له کوردیی حەز نەکا کوردێ مەڵێن بۆچی وە یا چۆنە
له دایکی پرسیارێ کەن کە ئەو بێچوەی لە کوێ هێنا

« حاجی قادری کۆیی »

## پێشکەشی :

بە گیانی پاکی ئەو کوردە مەردەی، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، بیری لەوە کردەوە، بە زمانی شیرینی کوردیی بنووسێ.
بەو کوردە بلیمەتە ئازایەی، یەکەم خشتی زێڕینی، بناغەی زمانی نووسینی کوردیی دانا.
بە هەموو ئەوانەی، ملوانکەی مرواریی ئەلفوبێی کوردییان هۆنییەوە.
بە هەموو ئەوانەی، یەکەم بنچینەی ڕێزمانی کوردییان داڕشت.
بە هەموو ئەوانەی، ووشەی خاوێنی کوردییان بۆ کۆکردینەوە و فەرهەنگی کوردییان بۆ دانایین.
بە هەموو ئەو شۆڕەسوارانەی، باسکی مەردایەتییان لێ هەڵکردووە و ڕاژەی زمانی پاراوی کوردیی دەکەن.

# ناوەڕۆک

# پێشەکیی

هەموو ئەو شارەزا و کادێرە ئەکادیمییانەی، لە بواری زانستی زماندا کاردەکەن، بە سەر دوو دەستەدا دابەشدەکرێن :
یەکەم ـ زماناس : هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە، بە هەوڵوتەقەلایەکی بێوچان، شەونخوونییەکی زۆر، خۆماندووکردن و خوێندنەوەیەکی بەردەوام، خۆیان فێری سەرەتا و بابەتەکانی زمانەوانیی دەکەن. لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیاندا قووڵدەبنەوە و شارەزاییەکی زۆر پەیدادەکەن. بەڵام مەرج نییە، لە زمانەکانی دیکەدا، شارەزاییان هەبێ، یا زانستی زمانەوانییان خوێندبێ.
دووەم ـ زمانزان : هەموو ئەو کادێرە ئەکادیمییانە دەگرێتەوە، یەکێ لە خوێندنگە بەرزەکانی زمانەوانییان تەواوکردبێ. ماوەی چەن ساڵێ، بابەتەکانی زانستی زمانیان خوێندبێ، چەن لێکۆڵینەوە و باسێکی گرنگیان، لە سەر کێشەکانی زمان نووسیبێ، شارەزاییەکی تەواویان، لەو بوارەدا هەبێ. جگە لە زمانی دایک، لەو زمانانەی خوێندوویانە، شارەزاییەکی باشیان پەیداکردبێ، زانیارییەکی گشتیشیان، لە سەر ئەلفوبێی زمانە زیندوو و گرنگەکانی گەلانی جیاوازی جیهان هەبێ. بۆیە دەتوانین، ئەو جۆرە کادێرانە، لە بواری زمانەوانیدا، بە پسپۆڕ و شارەزای تەواو ناویەرین.
بەڵام هێندێ جار، چەند کادێرێ، لە بواری زانستی زماندا، خوێندنی باڵاش تەواودەکەن، کەچی نەک هەر بەرهەمیان نییە، نەک هەر هیچیان پێ نییە، بەڵکوو بەقەدەر زماناسێکی خۆماڵیشی لێ نازانن و شارەزاییان لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆشیاندا نییە. بە لای منەوە، ئەو جۆرە کادێرە ئەکادیمییانە، وەک درەختێکی زڕ وان، جگە لە کۆلکەپسپۆڕ یا کوێرەئەکادیمی، هیچی دیکە نین. بۆیە، بە بۆچوونێکی ڕاستی دەزانم، گەر لێرەدا بڵێم: چ بۆ زماناس و چ بۆ زمانزان، لە پێش هەموو شتێکدا بەهرە، پاشان خۆماندووکردن و سەلیقەی ورد، لە بواری زمانەوانیدا، ڕۆڵێکی گەلێ مەزن دەگێڕن.

له ڕاستیدا، من زمانەوان نیم، بەڵام سوێندتان لە سەرم نییە، گەر بڵێم: هێشتا لاوێکی تازە پێگەیشتووبووم، ئارەزووی زمانەوانیی، لە کەللەی دابووم. هەر شتێکم بە زمانی عەرەبیی دەخوێندەوە، خێرا لە دڵی خۆمدا، واتاکەیم بە کوردیی لێکدەدایەوە، لە تەنیشت ووشە قورسەکانەوە، سپێتی لێواری پەرتووکەکانم، بە ووشەی کوردیی پەتیی ڕەشدەکردەوە. لە کاتی ئاخافتنیشدا، ووشە عەرەبییەکانم بۆ خەڵک ڕاسدەکردەوە. لەبەرئەوە، هێندێ جار، دڵی دۆستان و برادەرانم لێ دێشا، بەڵام، هێندەی بە تەنگ زمانەکەوە بووم، هێندە بە تەنگ دڵی ئەوانەوە نەبووم!
هەر چەندە ئەو کاتانە، بیر و هۆشی منالیم، توانای ئەوەی نەبوو، وەڵامی هێندێ پرسیاری قورسی زمانەوانیی بداتەوە. بەڵام ڕۆژگار هات و ڕۆی، ئەو گڕوگاڵە منداڵانەیەی، سەلیقەی زمانەوانییم گەشەیکرد، تا وای لێهات، هێندەی لە باردابێ، بەرەبەرە، ئەو ڕەچە سەختەی سەر ڕێگەی زمانەوانییم بۆ بشکێنێ. کاتێ هۆشیشم فراوانبوو، خۆم لە دەشتێکی کاکیبەکاکیدا بینییەوە، بۆم ڕوونبۆوە، تازە لە سەرەتادام و وا خەریکم، کیسەڵ ئاسا پەلدەکوتم. لەو زەریا بێسنوور و بێبنەی زماندا مەلەدەکەم، کە هەر کوردێ وەک بێچووە مراویی، هەر لە منالییەوە مەلەوانیی نەزانێ، پەلیش بکوتێ، کەڵکی نییە و هەر زوو دەخنکێ. ئیدی لەو ڕۆژەوە، هەر چی پڕۆژەیەکم هەبوو، وازم لێ هێنا، چونکە، ئەم بابەتە هەموو بیر و هیوای پێشووی، لە مێشکمدا ڕامالی، کەشتیی کەڵکەڵەی زمانەوانییم، لە بەندەری سەلیقەی ورددا لەنگەریگرت. بە تایبەتیی، ماوەی ئەم دە ساڵەی لە شاری ستۆکهۆڵم نیشتەجێبووم، هەلێکی باشم بۆ ڕەخسا. ئیدی بە تەواویی، سەرقاڵی ئەو بەزمە بووم، زۆربەی زۆری ئەو ژیانەم، بە خوێندنەوە و نووسینەوە بەسەربرد، تا دەروازە گەورە خڕداخراوەکەی قەڵای زمانەوانیی بۆ کردمەوە. لەبەرئەوە، زۆر لە کۆنەوە، خۆم بە بابەتی زمانەوانیی و زمانی کوردییەوە خەریککردووە. هەمیشە هەوڵمداوە، زمانەکەم لە ووشەی بیانیی خاوێنکەمەوە، لە کاتی ئاخافتنیشدا، ووشەی کوردیی پەتیی و ڕەسەن بەکاربێنم، بە چاوی ڕەخنەوە، لە هەموو جۆرە نووسین و داڕشتنێکی، هەموو نووسەرانی کورد بڕوانم.

هەر چەندە، گۆڕەپانی خەبات گەلێ فراوانە، بەڵام، هەمیشە لەو باوەڕەدابووم، گەر هەر کوردێ بیەوێ، ڕاژەی نەتەوەکەی خۆی بکا، لە پێش هەموو شتێکدا دەبێ، ملی ڕێگەی زانست بگرێ. زانستیش، لە زمانی نەتەوەیی یەوە دەسپێدەکا و بە مێژوودا تێپەڕدەبێ. کوردە ناسیۆنالیستەکان، هەر چییەکیان پێ بکرێ، دەبێ وەک پاسەوانێکی ئازا و وریا، قەڵای سەختی زمانە نەتەوەیی یەکەیان، لە داتەپین و ڕوخان بپارێزن. هەمیشە هەوڵدەن، دینگەکانی پتەوکەن، زەوییە بەیارەکانی بکێڵن و ببوژێننەوە، بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگی جوان و بۆنخۆش بیرازێننەوە. (پێویستە چەکی زانین و هونەر بەرامبەر دوژمنانی زانیاریی و پێشکەوتن ڕاست کاتەوە مەشخەڵی خوێندەواریی بە زمانی کوردیی بەرز بکاتەوە، تا تیشکە بەتینەکەی کوێرایی یەکجاریی بە چاوی پڕوپوشاویی شەمشەمەکوێرە و کوندەبەبووی شوومی تاریکیی و « نەزانین »دا بهێنێ.) «ج،N» چونکە هەر نەتەوەیە، زمان و وێژەی خۆی پاراست، گومانی تێدا نییە، بە نەتەوەیەکی زیندوو دادەنرێ، نەتەوەی زیندووش، هەر دەژی، سەردەکەوێ و پێشدەکەوێ. گرنگیش نییە، گەر ژێردەسیشبێ، چونکە پاراستنی زمان، ڕاژەکردنی زمانی نەتەوەیی، کۆکردنەوەی ووشە، نووسینەوەیان و ڕێکوپێککردنیان، لە پاراستنی گیان گرنگترە، چونکە گەر هەزاران کەس گیانیان لە دەسدەن، نەتەوەکە نامرێ، بەڵام گەر هەر نەتەوەیە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی وونکرد، ئەوا پێوەندیی کۆمەڵایەتیی کزولاوازدەبێ.

دەربارەی ڕاژەکردنی زمان، مامۆستا « مەسعوود محەمەد » دەڵێ: (ئەم باوەڕەم دەمهاوێتە سەر ڕێبازی خۆش ئامەدیی کردن لە هەموو چالاکیێکی زمانزانانی کورد بەرەو دۆزینەوەی دەستوورە ورد و درشتەکانی زمانی کوردیی، فەتوا بۆ خۆشم دەدا کە وا لە گوێرەی دەسەڵاتی خۆم، بە تەنیایی یاخود لەگەڵ خەڵقی تر، لەو تەرزە چالاکیەدا دەستێکم هەبێ. نەزانراویی و شاراوەیی دەستوورەکانی کوردیی بە بەریەوە هەیە خەڵقێکی زۆر بۆ ماوەیێکی درێژ لەگەڵی خەریک بن و لێی نەبنەوە.

ڕەنگە بگوترێ کردنەوەی دەرگەی زمان لە ڕووی هەموو کەسێک

قەڵەباڵغییەکی بێ تام بە دەوری زمانەوە کۆدەکاتەوە، بەڵام وا بزانم ئەم تێبینییە هەر لە سەر کاغەز بایەخدارە، لە واقیعدا جێی مەترسی لێکردن نییە.) «مەسعوود،ز»

هەڵبەتە، ئەوەی پتر هانیدام، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە سەر زمانی کوردیی بنووسم، سێ خاڵی سەرەکیی بوو :

1/ لە مێژبوو، هەستم بە پاشاگەردانیی، گەڕەلاوژێ و گێژاوی زمانەوانیی دەکرد، بەڵام هەر چەندە بیرم لێ دەکردەوە، چارەسەرێکم بۆ نەدەدۆزرایەوە. یا ڕاستروایە، بڵێم: نەمدەوێرا، خۆم لە قەرەی باسێکی وا گرنگ بدەم، توخنی ئەو زەریا بێبنە کەوم، لە بەر خۆمەوە دەمگوت: نەبا نقومبم و سەری تێدا دەرنەکەم! بەڵام، پاشان بیرم گۆڕی، وەک کورد دەڵێ، منیش گوتم: کردەی پەشیمان لە نەکردەی پەشیمان باشترە! بەڵکوو، دارێ سەر بەردێ هاوم و کەڵکێکی هەبێ، کەلێنێ لەو کەلاوە گەورەیە پڕکاتەوە.

2/ ئەوەی پتریش هانیدام، ئەم کارە لە ئەستۆی خۆم بگرم، ئەوەبوو، کاتی خۆی لە سولەیمانی، لە ئێوارەی(1996/5/26)دا، لە بەرنامەیەکی ڕاستەوخۆی تێلێڤیزیۆنی « گەلی کوردستان »، کۆڕێکی کەلتووریم پێشکەشکرد. یەکێ لەو هاوشاریانەی بە تێلێفۆن پرسیاری لێ کردم، گوتی: ئێوەی کوردی هەندەران، لە هیچتان کەم نییە، بۆچی هەوڵ نادەن، ڕێنووس و زمانێکی یەکگرتوومان بۆ دانێن، تا زمانەکەمان لەم پاشاگەردانییە ڕزگارکەن؟ منیش لە وەڵامدا گوتم: ئەو کارەی ئێوە بیری لێ دەکەنەوە، هەروا ئاسان نییە. ئەوە کاری دەزگەیەکی ئەکادیمیای تایبەتیی کوردییە، کە زۆربەی پسپۆڕ و شارەزایانی زمانی کوردیی، لە چوارچێوەی سنووری خۆیدا کۆکاتەوە.

هەر چەندە، جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەمەوە، ئەز زمانەوان نیم، ئەو کارەش، تەنیا لە توانای دەزگەیەکی ئەکادیمیای کوردیی دایە، بەڵام پرسیاری ئەو برا کوردە، لەو ڕۆژەوە تا ئەوڕۆش، هەر لە مێشکمدا دەخولێتەوە. هیوادارم توانیبێتم، لەم پەرتووکەدا، هێندێ لە گرفتەکانی زمانی کوردیم، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم ڕوونکردبێتەوە، بە لانی کەمیشەوە، وەڵامی پرسیاری ئەو برایەم دابێتەوە.

3/ جگە لەوەی کاتێ، « ئینستیتووتی کوردیی لە ستۆکهۆڵم » ، ڕووی دەمیان لێ نام و داوایان لێ کردم، گوتارێ لە سەر « گرفتەکانی زمانی کوردیی » ئامادەکەم، تا لەو کۆنفرانسەی « یەکێتی نووسەرانی کوردستان » و « ئینستیتووتی کوردیی لە بەرلین » ، لە شاری ستۆکهۆڵم دەیگرن، بەشداربم، بە سنگێکی فراوانەوە، داواکارییەکەیانم پەسەندکرد.
ئیدی لەو کاتەوە، تا ڕۆژی کۆنفرانسەکە، بە تەواویی خۆم بۆ ئەو باسە تەرخانکرد، گەلێ سەرچاوەی بە نرخم کۆکردەوە و خوێندەوە. لەگەڵ هەموو ئەو باری سەرنجانەی، دەربارەی زمانی کوردیی و گرفتەکانی، چەندین ساڵ بوو، لە بیر و هۆشمدا کەڵەکەبووبوون، تێهەڵکێشی ئەو زانیارییە گرنگانەم کرد و گوتارێکی نۆ لاپەڕەییم ئامادەکرد.
پاشان کورتەیەکی گوتارەکەم، لە ڕۆژی «1997/5/10»دا، لە بەردەم کۆمەڵێ خەڵکی ڕووناکبیر، شارەزای زمان و وێژەی کوردییدا خوێندەوە. دواییش، لە لایەن بەشدارانی کۆنفرانسەکەوە، دەمەتەقێی تێروتەسەلی لە سەر کرا.
لە کۆنفرانسەکەدا، هێندێ لە ڕووناکبیرانی کورد، لە هەر چوار پارچەکەی کوردستانەوە، بەشدارییانکردبوو. نۆ گوتار لە سەر بابەتی جیاجیای زمانەوانیی، نووسین بە کوردیی، ئەلفوبێی عەرەبیی و لاتین، وەرگێڕان، خەسڵەتەکانی نووسەر و بابەتەکانی ئینسکلۆپیدیای کوردیی، بە هەر دوو بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووو ژووروو، لە لایەن چەند نووسەرێکەوە پێشکەشکرا.
دوای ئەوەی گوتارەکان تەواوبوون، پێشنیازێکم، پێشکەش بە دەستەی بەڕێوەبەری کۆنفرانسەکە کرد. ئەویش ئەوەبوو، وەک هەنگاوی یەکەم و کارێکی هاوبەشی نووسەران، هەموو گوتارەکان کۆکرێنەوە، بە هەر دوو بەشەدیالێکتە سەرەکیی و بە هەر دوو تیپی عەرەبیی و لاتین بنووسرێنەوە. پاشان، لە سەر ئەرکی ئینستیتووتی کوردیی لە ستۆکهۆڵم، لە شێوەی پەرتووکێکدا چاپ و بڵاوبکرێتەوە. بەڵێنیشمدا، ئەرکی نووسینەوەی، ئەو گوتارانەی بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی نێوەڕاست نووسرابوون، لە ئەستۆی خۆمی گرم. ئەوەبوو، بەشدارانی کۆنفرانس، بە تێکڕای دەنگ، ئەو

پێشنیازەیان پەسەندکرد. دەستەی بەڕێوەبەری کۆڕەکەش پەیمانیدا، لە ماوەیەکی کەمدا، ئەو کارە بە ئەنجامبگەیەنێ.
ئیدی دوای ئەوە، زیاتر خۆم بۆ ئەو کارە تەرخانکرد، هێندێ سەرچاوەی دیکەشم خوێندەوە، باسەکەم بە گەلێ زانیاریی تیۆریی دیکە، دەوڵەمەندترکرد. پرس و ڕاشم، بە هێندێ کەسی شارەزای زمانی کوردیی کرد. پاشان، هەمووی هەفتەیەکی پێ نەچوو، گوتارێکی دە لاپەڕەییم ئامادەکرد، بەچاپکراویی پێشکەش بە ئینستیتوتی کوردیی - ستۆکهۆڵمم کرد، تا لە سەر بەڵێنەکەی خۆیان، هەموو گوتارەکان کۆکەنەوە، لە پەرتووکێکدا چاپیکەن و بڵاویکەنەوە. بەڵام، لە مانگی پێنجی «1997»ەوە، تا نووسینی ئەم پێشەکییە، بە هیچ شێوەیە، دەنگ و ڕەنگیان نەبوو، هیچ کەسێ لەو نووسەرانەش، گوتارەکانی خۆیان ئامادەنەکرد و پێشکەشی ئینستیتووتیان نەکرد! بۆیە بە تەواویی نائومێدبووم، دەسم لە بەڵێنەکەی ئینستیتووت شت. ئیدی بڕیارمدا، درێژە بە لێکۆڵینەوەکەم بدەم، هێندێ فراوانتریکەم و لەم پەرتووکە خنجیلانەیەدا، پێشکەش بە ئەویندارانی زمانی شیرینی کوردیی بکەم.
ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم: بۆ نووسینی ئەم پەرتووکە، سەدوبیستوپێنج سەرچاوەی جیاوازم بەکارهێناوە. بۆ ئەوەی، سەراپای نووسینەکە، بە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو بنووسمەوە، تەنیا ئەو ڕێنووسە یەکگرتووەم بەکارهێناوە، کە خۆم باوەڕم پێی هەیە، تا سەر لە خوێنەران نەشێوێ و هەر دەمە ڕێنووسێکی جیاوازی پێش چاوکەوێ، بێ ئەوەی دەسکاریی شێوەی داڕشتنەکانیان بکەم، یا ووشە عەرەبییەکان بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕم. لەبەرئەوە، داوای لێبووردن لە نووسەرەکانیان دەکەم.
هەروەها ئەو نووسەرانەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا ناویان هاتووە، وە نەبێ شتێکی تایبەتیم لەگەڵیاندا هەبێ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ڕێزم بۆیان هەیە. بەڵام، ئەم ڕەخنانەی لێرەدا، ئاراستەی نووسەرانی کوردی دەکەم، لەوەوە هاتووە، جەرگم بۆ باری زمان و وێژەی گەلەکەمان ژاندەکا، گرنگیش نییە، گەر لە سەر ڕاستیی، دڵی چەند کەسێکم لێ بڕەنجێ، چونکە زمانە شیرینەکەم، نەتەوە چەوساوەکەم، نیشتمانە ئازیزەکەم، لە هەموو کەسێکی دیکە خۆشتر دەوێ!

ئەز بە ڕاشکاویی دەڵێم، هێندەی لە توانامدابووە، ئەو زانیارییانەی دەربارەی زمانی کوردیی زانیوومن، چەن ساڵە کۆمکردونەتەوە، پاشان، گێژمداون، بێژاومن، ڕێکمکردوون و تۆمارمکردوون. وەک زماناسێ، ئەوەی لە دەسم هاتبێ، کردوومە و پێشکەش بە خوێنەری کوردم کردووە. گەر ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم، لێکۆڵینەوەکەم پەسەندکەن، ئەم چەپکە ئاڵەکۆکە ڕەنگینە پرچنەم لێ وەرگرن، خۆم زۆر بە بەختەوەر دەزانم. بە مەرجێ، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، شەنوکەویکەن، هەڵەوپەڵەی لێ بژارکەن، هەڵەکانم بۆ بگێڕنەوە، گەلێ شاددەبم و بە داوەریی ئێوەی هێژا و خاوەن ویژدان قایلدەبم، چونکە، وەک دەڵێن: (ماڵی قەڵب سەروگوێلاکی خاوەنەکەی دەگرێتەوە).

دەبا شارەزا و زمانەوانەکانی کورد، بە باری سەرنجی ورد، سەلیقەی کوردانە و دڵسۆزانەی خۆیان، ئاوڕێکی پڕ لە بەزەیی، لەم لێکۆڵینەوەیە بدەنەوە، کەموکوڕییەکانم بۆ دەسنیشانکەن و باسەکەش دەوڵەمەترکەن، تا نەوەکانی دوارۆژمان، بە هەڵە زانیارییەکان وەرنەگرن. لە ئێوە دەسپێشکەریی و لە منیش چاوەڕوانیی. گەر ئێوەی خەمخۆرانی زمانی بێکەسی کوردیی، بە تیشکی چرای گەشی ڕەخنەی دروسکەر، شەوەزەنگی بەرپێم ڕووناککەنەوە، منیش هەتا ماوم، لە چاکەتان دەر ناچم.

هیوادارم، وەک چۆن خۆم، ڕەخنە لە شێوازی نووسین، ڕێنووس و هەڵەی نووسەرانی کورد دەگرم، خوێنەر و شارەزایانی زمانی کوردییش، تۆڵەی خۆیانم لێ بکەنەوە، نەیەڵن، هەروا بە خۆڕایی، لە دەس چاوی تیژی مەلی ڕەخنەی، دڵسۆزانەیان قووتاربم. بەڵام، بە مەرجێ لەم بەرهەمەوە، لە سەر ڕێنووسی کوردیی، ئاوڕێکی پڕ لە بەزەییانەم لێ بدەنەوە، نەک لە بەرهەمە کۆنەکانمەوە، نووکی پێنووسەکەیانم بۆ تیژکەنەوە، چونکە، لەو کاتەوە، دەسم بەم باسە کردووە، باوەڕم بەرانبەر ڕێنووسی کۆنی کوردیی، بە تەواویی گۆڕاوە.

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
1999/05/05

# 1. هێندێ زانیاریی گشتیی :

ئەورۆ، زانست بە ئەندازەیە پێشکەوتووە، گەلێ کۆسپی لە ڕێی کۆمەڵگەی مرۆدا تەختکردووە، گرێکوێرەی زۆر نهێنی بۆ کردۆتەوە، چەندین مەتەڵی قورسی بۆ هەڵێناوە. بەڵام، هێشتا بە تەواویی، هێندێ شتی بۆ ساغ نەکردووینەتەوە. بۆ نموونە: تەمەنی ئەم گەردوونە چەندە؟ کەی دروسبووە؟ کەی کۆمەڵگەی مرۆ پەیدابووە؟ یەکەم جار لە مێژوودا، مرۆڤ بە چ زمانێ قسەیکردووە؟ چونکە، ئەوەی هەیە، تەنیا لە هێندێ لێکۆڵینەوەی، چەن هەزار ساڵەی، هەوڵوتەقەلای بەری ڕەنج و ئارەقی ناوچەوانی، چەندین زانا و پسپۆڕی جوگرافیا، ئەرکیۆلۆژیا، مێژوو و زمانزانەکان تێپەڕ ناکا. ئەوانیش، هەموویان لە خانەی قەبلاندندا جێگەیان دەبێتەوە.

چیرۆکە ئایینییەکان دەگێڕنەوە، لە سەردەمی پەیامبەر « نوح »دا، بارانێکی زۆر باریوە، « تۆفان »ێکی گەورە دروسبووە، هەموو بستێکی ئەم سەر زەوییەی داپۆشیوە. تەنیا « نوح » و سەرنشینی کەشتییەکەی نەبێ، ئیدی هەموو گیانلەبەران « مرۆڤ، ڕووەک، ئاژەڵ، پەلەوەڕ و جانەوەر » مردوون. جیهان بە تەواویی چۆڵبووە. پاشان، باران خۆشیکردۆتەوە. ئاوی سەر زەوی نیشتۆتەوە. کەشتییەکەی « نوح »یش، وەک قورئان دەفەرموێ :(و استوی علی جودی). واتە. لە سەر چیای جوودیی لەنگەری گرتووە، کە ئێستەش، شوێنەوارەکەی هەر ماوە. هەروەها، لەو بارەیەوە « ئەولیا چەلەبی »یش دەڵێ: (کەشتییەکەی نوح، لە پاش گەڕانێک بە سەر ئاودا، دوو قۆناغ لە لای باکووری « شەنگار » لە نێوان قەڵای « موسڵ و نەسیبن »دا، لە سەر کێوی جوودیی گیرساوەتەوە.)«76،8»

ئیدی، کاتێ هەموو شت تەواوبووە، کەشتییان جێهێشتووە، سەرلەنوێ ئەم زەوییەیان ئاوەدانکردۆتەوە، ژیانێکی نوێ دەسپێکردۆتەوە، مرۆ زاوزێیکردووە، ڕووەک و گیانلەبەرەکانی دیکەش، وردەوردە، بوژاونەتەوە و زیادیانکردووە. گەر باوەڕ بەم چیرۆکە بکەین، ئەوا دەبێ، بڵێین: کوردستان بە لانکەی دووەمی مرۆ دادەنرێ. کۆمەڵگەی دووەمی مرۆ، هەر لە کوردستانی ئەو سەردەمەوە ژیاوەتەوە.

لەو بارەیەوەشەوە، « ئەولیا چەلەبی » دەڵێ: (لە دوای تۆفانی « نوح »، یەکەم شوێن شاری جوودیی ئاوەدانکراوەتەوە. دوای ئەو قەڵای شەنگار و سێیەم میاقارقین. بەڵام، خاوەنی شاری جوودیی، کە « کوردم » شایە و ئۆمەتی نوح بووە، شەسەد ساڵ ژیاوە و بە نێو هەموو کوردستاندا گەڕاوە. کە گەیشتۆتە میافارقین، ئاو و هەواکەی زۆر چۆتە دڵییەوە و تێیدا نیشتەجێبووە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بوون. ئەم خەڵکە لە خۆیانەوە، زمانێکیان داهێنا، کە نە عەرەبیی و نە فارسیی و نە عیبریی و نە دەرەیی یە. ئەوڕۆش، بەو زمانە دەڵێن: کوردیی و لە کوردستاندا بەکاردێنرێ.) «90،8»

هەڵبەتە، ئەو کات و سەردەمە، « تیرە، هۆز، گەل و نەتەوە » نەبووە. بەڵکوو، کۆمەڵگەی مرۆ، لە کۆمەڵە خەڵکێ پێکهاتووە، هەر کۆمەڵەی لە ناوچەیەکی دیاریکراودا ژیاون، بە ناوی پەیامبەر یا ئایینەکەیانەوە ناسراون، وەک میللەتی « نوح، برایم، موسا، عیسا ... تاد ».

وەک دەگێڕنەوە: « نوح » چەن منالێکی هەبووە. لە ناو ئەوانەدا، دوو کوڕیان ناویان « سام و حام » بووە. لە « سام » دوو دەستەی لێکەوتۆتەوە. هێندێ دەڵێن: ناویان « سامیی و یافتیی » و هێندێکی دیکەش دەڵێن: « سامیی و ئاریی » بووە.

هەر چۆنێبێ، لە « سامیی »ەکان، چەن گەلێکی وەک « عەرەب، جوو، ئاشووریی، کلدانیی، دانیشتووانی بابل، خەڵکی شام، ئارامیی، فینیقیی و ... تاد » پەیدابوون. لە « ئاریی »ەکانیش، سێ دەستەی گەورە سەریان لە هێلکە جوقاوە. ئەوانیش، « هیندیی، ئێرانیی و ئەورووپایی » بوون. لە « ئێران »ییەکان، چەن کۆمەڵێکی ئیتنیی وەک « پارس، کورد، ماد و تیرە و هۆزەکانی ئارارات » چاویان بە ژیان هەڵێناوە. لە « ئەورووپایی » یەکانیش، چەن کۆمەڵێکی دیکەی، وەک « لاتینەکان، ئەڵمان، ئۆسلاویی و سەلتەکان » لەدایکبوون.

ئیدی بەم شێوەیە، لە هەر بنەماڵە و بەرەبابێ، کۆمەڵ و دەستەیەکی نوێ پەیدابووە، تا بە تەواویی، سەر ڕووی ئەم زەوییەیان ئاوەدانکردۆتەوە. هەموو ئەو گەل و نەتەوانەی ئەوڕۆ دەیانبینین، دروسبوون. بەڵام، جگە

لەوەی، ئەم دید و بۆچوونە، هیچ جۆرە زانیارییەکی ئەکادیمییمان ناداتێ، لە هەمان کاتیشدا نازانین، ئەم شتانە، کەی ڕوویانداوە؟ تەمەنی زەوی، لە دوای « تۆفان »ەوە چەندە؟ ئەو خەڵکەی ڕزگاریانبووە، بە چ زمانێ پەیڤیون؟

لە باسە زانستییەکانیشدا، دید و بۆچوونی جۆربەجۆر هەیە. هێندێ لە زاناکانی ئارکیۆلۆژیا لەو باوەڕەدان، ئەم گەردوونە زۆر کۆنە، زەوی لە مێژە دروسبووە. مرۆڤیش لە سەر زەوی نزیکەی دووسەدهەزار ساڵێ لەمەوبەر پەیدابووە. هێندێکی دیکەش دەڵێن: نزیکەی نیومیلیۆن ساڵ دەبێ، سەر ڕووی ئەم زەوییە، لە لایەن مرۆڤەوە ئاوەدانکراوەتەوە. ماوەی شەش هەزار ساڵێکیش دەبێ، خوێندن و نووسین لە نێو کۆمەڵگەی مرۆدا پەیدابووە.

تا دوێنێ بوو، زاناکانی ئارکیۆلۆژیا، تەمەنی مرۆڤیان، لە وولاتێکی وەک « میسر »، بۆ سەدهەزار ساڵ لەمەوبەر دەگێڕایەوە. ئەو سەردەمەشیان، بە سەردەمی « بەردینی نوێ » دادەنا. بەڵام، ئەوڕۆ وێزگەی ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆنەکانی جیهان، دەنگوباسێکی نوێیان ڕایەنگەیاند، وا خەریکە هەموو شتەکان، بە جارێ دەگۆڕێ. کەناڵی تێلێڤیزیۆنی « ئەلجەزیرە »، کاژێری « 14.30» ڕۆژی « 1999/04/23 » بلاویکردەوە، کۆمەڵێ زانای ئارکیۆلۆژیا، لە سیازدە دەوڵەتی جیهانەوە کۆبوونەتەوە و پێکەوە کاردەکەن. لە یەکێ لە بیابانەکانی « ئەسیوبیا »، پەیکەری ژنێکیان دۆزیوەتەوە، ناوی « لوسی »یە.

زاناکان، بە هۆی « کاربۆنی14 »ەوە، تەمەنی ئەو پەیکەرەیان دیاریکردووە، بە دوومیلیۆن و نیو ساڵ قەبلاندوویانە. زۆربەی زاناکانی جیهان، ئەو دۆزینەوە نوێیە، زۆر بە باشیی هەڵدەسەنگێنن. لە بواری زانست، مێژووی کۆمەڵگەی مرۆ و تەمەنی مرۆڤ لە سەر زەویی، بە دەسکەوتێکی گەورە و شۆڕشێکی نوێی دادەنێن. چونکە، لەو باوەڕەدان، لەو سەردەمانەدا مرۆڤ توانیویێتی، لە بواری ژیاندا، شۆڕشێکی تەکنۆلۆژیا بەرپاکا. مرۆڤ لەو قۆناغەی تێیدا ژیاوە، گژوگیای ڕنیوەتەوە، بەروبوومی درەختی کۆکردۆتەوە و خواردوویەتی. دوای ئەوە، قۆناغێکی نوێ دەسپێکردووە، بەرەو قۆناغی ڕاوکردن و گۆشتخواردن هەنگاوینەوە.

زاناکـان دەبێ، سـەرلەنوێ، چاوێ بە تیـۆرییـەکـەی زانای بە ناوبانگ، «چارلس داروین »دا بگێـڕنەوە، بۆ ئەوەی بە تەواویی دیاریکەن، مـرۆڤی سـەرەتایی، لە سـەردەمـە کـۆنەکـانی ژیاندا چۆن بووە، تا بەم شێـوەیەی ئەورۆی گەیشـتووە؟ لەوانەیە، ئەم ڕووداوە زانستـییـە گرنگە، جارێکی دیکە، چیرۆکی ڕەچەڵەکی مـرۆڤ و مـەیموون زیندووکـاتەوە، سـەرلەنوێ، ناکۆکـییـەکی قـووڵ، لە نێوان دەزگـە ئایینیی و ئەکـادیمییـەکانی جیـهاندا بتەقێنێتەوە!

هەروەها، گەر زاناکان، ئەنجامێکی زانستـانەیان دەسکەوێ، بە کۆڵینەوە و توێژینەوە بیـســـەلمێنن، نرخی ئەو دۆزینەوە نوێیـە هەڵســەنگێنن و لە ئەنجامەکەی دڵنیـابن، ئەوا دەتوانن، بۆمـان بسەلمێنن، کیشوەری ئەفـریکا، یەکەم مەڵبەندی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆ و لانکەی شـارستـانیی بووە. هەر لەوێشەوە، ژیان دروسبووە، خەڵکی بە هەموو بستێکی ئەم سەر زەوییەدا بڵاوبوونەتەوە.

بەڵام، لێرەدا پرسیارێ خۆی قووتدەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا « تۆفان » ەکەی پەیامـبەر « نوح »، هیچ پێوەندییەکی بە لەنێوچوونی ئەو کۆمەڵگە کۆنەی مـرۆوە هەیە، کە ئەورۆ زاناکان پاشماوەکانی دەدۆزنەوە؟ ئایا، پێش ئەوەی، کـیـشـوەری ئەفـریـکا بدۆزرێتـەوە، ژیانی تێـدابووە؟ ئەوانەی لەوێ ژیاون، کێ بوون؟ چۆن بوون؟ چۆن ژیاون؟ پاشان، چییان بەسەرهاتووە؟ بۆ لەنێـوچوون و ونبـوون؟ کـەی سـەرلەنوێ، ژیانی تێـدا پەیدابۆتەوە؟ کـەی ناوچەکـە ئاوەدانبـۆتەوە؟ ئایا، « تۆفـان » ئەوێشی گـرتۆتەوە، یانا؟ گـەر ئەوێشی گـــرتۆتەوە، ئەوا لە ڕووی ئاییـنەوە، ڕووداوەکـــە دیارە. گـــەر نەیگرتۆتەوە، ئەوا ناکۆکـییـەک، لە بەسەرهاتەکەی « نوح »دا دروسدەبێ. چونکە، بەپێی قورئان، هەموو کونوقوژبنێکی ئەم سەر زەوییەی گرتۆتەوە.

هەر چۆنێـبێ، دانیشـتـووانی ئەم تۆپی زەوییـەی، ئەورۆ، ئێـمـەی لە سـەر دەژین، نزیکەی پێنجونیو بۆ شەش میلیار کەس دەبێ. ئەم شـەش میلیـار مـرۆڤـە، بە سـەر پێنج کـیـشـوەری گـەورەی پانوبەریندا دابەشبـوون. بە شـێـوەیەکی سـروشـتـیی، لە چەن تیـرە و هۆز، کـەمـەنەتەوەیی، گـەل و نەتەوەیەکی جیـاواز پێکهـاتوون. هەر یەکێ لەو گـروپە ئیـتنیـانەش، لە

چوارچێوەی ناوچەیەکی جوگرافیای دیاریکراوی سنوور بۆکێشراودا دەژین و بە زمانێکی نەتەوەیی جیاواز لە یەکدی دەدوێن. هەر چەندە، لە سەرەتادا هێندێ لەو گروپە ئیتنییانە، زمانی تایبەتیی خۆیان نەبووە، بەلام، ئەورۆ هیچ کۆمەڵێکی ئیتنیی لە جیهاندا نییە، زمانی تایبەتیی خۆی نەبێ.
بەپێی ئەو زانیارییانەی لە بەر دەسدان، هێندێ شارەزا دەڵێن: نزیکەی پێنج هەزار زمانی نەتەوەیی و دیالێکتی جۆراوجۆر لە جیهاندا هەیە. هێندێکی دیکەش دەڵێن: (ژمارەی زمانەکانی جیهان بە نزیکەی سێ هەزار دانراون) «53،103» بەلام مەرج نییە، هەموو زمانەکان، زمانی ئاخافتن و نووسین بن، بەڵکوو، هەیانە زمانی نووسینیان نییە، تەنیا زمانی ئاخافتنیان هەیە. ژمارەی زمانەکان، بەگوێرەی گرنگیی، بەکارهێنان و ژمارەی ئەو کەسانەی لە جیهاندا ئاخافتنیان پێ دەکەن، بەپێی سەرژمێری ساڵی «1991»، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەی لای خوارەوەن :

| | |
|---|---|
| چینیی ـ | 845 000 000 |
| ئینگلیزیی ـ | 485 000 000 |
| هیندیی ـ | 338 000 000 |
| ئیسپانیی ـ | 331 000 000 |
| ڕووسیی ـ | 291 000 000 |
| عەرەبیی ـ | 192 000 000 |
| بەنگالیی ـ | 181 000 000 |
| پورتوگالیی ـ | 171 000 000 |
| مالایشیدۆنیسی ـ | 138 000 000 |
| ژاپۆنیی ـ | 124 000 000 |
| ئەلمانیی ـ | 118 000 000 |
| فەرەنسیی ـ | 117 000 000 |
| ئۆردۆ ـ | 900 000 «5،127». |

بەلام، زمانەکانی « ئینگلیزیی، ئیسپانیی، فەرەنسیی و ڕووسیی » پتر لە زمانەکانی دیکە، لە کاروباری دیپلۆماسیی و نێودەوڵەتیدا بەکاردێنرێن.
شتێکی ئاشکرایە، وەک چۆن هەموو شتێ لەم گەردوونەدا، بە سەر چەن

بەش و دەستەیەکدا دابەشدەکردێ، بە هەمان شێوەش، زمانە جیاوازەکانی گەلانی جیهان، بە سەر چەن خێزانە زمانێکی جیاوازدا دابەشدەکرێن. بەڵام، چەن خەسڵەتێکی هاوبەشی وەک:« ڕەگەز و بنچینە، ڕێزمان، ڕێبازی پێشکەوتن »، پێکیانەوە دەبەسێ.(زانستی زمانەوانیی، هەموو ئەو زمانانەی کە ئیمڕۆ نەتەوەکانی دنیا قسەی پێ دەکەن، بەپێی خزمایەتییان و نزیکییان لە یەکتر ـ لە باری ڕێزمان و فۆنێتیک و داتاشینی ووشەکانیانەوە ـ بەشبەشکردوە و هەر بەشەی دەباتەوە سەر بنەمایەک.)«11،69» بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین، زمانەکان لە چوارچێوەی ئەم گروپانەی خوارەوەدا پۆلێنکەین :

یەکەم : خێزانی هیندۆ ـ ئەورووپایی :

ئەو گەلانەی بەم زمانە دەدوێن، هەر لە ناوەڕاستی ئاسیاوە، تا ئەو پەڕی کەنارەکانی ڕۆژاوای ئەورووپایان داگیرکردووە. ئەم خێزانەش لە چەن کۆمەڵێ پێکهاتوون :

1/ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتیی : بە هیندۆئارییی ناسراوە و زمانی « میتانیی، سانسکریتیی، ماد و ئەخمینیی »دەگرێتەوە.

2/ کۆمەڵی ڕۆژاوایی : زمانەکانی دیکەی نەتەوەکانی ئاسیا دەگرێتەوە، کە لە چەن زمانێکی جیاواز پێکهاتووە، وەک :

1. زمانە جەرمانییەکان « ئەڵمانیی، ئینگلیزیی، دانیمارکیی، فیلمەندیی ـ بەلچیکا ، هۆڵەندیی، زمانە ئەسکەندناڤییەکان ».

2. زمانە سلاڤییەکان « ڕووسیی، پۆڵەندیی، چیکیی، سلۆڤاکیی، یۆگۆسلاڤیی و ... تاد ».

3. زمانە لاتینییەکان یا ڕۆمانییەکان « ئیتالیی، فرەنسیی، ئیسپانیی، پورتوگالیی ... تاد ».

4. زمانی یۆنانیی : « ئەمیش وەک زمانی ئەرمەنیی و ئەلبانیی، شێوەیەکی سەربەخۆیە لە زمانە هیندۆ ـ ئەورووپاییەکان ».

5. زمانی کەڵتیی : گرنگترینیان زمانی ئێرلەندییە.

دووەم : خێزانی سامیی :

ئەم خێزانە زمانە، زمانی هەموو ئەو نەتەوانە دەگرێتەوە، کە لە وولاتەکانی

میسۆپۆتامیا ، دوورگەی عەرەبیی و ژووررووی ئەفریکادا نیشتەجێبوون. ئەم خێزانەش لە چەند کۆمەڵێ پێکهاتووە :
1/ کۆمەڵە باشوورییەکان (عەرەبیی کۆنی خواروو و شێوە لەنێوچووەکانی وەک « سەبەء و قتبانیی و سەمودیی » عەرەبیی نوێی باکوور و زمانی حەبەشیی) .
2/ کۆمەڵە باکوورییەکان « ئارامیی کۆن، سریانیی و زمانی سائبە »
3/ کۆمەڵی ڕۆژاوایی ـ کەنعانیی « فینیقیی و عیبریی » .
4/ کۆمەڵی ڕۆژهەلاتیی « ئەکەدیی، بابلیی و ئاشووریی » .
سێیەم : خێزانی ئۆراڵی :
1/ ئۆراڵیی « فنلەندیی، ئەستۆنیی و مەجەڕیی » .
2/ ئەلتیکیی « تورکیی، مەگۆلیی، تەنوکوسیی و مەنانشۆ » .
چوارەم : خێزانی چینیی تیبتیی :
« چینیی، تایلەندیی، بورمایی و تیبتیی » .
زۆر پێدەچێ، ئەم دابەشکردنە، پتر بەگوێرەی شوێنی ژیان و نیشتمانی تایبەتیی نەتەوەکان کرابێ. بۆ نموونە: گەر تەنیا گرووپی یەکەم « خێزانی هیندۆ ـ ئەوروپایی » وەرگرین، دەبینین: نەتەوەکانی هیندۆ ـ ئەوروپایی، زۆربەیان لە کیشوەری ئەوروپا و هێندێکیشیان لە کیشوەری ئاسیا دەژین. ئەوانەی لە ئەوروپا دەژین: (ڕووس، پۆڵەندە، بولگاریا ، چیک، سلۆڤاک، یۆگۆسلاڤیا ، سوید ، نەرویج، دانیمارک، ئەڵمانیا ، ئینگلتەرە، ئێرلەندە، پورتگال، ئیسپانیا ، ئیتالیا ، فەڕەنسا و ڕۆمانیا ) . ئەوانەی لە ئاسیا دانیشتوون، پێیان دەگوترێ: « ئێرانیی ـ هیندیی » . وەک(سانسکریت، بەنگال، بلوژ، سەیلان، هیند، پاکستان، ئەفغان، فارس و کورد . )«139،63» هەرچەندە، هێندێ لەو باوەڕەدان، گەلانی هیندۆ ـ ئەوروپایی، گەلێ لەوە زیاترن، وەک(یابانیی. یۆنانیی. سەکتیی «بریتونیی، ئێرلەندیی، ویلزیی » . سلاڤیی « یۆگۆسلاڤیی، سلاڤیی، سلۆڤاکیی، چیکیی، بولگاریی، ڕووسیی، پۆڵەندیی » . ئێرانیی هیندیی «کوردیی، فارسیی، ئەفغانیی، پاکستانیی، هیندیی، سەیلانیی، بلوژیی، بەنگالیی، سانسکریتیی » . تیتۆنیی « ئینگلیزیی، ئێرلەندیی، ئەڵمانیی،

دانیمارکیی، نەرویجیی، سویدیی ». ڕۆمانیی « ڕۆمانیی، فرەنسیی، ئیتالیی، ئیسپانیی، پورتوگالیی ». بالتیکیی « لیتیی، لیتوانیی ». ئەرمەنیی.)«140،63»
ئەوەی لێرەدا، ئێمە پتر مەبەستمانە لێی بدوێین، کۆمەڵە خێزانی هیندۆ ـ ئەورووپایی یە. چونکە، بەپێی لێکۆڵینەوەی زانستەکانی زمانەوانیی، زمانەکەمان سەر بەم خێزانە گەورەیەیە. کەواتا پێویستە، بزانین، هیندۆ ـ ئەورووپایی چییە؟ ئەم ناوە لە کوێوە هاتووە؟ پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەو ڕاستییە دووپاکەینەوە، نەک هەر تەنیا گروپە زمانی هیندۆ ـ ئەورووپایی، بەڵکوو هەموو زمانەکانی دیکەی نەتەوەکانی جیهانیش، چەند خاڵێکی هاوبەشی وەک « ڕێزمان، فۆنێتیک و ڕەگی ووشە لە یەکچووەکان »، کۆیاندەکاتەوە و بەپێی ئەو نیزیکییەیان لە یەکدییەوە دابەشکراون.
هەڵبەتە، زمانی « هیندو ـ ئەورووپایی »، بە گەورەترین و پانوبەرینترین، گروپە زمانی جیهان دەژمێررێ. بنەمای هەرە گەورەی، زمانەکانی جیهانیش پێکدێنێ. هەروەها، بە دایکێکی ڕەسەنی زۆربەی زۆری، زمانە زیندووەکانی جیهان و گەلێ زمانی دیکەی مردووش دادەنرێ. زەریایەکە بۆ خۆی و لە بن نایە،(چونکە، هەموو دانیشتووانی ئەورووپا، ئەمێریکا، ئوستراڵیا و خوارووی ئەفریکا قسەی پێ دەکەن ـ کۆمەڵێکی کەمی لە ئەورووپا لێدەرچێ، بە زمانی باسکیی یا فینللەندیی یا مەجەڕیی یا تورکیی ئەو جۆرە زمانانە قسەدەکەن و دانیشتووانی ڕەسەنی هەر دوو ئەمێریکا، ئوستراڵیا و خوارووی ئەفریکا نەبێ، زۆربەیان لەناوچوون، بێجگە لە ژمارەیەکی کەم کەسیان نەماوە و ئەوانیش بەرەو فەوتان دەچن ـ هەروەها، بەشێکی گەورەی خەڵکی ئاسیا پێی دەدوێن « هێند، فارس، ئەفغانستان، کوردستان، قەفقازی ناوەڕاست ... تاد»)«182،64ـ 183»
هەروەها،(ئەو زانایانەی کە ناوی هیندوئوروپایی یان داهێناوە، ئەو زمانە نەزانراوەیان کردۆتە چەن لکێک کە هەر لکەی زمانی چەن نەتەوەی ئیمڕۆی لێ کەوتۆتەوە. یەکێ لەم لکانەیان ناوناوە خێزانە زمانی «ئاریایی» یا « هیندۆئێرانی » و ئەویشیان کردۆتە دوو دەستەی گەورە :
1. دەستەی زمانەکانی هیندیی.

2. دەستەی زمانەکانی ئێرانیی.)«12،70»

ئێمە، لێرەشدا بایەخ بە دەستەی دووەمیان دەدەین، چونکە، بۆ باسەکەمان بایەخێکی تایبەتیی هەیە. زانایان، بۆ دەستەی زمانە ئێرانییەکان، سێ قۆناغی مێژووییان دیاریکردووە :

1. دەوری کۆن، زمانی : « مادیی، ئاوێستایی، پارسیی کۆن ».
2. دەوری ناوەڕاست، زمانی : « پارتیی ـ فرثیی، پەهلەویی ».
3. دەوری تازە، زمانی :« فارسیی، کوردیی ».)«12،70»

دیسانەوە لێرەدا دەکرێ، بزانین، ناوی زمانە ئێرانییەکان لە چییەوە هاتووە؟« دیاکۆنۆف »دەڵێ:(« زمانەکانی ئێرانیی » ناوێکە بۆ دەستەیەک لە زمانانی هیندوئوروپایی ـ کە زمانانی: ئۆسیتی، ئەفغانیی، فارسیی، تاجیکیی، کوردیی، تاتیی، تالیشیی و... تاد و لە زمانانی کۆن ئاوێستایی، سوغدیی، خوارەزمیی، ئێسکیتیی و گەلێکی تر دەگرێتەوە ـ برەوی پەیداکردوە، ئەم زاراوەیە وێڕای ئەوەش کە زۆر لە گوێین نییە، ئێستە ناتوانین، ووشەیەکی تری لە جێ دانێین. بەکارهێنانی سفەتی ئێرانیی لەوانەیە وا لێکدرێتەوە کە مەبەس زمانی وولات و دەوڵەتی ئێران یەعنی «فارسیی »یە، کەچی وەکوو بۆ هەموو کەس ئاشکرایە... زاراوەی« ئێران » بە شێوەی کۆنی یەعنی « ئاریانا » لە سەرەتاوە « فارس »ی نەگرتۆتەوە.) «12،70»

## 2. زمانی کوردیی و دیالێکتەکانی :

هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، گەلێ لە پسپۆڕ و ڕۆژهەڵاتناسە بیانییەکان، لە وڵاتە جیاجیاکانی جیهانەوە، بۆ مەبەسی تایبەتیی خۆیان، سەردانی کوردستانیان کردووە، ماوەیە ژیانیان تێدا بەسەربردووە. لەو ماوانەدا، دەربارەی « مێژوو، ڕەچەڵەکی کورد، ڕێزمان، فەرهەنگ، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، باسی مۆرفۆلۆژیی، فۆنۆلۆژیی و سینتاکس » ، لێکۆڵینەوەی زانستانەیان کردووە. هەر چەندە، هێندێ لەو دید و بۆچوون، باوەڕ و لێکۆڵینەوانە، کەموکوڕییەکی زۆریان تێدا بەدیدەکرێ و لە هەڵە بە دوور نین. ئەو کەموکوڕییانەش، زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لە لایەکەوە، ئەو پسپۆڕە بیانییانە، شارەزاییەکی تەواویان، لە زمان و دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا نەبووە، یا هێندێ چاوساغیان لە نێو کوردا، لەگەڵ بووە، لە زمانی کوردیدا زۆر شارەزا نەبوون. بەڵام، هەر چۆنێبێ، ئەوان پرسیاری خۆیان لێ کردوون و کارەکانی خۆیانیان ڕاپەڕاندووە. جگە لەوەی، هەموو ئەو لێکۆڵینەوانە، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا کراون، ڕۆژبەڕۆژ، زمانی کوردیی پێشکەوتووە و گۆڕاوە، ئەوان لەو پێشکەوتن و گۆڕانکارییانەوە دووربوون، لە نزیکەوە چاودێرییان نەکردووە و تا ڕادەیەکی زۆریش، ئاگادار نەبوون. لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ لەو کادێرە بیانییانە، بە تایبەتیی بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیی نەهاتوون، بەڵکوو بۆ مەبەسێکی ڕامیاریی، ئایینیی یا سیخوڕیی، سەریان لە کوردستان داوە، ماوەیەکی دیاریکراو، لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریی و لە ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستاندا ژیاون. لەبەرئەوە، لە پاڵ کارەکانی خۆیاندا، وەک هۆبییەک، هێندێ کاری مێژوویی و زمانەوانیشیان بە ئەنجامگەیاندووە. بۆیە، لە بواری زمانەوانیدا، پسپۆڕێکی تەواو نەبوون، تا ڕادەیە کەموکوڕیی بە کارەکانیانەوە دیارە. هێندێکی دیکەیان، پلەوپایەیەکی بڵندی ئەکادیمییان هەبووە و تا ئەورۆش، ئەو نرخەیان لە دەس نەداوە. هەر چۆنێبێ، هەموو ئەو مرۆڤە لێهاتووانە، شایانی ئەوەن، ڕێز لە خۆیان و کارەکانیان بگیرێ، چونکە، ڕاژەیەکی گەورەی زمانی

کوردییان کردووە، گەلێ باسی گرنگیان، دەربارەی مێژووی کورد و زمانەکەی پێشکەشکردووە، بە شێوەیە دەتوانم، بڵێم: گەر ئەوان نەبوونایە، ئەورۆ زۆر شتمان بۆ ڕوون نەدەبۆوە و گەلێ شتیشمان دەفەوتا. بە تایبەتیی، سامانی فۆلکلۆری نەتەوەیی کوردیان، گەلێ پەرشوبلاوبووە، ئەوان دەستێکی بالایان، لە کۆکردنەوە و پاراستنیدا هەبووە. لێرەدا، بە پێویستی نازانم، باسی چۆنێتی کاری هەر یەکێ لەو گەرۆک، پسپۆڕ و ڕۆژهەلاتناسە بیانییانە بکەم. چونکە، هێندێ نووسەر و لێکۆلەری کورد، لە بەرهەمەکانی خۆیاندا باسیانکردوون. بەلکوو، بەپێی توانا هەولدەدەین، تەنیا ناوی هێندێکیان، بەگوێرەی مێژووی کارکردنیان، لە بواری زمانی کوردیدا تۆمارکەین و بە خوێنەری کوردیان بناسێنین. وەک ئەمەکدارییەک، هەم یادیانکەینەوە و هەم بە بیری خوێنەریان بێنینەوە. بۆ نموونە: (ماورێزۆ گارزۆنی ـ1787، گ. گیورنالی 1836 ـ 1837، خۆدسکۆی ـ1857، د. ئەرنێست مەکاریۆس ـ 1958، پێتەر لیرخ1857 ـ 1858، فردریک میولەر ـ 1855، 1864، سامۆل رهیا ـ 1872، ڤلاددیمیر فیۆدۆرۆڤیچ مینۆرسکی ـ1877 ، ئەلێکساندەر ژابا ـ 1879، فەرنیناند یوسیت ـ 1880، ئەلبێرت سۆسین ـ 1889، دێ مۆرگان ـ 1904، ئۆسکارمان1901ـ1907، پرۆفیسۆر ماکسیمیلیان بێتنەر ـ 1913، مێجەر سۆن 1913، 1919، فۆسیۆم ـ 1919، ماکاس هۆگۆ ـ 1926، فازەر باول بێدار ـ 1926، جاردین ـ 1929، ئا. خاچاتۆریان ـ 1932، خاچاتۆریان و حاجی جوندی ـ 1935، کارل هادانک ـ 1938، د. مەکەنزی 1961، 1966، تسوکەرمان ـ 1962، ئەولیا چەلەبی ... تا).

لە ناو کوردیشدا، گەلێ نووسەر، شارەزا و پسپۆڕ، لە بواری زمانی کوردییدا کاریانکردووە. زماناناس و زمانزانەکانی کوردیش، هەر یەکە لە جێی خۆیەوە، هەر یەکە لە شوێنێک و لە ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستان، دەسڕەنگینی خۆیان نواندووە، نووکی پێنووسەکەیان تیژکردۆتەوە، هێندەی پێیان کراوە، هێندەی لە توانایانا بووە، دریغییان نەکردووە، چاکی چالاکییان لێ هەلکردووە و دەربارەی « مێژوو و زمانی کوردیی »، گەلێ گەوهەری ووشەی بریسکەداریان کۆکردۆتەوە، ڕستەی

مرواریی بە نرخ و جوانیان لێ هۆنیوەتەوە، سەرەتای بناغەیەکیان بۆ زمانی کوردیی دارشتووە، بە چەپکە گوڵی بۆنخۆشی ڕەنگاوڕەنگ، ئەو باخە جوانەی وێژە و زمانی کوردییان ڕازاندۆتەوە. لەو بوارانەدا نابێ، ناوی چەندین دەسویەنجەی زێڕین و پێنووسی، پڕ بە بڕشتی ڕەنگینی مامۆستا و زانایانی کوردی وەک « شەرەفخانی بەدلیسی، مەلا مەحموودی بایەزیدیی، حوسێن حوزنی موکریانیی، مەلا ڕەشید بەگی بابان، سەعید سدقی بابان، مەلای گەورە، تۆفیق وەهبی، محەمەد ئەمین زەکی، ڕەفیق حیلمی، هەر پێنج بەدرخانییەکان « مقداد، مەدحەت، جەلادەت، ڕەوشەن و کامەران »، پرۆفیسۆر کوردۆییڤ، ئایەتوڵلا مەردۆخی کوردستانیی، جەمال جەلال ، نووری عەلی ئەمین، برایم ئەحمەد، د. جەمال نەبەز، باکاییڤ، مەکسیمۆ خامۆ، ا. ب. هەوریی، تایەر سادق، جگەرخوێن، شێخ محەمەدی خاڵ، عەلادین سوجادیی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی و وەچەکانی، گیوی موکریانیی، پرۆفیسۆر عیسمەت شەریف، د. کەمال فوواد، د. کەمال مەزهەر، د. عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ، د. مارف خەزنەدار، د. نەسرین فەخری، محەمەد ئەمین هەورامانی، د. مارفی حاجی ئەوڕەحمان، د. کامیل بەسیر، د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی، عەمید ئەحمەد حەسەن، د. عەبدوڵلا نەقشبەندیی، کەمال جەلال غەریب، ڕەووف ئالانی و مەسعوود محەمەد ... تاد)مان لە بیرچێ. ئەم کەڵەنووسەرانە، دەربارەی زمانی کوردیی، بیروڕای جیاوازی تایبەتیی خۆیان دەربڕیوە. هەر یەکەشیان، بە گوێرەی توانای خۆیان، ڕاژەی زمانی کوردییان کردووە. هەروەها، بەپێی زانیاریی و بۆچوونی تایبەتیی خۆیان، گەلێ شتی گرنگیان، سەبارەت بە مێژووی لێڵ و تەمومژاویی زمانی کوردیی، دیالێکتەکانی، ڕێزمان، فەرهەنگ، پیتی عەرەبیی و لاتین، ڕێنووسی کوردیی ڕوونکردۆتەوە. هەر چەندە هێندێ جیاوازیی، لە میانەی بیروڕاکاندا دەبینرێ، بەڵام، ئەو جیاوازییانە، بایی هێندە نین، ناکۆکییەکی گەورە لە دید و بۆچوونەکانیاندا دروسکا.

هەروەها، هێندێ دەزگەی کوردیی وەک(کۆڕی زانیاریی کورد و یەکێتی نووسەرانی کورد)، چەن دەزگەیەکی ڕووناکبیریی و پیشەیی دیکەش، لەو

بوارەدا هەنگاوی باشیان ناوە. جگە لەوەی، گەلێ لە نووسەرانی کورد، بە گوتارنووسین لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ناوەوە و دەرەوەی وولاتدا، ئەسپی خۆیان لەو بوارەدا تاوداوە. لەبەرئەوە ناتوانین، بڵێین: زمانەکەمان ڕاژە نەکراوە و گەلێ دواکەتووە، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوی ڕاستییێ، هێشتا هەر لە سەرەتادایین و زۆرمان ماوە. بۆیە پێویستە، خۆمان لەگەڵ زمانەکەماندا، پتر ماندووکەین، تا هەموو کون و کەلەبەرەکانی، بە تەواویی پڕکەینەوە.

گەر تەماشایەکی درەختی خێزانی، زمانە جیاوازەکانی گەلانی جیهان کەین و بمانەوێ، جێگەی زمانی کوردیی، لە نەخشەی زمانەکاندا دیاریکەین، بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ: زمانی کوردیی، یەکێ لە زمانە ئێرانییەکانی سەر بە کۆمەڵی ڕۆژهەلاتیی پێکدێنێ، لە ژێر خانەی خێزانی هیندۆ ـ ئەورووپایی یا ئاریدا پۆلێندەکرێ. ئەم کۆمەڵە ڕۆژهەلاتییەش لە دوو کۆمەڵی دیکە پێکهاتووە :

1. کۆمەڵی هیندیی « بنجابیی، کۆجراتیی، بەهاریی، بەنگالیی، هیندیی ڕۆژاوایی و ڕۆژهەلاتیی، باراکراتیی و ڕاجاسانیی ».

2. کۆمەڵی ئێرانیی « فارسیی کۆن و نوێ، کوردیی، ئەفغانیی،* بلووجیی، شێوەکانی ناوچەی پامێر، ئەسیتیی لە ناوچەی قۆقازی ڕۆژاوا » «16-12،58».

بەگوێرەی ئەو زمانانەی دانیشتووانی بانە ئێرانییەکان پێی دواون، دیاکۆنۆڤ زمانە ئێرانییەکان بە سەر سێ کۆمەڵدا دابەشدەکا :

1. کۆمەڵەی لقی « ئەسکیتیی ـ ئاسیای ناوەڕاست »، یا « کۆمەڵەی ئێرانی ڕۆژهەلات ».

2. کۆمەڵەی لقی « مادەکان ـ پارتیی » یا « ژووررووی ڕۆژاوا ».

3. کۆمەڵەی لقی « خوارووی ڕۆژاوا » کە تەنیا نوێنەری کۆنی ئاشکرا و دۆزراوەی هەمان پارسیی کۆنە.

---

* لە ڕاستیدا، ئەفغانیی زمان نییە، بەڵکوو، ناوی وولات و دەوڵەتەکەیانە. گەلی ئەفغانستان، بە چەن زمانێکی وەک: « پشتۆ، ئۆردۆ، تاژیکیی و ... » دەپەیڤن.

بەڵام، دوو بەشە باسکراوەکەی دوایی کراون بە یەک، بە ناوی « کۆمەڵەی ئێرانی ڕۆژاوا »وە ناو ئەبرێن.)«107،42» بۆیە مامۆستا « زوبێر بیلال » بە سەر دوو دەستەدا دابەشیاندەکا:
1. کۆمەڵی ژووررووی ڕۆژاوا : کۆنترینیان « ماد یا زمانی کتێبی پیرۆزی زەردەشتی ئاڤێستایە »زمانی کوردیش بە زیندووترین وێنەی دەژمێررێ.
2. کۆمەڵی خوارووی ڕۆژاوا : ئەو نووسینە بزماریانەی دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی هەخامەنشییەکان لە هەرێمی فارس. «17،58»
پێش ئەوەی، لە ژمارە و جۆری دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بدوێین، بە پێویستی دەزانم، هێندێ زانیاریی و کورتەیەکی مێژوویی، دەربارەی دیالێکت و پەیدابوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردیی باسکەین. وەنەبێ، هەر لە زمانی کوردیدا، دیالێکتی جۆراوجۆر هەبێ، بەلکوو، لە زۆربەی زۆری زمانەکانی گەلانی جیهاندا، دیالێکتی جۆربەجۆر هەیە. هەر چەندە، ئەم دەرکەوتەیە، گرفتێکی نەتەوەیی، بۆ هێندێ زمان دروسکردووە، بە تایبەتیی، بۆ ئەو نەتەوانەی هێشتا خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیان نین. بەڵام، لە هەمان کاتدا، زۆریی دیالێکت لە زمانێکی دیاریکراودا، هەرگیز بە کەموکوڕیی و خەوش دانانرێ. گوتمان: لە هەموو زمانێکدا، دیالێکتی جیاجیا هەیە. ئەو بوونەش، بە دیاردەیەکی ئاسایی دادەنرێ. کەواتە، گەر لە زمانی نەتەوەکانی دیکەی جیهاندا، بەو شێوەیە دیالێکت هەبێ، هەڵبەتە، لە زمانی کوردیدا بوونی ئەو دیالێکتانە، هەر زۆر بە شتێکی ئاسایی دەژمێررێ. چونکە، گەلێ لەو زمانانە، چ لە لایەن شارەزا و پسپۆڕە بیانییەکان، چ لە لایەن زمانزان و زماننناسە خۆماڵییەکانەوە، ڕاژەیەکی تەواوکراون، بە شێوەیەکی بەردەامیش ڕاژەدەکرێن. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا، هەر لە دەس گرفتی دیالێکت ڕزگاریان نەبووە. هێشتا، هەر جیاوازیی لە نێوان دیالێکتەکاندا، بە شێوەیەکی ئاشکرا دەبینرێ. بۆ نموونە: عەرەبەکان، هەر چەندە، خاوەنی ئایین و پەرتووکێکی پیرۆزی ئاسمانیی وەک قورئانن، بەڵام، هێشتا لە چەن دیالێکتێکی گەورە و پچووک پێکهاتووە. بەو پێیەی زمانی فارسیی، لە زمانی کوردییەوە زۆر نزیکە، گەر سەرنجی لێ بدەین،

دیسانەوە دەبینین: لە چەندین دیالێکت و بەشەدیالێکت دروسبووە. « د. معین » لەو پێشەکییەی بۆ فەرهەنگی « بورهانی قانیع »ی نووسیوە، (پتر لە پەنجا دیالێکتی بژاردووە.)«114، 37-41» هەروەها، گەر باسی زمانە ئەوروپایی یەکانیش بکەین، ئەوا دیسانەوە لە دیالێکتی جۆراوجۆر بێبەش نین. ئەو زمانەی گەلی « سوید » لە ناوچە جیاوازەکانی باکوور، باشوور و ناوەڕاستی وولاتەکەدا پێی دەدوێن، لە ڕووی دیالێکت و فۆنێتیکەوە، هێندێ جیاوازییان هەیە. ئەو ئینگلیزییەی لە ناوچەکانی « بریتانیا »ی وەک: « لەندەن، وێلز و سکۆتلاند » قسەی پێ دەکەن، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. هەروەها، زمانەکانی « ئەڵمانیی، ڕووسیی، فەرەنسیی، ئیتالیی و ... »دیالێتکی جیاوازیان هەیە. کەواتە، سەرەڕای ئەو هەموو پشگوێخستن و دواکەوتوویی یەی نەتەوەی کورد، ئیدی دەبێ، لەوە زیاتر چاوەڕوانی چی دیکە لە زمانی کوردیی بکەین؟!!

لێرەدا، پرسیارێ خۆی دەسەپێنێ، ئەویش ئەوەیە، ئایا، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی چۆن پەیدابوون؟ بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، بەپێی زنجیرەی گۆڕانکارییەکان و لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا باسیانکەین، پەنا بۆ بەر ئەم ڕوونکردنەوەیەی خوارەوە دەبەین.

گەلێ لە شارەزا، ڕۆژهەلاتناس، زمانەوانەکانی کورد و بیانیی، بە شێوەی جیاجیا و جۆراوجۆر، باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردییان کردووە. هێندێکیان لە هۆی پەیدابوونی ئەو دیالێکت و خواردیالێکتانە کۆڵیونەتەوە. هێندێکی دیکەشیان، خۆیان بە پۆلێنکردنی دیالێکتەکانەوە خەریککردووە.

هەر چەندە، دیالێکت و بەشەکانی، لە ئەنجامی چەن هۆیەکی دیاریکراودا پەیدابوون. هێندێ لەو هۆیانە، بە هۆی دەسەلاتی دەوڵەت و ویستی نەتەوەکەوە لەناودەچن. بەلام، هێندێکی دیکەشیان، هەر وا بە ئاسانیی ناسڕێنەوە، بەڵکوو، تا ماوەیەکی درێژی مێژوویش، هەر دەمێنن. بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین، ئەو هۆیانە لە چەند خاڵێکدا چڕکەینەوە :

1. فاکتەری جوگرافیا.
2. داگیرکردن و دابەشکردنی خاکی کوردستان.

3. نەبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی ناسیۆنالی کوردیی.
4. باری دواکەوتووی کۆمەڵایەتیی، فەرهەنگیی و ئابووریی.
بەڵام، بە بڕوای من، لەگەڵ هەموو ئەو باری سەرنجانەشدا، بۆ ئەوەی بە تەواویی، لە پەیدابوون و سەرهەڵدانی دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بگەین، دەبێ، سەرەتا ئاوڕێ لە مێژوو بدەینەوە، سەرێ بە کۆشی ڕووداوەکانی ناوچەکەدا بکەین.
گومانی تێدا نییە، تا ئەو کاتەی، مادەکان دەسەڵاتیان بە سەر ناوچەکەدا دەشکا، ئیمپراتۆریای ماد، وەک زەبەلاحێکی خاوەن دەسەڵات، کەوشەنی سنووری خۆی لە خاکی ئێرانی ئەوڕۆ تێپەڕاندبوو. یەک زمانی یەکگرتووی، بە سەر هەموو ناوچەکانی، ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکەدا سەپاندبوو، زمانەکەش زمانی ئایین و دەوڵەت بوو. لەبەرئەوە، ئەو گەلانەی بە زمانێکی دیکە دەپەیڤین و لە بندەسی مادەکاندا بوون، زمانەکانی خۆیان، تەنیا بۆ ئاخافتن بەکاردێنا.
دوای ئەوەی، ئیمپراتۆریای ماد ڕوخا، کۆرشی گەورەی پارسیی، ئیمپراتۆریای هەخامەنشیی دامەزراند. ئیدی لەو ڕۆژەوە، بارێکی دیکەی نوێ، لە ناوچەکەدا دروسبوو. پێوەندییەکانی نێوخۆی ماد، بە تەواویی گۆڕا، پێوەندییەکانیان لەگەڵ دراوسێکانیاندا، شێوەیەکی دیکەی وەرگرت، یەکێتی نێوان خێڵەکانی ماد شەقوشلۆقبوو. ئەو گۆڕانکارییە، کارێکی یەکجار گەورەی، لە زمانی دەوڵەت و گەلانی دیکەی ناوچەکە کرد.
دیارە، هەخامەنشییەکان دوای ئەوەی، دەسەڵاتیان وەرگرت، زۆربەی زۆری دوژمن و نەیارەکانی خۆیان، پاکتاوکردووە. ئەوانەی لەو ڕەشەکوژییەدا تێداچوون، کۆتاییان پێهاتووە و هەموو شتێکیان لەکیسچووە. ئەوانەی ڕزگاریشیانبووە، هێندێکیان سەری خۆیان کزکردووە و ماونەتەوە، لە ژێر سایەی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکاندا، سەرەگوریسێکیان گرتووە و بە هەر دەردەسەرییە بێ، بۆ خۆیان ژیاون. بەڵام، هێندێکی دیکەیان، ئەو بارودۆخە نوێیەیان پێ هەرس نەکراوە، لەبەرئەوەی، دەسەڵاتیشیان نەبووە، ملی ڕێگەی هەڵاتن و کۆچکردنیان وەبەرگرتووە. ئیدی لەو ڕۆژەوە، ئەو

یەکێتییەی لە نێوان تیرە و هۆزەکانی ماددا بە ئەنجامگەیەندرابوو، لەبەریەک هەڵوەشاتەوە و تێکچووە.
نابێ، ئەوەشمان لە بیرچێ، لە سەرەتادا، هەخامەنشییەکان نەیانتوانیوە، دەس بە سەر هەموو ناوچەکانی ئیمپراتۆریای ماددا بگرن. بەڵکوو، دوای ئەوەی مادەکان، ناوەندی دەسەڵاتیان لەدەسدا، تا ماوەی 100-150 ساڵێکیش، لە هێندێ ناوچەی وڵاتی مادستاندا، چەن میرنشین و دەسەڵاتێکی ناوچەیی ماد هەر مابوو. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، دانیشتووانی ئەو ناوچانە، بە زمانی مادەکان دوابن و پارێزگاریی زمانەکەی خۆیان کردبێ. چونکە، چۆن هەر لە سەرەتاوە، زمانی مادەکان، پتر لە ناوەندی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکەدا، وەک زمانێکی ڕەسمیی جێی خۆی کردۆتەوە و بە تەواویی خۆی سەپاندووە، بە هەمان شێوەش، زمانی هەخامەنشییەکان، لە سەرەتادا هەر وابووە. بەڵام، تا لە مەڵبەندی دەسەڵات دوورکەتبێتەوە، ئەو زمانە، تینوتاوی لە سەر گەلانی دیکە و دانیشتووانی ناوچەکانی، ژێر دەسەڵاتی مادەکان یا هەخامەنشییەکان کەمتربووە. چونکە، هەموو ئەو گەلانە، نیمچە ئازادییەکیان هەبووە و بە زمانی نەتەوەیی خۆیان ئاخافتنیانکردووە.
جگە لەوەی، فاکتەری جوگرافیا، ڕۆڵێکی مەزنی وازیکردووە. سنووری دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکە، گەلێ فراوانبووە. ئەو زمانە نەیتوانیوە، لە هەموو کون و قوژبنێکی وڵاتی ماددا، وەک یەک، جێگەی خۆی بکاتەوە. بۆیە، تا لە مەڵبەندی دەسەلات دوورکەوتایەتەوە، بەپێی دووریی ناوچەکان، زمانەکە وردەوردە، لاوازدەبوو. بە پێچەوانەشەوە، بەرانبەر بەوە، زمانی نەتەوەیی گەلانی ئەو ناوچە دوورانە، بەهێزتردەبوون. لێرەدا دەتوانین، نموونەیەکی زیندوو، لە سەر ڕۆژگاری ئەوڕۆمان بێنینەوە. کارتێکردنی زمانی « عەرەبیی، تورکیی یا فارسیی » لە زمانی کوردیی، لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی مەزندا، وەک یەک نین. دیارە، ئەو ناوچانەی لە عێراقی عەرەبیی، مەڵبەندی دەسەڵاتی تورک و فارسەکانەوە نزیکترن، لە چاو ئەو ناوچانەی، لەو جێگایانەوە دوورن، هەر سێ زمانی « عەرەبیی، تورکیی و فارسیی »، کارێکی یەکجار گەورەتریان، لە زمانی کوردیی

کـردووه. گـەلێ ووشـەی ئەو سێ زمـانە، تێکەڵاوی زمـانی کـوردی، دانیـشـتـووانی ئەو ناوچە کـوردییـانە بوون. بە پێـچـەوانەشـەوە، تا لە مەڵبەندی دەسەلاتی، هەر سێ دەوڵەتەکە دوورکەوینەوە، تا بەرەو قولایی خاکی کوردستـان بڕۆین و بەرەو چیاکـان هەڵکشێین، زمانێکی پوخت و پاراوی کوردیمان گوێ لێ دەبێ.

هەروەها دەتوانین، لە نموونەیەکی دیکەی زیندوودا بڵـێین: ئەو زمـانە کوردییەی ئەورۆ، خەڵکی گوندەکانی کوردستـان پێی دەدوێن، گەلێ لەو زمانە کوردییە خاوێنترە، کە دانیشتووانی شار و شارۆچکەکانی کوردستان قسـەی پێ دەکـەن. چونکە، دەسـەلاتی نەتەوە بالادەسـەکـانی « فـارس، عـەرەب و تورک »، ڕۆڵی دەوڵەتە داگیـرکـەرەکـانی کـوردسـتـان، لەو جـێگایانەدا جـیـاوازییـان هەیە، لە ناوچەکـانی دووەمـدا، پتـر خـۆیان سـەپاندووە. وەک زمـانی دەوڵەت، لە هەمـوو بوارەکـانی ژیانی ڕۆژانەی «ڕامیاریی، کۆمەلایەتیی، فەرهەنگیی و ئابووریی »دا ڕەنگیانداوەتەوە.

ئەم دوو فاکتەرە، فاکتەری ڕوخاندنی ماد و جوگرافیا، کارێکی گەورەی لە پەیدابوونی دیالێکتـەکـانی زمـانی کـوردیی کـردووە. دیارە، دوای ئەوەی مـادەکـان پەرشـوبڵاوبوونەتەوە، هەر تیـرە و هۆزێ، ڕووی لە جـێگەیەکی دیایکراو کـردووە، تا ژیانێکی ئاسـایی بۆ خـۆیان دابینکەن. وولاتی مادەکانیش، بەو گەورەیی و پانوپۆرییە، بەو هەموو بەربەستە جوگرافیایی، لێکدابڕان، ڕیزە چیـای سـەخت، دارسـتـانی چڕوپڕ، سـامـانی ئاوی چەم و ڕووبارەکـانیـیـەوە، کـارێکی وای کـردووە، زۆربەی زۆری ئەو تیـرە و هۆزانەی، بە تەواویی لە یەکدی دوورخـسـتـۆتەوە و بە گـران دەنگیـان بە یەکدی گەیشتووە. لەبەرئەوە، هەر تیرە و هۆزێ، لە ناوچەکەی خۆیدا، بەو زمانە قسەیکردووە، کە لەگەڵ پێویستییەکانی ژیان و گۆڕانکارییەکانی باری سەختی « کـۆمـەلایەتیی، ئابووریی و کـەلتـووریی »نوێی، ناوچەی ژیانی نوێیاندا گونجاوە، تا بەرەبەرە، شێوە زمانێکی تایبەتیی پەیدابووە، کەم تا زۆر، جیاوازییە لە نێوان ئەو شێوە زمانە و زمانە ڕەسەنە کۆنەکەی پێشوویاندا دروسبووە. جا ئیدی، هەر شێوە زمانێ، بەپێی دوور و نزیکیی ناوچەکە، لە هەخامەنشییەکان و گەلانی دیکەی دەوروبەریان، گۆڕانیان بە

سەردا هاتووە و پێشکەوتوون، تا چەن دیالێکتێکی جیاجیایان لێ کەوتۆتەوە. دەبێ، ئەوەشمان لە یاد نەچێ، لەو سەردەمانەدا، پێوەندیی کۆمەلایەتیی، لە نێوان خەلکدا زۆر لاوازبووە. سەرەڕای ئەوەی، باری ڕێگاوبانەکان، زۆر سەرەتایی بوون، هۆکانی هاتوچۆش وەک ئێستە نەبوون، هاتوچۆ لە نێوانیاندا، زۆر کەم و دیاریکراوبووە. ساردوسڕیی و سەختی باری تۆپۆگرافیای کوردستانیش، وای لێ کردوون، کەمتر هاتوچۆبکەن. لەبەرئەوە، هێندێ خێل، هەر بە تەواویی لە یەکدی دابڕاون.
جا گەر، مادەکان بە باپیرە گەورەی کوردی ئەوڕۆ دانێین، زمانی کوردییش، بۆ سەر زمانی مادەکان بگێڕینەوە، ئەوا دەبێ، فاکتەری داگیرکردن و زمانی نەتەوەی خاوەن دەسەلاتیش، لەبەرچاوگرین. ئاشکرایە، تا ئەو کاتەی مادەکان، خۆیان خاوەنی دسەلات بوون، زمانی دەولەت، زمانی مادیی بووە. هیچ جۆرە گرفتێکی چەوسانەوەی نەتەوەیی یان نەبووە، زمانەکەیان لێ قەدەغە نەکراوە، یا زمانێکی دیکەی بیانیی، داشەهارەی خۆی بە سەر داشی زمانەکەیاندا سوار نەکردووە. واتە: زمانی دەولەتێکی داگیرکەر یا زمانی نەتەوەیەکی بالادەس نەبووە، تا کار لە زمانی مادەکان بکا، هەڕەشەی تواندنەوەی لێ بکا. بەلام، کاتێ دەسەلاتی مادەکان لەنێوچوو، دەسەلاتی هەخامەنشییەکان دامەزرا، هەموو شتێ گۆڕاوە. تیرە و هۆزێکی دیکەی ماد، دەستیان بە سەر دەسەلاتدا گرتووە، لەو ڕێیەشەوە زمانەکەی خۆیان بە سەر زمانی ئەو دەستەیەی مادا سەپاندووە. ئیدی بەرەبەرە، ئەو زمانە نوێیە، جێی بە زمانی مادەکان تەنگکردووە، زمانی هەخامەنشییەکان، وەک زمانی دەولەت، خۆی بە سەر زمانی، دانیشتووانی هەموو ناوچەکانی ئیمپراتۆریاکەدا سەپاندووە.
هەمووشمان دەزانین، زمانی دەولەتی داگیرکەر و زمانی نەتەوەی بالادەس، چۆن کار لە زمانی نەتەوەیی گەلانی بندەس دەکا. لەو بارەیەوە، مێژوو چەندین نموونە و بەلگەی لەچاوچەقیومان پێش چاو دەخا. عەرەبەکان، لە ژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا، زمانەکەی خۆیان، بە سەر هەموو گەلانی بندەسیاندا سەپاند. زمانی عەرەبیی، شوێنەواری زمانی نەتەوەیی قیپتییەکانی لە میسر بە تەواویی کوێرکردوەوە. کۆلۆنیالیزمی فەرەنسا، بە

زۆر زمانی فرەنسیی، بە سەر گەلانی « جەزایر، مەغریب و تونس »دا سەپاند. گەر تا ئەورۆ، بە پشتیووانی گەلانی دیکەی عەرەب ڕزگاریان نەبووایە، هەستی نەتەوەیی یان نەبوژایەتەوە، لەو باوەڕەدام، گەلانی ئەو سێ وولاتە، بە زمانی فرەنسیی قسەیاندەکرد، با هەر خۆشیان بە عەرەب بزانیایە! هەمووشمان دەزانین، دوای ئەوەی ئەو سێ گەلە بە سەربەخۆیی گەیشتن، دەولەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزراند، دەولەتە عەرەبییەکان، چ ڕۆلێکی گرنگیان، لە بوژاندنەوەی زمانی عەرەبیی و فێرکردنی ڕۆلەکانیاندا بینیوە. تەنانەت تا ئەورۆش، کارتێکردنی زمانی فرەنسیی، بە ئاشکرا پێیانەوە دیارە و ئێستەش زۆربەی زۆریان، لە نێو خۆشیاندا، هەر بە فرەنسیی قسەدەکەن.

ئەز لەو باوەڕەدام، چۆن لە نێوان « تاکەتاکەی خەلک، تیرە و هۆز، گەل و نەتەوە و دەولەتەکانی جیهان »دا، « چەلەمە، ململانێ، ناخۆشیی و جەنگ » ڕوودەدا، بە هەمان شێوەش، لە نێوان زمانە جۆربەجۆرەکانی گەلانی جیهاندا، ئەو گرفتانە ڕوودەدەن. هەموو ئەو گرفت، تەنگپێهەلچنین، بەربەرەکانیی، ململانێ، ناخۆشیی و جەنگە، هەر لە سەرەتاوە، لە لایەن زمانی نەتەوەی بالادەسەوە دەسپێدەکا، ڕۆژبەڕۆژیش تا دێ، لەگەل فراوانبوونی دەسەلاتی ڕامیاریی و داگیرکردنی وولاتەکەدا، بەرفراوانتر دەبێ. زمانی نەتەوەی بالادەس، بە هەموو شێوەیە هەولدەدا، شوێن بە زمانی نەتەوەی بندەس لەقکا، بە هەر جۆرێبێ، بە سەریدا سەرکەوێ و لەناویبەرێ. لە هەمان کاتیشدا، زمانی نەتەوەی بندەسیش، دژیدەوەسێ، بەرانبەر ئەو داگیرکردن و ململانێیە کۆل نادا، سەردانا نەوێنێ، لە پێناوی مانەوە و ژیاندا، داکۆکیی لە خۆی دەکا، تا لە دەس زۆرداریی نەتەوەی بالادەس و تواندنەوەی زمانەکەی، لە بۆتەی زمانی نەتەوەی داگیرکەردا، خۆی قووتاردەکا.

هەلبەتە، ئەو ناکۆکیی و ململانێیەی نێوان هەر دوو زمانەکەش، بە کارێکی خۆڕسکیی دادەنرێ، لە نێوان زۆربەی زمانەکانی، نەتەوەی بالادەس و بندەسی جیهاندا ڕوویانداوە. بە شێوەیەکی گشتیی، هەموو ناکۆکیی و ململانێکەی نێوان زمانەکان، هەر لە سەرەتای داگیرکردن و

لەدەسـدانی دەوڵەتی نەتەوەیی نەتەوەکانەوە، وردەوردە دەردەکـەوێ. گـەر، تەماشایەکی باری زمانی کوردیی کەین، زۆر بە ئاشکرا، ئەو داگیـرکردنەی پێـوە دیارە. سـەرەتاکـەشی بۆ سـەردەمی ڕوخـاندنی ئـیمـپـڕاتۆریای مـاد دەگـەڕێتـەوە. لەو ڕۆژەشـەوە تا ئەوڕۆ، بە چەندین قـۆناغی جـیـاوازدا تێپەڕبووە. هەروەها، لە سەردەمە جیاجیاکانی دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریاکانی « هەخامـەنشـیی، ئەشکانیی و ساسانیی »، لەگەڵ چەندین زمـانی ئێـرانی کـۆنی وەک « پارسـیی کـۆن، پەهلەویی و پارسـیی »، هەروەها، زمـانی گەلانی نوێی ناوچەکەدا، دەسەویەخەبۆتەوە. گەر زمانی مادیی، کاری لە زمـانی کـوردیی و فـارسـیی ئەوڕۆ کـردبێ، ئەوا ئەو کـارتێکردنە، لە سەردەمێکی دیاریکراودا وەک یەک وابوون. پاشان، کارتێکردنەکە پێبەپێی دەسـەڵاتی ڕامـیـاریی گـۆڕاوە و ئاوەژووبۆتەوە. دیارە، لە سـەردەمی هەخامەنشییەکاندا، زمانی فارسیی کۆن پتر برەویبووە، گەلێ کەڵکی لە زمانی مادەکان وەرگرتووە و کارێکی زۆریشی تێکردووە.

بەڵام، زمـانی کـوردیی وردەوردە، ئەو کـەڵکەی لەدەسـداوە. چونکە، دەسەڵاتی ڕامیـاریی لەکیـسچـووە. لە بری کـارتێکردنی زمـانی مادەکـان، زمـانی فارسیی، کاری لە زمـانی کوردیی کـردووە. ئەو کـارتێـکردنەش، لە هەمـوو ناوچەکـانی کـوردسـتـانـدا، وەک یەک نەبووە. بەڵکوو، وەک لە سەرەتادا گوتمان: بەپێی دوور و نزیکیی ناوچەکان، لە مەڵبەندی دەسەڵات و هێڵی تێکەڵابوونی هەر دوو نەتەوەی داگیرکەر و داگیرکراوەوە گۆڕاوە. بۆ نموونە: گەر کارتێکردنی زمانی پارسیی کۆن، لە زمانی مادەکان، لە هەموو ناوچەکـانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی خـوارووی وڵاتی مـاددا، لەگـەڵ ناوچەکـانی ڕۆژاوا، باکـوور و خـوارووی ڕۆژاوادا بەراوردکـەین، ئەوا بە ئاشکرا، ئەو جـیـاوازییـە دەبینین. لە هەمـوو ناوچەکـانی یەکـەمـدا، کارتێکردنەکە بە شێوەیەکی یەکجار گەورە و کاریگەربووە. ئەو کارتێکردنە بە شێوەیەبووە، هێز و توانای لە زمانی مادیی بڕیوە. وردەوردە، شوێنەواری لەو ناوچانەدا نەمـاوە و زمـانی فـارسـیی جـێـگەی گـرتۆتەوە. کـەچی لە ناوچەکانی دووەمدا دەبینین، ئەو کارتێکردنە زۆر لاوازبووە، زمانی مادیی شـێـوە بوژانەوەیەکی بەخـۆیەوە دیوە، لە دەس ئەو توانەوە، شـێـوانن و

کارتێکردنە ڕزگاریبووە. ئیدی بەو شێوەیە، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، هەر داگیرکەرێ هاتووە، کوردستانی داگیرکردووە، زمانەکەی بەگوێرەی خۆی، کاری لە زمانی کوردیی کردووە. ئەم کارتێکردنەش، لە ڕۆژی ڕوخاندنی مادەوە دەسپێدەکا، هەروا دەڕوا و بەردەوامدەبێ، تا دوا قۆناغی دەسەڵاتی فارسەکان، لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریای ساسانیدا دەپێچرێتەوە، سەردەمێکی نوێ لە کوردستان، ئێران و هەموو ناوچەکەشدا پەیدادەبێ، ئەویش سەردەمی دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریای ئیسلامییە، کە زمانی عەرەبیی، زمانی ڕەسمیی ئایین و ئیمپڕاتۆریاکە بووە.

لە هەموو ئەو قۆناغانەی، کوردستانی پێدا تێپەڕیوە و داگیرکراوە، هەر زمانێکی نەتەوەی داگیرکەر، بە شێوەیە لە شێوەکان، کاری لە زمانی کوردیی کردووە. بەڵام، کاتێ عەرەبەکان هاتن و ناوچەکەیان داگیرکرد، ئەو کارتێکردنە گۆڕا. هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، لە ژێر کارتێکردنی زمانی عەرەبیدا، خۆیان بینییەوە. زمانی کوردیی، وەک لقێ لە لقەکانی زمانە ئێرانییەکان، تا ڕادەیەکی زۆر، لە دەس زمانی فارسیی ڕزگاریبوو.

کورد، لە هەموو سەردەمە جیاوازەکانی مێژوودا، هەوڵی خۆ ڕزگارکردن و سەربەخۆیی داوە. زمانەکەی خۆی لە کارتێکردنی زمانی نەتەوە داگیرکەرەکان پاراستووە. لەبەرئەوە، چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی خوێناویی بەرپاکردووە. هەر چەندە هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەی، لە مێژووی کورددا ڕوویانداوە، لە گۆمی خوێن و فرمێسکدا نقومکراون. بەڵام، هەمیشە کورد توانیویەتی، زمانەکەی خۆی لە تواندنەوە بپارێزێ.

دیارە، هەموو ئەو پەلاماردان و هێرشانەی، « مەغۆل، تەتەر، ڕۆم و یۆنانییەکان »، بۆ سەر ناوچەکە کردوویانە و داگیریانکردووە، هەموو ئەو جەنگە خوێناویانەی، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا، لە نێوان دەسەڵاتدارانی فارس و تورکە عوسمانییەکاندا، لە سەر خاکی کوردستان ڕوویانداوە، پاشان، ئەو ناوچانەیان بۆ ماوەیەکی درێژ داگیرکردووە، کارێکی زۆری لە زمانی کوردیی و دیالێکتەکانی کردووە. بە تایبەتیی، لە کاتێکدا، یۆنانییەکان بە سەرکردایەتیی « ئەسکەندەری مەکەدۆنی »، پەلاماری ئیمپڕاتۆریای هەخامەنشییان دا و داگیریانکرد، گەلێ شت لە

ناوچەکەدا گۆڕا. لە لایەکەوە، زمانی پارسیی کۆن تووشی گرفتێکی تایبەتیی بوو، زمانی دەسەڵاتی بۆ ماوەی پتر لە سەدوپەنجا ساڵ لەدەسدا.
لە لایەکی دیکەوە، یۆنانییەکان زمانی پارسییان قەدەغەکرد، زمانەکەی خۆیان بە سەر دانیشتووانی ناوچەکەدا سەپاند، زۆربەی زۆری نووسراوەکانیشیان سوتاند و لەنێوبرد. بەڵام، تا ڕادەیەک، زمانی هێندێ لە ناوچەکانی ماد بوژایەوە. چونکە، پێوەندیی نێوان مادەکان و یۆنانییەکان خراپ نەبوو، وەک ئەو دەوڵەتەی لە سەردەمی « ئەترۆپات »ی ماددا دامەزرا. (دەوری دەسەڵاتی ئەسکەندەر و جەنەڕاڵەکانی لە سەر خاکی ئیمپراتۆری هەخامەنشیی و کوردستانیش ناتوانێ، لە باری زمانیشەوە کاریگەر نەبووبێ، شارستانێتی یۆنانیی لە ئێرانی ئەو زەمانەدا، بە زۆری کاری لە سەر ژیانی چینی ئەریستۆکرات و دەسەڵاتداران کردووە و تەنانەت پاشایانی ئەشکانیی کە جێگەی دەسەڵاتی یۆنانییان گرتەوە، تا ماوەیەکیش لە ژیانی خۆیان و دەرباردا لاسایی ئەوانیان دەکردەوە و پاشان سەرلەنوێ گەڕانەوە سەر دابودەستووری ئارییایی. بەڵام، ژیانی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ، لە لایەن شارستانێتی یۆنانییەوە، کارێکی ئەوتۆی تێ نەکراوە و لە سەر ڕچەی باووباپیران لای نەداوە و هەر نەشیانتوانیوە لابدەن، چونکە کەرەسە و مایەی ئەم لادانەیان نەبووە، جا کارێکی زمانی یۆنانیی کردوویە لە سەر پێویستییەکانی ژیانی ئەریستۆکراتی بووە، نەک هی خەڵکی ڕەشوڕووت، کە ئەویش بە بادانەوەی پاشایانی ئەشکانیی و گەڕانەوەیان بۆ سەر ڕێوشوێنی باپیران، زۆربەی لە بیرچۆتەوە.)«51،70»
کاتێ ئاینی ئیسلام، لە ناوچەکەدا بە تەواویی بڵاوبۆوە، کارێکی یەکجار گەورەی لە زمانی گەلانی ناوچەکە کرد، چونکە:
یەکەم: زمانی گەلانی ناوچەکە، خۆیان لە بەر مەترسیی هەڕەشەلێکردنی قوتدان و تواندنەوە، لە بۆتەی زمانی ئایینی نوێ و زمانی نەتەوەی داگیرکەری عەرەبدا بینییەوە.
دووەم: زمانی کوردیی، وەک زمانێکی سەربەخۆ، لە دەس کارتێکردنی زمانەکانی دیکەی ئێرانیی قوتاربوو. بە ڕێگەی گۆڕانکارییە تایبەتییەکانی خۆیدا تێپەڕبوو. هەموو دیالێکتەکانی، لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا

گەشەیکرد. چونکە، هەموو زمانەکانی گەلانی ناوچەکە، لە یەکدییەوە نزیکبوون و کاریان لە یەکدی دەکرد. بەڵام، دوای ئەو لێکدابڕانە، هەر زمانەی بە جیا ڕێگەی گۆڕان، گەشەسەندن و پێشکەوتنی خۆی وەبەرگرت.
سێیەم: هەموو ئەو گەلانە، لە زمانی ئایینی نوێ تێ نەدەگەیشتن، ناچاربوون، خۆیان فێری ئەو زمانە نوێیە کەن، تا هەموو پاڕانەوە، نوێژ و خواپەرستییەکیان، بە زمانی عەرەبیی بێ. لەبەرئەوەی خەڵکی کوردستانیش، دواکەوتوو و نەخوێندەواربوون، زۆر بە درەنگ فێری ئەو زمانە دەبوون. بە تایبەتیی، زمانی عەرەبیی لە(فۆنێتیک، گرامەر، ئەلفوبێ، ڕێنووس و شێوەی نووسین)دا، لەگەڵ زمانی کوردیدا، گەلێ جیاوازبوو. بۆیە، سەرەتا کەمەکێکی کەم نەبێ، کە بە پەنجەی دەس دەژمێرران، کەسی دیکە فێری زمانی ئایینی نوێ و نەتەوەی داگیرکەر نەبووە. تەنانەت گەر فێری ئەو زمانەش نەبوونایە، ئەو دەقانەی بۆ خواپەرستیی پێویستبوونایە، بێ ئەوەی لێی تێبگەن، لەبەریاندەکرد و وەک تووتی دووبارەیاندەکردەوە. وەک چۆن ئێستە، منداڵە موسوڵمانە پەنابەرەکان، وانەی ئایین دەخوێنن، هێندێ ئایەتی قورئان لەبەردەکەن، بەڵام لێیان تێ ناگەن!
ئەم بارودۆخە نوێیەش، هەلێکی باشی بۆ زمانی کوردیی ڕەخساند، تا بە پوختیی و پاراوەیی بمێنێتەوە. چونکە، هێندەی زمانی فارسیی، کاری لە زمانی کوردیی دەکرد، هێندە زمانی عەرەبیی کاری تێ نەدەکرد. بۆیە دەتوانین، بڵێین: ئەم دەرکەتەیەش زۆرتر لەو مەڵبەندانەدا دەبینران، کە لە هەر دوو مەڵبەندی دەسەڵاتی فارس و عەرەبەکانەوە دووربوون. یا، بە لانی کەمەوە، بەم شێویەبووە: تا کورد لە فارسەکان دوورکەوتبێتەوە، زمانەکەشی لە کارتێکردنی زمانی فارسیی بە دووربووە، وەک زمانێکی خاوێن و سەربەخۆ حسێبی بۆ کراوە، لە خەسڵەتەکانی زمانی فارسیی، خۆی جیاکردۆتەوە و پاراستووە. جا لێکجیابوونەوە، گۆڕان و گەشەکردنەکەی زمانی کوردیی و دیالێکتەکانیشی، وەک کەمێ لەمەوبەر گوتمان: بەپێی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بووە. لەم قۆناغە نوێیەشدا، مەڵبەندی دیالێکتی ناوەند،(زینوویەتی زیاتربووە و زۆرتر ئامادەیی

هەبووە بۆ گەشەکردن، هەر بۆیەش مەڵبەندەکە پانوبەرینتربووە و خودی لەهجەی ناوەندیش تەشەنەیکردووە و لە سنووری جارانی تێپەڕیوە.) «51،70» کەچی، لە هەمان کاتدا دەبینین، دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردیی، وەک هەر دوو دیالێکتی باکوور و باشوور، بە بەراوردکردن لەگەڵ دیالێکتی ناوچەکانی ناوەندا، گەشەیان نەکردووە و لەو ئاستە پێویستەدا نەبوون.

بە کورتیی و کوردیی دەتوانین، بڵێین: لەم قۆناغە تازەیەدا، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی سەریاندەرهێناوە و گەشەیانکردووە. چونکە زمانی دەسەڵاتی رامیاریی و زمانی ئایین، بۆ ماوەی پتر لە سێ سەدە، هەر زمانی عەرەبیی بووە. ئەم زمانەش لە بنەڕەتدا، لە هەموو رووییەکەوە، لەگەڵ زمانی کوردیی جیاوازبووە. واتە: زمانی عەرەبیی، لە لایەکەوە زمانی ساسانییەکانی لەنێوبرد. لە لایەکی دیکەشەوە، زمانی کوردیی بوژاندەوە. دیارە، مەترسیی زمانی فارسیی، بۆ سەر زمانی کوردیی، هەموو کاتێ لە زمانی عەرەبیی زیاتربووە. چونکە، هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون و ئێستەش هەر نزیکن. کێ دەڵێ، بەپێی ئەو نزیکیی و خزمایەتییەی، لە نێوان هەر دوو زمانی فارسیی و کوردییدا هەبووە و هەیە، گەر زمانی عەرەبیی لێ گەڕایە، وردەوردە، زمانی کوردیی و زمانی فارسیی یەکیان نەدەگرت و لە یەکدیدا نەدەتوانەوە؟!! بەڵام زمانی عەرەبیی، هەرگیز ناتوانێ، ئەو کارە نێگێتیڤە، لە سەر زمانی کوردیی دانێ. چونکە، دوو زمانی جیاوازن، رۆڵەکانی نەتەوەی کورد، خوێندەوار و شارنشینەکانی نەبێ، هەرگیز نە فێری ئەو عەرەبییە دەبن، تا مەترسی بۆ سەر زمانەکەیان هەبێ، نە هێندەش پێویستیان بەو زمانە هەیە، مەگەر هەر هێندە پێویستیان پێی بێ، بەشی ئەوە بکا، ئەرک و فەرمانەکانی، ئایینی ئیسلامی پێ جێبەجێکەن. لەبەرئەوە دەتوانین، بڵێین: زمانی عەرەبیی، زمانی کوردیی لە دەس تواندنەوە لە بۆتەی زمانی فارسیدا رزگارکرد. چونکە، لە قۆناغی سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا، ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبیی، تا چەن پێویستیانبووبێ، بۆ ئەوەی سەرەتا بە زمانی عەرەبیی، « شایەتمان، هێندێ سورەتی کورت، ویرد و ووشە سەرەکییە

ئایین »ییەکانی وەک: «سەلامو عەلەیکم، ئەستەغفیروڵڵا، سوبحانەڵڵا، ئەلحەمدوڵلا، لا ئیلاهە ئیلەڵڵا، ئەڵڵاهو ئەکبەر، ماشەڵڵا، لا حەولە و لا قـوەتە ئیـلا بیـلا، کـول نەفس زائقـەت ئەلمەوت و ... » بە تەواویی بچەسپێنن، هەر هێندە کاریان لە زمانی کوردیی کردووە. پاشان، وردەوردە توانیویانە، لەو ڕێیەوە زمانەکەش بڵاوکەنەوە.
بێگومان، دوای ئەوەی هەر دوو ئیمپڕاتۆریای عوسمانیی و سەفەویی دامەزرا، لە سەر دەسەڵات لە ناوچەکە و لە بەر ئەو ناکۆکییە ئاییینزاییەی لە نێوانیـاندا هەبوو، هەمیـشە، لە ناکـۆکـیی، ملمـلانێ و جـەنگێکی بەردەوامـدابوون. زۆربەی زۆری، ئاگری دۆزەخی ئەو جەنگانەش، هەر لە سەر خاکی کـوردسـتـان هەڵگیرساوە، دواییش بە تەواویی، گـڕەکـەیان خۆشکردووە. هەر کاتێ، دەسەڵاتی لایەکیشیان بە سەر لایەنەکەی دیکە و کوردستاندا زاڵبوویێ، ئەوا زمانی ئەو لایەنەیان، بە سەر ڕۆڵەکانی کورددا سەپێندراوە. جگە لەوەی، کاتێ جەنگی چاڵدێران، لە« 1514 »دا ڕوویدا، بە یارمـەتی تیـرە و هۆزەکـانی سـوننی کـورد، عـوسـمـانیـیـەکـان بە سـەر سەفەوییە شیعەکاندا سەرکەوتن. پاشان، بەپێی پەیماننامەی « زەهاو »، کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد و ڕەنگی سنووری نێوانیان ڕێژرا، ئیدی لەو ڕۆژەوە، کوردستان بە سەر هەر دوو ئیمپڕاتۆریاکەدا دابەشکراوە. بەپێی ئەو دابەشکردن و لێکدابڕانەی خاکی کوردستانیش، نەتەوەی کورد لە یەکـدی داپچـڕاوە، بەشێکی لە ژێر دەسـەڵاتی فـارسـەکـاندا مـاوەتەوە، بەشەکەی دیکەشیان، لە لایەن تورکەکانەوە داگیرکراوون. لە بەر ڕۆشنایی ئەم ڕاسـتـییـانەشدا، بارێکی نوێی نەتەوەیی و ڕامـیـاریی لە کوردسـتـاندا دروسـبـووە. ئەو بارە نـوێیـەش، هێندەی دیکە، جـیـاوازیی نێـوان دیالێکتەکانی، زمانی کوردیی قووڵکردۆتەوە، لە یەکدی دوورخستونەتەوە و لێکیدابڕیوون. ئەوا ئەوڕۆ، ماوەی چوار سەدەی تەواوە، زمانی کوردیی بە هەموو دیالێکتە جۆربەجۆرەکانییەوە، وەک حەزرەتی « سمایل »، لە ژێر زەبری چەقۆی زمانەکانی تورکیی و فارسییدا دەناڵێنێ. بەڵام، تا ئێستە بە هەر شێوەیە بوویێ، خۆی لە بەر زەبری کارتێکردنی زمان و فەرهەنگی، نەتەوە باڵادەسەکانی « فـارس، عـەرەب و تورک »دا ڕاگـرتووە، ئەز لەو

باوەڕەشدام، تا تاکە کوردێ لە کوردستان و جیهاندا مابێ، زمانی کوردهیش هەر دەمێنێ، ڕۆژبەڕۆژیش، پێشدەکەوێ و گەشەدەکا.
ئیدی بەو شێوەیە، دیالێکت و خواردیالێکتەکانی زمانی کوردیی دروسبوون و دامەزران. هەموو ئەو فاکتەرانەی باسمانکردن، زەمینەیەکی لە باریان بۆ لێکداپچڕان، دوورکەوتنەوە و گەشەسەندنی دیالێکتەکانی زمانی کوردیی خۆشکرد، تا ئەم هەمووە دیالێکت و خواردیالێکتەیان لێ کەوتۆتەوە، ئەم زمانە کوردییەی ئەوڕۆمان، بە پاکیی و ڕەوانیی، لە دەس گورگی چاوچنۆکی داگیرکەران قوتاربووە و بۆمان ماوەتەوە. وەک دەڵێن: ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە ژێر گوشاری دوژمنان و داگیرکەراندا، زووزوو باوەڕ و ئایینیی خۆیان گۆڕیوە و بایانداوەتەوە. بەڵام، هەرگیز وازیان لە زمانەکەی خۆیان نەهێناوە!
بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەی، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، بە سەر ناوچەکەدا هات، بارودۆخی نەتەوەی کوردیش، لە هەموو پارچەکانی کوردستان، تا ڕادەیەکی زۆر گۆڕانی بە خۆیەوە بینیی. بە تایبەتیی، لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، دوای جەنگی دووەمی جیهان، دەرفەتێ بۆ کورد دروسبوو، تا کەمێ بە خۆیدا بێتەوە، ئاوڕێ لە زمانەکەی بداتەوە. گەر، بەراوردێ لە نێوان ئەم سەد ساڵەی دواییدا بکەین، دەبینین: زمانی کوردیی ئاخافتن بە گشتیی و نووسین بە تایبەتیی، ڕۆژبەڕۆژ، بەرەو پێشەوە چووە، ئەو جیاوازییە زۆرەی لە کۆندا، لە نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردییشدا دەبینرا، ئەوڕۆ بە شێوەیەکی لەبەرچاو کەمبۆتەوە. چونکە، تا دێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، هەستی نەتەوەیی و هوشیاریی ڕامیارییان پەرەدەسێنێ. تێکەڵاوبوون لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا، لە یەک پارچەدا یا لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا پتردەبێ. هۆکانی هاتوچۆ ئاسانتربووە، گەلێ ڕێگەوبانی هاتوچۆ، لە هەموو بەشەکانی کوردستان دروسکراون. هۆکانی ڕاگەیاندن وەک: « ڕۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ و تێلیڤیزیۆن »، کارێکی زۆر گەورەیان، لە نزیککردنەوەی شێوەکانی زمانی کوردیی کردووە، بە تایبەتیی، لەو ڕۆژەوە، تێلیڤزیۆنی مەد « MED TV »، لە « 1995/5/15 »دا، لە دەرەوەی وڵات دامەزرا، ئیدی

لەو کـاتەوە، کـاری هەزاران دەزگـەی وەک: « خـوێندنگە، ڕێکخـراوی وێژەیی، هونەریی، پیشەیی، ئەکادیمیی و ڕامیاریی » دەکرد. لە بوارەکانی « زمـانفـێربوون، گـەشـەسـەندنی زمـان، کـەمکردنەوەی جیـاوازیی نێـوان دیالێکتـە کـوردییـەکـان »دا، ڕۆڵێکی گـەلێ مـەزنی دەبینی. گـەر بمایە، کارەکانی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەڕێوەببرایە، کادێری شارەزا و پسپۆڕ، لە بواری زمـانەوانیـدا کـاری تێـدا بکردایە، لەو باوەڕەدام، ئەو ئەرکـە نەتەوەیی یەی، بە زیادەوە جێبەجێدەکرد. چونکە، ئەو تێلێڤیزیۆنە، لە بـواری بـوژاندنـەوەی زمـــــانی کـــــوردیی و لێـکدی نـزیکردنـەوەی دیالێکتـەکـانییـەوە، بە « ڕێنیسـانس »ێکی کـوردیی، کۆتایی سـەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیستویەک دادەنرا.

لە کۆتایی سالی «1998 »یشەوە، تێلێڤیزیۆنێکی دیکەی سەرانسەریی ئاسمـانیی «KTV» دامـەزراوە، گـەر بەرنامـەکـانی لە ڕاژەکـردنی زمـان و پاشـەڕۆژی نـەتەوەی کـورددا بێ، ئەوا دەتوانێ، هەمـوو بۆشـایی یەکـان پڕکـاتەوە، لە مـاوەیەکی کـەمـدا، زمـانی کـوردیی، لە دەس گـەلی گـرفـتی جۆربەجۆر ڕزگارکا.

# 3. زمانی کوردیی و دابەشبوونی دیالێکتەکانی :

دوای ئەوەی، کورتەیەکی مێژووییمان، دەربارەی پەیدابوونی دیالێکتەکان پێشکەشکرد، ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، کەمێ لە سەر جۆری ئەو دیالێکتانە بدوێین، بەپێی توانا، پەنجە بۆ جیاوازییەکیانیان ڕاکێشین.
لە بواری دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، گەلێ لە زانا، ڕۆژهەلاتناس، زماناس، زمانزانەکانی کورد و بیانیی کاریانکردووە، بیروڕای جیاوازیان دەربڕیوە. بۆیە، ئەو بابەتە زۆر باسکراوە، پێویست بەوە ناکا، بە درێژیی لێیان بدوێین. بەڵکوو، بە کورتیی باسیان دەکەین. دیارە، هەر نووسەر و شارەزایەکی زمانیش، بیروباوەڕی جیاوازی تایبەتیی خۆی هەبووە، بە شێوەیەکی جیاواز، لەم باسە دواوە. ئەو دید و بۆچوونانەی ئەوانیش، لە باوەڕی شارەزا و پسپۆڕە کوردەکاندا، بە ڕوونی ڕەنگیداوەتەوە.
ئەز پێموایە، شارەزا و پسپۆڕە بیانییەکان، کارێکی زۆریان کردووە، بەڵام، وەک پێشتر گوتمان: مەرج نییە، هەموو کارەکانیان ڕاستبووبێ، هەموویان نیشانی ڕاستییان پێکابێ. لەبەرئەوەی، لە لایەکەوە ئەو کۆمەڵە زانایانە، زۆربەیان خەڵکی بیانیی بوون. سەرەڕای ئەوەی زۆریش کۆشان، بەڵام، بە گیانی زمانەکە، ئاهەنگی ڕاستیی ووشەکان، گوتنیان بە شێوەیەکی دروست، زۆر ئاشنا نەبوون و بە چاکیی سەریان لێ دەر نەکردووە. هەروەها، گەر لە دیالێکتێکی دیاریکراویشیان کۆڵیبێتەوە، لەوانەیە، تەنیا لایەنێکی تایبەتییان گرتبێ و لێی وردبووبنەوە، لایەنەکانی تریان بە لاوەناوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو کادێرە بیانییانە، لە چاو کادێرە کوردەکانی خۆماندا، زۆر شارەزا نەبوون. جگە لەوەی، ئەوڕۆ دەرکەوتووە، هێندێ هەڵەی زانستانە، لە دید و بۆچوونەکانیاندا هەبووە. دیارە، لەو سەردەمانەدا، بە کارێکی ڕاست دانراون. چونکە، هێندێ لەو بیروڕایانە زۆر کۆنن، بە شێوەیە بوون، تەنیا بۆ ئەو سەردەمانە نوێبوون. ئەوڕۆ بیریاوەڕی نوێتر هەیە. جا هەر بۆیە، زۆر جار کارەکانیان ناتەواوبووە، هێندێ جار ڕێیان لە مرۆڤ گۆڕیوە، گەلێ جاریش مرۆڤیان تووشی سەریەشەکردووە. بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا، زۆر گرنگیی بە بیروڕای ئەو

پسپۆڕە بیانییانە نادەین، بە ڕێزێکی بێ ئەندازە و بە سوپاسێکی گەرمەوە، تەنیا ناویاندێنین و پەنجە بۆ هەڵەکانی هێندێکیان ڕادەکێشین. بەڵکوو، ئەوەی لێرەدا، پتر خۆی لە ناو بازنەی لێکۆڵینەوەکەماندا دەبینێتەوە و زۆر بایەخی پێ دەدەین، بیروباوەڕی شارەزا، زمانزان و پسپۆڕەکانی کورد خۆیەتی.
لەگەڵ ئەوەشدا، وەک « د. محەمەد موکریی » دەڵێ: (نکولی لەوە ناکرێ، ڕەوشتی لێکۆڵینەوە و شێوەی کاری ئەوان، ڕەوشتێکی پەسند و بەرزبووە، گەر خەڵکی زمانەکە، ڕەوشتی ئەوانیان ڕەچاوکردایە، ئەو ئەنجامەی وەردەگیرا، هەزاران جار زۆرتردەبوو.)«58،114» ئەو ڕۆژهەلاتناسانە، بە شێوەیەکی گشتیی، کاریان لە سەر هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیی کردووە، گەلێ ڕووی تاریکیان بۆ ڕووناککردووینەتەوە، زۆر زانیاریی بە کەڵکیان بۆ تۆمارکردووین. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێوانەی ئەم سەردەمە، هەر هەڵەیان هەبووە! هەروا بۆ نموونە: « ئەولیا چەلەبی » دەڵێ: (زمانی کوردیی بە سەر پازدە دیالێکتدا دابەشدەکرێ و ئەمانەن:« زازا، لۆلۆ، عونیکی، مەحموودیی، شیروانیی، جزیرەیی، پسانیی، سنجاریی، حەریریی، ئەردەلانیی، سۆرانیی، خالدیی، چەکوانی، عمادیی، ڕۆژکیی.)«318،97» دیارە، « چەلەبی » لە گەشتەکەیدا، لە هەر ناوچەیە لای دابێ، لە هەر گوندێ، پاروویە نانی خواردبێ، گوێی لە جۆرە دەنگ و ئاوازێکی جیاوازی کوردیی بووبێ، ئەو بە دیالێکتێکی سەربەخۆی داناوە، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە بنچینەیەکی زانستانە ڕەچاوکا. لەوەش دەچێ، پتر بەپێی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان دابەشیکردبێ، بۆیە وا، ناوی گوند و شارۆچکەنانی کوردستانی ئەو سەردەمەی ڕیزکردووە!
هەروەها، « مینۆرسکی » لە بارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردییەوە دەڵێ:
(زمانی کوردیی بەشکراوە بە شێوە زمانی زۆرەوە وەکوو:
1. شێوە زمانی خواروو:لە «کرماشان و سەنەندج ... هتد » پێکهاتووە.
2. شێوە زمانی ڕۆژهەلات: زمانی « سلێمانی و سابلاغ ».
3. شێوە زمانی ڕۆژاوایی: ئەمەیان تا ڕادەیەک لە هەموو سەرانسەری کوردستاندا بلاوبۆتەوە.

کوردە ڕۆژهەلاتییەکان و ڕۆژاواییەکانیش، بە زمانەکەیان ئەڵێن: «کورمانجیی». لە سەر ئەوەشە، کەمایەتییەکانی تر بە شێوەزمانی ڕۆژهەلاتیی ئەدوێن. بەلام، لە ڕووی قسەپێکردن و فۆنێتیکەوە، پاکیان پاراستووە. وە لە نیشانەکانی جیاوازیی شێوە زمانی ڕۆژاوایی و ڕۆژهەلاتیدا، ئاوەڵناوی تاکی قسەکەرە وەکوو «من ئەزانم» لە شێوەزمانی ڕۆژهەلاتیدا ئەبێتە «ئەزانم»، لە شێوەزمانی ڕۆژهەلاتیدا ئەم دوو ووشەیە هەر دووکیان ئاشکران، تەنانەت لە لەیەکچوونیشیاندا لەگەڵ سلاڤیدا، کە ئەمانە هەموویان لە یەک ڕەگەزن.)«112، 84 ـ 85»

«مینۆرسکی» لە ساڵی «1915»دا، یەکێ لەو زانا ڕۆژهەلاتناسە ئەکادیمیە بە ناوبانگانەی ڕووس بووە، باسی «جوگرافیا، مێژوو، ڕەگەز، چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ، کەسێتیی کورد، زمان، وێژە، ئایین، خوڕەوشت، ژن و پێوەندی کوردیی بە گەلانی دیکەوە» کردووە. وەک زانایەکی لێهاتوو، سەرەتای لێکۆلینەوەیەکی ئەکادیمیی، بۆ ئەو باسانە داناوە. بەلام، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێندێ لە بیروڕاکانی، ئەوڕۆ بە هەڵە دادەنرێن. جگە لەوەی دابەشکردنەکەی بۆ زمانی کوردیی، ئەوڕۆ بە ڕاست دانانرێ. چونکە، دیالێکتەکانی زمان، لە سەر بنچینەی ناوچەی جوگرافیا دابەش ناکرێن، بەڵکوو، لە بەر ڕۆشنایی جیاوازیی نێوان دیالێکتەکان، لە ڕووی «فۆنێتیک، گرامەر و ووشە لەیەک نەچووەکان»ەوە دیاریدەکرێن.

د. «مارف خەزنەدار»، لە ڕوونکردنەوەیەکدا دەڵێ: (بەشکردنی شێوە زمانەکانی کوردیی، لە سەر بناغەی جوگرافیی شتێکی بڕواپێکراو نییە. چونکە، بەو مەسەلەیە لای نەکردۆتەوە بە لای سروشتی شێوە زمانەکان و پەیوەندییان بە یەکترییەوە. بێگومان. باری جوگرافیی کار ئەکاتە سەر شێوە زمان، بەلام، جیای ناکاتەوە.)«85،112»

هەروەها، «ئەلێکساندەر ژابا»ش، باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردیی کردووە. بەلام، بەپێی خێلە کوردییەکان و جێگەی دانیشتنیان پۆلینیکردووە. ئەمەش، لە زۆر ڕووی زمانەوانییەوە، بە هەڵە دادەنرێ. هەر وەک پڕۆفیسۆر «خەزنەدار» دەڵێ: (ئەوەشی پەیوەندیی بە ژاباوە هەبێ، ئەو لە سەر بناغەی هۆز و ئەو ناوچانەی تیا دائەنیشن جیایکردوونەتەوە،

تەنانەت ئەو ناوچە جوگرافییەکان و شارەکانی بەستووە بەو هۆزانەوە کە تیا دائەنیشن، ئەمەش شتێکە دوورە لە ڕاستییەوە.)«85،112»
هەر چەندە، « مینۆرسکی » ڕاژەیەکی گەورەی، پێشکەش بە نەتەوەی کورد کردووە، لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، زۆر ناوبانگی دەرکردووە. بەڵام، لە ڕاستیدا، لێکۆڵینەوەکەی لە سەر کورد، تەنیا وەک سەرەتایەک بە کەڵکدێ، ئەگینا بە پێوانەی ئەورۆ، زۆر ساکارانە نووسراوە و گەلێ هەڵەی تێدایە. جگە لەوەی، لە هێندێ بواردا، وەک زمان و ئایینی کورد، زۆر لە باسەکانی خۆیدا قووڵ نەبۆتەوە. لەوە دەچێ، ئەو ماوەیەی لە کوردستاندا ژیابێ، بایی هێندە نەبووبێ، بە تەواویی شارەزای هەموو کونوقوژبنەکانی، ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواریی بووبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەو سەردەمە، بە کارێکی گەلێ گرنگ دادەنرێ. هەر چەندە، پێش ئەو سەردەمە و هەر لەو سەردەمانەشدا، هێندێ لێکۆڵینەوەی دیکە کراوە، لە چاو لێکۆڵینەوەکەی « مینۆرسکی »دا، گەلێ دەوڵەمەندتر و بەپێزتربووە. هەروەها، لە زۆربەی شوێنی ئەو بەرهەمەیدا، نووسینەکانی زیاتر لە بیرەوەریی دەچێ، وەک لەوەی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیی بێ!
بە لای منەوە، پسپۆڕ و زانا کوردەکانی خۆمان، گەلێ لەو ڕۆژهەڵاتناس و گەڕۆکە بیانییانە، شارەزاتربوون، هەر بۆ نموونە: زانایەکی وەک « تۆفیق وەهبی »، لەگەڵ ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەدا چۆن بەراورددەکرێ؟! بۆیە، منیش لەگەڵ د. « مارف خەزنەدار »دا دەڵێم :
(کوردەکان خۆیان لێکۆڵینەوەی زۆریان کردووە و خشتەی تایبەتییان ڕێکخستووە بۆ جیاکردنەوەی شێوە زمانەکانی کوردیی و ئەو ناوچانەی تێیا بڵاوبوونەتەوە. خاوەنی شەرەفنامە لە ڕووی شێوە زمانەکانەوە، زمانی گەلی کوردیی کردووە بە چوار شێوە زمانی گەورەوە کە ئەمانەن: کرمانجی، لوڕی، گۆرانی، زازا. هەروەها، زانای کورد تۆفیق وەهبی، ئەم خشتەیەی فراوانکردووە، هەر شێوە زمانێک لەوە شێوە زمانانەی بەشکردووە، بۆ شێوە زمانی پچووکتر و ئەو ناوچانەشی دیاریکردووە کە قسەی پێ ئەکەن. بۆ نموونە شێوە زمانی کرمانجیی ژووروویی کردووە بە دوو بەشەوە، سەروو و خواروو، وە هەر بۆ نموونەش ئەڵێین شێوە زمانی کرمانجیی خواروو لای

تۆفیق وەهبی، لەم ناوچانەدا بلاوبۆتەوە، « هەولێر، سلێمانیی، مهاباد، سنە »، لە کاتێکدا ئەبینین، مینۆرسکی شێوە زمانی سلێمانیی و سابلاغیی کردووە بە ڕۆژهەلاتیی و شێوە زمانی سنەی خستۆتە خواروو، لە ڕاستیشدا خۆی لە شێوە زمانەکانی سلێمانیی و سابلاغە ـ بەلام ژابا شێوە زمانی هۆزەکانی بلباس و زەرزی ئەخاتە ناو شێوەکانی سلێمانیی و سابلاغەوە « موکریی » لە کاتێکدا ئەم دوو شێوە زمانە لە شێوە زمانی کرمانجیی ژووروون)«112، 85 ـ 86».

وا بزانم، ئەم مشتە چکۆلەیەی، لە سەر دید و بۆچوونەکانی « مینۆرسکیی و ژابا » هێنامانەوە، نموونەی خەروارێکی دید و بۆچوونە هەلەکانیان بێ، گەر لەگەل دید و بۆچوونی زانا کوردەکانی خۆماندا، بەراوردیانکەین!

ئێمە لێرەدا، هەولدەدەین، بەپێی باری سەرنجی زانا و شارەزاکانی زمانی کوردیی، دوو شێوە دابەشکردنی جیاواز بۆ دیالێکتەکانی پێش چاوخەین.

1. دابەشکردنی دیالێکتەکان، لە بەر ڕۆشنایی جیاوازییەکانی نێوانیاندا:
ئاشکرایە، زمانی کوردیی، وەک هەموو زمانێکی دیکەی نەتەوەکانی ئەم جیهانە، لە چەند دیالێکتێکی جۆربەجۆر پێکهاتووە. هەر چەندە، هێندێ نووسەر و لێکۆلەر، بە پێنج دیالێکتی جیاوازی دادەنێن، بەلام، لە ڕاستیدا، زۆربەی شارەزایان لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، زمانی کوردیی، لە چوار دیالێکتی سەرەکیی پێکهاتووە.

ئەوەی تا ئێستە پێمانگەیشتووە، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ: یەکەم کەسێ لە ناو کورددا، زمانی کوردیی بە سەر دیالێکتەکانیدا دابەشکردبێ، میر «شەرەفخانی بەدلیسی » بووە. شەرەفخان چوارسەدە لەمەوبەر، لە شاکارە بە نرخەکەیدا « شەرەفنامە »، زمانی کوردیی بە سەر چوار دیالێکتی وەک (کرمانج، لوڕ، کەلهوڕ و گۆراندا دابەشکردووە)«29،62». ئەم دابەشکردنەی « شەرەفخان »، وەک بنچینە و سەرەتایەکی گرنگ وابووە، لە دواییدا، زۆربەی شارەزایانی زمانی کوردیی، کەلکیان لێ وەرگرتووە. « تۆفیق وەهبی »، زمانی کوردیی بە سەر چەند دیالێکت و خواردیالێکتێکدا دابەشدەکا. بە بڕوای « وەهبی »، زمانی کوردیی لەم دیالێکتە سەرەکییانەی خوارەوە پێکهاتووە :

1. کرمانجیی :
A ـ کرمانجیی ژووروو : لەم لقانە پێکهاتووە « بادینانیی، بۆتانیی، ئاشتیانیی، هەکاریی و بایەزیدیی ».
B ـ کرمانجیی خواروو: لقەکانیشی ئەمانەن « موکریی، مهابادیی، سۆرانیی، هەولێریی، سولەیمانیی و کەرکوک، سنەیی و ئەردەلانیی ».
2. لوڕیی :« بەختیاریی، لەک، فەیلیی، کەلهوڕ و مامەسەنیی ».
3. گۆران : « باجەلانیی، کاکەیی، زەنگنەیی، هەورامانیی ».
4. زازایی. «116ـ115،58 »
هەڵبەتە، ئەم دابەشکردنە، تا ئەندازەیەکی زۆر، بۆ ئەو سەردەمە زۆر ڕاستبووە. بەڵام، وا بزانم، ئەوڕۆ هێندێ لەو لقەدیالێکتانە، بە تەواویی لە یەکدی نزیکبوونەتەوە. لەبەرئەوە، ژمارەکانیان کەمدەبنەوە. بۆ نموونە: لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووداد، هەر دوو لقەدیالێکتی « موکریی و مهابادیی » یا لقەدیالێکتەکانی « سولەیمانیی، سولەیمانیی و کەرکوک » و « سنەیی و ئەردەلانیی »، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نەماوە.
« محەمەد ئەمین زەکی » دەڵێ:(شاراوەش نییە، دیالێکتە کوردییەکان چەند بەشێکن: لەوانە بەشی هەرە گەورەیان لە دیالێکتی کرمانجیی پێکهاتووە. بەپێی باوەڕی پەرتووکی « شەرەفنامە »، گەلی کورد بە سەر چوار بەشدا دابەشدەکرێ: کرمانج، لوڕ، کەلهوڕ و گۆران. )«316،97»
مامۆستا « خاڵ »، زمانی کوردیی بە سەر چوار دیالێکتدا دابەشدەکا:
1. زازا.
2. کرمانجیی دەستە چەپ « شمالیی » کە « بۆتانیی » و « بادینانیی » و « هەکاریی » و « بایزیدیی » و « شەمدینانیی »یە.
3. کرمانجیی دەستەڕاست کە « سۆرانیی » و « بابانیی » و «موکریانیی» و « ئەردەلانیی » و « کەلهوڕیی » و « گۆرانی »یە.
4. لوڕیی کە « بەختیاریی » و « لەکیی » و « فەیلی »یە. «26،102»
بەڵام، ئەم دابەشکردنە، زۆر ڕاست نییە. چونکە، جگە لەوەی، « سۆرانیی و بابانیی » ،کاتی خۆی، ناوی دوو میرنشینی گەورەی کوردیی بوون،

یەکەمیان: لە ناوچەی سولەیمانیی و دووەمیشیان: لە ناوچەی ڕەواندوز بوون، ئێستە لقەدیالێکتی سولەیمانی جێیگرتوونەتەوە، هەر دووکیشیان، نزیکەی هەر یەک شتن. « کەلهوڕیی » لە ژێر دیالێکتی لووڕیدا پۆلێندەکرێ و بەشێ لە کرمانجیی دەسەڕاست پێک ناهێنێ. هەروەها، دیالێکتی « گۆرانیی » دیالێکتێکی سەربەخۆیە و بەشێ لە دیالێکتی کرمانجیی دەسەڕاست پێک ناهێنێ.

د. « عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ »، دەڵێ: زمانی کوردیی(چوار دیالێکتی گەورەی هەیە و ئەو دیالێکتانەش چەند لقێکی لێ ئەبێتەوە.)«11،69» هەروەها، د. « جەمال نەبەز »یش، زمانی کوردیی بە سەر دوو شێوەی بنچینەیی(کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەڕاست) و دوو شێوەی لاتەنیشتدا(کرمانجیی ژێروو و کۆمەڵە شێوەی گۆرانیی ـ زازایی) دابەشکردووە، هەر یەکێ لەم دیالێکتانەش، بە سەر چەن زاراوەیەکی تایبەتیدا دابەشدەکاتەوە.«22،23» بەلام، لەساڵی «1957»دا و لە پەرتووکی « خوێندەواری بە زمانی کوردی »، دەبارەی شێوەکانی زمانی کوردیی دەڵێ:(لە کوردیدا چوار شێوەی بنچینەیی هەیە: گۆرانیی و کرمانجیی و لووڕیی و زازایی، کرمانجییش دوو چەشنە: کرمانجیی باکوور و کرمانجیی خواروو، ئەم شێوانەش جیاوازیان لەگەل یەکتر بە جۆرێکە هەندێ جار دوو کورد زۆر بە زەحمەت لە یەک ئەگەن.)«5،26» هەروەها، لە ساڵی « 1976 »دا، واتا دوای نۆزدە ساڵ، بیروڕای خۆی دەگۆڕێ و زمانی کوردیی، بە سەر دوو شێوەی بنچینەیی و دوو شێوەی لاتەنیشتدا دابەشدەکا. هەر چەندە، پاشتر دەڵێ:(مەبەستیشم لەم دابەشکردنە بەم جۆرە، کەمکردنەوەی نرخ و بایەخی ئەو شێوانە نییە کە بە لاتەنیشتیان دادەنێم. بەڵکوو مەبەستم لە شێوە بنچینەیی یەکان ئەو شێوانەیە کە ئەمڕۆ بوونەتە زمانی ئەدەبی و شێوە لاتەنیشتەکانیش ئەوانەن کە دەمێکە ئەو دەورە نابینن.)«21،23» بەلام، لە هەمان کاتدا، ئەم دابەشکردنە لەگەڵ ئەو دابەشکردنەی پێشوودا، جیاوازییەکی گەورەی هەیە. چونکە، لە یەکەمدا، چوار دیالێکت بەدیدەکەین، کرمانجیی باکوور و خوارووی هەر بە یەک دیالێکت داناوە و هەر بەشێکیشیان وەک لقەدیالێکتێ دەردەکەوێ.

کەچی، لە دووەمیاندا، هەر دوو بەشەکرمانجییەکەی، بە دوو دیالێکتی جیاواز داناوە و بە کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نیوەڕاست ناویبردوون. هەروەها، لە دابەشکردنی یەکەمدا، دیالێکتی لووڕیی بەکارهێناوە، کەچی، لە دابەشکردنی دووەمدا، بە دیالێکتی کرمانجیی ژێروو ناوی بردووە و بە سەر چەن لقەدیالێکتێکی دیکەدا دابەشیکردوونەتەوە، کە لە دابەشکردنی یەکەمدا، پەنجەی بۆ دابەشکردنی خواردیالێکتەکان نەبردووە.
پاشان، لە دابەشکردنی یەکەمدا، هەر دوو دیالێکتی گۆرانیی و زازایی لێکەی جیاکردوونەتەوە و بە دوو دیالێکتی سەربەخۆی داناون. کەچی، لە دابەشکردنی دووەمدا، لە ژێر کۆمەڵە شێوەی « گۆرانیی - زازایی »دا پۆلێنیکردوون. دیارە، لە دابەشکردنی یەکەمدا، کەڵکی لە دابەشکردنەکەی شادرەوان « تۆفیق وەهبی » وەرگرتووە، بەڵام، پاشان باوەڕی خۆی گۆڕیوە و دابەشکردنی دووەمی بە لاوە پەسەندتر بووە.
د. « کەمال فوواد » ، لە گوتارێکدا دەربارەی دیالێکت و زمانی نووسین، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، بە سەر چوار جۆردا دابەشکردووە :
(1 . کرمانجیی سەروو 2. کرمانجیی خواروو 3. کوردیی باشووریی 4. گۆرانی و زازا.)«24،89» لێرەدا دەبینین، هەر دوو دیالێکتی « گۆران و زازا »ی، بە یەک دیالێکت داناوە. هەروەها، دیالێکتی گۆرانی، بە سەر چەند لقەدیالێکتێکی وەک(هەورامیی، کەنوڵەیی باجەلانیی، گەهوارەیی)دا دابەشکردووە.«89،د26»
هەڵبەتە، هەر دوو دیالێکتی « گۆران و زازا » ، هەر چەندە، لە ڕووی جوگرافیاوە لە یەکدییەوە دوورن، بەڵام، لە ڕووی سەرەتاکانی زمانەوانییەوە، لە یەکدییەوە نزیکن. بۆیە، هێندێ شارەاز و پسپۆڕ، ئەو دوو دیالێکتە بە یەک دیالێکت دادەنێن. هەر وەک « زوبێحی »یش دەڵێ: (لە مەڵبەندی لەهجەی باکووریی و ناوەندیی زمانی کوردییدا، دوو دوورگەی زمانیی هەن، کە سەرەڕای دووریی لە یەکتر، پیاو بە هاسانیی دەتوانێ بڵێ، لە ئەسڵا یەکن، ئەویش « زازایی »یە لە باکوور و «گۆرانیی»یە لە « ناوەندییدا » ، ئەمەی ئاخریان، زیاتر بە « هەورامیی » ناوی دەرکردووە، چونکە، گەورەترین ناوچەیەکی تێیدا ڕەواجی هەیە

«هەورامــان »ە، بێــجگە لەوەی لە « ڕێژاو » و « کــەنەوولە » و لە ناو عــەشــیــرەتی « باجــەلان » و « زەنگنە » و « شــەبەک » یش قســەی پێ دەکرێ، زازاییش لە « پلوو »، « کۆر » و « چەبەخچوور » لە برەودایە. من لە سەر ئەم دوو بن لەهجەیە، تا ڕادەیەک گەیشتوومەتە هەندێ ئەنجام و گومانم لەوەدا نییە، کە « کوردیی »ن، بەڵام، چونکە لێکۆڵینەوەکەم بە لای خۆشمەوە هێشتا کاڵوکرچە، وازم لەوە هێنا کە لەم سەرەتایەدا بڵاویکەمەوە و هەڵیدەگرم بۆ مەیدانێکی تر.)«55،70»

مامۆستا« مەردۆخ »، زمانی کوردیی بە سەر چوار دیالێکتی سەرەکیدا دابەشدەکا و دەڵێ:(زمانی کوردیی ئەمڕۆ لە چوار شێوە زمان پێکدێ «کرمانج، گۆران، لوڕ، کەلهوڕ » و هەر یەکێ لە مانە بوون بە چەن بەشێکی ترەوە کە شێوەیان لە یەک جیاوازە.)«84،106»

« فوواد حەمە خورشید »، هەورامانیی بە یەکێ لە لقەدیالێکتی گۆران داناوە و دەڵێ: « زاری گۆران دەکرێ بە چوار بەشەوە، گۆرانی ئەسڵی، هەورامانی، باجەڵلانی، زازایی »...) «634-612،75»

« تایەر سادق »، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، بە سێ دیالێکت دادەنێ، {1. زازا. 2. لوڕیی(بەختــیــاریی، لەکــیی، فــەیلیی، ڕۆژبەیانیی). 3.کرمــانجــیی « کــرمــانجــیی ســەروو »(بۆتانیی، بادینانیی، هەکاریی، بایەزیدیی، شەمدینانیی) و « کرمانجیی خواروو »(سۆرانیی، موکریانیی، ئەردەڵانیی، کــەڵهــوڕیی، گــۆرانیی).«92،63» هەر چەندە، ئەم نووسەرە لێرەدا، لە سەر ڕێوشوێنی دابەشکردنەکەی مامۆستا « خاڵ » ڕۆیشتووە. بەڵام، لە ڕاستــیــدا ئەم دابەشکردنە ڕاست نیــیــە، چونکە، لە دیالێکتی لوڕیدا، پەنجەی بۆ « کەڵهوڕ و مامەسەنیی » ڕا نەکێشاوە. لە کرمانجیی سەرووداش، باسی « ئاشتــیــانیی » نەکــردووە، بەڵکوو، « شــەمــدینانیی » زیادکردووە. « کەڵهوڕیی » سەر بە کرمانجیی خواروو نییە، بەڵکوو، سەر بە دیالێکتی « لوڕیی »ە. هەروەها، « گــۆرانیی »ش دیالێکــتــێکی سەربەخۆیە و لە ژێر بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووودا پۆلێن ناکرێ. جگە لەوەی، باسی هێندێ لقــەدیالێکتی وەک « مــهــابادیی، هەولێــریی و سولەیمانیی » نەکردووە.

## 2. دابەشکردنی دیالێکتەکان بەپێی فاکتەری جوگرافیای کوردستان :

هەر وەک چۆن، هێندێ شارەزا و زمانزان، زمانی کوردیی، بەپێی دەستوورەکانی زمان دابەشدەکەن، هەروەها ، هێندێکی دیکە لە شارەزایان، بەپێی سنووری ناوچەی جوگرافیا و ژیانی کورد، زمانی کوردیی دابەشدەکەن. دەتوانین، لێرەدا چەند نمونەیەک بێنینەوە:
« محەمەد ئەمین زەکی » ، دیالێکتەکان بەپێی ناوچە و مەڵبەندەکانی کوردستان، بە سەر دوو دەستەدا دابەشدەکا :
(کرمانجیی ڕۆژهەڵاتیی، ئەم کۆمەڵە لە وڵاتی « موکریان » و لە نێو خێڵەکانی حەوزی دیجلە بڵاوبۆتەوە. واتە، ئەو ناوچەیەی لە نێوان زێی خواروو و ڕووباری ئەدهەم و دامێنەکانی ڕووباری سیروان هەڵکەوتووە. ئەم کۆمەڵە، دیالێکتێکی ڕوون و پاراوە، لە ووشەو و ڕاڤەکردندا زۆر دەوڵەمەندە.
کرمانجیی ڕۆژاوایی، ئەم کۆمەڵە بنەچەی زمانی کرمانجییە ، لەگەڵ هێندێ گۆڕانکاریی ناوچەیی بە سەرداهاتووە. کوردەکانی « دیاربەکر، ماردین، بۆتان، بادینان، هەکاریی، ورمێ، ئەرزڕۆم، مەریوان، ناوچە کوردییەکانی ئەنادۆڵ و هەرێمی خۆراسان ». جگە لە « گرمانجیی باشووری ڕۆژاوا - وەک: دیالێکتەکانی کوردەکانی یەریڤان، بارۆکلیی لە چیاکانی ئارارات، کوردەکانی وڵاتی ئەرزڕۆم و بایەزید، ناوچەی ورمێ، هەکاریی و شەمدینان، ناوچەی بادینان و بۆتان، ناوچەی تورعابدین، ماردین و دیاربەکر و ناوچەی باکووری سووریا » بەم دیالێکتە دەپەیڤن. )«318،97»
پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ » ، بە شێوەیەکی هەڕەمەکیی، ناوچەکانی کوردستانی مەزن، بە سەر دیالێکتەکاندا دابەشدەکا و دەڵێ:(کوردەکانی تورکیا لە دەڤەری دیاربەکر، ماردین، هەکاریی، بەدلیس، موش، وان، ئەرزەڕۆم، دوگسو، بایەزید، ئەرزنجان و خەرپوت، کوردەکانی ئێران لە دەڤەری خۆراسان و دەڤەری ڕۆژاوای گۆلی ورمێ، کوردەکانی عێراق لە دەڤەری موسڵ، ئاکرێ، زاخۆ، ئامێدیی، دهۆک و چیای شەنگار بە کرمانجیی ئاخافتندەکەن. هەروەها ، کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتیش، هەر بە کرمانجیی قسەدەکەن. بەڵام، کوردی دەرسیم بە زازایی دەپەیڤن و زاراوەی

کرمانجیش باش دەزانن. بەڵام، کوردەکانی ئێران لە دەڤەری مهاباد، سەقز، بۆکان، بانە، سنە، کوردەکانی عێراق لە ڕەواندز، هەولێر، سولەیمانی، کەرکووک و ئەو ناوانە بە زاراوەی سۆرانیی دەئاختن..)«36ـ35،81»
بەپێی سنووری جوگرافیا و ڕامیاریی، « زوبێر بیلال ئیسماعیل » ئەو کۆمەڵە دیالێکتە، بە سەر دوو دەستەدا دابەشدەکا :
1. کۆمەڵی ژووروو « کرمانجیی »: کوردەکانی تورکیا، جگە لە کوردەکانی دەرسیم، کە بە زازایی دەدوێن، پارێزگای دهۆک، ناوچە کوردییەکانی موسڵ و بەشێ لە ئێران و کوردی سووریا پێی دەدوێن.
2. کۆمەڵی خواروو ـ ژێروو « سۆرانیی »: کوردەکانی خوارووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەولێر، سولەیمانی، کەرکوک، کوردستانی ئێران پێی دەدوێن.
«117 ـ 116،58»
« هەورامانی »، دیالێکتەکان، بە سەر سێ دەستەدا دابەشدەکا:
(1. شێوەی کرمانجیی ژووروو یا سەروو، کە ئێستا حاڵی حازر و بە شێوەی هەڵە ـ هەڵەیەکی باو ـ نێوی بادینانی وەرگرتووە.
2. شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست، کە بە شێوەیەکی هەڵە زاراوەی «سۆرانی» ووەرگرتووە.
3. شێوەی کرمانجیی خواروو، یاخود بە شێوەیەکی هەڵە « گۆران »ی پێ دەڵێن.
ناوچەکانی: دیاربەکر و بەدلیس و ماردین و بۆتان و حەکاریی و ئاکرە و شێخان و پارێزگای دهۆک سەرپاکی بە زمانی کوردیی بادینانیی گفتوگۆدەکەن. ناوچەکانی موکریان و سۆران و پارێزگای سلێمانیی و کەرکووک بە زمانی کوردیی « سۆرانیی » گفتوگۆدەکەن. ناوچەی هەڵەبجە و هەورامانی عێراق و هەورامانی ئێران و لە نێوان کرماشان و سنە و پێنجوین بەرەو خواروو« کوردستانی خواروو »بە زمانی کوردیی «گۆران» گفتوگۆدەکەن.
دیارە هەر یەکێ لەو شێوانە، وەچەدیالێکتی کەی لێ دەبێتەوە، بە نیسبەت زاری « گۆران »ەوە دەتوانین، بیکەین بە چەند وەچەزارێکی کەوە: هەورامانیی، لوریی، باجەلانیی، زازایی.

زاری هەورامانیی، خەڵکی ناوچەکانی هەورامان کە کەوتۆتە سەرووی ئاوی سیروانەوە، لای ڕۆژاوای: هێڵی نێوان هەڵەبجە پێنجوینەوە، لای ڕۆژهەڵاتی: « سنە و کرماشان »ەوە گفتوگۆی پێ دەکەن. زاری لوڕیی ناوچەی لوڕستانی گەورە و پچووکی گرتۆتەوە، واتە: ڕێگەی خانەقین کرماشان کەوتۆتە لای سەروویەوە و خوارووەکەشی بە درێژایی خاکی کوردستان درێژبۆتەوە. زاری « زازا » کەتۆتە ناوچەی دەرسیم، کە کەوتۆتە نێوان دوو لقە ڕووباری مرادسوو و فوراتسوو تاوەکوو جێگەی بە یەکگەیشتنیان لە خوارووی شاخی « شیرداخ »ەوە.
زاری باجەلانیی، زەنگنە و شەبەک دەگرێتەوە، لە لای ڕۆژهەڵاتی مووسڵەوە لە شارەکانی بازوایەوە درێژبووەتەوە و پرژوبڵاوبوونەوە بەرەو خوارو ژوورووی ناوچەی حەمدانیە، تا دەگاتە ناوچەی تاڵەبان و زەنگەنە بەرەو قۆرەتوو و هۆرێن و شێخان.)«100،68 ـ 69» بە باوەڕی من، ئەم دابەشکردنەی « هەورامانیی » ڕاست نییە. چونکە، لە لایەکەوە دیالێکتەکانی بە سێ دیالێکت داناوە، لە کاتێکدا زۆربەی زۆری شارەزایانی زمانی کوردیی، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، زمانی کوردیی لە چوار دیالێکت پێکهاتووە. لە لایەکی دیکەشەوە، ڕیزکردنی دیالێکت و بەشەدیالێکتەکان، لە جێگەی خۆیدا نییە، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ. چونکە، هەموو جۆرەکانی لە ژێر ناوی کرمانجیدا نووسیوە. هەروەها، کرمانجیی نێوەڕاست و خوارووی بە دوو دیالێکتی جیاواز داناوە، کە لە ڕاستیدا، هەر دووکیان هەر یەک واتایان هەیە، دوو ناوی جیاوازن و بۆ یەک مەبەست بەکاردێنرێن. لێرەدا دەمەوێ، شتێ ڕوونکەمەوە، ئەویش ئەوەیە، بۆ سنووری جوگرافیای دیالێکتەکان، هەر نووسەرێ بە ئارەزووی خۆی، زاراوەیەکی دیاریکراو بەکاردێنێ. زۆربەی کوردەکانی ڕۆژهەڵات، لە فارسەکانەوە فێربوون، زاراوەی « شمال »ی عەرەبیی بەکاردێنن. بەڵام، لە زمانی کوردیدا، « ژووروو، سەروو و باکوور » هەر یەک واتایان هەیە. هەروەها، « نێوەڕاست، ناوەڕاست، ناوەندیی، نێوەندیی »، هەر یەک شتە و « وسط »ی عەرەبیی دەگرێتەوە. « ژێروو، خواروو و باشوور »یش بە واتای « جنوب » دێ.

باوەڕ ناکەم، دیالێکتی گۆران بە کرمانجیی خوارووا دابنرێ. بەڵکوو، خۆی بۆ خۆی بە دیالێکتێکی سەربەخۆ دەژمێررێ و کرمانجیی خواروو یا نێوەڕاست شتێکی دیکەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، دیالێکتی گۆرانی بە سەر چەن بەشەدیالێکتێکدا دابەشکردووە، لە ڕاستیدا، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە، « لوڕیی و زازا »ی بە بەشەدیالێکتی گۆران داناوە، لە کاتێکدا، هەر دووکیان بە دوو دیالێکتی سەربەخۆ دادەنرێن، هەروەها، بە هیچ شێوەیە، باسی هەر دوو بەشەدیالێکتی « کاکەیی و زەنگەنەیی » نەکردووە. جگە لەوەی، گەر بەگوێرەی دابەشکردنی فاکتەری جوگرافیاش، سەرنجێ لە بۆچونەکانی بدەین، ئەوا دەبینین: لوڕیی، زازایی و هەورامانیی، هەر یەکەیان لە ناوچەیەکی دوور لە یەکدییەوە هەڵکەوتوون، وەک خۆی لە باسەکەیدا، ئاماژەی بۆ کردوون. هەروەها، دەڵێ:
(زاری باجەلان، زەنگنە و شەبەک دەگرێتەوە)«69،100» ئەوە لە کاتێکدا، « باجەلانیی و زەنگنە »، هەر دووکیان بە دوو بەشەدیالێکتی گۆران دەژمێررێن، نەک زەنگنە بە یەکێ لە خوار بەشەدیالێکتی باجەلانیی دابنرێ. هەروەها، « شەبەک »یش زۆر لە هەورامییەوە نزیکە و دەتوانین، بە بەشەدیالێکتێکی گۆرانی دابنێین.
لێرەدا، زۆر جێی خۆیەتی، گەر بەپێی ئەو ناوچانەی کوردی تێدا دەژی، نەخشەی دیالێکتەکان دیاریکەین. هەڵبەتە، ئەو کوردانەی بە بەشەدیالێکتی هەورامیی دەپەیڤن، لە چاو ئەو کوردانەی بە بەشەدیالێکتەکانی وەک « باجەلانیی، کاکەیی و زەنگنەیی » دەدوێن، گەلێ زۆرترن. هەر بۆیە، ئەم دیالێکتە هێندێ جار بە دیالێکتی هەورامیی ناوی ڕۆیشتووە. هۆکەشی ئەوەیە، خەڵکێکی زۆر، بەڵام، پەرشوبڵاو لە ناوچەیەکی گەورە و پانوبەریندا قسەی پێ دەکەن. چونکە، فاکتەری جوگرافیا و تۆپۆگرافیای زەوی ناوچەکە، کارێکی وای کردووە، تا بەو شێوەیە لە یەکدی دابڕێن. بە شێوەیەکی گشتیی، ناوچەکانی هەورامانی «لهۆن، دزڵی، تەخت، جوانڕۆ، کەندۆڵە و ... »، بە ناوچەیەکی زۆر سەخت و شاخاویی دادەنرێن. لووتکەی چیاکان گەلێ تیژ و بەرزن، دەڵێی شەڕ لەگەڵ ئاسماندا دەکەن. ڕێگەکان پێچاوپێچ و بە تاشەبەردی گەورە

دەورەدراون، ژمارەیەکی زۆر ئەشکەوتی لێیە، چەندین جۆر گیانلەبەر و درندەی کێویی لێ دەژی، بە دەیان چەمی گەورە و گچکە، دۆڵی قووڵ و مەندی پڕ لە چاڵوچۆڵی تێدایە، بە دارستانی چڕ و داری بەردار ڕازاوەتەوە. بە کورتیی، بووکی « هەورامان » هێندە جوانە، هەر دەڵێی یەزدانی گەورە، بەهەشتەکەی خۆی، لەو بستۆکەی کوردستاندا دروسکردووە، ناوچەکە هێندە سەخت و چڕوپڕە، کەم کەس دەتوانێ، بە ئاسانیی شارەزایبێ.

مەگەر هەر بلیمەتێکی وەک « گۆران » توانیبێتی، بە کامێرای چاوی تیژی، وێنەیەکی فۆتۆگرافیی « هەورامان »ی بۆ گرتبێ، کاتێ دەڵێ :

کۆمەڵە شاخێک سەخت و گەردنکەش،
ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش،
سەرپۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی،
بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کپی ...
جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیس ماو :
هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو.
هاواروهاژەی کەفچەڕێنی چەم
بۆ تەنیایی شەو لایەلایەی خەم!
توولەڕێی باریک، توونا وتوون پشکن
ڕێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێ بن ...
ناو ڕێگا تەقتەق، لاڕێ بەردی زل
کە هێشتا گەردوون پێی نەداوە تل!
گا سەرەوژوورە، گا سەرەوخوارە
تاڵی و شیرینیی دنیای ڕێبوارە! ... «46، 127-128»

لەبەرئەوە، لە لایەکەوە دانیشتووانی ئەو ناوچانە، دوور لە یەکدیەوە دەژین و بەو ناوچانەدا بڵاوبوونەتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم بەشەدیالێکتەی هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، بە باشترین شێوە پاراستووە و بە خاوێنی ماوەتەوە. بۆیە، هۆنەرێکی وەک « قانع » گوتوویەتی:

کتێبی زەدەشت، کە ئاوێستایە

وەک باقی کتێب خەلاتی خوایە
بە زمان هەورامی هاتە سەر بەشەر
یانێ های زەردەشت بووی بە پێغەمبەر
تا دەورەی خۆی بوو، وەک باقی دینان
بەلام نەسخ بوو، ئەویش بە قورئان
« ماریفەت » و « پیر » وتەی شالیارە
کە بە « پیرشالیار » لە گشت دیارە
شاخی هەورامان هەرچەندە ڕەنجەڕۆم
زۆر چاک بزانە کە مەمنوونی تۆم
چونکە پاراستت تۆ ئەو زمانە
تێکەڵت نەکرد، لەگەڵ بێگانە
نە ڕۆم، نە عەجەم، نە تورکی تاتار
نە ڕووس، نە ژاپۆن، نە دەس ئیستیعمار
نەهاتنە ناووت، سەربەخۆ ژیای
بۆ لاوەکانت، تۆ پشت و پەنای
ئێستە نازانم، بۆچی بێ ڕەنگی؟
دووریێ لە گیانت، بۆچی دڵتەنگی؟ «402،77 »

لەبەرئەوە، گەر نەخشەی کۆنی ناوچەکانی هەورامان، بەپێی ئەو ناوانەی، هەر یەکێ لەو ناوچانە هەیانبووە، دەسنیشانکەین، دەبینین، بەم جۆرەی خوارەوە دابەشکراوە :

1 . هەورامانی عێراق : کە بەشێکە لە هەورامانی لهۆن و ئەم دێیانە دەگرێتەوە. بیارە، تەوێڵە، بەڵخەی خواروو، بەڵخەی سەروو، سۆسەکان، پالانیان، هاوار، تاوێرە، دەرەقەیسەر، خەریانی، هانەنەوتی، نارنجلە، گولپ، دەرگاشێخان، سەرگەت، هانەودنی، دەرەومەڕێ، ئەحماوا، زەڵم، گەچینە، باخەکۆن، خارگیلان، بنجە و دڕەی.

2. هەورامانی لهۆنی ئێران: نەوسوود، هانەگەرمەڵە، کەیمنە بێدرواز، تەشار، شەڕەکان، ڕەزلیە، نۆدشە، نەروێ، دەرەوهەجیجیا، هەجیج، ئەسپەڕێز، داریان، وڕا، کەمەدەرە، دەریبەر، هێروێ، بەلەبزان، سشە،

گراڵە، خانەگا، پاوە، نوریاو، دووریسان، دەرەبەیان، بندەرە، نۆسە.
3. هەورامــانــی دزڵی: دزڵـی، دەرەوکێ، بارامـاوا، قــەڵاگــا، قــەڵاجی، دەمەیەوە، زەلکە، دەرەناجی.
4. هەورامان و تەختی هەورامان : « شار »، ڕووەوەرێ، کەماڵا، وەیسیا، بڵـبـەر، سـەروپیـری « پیرشـالیـار »، سلێنە، کراویەدۆڵە، کەلجی، نوێن، ناوە.
5. هەورامـانـی ڕەزاو: ڕەزاو، کـەڕاوا، سـەولاوا، دووڕووە، ژیوار، ڕووار، دەڵ، دەڵەمەرز، کوردەکا، سەروماڵ، گاڵیاوا، سوورەتفێ، دەگاگا، مازیبن، بۆریدەر، بەرقـوڕو، وێژەنـان، چەشــمـیـدەر، نەسـەنار، ئارنان، پایگەلان، نگڵ، میـانە، تفڵیـە، ئەحەمدئاوا، مـەحموودئاوا، نازاوا، تخان، هەنجمنە، هەزارخـانی، گـڵـیـە، بێـدەرە، سوورکەوڵ، نزلژان، بێـسـران، ئەوێهـەنـک، پاڵنگان، کەنوولە « وا لە میانەی کرماشان و سنە ـ ڕێگەی هەمەدان ـ لەو لای « سـونگوڕ »ەوە. نزیکەی سـەد کم، لە ڕێگەی تاقـەوسانەوە دوورە.) «70 ـ 69،100»
« زوبێـحی »، بەپێی مەڵبەندی دەسەلات و فەرمانڕەوایی، زمانی کـوردیی لە ڕووی شێوەی قسەکردنەوە، بە سەر سێ ناوچەی جیاوازدا دابەشدەکا:
1. لە کەناری ڕۆژاوای گۆلی ورمێرا، دەق لەو شوێنەرا کە ناوچەی « دزەی دۆڵـی » و « سندووس » لێک جـیــادەبنەوە، بە خـەیاڵ خــەتێک دەس پێـدەکـەین و بە پشت « شنۆ »یەیدا تێـدەپەڕێنین و دەیهـێنینە باکـووری «ڕەواندز »ێ و هەروا بەرەو ڕۆژاوا تا دەگـاتە « ئاکـرێ » و « دهۆک » و «زاخـۆ » و « شـەنگار » و بە نێـوان « قـامـیشلیی » و « حـەسـەکـە »دا دەربازی دەکەین بۆ جنوبی « دەرباسییـە »، « راس العین » و دەیگـەیەنینە «عفرین » و « چیای کورمانجا ».
2. هەروەها، بە خـەیاڵ خـەتێک لە مـەڵبـەندی ڕۆژاوای « هەمـەدان »ەوە هەڵدەگرین و بە باکووری مـەڵبـەندی « کرمـاشـان »دا دەربازی دەکـەین تا دەگاتە ڕووباری « دجلە ». ئەم دوو خەتە خەیاڵییە هەموو ئەو مەڵبەندەی بە زمـانـی کـوردیی قـســەی تێـدا دەکـرێ، دەکـاتە سێ بەش، کـە لـە هەر بەشەیاندا لەهجەیەکی سەرەکیی زمانی کوردیی زاڵە :

1/ لەهجەی باکووریی ـ دەکەوێتە باکووری خەتی یەکەم، ئەو بن لەهجانەی تێدا بەدیدەکرێ: هەرکیی،شکاکیی، جەلالیی « بایەزیدیی »، هەکاریی، بۆتیی، جزیریی، عفرینی، دومبلی، بادینی ...
2/ لەهجەی ناوەندیی ـ دەکەوێتە جنوبی خەتی یەکەم و باکووری خەتی دووەم و بە غەلەتێکی مەشهوور پێی دەڵێن لەهجەی سۆرانیی، کە ئەوەی ڕاست بێ « سۆرانیی » بن لەهجەیەکی لەهجەی ناوەندییە. لەم مەڵبەندەدا ئەو بن لەهجانە هەن : موکریانیی، سۆرانیی، سولەیمانیی، شوانیی، جافیی، سنەیی، گەڕووسیی، ...
3/ لەهجەی جنوبیی ـ لە جنوبی خەتی دووەم لەهجەی جنوبیی زمانی کوردیی زاڵە، کە ئەم بن لەهجانەی تێدا بەدیدەکرێ: کرماشانیی، کەڵووریی، کولیایی، پیرەوەندیی، لەکیی، لوڕیی، ... «41،70 ـ 42»
ئەم دابەشکردنەی « زوبێحی »، لەگەڵ دابەشکردنەکەی « هەورامانیی » دا، هێندێ جیاوازییان هەیە. « لەهجەی جنوب »یی، واتا دیالێکتی کرمانجیی خواروو، ئەو نموونانەی بۆ بندیالێکت هێناوێتییەوە، وەک «کرماشانیی، کەڵووڕیی، کولیایی، پیرەوەندیی، لەکیی و لوڕیی ... » هەموویان یەک دیالێکتی سەربەخۆ پێکدێنن و بە دیالێکتی « لوڕیی » ناودەبرێن. بەڵام، ئەوانی دیکە بە خواردیالێکت دەژمێررێن. بەڵام، «زوبێحی » دەربارەی دیالێکتی « زازایی »، بەشەدیالێکتی « شەبەکیی و هەورامانیی» هیچی باس نەکردووە، کە کەمێ پێشتر لێی دواین.
جگە لەوەی، لە بارەی دیالێکتی « لوڕیی »یەوە دەڵێ:(« لوڕیی » دەکەوێتە بەشی هەرە خوارووی مەڵبەندی زمانی کوردیی، دەربارەی ئەم بن لەهجەیە، هەر کەسەی هاتووە قسەیەکیکردووە. شەرەفخانی بتلیسی لە «شەرەفنامە »دا بە یەکێک لە چوار لەهجەی گەورەی زمانی کوردیی دادەنێ، هێندێک زانا و ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنگیی و ئێرانیی بە لەهجەیەکی زمانی فارسییان داوەتە قەڵەم.)«41،70 ـ 42»
دیارە، فارسەکان نەک هەر دیالێکتی لوڕیی بە فارسیی دەزانن، بەڵکوو، تەنانەت زمانی کوردیش، بە هەموو دیالێکتەکانییەوە، بە یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی فارسیی دادەنێن. بۆیە، یەکێکی وەک د. « معین »

دەڵێ: (لوڕیی لە لوڕستان، ئەویش گەلێ بندیالێکت دەگرێتەوە، لەگەڵ «بەختیاریی »دا خزمایەتیی هەیە.)«39،114» هەروەها، دەڵێ: (کۆمەڵێ « نیوەزمان » هەن، پێیان دەڵێن: دیالێکتی ئێرانیی، زۆربەی دیالێکتە ئێرانییەکان تا ئێستا، لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا ماون و قسەیان پێ دەکرێ، هۆی مانەوەی ئەم دیالێکتانە ئەوەیە، ئەوانەی پێیان دەدوێن، زۆرریان بە دڵە، لەگەڵ خەڵکی شارەکان و خوێندەوارەکانی فارسیشدا، لە تێکەڵاوبوونەوە دوورن، هەستان و دانیشتنیان نییە.)«37،114».
لە بەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ئاغای « معین »دا، « زوبێحی » دەڵێ: (کەوابوو لوڕیی و بەختیاریی پێکەوە خزمن و نیوەزمانی ئێرانین و خەڵکیش قسەیان پێ دەکەن، چونکە فارسیی نازانن، ئەمە پێمان دەڵێ: کە ئەم نیوەزمانانە فارسیی نین، جا کە « بەختیاریی » فارسیی نەبێ و خزمی « لوڕیی »ش بێ ـ بە شایەدیی زانایەکی بە ناوبانگی (فارس) ـ «لوڕی »ش خۆی کورد بێ، هیچ ڕێگەیەک نامێنێتەوە کە بە شێوەیەکی دوور لە زانست یا بۆ مەبەستێ کە هیچ پێوەندیی بە سەر زانستەوە نییە، زمانی « بەختیاریی » لە کوردیی دابپچڕن.)«44،70»
لە ڕاستیدا، لە بەر ئەو نزیکیی و لێکچوونەی، لە هێندێ بواردا لە نێوان دیالێکتی لوڕیی و زمانی فارسیدا هەیە، زۆربەی گەڕۆک و ڕۆژهەڵاتناسەکانی بیانییش، لوڕەکان خۆیان بە بەشێ یا بە خێڵێکی گەورەی فارس و دیالێکتەکەشیان بە بەشێ لە زمانی فارسیی داناوە.
بەڵام، ئەو ڕۆژهەڵاتناسە بیانییانە وەنەبێ، ئەم بۆچوونەیان لە بەر ڕۆشنایی توێژینەوەیەکی زمانەوانییدا کردبێ، بەڵکوو، زیاتر هۆکەی ئەوەیە، بە تەواویی لە زمانەکە نەگەیشتوون، کاتێ گوێشیان لە خەڵکی ناوچەکانی هەر دوو لاشیان بووە، لە بەر ئەو نزیکییەی لە فۆنێتیکی نێوان لوڕیی و فارسیدا هەیە، وایان زانیوە، هەر یەک زمانە، یا بە هۆی دیالێکتەوە، کەمێ لە یەکدییەوە دوورن.
بۆیە، ئەز دەڵێم: ئەو شارەزا بیانییانە، بە تەواویی، لە هەر دووکیان قووڵ نەبوونەتەوە، لێکۆڵینەوەی وردیان لە سەر نەکردوون و هەر دووکیان بەراورد نەکردوون. ئەگینا، لە ڕاستیدا دوو زمانی جیاوازن.

دەربارەی زمانی کوردیی و دیالێکتی لوڕیی، پێوەندیی ئەو دیالێکتە بە زمانی فارسییەوە، مامۆستا « مەردۆخی » دەڵێ: (لەهجەی لوڕیی نزیکترین لەهجەی کوردییە لە زمانی پەهلەوییەوە لە پاش ئەویش لەهجەی کەڵهوڕیی ئەمجا « گۆران، هەورامیی، گێلیی، کرمانجیی » دێ. لەبەرئەوەی، گۆران و کرمانج نزیک و دراوسێی کلدان و ئاشووریی بوون، زمانەکەیان زۆر لە یەکەوە نزیکن. زۆربەی ووشەیان لە یەک ئەچێ، هەندێ لە مێژوونووسەکان، ڕایان وایە، کە زمانی کوردیی لەهجەیەکە لە زمانی فارسیی.)«86،106»

لوڕەکان، لە چوار بەش پێکهاتوون:« لوڕی پچووک ـ فەیلیی، ماماسانیی، کوەگلۆیی و بەختیاریی یا لوڕی گەورە. » ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان، کوردێکی فەیلی دیبێ، دەزانێ، بە چ زمانێ قسەدەکا. لەبەرئەوە پێویست ناکا، لەوە زیاتر لە سەر ئەم بەشەیان بڕۆین. « ئەمین زەکی »دەڵێ:(جیاوازیی نێوان دیالێکتی کرمانجیی ڕۆژهەلات و دیالێکتی لوڕی فەیلیی، لە جیاوازیی نێوان هەر دوو دیالێکتی ڕۆژهەلاتیی و ڕۆژاوایی گەورەتر نییە.) «325،97» بەلام، سێ بەشەکەی دیکەی، گەلێ ووشەی فارسیی تێکەلاوبووە. ئەویش لەبەرئەوەی، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، مەڵبەندی ژیانی ئەو سێ بەشە لوڕە، لە ناوچەکانی نەتەوەی فارسەوە نزیکبووە. ئەگینا بە هیچ جۆرێ، گومان لە کوردێتی ئەوانیش ناکرێ.

ئەوە تێڕوانینی نەتەوەی بالادەسی فارس بوو. دەیانەوێ، بە هەموو شێوەیە، کورد و زمانەکەی قووتدەن! بەلام، با بزانین، کوردێکی وەک «کەمال فوواد» دەربارەی ئەو دیالێکتە دەڵێ چی؟ (لە ڕووی ڕێزمانەوە، «لوڕیی » بە زمانێکی « ئێرانیی باشووریی ـ ڕۆژاوایی » دائەنرێ، بەلام فارسیی نییە، بەڵکوو زمانێکی سەربەخۆیە، بەشی یەکەمیان «بەختیاریی» وەکوو لە ڕووی زمانەوە « کوردیی » نییە، خۆشیان لە ڕووی نەتەوەیی یەوە بە کورد نازانن، بەلام دووەمیان، بە تایبەتیی لە عێراق، لە بەر گەلێک هۆی مێژوویی و سیاسیی و ئابووریی لە ڕووی نەتەوەیی یەوە لە کورد جیا ناکرێنەوە، هەتا لە ڕووی زمانەوە لە ئەنجامی تێکەلابوونەوە زۆریان لە «کوردیی ڕۆژهەلاتی » وەرگرتووە.)«22،88»

لە سەر بۆچوونەکانی د. « کەمال »، هەر هێندە دەڵێم: گەر چوارسەد ساڵ لەمەوبەر، « شەرەفخان » لوڕەکانی بە کورد دانابێ، خۆشیان هەر بە کورد بزانن، ئیدی د. « کەمال » بۆ دەبێ، بە کوردیان دانەنێ؟ « لوڕیی » نە زمانە و نە سەربەخۆشە. بەڵکوو، بە یەکێ لە چوار دیالێکتە سەرەکییەکەی زمانی کوردیی دادەنرێ. چونکە، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە زمانی کوردییەوە نزیکە، وەک لەوەی سەربەخۆبێ. پاشان، گەر لوڕیی، بە سەر دوو بەشدا دابەشکرێ، چۆن بەشێکیان « بەختیارییەکان »کورد نین و بەشەکەی دیکەیان «کە دوکتۆر باسی ناکا، ناوی چییە »کورد دەبن؟ ئایا، شتی وا دەبێ، بەشێ لە کۆمەڵێ کورد بن و بەشەکەی دیکەیان کورد نەبن، بە مەرجێ هەر هەمان خەسڵەتیان هەبێ؟! دیارە، ئەوەش پێوەندیی بەوەوە هەیە، ئەو بەشەیان هەستی نەتەوەیی یان لاوازە و لە کورد دابڕاون، ئەگینا هەر کوردن. ئێرانییەکان، بە فارسییان دادەنێن، بەڵام، گەر سەربەستیی هەبێ، بڕوا ناکەم، کەسیان لاریی لە کوردێتی خۆی هەبێ.

هەڵبەتە، دوکتۆر لە لایەکەوە، لە سەر باوەڕی مێژوونووسە کۆنەکانی سۆڤیەت بە ڕێوەدەڕوا، بۆیە، بەشێ لە لوڕەکان بە کورد نازانێ. چونکە، ئەوان نەک هەر بەشێکیان، بەڵکوو، هەموو لوڕەکان بە کورد دانانێن و بە خزمی کوردیان دادەنێن.

لەو بارەیەوە د. « ڕەشاد میران »، لە پەراوێزی بەرهەمەکەی زانای سۆڤێتی، « ڤیلچێڤسکی ـ نەژادی کورد »دا دەڵێ:(زانستی مێژوو و ئیتنۆگرافیای سۆڤیەتی، لوڕ و بەختیارییەکان بە دوو میللەتی جیاواز دادەنێ، نەک بە کورد.)«106،76» لە لایەکی دیکەشەوە، دوور نییە، دوکتۆر لە هەندەران تووشی کوردێکی ناوچەی لوڕستان بووبێ، ئەو هەستەی هەبووبێ! ئیدی، ئەم قسەیەی بە سەر هەموو کوردەکانی، ناوچەی لوڕستاندا چەسپانبێ. ئەدی، ئەوڕۆ بە چاوی خۆمان نابینین و بە گوێی خۆمان نابیستین، لە تێلیڤیزیۆنی « مەد »دا چەن کوردی ناوچەی لوڕستان، بەرهەمەکانیان بە زمانی کوردیی پێشکەشدەکەن، شانازیی بە کوردێتی خۆیانەوە دەکەن؟ تەنانەت، ڕەچەڵەکی کوردیش، هەر بۆ سەر لووڕەکان دەگێڕنەوە!

لە « ئینسکلۆپیدیای تورک »دا نووسراوە: (هێندێ لە زانایانی زمان پێیان وایە، « لوڕیی » لەگەڵ « بەختیاریی » دەکرێ، بە دیالێکتێ لە دیالێکتەکانی کوردیی دانرێن، زۆر نزیکیشیان لە کۆمەڵەی کوردیی باکوورییەوە هەیە.)«113،73» هەروەها، « زوبێحی » بڕوای بەوە هەیە، لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمییانە، لە سەر کێشەی لوڕەکان بکرێ، بە مەرجێ، هەست و سۆزی نەتەوەیی پشگوێخرێ، بە لای کورددا لانەدرێ و بە لای فارسەکانیشدا دا نەشکێنرێ. بۆیە، دەڵێ: (ئەم مەسەلەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی هەیە و تا ئەو کاتە بە لای منەوە « لوڕیی » هەر لە کوردیی نێزیکترە تا فارسیی، پێویستە، ئەوەش بڵێم: کە مەبەستی من لێرەدا ئەو بەشەی « لوڕیی » نییە کە « لوڕی پچووک » قسەی پێ دەکەن و بە لەهجەی « فەیلی » مەشهورە، چونکە ئەمەیان جێی ئەوەی تێدا نابێتەوە کە سێ و دووی لێ بکرێ، بە ئاشکرا بە بەرچاوی خۆمانەوە « فەیلیی » بە کوردیی قسەدەکەن و خۆشیان بە کورد دەزانن، بەڵکوو لەوەش زیاتر هەر خۆیان بە کورد دەزانن و هەموو کوردی تر یا بە « جاف » یا بە « لەک » دادەنێن.)«43،70» فەیلیش دیالێکت نییە، بەڵکوو بە بەشەدیالێکتێکی لوڕیی دەژمێررێ.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم: ئەز بە ڕاستی نازانم، زمانی کوردیی، بەپێی ناوچەی جوگرافیا دابەشکرێ. بەڵکوو دەتوانین، بڵاوبوونەوەی دیالێکتەکان لە ناوچە جوگرافیاکاندا دیاریکەین. بەو پێیە، دوور نییە، دیالێکتێ یا چەن بەشەدیالێکتێ، لە چەن ناوچەیەکی جیاواز و دوور لە یەکدییەوە بڵاوبنەوە. ئەو دیالێکتانەی شارەزایانی زمانی کوردیی، بەپێی ناوچەکان دابەشیانکردووە، لە هێندێ شوێندا جۆرە تێکەڵاویی و هەڵەیەک، لە نێوان دیالێکت و خواردیالێکتەکاندا هەیە، بەڵام، لێرەدا بە پێویستمان نەزانی، پتر لە سەر ئەو باسە بڕۆین.

لە ڕاستیدا، نە ووشەی « ماچۆ »ی هەورامیی، لە ووشەی « یەژم »ی لووڕەکان دەکا، نە ووشەی « دەڵێم »ی کرمانجیی خواروو لە « گوتم »ی کرمانجیی ژووروو دەچێ، بەڵکوو، هیچیان لە هیچیان ناچن. هەر بۆیە، ئەو چوار دیالێکتە سەرەکییەمان، لە زمانی کوردییدا هەیە. لەبەرئەوە، بە

باوەڕی من، ئەو دابەشکردنەی زانای کورد « تۆفیق وەهبی »، دەورووبەری پێش حەفتا ساڵ لەمەوبەر کردوویەتی، تا ئەورۆ نرخ و بایەخی تایبەتیی و زانستانەی خۆی لەدەس نەداوە، لە هەمووشیان ڕێکوپێکتر زمانی کوردیی پۆلێنکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ، ئەو سەرنجانەی لە کاتی خۆیدا دەرمانبڕی، ڕەچاوکرێن. جگە لەوەی پێموایە، بۆ ئەوەی لەم هەموو دابەشکردن و گەڕەلاوژێیە ڕزگارمانبێ، پێویستە، دەزگەیەکی ئەکادیمیی وەک « کۆڕی زانیاریی کوردستان »، بە یارمەتیی شارەزا و پسپۆڕەکانی کورد دابمەزرێ، بڕیار لە سەر ژمارە، جۆری دیالێکت و بەشەکانی بدەن.

# 4. بایەخی زمان لە ژیانی نەتەوەکاندا :

پێناسە و بایەخی زمان، پێبەپێی بۆچوونە ئایدۆلۆژیی و فەلسەفییەکان دەگۆڕێ. بەپێی ئایدۆلۆژیی و فەلسەفەی ناسیۆنالیزم، زمان بە یەکێ، لە مەرجە هەرە سەرەکییەکانی دروسبوونی نەتەوە و بە ژێرخانی کۆمەڵگە دادەنرێ. گومانی تێدا نییە، هیچ نەتەوەیەک لەم جیهانەدا، هەرگیز بێ زمان نەبووە و نییە و نابێ. جا، هەر لە تیرە و هۆزە دواکەوتووە دڕندە و کێویلەکانی، نیشتەجێی نێو دارستانەکانی ئەفریکا و خەڵکی دوورگەکانی ئۆقیانووسەوە بیگرە، تا بە پێشکەوتووترین کۆمەڵی ئیتنیی ئەم جیهانە دەگا. زمان و نەتەوە، تەواوکەری یەکدین، وەک ماسی و ئاو وان، هیچ کامێکیان بێ ئەوی دیکەیان ناژین. زمانی نەتەوەیی، گیانێکی گەش و ژیانێکی پڕ بە جۆشوخرۆش، بە بەر هەموو نەتەوەیەکدا دەکا. دڵی زیندووی هەموو نەتەوەیەک، زیاتر بە هۆی زمانەکەیەوە لێدەدا، گیانی نەتەوەکەش، هەر خۆی لە چوارچێوەی « بەسەرهات، سەرگوزشتە، چیرۆک، هۆنراوە و مێژوو »دا دەبینێ، کە بە زمانی باپیران ڕاڤەدەکرێ و دەردەبڕێ.

هەر چەندە، هێندێ لە ڕووداوەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کورد سەلماندوویەتی، تەنیا زمان، بە یەکەم مەرجی نەتەوە و کوردبوون دانانرێ، بەڵکوو، هەستی هاوبەشی نەتەوەیی و خۆبەکوردزانین، بە پلەی یەکەم دێ. چونکە، هەزاران کوردی وەک د. « فوواد » لە باکووری کوردستان، گیانی خۆیان بە نەتەوەی کورد و خاکی پیرۆزی کوردستان بەخشی، لەگەڵ ئەوەشدا، زمانی زگماکیی خۆیان نەدەزانی! بە پێچەوانەشەوە، بە هەزاران کورد هەن، کوردییەکی باش دەزانن، بەڵام، چەکیان بۆ دوژمنی داگیرکەر هەڵگرتووە، دژی هاوزمان و نیشتمانەکەی خۆیان دەجەنگن!

بەپێی باوەڕی مارکسیزم، زمانی نەتەوەیی ئەو گرنگیی و ڕۆڵەی نییە، بەڵکوو، فاکتەری ئابووریی جێگەی دەگرێتەوە. چونکە، مارکسییەکان لە ڕوانگەی پێوەندییەکی مەتیریالیی ڕووتەوە، لە هەموو شت و پێوەندییەکانی دیکەی کۆمەڵگەی مرۆڤ دەڕوانن. فاکتەری ئابووریی، بە خاڵی سەرەکیی درووسبوونی نەتەوە و ژێرخانی کۆمەڵگەی مرۆ دادەنێن.

هەروەها، بەپێی باوەڕی ئایینی ئیسلامیش، زمان لە ژیانی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەویدا، ڕۆڵێکی گەورە و گران نابینێ. چونکە، ئەوەی لای ئەوان گرنگبێ، تەنیا ئەوەیە، مرۆڤ دەبێ، باوەڕ بە خوای تاکوتەنیا بێنێ، تەنیا کێشەی یەکێتی باوەڕ، هەموو شتەکان چارەسەردەکا. لەبەرئەوە، چۆن مارکسییەکان لە ڕوانگەیەکی نەتەگەلێتی «ئینتێرناسیۆنال» مەتیریالیییەوە بیردەکەنەوە، هەر بەو شێوەیەش، ئیسلامەکان هەموو باوەڕ و دیدەکانیان، لە سەرچاوەی نەتەگەلێتی گیانییەوە هەڵدەهێنجن. واتە: لای هەر دوو بیروباوەڕەکە، زمان ڕۆڵێکی ئەوتۆ نابینێ. چونکە، ئەوان بە یەک چاو، لە هەموو گەلانی جیهان دەڕوانن، باری سەرنج و تێڕوانینەکانیان، لە سەر ئاستێکی فراوان و ئینتێرناسیۆنال دارێژراوە، بە پێچەوانەی باوەڕی نەتەوەیی یەوە، کە لە هەموو شتێکدا، لە بەشەوە بۆ گشت هەنگاودەنێ، لە پچووکەوە بۆ گەورە دەسپێدەکا.
ئەم باری سەرنجەی مارکسییەکان و ئیسلامییەکان، کارێکی وای لە زمانی نەتەوەیی کردووە، لە سنووری هەر دەوڵەتێکدا، چەن کەمەنەتەوەیی، گەل و نەتەوەیەک پێکەوە بژین، دەبێ و پێویستە، هەموو ڕۆڵەکانی ئەو گروپە ئێتنییانە، زمانی دەستەی فەرمانڕوا و دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتانە بزانن، ئاخافتنی پێ بکەن، پێی بخوێنن و بنوسن. واتە: ئەو زمانە، بە زمانێکی سەرەکیی دادەنێن، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆشیان، بە زمانێکی پلە دوو و لاوەکیی دێ. تەنانەت، ئایین کارێکی وای لە زمانی نەتەوەیی کردووە، هێندێ جار و لە هێندێ دەوڵەتدا، زمانی ئایین شانبەشانی زمانی نەتەوەیی دەڕوا. بۆ نموونە: گەر لە وڵاتێکی دیاریکراودا، دەوڵەتێکی ئایینیی دامەزرێ، با زمانەکەشیان زمانی عەرەبیی نەبێ، ئەوان گەلێ ڕێز لەو زمانە دەگرن، بە زمانێکی سەرەکیی دادەنێن، لە خوێندنگەکاندا، بە زۆرەملیی بە خوێندکارەکانی دەخوێنن، وەک لە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، ڕێبەرەکانی ئاینزای شیعە، زمانی عەرەبییان بە زمانێکی ڕەسمیی ناساند. چونکە، زمانی قورئانە، ئەوانیش قورئان، بە تەنیا سەرچاوەی هەموو باوەڕەکانی خۆیان و ئایدۆلۆژیای ڕێکخراو، دەوڵەت و کۆمەڵگە دادەنێن.

هەر چەندە ئەم بۆچوونەی ئیسلام و کۆمۆنیستەکان، هەر تەنیا لە نێو دێراوی دێڕی پەرتووکەکاندا جێگەیاندەبێتەوە، بەڵام، بە کردەوە وا نییە. بەڵکوو، شتێکی دیکە دەڵێن و بە جۆرێکی دیکە ڕەفتاردەکەن. بۆ نموونە: پەیامبەری ئیسلام فەرموویەتی: (عەرەبم لە بەر سێ شت خۆشدەوێ: ئەز عەرەبم، قورئان عەرەبییە و زمانی خەڵکی بەهەشتیش عەرەبییە.) هەر چەندە وەک باوە، لە سەردەمی پەیامبەردا، گرفتی نەتەوەیی نەبووە، گەر هەشبوویێ، هەڵبەتە بەم شێوەیەی ئەوڕۆ نەبووە. بۆیە، قورئانی پیرۆز و پەیامبەر، باسی زمان و کێشەی نەتەوەیی یان نەکردووە. بەڵام، گەر لەو سەردەم و لەو بارەدا، پەیامبەر ئەوەی گوتبێ و ئەوە فەرمایشتی ئەو بێ، ئەوا دیارە، زۆر شانازیی بە عەرەبێتی خۆی و زمانی عەرەبییەوە کردووە، کە ئەوڕۆ هەموو نەتەوەیی یەکی دڵسۆز بۆ نیشتمانەکەی خۆی، هەر بەو شێوەیە شانازیی بە خاک و زمانەکەیەوە دەکا!
بایەخی زمان، پتر لە ژیانی ڕۆژانەدا دەردەکەوێ. چونکە(زمان هۆیەکە لەو هۆیانەی ئادەمیزاد بە کۆمەڵەوە دەبەستێ)«8،69» هەموو مرۆڤێ، تەنیا بە هۆی زمانە نەتەوەیی یەکەیەوە، تێکەڵاویی لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵگەکەیدا پەیدادەکا و لە یەکدی دەگەن. هەر بە هۆی ئەو زمانەی پێشی دەدوێ، بە ئەندامێکی ئەو نەتەوەیە دادەنرێ. هەروەها، بە هۆی ئەو زمانە بیانییانەی دەشیانزانێ، لە خەڵکی وڵاتانی دیکەی جیهان تێدەگا و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکا. تەنانەت، زمان لە ژیانی گەلاندا، هێندە گرنگیی پەیداکردووە، چەندین دەوڵەتی جیاجیای کیشوەرەکانی جیهان، لە سنووری خۆیدا کۆدەکاتەوە، بۆ ئەوەی لە بوارەکانی « کەلتوور، زمان، ئابووریی و ڕامیاریی و دیپلۆماسیی »دا پێکەوە هاوکارییکەن، داکۆکیی لە یەکدی بکەن، وەک کۆمەڵەی ئینگلیززمانەکان « ئەنگلۆسەکسۆن » و کۆمەڵی فرەنسیزمانەکان « فرانکفۆن ». هەر دوو بەشەکەی زمانی نەتەوەیی « ئاخافتن و نووسین »، یارمەتییەکی زۆری گۆڕان و گەشەسەندنی ژیانی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکان دەدەن. گەر بە هۆی زمانەوە نەبووایە، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان هۆشی مرۆڤ و هەموو ئاژەڵەکانی دیکەدا نەدەبوو. بۆیە، زمان وەک وەرگێڕی هۆش و دەروون وایە، بیر و بۆچوونەکانی مرۆڤ وەردەگێڕێ.

شتێکی ئاشکرایە، هەموو نەتەوەیەک لەم جیهانەدا، بە پلەی یەکەم، تەنیا بە هۆی زمانەکەیەوە دەناسرێ. گەر هەر نەتەوەیە، زمانی نەتەوەیی نەبوو، ئەوا ناو و بوونیشی نابێ. هەر وەک « هەژاری موکریانی »یش دەڵێ:(لە ڕۆژیش ئاشکراترە، کە قەباڵەی بوون و مانی هەموو گەلان، لەم سەر زەمینە زمانە. ئەگەر زمان لەناودرا، بوون و مانیش لەناودەچێ.)«3،49». پاشان دەڵێ:(پێناس زمانە، فەرهەنگە، مێژووی کەونارا و تازەیە، وێژە و شیعر و ئەدەبیاتە، بە هەموو لک و پۆپییەوە.)«3،49» لە باسێکی دیکەشدا، پێ لە سەر گرنگیی و بایەخی زمانی نەتەوەیی دادەگرێ و دەڵێ:(زۆر لە ڕۆژ ئاشکراترە، پێناسی گەلان لە جیهان، دروشمی نەتەوایەتی، ئامیانی ڕەگەزایەتی زمانە و بەس.)«19،120»
هەروەها، دەربارەی گرنگیی زمان، مامۆستا « خاڵ » دەفەرموێ:(هەر گەلێک زمان و فەرهەنگی نەبێ، لەگەڵ گەلانا ناژمێررێ و ناناسرێ، بەڵکوو، ئەکرێ بە بەردەباز و پێشێل لە ژێر پێی ئەو گەلانەی کە بۆ کوێستانی ژیان ئەچن، تا لەو کێڵگەیەدا پانوپلیش ئەکرێتەوە، وە لەگەڵ خاکا یەکسان ئەکرێن. بەڵام، کە زمان و فەرهەنگی بوو، با دیلیش بێ هەر گەلە، وە بە گەل ئەناسرێ، وە ڕۆژێ ئەبێ، کە لەگەڵ گەلانی خواپێداوا ڕووەو کوێستانی ژیان بڕوا و سەرکەوێ، وە لە پێشکەوتن و بەرزبوونەوەدابێ، تا ئەگاتە لوتکەی هەرە بەرزی ژیان، وە بە سەر چڵەپۆپەی کامەرانییەوە، وەک بلبلی هەزار داستان بخوێنێ و بچریکێنێ. کەوابوو، ئاگاداریکردنی زمان بە نووسینی فەرهەنگ و کۆکردنەوەی ووتە، لە ئاگادارییکردنی گیان پێویسترە بۆ مانەوەی گەلان، چونکێ بە نەمانی هەزاران گیان گەل نامرێ، بەڵام بە نەمانی زمان ڕیشتەی کۆمەڵایەتی ئەپچرێ وە شیرازەی گەل تێکئەچێ، تا هەموو پەرەوازە ئەبن و لە یەک ئەبڕێن وە زۆردار قووتیانئەدەن و لەناویانئەبەن.
گەر بە چاوێکی ووردبوونەوە، تەماشای سەرگوروشتە و مێژووی گەلانی ڕابووردوو بکەین، تێئەگەین کە لەمە پێش، زۆر گەلی گەورە بوون، کە لە خوێندەواریی و تێگەیشتن و پێگەیشتن و تێکۆشین و پێشکەوتنا، پایەیەکی بەرز و جێگەیەکی بڵندیان بووە، وە لە سەر ڕووپەڕەی مێژوو زۆر

نیشانەی مەردانە و پیاوانەیان بەجێهێشتووە، بەڵام چونکە، وەیشومەی ڕۆژگار، وە گەردشی چەرخی کەچڕەفتار، زمانەکەی لەناوبردوون، خۆشیان لەناوچوون، سا مەگەر لە کون و قوژبنی مێژوودا ناوێکیان مابێتەوە.
کەوابوو، مانەوەی زمان مایەی مانەوەی گەلە، هەر گەلێک تا هەر چەندە دووچاری خەم و تەم و خەفەت و دەردیسەریی بێ، وە تاڵیی و سوێریی ڕۆژگار بچێژێ، وە تەنگانە و چەڵەمە کەڵەمەی بکا، ئەو گەلە هەر ئەژی و ئەمێنێ، تا وەک ئاگاداریی زمانەکەیان بکەن، وە نەیەڵن لەناوبچێ.
کەواتە، زمان بۆ ئاگاداریی گەلان، لە هەموو قەڵایەکی ئاسنین و قوللەیەکی سەختی بەهێزی مسیین باشتر و چاکترە، چونکە قەڵا ئەگیرێ و قوللە ئەڕوخێنرێ، بەڵام زمان هیچی لێ ناکرێ.)«8،102 ـ 9»
یەکێ لە خاڵە گرنگە تایبەتییەکانی هەر زمانێ ئەوەیە، بە هۆی «وێژە، فەرهەنگ و زمانی نەتەوەیی»یەوە دەتوانرێ، ڕەگوڕیشە و ڕەچەڵەکی هەموو گەل و نەتەوەیەک، لە ناوچەیەکی دیاریکراوی مێژوویيدا دەسنیشانکرێ، ئەو گەل و نەتەوانە، بۆ سەر بنەڕەتی ڕەسەنی خۆیان بگێڕرێنەوە و نەژادیان ڕوونکرێتەوە. وەک ئەوەی، زمانی کۆنی گەلانی ئەو ناوچانە دیاریکرێ، بە باڵای زمانی ئێستای ئەو گەل و نەتەوانە بگیرێ، پاشان لە ڕێگەی «فۆنێتیک، ڕێزمان و ووشە لەیەکچووەکان»ەوە، هەر دووکیان لەگەڵ یەکدیدا بەراوردکرێ، خاڵە هاوبەش و لێکچووەکانیان دیاریکرێ و بنەچەکانیان ڕوونکرێتەوە.
هەڵبەتە، هەموو دەزگە ئەکادیمییە کوردییەکان، گەر بیانەوێ، لە بنەچە و بناوانی نەتەوەکەی خۆیان بکۆڵنەوە، لە زمانەکەی خۆیان شارەزابن، پێویستە، ڕێبازی زانستانە بگرن و دوو خاڵی گرنگ ئەنجامدەن:
یەکەم ـ لە مێژووی دروسبوون و پەیدابوونی کورد لە ناوچەکەدا بکۆڵنەوە.
دووەم ـ لە مێژووی دروسبوون و پەیدابوونی، زمانی کوردیی و قۆناغە جیاوازەکانی پێشکەوتنی زمانەکە بدوێن. بۆ ئەمەش دەبێ، پەنا بۆ بەر فۆلکلۆر و وێژە بەرن. بۆ نموونە: گەر ئێمە توانیمان، بە تەواویی ڕوونیکەینەوە، کاتی خۆی مادەکان بە چ زمانێ پەیڤیون، لەگەڵ زمانی کوردیی ئەوڕۆدا بەراوردیانکەین، گەر بەڵگەی تەواومان بە دەسەوەبوو، ئەو

زمانەی ئەورۆ، ئێمەی کورد قسەی پێ دەکەین، سەرچاوەکەی لەو زمانەوە جۆگەی هەڵبەستووە، کە مادەکان کاتی خۆی قسەیان پێ کردووە، ئەوا دەتوانین، بە ئاشکرا بڵێین: مادەکان بە باپیرە گەورەی کوردەکانی ئەورۆ دادەنرێن. واتە: بە هۆی زمانەوە توانیمان، ڕەچەڵەکی کورد دیاریکەین.
شتێ هەیە، با لێرەدا باسیکەین. زۆر جێی داخە، گەلێ جار، گوێم لە سرتە و بۆڵەی، هێندێ لە کوردە کۆسمۆپۆلێتییەکان بووە، گوتوویانە: زمان زۆر گرنگ نییە، بە هەر زمانێ بدوێین، بۆ ئێمە هیچ جیاوازییەکی نییە، گرنگ ئەوەیە، لە یەکدی بگەین. بەڵام، ئەو جۆرە کەسانە، جگە لەوەی خۆیان دەخەڵەتێنن، ئەوەشیان لە یادکردووە، هەموو نەتەوەیەک، بە زمانەکەیەوە دەناسرێ. بۆیە، بە مرۆڤێکی کورد دەڵێن کورد، چونکە، لە دایک و باوکێکی کورد لەدایکبووە و بە زمانی کوردیی دەپەیڤێ.
لە ڕووی باری سەرنجی بیری نەتەوەیی یەوە، مرۆڤێکی کورد لە یەکێکی دیکەی « فارس، تورک، عەرەب، ڕووس، ئینگلیز .. تاد »، لە پێش هەموو شتێکدا، بە زمانە نەتەوەیی یەکەی جیادەکرێتەوە، پاشان، خەسڵەتەکانی دیکەی نەتەوە دێن. تەنانەت، لە ڕووی ئایینیشەوە، کوردێکی موسوڵمان لە « عەرەبێ، تورکێ یا فارس »ێکی موسوڵمان، تەنیا بە زمانەکەی جیادەکرێتەوە، بۆیە پێیان دەڵێن: گەلانی ئیسلام، کە بە هەموویان نەتەوەی ئیسلام پێکدێنن. *
هەروەها، « جوتیار، کرێکار، دەرەبەگ، بۆرژوا و سەرمایەدار »ەکانی هەر نەتەوەیەک، یەک زمانی هاوبەشیان هەیە، (زمان بە یەکێ لە مەرجە هەرە گرنگەکانی بوونی نەتەوە دادەنرێ، زمانی هەموو چینەکانی گەلە، زمانی هاوبەشی هەموو نەتەوەکەیە بە هەموو چین و توێژەکانییەوە. هەرگیز زمانی کوردیی چینی کرێکاران، زمانی کوردیی چینی بۆرژوا، زمانی کوردیی چینی جووتیاران یا زمانی کوردیی چینی دەرەبەگ نەوتراوە و نەبیسراوە.) «33، 88-89»

---

* لێرەدا، نەتەوە، بەپێی دید و بۆچوونی ئیسلام بەکارهاتووە، نەک وەک زاراوەیەکی ئیتنیی و ڕامیاریی بەکارهێنرابێ.

جا ، گەر ئەو هەموو خەباتەی دەکرێ، ئەو هەموو قوربانییەی دەدرێ، یەکێ لە ئامانجەکانی، پاراستنی زمانی نەتەوەیی نەبووایە، هەڵبەتە، ئەو گەلانەی رزگاریانبووە، ئەو هەموو خوێنەیان لە پێناوی رزگارکردنی خاکەکەیاندا نەدەرشت، دوای رزگاربوونیشیان، هیچ جۆرە بایەخێکیان، بە زمانە نەتەوەیی یەکەیان نەدەدا! بە پێچەوانەوە، هیچ یەکێ لەو مەرجانەی دروسبوونی نەتەوە، لە یەکدی جیا ناکرێنەوە، هیچ یەکێکیان خەسڵەتێکی ئایینیی یا چینایەتییان نییە. بەڵکوو، تەنیا خۆیان لە ژێر ناوی خەسڵەتە نەتەوەیی یەکاندا دەبیننەوە. واتە:(مەرجەکانی بوونی هەر نەتەوەیەک، لە نێوان هەموو چین و دەستە و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکاندا، خاڵی نێوکۆیی و هاوبەش پێکدێنن، هەرگیزاوهەرگیز، کەرتکەرت و بەشبەش ناکرێن. گەر لەتوپەت و جیاکرانەوە، ئەوا ناسنامە و کەسێتی ئەو نەتەوەیە تێکدەچێ و دەبێتە دوو گەلی جیاواز، وەک گەلی ئازەریی و تورکیی کە لە یەک گروپە زمانن « تورکزمانەکان » رۆمانیی و مەڵداڤیی، لە گروپە زمانی رۆمانین، رووسیی و ئۆکراینیی، لە لقە زمانی سلاڤین، کورد و فارس، کورد و هیند « ئاریی ». ئەو نەتەوانە لە یەکدییەوە نزیکن، لە رووی زمانەوە خزمن و لە لقە زمانێکیشن، بەڵام، هەر بە دوو نەتەوەی جیا ناودەبرێن. جا ، گەر ئەو نزیکیی و خزمایەتییە لە نێوانیاندا نەبووایە و لە گروپە زمانێ نەبوونایە، وەک « رووس و ئینگلیز، ئەڵمان و فرەنسیی، کورد و عەرەب، کورد و تورک » ، ئەوا بە هیچ شێوەیە، لە باری سەرنجی نەتەوەیی یەوە پێکەوە نەدەنووسان و نانووسێن، بەڵکوو، پێوەندییەکی دیکە هەیە، دۆستایەتی، هاوکاریی و برایەتیی نێوانیان ساز و کۆک و تەیاردەکا ، ئەویش پێوەندیی مرۆڤایەتییە.)«90،33»

بە باوەڕی من، ئەو نەتەوەیەی پارێزگاریی زمان و فەرهەنگی نەتەوەیی خۆی نەکا ، بە شێوەیەکی بەردەوام، هەوڵ بۆ پێشخستن و گەشەسەندنی نەدا، چ زمانەکە و چ نەتەوەکە، وردەوردە، بەرەو لاوازبوون و پوکاندنەوە دەڕۆن، تووشی گەلێ چەڵەمەی نەتەوەیی دەبن. بە پێچەوانەشەوە، هەر وەک نووسەرێکی عەرەب دەڵێ: ئەو نەتەوەیەی پارێزگاریی زمانی نەتەوەیی خۆی بکا ، وەک گیراوێ وایە، کلیلی دەرگەی گرتووخانەکەی لە

گیرفانی خۆیدا بێ، هەر کاتێ ویستی، دەرگەی گرتووخانەکەی بکاتەوە، دەیکاتەوە و خۆی قوتاردەکا. نەتەوەی بێ فەرهەنگ و زمانیش، وەک بەندێ وایە، کلیلی دەرگەی بەندیخانەکەی، لە گیرفانی دوژمنەکەیدا بێ، دۆش دادەمێنێ و ناچاردەبێ، بە کەساسیی لە بەردەمی دوژمنەکەیدا دەسەئەژنۆ دانیشێ، تا وردەوردە، دەتوێتەوە و نامێنێ. لەبەرئەوە، هیچ نەتەوەیەک بە هیچ شێوەیە، لەنێوناچێ و قەوارەی ڕامیاریی خۆی لەدەس نادا، تەنیا لەو کاتانەدا نەبێ، زمانەکەی خۆی لە بیردەچێتەوە و بە زمانی داگیرکەرانی نیشتمانەکەی دەدوێ. چونکە، زمانی داگیرکەران، بە هۆی دەزگەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت و خوێندن لە خوێندنگە جیاوازەکاندا، زۆر بە خێرایی بڵاودەبێتەوە، بەرەبەرە، تەشەنەدەکا و کار لە زمانە نەتەوەیی یەکە دەکا. بۆیە،(زۆر لە گەلانی سەربەخۆی سەرزەمینێ، کە ژێرکەوتوون و زمانی داگیرکەر فێربوون و زوانی نەتەوەیی خۆیان لەدەسداوە، لە ناو گەلی داگیرکەردا ـ کە زوانی خۆی بە زۆر بە سەردا سەپاندوون ـ تواونەتەوە و هەستی نەتەوەیی خۆیان تەواو لە بیربردۆتەوە. پێشی ناوێ، دانەدانە بەڵگە و نموونە نیشاندەم، هەر کەس تاریخان وەخوێنێ، لە هەزار جێ تووشی نموونەی زۆر زەق دێ. هەر لە دەوروبەری خۆمان وا دەبینین: فینیقی سووریا و لوبنان، قیبتی میسر، ڕەش و برشەکانی سۆدان و زۆر ڕەشی تری ئەفریکا، گەلی بەربەر لە جەزایر و مەراکیش، ئێرانییەکانی مەداین، جگە لە هەزاران هەزار هۆز و تیرە و ماڵە کوردی پەرژوبڵاو، کە زوانیان بوەتە عارەبی و زوانی خۆیان لەدەسداوە و ئەوە هیچ کە بوونە عەرەب، دەکرێ بێژین لە عارەبیش عارەبترن.)«19،120»

هەروەها، لەم بوارەدا، گەلێ نموونەی دیکەمان هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا، تەنیا دوو نموونەیان لێ گوڵبژێر دەکەین. دوای ئەوەی عەرەبە موسوڵمانەکان، ئیسپانیان داگیرکرد، ماوەیەکی یەکجار زۆر، لە ژێر دەسیاندابوو. «ئەندەلوس»، پتر لە حەوت سەدە بە پارچەیە لە نیشتمانی عەرەب دەژمێررا، خەڵکەکەشی بە زمانی عەرەبیی دەپەیڤین. بەڵام، ماوەی چوار سەدە پتر دەبێ، لە نیشتمانی عەرەب داپچڕاوە. لەبەرئەوە، خەسڵەتە عەرەبییەکەی خۆی لەدەسداوە، زمانە عەرەبییەکەشیان لەنێوچووە و ئێستە

بەکــارناهێنرێ. کــەچی، بە پێــچــەوانەوە دەبینین: دەوڵەتێکی وەک «مەغـریب»، تا سەدەی حەوتەم و هەشتـەمی زایین، وولاتێکی عـەرەبیی نەبوو، بەلام، لە دوای ئەو مێژووە و تا ئەورۆش، بە پارچەیە لە نیشـتمانی عەرەب دادەنرێ. لەبەرئەوەی دانیشـتووانی مەغریب، زمانەکەیان لە لایەن عـەرەبەکانەوە عـەرەبێنرا، لە هەمان کاتیـشدا، بە زنجیـرەیەک « ڕووداوی مێژوویی، گۆڕانکاریی کۆمەلایەتیی، گەشەسەندنی ئابووریی » دووروودرێژ و ئالۆزدا تێپەڕبوون، تا ئەم گەل و دەوڵەتەی ئەورۆیان لێ کەوتۆتەوە!

هەروەها دەتوانین، تازەترین نموونە لە ســـەر باری زمـــانی نەتەوەیی، دانیشـتووانی دوورگەی « هۆنگکۆنگ » بێنینەوە. گەلی « هۆنگکۆنگ » بەشێ لە نەتەوەی چین پێکدێنن. تا ساڵی «1841» لە ژێر دەسەلاتی چیندا بوون. بەلام، لەو مێژووە بە دواوە، بریتانیـای گەورە داگیـریکرد. تا بەپێی ڕێککەوتننامـەیەکی تایبەتیی، لە «1997/07/01 »دا، وازی لێ هێنا و دوورگەکە بۆ نێـو باوەشی دایکی نیـشتمـان گەڕایەوە، واتا مـاوەی «156» ساڵی ڕەبەق، کۆلۆنیایەکی بریتانیا بوو. لەو ماوە درێژەدا، بریتانیا زمانی ئینـگلیـزیی، بە سەر خـەڵکی « هۆنگکۆنـگ »دا سەپاندبوو. تەنانەت، لە خوێندنگەکاندا، بە زمانی ئینگلیزیی دەیانخوێند و زمانی دەوڵەتیش بوو. لەو شەش میلیۆنەی دانیشتووانی « هۆنگکۆنگ »، تا ئێستا مرۆڤێ بەدی ناکرێ، زمـانی کۆلۆنیـالیـزمی بریتـانیـا، زۆر بە چاکـیی نەزانێ. بەلام، زۆربەی خـەڵک، بە تایبـەتیی نەوەی نوێ، بە دەگـمـەن زمـانی نەتەوەیی خـــۆیان دەزانن. چونـکە، لەو مـــاوەیەدا بە تەواویی زمـــانی چینیی پشـگوێخـرابوو، لە هەمـوو بوارەکـانی ژیاندا، تەنیـا زمـانی ئینگلیـزیی بەکـاردێنرا. جـا گـەر بهـاتایە، ئەو داگیــرکـردنەی بریتـانیـا تا سـەر بەردەوامبووایە، لەو باوەڕەدام، مەگەر تاکوتەرای خەڵک، ئەگینا بە دەگمەن نەبێ، لە پاشەڕۆژدا کەس زمانی نەتەوەیی خۆی لە بیر نەدەما. دوورگەکەش بە خـاک، گەل و زمانەکـەیەوە، بە تەواویی لە نیشـتمان، نەتەوە و زمـانی چینیی دادەبڕان. دوور نییە، وەک « ئەندەلوسیان » لێ بەسەربهاتایە!

بۆیە، هەر نەتەوەیەک، زمان و وێژەی خۆی بپارێزێ، گومانی تێدا نییە، بە نەتەوەیەکی زیندوو دادەنرێ. نەتەوەی زیندووش، با ئازادیش نەبێ، با لە

ژێر دەسی داگیرکەری بیانیشدا بنالێنێ، ئەو نەتەوەیە هەر دەژی، سەردەکەوێ و پێشدەکەوێ. لەبەرئەوە پاراستنی زمان، ڕاژەکردنی زمانی نەتەوەیی، کۆکردنەوەی ووشە، نووسینەوەیان و ڕێکوپێککردنیان، لە پاراستنی ژیان و گیانی مرۆڤ گەلێ گرنگترە. چونکە، گەر هەزاران کەس ژیان و گیانیان لەدەسدا، نەتەوەکە نامرێ، بەڵام، گەر هەر نەتەوەیەک، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی لە بیرکرد و نەما، ئەوا وردەوردە، پێوەندیی کۆمەڵایەتیی، نێوان ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەیە، کزولاوازدەبێ، لە کۆتاییشدا، ناوی لە نێو ناواندا نامێنێ!

## 5. زمانی ئایین و زمانی نەتەوەیی :

هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، بە شێــوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، زمــانی ئایین و زمانی نەتەوەیی، کارێکی زۆریان، لە یەکدی کردووە. هەروەها، کاریان لە پێشکەوتن یا لە دواکەوتنی نەتەوەکانیش کردووە. ئەو کارتێکردنە، یا بە شێوەیەکی باشبووە، هەر دوو زمانەکە شانبەشانی یەکدی، گەشەیانکردووە و پێشکەوتوون، یا بە شێوەیەکی خراپبووە، یەکێکیان زیانی بەوی دیکەیان گەیاندووە، ڕێگەی گەشەسەندنی لێ گرتووە، دوایخستووە و پەکیخستووە. هەر دوو زمانەکەش، پێوەندییەکی یەکجار زۆریان، بە ئازادیی، سەربەخۆیی و دامەزراندنی دەوڵەتی ناسیۆنالەوە هەبووە.
پێش ئەوەی، ئایینە ئاسمانییەکان بڵاوبنەوە، پێش ئەوەی، پەرتووکە پیرۆزە ئایینیــیــەکــان، بە یەکێ لە زمــانە نەتەوەیی یەکــانی ئەو ســەردەمــانە بنووســرێنەوە، زمــانی ئایین، کــارێکی زۆری لە زمــانە نەتەوەیی یەکــان نەکردووە و مەترسییــەکی ئەوتۆی بۆیان نەبووە. چونکە، لەو سەردەمانەدا، نەتەوە جیــاوازەکــانی ســەر ڕووی ئەم زەوییــە، هەر یەکــەیان ئایینێکی تایبەتییــان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، جا باوەڕیان بە هەر جۆرە شتێ بووبێ، هەر جۆرە بتێکیان داتاشیبێ و پەرستبێ، تەنیا بەو زمانانە ناویان لێ ناون و لێیــان پاڕاونەتەوە، کــە خۆیان قســەیان پێ کــردووە. لەبەرئەوە، زمــانی نەتەوەیی و زمانی ئایینییــان، هەر یەک زمان بووە، زمانە ئایینییەکەیان، هیچ جۆرە مەترسییەکی، بۆ سەر زمانە نەتەوەیی یەکانیان دروس نەکردووە.
بۆیە دەتوانین، بڵێین :
(هەمــوو ئایینەکــانی چەرخی بتــپــەرســتــیی، تێکڕا بە کــرداری نەتــەوەیی دەژمێررێن. چونکە، هەمــوو جۆرە تکا و نزا و پەرستنێکی ئەو بــتانە، هەر کەسە بە زمــانی وڵات و نەتەوەی خۆی کردوویەتی. مــانــای وایە، لە ڕێی پاراســتنی زمــانەکــەیەوە، نەتەوەکــەی خــۆشی پاراســتــووە. کــە وڵاتێــکی بێگانەشی داگیرکردبێ، چووە ئایینەکەی خۆی بە زمانەکەی خۆی، بە سەر وڵاتی داگــیــرکــراودا سەپاندووە و بەوە سنووری بڵاوبوونەوەی زمــانــەکــەی فراوانتر کردووە.)«1،82»

بەڵام، ئەم بارودۆخـە، تا سـەر بەردەوام نەبووە، بەڵکوو، کـاتێ ئایینە ئاسمانییەکان داهاتوون، زمانی ئایین کارێکی زۆری، لە زمانە نەتەوەیی یەکان کردووە. ئەویش، بە هۆی ئەوەوە، کاتێ نەتەوەی خاوەن ئایین، چەن وڵاتێکیان داگیرکردووە، ئایینەکەی خۆشیان بە زۆر، بە سەر دانیشتووانی ئەو وڵاتانەدا سەپاندووە. هەمیـشـەش هەوڵیـانداوە، لە ڕێی زمـانی ئایینەوە، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، بە سەر ئەو نەتەوە داگیرکراوانەدا بسەپێنن. گەر نەشیانتوانیبێ، زمانە نەتەوەیی یەکانیان، بە تەواویی لەنێوبەرن، ئەوا بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیانداوە، زمانە نەتەوەیی یەکانی نەتەوە بندەستەکان، سووکوچرووککەن، بە زمانێکی خراپ و دواکەوتووی بناسێنن، لەو ڕێیەشەوە زمانە نەتەوەیی یەکە، بە تەواویی کزولاوازکەن و لە پەلوپۆخەن.

هێندێ لە نەتەوەکان، زمانی ئایینیی و زمانی نەتەوەیی یان، هەر یەک زمان بووە. ئەم نەتەوانە، تووشی گرفتێکی ئەوتۆی نەتەوەیی و زمان نەبوون. بە پێچەوانەوە، زمانە ئایینییەکە، ڕاژەی زمانە نەتەوەیی یەکەی کردووە. وەک عەرەبەکان، هەر دوو زمانەکەیان یەکبووە. ئایینیی ئیسلام، ڕاژەیەکی زۆر گەورەی زمانی عەرەبیی کردووە، لە لەنێوچوون و لاوازیی پاراستوویەتی، پەرەیپێداوە، بە تەواویی بە هەموو جیهانی عەرەب و وڵاتانی موسوڵماندا بڵاویکردۆتەوە.

هێندێ نەتەوەی دیکەش، هەر دوو زمانەکەیان جیاوازبووە، زمانی نەتەوەیی یان هەبووە، بەڵام زمانی ئایینییان لە نەتەوەیەکی دیکەوە وەرگرتووە. زمانی ئەم نەتەوەیە، خۆی لە بەردەم مەترسیی زمانە ئایینییەکەدا بینیوەتەوە. زمانە ئایینییەکە، هەمیشە هەوڵیداوە، جێ بە زمانە نەتەوەیی یەکە لەقکا، بە سەریدا زاڵبێ و لەنێوبەرێ. لەبەرئەوە، ئەم نەتەوانە بەرەورووی چەڵەمەیەکی زمانەوانیی گەورە بوونەتەوە. بۆیە هەوڵیانداوە، خۆیان لە کارتێکردنی زمانە ئایینییەکە بپارێزن، وەک کارتێکردنی زمانی عەرەبیی، لە زمانەکانی « تورکیی، فارسیی، کوردیی ... تاد ». بەڵام، بە شێوەیە لە شێوەکان، زمانە ئایینییەکە، هەر کاری خۆی، لە زمانە نەتەوەیی یەکان کردووە، لاواز و بێپێزی کردوون، گەلێ لە

ووشه و زاراوەکانی زمانە ئایینییەکەی نەتەوەی بالادەس، تێکەڵاوی زمانە نەتەوەیی یەکەی نەتەوە بندەسەکان بوون. گەر زمانی ئایین، لەگەڵ زمانە نەتەوەیی یەکەدا، خزمایەتییان نەبێ و لە یەکدییەوە دووربن، ئەوا جگە لەوەی، بە دوو زمانی جیاواز دەژمێررێن، لە هەمان کاتیشدا، هێندێ پیت و ووشەی نوێ، بە سەر زمانە نەتەوەیی یەکەدا دەسەپێنێ، هێندێ جاریش دەنگەکانیش دەگۆرێ. زمانی کوردیی دوای ئیسلام، ئەو زمانەی پێش ئیسلام نەبوو، بەڵکوو، زمانی عەرەبیی کاری خۆی تێکردبوو. بۆ نموونە: پیتەکانی « ث، ص، ض، ذ، ط، ظ »، تێکەڵ بە زۆربەی زمانی گەلانی ئیسلامی ناعەرەب بوون. گەر پیتەکانیش، وەک خۆیان چۆن هەن، بەکار نەهێنرێن، ئەوا کارێکی یەکجار زۆری، لە فۆنێتیکی زمانەکان کردووە. (زمانی دینی تازە « دەنگ »ی وای تێدابوو کە لە زمانەکانی «ئێرانی »دا بەرچاو نەدەکەوت، گومانی تێدا نییە، کورد یا فارسێکی سەرەتای ئیسلامەتیی تا ماوەیەکی زۆر نەیتوانیوە، ئەو دەنگانە وەکوو عەرەبێک تەلەفوزکا، فارسەکان و گەلێ نەتەوەی موسوڵمانی ئێستەش، ئەو دەنگانەیان وەکوو خۆی بۆ ناگوترێ.)«36-35,70»

ئاشکرایە، لە نیوەی یەکەمی چەرخی حەوتەمی زاییندا، ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە، لەشکری ئیسلام توانی، لە ماوەی چەن ساڵێکی کەمدا، ئیمپراتۆریای « ساسانیی » لە بنوبێخەوە هەڵتەکێنێ. بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا، لە هەر ڕوویەکەوە بیگرین، گۆڕانێکی قووڵی لە ژیانی گیانیی و مەتیریالی، دانیشتووانی ناوچەکەدا دروسکردووە. جگە لەوەی، دەسەڵاتی ڕامیاریی پێشووی گۆڕی، لە ڕووی ئایین و زمانیشەوە، دیسانەوە گۆڕانکارییەکی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. « قورئان » وەک پەرتووکێکی پیرۆزی ئایینی نوێ، جێگەی بە «ئاڤێستا » وەک پەرتووکی ئایینی زەردەشتیی لەقکرد. هەروەها، زمانی عەرەبیی، وەک زمانی ئایین و نەتەوەی بالادەس، خۆی بە سەر زمانی دانیشتووانی ناوچەکەدا سەپاند. لەبەرئەوە، گەر دانیشتووانی ناوچەکە، بە خێرایی و بە ئاسانیی، فێری زمانەکە نەبوون، ئەوا ناچاربوون، لە ئایینەکەدا ئەو شتانە فێربن، کە دەبووایە، هەموو موسوڵمانێ فێری بوونایە

و بیانزانیایه.(دیینی ئیسلام ئەرکی وای تێدا بوو کە دەبووایە خەڵک وەکوو پێویستێکی دیینیی جێبەجێیان بکەن و لە دیینەکەی پێشوویاندا نەبوو، بۆیە دەبوو، ناوی ئەم ئەرکە دیینییانە لە زمانی دیینی تازە وەربگرن، هەر وەک وەریانگرتووە.)«35-70»

دیارە، هەر لە کۆنەوە، وەک یاسایەکی سروشتیی، هەستێکی خۆماتکردوو، لە ناخی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەدا هەبووە. ئەو هەستەش پتر هانیداوە، پارێزگاریی خۆی بکا، لە دەس کارەسات و ڕووداوە سروشتییەکان، خۆی بپارێزێ، دژی ئاژەڵە کێوییی و دوژمنەکانی داکۆکیی لە خۆی بکا، ئەمەش هەمووی لە پێناوی ئەوەدابووە، تا بەرگەی گرفتەکانی ژیان بگرێ، بەربەرەکانی هەموو جۆرە مەترسییەک بکا، پتر بژی و بمێنێتەوە.(ئەم خۆڕاگرتن و هەوڵی مانەوەیە، وەک هەر لە مێژەوە، لە تاکەتاکەی خەڵکیدا بووە، دیارە لە نێو هۆز و گەل و نەتەوە جۆرجۆرەکانیشدا هەر بووە. هەر یەکێ لەوانە بە گەلێ هۆ و ڕەنگی جیاواز و لە گەلێ کالا و بەرگی جیاوازدا، ئەم ئارەزووی مانەوەیەی دەربڕیوە و ویستوویەتی، خۆی لە توانەوە و لەناوچوون بپارێزێ. بە لای ئێمەوە، «مەبەستیان لە هەڵگرانی بیری کاژیک بووە ـ نووسەر. » قایمترین و باشترین کالا، بۆ پاراستنی زۆربەی نەتەوەکان، لە دەورانی کۆندا، ئەو بیروباوەڕانە بوون، کە لە شێوەی ئایین و ئایینزای هەمەچەشنەدا خۆیان دەرخستووە.

لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ، بڵێین: هەموو نەتەوەیەک توانیبێتی، هەر بە تەنیا بۆ خۆی بژی و دوورەپەرێز لەوانی تر بوەستێ. چونکە گەلێ جار، هەر بە هۆی ئەم ئایین و ئایینزایانەوە، چەن نەتەوەیەک لە ژێر ئالای تاکە ڕژێمێکدا کۆبوونەتەوە و پێکەوە ژیاون. بەڵام ئەم ئایین و ئایینزایانەش، لە کانگای چ نەتەوەیەکیانەوە هەڵقوڵابێ، بە زۆری ئەوەیان توانیوێتی، دەس بە سەر ئەوانی تردا بکێشێ و بیانخاتە چوارچێوەی نەتەوەیی خۆیەوە. لەبەرئەوە، ئەوانیش کەوتوونەتە بەربەرەکانییەوە لەگەڵی و لە ئەنجامدا، یان سەرکەوتوون و سەربەخۆ بوون، یان بە جارێ ژێرکەوتوون و بەرەو توانەوە چوون. چاکترین وێنەش بۆ ئەمە، ئایینی دیانە « مەسیحی »

یەکانە. چونکە ئەوەبوو، کتێبی ئایینی دیانێتی، نەتەوەکانی ئەوروپای لە ژێر سایەی خۆیدا کۆکردبووەوە، لە هەمان کاتدا دەیویست، زمانی لاتینی بە سەر زۆربەیاندا بسەپێنێ. « هەرچەندە زمانی لاتینی لەوەپێش لە ناو هەندێکیاندا بڵاوبووبووەوە » هەروەها دەتوانین، یەکەم جیابوونەوەی کەنیسەی « ئۆرتۆدۆکس » بە کردەوەیەکی نەتەوەیی بژمێرین. چونکە پاش جیابوونەوەی هات، یەکسەر زمانی یۆنانی کرد بە زمانی ڕەسمیی خۆی و بەم جۆرە بەشێکی زۆری ئەوروپای ڕۆژهەڵات، لە چنگ زمانی لاتینی ڕزگاربیوو. تەنانەت جیابوونەوەی کەنیسەی « بولگاریی »ش لە کەنیسەی « ئۆرتۆدۆکس » لەم دواییەدا، دیسانەوە و بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەو قسەیە. جگە لەوەش، ئەو نەتەوانەی زمانیان لاتینی نەبوو، لە ڕۆژاوای ئەوروپادا وەک گەلانی جەرمانی و ئەنگلۆساکسۆنی توانییان، بە هۆی وەرگرتنی ئاینزاکانی پرۆتیستانتەوە، زمانی خۆیان بپارێزن.کە ئەم کارەش لە خۆیدا کردەوەیەکی نەتەوەیی یە.)«1،82»

لە کۆندا، هێندێ نەتەوەی وەک « هەنگاریی، بولگاریی، ڕۆمانیی و ... » لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان لێ داگیرکراوە. بەڵام، دوای ماوەیە، بزووتنەوەی نەتەوەیی لەو وولاتانەدا، لە سەر بنچینەی یەکێتیی زمان، گەشەسەندن و پەرەپێدانی فەرهەنگی نەتەوەیی دەسپێکردووە و ڕزگاریانبووە. گەلێ جار، زمانی ئایینی هاوبەشی، نێوان دوو نەتەوەی داگیرکەر و داگیرکراو، ڕۆڵێکی سەرەکیی، لە چەوساندنەوە و دیلکردنی گەلێکی دیاریکراودا وازیکردووە. وەک زمانی هاوبەشی ئایینیی، نێوان نەتەوەکانی « کورد و عەرەب، کورد و تورک، کورد و فارس، تورک و عەرەب ... هتد ». جا گەر کارتێکردنی ئایین نەبووایە، ئایا چی وای لە دانیشتووانی خوارووی « فیلیپین » دەکرد، فێری زمانی عەرەبیی بن، خۆیان لە برا فیلیپینییەکانی دیکەیان جیاکەنەوە، داوای جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی بکەن، لە ماوەی ئەو سی ساڵی خەباتەیاندا، خوێنێکی زۆر برێژن، بە مەرجێ ژمارەیان زۆر کەمە و لە « 5 - 10 ٪ »ی، هەموو دانیشتووان پێکدێنن، زمانەکەشیان هەر هەمان زمانی نەتەوەیی بێ، کە گەلی فیلیپین پێی دەدوێن؟!!

هێندێ لە گەلانی جیهان، بە هۆی ئایین و ئایینزای جیاوازەوە، زمانی نەتەوەیی خۆیان پاراستووە و دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزراندووە. واتە: پێش ئەوەی، دەوڵەتی خۆیان هەبووبێ، زمانی ئایینیی یەکگرتووی خۆیان هەبووە. وەک جووەکان، لە هەموو کونوقوژبنێکی جیهانەوە، بە هۆی « تەورات »ەوە، لە دەوری ئایینەکەی خۆیان کۆبوونەوە، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دەوڵەتی ئیسرایلیان دامەزراند و زمانێکی یەکگرتووی هاوبەشیان، بۆ خۆیان زیندووکردەوە.
پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام دەرکەوێ، هەموو ئەو ئایین و ئیمپراتۆریانەی هەبوون، لە سەر بنچینەی جیاوازیی چینایەتی دامەزرابوون. بۆ نموونە: (هەر دوو کۆمەڵی ساسانیی و بیزەنتیی، لە سەر بنچینەی چینایەتیی دامەزرابوون. چینەکانی سەرەوە حوکمی وڵاتیان ئەکرد و سەرکردایەتی لەشکر و لەشکرکێشییەکان، چینەکانی خوارەوەش کار و پیشە و هەندێ جار سەربازی شەڕکەربوون. ئیسلام وەکوو دینێکی تازە کە هات، سنووری چینەکانی لە ناو ئەم کۆمەڵانەدا تێکدا و بانگی دوو جۆرە یەکسانیی بە گوێی مرۆڤایەتیدا دا: یەکسانیی لە نێوان عەرەب و هەموو نەتەوەکانی تردا و یەکسانیی هەمووان لە ناو کۆمەڵی ئیسلامدا. تەنیا شت کە ئەبوو، بە هۆی جیاوازیی لە نێوان نەتەوەیەک و نەتەوەیەک و مرۆڤێک و مرۆڤێکدا خواپەرستی « تەقوا » بوو.)«225،116» دیارە، ئەمە لە سەرەتادا وابووە، بەڵام، دوایی وردوردە، زۆربەی شتەکان گۆڕاون.
وەک هێندێ لە سەرچاوەکان باسیدەکەن، لە سەردەمی پەیامبەری ئیسلامدا، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە میانەی گەلانی ئیسلامدا نەبووە، تا هەستی پێ بکرێ. بەڵام، دوای ئەوەی پەیامبەر مردووە، ئیدی بەرەبەرە، بارودۆخەکە گۆڕاوە. (لە دوای کۆچی پێغەمبەریش، هەتا نزیکەی چل ساڵێک کەس گوێی نەدەدا بە نەژاد، بە خوێن، بە نەجیمی و نانەجیمی. هەر لە خواترسان مەرج بوو بۆ گەورەیی و قەدر و حورمەت. بەڵام بە هەزار داخەوە هەر لەو ساوە حوکم کەوتە دەست بەرەی ئەمەوییەکان و پادشایەتی بە کەلەپوور لە ناو ئیسلامدا دامەزرا. برایەتی گەلانی ئیسلام توایەوە و بە ناخی هەردا ڕۆییە خوار. کار بوو بە زۆردار و بێ زۆر. هەر کەس، هەر

تیره، هەر بەرەی دەسەڵاتی وەدەسکەوت خۆی و خزم و هاونەژادی بڵندکرد و وەکوو ئاژەڵ لە هاودینە نامۆیەکانی دەڕوانی. خەلیفەکانی ئەمەوی ئەگەر تەرمێکیان بدیبا، دەیانپرسی: کێیە؟ ئەگەر دەیانگوت قورەیشە. هاواریان دەکرد خزمەڕۆ. ئەگەر بیان گوتایە عەرەبە، دەیانگوت لە هۆز کەمی کرد. بیانگوتایە عەرەب نییە و موسوڵمانە، دەیانگوت ها، ماڵی خوایە دەیدا و دەشیسێنێتەوە.)«8،49»

بەڵێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لە سەرەتادا شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیی گەورەی قووڵی، لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا بەرپاکرد. باوەڕی بە هیچ جۆرە جیاوازییەک، لە نێوان گەلانی ئیسلامدا نەبوو. جگە لە خواناسین و خواپەرستیی، هیچ جیاوازییەک لە نێوان موسوڵمانانددا نەبوو. بەڵام، ئەم باوەڕ و بۆچوونانە، هەمیشە بەپێی بەرژەوەندیی، دەستەی بەڕێوەبەرانی ئایینەکە گۆڕاوە. بۆ نموونە: لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا، بۆ یەکەم جار، یەکەم هەنگاوی ئەو پاشگەزبوونەوەیە دەرکەوت. چونکە، ئەمەوییەکان لە بری ئەوەی موسوڵمانێکی ڕاستەقینە بن، نەتەوەپەرستێکی ڕاستەقینە بوون. دوای ئەوەی هەر چی ناکۆکیی و دووبەرەکیی نێوان خۆیان هەبوو، چارەسەریانکرد، هەموو دوژمنەکانیان پاکتاوکرد، ئیدی هەوڵی داگیرکردنی وڵاتانی دیکەیان داوە. دیارە، ئەو داگیرکردن و فراوانکردنەی سنووری دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکەیان، پێویستی بە سوپایەکی گەورەی پڕ چەک، دەزگەی بەڕێوەبردن و جەنگیی، خەرجێکی یەکجار زۆر هەبووە. بۆیە، (یەکێ لە سەرەتا گرنگەکانی ئیسلام : « یەکسانیی موسوڵمانی عەرەب و موسوڵمانی ناعەرەب »یان هەڵوەشاندەوە. بەو گەلانەیان ئەوت « موالی » کە موسوڵمان بوون، بەڵام عەرەب نەبوون. وەک جاران موسوڵمانی عەرەب لە باج بەخشرابوو، بەڵام باج خرایە سەر « مەوالی »یش، وەکوو « جزیە » لە سەر « ئەهلی زیمـە » بوو.)«225،116» ئیدی بەو شێوەیە، هەموو(کاروباری دەوڵەت و دەسەڵاتداریی، لە دەس عەرەبدا کۆکرابووەوە. لە ناو عەرەبیشدا « قورەیش » لە پێش بوون. سەردەمێ « بەنی ئومەییە » و سەردەمێک « بەنی عەبباس )«226،116» هەروەها،(ئەمەوییەکان گیانی خۆبەزلزانینیان لە ناو عەرەبدا بڵاوکردەوە. بە چاوی سووک سەیری

گەلانی ناعەرەبیان ئەکرد، موسولمان بوونایە یا ناموسولمان.) «226،116» («عەرەب بوون»، لە ناو عەرەبیشدا «قورەیش بوون» پلەی مرۆڤی بەرزئەکردەوە و ئیمتیازی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و دارایی پێ ئەبەخشی.)«226،116» هەر بۆیە،(ئێلە موسولمانەکانی ناعەرەب بۆ خۆپاراستن، خۆیان خستۆتە پەنای یەکێ لە قەبیلە ناودارەکانی عەرەب بەرامبەر پێشکەشکردنی هەندێ خزمەت. زۆر کەس و زۆر تیرە لە سەرانسەری وولاتانی ئیسلامیدا، بۆ ئەوەی کەلک لە ئیمتیازەکانی عەرەب وەرگرن، ڕەچەلەکی خۆیان بردۆتەوە سەر یەکێ لە نەوەکانی عەلی، یان یەکێ لە خەلیفەکان، یا سەحابەکانی پێغەمبەر.)«226،116»
تەنانەت، ئایین کارێکی وای، لە خەلکی ناعەرەب کردبوو، سەردەمێ وای لێهاتبوو، خەلکی نەیانوێراوە، شانازیی بە نەتەوە و زمانەکەی خۆیانەوە بکەن، بۆیە یەکێکی وەک(شێخ محەمەدی زاهید، کە نازناوی تاجئەلعارفینی هەبووە و باپیری ئەو شێخ حیسامەدین چەلەبیە بووە، کە مەولانا جەلالەدین لە مەسنەوی پێیهەلدەلێ، لە هۆزی گاوانی کورد و لە سەرەتای چەرخی شەشەمیندا ژیاوە. فەرموویەتی:« شەو کورد بووم و هەر کردیە ڕۆژ بووم بە عەرەب » )«9،49»
هەروەها، عەرەبەکان بە هۆی « قورئان »ەوە توانییان، هەموو تیرە و هۆزەکانی عەرەب، لە نیوەدوورگەی عەرەبدا کۆکەنەوە و ڕێکیانخەن. پاشان، لە ژێر چارشێوی ئالای ئایینی ئیسلامدا، دەولەتێکی نەتەوەیی - ئیسلامیی دامەزرێنن، بەرەبەرە سنووری دەولەتەکەیان، لە سەر حسێبی گەلانی ناوچەکە فراوانکەن و لایەکی ئەم سەر زەوییە داگیرکەن. بە تایبەتیی، لە سەردەمی ناوزڕاوی خەلیفەکانی هەر دوو دەولەتی ئەمەویی «661 -750 »ز و عەبباسیدا «750 ـ 1258»ز، ئەو دەسەلاتە عەرەبییە زۆر فراوانبوو، گەلێ وولاتی دیکەی گەلانی ناعەرەبیان داگیرکرد و لە لووتکەیان تێپەڕاند.
« عەلی عەبدولڕەزاق »، یەکێ لە زانا بە ناوبانگەکانی « ئەزهەر » بوو. ماوەیەکی زۆریش، شالیاری کاروباری ئایینی « میسر » بوو. لە سالی «1925»دا، پەرتووکی « ئەلئیسلام و ئسولێ ئەلحوکم »ی بە ناوبانگی

بلاوکردەوە. ئەو زانایە، زۆر بە ڕاشکاویی و بە شێوەیەکی جەسورانە، لەو باسانە دواوە و باوەڕی خۆی دەربڕیوە. لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، دوو کۆپلەی بیروڕاکانی مامۆستا «عەلی»، بۆ نێو باسەکەمان ڕاگوێزم.
دەرباری دەسەڵات لە ئیسلامدا، دەڵێ: (خەلافەت لە ئیسلامدا، تەنیا لە سەر بناغەی زەبروزەنگ و هێزێکی تۆقێنەر دامەزرابوو. ئەو هێزە، زۆربەی کات، هێزێکی مەتیریالیی چەکداربوو. هیچ شتێ پلەوپایەی خەلیفەی بەرز نەدەکردەوە و چواردەورەکەی نەدەپاراست، ڕم، شمشێر، سوپای چەکدار، توندوتیژیی و سەرکوتکردن نەبێ).
پاشان، دەڵێ: (ئەو دەوڵەتەی لە سەردەمی ئیسلامدا دروسبوو ... دەوڵەتێکی عەرەبیی بوو، لە سەر بناغەی بانگهێشتنی ئایینیی دامەزرا بوو. دروشمی ئەو دەوڵەتە، پاراستنی ئەو بانگهێشتنە و مانەوەی بوو. بەڵێ، لە ڕاستیدا کارێکی زۆری کردە سەر کاروباری ئەو بانگهێشتنە. نکولی لە ڕۆڵی کاریگەرێتی ئیسلام لە گۆڕان و پێشکەوتنیدا ناکرێ. بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، لەوە بەدەر نەبوو، کە دەوڵەتێکی عەرەبیی بێ، پشگیریی دەسەلاتی عەرەبیی دەکرد، ڕەواجی بە بەرژەوەندییەکانی عەرەب دەدا و لە هەموو ولاتانی سەر زەویدا، دەسەلاتی بۆ پەیدا کردبوون) «198,59»
دیارە، لەو کات و ساتە مێژوویی یانەی، ئایینی ئیسلام بە چەشنی بارانی بەهار، خێر و خۆشیی بە سەر نەتەوەی عەرەبدا دەباران، بە هۆی کردەوەی خراپی بەڕێوەبەرانی ئایینەکەوە، ماڵوێرانییەکی زۆر، چەوساندنەوە و ژێردەستیی نەتەوەیشی، وەک قەفی ئەستووری کۆت و زنجیر، لە مل و گەردنی گەلانی بندەستیانەوە دەئالاند!
گەورەترین بەلگەی گرنگیی، مەزنیی، بەرزیی و پیرۆزیی زمانی نەتەوەیی، لە شێوازی ئایینە جیاجیاکاندا دەردەکەوێ. چونکە، یەزدانی مەزن، هەموو جۆرە ئایینەکانی ئاسمانیی، بە یەک زمانی یەککگرتوو، بۆ پەیامبەرانی خۆی نەناردووە. بەلکوو، هەر ئایینەی، بەگوێرەی زمانی ئەو پەیامبەرە ناردووە، کە لە نێو ئەوگەلەدا هەلکەوتووە. دیارە، ئەو پەیامبەرە، لە نێو گەلێکی دیاریکراودا، چاوی بە ژیان هەلێناوە. ئەو گەلەش، زمانێکی تایبەتیی

هەبووە. هەر بە هۆی ئەو زمانە نەتەوەیی یەشەوە، لە گەلەکانی دەورووبەری خۆی و لە یەکدی جیاکراونەتەوە. بۆ نموونە: لێرەدا باسی هەر دوو ئایینی پیرۆزی « زەردەشتیی » و « ئیسلام » دەکەین. « زەردەشت »ی پەیامبەر، لە خاکی کۆنی ئێرانی ئەورۆدا لە دایکبووە. لە نێو گەلانی ئەو سەردەمەی ئێراندا گەورەبووە و ژیاوە. هەر بەو زمانەش قسەیکردووە، کە یەکێ لەو گەلانە، پێی دوواون. بۆیە، « زەردەشت » ئامۆژگاریی، سروودە ئایینیی و دەقە پیرۆزەکانی « ئاڤێستا »ی، هەر بەو زمانە نەتەوەیی یە ڕەسەنەی خۆی نووسیووەتەوە، کە ئەورۆ شارەزایانی زمان و ڕۆژهەڵاتناسەکانی جیهان، بە زمانی « ئاڤێستا »ی ناودەبەن. کەواتە: بۆیە، هەموو ئەو ئایین و ئایینزایانەی، لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا سەریانهەڵداوە، پەیامبەر و ڕێبەرەکانیان کورد بوون، هەر هەمووشیان بە زمانی کوردیی نووسراون، تا کورد لێیان تێبگا، پێویستیان بە وەرگێڕ و وەرگێڕان نەبێ، لە کۆتاییشدا، باوەڕ بەو پەیامبەر و ڕێبەرانە بێنن.

هەروەها، پەیامبەری ئیسلامیش « محەمەد »، لە نیوەدوورگەی عەرەبدا و لە (12/ڕەبیع لئەوەل/570)ز لە دایکبووە. لە نێو تیرەی « قورەیش »دا، گاگۆڵکێ و دارەدارەیکردووە، پاشان، سەرپێی خۆی کەوتووە. هەر لە منداڵیشەوە، زمانی بە ووشەی عەرەبیی ئەو سەردەمە پژاوە و فێری گروگاڵبووە، پاشتریش، بە عەرەبیی پەیڤیوە و گفتوگۆی لەگەڵ هاوزمانەکانیدا کردووە. کاتێکیش، ملی ڕێگەی ئەشکەوتی « حەڕا »ی گرتووە، هەر بە عەرەبیی، بیری لە کاروباری ئەم گەردوونە کردۆتەوە. یەکەم جاریش، کە « جوبریل »ی فریشتە خۆی پیشانداو قسەی لەگەڵدا کرد، هەر بە زمانی عەرەبیی فەرمووی: ( اقرء باسم ربک الذی خلق، خلق الانسان من علق) کەواتە: جارێ با لێرەدا، باسی هۆکانی دیکە نەکەین، هەر هێندە بڵێین: بۆیە، قورئان بە عەرەبیی هاتە خوارەوە، چونکە، پەیامبەرەکە عەرەب بوو، لە نێو عەرەبدا دەژیا، سەرەتا مەبەستەکەش هەر گەلی عەرەب بوو، پاشان هەموو کۆمەڵگەی مرۆی گرتەوە. واتە: لە بەشەوە بۆ گشت دەسپێکرد. گەر وا نەبووایە، هەڵبەتە دەبووایە، ئاڤێستا بە عەرەبیی و قورئان بە کوردیی، یا بە هەر زمانێکی دیکە بهاتنایەتە

خـوارەوە، پاشـانیش، هەر بەو زمـانانە بنووسـرانایەتەوە. بەڵام، یەزدانی گەورە خۆی دەزانێ، چی دەکا و هەموو کارەکانی بە ڕێوجێیە، نەک بە گۆترە و ڕێکەوتبێ!

بۆیە، ئەز پێمـوایە، زمـانی نەتەوەیی هەر نەتەوەیەک، دیارییـەکی گـەورە و پیرۆزە، یەزدان بەو کۆمەڵە مرۆڤە دیاریکراوەی بەخشیوە. دەبێ، ڕێزی لێ بگـیرێ، ڕاژەکـرێ، پێـشـخـرێ، لە کزیی، لاوازیی، پەڕپوتیی و فـەوتان بپـارێزرێ. گـەورەترین گـوناح، مـەزنتـرین تاوان و گـومـڕاییش ئەوەیە، دەسـەڵاتدارێکی زۆردار، دەسـتـە و تاقـمـێکی ملهـوڕ، کـاربەدەسـتـانی دەزگـەیەکی دەوڵـەتێکی دیاریکراوی شـۆڤـێنیی و ڕەگـەزپەرست، خـاکی وولاتێ داگیرکەن، گەلەکەی بچەوسێننەوە، زمانەکەیان لێ قەدەغەکەن، بە هەمـوو شـێـوەیە هەوڵدەن، زمـانە نەتەوەیی یەکـەیان، لە بۆتەی زمـانە نەتەوەیی یەکـەی خـۆیاندا بتـوێننەوە. ئەم کـردەوە چەپەڵانەش، بە هەمـوو شێـوەیە، بە دژایەتیکردنی نەتەوەکـان دادەنرێ و بە لادان لە فـەرمـانەکـانی پەروەردگار دەژمێردرێ. چونکە، خوا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

(انا خلقناكم من ذكر و انثى و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقـاكم) واتە: ئێـوەمـان بە شـێـوەی گـەل و هۆز لە نێـر و مێ دروسکرد، بۆ ئەوەی یەکدی بناسن. هەرە بەڕێزەکەتان لای خوا ئەوانەتانن، کە تەقوای زیاتر دەکەن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، نیشـانەیەکی باشە و ئەوە دەگەیەنێ، جگە لەوەی ئەو چوار دەوڵـەتە خاکی کوردستانیـان داگیـرکردووە، بە خـراپتـرین شـێوە، نەتەوەی کـورد دەچەوسێننەوە، لە ڕووی ئـاییـنیـشـەوە، تاوان و گـوناحـێکی گـەورە دەکـەن. چونکە، ئەوان بێ هۆ، مـاف لە کـورد زەوتدەکەن، کورد قڕدەکەن و دەیانەوێ، ناوی لە کولەکەی تەڕیشدا نەهێڵن، هەر کـەسـێکیش بێ هۆ یەکێ بکوژێ، جگە لەوەی دەس لە کـاری یەزدان وەردەدا و دژایەتیـدەکـا، وەک ئەوە وایە، هەمـوو خەڵـکی ئەم سـەر زەوییـە بکوژێ، هەر وەک پەروەردگاریش لە قورئاندا دەفەرمووێ :

(من قتل الناس بغير حق كانما قتل الناس جميعا) « ص » .

سەیر ئەوەیە، قـورئانی پیرۆز، دان بەوەدا دەنـێ، زمـانەکـان جیـاوازن، هەر گەلێ زمانی تایبـەتیی خۆی هەیە، وەک خوای مەزن لە سورەتی « ئەلڕۆم »

دا دەفەرموێ: (و من اياته خلق السماوات و الارض و اختلاف السنتكم و الوانكم ان فى ذلک لايات للعالمين) هەر چەندە، لە لایەکەوە « عەرەب، تورک و فارس »ەکان، خۆیان بە موسوڵمان دادەنێن، شانازییەکی زۆر بە ئیسلامەوە دەکەن، کەچی دان بە زمانی کوردیی و زمانەکانی دیکەی گەلانی بندەسیاندا نانێن، نکولی لە بوونیان دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا، بانگاشەی ئایینی ئیسلام دەکەن، بە ناوی ئیسلامەوە، کورد بە گاور* و تێکدەر دادەنێن. لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ لەو کوردانەی هۆش و گۆشی نەتەوەیی یان نییە، هەستی کوردایەتییان لاوازە، بە ناوی ئایینەوە دژایەتی زمانی کوردییان کردووە. هەمیشە، بە زمانی عەرەبییەوە خۆیان خەریککردووە. لەبەرئەوە دەبینین، لە هەموو سەردەمێکدا، هێندێ کورد هەبوون، هەستی نەتەوەیی یان لاوازبووە، ڕێزی خۆیان و زمانەکەیان نەگرتووە. بۆیە، گەر نووسەرێ بابەتێکی بە کوردییەکی پەتیی و ڕەسەن نووسیبێ، یا دەقێکی قورئانی پیرۆزی وەرگێڕابێ، یا گەر هۆنەرێ هۆنراوەیەکی بە کوردیی گوتبێ، ئەوا زۆر بە توندیی هێرشیان بۆ بردووە، پەلاماریانداوە، بە پیاوخراپ و گومڕا ناویان بردووە.

هەڵبەتە، لە هەموو سەردەمێکیشدا، چەن کەسانێ هەبوون، هەستی نەتەوەیی یان بەهێزتربووە، زمانەکەی خۆیان خۆشویستووە. لێرەدا بۆ نموونە دەڵێین: مەلایەکی وەک « ئیبنو ئادەم »، لە ساڵی(1205ک ـ 1790ز)دا، ڕەخنەی لەو کەسانە گرتووە، کە کەموکوڕییان لە زمانی کوردیی دۆزیوەتەوە، یا لایان شەرم و پێیان نەنگیبووە، بە کوردیی بنووسن. بۆیە، بە پەندێکی کوردیی پلاری تێگرتوون و گوتوویەتی: (وەک هێلکە لە توێلکی خۆیان دەرچوون)« 107، ا ـ پ »

برا عەرەبە « زۆرا » موسوڵمانەکانمان، تەنانەت، وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز

---

* ووشەی گاورم، بۆ مەبەستی « کافر »ی عەرەبیی بەکارهێناوە. ئەم ووشەیە، بە هەڵە لە بری « مەسیحیی » عەرەبیی بەکارهاتووە. بەڵام، ڕاست نییە. چونکە، لە کوردیدا « فەلە یا دیان »، بەرانبەر « مەسیحیی » بەکاردێ.

و فەرمایشتەکانی پەیامبەریشیان، بە کارێکی ناڕەوا زانیوە. بەڵام، ئەو عەرەبە موسوڵمانانە، بیریان لەوە نەکردۆتەوە، لە کوردستانێکی دواکەوتوودا، دەسی خوێندن و خوێندەواریی نەگەیشتبێتێ، لە خوێندن و خوێندەوارییەوە دووربووبێ، کوردێکی چیایی و گوندنشین، لە شارەوە دووربووبێ، گەر زمانی عەرەبیی نەزانیبێ، بە هیچ شێوەیە لێی تێ نەگەیشتبێ، چۆن دەتوانێ، لە فەرمایشتەکانی یەزدان و گوتەکانی پەیامبەر بگا؟! وەک « هەژار » دەڵێ: (تەنانەت زمانەکەشمان لە لای ئەوان بۆتە مایەی گوناهباریی. کورد هەرگیز لە هیچ کاتێکدا، لە ژێر حوکمی ئەو موسوڵمانە جوانانە! نەیوێراوە، تەفسیری قورعانی خوداش بە زمانی کوردیی بنووسێ.)« 10،49 »

لە ڕاستیدا، ئەمە لەوە دەچێ، وەک ئەوەی یەزدان عەرەب بێ و تەنیا زمانی عەرەبیی بزانێ. بۆیە، بەو شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ کورد و گەلانی دیکەدا کردووە! ئەدی ناڵێن: هەموو ئەو گەلانە و زمانەکانیان، هەر خوا دروسیکردوون؟! ئیدی، گەر وایە، بۆ دەبێ، ڕسقی خودا ڕەتکەنەوە؟! زمانی گەلانی دیکە قەدەغەکەن و بتوێننەوە؟! لە بری زمانە نەتەوەیی یەکان، زمانی عەرەبیی لە جێ بڕوێنن؟! ئایا، ئەوە گوناح نییە، برای هاوئاییینی عەرەب، بەرانبەر برا کوردەکانی خۆیان دەیکەن؟! نازانم، بۆچی لەو سەردەمانەدا، شێخێ، مەلایە، زانایەکی کورد لێیان ڕاست نەبۆتەوە، پەلاماری نەداون و پێی نەگوتوون: براینە! ئێمەی کوردیش، گەلێکی موسوڵمانین، هەر ئەو خودا تاکوتەنیایە دروسیکردووین، کە ئێوەشی دروسکردووە و بەو شێوەیە دەسەڵاتی پێ بەخشیوون. بۆ بەو شێوەیە ڕێگەمان لێ دەگرن و زمانەکەمان لێ قەدەغەدەکەن؟ گەر خوا لە زمانی ئێوە تێبگا، ئەوا لە هەموو زمانەکانی دیکەش تێدەگا. ئیدی، بۆ ڕۆڵەکانی کورد، بە زمانی کوردیی قورئان نەخوێنن و گوتەکانی پەیامبەر باس نەکەن؟ بۆ بە زمانی خۆمان، لە پەروەردگار نەپاڕێینەوە و ڕازونیازەکانی خۆمانی لا نەدرکێنین؟ هەر ئەو بیروباوەڕە چەوتانە بووە، هەر هێندێ لە مەلا نەشارەزاکانی کورد بوون، ئەو کارانەیان کردووە، بە هیچ شێوەیە، بە مێشکیاندا نەچووە، گەر قورئان بە عەرەبیی بێ، بۆچی دەبێ، قەدەغەکرێ،

به زمانێکی دیکه بڵاوکرێتەوە! بۆیه کاتێ،(بۆ یەکەم جار مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ، کە تەفسیری جزمی عەمای کرد و لە چاپی دا بە کوردیی، لە لایەن هەندێ مەلا و نیمچە خوێندەوارەوە هەندێ هێرشی ناڕەوای برایە سەر)«77،44»

هەروەها، هێندێکی دیکە، بەوەشەوە نەوەستان. بەڵکوو،کاتێ زانای کورد « تۆفیق وەهبی »، بە دڵ و بە گیان، ڕاژەی زمانی کوردیی دەکرد، لە لایەن هێندێ کەسی نەخوێندەوارەوە پەلاماردراوە،(مامۆستا تۆفیق وەهبی کە عەلامە و شارەزایەکی زۆر بەرزی کوردە لە زمانی کوردیدا، لە ڕووی بژارکردنی زمانی کوردییەوە، دەستێکی باڵای هەیە، لەم ڕووەوە لە کاتی خۆیدا تووشی گەلێ هێرش هاتووە، بەڵام ئەو گوێی نەداوەتێ و لە سەر مەبەستی خۆی ڕۆیوە و هەوڵوتەقەلاکەی هاتۆتە بەرهەم.)«42،44»

لێرەدا دەبێ، شتێکی دیکەش بڵێین: عەرەبە موسوڵمانەکان نەیانتوانی، ڕێگە لە فارس و تورکەکان بگرن، قورئان و گوتەکانی پەیامبەر، بۆ سەر زمانەکانی خۆیان وەرگێڕن. چونکە، ئەوان لە بندەسی عەرەبەکان ڕزگاریان بووبوو، خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان بوون. دواتریش، « عەرەب، فارس و تورک »ەکانیش، تەنیا گەریان لە کورد و گەلانی بندەسیان لە نێوچەکەدا ئاڵاندبوو. ڕێگەیان نەدەدان، قورئان بۆ سەر زمانەکانی خۆیان وەرگێڕن، بە کوردیی وانەی ئایین بخوێنن. چونکە، کورد هەر لە ژێردەسیی ئەو نەتەوە باڵادەسانەدا مابۆوە، خاوەنی هێز و دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆی نەبوو، تا گوێ لە فەرمانەکانی ئەوان ڕا نەگرێ. بەڵام، بۆ گەلانی دووری ئازاد، خۆیان ئەو شتانەیان بۆ وەردەگێڕان، تا لێی تێبگەن. چونکە، باشیان دەزانی، تازە ئەو وڵاتانەیان لەکیسچووە، تا داگیریانکەن و بەرووبوومی خاکەکەیان بخۆن. بۆیە، هەر چۆنێبێ، بە ناوی ئایینەوە دەیانویست، کەڵکیان لێ وەرگرن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، مەبەستەکەیان لەگەڵ کورد و گەلانی دیکەی بندەسیاندا، ئەوە نەبووبێ، بەڵکوو، تواندنەوەی نەتەوەکانی بندەسیان و زمانەکانیان بووە!

با سەرەتا، باسێکی زمانەکانی نێوچەکە بکەین. پاشان، لە پێوەندیی نێوان زمانی کوردیی و ئەو زمانانە دەدوێین. ئەوەتەی گەل و نەتەوە

جیاوازەکان، لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەندا دەژین، بەپێی ئەو نزیکیی و دراوسێیەتییەی لە نێوانیاندا هەبووە، زمانەکانیان کاریان لە یەکدی کردووە. بەڵام، ئەم تێکەڵاویی و کارتێکردنە، بەگوێرەی هێندێ فاکتەری وەک « درووستبوونی گەل و نەتەوەکان، ڕەچەڵەکی زمانەکان، دەسەڵات، دووریی و نزیکییان لە یەکدی »یەوە گۆڕاوە و دەگۆڕێ.
دیارە، نزیکترین دوو زمان لە نێوچەکەدا، زمانی کوردیی و فارسیی بووە. لە کۆندا، زمانی کوردیی پتر تێکەڵاویی، لەگەڵ زمانی فارسیدا هەبووە. لەبەرئەوەی، لە لایەکەوە هەر دوو نەتەوەی کورد و فارس، پێکەوە و بە نۆرە، هەر جارە لایەکیان، چەندین جار، لە ژێر سێبەری ئاڵای یەک دەوڵەتدا ژیاون. لە لایەکی دیکەشەوە، لە کۆندا، کورد و فارس، هەم یەک ئایینی هاوبەش کۆیکردوونەتەوە. هەم نزیکییەکی زۆر، لە نێوان هەر دوو زمانەکەیاندا هەبووە و هەیە.
بەڵام، کاتێ عەرەبەکان، لە ژێر ناوی ئیسلامدا، ناوچەکەیان داگیرکرد، ئایینی ئیسلامیان بە دیاری بۆ گەلانی نێوچەکە هێنا، لەو سەردەمەوە، زمانی عەرەبیی کارتێکی زۆری، لە هەر دوو زمانی فارسیی و کوردیی کردووە. ئیدی لەو کاتەوە، جۆرە تێکەڵاوییەک، لە نێوان هەر دوو زمانی کوردیی و عەرەبییدا دروستبووە. واتە: دووەم تێکەڵاویی زمانەکان لە ناوچەکەدا، لە لایەکەوە تێکەڵاویی زمانی عەرەبیی و فارسیی، لە لایەکی دیکەشەوە تێکەڵاویی عەرەبیی و کوردیی بووە. هەر چەندە، جۆری تێکەڵاوییەکە جیاوازبووە.
دوای ئەوەی، تورکە مەغۆلییەکانیش، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتوون و لە ناوچەکەدا جێگیربوون، قۆناغی سێیەمی تێکەڵاوبوونی زمانەکان دەسپێکردووە. ئیدی، هەر یەکەیان بە شێوەیە لە شێوەکان، کارتێکی ئەرێتی یا نەرێتییان لە یەکدی کردووە. بەڵام، هیچ زمانێ لەو چوار زمانە، بەقەدەر زمانی عەرەبیی، کاری لە هەر سێ زمانەکەی دیکە نەکردووە، بە تایبەتیی و بە پلەی یەکەم، کارتێکی یەکجار زۆری، لە زمانی فارسیی، بە پلەی دووەم، لە زمانی تورکیی کردووە. پاشان، بە پلەی سێیەمیش، کاری لە زمانی کوردیی کردووە. کەواتە، نەک هەر کورد و زمانی کوردیی، لە

لایەن نەتەوەی عەرەب و زمانی عەرەبییەوە کاریتێکراوە، بەڵکوو، هەموو ئەو نەتەوانەی ئیسلام بوون، بەپێی دوور و نزیکییان لە عەرەبەکانەوە، ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبیی، کارێکی زۆر گەورەی تێکردوون. تەنانەت، کارتێکردنەکە بە شێوەیەک بووە، هێندێ لە ڕۆڵەکانی ئەو گەلانە، بە تەواویی، خۆیان بۆ ڕاژەکردنی ئایین و زمانی عەرەبیی تەرخانکردووە..

ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، لێرەدا، کەمێ لە پێوەندیی نێوان زمانی عەرەبیی « واتا زمانی ئایینی ئیسلام » و کوردیی بدوێین. لە لایەکەوە، باسێکی ورد، لە سەر کارتێکردنی زمانی عەرەبیی لە زمانی کوردیی بکەین. لە لایەکی دیکەشەوە، ڕۆڵی کارتێکردنی خودی ئایینەکە، لە هەست و هۆشی، نووسەر و زاناکانی کورد پیشاندەین.

کاتێ، عەرەبە ئیسلامەکان کوردستانیان داگیرکردووە، ئیدی، هەموو ئەو نووسین و شتانەی، بە زمانی کوردیی هەبووە، وردەوردە پێچراونەتەوە. زمانی ئایینی نوێ، لە پەرستن و پاڕانەوە، لە خوێندن و نووسیندا، جێی زمانە نەتەوەیی یەکەی گرتۆتەوە. تا وای لێهاتووە، بە تەواویی لە کاری خستووە. زمانی کوردیی، تەنیا وەک زمانی ئاخافتن ماوەتەوە. تەنانەت، خوێندەوارەکانی کورد، لە نێوان خۆشیاندا، نامەیان هەر بە زمانی عەرەبیی بۆ یەکدی نووسیوە. دیارە ئایینی نوێ، ئایینێکی دەوڵەمەند و پڕ چەکبووە، تا ئەندازەیەکی زۆر، دادپەروەرییەکی تێدابووە، هەژار و دەوڵەمەندی، وەک یەک لە ئاستی پەروەردگاردا ڕاگرتووە. بۆیە، ئایینە کۆنەکانی کورد، لە بەردەم ئایینی نوێدا، خۆیان زۆر بۆ نەگیراوە. ئایینە کۆنەکانی کورد و زمانە نەتەوەیی یەکەی، شانبەشانی یەکدی و پێکەوە، لە بەردەم ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبیدا، پاشەکشەیانکردووە. هەڵبەتە، بیروباوەڕی ئایینی نوێ، کارێکی وای لە هەست و هۆشی، ڕۆڵەکانی کورد کردووە، هەموو شتێکی کۆنی خۆیان، کە پێوەندیی بە ئایین و زمانەکەی خۆیانەوە هەبووە، بە شتێکی خراپ و سەردەمی گومڕایی و گاورییان داناوە. بۆیە، زۆربەی زۆری کوردە موسوڵمانەکان، بە تەواویی لە هەستی نەتەوەیی کوردیی شۆراونەتەوە. ئایینی نوێ، بە شێوەیە هۆش و باوەڕی

تاساندبوون، به هیچ جۆرێ بایەخیان، بە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان نەداوە، پشتیان لە ئایین و زمانەکەی خۆیان کردووە، بە هەموو جۆرێ کۆشاون، ڕاژەی زمانی ئایینی نوێ و نەتەوەی سەردەس بکەن. جا گەر لێرەدا، سەرنجێکی ورد لە ئارشیڤی پەرتووکخانەی ئیسلام بدەین، دەبینین، شانبەشانی نووسەر و زانایانی گەلانی دیکەی جیهانی ئیسلام، نووسەر و زانایانی کوردیش، لە بواری نووسین بە زمانی عەرەبیی، بەشی شێریان بەردەکەوێ.

ئەو مەلا و زانا ئایینییە کوردانە، بە شێوەیە بە دەوری زمانی عەرەبیی و ئایینی ئیسلامدا هاتوون، مەگەر هەر عەرەبەکان خۆیان توانیبێتیان، بەو شێوەیە بایەخ بە زمان، کەلتووری عەرەب و ئیسلام بدەن. جگە لەوەی، ئەو کارانەیان، بە ئەرکێکی پیرۆزی سەرشانی خۆیان زانیوە، زۆربەی زۆریشیان، باسی کوردێتی خۆیان نەکردووە، بەڵکوو، لە ڕێی خوادا ڕاژەی ئەو زمانەیان کردووە و پشتیشیان لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان کردووە. بۆیە، زانایەکی بە ناوبانگی ئیسلامی وەک، ئیمام « محەمەدی غەزالی » گوتوویەتی:

(دینی ئیسلام، لە سەر سێ ستون وێستاوە. ئەگەر خودا ئەو سێ کۆڵەکەی نەدابا، لەوانە بوو تێک بتەپێ. ئەم سێ دیرگە ئەستوورانەش،« دینەوەری » و « ئامیدی » و « شارەزووری » بوون.) «5،49» ئەو سێ زانا موسوڵمانە، کە کۆڵەکەی هەرە گەورەی ئیسلام بوون، بە گەواهی عەرەبەکان خۆیان، زمان و ئایینەکەیان بۆ ڕاگرتبوون، هەر سێکیان کورد بوون! لەو ڕۆژەوە ئایینی ئیسلام، لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، لە هەر سەردەم و لە هەر ناوچەیەکدا، کۆمەڵێ نووسەر و زانای کورد، وەک کۆڵەکەیەکی گەورە و پتەو، شانیان وەبەر ئەو کارە داوە و ڕاژەیەکی زۆریان، پێشکەش بە زمان و کەلتووری عەرەب کردووە. ئەو نووسەرانەش هێندە زۆرن، لە ژماردن نایەن. وەک مام « هەژار » دەڵێ:(گەر بە دووردرێژیی، ناوی هەموو ئەو کوردانەی کە لە ڕێی زانست و هونەر لە درێژایی هەزار و ئەوەندە ساڵدا لە ڕای ئیسلامدا کۆشاون و ناویان تێدا دەرکردووە، بیرخەمەوە، وشتر لە بنیا ترکەی دێ.)«6،49»

بۆ نموونە: لە بواری مـێـژوو و فـەرهەنگدا، چەندین کـوردی وەک: (سـهرەوەردی خـاوەنی عـەوارف ئەلمعـارف، ئیبن ئەسـیر خـاوەنی تەئریخ ئەلکامل، دینەوەری خاوەنی ئەخبار ئەلتول، شارەزووریی نووسەری نزهەت ئەلئەرواح، ئیبنی خەلەکان دانەری وەفیات ئەلئەعیان و ئەخیرا مەحموود عەقاد مێژوونووسی بە ناوبانگ، ئیسماعیل پاشای بابان نووسەری زەیل کەشف ئەلزنون، حاجی خەلیفە شێخ محەمەد، عەبدە فەقێ و زانای بە ناوبانگ و قورئانخوێن شێخ محەمەد عەبدولباسیت عەبدولسەمەد، هەموویان کورد بوون)«8،66» ڕاژەی زمان و کەلتووری عەرەبییان کردووە. با ئێمە لێرەدا، تەنیا باسی کورد بکەین.

« عەلادین سوجادیی » دەڵێ: (کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، کورد تا دووسەد ساڵێ پاش دامەزراندنەکەی، هەموو بە دڵێکی فراوان و بە هەموو ئارەزوویەکییەوە، باوەشی کرد بەو ئالایەدا، بە دڵ و بە گیان خۆی لە ژێر سێبەری ئالاکەدا حەسانەوە. لەو ڕۆژەوە چ بە شیر، چ بە قەڵەم خزمەتی ئەم دینە ئەکا تا ئەم ڕۆژەی ئێمەی تێدایین. لە هیچ سەردەمێکدا و لە هیچ ڕۆژێکیا بە جۆرێکی تێکڕایی لەو دوو ڕێگایەدا درێغیی نەکردووە و ناشیکا. بەلام، لە دوای سەردەمی عەبباسیی، بەربەرەکانیی حوکوومەتی ئێرانیی و حوکوومەتی عوسمانیی، کوردی لەو ناوەدا کرد بە ئاردی دڕکان و کردی بە هەڵمات پێکیانا ئەدان! ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە، پابەندبوونیان بە ئایینی ئیسلامەوە و خزمەتکردنیان بە علووم و زانیاریی ئیسلامیی و زمانی عەرەبییەوە، ماوەی ئەوەی نەدان، کە بە زمانەکەی خۆیان شتێک بنووسن و شتێک بهێڵنەوە. لەگەڵ ئەوەشا ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەنەبێ، ئەم جۆرە شتانەبێ. بەڵکوو، گەورەترین بەڵگە بۆ بەرزی ئەم ئایینە و بۆ هاندانی ئەم ئایینە بۆ خوێندەواریی و بۆ زانین، یەکەم ئایەتی « قورئان »کە ئەفەرموێ: « اقرا باسم ربک الذی خلق، خلق الانسان من علق، اقرا و ربک الاکرم، الذی علم بالقلم، علم الانسان ما لم یعلم ». پاشان، دەڵێ: (هیچ ئایینێک لە عالەما نەبوو ـ ئاسمانیی بووبێ، یا غەیری ئاسمانیی ـ بەم جۆرە هانەهانەی خوێندن و خوێندەواری بدا)« 147-146،68 »

دیارە، هەموو ئەو دید و بۆچوونانەی مامۆستا ڕاستە. بەڵام، ئەو ئایەتەی بۆ باسی خوێندەواریی هێناویتییەوە، مەبەس ئەوە بووە، بە زمانی عەرەبیی بخوێنێ، نەک هەر گەلەی بە زمانی نەتەوەیی خۆی بخوێنێ. چونکە: یەکەم ـ پەیامبەرەکە عەرەب بووە. دووەم ـ ئایەتەکە بە زمانی عەرەبیی هاتووە. سێیەم ـ زمانی عەرەبیی، بە زمانی ڕەسمیی ئایینی ئیسلام دادەنرێ. ئەوە جگە لەوەی، هەر چەندە، هەرچی بە زمانی نەتەوەیی بخوێنرێ، بە شتێکی باش دادەنرێ. چونکە، زیاتر یارمەتیی بوژاندنەوە و پێشخستنی زمانەکە دەدا. بەڵام، گەر کورد هەر بە زمانی خۆی، « جوگرافیا، مێژوو، هونەر، وێژە »ی نەتەوە سەردەسەکانی چوار دەوڵەتەکە بخوێنێ، لە جوگرافیای نیشتمانەکەی خۆی شارەزا نەبێ، مێژووی نەتەوەکەی خۆی نەزانێ، سەر لە هونەر و وێژەی کوردی دەر نەکا، جگە لەوەی، پارێزگاریی زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی دەکا، چ کەڵکێکی دیکەی دەبێ؟!! هەر چەندە، کورد هەر لە کۆنەوە، خوێندەواربووە، خوێندن و نووسین لە کوردستاندا هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا، بە زمانی زکماکیی خۆی نەیخوێندووە. شتێکیش بە زمانی دایک نەبێ، هەر چەندە، هێندێ ئاگاداریی و زانیاریی دەبەخشێ، سوودی گەورەگەورە دەگەیەنێ، بەڵام، لە ڕووی کەلەپوور و ڕەسەنیی زمانەکەوە، دووریی و نامۆییەک پەیدادەکا.

لەبەرئەوەی، نەتەوەی کورد، بە درێژایی مێژوو، خاوەنی دەوڵەتێکی یەککگرتووی سەربەخۆ نەبووە، هەمیشە نیشتمانەکەی داگیرکراوە، لە ژێر باری چەوساندنەوەدا نالاندوویەتی، زمان و ئایینەکەی لێ قەدەغەکراوە، بۆیە، بە شێوەیەکی بەردەوام، ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوە هەژارە چەوساوەیە، تووشی گرفتێکی گەورەی دەروونیی بوون، هەمیشە هەستیان بە کەموکوڕیی کردووە. لە ڕووی سایکۆلۆژیی یەوە، نەتەوەیەکی نەخۆش و لاوازە. لەبەرئەوە، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، نووسەر و شارەزاکانمان، کونوکەلەبەری مێژووی گەلان، بە دوای « نووسەر، هۆنەر، زانا و پیاوە ناودارەکانی جیهان »دا وێڵن و دەگەڕێن. بۆ ئەوەی، ئەو کەموکوڕییە سایکۆلۆژیی و نەتەوەیی یە پڕکەنەوە، تا، لە ئاستی نەتەوە دەسەڵاتدارەکانی دیکەی ناوچەکەدا، خۆیان بە کەم نەزانن، هەوڵدەدەن، هەر

چۆنیبێ، بنچەیان بۆ سەر یەکێ لە بنەماڵەی تیرە و هۆزە کوردییە ناودارەکان بگێڕنەوە. وەک ئەوەی، بەو کارەیان نەتەوەی کورد، لە دەس چەوسانەوە و کوردستان لە داگیرکردن ڕزگارکەن! گەلێ جار بەر گوێم کەوتووە، خەڵکی ساویلکە گوتوویانە: « سەلاحەدینی ئەیوبیی، ئیدریسی بەدلیسی، دینەوەریی، ئامێدیی، شارەزووریی، ئیبنوخەلەکان، ئەبولفیدا، ئیبنو حاجیب، ئیبنو سەلاح، هەر سێ ئیبنو ئەسیرەکان ... تاد » کورد بوون و شانازییان پێوە کردوون. ڕاستە، ئەو پیاوە ناودارانە، هەموویان بە ڕەچەڵەک کورد بوون، چونکە، لە دایک و باوکێکی کورد لەدایکبوون، یا بە لانی کەمەوە، یەکێ لەو دووانەیان کورد بوون. بەڵام، خۆکوردبوون، هەر بە ڕەچەڵەک نییە، بەڵکوو، بە « هەست، باوەڕ، دڵسۆزیی و کارکردن » دەبێ. بۆیە، کەم جار گوێم لێ بووە، یەکێ بپرسێ و بڵێ: ئاخۆ ئەو پیاوە ناودار، کەڵە زانا و هونەرە بلیمەتانەی کوردبوون، کە ئەوڕۆ بە شانازییەوە ناویاندەبەن، چییان بۆ نەتەوەکەی خۆیان کردووە؟ تا چەن زمانەکەی خۆیان لە تواندنەوە پاراستووە؟ تا چەن ڕاژەی زمانەکەی خۆیان کردووە و ڕازاندوویانەتەوە؟ بە چ زمانێ نووسیویانە؟ ڕاژەی کام نەتەوە و کەلتووریان کردووە؟ بۆچی، زمانەکەی خۆیان پشکوێخسووە؟ گەلێ کەسیش هەن، تا ئێستە، زۆر بە گەرمیی، داکۆکییان لێ دەکەن، بە کەڵەپیاوی کوردیان دادەنێن، شانازییان پێوە دەکەن!!! ئەوە لە کاتێکدا، گەلانی دیکەی موسوڵمان، گەلێ زانا و شارەزای باشیان تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام، هەرگیز پشتیان لە زمان و نەتەوەکەی خۆیان نەکردووە، وەک کورد، بەردیان لە کانی وڵاتی خۆیان نەهاویشتووە و بە پاچەکۆڵەی دەسی خۆیان، ماڵی خۆیان وێران نەکردووە. ئەدی، بۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەوانە نەیانپرسی، ئەو کوردنەژادانە، بۆ لایەکیان بە لای زمان و مێژووی نەتەوەکەی خۆیاندا نەکردۆتەوە؟ ئایا، هەموویان وەک « محەمەد عەلی عەونی، عەبباس مەحموود عەقاد و مەحموود تەیموور ... تاد »، هەر لە منداڵییەوە لە میسر گەورە بوون و ڕێگەی گەڕانەوەیان بۆ باکووری کوردستان لێ گیرابوو؟ یا، هەر خۆیان هەستی نەتەوەیی یان کزولاواز بووە، تا سەر مۆخ و ئێسکیان بێگانەپەرستبوون، گەلێ ساویلکە و

ساکاربوون، به هەموو پەیان و قسەیەکی داگیرکەرەکە هەڵخەڵەتاون، لە کەلاوە وێرانەکەی خۆیاندا، خۆیان بە میوان زانیوە و بێگانەی داگیرکەریشیان، بە خاوەن ماڵ داناوە!!
بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: ئەورۆ، من چیم داوە، لەو « بلیمەت، زانا و نووسەرانە »ی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئاوڕێکیان لە نیشتمانە داگیر و دابەش و کاولکراوەکەی خۆیان نەداوەتەوە، زمانەکەی خۆیان نەپاراستووە، بە دەوریدا نەهاتوون و گەشەیان پێ نەکردووە، یەک پیتیان بە زمانی شیرینی کوردیی نەنووسیوە، هەمیشە، لە ژێر پەردەی ئاییندا، ڕاژەی زمانەکانی دیکەی گەلانی دەرودراوسێیان کردووە؟ کەواتە، بۆچی دەیان کوردی بە ناوبانگی وەک:« سەلاحەدینی ئەیوبیی» ، زانای گەورە « ئیدریسی بەدلیسیی » ، با کوردیش بووبن، لە ڕووی نەتەوەیی یەوە، بە قوربانی بزماری ناڵی سمی ئەسپەکەی، چەن سەرکردەیەکی وەک « میر بەدرخان، شێخ عوبێدوڵلای نەهریی، شێخ سەعیدی پیران، سەیید ڕەزای دەرسیمیی ... تاد » نەکەم، کە ژیان و گیانی خۆیان، لە پێناوی کورد و کوردستاندا بەختکردووە. بۆچی، سەدانی وەک:« ئین خەلەکان »ی مێژوونووس، بە تۆزی ژێر کەوشەکانی، چەن مێژوونووسێکی پیتۆڵی وەک:« شەرەفخانی بەدلیسیی، مەلا مەحموودی بایەزیدیی و ئەمین زەکی بەگ » بگۆڕمەوە، کە بەردی بناغەی، مێژوویەکی نەتەوەیی یان بۆ ئێمە داناوە؟ بۆچی، هەزارانی وەک:« ئیبنوحاجیب، ئیبنوسەلاح، ئیبنوئەسیر و ئەبوفیدا » و هەموو ئیبن و ئەبوەکانی دیکەش، بالآیان بە قەدەر باڵای شێخ، مەلا و زانایەکی کوردپەروەر بەرزترێ، کە منالآنی کوردیان، لە ژووری تاریکونووتەک، لە بەر قوتیلە و شەوقی چرا، فێری زمانی زکماکیی خۆیان کردووە؟ بۆچی، سەر و کۆتەڵی یەک میلیۆنی وەک:« ئەحمەد شەوقی، جەمیل سدقی زەهاوی، مەعروف ڕەسافی و بلند حەیدەریی ... تاد » ، بە قوربانی گەردی سەرمەزارەکەی، « مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی، نالیی و حاجی قادری کۆیی » نەکەم، کە لەو سەردەمانەدا، لە ناخی دەروونێکی بێگەردەوە، هاواریان لێ هەستاوە، « ڕێنیسانس »ێکی کوردییان ڕاگەیاندووە، بە دەم و بە دەس، ووشەی پیرۆزی کوردییان گردکردۆتەوە، وەک دانەی مرواریی،

گەردانەی زێڕینی هۆنراوەی جوان و سەنگینیان لێ هۆنیوەتەوە، وەک یادگاریێ، بۆ ئێمە و نەوەکانی داهاتووی کوردیان بەجێهێشتووە؟ دیارە، هەموو ئەو کوردنەژادانە، لە کوردستان لەدایکبوون و هیچیشیان بۆ کورد نەکردووە، ڕاژەی زمان و مێژووی نەتەوەکەی خۆیانیان نەکردووە، هەڵبەتە، ئەو گەلانەش ئەوڕۆ، ناهەقیان نییە، بە عەرەبیان دانێن و شانازییان پێوە کەن! ئیدی بۆ دەبێ، منی کوردی ژێردەسەی چەوساوە، خۆم بە خاوەنیان بزانم و شانازییان پێوە کەم؟!

گەر، ئەو ناودارانەی باسمانکردن، ڕاژەیەکی تەواویی نەتەوەی عەرەبیان نەکردایە، هەڵبەتە ئەوڕۆ، ناویان لە لاپەڕەکانی مێژوودا، بە شانازییەوە تۆمار نەدەکردن، بەسەرهاتی ژیان و بەرهەمەکانیان، لە خوێندنگەکاندا نەدەخوێنند، بە ناوی ئەوانەوە، شەقام و گۆڕەپانەکانیان ناو نەدەنا، چەندین پەیکەریان بۆ دا نەدەتاشین و لە ناوەڕاستی شارەکاندا دایان نەدەچەقان.

جا هەر کوردێ، باوەڕی هەرچی دەبێ، با بێ، گەر تیکەی ڕاستیی، ئەم دید و بۆچوونەی بۆ قووت نەچێ، ئەم لێکدانەوەیەی بۆ هەرس نەکرێ، با تا دەتوانێ، وەک « یاسر عەرەفات » بە جووەکان دەڵێ: لە ئاوی زەریای مەرگ بخواتەوە. چونکە، لە مێژە ئەو گەلانە، وەک ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکی خۆیان، تەماشای ئەو کوردنەژادانەیان کردووە! ئەوڕۆش، بەو پەڕی بڕواوە، شانازییان پێوە دەکەن و خۆیانیان پێوە بادەدەن. دیارە، هەر ئەوانیش ڕاسدەکەن، چونکە، ئەو کەڵەپیاوانە، بە سەدان و بگرە بە هەزاران، بەرهەمی « هونەریی، وێژەیی، زمانەوانیی، مێژوویی، جوگرافیایی، ئایینیی، پزیشکیی و ئەکادیمی »یان بۆ نووسیون، پەرتووکخانە دەوڵەمەندەکانیان، هێندەی دیکە بۆ قەبەکردوون و ڕازاندوونەتەوە. بۆیە، یەکێکی وەک د. « تەها حوسێن »، نووسەر و زانای نابینای میسر، لە یادی بیرەوەریی « ئەبو عەلی سینا »دا، لە گوتارێکدا دەڵێ:(ئەبو عەلی سینا بە عەرەبیی نووسیویەتیی و ئێمە بە عەرەبی دەزانین. جا با ئێرانییەکان هەر هاوارکەن و بڵێن لە خۆمانە.)«6،49» تەنانەت، ئەوڕۆش عەرەبەکان نایشارنەوە، کاتێ باسی بزووتنەوەی « نەوەی ڕابەر »دەکەن، ناوی چوار هۆنەری بلیمەت و بە توانای وەک:(بەدر شاکیر سەییاب،

عـــەبدولوەهاب بەیاتی، نازک ئەلمەلاییکە و بلّند حـــەیدەریی دێن.)
«62،29» کـە هەمـوومـان دەزانین، « حـەیدەریی » کـورد، چەن ڕۆشنبیـر و هۆنەرێکی گەورەی عەرەب بوو!
هەڵبەتە، گەر یەکێکی وەک « حاجی قادر »ی نەمر و نیشتمانپەروەر، بە تەواویی لە کـەللەی نەدابێ، کـاسـەکـەی پڕ نەبووبێ و لێی نەڕژابێ، پەلامـاری « شـێخ، مـەلا، زانا، نـووسـەر و هۆنەرانی کـوردیی » نەدەدا و نەیدەفەرموو :

وەک مریشکێک کە بەختی نەیهێنێ بێتو جـوجکەی مـراوی هەڵبێنێ
هـەر بگاتە کەنـاری جۆگـەلەیەک نایەتە شوێنی، بمرێ، جوجەڵەیەک
ئـەم لە وشـکانی ئـەو لە ناو ئـاوە تێ دەگـا ..... دڕانـــی پێ ماوە
«37،45»

« حاجی » بە سەدوپەنجاوهەشت دێڕ، هۆنراوەی « شەهسـواری بەلاغـەتی کوردان »مان، بۆ دەڕازێنێتەوە. ناوی زۆربەی زۆری هۆنەرەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی دەهێنێ، زۆر بە چاکە باسیاندەکا، ڕوو لە « مەلەکەقوڕ، حیماریی و کیسەشکەل » دەکا و دەڵێ: هەرچەندە ناوەکانتان، زۆر نالەبار و ناخۆشن، بەڵام، چونکە بە کوردیی نووسیوتانە، هۆنراوەکـانتـان جوانن، سەد « ئیبنو یەمین » بە قوربانتان دەکەم :

شیعریان جوانە بەس نییە کوردن
گەر چی بەد ناون و گەلێ ووردن
بە فیدایان دەکەم سەد ئیبنو ئەمین
چونکە دەربەستی غیرەتی کوردین «220،45 »

هەروەها، دەڵێی « جگەرخوێن »ی هۆنەری نیـشتـمـانپـەروەری گـەورەی کوردیش، لە خۆراوای کوردستانەوە، گوێی لە هۆنراوەکانی « حاجی » بووە. بۆیە، هاواری لێ هەستـاوە. لە ئاستی ئەوانەی، پشـتـیـان لە زمـان و نەتەوەکـەی خۆیان کردووە، ڕاژەی زمـانی بیـانیـیـان کردووە، ئاوڕێکیـان لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان نەداوەتەوە، خۆی بۆ نەگیراوە. کاتێ، وەڵامی « ئەسیریی » هۆنەری کوردپەروەری داوەتەوە، گۆڕی سەد مێژوونووسی وەک « ئیبنو ئەسیر »ی، بە قوربانی « ئەسیریی » کردووە، چونکە، بە کوردیی

نووسیوێتی و ڕاژەی زمانی کوردیی کردووە. لەبەرئەوە، گوتوویەتی :

ئەی برا شەهبازی ئەوجی من و هەم عیرفانی تۆ
سەد وەکی ئیبنولئەسیری گۆڕی بوو قوربانی تۆ

پاشان دەڵێ :

سەد سەلاحەددین و بێ، سەد وەک ئەبی موسلیم هەبێ
فائیدەی هیچ بۆ مە نادەن، سەتوەتی شاهانی تۆ «146،53»

گەلانی ئەورووپا، گەر زوو فریای خۆیان نەکەوتنایە، پیاوە دڵسۆز و شارەزاکانیان، « ئینجیل »یان لە لاتینییەوە، بۆ سەر زمانە نەتەوەیی یەکانی خۆیان وەرنەگێڕایە، دوورنەبوو، هێدیهێدی، زمانە نەتەوەیی یەکانی خۆیان، بەرەو لەنێوچوون و تواندنەوە بڕۆشتایە. بۆیە، کاتێ ئیمپراتۆریای ڕۆما دوولەتبوو، لە سەر بنچینەی هەر دوو ئایینزای «ئارسۆدۆکس و کاسۆلیک » ، دوو ئیمپراتۆریای جیاوازی ڕۆژهەڵاتیی و ڕۆژاوایی دامەزرا. لە هەمان کاتدا، دوو زمانی ئایینیی جیاوازیش پەیدابوو، زمانی یەکەم ـ «یۆنانیی » و دووەمیشیان ـ « لاتین » بوو.

بە داخەوە، لە کۆندا ڕۆڵە خوێندەوار و ڕووناکبیرەکانی نەتەوەی کورد، لە لایەکەوە، هەستیان بە مەترسیی کارتێکردنی زمانی ئایین، لە زمانی نەتەوەیی نەکردووە. لە لایەکی دیکەشەوە، سەرنجێکی قووڵیان، لە پێوەندیی نێوان زمانی ئایین و زمانی داگیرکەر نەداوە. لە بەر ڕۆشنایی کارتێکردنیان لە زمانی کوردیی، لەو پێوەندییانە وردنەبوونەتەوە، هەموو لایەنەکانیان هەڵ نەسەنگاندووە، تا بزانن، پێوەندییەکانیان چۆنە؟ تا چەن زیان بە زمانی کوردیی دەگەیەنن، وەک گیاکەڵە، لە سەر ڕەگی زمانەکەمان شیندەبن و خوێنی دەمژن؟! بە شێوەیە هەستە ئایینییەکە، بە سەر هەستە نەتەوەیی یەکەیاندا زاڵبووە، دەماری هەست و هۆشی نەتەوەیی کوردی سڕکردووە. بۆیە، لەم بوارەدا، بیریان لە هیچ نەکردۆتەوە، وەک گەلانی ئەورووپا، چۆن ئینجلیان بۆ سەر زمانەکانی خۆیان وەرگێڕاوە، قورئانیان بۆ سەر زمانی کوردیی وەرنەگێڕاوە و کەمتەرخەمییان تێداکردووە. تەنانەت، وەرگێڕانی قورئانیشیان، بە گوناهێکی گەورە داناوە! گەر چی، زمانی هەموو ئایینە کۆنەکانی کورد، وەک « عەلەویی، یەزدیی و کاکەیی ... »

کوردیی بوون و پەرتووکە پیرۆزەکانیش هەر بە کوردیی نووسراون. بەڵام، جگە لەوەی، وەک « ئینجیل و قورئان »، دوو ئیمپراتۆریای گەورەیان لە پشتەوە نەبووە، لەبەرئەوە کارێکی ئەوتۆیان، لە زمانە نەتەوەیی یەکە نەکردووە و بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو نەبوونەتەوە، بەڵکوو، هەر لە ناوچەیەکی بەرتەسک و لە نێو کۆمەڵێکی دیاریکراودا بەکارهێنراون، تا ئێستەش لە دووتوێی ئەو پەرتووکانەدا ماونەتەوە. چونکە، هێز و دەسەڵاتی دەوڵەتێکی کوردییان لە پشتەوە نەبووە، تا گەشەیان پێ بدا، وەک زمانێکی یەکگرتوو، لە هەموو کوردستاندا بیانچەسپێنێ. هەروەها، کوردیش لە مێژووی خۆیدا، نەتەوەیەکی داگیرکەر نەبووە، تا پەلاماری خاکی وڵاتانی دیکە بدا، وڵاتەکەیان لێ زەوتکا، لە رێی زمانە ئایینییەکەیەوە، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆشیان بە سەردا بسەپێنێ. جگە لەوەی، کاتێ عەرەبە ئیسلامەکان، لە دەورووبەری «640 ز. »دا، کوردستانیان داگیرکرد، ئیدی، لەو رۆژەوە وردەوردە، زمانی عەرەبیی کە زمانی ئیسلام و نەتەوەی عەرەب بوو، تەنگی بە زمانی دانیشتووانی کوردستان هەڵچنیوە، لە هەموو بوارەکانی ژیانی « ئایینیی، کۆمەڵایەتیی و رامیاریی »دا بڵاوبۆتەوە، زمانی قورئان بە تەواویی پەکی زمانە ئایینییەکانی کوردی خستووە و کزولاوازیکردووە. لە باشترین دۆخیشیدا، وەک چەن پەرتووکێکی ئاسایی، وەک یادگارێکی مێژووییان لێهاتووە و بۆ نەتەوەی کورد بەجێماون.

جگە لەوە، هەموومان دەزانین،(کورد یەکێکە لەو میللەتانەی زۆر لە زووەوە موسوڵمان بووە و لە پێناوی ئیسلامدا شەڕی زۆری کردووە و زانای گەورەی لە بواری نووسینی: فیقهـ، تەفسیر، کەلام، زمان ... تێدا هەڵکەوتووە و گەم دێ هەیە، مزگەوتی تێدا نەبێ، کەچی مەلاکانی کورد بە زمانی کوردیی، جگە لە چەن « عەقیدەنامە »یەکی کورت و چەن «مەولودنامە » یەکی، شوێنەواری ئەوتۆیان بەجێ نەهێشتووە. تەفسیری قورئان و لێکدانەوەی حەدیسەکانی پێغەمەر و دانانی کتێب لە سەر فیقهی ئیسلام، بە کوردیی نەنووسراوە، تەنانەت دوعایەکیان بە کوردیی نەهۆنیوەتەوە، لە کاتێکدا لە ئیسلامدا شتێک نییە، رێگەی لەمە گرتبێ. )«276،117».

دیاره دواتر، هێندێ لە ڕووناکبیران، نووسەران و زانایانی ئایینیی کورد، هەستیان بەو کەموکوڕیی و مەترسییە گەورەیە کردووە، پەیان بەو ڕاستییە بردووە. بۆیە، چەن مامۆستا و زانایەکی کوردپەروەری ئایین، لە خۆیان بوردوون، ئەرکێکی گەورە و گرانی ئایینیی و نەتەوەیی یان کێشاوە، قورئانیان لێکداوەتەوە، تا ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیش، وەک ڕۆڵەی گەلانی دیکەی ئیسلام، لێی تێبگەن و کەڵکی لێ وەرگرن. لەو ڕێیەشەوە، ڕاژەیەکی زۆری زمانەکەی خۆیان کردووە. هەر چەندە، تا ئێستە، لەو بوارەدا سێ کاری گەورەی، وەک لێکدانەوەکانی «جەلیزادە، نامی و خاڵ» مان هەیە، بەڵا، ئەوە لە چاو پەرتووکخانە ئایینییەکانی نەتەوەکانی دیکەدا، هەر زۆر کەمە!
مامۆستا « شێخ محەممەدی خاڵ »، یەکەم زانایەکی کوردی ئیسلام بووە، هەستی بەم کەلێنە گەورەیە کردووە، چەن لێکدانەوە و شیکردنەوەیەکی هێندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی، بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕاوە. بەڵام، داخەکەم، سەرەڕای ئەوەی، هەر مەلا کوردە هاوزمانەکانی خۆی، بەربەرکانیانکردووە و دژی ڕاوەستاون، بە تەنیا باڵیش هەر هێندەی پێ کراوە. هەروەها، هۆنەر و زمانزانێکی گەورەی وەک:« هەژاری »یش، یەکێ لەو کوردە بە هۆش و گۆشانە بووە، هەنگاوی گەورەی لەم بوارەدا ناوە. زۆر بە باشیی، لەو پێوەندییە توندوتۆڵەی، نێوان زمان و ئایین گەیشتووە، هەر زوو هەستی بە گرنگیی و ڕۆڵی بێ ئەندازەی زمان، لە ژیانی نەتەوەی کورددا کردووە. بۆیە، « هەژار » زۆر جەسوورانە، باسکی کوردانە و مەردانەی لێ هەڵماڵیوە، سەرلەبەری قورئانی پیرۆزی وەرگێڕاوە و بە زمانی کوردیی دایڕشتۆتەوە. بەڵام، ئەو هەوڵوتەقەلایەی مام « هەژار » داویەتی، جگە لەوەی، لە چاو داگیرکردنی کوردستان و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، لە نێو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا، زۆر دواکەوت و درەنگبوو، گەر لەگەڵ وەرگێڕانی ئینجیلیشدا بەراوردیکەین، چ لە ڕووی سەردەم، چ لە ڕووی هێز و دەسەڵاتی ئەو گەلانە، چ لە ڕووی شێوازی کارتێکردن و تاووتینەوە، جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندا هەیە. واتا دەتوانین، بڵێین : کورد خاوەنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نییە، تا قورئان بە

کوردیی بلاوکاتەوە، بە شێوەیەکی ڕەسمیی لە هەموو بوارەکانی ئایین و دادگا شەرعییەکاندا کاری پێ بکا. بۆیە، ئەویش جارێ، گەر چاپیشکرێ و ڕووناکایی ببینێ، تەنیا هەر وەک دەقێکی وێژەیی بەرز و پەخشانێکی پیرۆز، لە پەرتووکخانەی کوردیدا، جێگەی خۆی دەکاتەوە. بەڵام هەر چۆنێبێ، بۆ پاشەڕۆژ بە هەنگاوێکی باش، بە کارێکی مەزن و بە کەڵک دادەنرێ.
لەم دواییانەشدا، زانای ئاینیی کورد« مەلا محەمەدی سالحی ئیبرایمی »، خەڵکی شاری بۆکان لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، سەرلەبەری قورئانی پیرۆزی، لە عەرەبییەوە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردیی وەرگێڕاوە، لە سالی «1997 »، لە سوید چاپ و بلاوکرایەوە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بە کارێکی گەلێ باش دادەنرێ.
با لێرەدا، هەر دوو نەتەوەی فارس و کورد بەراوردکەین، تا بزانین، ئەوان چۆن بوون و چییان کردووە؟ ئێمەش چۆن بووین و چیمان کردووە؟ کاتێ، فارسەکان هەستیان بە مەترسیی پڕ چەکیی، بیروباوەڕی ئایینی ئیسلام، دەوڵەمەندیی زمان و کەلتووری عەرەب کرد، هەر زوو خۆیان لەو مەترسییە گەورەیە قوتارکرد و ئایینزای شیعەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد. بەو کارەیان، خۆیان لە عەرەب و تورکە سوننییەکان جیاکردەوە و دەوڵەتی فارسیان دامەزراند، خۆیان لە دەس بندەسیی و چەوساندنەوەی هەر دوو نەتەوەی عەرەب و تورک ڕزگارکرد و زمانەکەشیان پاراست. هەر زۆر زووش، هەموو دەقەکانی قورئانی پیرۆزیان، بۆ سەر زمانی فارسیی وەرگێڕا. فارسەکان، بەو کارانەیان، نە لە ئیسلام لایاندا، نە زیانیشیان بە ئایین و گەلەکەی خۆیان گەیاند. بەڵکوو، گەورەترین کەڵکیان لە ئایینی ئیسلام وەرگرت، وەک چەکێکی نوێ، پارێزگاریی خۆیان و نیشتمانەکەیان پێ کرد. بەڵام، کورد جگە لەوەی، وازی لە هەموو ئایینە کۆنەکانی خۆی هێنا، جگە لەوەی، هەر زوو دەسی خۆبەدەسەوەدانی بەرزکردەوە، پشتیشی لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی کرد. ئیدی، لە لایەکەوە، لە نێوان نەتەوەکانی « فارس، عەرەب و تورک »دا دابەشبوو. لە لایەکی دیکەشەوە، بەپێی ئایینزا و ڕێبازە جیاجیاکانی ئایینی ئیسلام، بەگوێرەی دەسەلاتی دەوڵەتەکانی ئێران

و تورکـــیـــا، خـــۆی بە یەکێ لەو ئاینزا و ڕێبـــازانەدا هەڵواسی. ئەو خۆهەڵواسینە، بە شێوەیە بوو، بە قازانجی یەکێ لەو دەوڵەتە داگیرکەرانە تەواوبوو. ئەوە، لە بری ئەوەی، وەک فارسەکان یا تورکەکان، ڕێبازێکی سەربەخۆ هەڵبژێرێ، لەو ڕێیەشەوە، خۆی بپارێزێ و ببوژێنێتەوە، کەچی، هیچی نەکرد، بەڵکوو، وەک مەڕ، دوای شوانە فارس و تورکەکان کەوت!
تەنانەت، یەکێکی وەک « مینۆرسکی » دەڵێ: (بەشی زۆری کوردەکان لە ڕووی بیروباوەڕی ئایینییەوە موسوڵمانی سوونین، ئەم مەسەلەیەش لە ڕووی بەرانبەربوونەوەی فارس و تورکەکانەوە لە کوردستاندا بە چاکەی تورکەکان تەواو بوو.)«107،112» چونکە، کورد و تورک لە سەر ئایینزای سوننی بوون، هەر چەندە، کورد سوننی شافیعیی و تورک سوننی حەنەفییە، بەڵام، ئەم دوو لقەی سەر بە ئایینزای سوننە، ڕێگەی ئەوەی لە تورکەکان نەگرت، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، کوردە شافیعییەکان، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دژی ئێران هەڵسوڕێنن. هەر وەک چۆن، ئایینزای شیعە، وەک بەربەستێ لە نێوان فارسە شیعەکان و کوردە سونییەکاندا، ڕۆڵێکی گەورەی وازیکرد، ناکۆکییەکی گەورەی لە نێوانیاندا دروسکرد، بە شێوەیە تورکەکان، کەڵکیان لەو ناکۆکییە ئایینزاییەی، نێوان هەر دوولایان بینی، بە لای خۆیاندا ڕایانکێشان، دژی ئێرانییەکان هانیاندان و بەگژیانداکردن. لە جەنگەکانی نێوانیاندا، کوردەکان پشگیریی تورکە سونییەکانیان کرد و دژی فارسە شیعەکان جەنگان.
بۆ ئەوەی لێرەدا، ڕۆڵی ئایین و زمان باشتر ڕوونکەینەوە، پەنا بۆ بەر چەن گوتە و نموونەیەک دەبەین. « جەلادەت بەدرخان » لە ساڵی «1932»دا فەرموویەتی: (نەتەوەی ژێردەس بوونی خۆی بە دوو شت، بە دوو چەک دەپارێزێ : ئایین و زمان. گەر ئایینی هەر دوو نەتەوەی سەردەس و بندەس یەکبێ، ئەوا زمان تاکە چەک دەبێ)«45،14».
لە سەر کاریگەرێتی ئایین و زمان دەتوانین، نموونەیەک بێنینەوە. ئەو کوردانەی هەر لە کۆنەوە، لە ژێر دەسەڵاتی ڕووسیای تساریدا بوون، لە کوردستانی بندەسی ڕووسیا، لە ناوچەکانی قەفقاز دەژیان، هەر چەندە، لە زۆر ڕووەوە، باریان لە باری برا کوردەکانی، پارچەکانی دیکەی کوردستان

باشتر نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، تا چاوی ئازەرییە شۆڤێنییەکانیان لێوە دووربوو، سەریان سووکبوو. گرفتی نەتەوەیی یان کەمبوو. بەڵام، کاتێ لە ساڵی «1911»دا، « پارتی دیمۆکراسی موسوڵمان ـ موساوات » لە ئازربایجان دامەزرا، باوەڕیان بەرانبەر کورد زۆر خراپبوو. بە تایبەتیی، کاتێ ساڵی «1918-1920» ، دەسەڵاتی خۆیان لە ئازربایجان دامەزران، ئیدی، بە تەواویی دژی دەسەڵاتی نوێی سۆڤیەت و کورد ڕاوەستان. چونکە پارتێکی ڕەگەزپەرست و دواکەوتووبوو، یارمەتییان لە ئێران، تورکیا و ئینگلیز وەردەگرت. لە سەردەمی دەسەڵاتیاندا، پێش ئەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت دامەزرێ، زۆر دژی کورد بوون. تەنانەت، وایان لە هێندێ کورد کرد، لە تاوانا ڕووەو توکیا و ئێران هەڵێن. هێندێکی دیکەش لە تاوانا، وازیان لە کوردێتی خۆیان هێنا. لەو بارەیەوە نووسەرێکی سۆڤێتی «پۆکشپان »دەڵێ:(ڕاوودونانی کورد و گاڵتەپێکردن بە زمان و داب و نەریتیان پەرەیسەند، کورد بوونە گاڵتەجاڕ و مایەی نوکتە لەسەردانان لە لایەن موساواتییەکانەوە، کە توانییان جاروبار بەشێکی کەم لە خەڵکی هەرە دواکەوتوو، ڕاکێشنە ئەو گێژاوەوە، هەر ئەو دەوروبەرە دانیشتووانی ژمارەیەک گوندی کورد سوێندیان خوارد، دەس لە زمانی کوردیی هەڵگرن، ئەو زمانەی ببووە مایەی توانج و تەشەری پێکەنیناوی وەک «کەرە وەرە ». ئێمە، بۆ خۆمان تووشی چەن حاڵەتێکی هاتین، کە دیمان چۆن کورد هەبوون، سوێندیان خواردبوو، واز لە زمانی زگماکی خۆیان بێنن، وەک دانیشتووانی گوندی کەمالیی ناوچەی لاچین.)«14،93»

هەروەها، یەکێ لە نووسەرەکانیان، زۆر بێشەرمانە دەینووسی:(زمانی تورکی تا دێ، زیاتر سەرکەوتن وەدەسدێنێ، لە ڕێگەی تەنگهەڵچنینییەوە بە گەلێ زمانی پەککەوتەی ئەوتۆ کە ڕۆژیان بەسەرچووە، وەک زمانی تات و تالش و لەزگین و کوردیی هی تر.)«15،93»

پاشتریش، لە سەردەمی دەسەڵاتی سۆڤێتدا، کورد لە ناوچەکانی قەفقاز و ناوەڕاستی ئاسیا بڵاوبووبوونەوە و دەژیان. لە هەر ناوچەیەک و لە هەر کۆمارێ، بە جۆرێکی جیاواز ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرا. لە کۆماری ئازربایجان، لەبەرئەوەی ئازەرییەکان و کوردەکان، هەر دووکیان موسوڵمان

بوون، زمانی ئایینییان هاوبەشبوو، ئازەرییە شۆڤێنییەکان بە ناوی ئایینەوە، بە هەموو شێوەیە دەیانچەوساندنەوە، دانیان بە بوونی نەتەوایەتییاندا نەدەنا، نەیاندەهێشت، بە زمانی کوردیی قسەبکەن، خوێندن و نووسینیان، بە زمانی زکماکیی خۆیان لێ قەدەغەکردبوون، بەرنامەیان لە ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆندا نەبوو، ڕۆژنامە و گۆڤاریان، بە زمانی کوردیی دەر نەدەکرد، بە هەموو شێوەیە دژایەتیان دەکردن و لە زۆر جێگە کاریان پێ نەدەدان، بە هەڕەشە و بە زۆر، ناو و فەمیلیاکانیان پێ دەگۆڕین، سەرانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتیش، لە ئاستی ئەو تاوان و کارە نامرۆڤانەیەی تورکە ئازەرییەکاندا، چاویان نوقاندبوو، ورتەیان لە خۆیان بڕیبوو! بۆیە، لە ماوەیەکی کەمدا، زۆربەی زۆری کوردەکان کۆڵیاندا، ناو و فەمیلیاکانی خۆیان گۆڕی و بە ئازەر ناونووسکران. ئەوانەی بەو کارە نامرۆڤانەیەی ئازەرییەکانیش ڕازی نەبوون، لە ناچاریدا باریانکرد و بە کۆمارەکانی دیکەی یەکێتی سۆڤێتدا پەرشوبلاوبوونەوە.

بەڵام، ئەو کوردانەی، لە کۆمارەکانی دیکەی وەک: « ئەرمەنستان و گورجستان »دەژیان، لەبەرئەوەی، گەلانی « ئەرمەنیی و گورجیی » موسوڵمان نەبوون، زمانی ئایینیی و نەتەوەیی یان یەک نەبوو، کوردەکانیش، زۆربەی زۆریان « یەزدیی » بوون، تووشی ئەو گرفتە نەتەوەیی یانە نەبوون، لە چاو کوردەکانی ئازربایجاندا، زۆر بە ئازادیی و بەختەوەریی دەژیان، لە ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆنەکاندا، خاوەنی بەرنامەی تایبەتیی خۆیان و ڕۆژنامەی کوردیی بوون. تا ئێستەش، چەندین لێکۆڵینەوەی قووڵ و وردی زانستانەیان، لە سەر « مێژووی کورد، زمان، هونەر، وێژە و باری کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگەی کوردەواریی » بە ئەنجامگەیاندووە. وەک د. « کەمال مەزهەر »یش دەڵێ :

(هەستی نەتەوەیی لە ناو بەشی زۆری کوردی ئازربایجانی شوورەویدا نەگەیشتبووە ئاستی ئەو هەستە لە ناو کوردی ئەرمەنستاندا. هاوئایینی لە سەر ڕۆخی جیهانی عیسایی دەوری خۆی لەمەدا دیبوو.)«15،93» واتە: زمانی نەتەوەی باڵادەس، بە هۆی زمانی ئایینی هاوبەشەوە، کاری خۆی لە زمانە نەتەوەیی و خەسڵەتەکانی دیکەی کورد کردبوو، بە شێوەیەکی زۆر

خراپ، لە ژیانی ئەو کوردانەدا ڕەنگیدابۆوە، کە تا ئەورۆش شوێنەوارەکەی هەر دیارە!

بە کورتییەکەی، زمانی ئایین و ئایینزاکان، لە ژیانی گەلان و نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەوییەدا، هەمیشە، وەک چەکێکی دوودەم وابووە. هێندێ جار، بە هۆی ئایین یا ئایینزایەکی دیاریکراوەوە، زمانی ئەو گەلە یا ئەو نەتەوەیە، یەکیگرتووە و پێشکەوتووە.(مارتین لووتەر «1483 ـ 1546»ی ئەڵمانیش کە داهێنەری ئایینزای پرۆتستانت و پێشەوای بزووتنەوەی چاککردنی ئایینی دیانێتی « واتە کاتۆلیکی »یە، پاش ئەوەی ئینجیلی لە لاتینییەوە وەرگێڕایە سەر شێوەی ئەڵمانیی ساکسی، کە تا ئەو حەلە تەنیا لە دیوەخانی ئەمیرەکانی ساکسدا بەکاردێنرا، توانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ ئەو ئینجیلە ڕاکێشێ و هەر بەو هۆیەوە شێوەی ساکسی بوو بە زمانی ئەدەبیی هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئەڵمانی دەدوون، هەر لە ئەڵمانیا خۆیەوە بگرە، تا دەگاتە سویسرا و نەمسا و گشت لایەکی دی.)«8،23»

بە پێچەوانەشەوە، لە مێژووی هێندێ گەل و نەتەوەی دیکەدا، ئایین یا ئایینزا، ڕۆڵێکی گەلێ گەورەی، لە دوولەتکردنی زمانی نەتەوەیی، ئەو گەل و نەتەوانەدا وازیکردووە. بۆ نموونە:(سریانەکان هەتا سەدەی پێنجی زایین، زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەبوو. ئا لەم سەدەیەدا، ئاژاوە کەوتە کڵێسەی دیانەکانی ڕۆژهەڵاتەوە و بەوە خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە و هەر لەوەشەوە ئایینزای یاقووبیی و ئایینزای نەستووریی پەیدابوون. ئەمجا وردەوردە، هەر لایە شێوەی تایبەتیی خۆی پاراست و پێی نووسیی و ڕقوکینە و دووبەرەکیش دەورێکی ئاگرخۆشکەرانەی نوان بۆ دوورخستنەوەی هەر دوو شێوەکە لە یەکتر، بە جۆرێ سریانەکان ئێستە دوو شێوەی ئەدەبییان هەیە. ئارییایی یە کۆنەکانیش « واتا هیندۆ ئێرانییە کۆنەکان » لە سەرەتاوە بە یەک زمان دەدوان و یەک ئایینیشیان هەبوو. بەلام، پاش ئەوەی ئەوانەی هیندستان ئایینی خۆیان جیاکردەوە و لە دەورووبەری « 3000 پ.ز. »دا کتێبی پیرۆزی « ڤیدا »یان بە شێوەی سانسکریت بۆ نووسرایەوە، ئەمجا کە دوای ئەوانیش ئارییایی یەکانی ئێران، ئایینی زەردەشتییان پەسەندکرد و کتێبەکەیان بە زمانی « ئاڤێستا »

بڵاوکردەوە، ئەو دەمە زمانی ئارییایی بەرەبەرە بوو بە دوو زمان : هیندیی و ئێرانیی، کە هەر یەکەشیان لەسەرخۆ بوو بە چەند زمانێکی سەربەخۆ.)«9،23» بەڵام، لەبەر گەلێ هۆ،(ئایین لە نێو کورددا هیچ جۆرە دەورێکی بنچینەیی نەگێڕاوە بۆ دروستکردنی زمانی ئەدەبیی.)«11،23»
گرفتە سەرەکییەکەی کورد لەوەدایە، کورد بە یەکێ لە گەلانی ئیسلام دادەنرێ. تەنیا ئەرکی ئیسلامێتی لە سەر شانە، بێ ئەوەی وەک گەلەکانی دیکەی ئیسلام، هیچ جۆرە مافێکی هەبێ. لە هەمان کاتیشدا، گەلانی باڵادەسی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستانیش، بە ئایین هەر ئیسلامن. ئەو چوار دەوڵەتە وای لێکدەدەنەوە، هەموو سەرکەوتن و پێشکەوتنێکی کورد، لە هەر بوارێکدا بێ، زیان بە قەوارەی دەوڵەتەکانیان و ئاسایشی نەتەوەیی یان دەگەیەنێ. لەبەرئەوە، هەر چواریان بە ئاسانیی، هەمیشە، دژی کورد یەکدەگرنەوە، بێ ئەوەی گوێ بە کێشەی « ویژدان، ئایینی هاوبەش، باوەڕی مرۆڤایەتیی » و هیچ جۆرە شتێکی دیکە بدەن.
گەر بهاتایە، کورد لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکەی ناموسوڵماندا، دەسەویەخە بجەنگایە، لەوانەیە، ئەو دەوڵەتانە ئەو کاتە، نوزەیەکیان لێوە بهاتایە! بەڵام، چونکە بە هەموو شێوەیەک و لە ژێر هەر ناوێکدا بێ، هەر لە کورد دەدەن، گەر کوردیش بتوێتەوە، هیچ دەوڵەتێکی موسوڵمان لەم گەردوونەدا، ورتەی لێوە نایە! لەبەرئەوە، لە یەک کاتدا، کوردستان وەک کۆلۆنیایەکی ئەو چوار دەوڵەتە و ئایینی ئیسلام وایە. چونکە، بێدەنگبوونی جیهانی ئیسلام، لەو هەموو تاوانانەی لە کوردستاندا دەکرێن، خۆی لە خۆیدا، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە هەر دوو ئایدۆلۆژیای هەر چوار دەوڵەتەکە و ئیسلام، لە ناوەڕۆک و شێوەدا یەکدەگرنەوە. لەبەرئەوەی، داگیرکەران لە ژێر ڕەشماڵی ئایینی ئیسلامدا، کورد تاکبردەکەن، ئیسلامەکانی جیهانیش، بەو قەلاچۆکردنە قایلن، بۆیە، بێدەنگن. وەک ئەوەی، لە بەختی کورددا، هەموو شتەکان ئاوەژووبووبنەوە، وەک ئەوەی، سەرانی چوار دەوڵەتەکە، خەڵکی « فەلەستین، خوارووی فیلیپین، بۆسنەوهەرسک، چیچێن و کۆسۆڤۆ »ی ئیسلام بن، کوردیش

دەستەی فەرمانڕەوایانی، ئەو دەوڵەتە خوێنڕێژانەی « ئیسرایل، فیلیپین، یۆگۆسلاڤیا و ڕووسیا » بێ!
لە هەموو شتێ سەیرتر ئەوەیە، هەموو جیهانی ئیسلام، جگە لە چەن دەوڵەتێکی دیکتاتۆریی وەک:« عێراق، لیبیا و ئێران » نەبێ، کە ئەوانیش گرفتی تایبەتیی خۆیان، لەگەڵ « ئەمێریکا و بریتانیا »دا هەیە، زۆر بە توندیی پشگیریی ئەلبانە موسوڵمانەکانی « کۆسۆڤۆ » دەکەن، وەک جوجکەقاز دەقیرێنن، لەبەرئەوەی، سربە فاشییەکان بەرنامەی دەرکردن و ژینۆسایدیان، لەگەڵدا بەکاردێنن و دەربەدەریاندەکەن. کەچی، لە ساڵی «1991»دا، دوو میلیۆن کورد لە باشووری کوردستان لێی قەوما، کۆڕەوە مەزنەکەیان ئەنجامدا، یەک ڕێکخراو و یەک دەوڵەتی ئیسلامیی، قیرەیان لێوە نەهات!
بۆیە، زانایەکی ئایینیی گەورەی وەک: د. « شێخ یوسف قەرزاویی »، زۆر بە ڕاشکاویی، لە بەرنامەی « ئەلشەریعە و ئەلحەیات » دا، داکۆکیی لە موسوڵمانە ئەلبانەکانی « کۆسۆڤۆ » دەکرد. لە کاتێکدا، لەگەڵ بەرنامەی بەرەی « ناتۆ »دا بوو، لە هەمان کاتیشدا، دژی «ئەمێریکا و بریتانیا » ڕادەوەستا و پشگیریی عێراقی دەکرد! دەیگوت: گەر لە هەر جێگەیەکی ئەم جیهانە، گەلێکی موسوڵمان لێی قەوما، موسوڵمانەکانی دیکەی برایان نەتوانن، یارمەتییانبدەن، هەر لایەنێکی دیکە یارمەتییانبدەن، لە سەریانهەڵدەنێ، ئەوا کارێکی باشە و دەبێ، پشگیریی لێ بکرێ. لێدانی ناتۆ لە یۆگۆسلاڤیا، دوو جار بۆ ئیسلام باشە. جارێکیان داکۆکیی لە گەلی موسوڵمانی « کۆسۆڤۆ » دەکەن. جارێکی دیکەشیان، هەر دوو لایان دوژمنی ئایینی ئیسلامن و لە نێو خۆیاندا، سەر و گوێلاکی یەکدی دەشکێنن! کەچی، کاتێ بینەرێ، بە تێلیفۆن دەربارەی بیست میلیۆن کورد لە باکووری کوردستان لێی پرسی، ئایا، ئەوانە موسوڵمان نین، وا دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە سەریان هەڵ نادەنێ؟ نەک هەر بە چاک و بە خراپ وەڵامی نەدایەوە، بەڵکوو، یەکسەر بابەتەکەی گۆڕی!
هەڵبەتە، نەک هەر داگیرکەرانی کوردستان، بەڵکوو دەوڵەتەکانی جیهانیش دەزانن، کورد چەن نەتەوەیەکی خواپەرست و موسوڵمانە، چۆن هەموو

شتێکی بە نرخی، لە پێناوی ئیسلامدا بەخشیوە، بۆیە پرۆفیسۆرێکی ئەمەریکی وەک « Frey »، لە سالی «1962»دا، لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی باری تورکیا کردووە، لە باسی چارەسەرکردنی کێشەی کورددا، ئامۆژگاریی تورکەکان دەکا، پێشنیازیان بۆ دەکا و دەڵێ: (باشترین ڕێگە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی گرفتی کورد، بە هۆی دامەزراندنی پارتێکەوە دەبێ، بنەما سەرەکییەکانی لە سەر بنچینەی ئایین دامەزرێ و پشگیرییکرێ.)«168،10» هەڵبەتە، ئەم دید و بۆچوونە، تا ئەندازەیەکی زۆر ڕاستە، چونکە، گەلی کورد لە باکووری کوردستان، لە گەلی تورک موسوڵمانتر و خواپەرستترە. بۆیە، بنکەی جەماوەریی پارتی « ڕەفاهـ »ی کۆن و « فەزیلە »ی نوێی ئیسلامیی، لە کوردستاندا گەلێ فراوان و بڵاوە، لە نێو جوتیار و هەژارەکاندا دەسەڵاتێکی زۆریان هەیە.
لێرەدا هەوڵدەدەین، چەن نموونەیەک، لە سەر پێوەندیی تورک و کورد بێنینەوە. هەر چەندە، کورد لە هەموو پارچەکانی نیشتمانە داگیرکراوەکەیدا، خراپ ژیاوە و خراپیش دەژی، بە شێوەیەکی دڕندانە دەچەوسێنرێتەوە. بەڵام، چەوساندنەوە تا چەوساندنەوە جیاوازیی هەیە. بۆیە، بە باوەڕی زۆربەی کورد، تورکیا، لە چاو دەوڵەتەکانی دیکەی «ئێران، عێراق و سووریا »دا، لە لووتکەی چەوساندنەوەیان تێپەڕاندووە. دەتوانین، بە ڕاشکاویی بڵێین: کورد لەو سێ دەوڵەتەی پێشتر ناومانبردن، لە چاو کوردەکانی باکووری کوردستاندا پاشا بوون! هەر چەندە، لەو ڕۆژەوە، « مستەفا کەمال » کۆماری تورکیای نوێی دامەزراندووە، کاربەدەسانی دەوڵەتی تورک خۆیان، هەرگیز باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نەبووە و نییە. چونکە، هەر لە کۆنەوە، « ئەتاتورک »، هەموو بنچینە سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلامی، لە تورکیادا گۆڕیی،(قورئانی پیرۆزی ناونا پەرتووکە ڕەشەکە.)«16،56» پاشان،(بانگی کرد بە تورکیی، قورئانی گۆڕییە سەر زمانی تورکیی، ڕۆژی یەکشەممەی لە بری هەینی کرد بە پشووی هەفتانە، لەچکی ژنانی قەدەغەکرد، شالیارگەی ئەوقاف و هەموو خوێندنگە ئایینییەکانی داخست، تەنانەت، ڕۆژژمێری ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامیشی بە ئەورووپیی گۆڕی.)«303،110».

ئەورۆش، باشترین بەڵگەی بۆچوونەکانمان ئەوەیە، لە لایەکەوە، سەرانی دەوڵەتی تورک، بە پلەی یەکەم وابەستەی ئەمێریکا و بە پلەی دووەمیش بەرەی ڕۆژاوان. لە لایەکی دیکەشەوە، لەگەڵ دەوڵەتێکی وەک ئیسرایلدا، ڕێککەوتننامەی ستراتیژیی دەبەسن، وەک دۆستێکی ستراتیژیی لە ناوچەکەدا، لە یەکدی دەڕوانن. گەر تورکیا، دەوڵەتێکی ئیسلامی بووایە، باوەڕی بە یەکێتی گەلانی ئیسلام هەبووایە، دەبووایە، هەمووی بە پێچەوانەوە بووایە. واتە: لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، یەکێتییەکیان دامەزراندایە، دژی ئەمێریکا، بەرەی ڕۆژئاوای فەلە و ئیسرایلی جوو ڕابوەستانایە. کەچی، سەرەڕای هەموو ئەوانەش، کاتێ دەیانەوێ، گەلی کورد لە باکووری کوردستان بێدەنگکەن و لە بۆتەی نەتەوەی تورکدا بیتوێننەوە، دژی کورد و شۆڕشەکانی، چەکی ئایین بەکاردێنن.
لە هەموو سەرانسەری، مێژووی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستاندا، پیاوە ئایینییەکانی کورد، هەر لە کۆنەوە خۆیان لە دوو دەستەی جیاوازدا بینیووە :
1. ئەوانەی، لە حوجرەی « مەلا، تەکییەی مزگەوت و خانەقاکان »دا پێگەیشتوون. ئەمانە، هەر لای مەلا کوردەکان، بە زمانی کوردیی خوێندوویانە، واتای قورئان و گوتەکانی پەیامبەریان، بە کوردیی بۆ لێکدراوەتەوە. لە پاڵ وانە ئایینییەکانیشدا، هێندێ باسی « مێژوو، وێژە و زمانی کوردیی »شیان خوێندووە. زۆربەی کاتیش، لە میرییەوە مووچەیان بۆ نەبڕاوەتەوە، بەڵکوو، خەڵکی ڕەشوڕووتی گوند و ناو شارەکان ژیاندوویانن.
2. ئەوانەی، لە خوێندنگە ئایینییە دەوڵەتییەکان دەردەرچوون. ئەمانەش، هەر وەک دەستەی یەکەم موسوڵمان بوون، بەڵام، لێرەدا جیاوازییەکەی نێوانیان ئەوەیە، ئەمان بە زمانی کوردیی نەیانخوێندووە، بەڵکوو، بە زمانی نەتەوەی بالادەس و دەوڵەت خوێندوویانە. لە لایەن دەوڵەتەوە مووچەیان بۆ بڕاوەتەوە. کاتێ دەریشچوون، لە یەکێ لە مزگەوتەکاندا دامەزراون، دەوڵەت، مووچەی مانگانەی داونەتێ. بە هیچ شێوەیە، بە لای باسەکانی « مێژوو، وێژە و زمانی کوردیی »دا نەدەچوون. بەڵکوو، لە

ڕێگەی مامۆستاکانیانەوە، لە کاسەی ئاییندا، ئایدۆلۆژیای دەوڵەتیان دەرخواردراوە. بۆیە، کاتێ دەرچوون، هەر ناوی مافی کورد و سەربەخۆیی کوردستانیان، گوێ لێ بووایە، وەک فیشەکەشێتە بە حەوادا دەچوون و دەتەقینەوە. کاربەدەسانی دەوڵەت، زمانی دەوڵەت و زمانی ئایینیان، وەک یەک دژی زمانە نەتەوەیی یەکەی کورد بەکارهێناوە. هیوایەکی زۆریشیان بەو جۆرە مەلایانە هەبووە، تا مەبەس و ئامانجە گڵاوەکانیان بۆ بەدیبێنن.

بۆ نموونە: مەلا تورکە شۆڤێنییەکان، کە لە ژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا خۆیان حەشارداوە، بە خوێندکارە ئایینییەکان دەڵێن: (گرنگ ئەوەیە، مرۆڤ موسوڵمان و مرۆپەروەر و برابێ. بەڵام پێشخستنی ناسنامەی نیشتمانیی، لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێ.)«85،10» هەروەها، کاربەدەسانی تورک، هێندێ لە مەلا و شێخە کوردەکانیان کڕیوە، وەک نۆکەر و چڵکاوخۆرێکی دەزگەی سیخوڕیی « میت »ی تورک، دژی کوردپەروەران هەڵیاندەسوڕێنن. وەک:« شێخ سەیدا » ناوێ، لە ناوچەی « جزیرە » دەژیا، پێوەندییەکی توندیی بە «میت»ی تورکییەوە هەبوو. ئەم شێخە نیشتمانفرۆشە، هەمیشە، ئامۆژگاریی لاوانی کوردی دەکرد، دژی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد ڕاوەستن. تەنانەت، کاتێ لە باشووری کوردستان، ڕۆڵەکانی گەل تووشی کارەساتە گەورەکەی کیمیاباران و ئەنفالەکان بوون، ئەم شێخە خۆفرۆشە، بە هەموو توانایەوە هەوڵیدەدا، هەستی نەتەوەیی لاوانی ناوچەکانی «هەکاریی، سیرت، ماردین و وان » بتاسێنێ، دژی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، ناڕەزایی و توڕەبوونیان دامرکێنێتەوە. چونکە، ئەو ڕاپەڕین و توڕەبوونە، لە قازانجی تورکەکاندا نەبوو. بۆیە، پێیی دەگوتن: (گرنگ ئەوەیە، مرۆڤ موسوڵمان بێ، بە شێوەیەکی برایانە هەڵسوکەوتکا. بەڵام، سووربوون لە سەر ئەوەی سەر بە کۆمەڵێکی ئێتنی بێ، ئەوە لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆکە، خواش لەو کەسانە خۆش نابێ، کە لە سەر ئەو باوەڕە سوورن. لە گوتەکانی پەیامبەر محەمەد ئەوەیە، ڕێگە نەدەی، ئەو جۆرە کەسانە لە ناوماندا بژین، ئێمەش هەموو نەوەی پەیامبەرین.)«143،10»

ئەم قسە پڕوپوچانەی شێخ، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، وەک ئەوەی تەنیا کورد، خۆی بە ڕۆڵەی نەتەوەیەکی دیاریکراو بزانێ، « فارس، عەرەب و تورک »، هەموو وازیان لە نەتەوەکانی خۆیان هێنابێ، تەنیا بڵێن: ئێمە ئیسلامین و لە نەوەی پەیامبەرین! لە کاتێکدا، باوەڕ ناکەم، هیچ نەتەوەیەک هەبێ، وەک تورک خۆی بە نەتەوەیی بزانێ، تورکیای نیشتمانی خۆیان هێندە خۆشبووێ، ڤایرۆسی بیری شۆڤێنیزم و ئایدۆلۆژیای فاشیزم، لە نێو ڕۆڵەکانی تورکدا بڵاوکاتەوە! بەڵام، گەر کوردێ، خۆی بە کورد بزانێ، داکۆکیی لە زمان، هاونیشتمان و خاکی وولاتەکەی خۆی بکا، ئەوا، ئەو کارەی پێ ڕەوا نابینن، بە ناپاک تاوانباریدەکەن، دەڵێن: لە ئایین لایداوە. وەک « بێشکچی »ش دەڵێ: (شێخ دەیەوێ، کۆمەڵەکەی دەوروپشتی تێگەیەنێ، خوا و پەیامبەر دژی کێشەی کوردن، کارێکی زۆر خراپە، گەر مرۆڤ داکۆکیی لە کێشەی کورد بکا و داوای مافەکانی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی بۆ کورد بکا.)«10، 143»

ئەم درۆودەلەسانەی « شێخ، مەلا تورک و چڵکاوخۆرە کوردەکان »، بە ناوی خوا و پەیامبەرەوە هەڵیدەبەسن، هەر هەمان درۆودەلەسەی کاربەدەسانی میتی تورکە، هەر هەمان قەوانە سوواوەکەی، هەموو داگیرکەرانی کوردستان لێدەدەنەوە. چونکە، ڕێگەیەکی ئاسان و کارێکی هەرزانە! چونکە، ئایین کار لە هەست و هۆش دەکا، مرۆ دەتاسێنێ، بە تایبەتیی، لە ڕێی مەلا و شێخە کوردەکانەوە، هەموو مەبەسەکانی داگیرکەران، پتر دەپێکێ!

ئەم دەستەیە، لە لایەن دەوڵەتەوە، پشکیرییان لێ دەکردێ، پارە و دیارییان دەدرێتێ، بە پێچەوانەی ئەو مەلا و شێخانەی، هاوکاریی لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەر ناکەن، لە سەر نان و خوانی ڕەشوڕووتی موسوڵمانان دەژین، کاربەدەسانی دەوڵەتیش، بە هەموو شێوەیە دژایەتییان دەکەن. مەلا و شێخە بەکرێگیراوەکان وەنەبێ، تەنیا لە کاتی هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان و دەزگەکانی دەوڵەتدا، هەڵەکەسەمایان پێ کەوێ، بەڵکوو، هەر کاتێ و لە هەر کوێیە، تورک پێویستی پێ بوو، پارەی ڕشت، ئەوا ئەوان، لە سەر ژیان و گیانی، ڕۆڵە نیشتمانپەروەرەکانی کورد، دەسی یارمەتی بۆ تورکە

داگیرکەرەکان درێژدەکەن، پشت لە گەلەکەی خۆیان دەکەن، ناپاکییەکی چەپەڵ، لە ئایینی ئیسلام و گەلی کوردیش دەکەن. تەنانەت، دەڵێن: (بایەخدان بە کێشەی کورد، واتا باوەڕنەبوون بە خوا، کۆمۆنیزم و ناپاکیی گەورە دەگەیەنێ.)«169،10»
هەڵبەتە، ئەمانە هیچی لە قسەی مەلایەکی خواپەرست و شێخێکی دیندار ناچێ. بەڵکوو، بە چ شێوەیە، کاربەدەسانی میتی تورک، بۆیان دەهۆننەوە، ئەوانیش هەر بەو شێوەیە، مێشکی خەڵکی پێ پڕدەکەن! تەنانەت، بەکرێگیراوێکی میتی تورکمانی وەک « ئۆرخان محەممەد »، زۆر بێشەرمانە لە سەر تێلێڤیزیۆنی « ئەلجەزیرە »بەرانبەر« عادیل یەزیدیی » نوێنەری « P.K.K. » دیگوت: (« P.K.K. » ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستییە، واتە: گاورن، دەبێ، لێیان بدرێ!)دیارە، ئەو نووسەرە خۆفرۆشە، کێشەی چەوساندنەوەی بیست میلیۆن کورد، تەنیا بە بوون و نەبوونی « P.K.K.»وە گرێدەدا. ئایین، وەک چەکێکی کوشندە بەکاردێنێ، تا هەستی گەلانی موسوڵمان بە گشتیی و گەلی تورک بە تایبەتیی، بوروژێنێ و دژی « P.K.K. » هانیاندا.
لێرەدا، بۆمان دەردەکەوێ، تورکەکان ژاری ئایدۆلۆژیای فاشییە کوردکوژییەکەی خۆیان، بە ووشەی شیرینی ئایین دەپێچنەوە و پێشکەش بە کۆمەڵانی خەڵکی دەکەن. واتە: تورکەکان، هێندە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هەیە، کە قازانج بە خۆیان و زیان بە کورد بگەیەنێ! ئەگینا، گەر وا نەبێ، بۆچی، ژیانیان بە زانایەکی ئایینیی نیشتمانپەروەری وەک « شێخ سەعیدی نەورەسی 1873 - 1960 » تاڵدەکرد؟ هێز و توانایان لێ دەبڕی؟ بە هەموو شێوەیە دژایەتییاندەکرد؟ چەندین جار سزایاندەدا و لە قوژبنی گرتووخانە سامناکەکانیان توونددیاندەکرد؟ لە دواییشدا، کاتێ زانییان، هیچ جۆرە شتێ نییە، کار لە باوەڕی شێخی نەمر بکا، تا دەس لە« هەق، خواپەرستیی، ئایینی ئیسلام، داکۆکیی لە هەژار و چەوساوەکانی کورد، لە مافە نەتەوەیی یە ڕەواکانی نەتەوەی کورد » هەڵگرێ. لەبەرئەوە، وازیان لێ نەهێنا، تا بەو داخەوە، سەری نایەوە و مرد. دواتریش، چۆن لە ژیاندا لێی دەترسان، دوای مردنەکەشی، هەر بەو

شێوەیە، لە مەزراکەی دەترسان. بۆیە، زۆر نامەردانە و ترسنۆکـانە، گۆڕی شێـخی مـوسـوڵـمـان و کـوردپەروەریان تێکداو و ونکرد. ئایا، شێـخی نەورەسی، مـوسـوڵـمـان نەبوو؟!! دەتوانین، « سـەعـیـدی نەورەسی » کـە نازناوی « سـەعـیـدی کـوردیی » بوو، بە یەکێ لە پیـاوە خـواناس و کوردپەروەرە هەرە گەورە و ڕاستەقـینەکانی کـورد دانێین. بە « کـوردیی، عـەرەبیی و تورکـیی » نووسیـویەتی، موریدی لە « کـوردسـتـان، تورکـیا، ئێـران، پاکـسـتـان، هیندسـتـان و ئەوروپا » هەبووە. یەکـێـکە لەو نیشتمانپەروەرانەی، لەسەر کورد و کوردستان، ئازارێکی زۆری چێشتووە. دژی « کەمالییـەت »بووە. « نەورەسی » فەرموویەتی: (هەر چەندە، کوڕی مـرۆڤـێکی هەژاری نەتەوەی کـوردم، هەر شـادم، چونکە، لە ئامـێـزی کـێـوە سەوزە ڕەنگینەکانی کوردستان پێگەیشتووم ....)«274،105» تا بڵێی، پیـاوێکی ئازا و چاونەترسبـووە، داکۆکـیی لە خۆی و گـەلەکەی کـردووە، ئەوەشی نەشـاردۆتەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، لە بەردەم دادگـەدا، بە تورکەکانی گوتووە:

(یەکێ لە تاوانەکانم ئەوەیە، خەم بۆ کوردستان و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەخۆم، داوای دانەوەی مافە ڕەواکانی کورد دەکەم و دەکۆشم، کە ئەو گەلە کـوردە مـوسـوڵـمـانەش، وەکـوو خـەڵکی تر بگەنە کـاروانی هونەر، زانست، پێبگەن، پێـشکەون و لەمـە زیاتر ژێر چەپۆکـەی دوژمـنان نەبن. مـن، هەر چەندە، ئاوارە و دوورخراوەم، هەر خۆم بە بەختەوەر دەزانم. چونکە، هەست بە گـزینگی ئـاواتەکـەم دەکـەم، کـە لە ئاسۆی ئەم « زینـدانە شـاربەدەری »یە دەردەکەوێ و هەڵدێ.)«273،105» تەنانەت، هێندە کوردپەروەر بووە، چەن جـارێ فـەتوایداوە، (کـە مـوسـوڵـمـانەکـانی کـوردی تورکـیـا دەبێ، زۆرداریی ڕژێمی ئەتاتورک قەبوڵ نەکەن.)«272،105»

ئێستەش، با هێندێ باسی ئایین و جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نیشتـمانیی بکەین. شتێکی ئاشکرایە، هەر کاتێ، ڕۆڵەکانی کورد، داوای مافەکانی خۆیان کردبێ، یەکسـەر تورکەکان گـوتوویانە: ئەمانە لە ئیـسلام لایانداوە. هەمیشە، کوردیان بە گومڕا، گاور و کۆمۆنیست تاوانبارکردووە. ئەوە لە کـاتێکدا، هێندێ بزووتنەوەی ڕزگـاریخوازی نەتەوەیی و نیشتـمانیی، لە

جیهاندا بە گشتیی و لە ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەندا بە تایبەتیی هەبوون، ئایین ڕۆڵێکی سەرەکیی تێیاندا دیوە. وەک دینەمۆیەکی مەزن، کاری لە بزووتنەوەکە کردووە، ڕۆڵەکانی گەلی پتر دژی داگیرکەرەکە تیژکردووە و بۆ خەباتکردن هانیداون. بۆ نموونە: بزووتنەوەی « مەهدی » لە سۆدان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، دژی ئیمپریالیزمی بریتانیا بوو. جوولانەوە شۆڕشگێڕییە نەتەوەیی و نیشتمانییەکەی « عومەری موختار » لە لیبیا، دژی ئیتالییەکان وەستا. شۆڕشی « شێخ عەبدولقادر » لە جەزایر دژی فرەنسییەکان بەرپابوو. جەنگە خوێناوییەکانی گەلی « بۆسنەوهەرسک »، دژی « سرب »ەکان ڕوویاندا. گیانفیدایی و قوربانییە زۆرەکانی، گەلی «چیچێن »، دژی « ڕووس »ەکان، داستانێکی قارەمانانەیان تۆمارکرد. ڕاپەڕینی ئەلبانە موسولمانەکانی « کۆسۆڤۆ »، دژی « سرب »ەکان دەنگی دایەوە.

ئەمانە، هەموویان چەن نموونەیەکی زیندوون، هەستی نەتەوەیی و ئایینی پێکەوە تێکەڵاوبوون، گەر بە ڕووکەشی لێیان بدوێین، زۆر بە سەختی مرۆڤ دەتوانێ، ئەو دوو هەستە لە یەکدی جیاکاتەوە. گەر چی لە ڕواڵەتدا، ئەو بزووتنەوە نەتەوەیی یە شۆڕشگێڕانە، لە قاڵبی بزووتنەوەیەکی ئایینیی ڕووتدا خۆیان دەنوێنن، بەڵام، لە ڕاستیدا، بە چەن بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی دادەنرێن. ئایین، تەنیا ڕووی دەرەوەی ئەو بزووتنەوانە پێکدێنێ. وەک « بێشکچی »ش دەڵێ: (هەموو بزووتنەوە ڕزگاریخوازییە نیشتمانییەکان لە جیهاندا، لە ماوەیەکی دیاریکراودا، لە سەر ئایدۆلۆژیای ئایین بەڕێوەدەچوون. زەقترین نموونەش لە سەر ئەوە، جولانەوەکەی مستەفا کەمال دژی یۆنانییەکان و ئەرمەن لە ئەنادۆڵ بوو.) «179،10»

لێرەدا دەتوانین، نموونەیەکی دیکەی سەیرتر بێنینەوە: لە ساڵەکانی «1985-1987»دا، لە بری ئەوەی مەلا و شێخە تورک و کوردەکان بەکاربێنن، پیاوەکانی « میت، پۆلیس و جەندرمەکانی تورک »، ڕاستەوخۆ خۆیان ئەو کارانەیان جێبەجێدەکرد. هەروەها، بە هۆی فڕۆکەکانیانەوە، بە سەر ناوچەکانی باکووری کوردستاندا، بڵاوکراوەیەکی زۆریان، دژی شۆڕشە

پیرۆزەکەی « P.K.K. » بڵاودەکردەوە. لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیشدا، بە شێوەیەکی بەردەوام دەیاننووسی: گوایا « دەوڵەتی تورکیای عیلمانیی داوای غەزا دەکا ». ئەویش، بە هۆی(بڵاوکراوەکانیانەوە، کە هەمووی بە ئایەتی قورئان و گوتەکانی پەیامبەر ڕازابوونەوە، داوای لە دانیشتووانی ڕۆژهەڵات دەکرد، مل بۆ فەرمانەکانی خوا و پەیامبەر کەچکەن، لە پێناوی خوادا غەزا دژی بەرەی گاوران بکەن.)«342،9»
داگیرکەران، هەمیشە هەوڵیانداوە و هەوڵیشدەدەن، دوو فاکتەری گرنگ تێکەڵاوکەن، تا بە تەواویی، سەر لە کورد بشێوێنن. ئەویش: فاکتەری ئایین و مێژووی هاوبەشە. بۆ ئەوەی، کورد بتاسێنن، ڕۆڵەکانی کورد بیر لە ئازادیی و سەربەخۆیی نەکەنەوە، هەمیشە گوتوویانە: ئێمە هەموو موسوڵمانین و یەک ئایینی هاوبەش کۆماندەکاتەوە. لەبەرئەوە، لە یەک گەل و نەتەوە پێکهاتووین، مێژوویەکی هاوبەشمان هەیە، نزیکەی چوارهەزار ساڵە کورد و فارس، وەک برا لە خاکی ئەوڕۆی ئێراندا پێکەوە دەژین. زمان و مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە. هەزاروچوارسەد ساڵە، کورد و عەرەب دژی داگیرکەران و گاوران خەباتدەکەن. دەورووبەری حەوتسەد ساڵیشە کورد و تورک، لە ژێر ئاڵای ئیمپراتۆریای عوسمانیی و ئایینی ئیسلامدا پێکەوە دەژین.
دیارە ئەم باوەڕ و بۆچوونانە، جگە لە تاساندن و گێژکردنی کورد، هیچی دیکەی تێدا نییە. گەر هێندێ ڕاستیش لەم بۆچوونانەدا هەبێ، تەنیا ئەوەیە، کورد زیانی لێ دەکا و داگیرکەرانیش قازانجی لێ دەبینن. چونکە، ئەو دەوڵەتانە دەیانەوێ، لە لایەکەوە، بە ناوی « ئایین، زمان و مێژووی هاوبەش »ەوە، تا کورد ماوە، بە ژێردەسیی و دیلی بژی، بیر لە سەربەخۆیی نەکاتەوە. کوردستان داگیرکەن، هەرگیز ڕزگاری نەبێ، بۆ ئەوەی، لە سەر چەوساندنەوە و تواندنەوەی کورد بەردەوامبن، بەشە کوردستانەکەی خۆیان لەکیس نەچێ. لە لایەکی دیکەشەوە دەبێ، ئەوە باش بزانین، چ لە کۆن و چ لەم ڕۆژەدا، ئایین هەرگیز، بە یەکێ لە مەرجەکانی هیچ گەل و نەتەوەیەک دانەنراوە و داشنانرێ. چونکە، گەر (تورک و عەرەب و فارس و ئەفغان و میللەتانی تر، زۆر لە مێژە، ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە، بەڵام، بە هیچ

چەشنێ ناتوانرێ، بوترێ، ئەمانە یەک نەتەوەن. گەر لە ڕێگەی ئایینەوە
تەماشای کورد بکرێ، کە لە چ نەتەوەیەکە، ئەوسا بە ئاسانیی دەتوانرێ، کورد بکرێ بە عەرەب، بە تورک، بە ئەفغان ... هتد)«57،78 » جا، گەر درووسبوونی نەتەوەکان، لە سەر بنچینەی ئایین دابڕێژرایە، ئەوا دەبووایە، نەک هەر « کورد و فارس، کورد وعەرەب، کورد و تورک، کورد و ئەفغانیی » بەڵکوو،« کورد و پێسترەشە موسوڵمانەکانی ئەفریقا، موسوڵمانەکانی خوارووی فیلیپین، چین، بۆسنە، چیچێن، کۆسۆڤە و... » بە هەموویان یەک نەتەوەیان پێکبێنایە. یا نەتەوەکانی « ڕووس، ئینگلیز، فرەنسیی، ئەڵمانیی، ئیتالیی، ئیسپانیی و .. تاد »، بە یەک نەتەوە دابنرانایە. چونکە، هەموویان باوەڕیان بە یەک ئایین هەیە، یەک باوەڕی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە و پێڕەوی فەرمایشتەکانی پەیامبەر « مەسیح »یش دەکەن!

بۆیە، زۆر پێویستە، کوردە موسوڵمانەکان بە گشتیی، زانا ئایینییەکانی کورد بە تایبەتیی، هەرگیز، بە پڕوپاگەندەی داگیرکەران هەڵ نەخەڵەتێن. بەڵکوو دەبێ، بە چاو و مێشکێکی کراوەوە، لە کێشە و باسەکان بڕوانن و وردبنەوە. ئایین و کاری ڕامیاریی تێکەڵ نەکەن. نیشتمانەکەی خۆیان خۆشبوێ. چونکە، پەیامبەری ئیسلام، خۆشەویستیی نیشتمان، بە یەکێ لە مەرجەکانی باوەڕی ئایینیی داناوە و فەرموویەتی:

(خۆشەویستیی نیشتمان لە باوەڕەوەیە.) کەسێ ڕێگەی خواپەرستیی ڕاستەقینە بگرێ، وا بزانم، لە پێش هەموو شتێکدا دەبێ، نیشتمانەکەی خۆی بپارێزێ و ڕاژەیکا. باوەڕیش ناکەم، کەس ڕێگەی خواپەرستیی لە کەس گرتبێ. کورد دەتوانێ، لە یەک کاتدا، موسوڵمانێکی ڕاستەقینە و کوردێکی نیشتمانپەروەریش بێ. چونکە، هیچیان ڕێگە لە هیچیان ناگرن. پێویستە، کورد پارتی ئیسلامیی تایبەتیی خۆی هەبێ، چونکە، ڕەوشی نەتەوەیی کورد، لە ڕەوشی نەتەوەیی، هەموو گەلانی ئیسلام خراپترە. بۆیە، ڕەوشی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد، لە ڕەوشی نەتەوەیی و ڕامیاریی، هەموو گەلانی ئیسلام جیادەکرێتەوە. لەبەرئەوە، هەر لە زووەوە، پێشنیازمکردووە، (ڕێکخراوێکی ئیسلامیی کوردستانیی، بۆ

هەموو ئەو کەسانەی پێیان وایە، لە ڕێگەی بیروباوەڕی ئایینەوە، ڕاژەی نەتەوە و نیشتمانەکەیان دەکەن. بە مەرجێ، وابەستەی هیچ دەزگەیەکی نێودەوڵەتی نەبێ و پێوەندیی بە هیچ دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستانەوە نەبێ.)«50،32».

پارتە ئیسلامییە کوردستانییەکان دەبێ، هەوڵ لەگەڵ « ڕێکخراو، پارت، گەلانی جیاوازی ئیسلام و دەوڵەتە ئیسلامییەکان » بدەن، باری سەرنجیان، بەرانبەر کێشەی کورد بگۆڕن. کێشەی کوردیان بۆ ڕوونکەنەوە، تا لە ڕۆژانی تەنگانەدا، لە جەنگی قەلاچۆکردنی کورددا، بە هانامانەوە بێن، لە سەرمان هەڵدەنێ، یارمەتیمانبدەن و پشگیریمانبکەن، وەک چۆن یارمەتی گەلانی دیکەی موسوڵمان دەدەن! نەک هەر تەنیا، بیر لەوە بکەنەوە، چۆن لە کوردستان ڕەگ دادەکوتن، دەسەڵات وەردەگرن، بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام، بە زۆر بە سەر خەڵکیدا دەسەپێنن. بەڵکوو، وەک چۆن ئەرکە ئیسلامییەکانیان، لە ئەستۆی خۆیان گرتووە، هەر بەو شێوەیەش دەبێ، هەست بە ئەرکە نەتەوەیی یەکانی سەر شانیان بکەن. لەبەرئەوەی، داکۆکیکردن لە نەتەوەیەکی چەوساوەی بێ پشتوپەنای موسوڵمان، هەم بە ئەرکێکی نەتەوەیی، هەم بە ئەرکێکی ئایینیی دەژمێررێ.

« مارکس » ئایینی بە تلیاکی گەلان داناوە. بەڵام، من دەڵێم: مارکس غەدرێکی یەکجار گەورەی لە ئایین کردووە. لە هەمان کاتیشدا، ستایشێکی زۆری، باوەڕەکەی خۆی کردووە. چونکە، لە ڕاستیدا، هەر بیروباوەڕێ، چ زەمینیی و چ ئاسامانیی، بە شێوەیەکی « ڕێکوپێک، ڕەوا، دادپەروەرانە، هێمنانە، ئاشتیخوازانە، ژیرانە و گونجاو » بەکار نەهێنرێ، پەرگیریی و توندوتیژیی لەگەڵدا بێ، بەرژەوەندیی گشتیی ڕۆڵەکانی نەتەوە و سەروەریی نیشتمانەکە ڕەچاو نەکا، لای من، هەموو ئەو باوەڕ و ئایدۆلۆژییانە، لە تلیاکی گەلان گەلێ خراپترن! کۆمەڵگەیەک، بە هۆی « پشێویی، نائارامیی، ناکۆکیی، دووبەرەکیی، ململانێی ئایدۆلۆژیی و جەنگی نێوخۆ »وە، وزە لە دانیشتووانی ببڕێ، خێر و خۆشیی لە ژیان نەبینێ، ترسولەرز لە دەروونی جەماوەردا بچێنرێ، ئیدی کەی ئەوە ژیانە؟

ئایۆلۆژییایەک « نان، ئاسایش، ئازادیی و دیمۆکراسیی »، بۆ کۆمەلانی خەلکی ڕەشوڕووت دابین نەکا، ئیدی کەی ئەوە ئایدۆلۆژیایە؟! چ جۆرە ئایدۆلۆژیایەکە؟!! چ کەلکێکی بۆ گەل و نیشتمان دەبێ؟
گەر چی ئایین، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، ڕۆلێکی گەلێ گەورەی، لە ژیانی گەلانی جیاوازدا بینیوە، لە هەموو ڕوویەکەوە، کۆمەلگەی مرۆی بوژاندۆتەوە. لە دەس « کۆیلەیی، ئازاردان، کوشتنوبڕین، گومڕایی، نەزانین، چەوساندنەوە » و گەلێ شتی دیکەی خراپ ڕزگارکردووە. بەلام، هەر دەستەی بەڕێوەبەرانی هەمان ئایین، لە سەردەمێکی مێژوویی دیکەدا، بە هەزاران « هەلە، تاوان و ناپاکییان » بە ناوی ئایینەوە، دژی کۆمەلانی خەلک ئەنجامداوە.
کێ دەتوانێ، کردەوە نامرۆڤانەکانی پاپا و پیاوە ئایینییەکانی کەنیسە، لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا لە یادکا؟! دادگەی پشکنین، سوتاندن و ملپەڕاندن، لە ئەورووپادا، ڕۆژێکی ڕەشی وایان داهێنابوو، کارێکی وا خراپیان، لە باری ژیانی خەلک کردبوو، خەلکی مەرگیان بە ئاوات دەخواست!
جەنگە خوێناوییەکانی، سەردەمی هەر « چوار خولەفای ڕاشدین، ئەمەویی و عەلەویی، ئەمەویی و عەبباسیی، عەبباسیی و پاشماوەی عەلەوییەکان، تورکە عوسمانییەکان »، بە چەن ڕووداوێکی گرنگ دەژمێررێن، لە سەر دەسەلات و پاوەنخوازیی ڕوویانداوە. هەروەها، تورکە عوسمانییەکان، لە کوشتار و ژینۆسایدی « ئەرمەن »دا، ئایینیان وەک چەکێ بەکارهێناوە.
ئەو ڕووداوە گرنگە مێژوویی یانە، هەرگیز لە یاد ناچن. عەرەبە بێ ویژدانەکان، سکی هەزاران مرۆڤیان، بە نووکی ڕم و شمشێرە تیژەکانیان هەلدەدڕی. ئەوڕۆش دەبینین، ڕێکخراوە ئیسلامییە پەڕگیرەکان، « لە ئەفگانستان، پاکستان، هیندستان، ئێران، میسر، سۆدان، لوبنان، فەلەستین و ... تاد)، چ ڕۆلێکی خراپ وازیدەکەن، چییان بە سەر کۆمەلانی خەلک هێناوە.
هەروەها، کۆمۆنیستەکان لە هەموو سەردەمەکانی دەسەلاتیاندا، چۆن ئەو وولاتانەیان، وەک گرتووخانەیەکی گەورە لێ کردبوو. هێز و توانای

بیرکردنەوە و داهێنانیان، لە بەر خەڵکی بڕیبوو. مێشکیان گوشیبوون. لە سەردەسی هەر دوو پێشەوای کۆمۆنیستیی وەک: « لینین و ترۆتسکی » دا، تیرۆری سوور لە ڕووسیای تساریدا دامەزرا. دیکتاتۆر و خوێنڕێژێکی وەک: « ستالین » ، بە ناوی ئایدۆلۆژیاوە، چ جۆرە دۆزەخێکی بۆ نەیار و گەلانی بندەسی ڕووس داخستبوو؟ چەندین میلیۆن مرۆڤی بێتاوانی، گوللەباران کرد. سەرکردە کۆمۆنیستەکانی وولاتانی « ڕۆمانیا ، هەنگاریا ، چیکۆسلۆڤاکیا ، یۆگۆسلاڤیا ، ئەڵمانیا ڕۆژهەڵات، کۆریای باشوور، چینی گەلیی، کوبا ، ڤێتنام، خومێرە سوورەکانی کەمبۆدیا ... تاد » بە چ شێوەیە، ئەو وولاتانەیان کاولکرد، گەلەکانیان بە هەموو شێوەیە چەوسانەوە، هەژاریان کردن، لە « پێشکەوتن، شارستانێتی، ژیاریی، مافەکانی مرۆڤ، سەرەتاکانی دێمۆکراسیی، ژیانێکی پڕ لە ئاسوودە و بەختەوەریی » بێبەشیانکردن. بۆیە، تا ئەورۆش، بە دەس هاواری دواکەوتن، بێکاریی و هەژارییەوە دەناڵێنن!

ناسیۆنالیستەکانی « ئەڵمانیا ، ئیتالیا ، ئیسپانیا ، عێراق، سووریا ، تورکیا ، کوردستان و... تاد » ،چەن نموونەیەکی لەبەرچاوی دید و بۆچوونی، ئایدۆلۆژیای بیری نەتەوەیی توندڕەو و پەرگیر پیشاندەدەن.

## 6. زمانی دەوڵەت و زمانی نەتەوەیی :

لەم جیهانەدا، هیچ دەوڵەتێ نییە، لە ڕووی نەتەوەیی یەوە، لە سەداسەد هۆمۆجین و خاوێنبێ. واتە: لە یەک گەل یا نەتەوەی دیاریکراو پێکهاتبێ. بەڵکوو، هەموو دەوڵەتەکان، لە چەن گروپێکی « ئیتنیی پچووک، کەمەنەتەوەیی، گەل و نەتەوە »ی جیاواز دروسبوون. دیارە، هەر یەکێ لەو دەوڵەتانەش، چەندین زمانی نەتەوەیی و دیالێکتی جیاوازیان تێدایە. لە هەر دەوڵەتێکیشدا، یەکێ لە نەتەوەکان، ژمارەی دانیشتووانی، لەوانی دیکە زیاترە و بە نەتەوەی باڵادەس دەناسرێ. ئەو نەتەوە باڵادەسە، دەس بە سەر دەزگەکانی دەوڵەتدا دەگرێ و فەرمانڕەوایی کۆمەڵگەکە دەکا. بەو پێیە، زمانی نەتەوەی باڵادەس، بە زمانی یەکەم دادەنرێ و زمانەکانی دیکەش، بە پلە دوو و سێ دێن.

گەر سیستێمی فەرمانڕەوایی، لە دەوڵەتێکی دیاریکراودا دێمۆکراسیی بوو، یەکسانیی لە نێوان گەلانی دەوڵەتەکەدا هەبوو، چارەسەری کێشەی نەتەوەیی، لە سەر بنچینەکانی مافی چارەنووسی گەلان کرابوو، ئەوا لەو بارەدا، گەلەکانی دیکەش، مافی ئەوەیان دەبێ، زمانەکانی خۆیان بەکاربێنن، وەک لە دەوڵەتی فیدراڵیی سویسرای دێمۆکراسیی لە ئەورووپا پێڕەودەکرێ، زمانەکانی « ئەڵمانیی، ئیتالیی و فڕەنسیی »، بە سێ زمانی سەرەکیی دەوڵەت دەژمێررێن.

بەڵام، گەر سیستێمی دەوڵەت، دیکتاتۆریی و شۆڤێنیی بوو، ئەوا لەو دەوڵەتەدا، تەنیا زمانی نەتەوەی باڵادەس، بە زمانی یەکەم دادەنرێ. زمانی گەلەکانی دیکە، هیچ جۆرە حسێبێکیان بۆ ناکرێ و زۆر جاریش قەدەغەدەکرێن. بۆ نموونە: تورکیا، وەک دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتمان، لە چەن « کەمینەیەکی نەتەوەیی، گەل و نەتەوە »پێکهاتووە. گرفتەکانی تورک لەگەڵ(کورد، ئەرمەن، ئاسووریی، سریانیی، لاز، چەرکەس و عەرەب)«14،38» بە گەورەترین کێشەی نەتەوەیی و مرۆیی سەردەم دادەنرێ. چونکە، هەر یەکێ لەو گروپە ئیتنییانە، زمانی نەتەوەیی تایبەتیی خۆیان هەیە، بەڵام، تورکە شۆڤێنییەکان، تەنیا زمانی تورکیی،

بە زمانی دەوڵەت دەناسن، زمانەکانی دیکە بەپێی یاسای تورکیی، دانیان پێدا نانرێ. هەروەها، دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتمانی وەک ئێران، لە چەند کەمینەیەکی نەتەوەیی و گەلی وەک(فارس، کورد، بلوژ، تاژیک، ئەفگان، ئازەر، تورکمان، عەرەب)«14،38» پێکهاتووە، تەنیا زمانی فارسیی، بە زمانی دەوڵەت دادەنرێ. زمانەکانی دیکە، وەک زمانی ئاخافتنی ناوچەیی دەناسرێن.

بەپێی ئەو زانیارییانەی لە بەر دەسدان، ئەورۆ لە جیهاندا،(سەدونەوەدودوو دەوڵەتی گەورە و گچکە، زەریایی و کیشوەریی، ناسیۆنال و تێریتۆریال هەیە.)«20،37» ئەم دەوڵەتانە، لە ڕووی پێکهاتەی نەتەوەیی یەوە، بە سەر چەن جۆرێکدا دابەشدەکرێن :

1. دەوڵەتی ناسیۆنال « دەوڵەتی نەتەوەیی »: ئەو دەوڵەتانەن، کە لە یەک گەل یا یەک نەتەوەی دیاریکراو پێکهاتوون. یەک زمانی نەتەوەیی یان هەیە. گرفتی نێوخۆیی نەتەوەیی یان نییە. ئەم جۆرەش لە جیهانی ئەورۆماندا، زۆر کەمە.

2. دەوڵەتی تێریتۆریاڵ « دەوڵەتی فرە نەتەوەیی و نیشتمان »: هەموو ئەو دەوڵەتانە دەگرێتەوە، کە لە چەندین گرووپی ئیتنیی گەورە و گچکە، کەمەنەتەوەیی، گەل و نەتەوەی جیاواز پێکهاتوون. لەبەرئەوە، هەر بە ناوەکەیدا دەردەکەوێ، چەندین زمانی جیاوازی نەتەوەیی، لە سنووری خۆیدا کۆدەکاتەوە. ئەم جۆرە دەوڵەتانە، هەرگیز بێ گرفت و کێشەی نەتەوەیی نەبوون و نابن. لە ڕووی ژمارەوە، زۆرترین ژمارەی دەوڵەتەکانی جیهان پێکدێنێن.

3. جۆرە دەوڵەتێکی تایبەتیی دیکە هەیە، بە هۆی هێندێ فاکتەری ئایینییەوە دامەزراون، وەک: هەر دوو دەوڵەتی ئیسرایل و فاتیکان. هەموومان دەزانین، دەوڵەتی ئیسرایل ساڵی «1948»، لە سەر بنچینەی ئایینی جوو دامەزرا. لەبەرئەوەی، جووەکان بێ دەوڵەت بوون، بە هەموو جیهاندا بلاوبووبوونەوە، سوکایەتییان پێ دەکرا، قەلاچۆدەکران، بەپێی پەیمانی « بلفۆر » بڕیاردرا، دەوڵەتێکیان بۆ دامەزرێنن، تا لە پەرشوبلاویی و چەوساندنەوە قووتاریانکەن. ئیدی ئەوە بوو، لە هەموو دەوڵەتەکانی

جیهانەوە، وردەوردە، جووەکان بەرەو خاکی فەلەستین جمان. واتە: ئەو جووانە، تەنیا ئایینی هاوبەش نەبێ، هیچ شتێکی دیکە کۆی نەدەکردنەوە. زمانێکی تایبەتیی نەتەوەیی یان نەبوو. بەڵکوو، زمانی ئایینییان هەبوو، ئەویش مردبوو. ئەگینا، لە ڕاستیدا، هەر کۆمەڵە جووەی، لە وڵاتێکی جیاواز دەژیان، بە زمانی ئەو وڵاتانە دەپەیڤین. تا لە دواییدا، بە هۆی پەرتووکە پیرۆزەکەیانەوە « تەورات »، زمانی « عیبریی کۆن »یان زیندووکردەوە، گەلێکی تایبەتییان، بە ناوی گەلی ئیسرایلەوە پێکهێنا و دەوڵەتی ئیسرایلیشیان دامەزراند.

4. هێندێکی دیکەیان، لە ڕێگەی دۆزینەوەی جوگرافیاوە دامەزراون. لە کۆندا، گەڕۆکێکی جوگرافیا، ناوچەیەکی نوێی دۆزیوەتەوە، ناوێکی دیاریکراوی لێ ناوە. پاشان، وردەوردە، ئاوەدانکراوەتەوە، دانیشتووانی ئەو وڵاتە، دەوڵەتێکی تایبەتییان تێدا دامەرزراندووە. بۆ نموونە: زۆربەی زۆری دەوڵەتەکانی « ئەمێریکا و ئوسترالیا »، بەو شێوەیە دامەزراون. ئێمە، لێرەدا هەوڵدەدەین، نموونەیەک لە سەر دەوڵەتە تازە دروسبووەکانی جیهان بێنینەوە، بایەخێکی تایبەتیش، بە « وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا » دەدەین.

(دوای ئەوەی، گەشتگەری بە ناوبانگی ئیتالیی « کریستۆفەر کۆلۆمبس »، لە «13/سێبتێمبەری/1492» زاییندا، کیشوەری ئەمێریکای دۆزییەوە، ئیدی، وردەوردە، خەڵک لە هەموو وڵاتەکانی جیهانەوە، ڕوویان تێکرد و بە تەواویی ئاوەدانیانکردەوە.)«25،36» پێش ئەوەی « کۆلۆمبس »، ئەو کارە گرنگە بە ئەنجامگەیەنێ، ئەمێریکا خاکێکی چۆڵوهۆڵ نەبووە، بەڵکوو، چەندین گەلی پچووکی وەک « مایا و ئەنکا »ی لێ ژیاوە. بەڵام، کاتێ(داگیرکەرە ئیسپانیی، پورتوگالیی و ئەورووپاییەکانی دیکە، لە ڕێگەی زەریاوە، ئەمێریکایان داگیرکرد، بە هۆی چەکە ئاگردارەکانیانەوە توانییان،، کەلتوور و شارسانێتی گەلانی مایا و ئەنکای هیندییە ئەمێریکاییەکان لەنێوبەرن، تێکیانشکاندن و قڕیانتێخستن)«42،10». ئەوانەی ڕزگاریشیان بوو، بەر لێشاوی کوشتنوبڕین نەکەوتن، زۆر کەمبوون، زۆربەیان لە ناوچە شاخاویی و ناو

دارستانە چڕوپڕەکاندا خۆیان شاردەوە. دوای ئەو داگیرکردنە، ڕێگە لە بەردەم، گەلانی هەر سێ کیشوەرە گەورەکەی جیهان « ئاسیا، ئەفریکا و ئەورووپا »دا تەختبوو، کۆچوڕەو بەرەو ئەمێریکا دەسپێکەن، تا لە کۆتاییدا، بە تەواویی ئاوەدانبۆوە. دوای ئەوەی، کۆمەڵێ پێکدادان و جەنگی نێوخۆ ڕوویدا، ئیدی بە تەواویی، باری « ڕامیاریی، سەربازیی، ئابووریی، بازرگانیی و کەلتووریی » هێوربووە و جێگیربوو،(پاشان لە «15/یونی/1787ز »دا، یەکەم کۆنگرەی دەستووریی فیدراڵی لە «فلادیلفیا» گیرا. لەو کۆنگرەیەدا بڕیاریاندا، دەوڵەتێکی یەکگرتووی فیدراڵی دامەزرێنن.)«25،36» ئیدی، لەو ڕۆژەوە، ئەو کۆمارە دێمۆکراسییە فیدراڵییە، لە ئەمێریکا دامەزراوە، گرفتی نەتەوەیی بە شێوەیەکی دێمۆکراسیی چارەسەرکراوە.

بەڵێ، ڕۆژبەڕۆژ، شەپۆلی کۆچوڕەو بەرەو ئەمێریکا زیادیکردووە. ڕۆڵەکانی چەندین گەلی جیاواز، لە هەموو جیهانەوە، کۆچیان کردووە و لەوێ نیشتەجێبوون. هەر گەلێکیش، زمانێکی جیاوازی نەتەوەیی تایبەتیی خۆی هەبووە. بۆیە، تا ئەوڕۆش هەر پاراستوویانە. تەنانەت، بوونی ئەو هەموو گەل و زمانە جیاوازانە، گەلێ لە شارەزا و پسپۆڕانی زمانی هاندا، بۆ ئەوەی توێژینەوەی تایبەتیی و ئەکادیمییانە، لە سەر بابەتە جیاوازەکانی ئەنترۆپۆلۆژیی و لینگویستیک بکەن.(چونکە، زۆربەی ئەو زمانانە، ئاخێوەری زۆر کەمیان هەبوو و خێرا بەرەو لەنێوچوون و نەمان دەچوون. ئێستاش، زیاتر لە دووسەد زمانی خۆماڵی لە ئەمێریکادا هەیە، کە هێندێ لەوان، زیاتر لە چەن ئاخێوەرێکیان نییە و بڕبڕ لە ماوەی ژیانی وەچێکی دیکەدا لەنێودەچن)«81،103» کەواتە، ئەمێریکا هەر لە بنەڕەتدا، بە وولاتی کۆچبەرانی جیهان دەژمێردرێ، بارودۆخێکی تایبەتیی هەیە، (دەوڵەتە ئەمێریکاییەکان، لە بارودۆخێکی جوگرافیایی، مێژوویی و کۆمەڵایەتیی تایبەتیی و بە دەگمەنی وادا دروسبوون ... زۆربەی زۆری دانیشتووانی لە کۆچبەران پێکهاتوون. لە وولاتە جیاوازەکانی جیهانەوە چوونەتە ئەوێ و لەگەڵ خۆیاندا، زمان، دابونەریت و خەسڵەتە نەتەوەیی یەکانی خۆیان گواستۆتەوە. لەبەرئەوە، وولاتەکانی ئەمێریکا، وەک

جیهانەوە، وردەوردە، جووەکان بەرەو خاکی فەلەستین جمان. واتە: ئەو جووانە، تەنیا ئایینی هاوبەش نەبێ، هیچ شتێکی دیکە کۆی نەدەکردنەوە. زمانێکی تایبەتیی نەتەوەیی یان نەبوو. بەڵکوو، زمانی ئایینییان هەبوو، ئەویش مردبوو. ئەگینا، لە ڕاستیدا، هەر کۆمەڵە جووەی، لە وڵاتێکی جیاواز دەژیان، بە زمانی ئەو وڵاتانە دەپەیڤین. تا لە دواییدا، بە هۆی پەرتووکە پیرۆزەکەیانەوە « تەورات »، زمانی « عیبریی کۆن »یان زیندووکردەوە، گەلێکی تایبەتییان، بە ناوی گەلی ئیسرایلەوە پێکهێنا و دەوڵەتی ئیسرایلیشیان دامەزراند.

4. هێندێکی دیکەیان، لە ڕێگەی دۆزینەوەی جوگرافیاوە دامەزراون. لە کۆندا، گەڕۆکێکی جوگرافیا، ناوچەیەکی نوێی دۆزیوەتەوە، ناوێکی دیاریکراوی لێ ناوە. پاشان، وردەوردە، ئاوەدانکراوەتەوە، دانیشتووانی ئەو وڵاتە، دەوڵەتێکی تایبەتییان تێدا دامەزراندووە. بۆ نموونە: زۆربەی زۆری دەوڵەتەکانی « ئەمێریکا و ئوستورالیا »، بەو شێوەیە دامەزراون. ئێمە، لێرەدا هەوڵدەدەین، نموونەیەک لە سەر دەوڵەتە تازە دروسبووەکانی جیهان بێنینەوە، بایەخێکی تایبەتیش، بە « وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا » دەدەین.

(دوای ئەوەی، گەشتگەری بە ناوبانگی ئیتالیی « کریستۆفەر کۆلۆمبس »، لە «13/سێبتێمبەری/1492» زاییندا، کیشوەری ئەمێریکای دۆزییەوە، ئیدی، وردەوردە، خەڵک لە هەموو وڵاتەکانی جیهانەوە، ڕوویان تێکرد و بە تەواویی ئاوەدانیانکردەوە.)«25،36» پێش ئەوەی « کۆلۆمبس »، ئەو کارە گرنگە بە ئەنجامگەیەنێ، ئەمێریکا خاکێکی چۆڵوهۆڵ نەبووە، بەڵکوو، چەندین گەلی پچووکی وەک « مایا و ئەنکا »ی لێ ژیاوە. بەڵام، کاتێ (داگیرکەرە ئیسپانیی، پورتوگالیی و ئەوروپاییەکانی دیکە، لە ڕێگەی زەریاوە، ئەمێریکایان داگیرکرد، بە هۆی چەکە ئاگردارەکانیانەوە توانیان،، کەلتوور و شارسانێتی گەلانی مایا و ئەنکای هیندییە ئەمێریکاییەکان لەنێوبەرن، تێکیانشکاندن و قڕیانتێخستن)«42،10». ئەوانەی ڕزگاریشیان بوو، بەر لێشاوی کوشتنوبڕین نەکەوتن، زۆر کەمبوون، زۆربەیان لە ناوچە شاخاویی و ناو

دارستانە چڕوپڕەکاندا خۆیان شاردەوە. دوای ئەو داگیرکردنە، ڕێگە لە بەردەم، گەلانی هەر سێ کیشوەرە گەورەکەی جیهان « ئاسیا، ئەفریکا و ئەورووپا »دا تەختبوو، کۆچوڕەو بەرەو ئەمێریکا دەسپێکەن، تا لە کۆتاییدا، بە تەواویی ئاوەدانبۆوە. دوای ئەوەی، کۆمەڵێ پێکدادان و جەنگی نێوخۆ ڕوویدا، ئیدی بە تەواویی، باری « ڕامیاریی، سەربازیی، ئابووریی، بازرگانیی و کەلتووریی » هێوربووە و جێگیربوو،(پاشان لە «15/یونی/1787ز »دا، یەکەم کۆنگرەی دەستووریی فیدراڵی لە «فلادیلفیا» گیرا. لەو کۆنگرەیەدا بڕیاریاندا، دەوڵەتێکی یەکگرتووی فیدراڵی دامەزرێنن.)«25،36» ئیدی، لەو ڕۆژەوە، ئەو کۆمارە دیمۆکراسییە فیدراڵییە، لە ئەمێریکا دامەزراوە، گرفتی نەتەوەیی بە شێوەیەکی دیمۆکراسیی چارەسەرکراوە.

بەڵێ، ڕۆژبەڕۆژ، شەپۆلی کۆچوڕەو بەرەو ئەمێریکا زیادیکردووە. ڕۆڵەکانی چەندین گەلی جیاواز، لە هەموو جیهانەوە، کۆچیان کردووە و لەوێ نیشتەجێبوون. هەر گەلێکیش، زمانێکی جیاوازی نەتەوەیی تایبەتیی خۆی هەبووە. بۆیە، تا ئەوڕۆش هەر پاراستوویانە. تەنانەت، بوونی ئەو هەموو گەل و زمانە جیاوازانە، گەلێ لە شارەزا و پسپۆڕانی زمانی هاندا، بۆ ئەوەی توێژینەوەی تایبەتیی و ئەکادیمییانە، لە سەر بابەتە جیاوازەکانی ئەنترۆپۆلۆژیی و لینگویستیک بکەن.(چونکە، زۆربەی ئەو زمانانە، ئاخێوەری زۆر کەمیان هەبوو و خێرا بەرەو لەنێوچوون و نەمان دەچوون. ئێستاش، زیاتر لە دووسەد زمانی خۆماڵی لە ئەمێریکادا هەیە، کە هێندێ لەوان، زیاتر لە چەن ئاخێوەرێکیان نییە و بڕبڕ لە ماوەی ژیانی وەچێکی دیکەدا لەنێودەچن)«81،103» کەواتە، ئەمێریکا هەر لە بنەڕەتدا، بە وڵاتی کۆچبەرانی جیهان دەژمێردرێ، بارودۆخێکی تایبەتیی هەیە، (دەوڵەتە ئەمێریکاییەکان، لە بارودۆخێکی جوگرافیایی، مێژوویی و کۆمەڵایەتیی تایبەتیی و بە دەگمەنی وادا دروسبوون ... زۆربەی زۆری دانیشتووانی لە کۆچبەران پێکهاتوون. لە وڵاتە جیاوازەکانی جیهانەوە چوونەتە ئەوێ و لەگەڵ خۆیاندا، زمان، دابونەریت و خەسڵەتە نەتەوەیی یەکانی خۆیان گواستۆتەوە. لەبەرئەوە، وڵاتەکانی ئەمێریکا، وەک

بۆتەیەکی لێهاتووە، گەلە جیاوازەکان بە ڕێژە و چۆنێتی جیاواز، تێکەڵاو و ئاوێتەی یەکدی بوون و تواونەتەوە.)«66،59» ئەو وڵات و گەلانە، بە چەندین قۆناغی مێژوویدا تێپەڕبوون، چەندین گۆڕانکاریی گرنگی «کۆمەڵایەتیی، ئابووریی، فەرهەنگیی، سۆسیۆلۆژیی، مەراڵیی، نەتەوەیی، ڕامیاریی و مەتیریالیی »، لە ناخی ئەو گەلە کۆچکردووانەدا ڕوویانداوە، تا گەلی ئەمێریکای ئەورۆی لێ پەیدابووە. لەبەرئەوە ناتوانین، بڵێین: ئەمێریکا دەوڵەتێکی ناسیۆنال یا تیریتۆریال پێکدێنێ. چونکە، لە زۆر ڕووەوە، گەلی ئەمێریکا گەلێکی هۆمۆجین نییە. بەڵکوو، بە شێوەیەکی تایبەتیی و دەگمەن، بە وڵاتی کۆچبەرانی جیهان دادەنرێ. سەرەڕای ئەو هەموو زمانانەی هەشن،(لە ئەنجامی پێکەوە ژیانی هاوبەشی پتر لە دووسەدە، پێداویستییەکانی ژیان و ئەو سیستێمە دێمۆکراسییەی هەر لە کۆنەوە، لە ئەمێریکا پێڕەوکراوە، هەر لە سەرەتای ڕۆژەکانی داگیرکردنی ئەمێریکا لە لایەن بریتانیای گەورەوە، زمانی ئینگلیزیی وەک زمانی دەوڵەت و زمانی هاوبەش، بە سەر ئەو گەلە کۆچکردووانەدا خۆی سەپاندووە.)«28،40» ئەورۆ گەلی ئەمێریکا، هەموویان بە ئینگلیزیی دەدوێن، بەڵام، تا ئێستە، زۆربەی زۆری ئەو گەلانەی لەوێ دەژین، زمانی نەتەوەیی خۆیان پاراستووە، لە ناو خۆیاندا و لە ئاخافتندا بەکاریدێنن.

ئەم بارە تایبەتییەی ئەمێریکا، وەک نموونەیەک دەتوانین، باسیکەین، چۆن دەوڵەتێکی هاوبەش، لە سەر بناغەی « ئارەزووی گشتیی، مافی چارەنووس و سیستێمی دێمۆکراسیی »دامەزرابێ، دەتوانێ، زمانێکی هاوبەش، وەک زمانی ئاخافتن و نووسین، بە هۆی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندییەوە، بە سەر هەموو ئەو گەلە جیاوازانەدا بسەپێنێ، بێ ئەوەی کەس سرتە و بۆڵەی لێوە بێ!

جا، با ئێستە، کەمێ باسی هەر دوو جۆری دەوڵەتی ناسیۆنال و تیریتۆریال، پێوەندییان بە زمانی نەتەوەیی و زمانی دەوڵەتەوە بکەین، تا بزانین، لە دیوەخانی پڕ لە ئاژاوەی ئەو دەوڵەتاندا، چ باسە؟!!

بێگومان، هیچ گەل و نەتەوەیەک، لە دەوڵەتی ناسیۆنالدا، گرفتی زمانی نییە. چونکە، دەوڵەتی نەتەوەیی، توانا و دەسەڵاتی ئابووریی، هەمیشە

کارێکی یەکجار مەزنیان، لە « بوژاندنەوە، گۆڕان، پێشکەوتن، یەکگرتنی شێوەکانی زمانێکی دیاریکراوی نەتەوەیی »کردووە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش، کاریتێدەکەن. بە پێچەوانەشەوە، ئەو نەتەوانەی ژێردەسن، خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان نین، ئازادیی و سەربەخۆیی یان لێ زەوتکراوە، ڕێگەیان نەدراوە، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بدوێن، لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی « هونەریی، وێژەیی، کۆمەلایەتیی و ڕامیاریی »دا، زمانەکەی خۆیان بەکاربێنن، ڕۆژبەڕۆژ تا هاتووە، بەرەو لاوازبوون ڕۆیشتوون. لەم بوارەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە. هێندێ نەتەوە هەبوون، بە هۆی دەسەلاتی ڕامیاریی و هێزی سەرکوتکەری سەربازیی دەوڵەتەوە، زمانی نەتەوەیی خۆیان پێشخستووە و گەشەیانپێکردووە. لە ئەنجامیشدا، بناغەی زمانێکی یەکگرتووی هاوبەشی خوێندنەوە و نووسینیان دارشتووە، بە سەر دانیشتووانی ناوچە جیاجیاکانی وولاتەکەیاندا سەپاندووە. وەک تورکە مەغۆلییەکان، کە هەمووی نزیکەی حەوتسەد ساڵ دەبێ، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتوون و لە تورکیای ئەوڕۆدا نیشتەجێبوون. پاشان، ئیمپراتۆریای عوسمانییان دامەزراند. ئیدی، بەرەبەرە، « توانا، هێز، دەسەلاتی ڕامیا یی و سەربازییان »، لە سنووری جوگرافیای نێودەوڵەتیی تورکیای ئەوڕۆ تێپەڕاندووە، دەسیان بە سەر، زۆربەی زۆری وولاتەکانی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەند، هێندێ لە وولاتەکانی ڕۆژاوا و ڕۆژهەلاتی ئەورووپادا گرتووە، تا ماوەیەکی زۆریش، زمانەکەی خۆیانیان، بە سەر ئەو گەلانەدا سەپاندووە.

جگە لەوەی، هێندێ نەتەوەی دیکەش، بە هۆی « زەبروزەنگ، دەسەلاتی ڕامیاریی و سەربازیی دەوڵەت »ەوە، زمانەکەی خۆیان، بە سەر « گروپ، کەمینەنەتەوەیی، گەل و نەتەوە »کانی بندەسیاندا سەپاندووە. بۆ ماوەیەکی درێژیی مێژووییش، ئەو گەلانە هەر بەو زمانە پەیڤیوون، خوێندوویانە و نووسیویانە. وەک: ڕووسەکان لە سەردەمی، یەکێتی سۆڤیێتی پێشوودا، پێڕەویاندەکرد. هەروەها، « یۆگۆسلافیا، چیکۆسلۆڤاکیا، تورکیا، ئێران، عێراق، سووریا » و هەموو ئەو دەوڵەتە فرەنەتەوە و نیشتمانانەی، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، بەو شێوەیە دامەزرێنراون.

گەر لێرەدا، باسی زمانی کوردیی و زمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بکەین، دەبینین: لە هەموو جیهاندا، تاکە یەک نموونەی دیکەی وا نابینینەوە. چونکە، نەتەوەی کورد، بە سەر پێنج دەوڵەتی جیاوازدا دابەشکراوە، هەر دەوڵەتێ لەو دەوڵەتانە، زمانێکی جیاوازی هەیە. بۆیە، سەرەڕای ئەوەی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان بێبەشکراون، هێشتا دەبێ، گەلی کورد لەو بەشەی بەو دەوڵەتە داگیرکەرەی کوردستانەوە بەسراوەتەوە، بیەوێ و نەیەوێ، زمانی گەلی سەردەس فێربێ. واتە: گەلی کورد لە باکووری کوردستان، بە زمانی تورکیی، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە زمانی فارسیی، لە باشووری گەورە و پچووک، بە زمانی عەرەبیی، لە دەوڵەتەکانی یەکێتی سۆڤێتی پێشووشدا، بە چەن زمانێکی جیاوازی وەک: « ڕووسیی، ئازەریی، ئەرمەنیی، گورجیی، کیرگیزیی، ئوزبێکیی و تاژیکیی » بپەیڤێ، بخوێنێ و بنووسێ، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆشی، تەنیا بۆ ئاخافتێ بەکاربێنێ، لە هێندێ جێگەی ئەو دەوڵەتانەشدا، تەنانەت، بۆ ئاخافتنیش بۆی نییە، ناوی بێنێ. بۆیە، ئەوەی لە کورد و زمانی کوردیی قەوماوە، باوەڕ ناکەم، هێشتا، مێژووی کۆمەڵگەی مرۆ، بە خۆیەوە بینیبێ. چونکە، هەر کوردێ، جگە لە زمانەکەی خۆی دەبێ، یەکێ لە زمانی، ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان بزانێ. هەر چەندە، جگە لە کوردی باشوور و خۆراوا، زمانی عەرەبیی لە نێوانیاندا هاوبەشە، کوردی پارچەکانی دیکە، لەو زمانانە ناگەن. لەبەرئەوەی، ڕێگە بە زمانە نەتەوەیی کەی خۆشیان نەدراوە، قسەی پێ بکەن، تا گەشەبکا و پێشکەوێ، گەلێکیان هەر زمانەکەی دایکیشیان نازانن. بۆیە، هێندێ جار، کارێکی زۆر سەخت و گرانە، کاتێ، دوو کوردی خەڵکی دوو پارچەی جیاوازی کوردستان پێکدەگەن، نە بە کوردیی و نە بە زمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکە ناتوانن، پێکەوە ئاخافتنکەن و لە یەکدی بگەن.

هەڵبەتە، زمانی ئەو گەلە سەردەسانە، کارێکی گەلێ خراپی، لە زمانی کوردیی کردووە. جگە لەوەی، بێهێز و لاوازیکردووە، بە سەدان ووشەی باش و خراپیشی تێئاخنیوە.

لە ڕاستیدا، ئەنداماانی دەزگەی « کۆمەڵەی دەوڵەتە یەکگرتووەکان » ، لە ئاستی نەتەوەی کورددا دەبووایە، لە « شەرمەزاریی، سەرشۆڕیی و ڕووڕەشییدا » ، تکتک ئارەقیع شین و مۆری شەرمەزارییان بڕشتایە. چونکە، هەموو دەوڵەتەکان، لە پێناوی « ئازادیی، سەربەخۆیی و یەکسانیی »دا، بە دەم سەری شەششەش دەبڕن، کەچی، نەتەوەیەکی چل میلیۆنی وەک کورد، نەتەوەیەکی بەسزمانی بێتاوان، لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەندا، نەک هەر تەنیا، لە هەموو جۆرە مافێکی مرۆیی بێبەشکراوە، بە بەرچاویانەوە سەردەبڕێ، بەڵکوو، تا ئێستەش، بە دزییەوە نەبێ، لە هێندێ ناوچەی کوردستاندا ناوێرن، بە زمانی کوردیی گفتوگۆبکەن. ئەوانیش، هیچ بڕیارێ نادەن، تەنیا زەقزەق لێی دەڕوانن! ئەوە لە کاتێکدا، بە دەیان بڕیاری ڕێکوپێکیان، بۆ پێسترەشەکانی خوارووی ئەفریکا، گەلانی « فەلەستین، بۆسنەوهەرسک و کۆسۆڤۆ »دەرکردووە. بەلام، لایە بە لای کورددا ناکەنەوە. دەردی « سمایل بێشکچی » دەڵێ:(بۆ مرۆڤایەتی شەرمەزاریی یە، یادی ڕووداوەکانی چلوپێنج ساڵ لەمەوبەر بکەنەوە، دژی ئەوانە بوەستن، کە ئەو کاتە ئەو تاوانانەیان کردووە. بەلام، چاو لەو تاوانانە بپۆشن، کە ئەوڕۆ لە بەر چاومان ڕوودەدا. )«10،314-315»

هەموو کوردێ پێویستە، جگە لە زمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، زمانی ئایینیش بزانێ. چونکە، سیستێمی دەوڵەت وا پێویستدەکا. گەر موسوڵمانەکان دەڵێن، زمانی نەتەوەیی گرنگ نییە، چونکە زمانی ئایین و زمانی دەوڵەتی ئیسلام جێی دەگرێتەوە، ئەدی، بۆچی کاتێ هەر نەتەوەیەک، ڕزگاریدەبێ، سەربەخۆیی بەدەسدێنێ، دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی دادەمەزرێنێ، یەکسەر دوو شت، وەک یاسا، بە سەر دانیشتووانی وڵاتەکەیدا دەسەپێنێ: یەکەم ـ زمانی نەتەوەیی. دووەم ـ ئەو ئایینە یا ئەو ئایینزایەی خۆیان بڕوایان پێی هەیە. جا، هێندێ جار وا ڕێدەکەوێ، زمانی نەتەوەیی و زمانی ئایین، هەر لە یەک سەرچاوەوە دروسبووبن و هەر یەک زمانبن، وەک: هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان، زمانی ئایینەکەیان، لە هەمان زمانی نەتەوەیی عەرەب پێکهاتووە. لەبەرئەوە، لەم بارەدا، عەرەب هیچ جۆرە گرفتێکی نییە، کارەکەیان بۆ ئاسانبووە. بەڵکوو دەتوانین، بڵێین:

زمانە ئایینییەکە، ڕاژەیەکی گەورەی، زمانە نەتەوەیی یەکەیان دەکا. بەڵام، لە زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامییەکانی دیکەدا، زمانی نەتەوەیی و زمانی ئایین دوو زمانی جیاوازن، وەک: (ئێران، بەنگەلادیش، پاکستان، ئەفگانستان، ئوزبێکستان، کیگیزستان، ئازربایجان، تاژیکستان و... تاد). لەو کاتەدا، جگە لە زمانی نەتەوەیی، زمانی ئایینیش، ڕۆڵی خۆی وازیدەکا. بۆ نموونە: دوای ئەوەی شۆڕشی ساڵی «1979»ی گەلانی ئێران ڕوویدا، کاربەدەسانی نوێی دەوڵەتی ئیسلامیی، جگە لە زمانی فارسیی، کە زمانی دەوڵەت و نەتەوەی باڵادەسە، زمانی عەرەبیشیان، وەک زمانی دووەمی دەوڵەت ناساند و بە سەر هەموو گەلانی ئێرانیشیاندا سەپان. لەبەرئەوە، گەلی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و گەلانی دیکەی ئێران دەبێ، جگە لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، زمانی فارسیی کە زمانی نەتەوەی باڵادەس و دەوڵەتە، لەگەڵ زمانی ئایین فێربن و بزانن. واتە: جگە لە فارس، هەموو ئێرانییەکان دەبێ، سێ زمان بزانن، بێ ئەوەی، کەس پرسی پێ کردبن، یا بۆچوونی خۆیان، لە سەر ئەو کێشە گرنگە دەربڕیبێ!

بەڵام، لە هەموو ئەو دەوڵەتە فرەنەتەوە و نیشتمانانەی، کاتی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا، لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا دامەزرابوون، گەلانی جیاوازی نێو ئەو دەوڵەتانە، تا ڕادەیەکی باش، بە مافی نەتەوەیی خۆیان گەیشتبوون، زمانی نەتەوەیی خۆیان لە ئاخافتن و خوێندندا بەکاردێنا. وەک:لە یەکێتی سۆڤێتی کۆن، دوای زمانی ڕووسیی، کە زمانی دەوڵەت و زمانی هاوبەشی، هەموو «کەمینەنەتەوەیی، گەل و نەتەوە»کان بوو، هەموو گروپە ئیتنییەکانی دیکە، زمانی خۆیان هەبوو، لە دوای زمانی ڕووسیی، بە زمانی دووەم دادەنران. ڕۆڵەکانی ئەو گەلانە، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، بە ئازادیی بەکاردێنا، پێیان دەخوێند، ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بە زمانی نەتەوەیی دەردەچوون، ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆنی تایبەتییان هەبوو. بە کورتییەکەی، دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندیی سۆڤێت، بە هیچ شێوەیە، دژایەتی زمان و فەرهەنگی گەلانی دیکەی، نێو چوارچێوەی دەوڵەتی سۆڤێتی نەدەکرد. بەڵام، لە دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتمانی، فاشیی و شۆڤێنیی وەک تورکیادا، تەنانەت، زمانی

ئاخافتنیش، لە جێگە دەوڵەتییەکاندا قەدەغەیە. هەموو کوردێ دەبێ، تەنیا بە زمانی تورکیی قسەبکا، داکۆکیی لە خۆی بکا، ناچاریش دەکرێ، تا بڵێ: (ئای! چەن شادە، ئەو کەسەی لە تورکیادا دەژی و خۆی بە تورک دەزانێ!).

هەڵبەتە، کاتێ گەلانی جیهان، ڕوو لە سەربەخۆیی و ئازادیی دەکەن، دەیانەوێ، لە دەس چەوساندنەوە و بندەسیی ڕزگاریانبێ، یەکەم ئامانجیان ئەوەیە، مافی ڕووناکبیریی، بۆ ڕۆڵەکانی گەل دابینکەن. تەنانەت، ئەو گەلانەی داوای جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆش ناکەن، بە نیمچە مافێکی « کەلتووریی، ناناوەندیی، ئۆتۆنۆمیی یا فیدراڵیی » قایلدەبن، یەکێ لە داواکارییە سەرەکییەکانیان ئەوەیە، خوێندن و نووسین، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بێ. دەوڵەتی ناوەندیی، دان بە زمانی نەتەوەیی ئەو هەرێمەدا بنێ، وەک چەندین جار، لە گفتوگۆکانی کورددا، داوا لە دەسەڵاتی ناوەندیی میریی بەغدا کراوە، تا زمانی کوردیی، لە هەرێمی باشووری کوردستان، بە زمانێکی ڕەسمیی بناسێ، زمانی عەرەبییش، وەک زمانی دووەم، لە پاڵیدا بخوێنرێ. بەڵام، ئەو هەموو تەقەلایانە، لە لایەن کاربەدەسە شۆڤێنییەکانی عەرەبی عێراقەوە، زۆر بە توندیی ڕەتکراوەتەوە. هەر چەندە ،لە ڕێککەوتنامەکەی(11/مارسی/1970)دا، دانیان بەو مافانەدا نابوو، بەڵام، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، تەنیا هەر خەویان بە جێبەجێکردنییەوە دەبینی!

بەم ڕوونکردنەوانەی سەرەوەدا، بۆمان دەردەکەوێ، چۆن و بە چ شێوەیە، گەلانی نێو چوارچێوەی دەوڵەتێکی فرەنەتەوە و نیشتمان، ناکۆکییان لە نێواندا پەیدادەبێ، بەربەرەکانی یەکدی دەکەن، بە هەمان شێوەش، زمانەکان بەربەرەکانی یەکدی دەکەن. نەتەوەی باڵادەس دەیەوێ، زمانی خۆی، بە سەر نەتەوەی بندەسدا بسەپێنێ. بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدا، لە نرخ و گرنگیی زمانە نەتەوەیی یەکانی دیکە کەمکاتەوە. گەر بۆشیان بلوێ، ئەوا بە یەکجاریی قەدەغەیدەکەن و لەنێویدەبەن. بەڵام، گەر ئەو زمانە نەتەوەیی یانە، لە چەند زمانێکی زیندوو و گەشەکردوو پێکهاتبن، ڕەگی مێژوویی یان، بە ناخی نەتەوەکاندا قووڵ داچووبێ، ئەوا لە بەردەم

ڕەشەبا و گەردەلوولی ڕۆژگاردا خۆیان بۆ ڕادەگیرێ، لە دەس کێشەی تواندنەوە قووتاردەبن. دیارە، زمانی کوردییش، یەکێ لەو زمانە دەوڵەمەند و گەشەکردووانە پێکهاتووە، جێگەی خۆی بە زیادەوە، لە نێو دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا کردۆتەوە. تاقیکردنەوەکانی ژیانی نەتەوەییش سەلماندوویەتی، زمانێکی زیندووە. بۆیە، هەر دەمێنێ، هەرگیز نامرێ و لەنێوناچێ، بە تەقەلای داگیرکەران، تیشکی چرای بە هێزی ووشەی کوردیی کزنابێ، پشکۆی گەشی ووشەی، نێو ئاگردانی زمانی کوردیی ناکوژێتەوە!

هەروەها، پێوەندییەکی توندوتۆڵ، لە نێوان فاکتەری ئایین و دەوڵەتدا هەیە. هێندێ جار، ئایین، ڕیزەکانی چەن گەلێکی نزیک لە یەکدییەوە لەتوپەتدەکا، کە لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتدا دەژین و بە یەک زمانی نزیک لە یەکدییەوە دەپەیڤن. یا لە بنەڕەتدا، لە گرووپە زمانێکی دیاریکراون. بۆ نموونە: « هیندستان و پاکستان »، هەر دوو لایان لە یەک ڕەگەزبوون، زمانەکەیان زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوو. کەچی، هەر لە سەر بنچینەی فاکتەری ئایین جیابوونەوە، دوو دەوڵەتی جیاوازییان دامەزراند. « پاکستان و بەنگەلادیش »، هەر دوو لایان لە ڕووی زمانەوە، لە یەکدییەووە زۆر نزیکبوون. تەنانەت، یەک ئایینیشیان هەیە. کەچی، بە هۆی چەن فاکتەرێکی ڕامیاریی و جوگرافیاوە، لە یەکدی جیابوونەوە و دوو دەوڵەتی جیاوازیان دامەزراند.

هەروەها، « سربەکان و گەلی کۆسۆڤۆ »، نموونەیەکی دیکەی ئەم سەردەمەن. گەلی « کۆسۆڤۆ »، لە چەن گرووپێکی ئیتنیی وەک « ئەلبان، سرب، مەکەدۆنیی، سلاڤ، تورک و... تاد » پێکهاتوون. هەر چەندە، «سرب »ەکان، زمانەکەیان بە یەکێ لە زمانەکانی، گرووپە زمانی سلاڤیی و ئەلبانەکان زمانەکەیان بە یەکێ لە گرووپە زمانی یۆنانیی دادەنرێن. واتە: لە ڕووی زمانەوە جیاوازییان هەیە. هەروەها، لە ڕووی ئایینیشەوە، هەر جیاوازن و سەر بە دوو ئایینی ئاسمانیی جیاوازن. بەڵام، ئەوەتەی دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیای نوێ، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە دامەزراوە، ئەو گرووپە ئیتنییانە پێکەوە دەژین. کەچی، ئەلبانەکان ئەوڕۆ،

کراسی ئایینی ئیسلامیان لەبەرکردووە و داوای سەربەخۆیی دەکەن! لە هەمان کاتیشدا، پێچەوانەی ئەم بارە دەبینین، وەک ئەوەی چەندین دەوڵەتی عەرەبیی هەیە، بە هەر هەموویان یەک نەتەوە پێکدێنن، یەک زمانی نەتەوەیی یان هەیە، یەک ئایینی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە، کەچی، یەک دەوڵەتی یەکگرتوویان نییە!

ڕۆڵی دەوڵەتی نەتەوەیی، لە بوژاندنەوەی زمانی نەتەوەییدا، شتێکە هەر لە باسکردن نایە. چونکە، زۆربەی زۆری دەوڵەتە نەتەوەیی یەکان، لە سەر بناغەی زمانی نەتەوەیی دامەزراون. جا، گەر ئەو زمانە لاوازیشبێ، ئەوا دەوڵەتە نەتەوەیی یەکە بە هێزیدەکا. یا گەر زمانێ بێ، لە بیرچووبێتەوە، ئەوا دەوڵەتە نەتەوەیی یەکە، سەرلەنوێ زیندوویدەکاتەوە و دەیبووژێنێتەوە.

لێرەدا دەتوانین، باشترین نموونە لە سەر زمانی « عیبریی » بێنینەوە، چۆن جووەکان، دوای ئەوەی لە ساڵی«1948»دا، دەوڵەتی ئیسرایلیان دامەزران، زمانە عیبرییەکەی خۆیان زیندووکردەوە، ئەوڕۆ بە یەکەم زمانی سەرەکیی دەوڵەتی ئیسرایل دادەنرێ!

لەبەرئەوەی، باری کورد لە بندەسی تورکەکاندا، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستان خراپترە، لێرەدا، تەنیا نموونەیەک، لە سەر دەوڵەتی تورک و زمانی کوردیی دێنینەوە. ئەوەتەی کورد لە باکووری کوردستان دەژی، بە زمانی خۆی قسەیکردووە، هۆنراوەیکوتووە، شەوانە لە بەر ئاگردان، داپیرە و باپیرە کوردەکان، بەسەرهات و چیرۆکی کوردییان، بۆ منالەکانیان گێڕاوەتەوە. زۆر بە دەگمەن، کورد زمانی تورکیی زانیوە. بەلام، لەو کاتەوە دەوڵەتی تورکیای نوێ دامەزراوە، هەموو ڕەوشەکە بە تەواویی گۆڕاوە. چونکە، تورکە کەمالییەکان، جگە لە زمانی تورکیی، دان بە هیچ جۆرە زمانێکی دیکەدا نانێن. لەبەرئەوە، زمانی کوردییان قەدەغەکردووە. پەیڤین بە کوردیی، لە لایەن کاربەدەسانی تورکەوە، بە کارێکی نارەوا و ناپاکیی دانراوە. هەر چەندە، زۆربەی زۆری گەلی کورد، لە باکووری کوردستان، جگە لە زمانی زکماکیی خۆیان، هیچ جۆرە زمانێکی دیکە نازانن. بەلام، لەو سەردەمەوە، لە لایەکەوە لە ڕێی «قەدەغەکردنی زمانی کوردیی، هەڕەشەکردن، ڕاونان، گرتن، گواستنەوە،

کۆمەڵکوژیی، تواندنەوە و تورکاندنی باکووری کوردستان »ەوە، لە لایەکی دیکەشـــەوە، بە هۆی خـــوێندن بە زمـــانی تورکـــیی و بۆ ڕاپەڕاندنی کـاروبارەکـانی ڕۆژانەی ژیان، لە ناچاریدا و بە زۆر، وردەوردە، کـوردیان فـێـری زمـانی تورکـیی کـردووە، زمـانە نەتەوەیی یەکـەی خـۆیانیـان لە بیربردوونەتەوە، کە پێشتـر(لە نێو کوردەکاندا، کەس بە زمانی تورکیی قسەی نەدەکرد، بە تایبەتیی کوردە ئاسایی یەکان، ئەوە هەر هیچیان نەدەزانی)«10،134»
تورکەکان، لە سەرەتادا بە هیچ شێوەیە، دانیان بە زمانی کوردیدا نەدەنا. ، زمـانی کـوردییـان، بە یەکێ لە دیالێکتـەکـانی زمـانی تورکـیی دادەنا. هەر چەندە، نەک هەر تەنیـا کـورد خۆی، ئەو بۆچوونانەی تورکی ڕەتدەکـردەوە، بەڵکوو، هەمـوو دەزگـە ئەکـادیمیی و ڕووناکـبـیـرییـەکـانی دیکـەی گـەلانی جیهانیش، ئەوەیان سەلماندووە، زمانی کوردیی بە یەکێ لە زمانە « هیندۆ ـ ئەورووپایی »یەکـان دادەنرێ. زمـانی تورکـــیـیش، یەکێ لە زمـانە جیـاوازەکانی، گـروپە زمانی « ئەلتـیکی » سـەر بە خێزانی « ئۆرالـیی » پێکدێنێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا، تورکـەکـان خـۆیان باش دەزانن، کـوردیی و تورکـیی، دوو زمانی جـیـاوازن، کـورد و تورک دوو نەتەوەی جیـان. بەڵام، تورکـە داگـیـرکـەرەکـان، هەرگـیـز دانیـان بەو ڕاسـتـیـیـەدا نەناوە و نانێن، ئەوساش و ئێستـەش، هەر لە سەر ئەو باوەڕە شۆڤێنییەی خۆیان سوورن. ئەوان وا دەزانن، بەو جـۆرە بڕیارە قـرچۆکـانە دەتوانن، زمـانی کـوردیی لەنێوبەرن و کەسیش حسێبی بۆ نەکا!
دیارە، هەر کـاتێ، هێـزی داگـیـرکـەری دەوڵەتێکی بیـانیی، نیشـتـمـانی نەتەوەیەکی دیکە داگـیـردەکا، لە پێش هەمـوو شـتێـکدا هەوڵدەدا، زمـانە نەتەوەیی یەکـەی قەدەغەکا، تا وردەوردە، لەنێوبەرێ، لە بۆتەی زمانەکەی خۆیدا بیتـوێنێتـەوە. زمـانە نەتەوەیی یەکـەی خۆی، بە سـەردا بسـەپێنێ، ڕۆڵەکانی بە زمانی زکماکیی خۆیان نەخوێنن، نەنووسن و ئاخافتن نەکەن. کـەلتـوورەکـەی لەناوبەرن، مـێـژووەکـەی بشـێـوێنن، تا بەرەبەرە بە ئامـانجـە گـلاوەکـانی خۆیان دەگـەن. وەک: ئیـمـپریالیـزمی فـڕەنسـیی لە « جەزایر » ویسـتی، گـەلی جەزایر لە ڕێی زمـانەوە، بە خـاک و گـەلەکـەیەوە قـووتدا.

دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش، لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە، بە هەموو شێوەیە هەوڵیانداوە، زمانی خۆیان بە زۆر، بە سەر ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا بسەپێنن، زمانی کوردیی بتوێننەوە. لێرەدا نموونەیە دێنینەوە: لە سییەکاندا، باوکی فاشیزمی تورک « مستەفا کەمال »، لەگەڵ کۆمەڵەی مێژووی تورکیادا کۆدەبێتەوە، پرسیاریان لێ دەکا و دەڵێ: (دەزانن، بۆچی گەلانی بەلقانمان لەدەسچوو؟) پاشان، هەر خۆشی وەڵامدەداتەوە و دەڵێ: (گەلانی بەلقان، پەیمانگەی توێژینەوەی سلاڤییان دامەزراند، لێکۆڵینەوەی درێژیان دەربارەی « زمان، وێژە، مێژوو و کەلتوور »ەکەیان ئامادەکرد. ئەو کار و دەمەتەقێیانەی، لەو ڕێیانەوە دروسبوون، بووە هۆی ئەوەی، هوشیاریی نەتەوەیی لە نێو ئەو گەلانەدا لەدایکبێ. پاشان، دژی ئیمپراتۆریای عوسمانیی، بە شۆڕش کۆتاییهات.)« 10، 50-51 »

دیارە، مەبەستی ئەتاتورک، لە قەدەغەکردنی زمانی نەتەوەیی گەلانی بندەسی تورک ئەوەبووە، وەک « سمایل بێشکچی » دەڵێ: (گەر ویستمان، سەر بە نەتەوەیەک دانەوێنین، وەک کۆیلەی لێ کەین، ناسنامەی نەتەوەیی لێ زەوتکەین، گەر ویستمان، داگیرکەر لە ناوچەیەکدا دەسەڵاتی هەبێ، پێویستە، ئەلفوبێی ئەو نەتەوەیە لەناوبەرین، پێویستە نەیەڵین، ئەو گەلە یا ئەو نەتەوەیە، بە زمانی خۆی ئاخافتنکا، تا بەربەستێ لە میانەی خۆی و کەلتوورەکەیدا دروسکەین)« 10، 51 »

ئەم باوەڕە شۆڤێنیی و پووچە، نەک هەر تەنیا، کاربەدەسانی دەوڵەت، بانگاشەیان بۆ کردووە و بۆشی دەکەن، نەک هەر دەوڵەت ویستوویەتی و دەشیەوێ، زمانی نەتەوەی بالادەس، بە زۆر بە سەر دانیشتووانی کوردستاندا بسەپێنێ و دەشیسەپێنێ، بەڵکوو، زۆربەی زۆری « نووسەران، ڕووناکبیران، مامۆستایانی زانکۆ و دەزگە ئەکادیمییەکانی تورک »یش پشگیریانکردووە و پشگیریشیدەکەن. هەوڵیانداوە و هەوڵیشدەدەن، بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بیسەلمێنن، زمانی کوردیی زمانێکی ڕەسەن نییە، دیالێکتێکی زمانی تورکییە، لە بنەڕەتدا لە زمانی تورکییەوە وەرگیراوە. واتە: ئەو توێژە خوێندەوار و ئەکادیمییانە، هەمیشە، پشگیریی دید و بۆچوونەکانی، کاربەدەسانی دەوڵەت و دەزگەی سەربازیی تورکیان کردووە.

ئەوەتە، شۆڤێنییەکی بە ڕەچەڵەک کوردی وەک «Bulent Ecevit»، کە بە خۆڕایی و بە درۆ، خۆی بە « چەپ و دیمۆکراسیخواز » دادەنێ، زۆر بێشەرمانە دەڵێ: (کورد کەمینەیەکی نەتەوەیی نییە، ئەوانیش، وەک هەموو تورکەکان سەر بە زۆریەن، کە کۆماری تورکیایان دامەزراندووە. لە بەر ئەو هۆیە، کوردەکان بۆیان نییە، داوای مافەکانی «زمان، کەلتوور، نەتەوەیی و دیمۆکراسیی »بکەن. گەر، داوای ئەو مافانە بکەن، واتە داوای بارێکی تایبەتیی دەکەن، لەبەرئەوە، جیاوازیخوازن.) «31،10»
گەر تەماشایەکی، هەموو ئەو بڕیار و دەستوورانەش کەین، کە لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی، دەسەڵاتی ڕامیاریی دەوڵەتی خوێناویی تورکیادا، لە لایەن « دادگە سەربازییەکان، پەرلەمانی تورکیا و کاربەدەسانی دەوڵەتی تورک »ەوە دەرچوون، ئەوا دەبێ، باسێکی تایبەتییان بۆ تەرخانکەین. بۆیە لێرەدا، تەنیا دەس بۆ هێندێکیان ڕادەکێشین.
لە دادگە سەربازییەکاندا، دژی ئەو کوردانەی بە تاوانی، کاری ڕووناکبیریی گیرابوون، بۆیان نەبوو، بە کوردیی داکۆکیی لە خۆیان کەن. بەڵام، کاتێ بە کوردیی وەڵامی پرسیارێکی، دادوەری تورکیان دەدایەوە و تەنیا بە کوردیی دەپەیڤین، تورکەکان لە وەڵامی کوردەکاندا دەیانگوت: (نەتەوەی کورد بوونی نییە. بە شێوەیەکی گشتیی، کورد لە ڕەچەڵەکی تورکە. زمانی کوردییش، جگە لە دیالێکتێ لە دیالێکتەکانی زمانی تورکیی، هیچی دیکە نییە.)«149،10 » بەڵام، لاوە کوردەکان، زۆر بە شێوەیەکی جەسوورانە، داکۆکییان لە خۆیان و کێشە نەتەوەیی یەکەیان دەکرد. کەچی، تورکەکان دووپاتیاندەکردەوە و دەیانگوت: (زمانێکی سەربەخۆی کوردیی نییە، بەڵکوو، دیالێکتێکی تورکییە. لە 40٪ ی لە تورکیی، لە 30٪ لە عەرەبیی، لە 28٪ لە فارسیی و ئەوی دیکەشی لە 2٪ لە زمانەکانی ئەرمەنیی، گورجیی و سریانیی کۆنەوە وەرگیراوە.) «150،10»
هەروەها، کاتێ لە ساڵی « 1988 »دا، تورکەکان دادگایی کوردپەروەر «مەهدی زانا » دەکەن. « مەهدی » لە دوا دانیشتندا ڕایدەگەیەنێ، بە زمانی کوردیی، داکۆکیی لە خۆی دەکا. لەبەرئەوە، دەستەی دادگە

بڕیاردەدەن، جارێکی دیکە دادگایی بکەنەوە. چونکە، بە زمانی کوردیی قسەیکردووە. « Vedat Erkan »ی داواکاری گشتیی دادگە، زۆر بە ڕاشکاویی پێی دەڵێ: (لە سەر خاکی دەوڵەتی تورکیا، زمانی کوردیی نییە. پاشان، دەڵێ: کوردیی زمان نییە، بەڵکوو، لە کۆمەڵێ ووشەی تێکەڵاو پێکهاتووە. کۆمەڵێ ووشەی دیاریکراوە، بە ڕەچەڵەک تورکییە، کە لە ماوەی چەندین ساڵدا وەک دیالێکتێ دروسبووە. بەڵام، چەن کەسێکی کەم و دەوڵەتە بیانییەکان، بۆ مەبەسی تایبەتیی خۆیان، هانی بەکارهێنانی دەدەن. ئەمە بە هیچ شێوەیە ئەوە ناگەیەنێ، ڕەگەزی کورد و زمانی کوردیی، لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی تورک و نیشتمانی تورکدا هەبێ. ئەم دیالێکتە، ئەورۆ لە ڕۆژهەلات و خوارووی ئەنادۆڵ، وەک هۆی دەربڕین بەکاردێنرێ. ئێمە، ماوەیەکی زۆرە، دەسکاریی ئەم دیالێکتەمان نەکردووە، تا وەک بابەتێکی پڕوپاگەندە و شانازییکردنی لێهاتووە، ڕۆژێ لە ڕۆژانیش بە زمانی دایک دانەنراوە ... ئەوە ڕاستییەکە درۆی تێدا نییە. بەڵام، گەر ویستمان، هێندێ لەو کەسانەی زمانی تورکیی نازانن، بە کوردیان ناوبەرین و بڵێین: زمانێکی کوردییان هەیە، ئەوە جگە لە بریندارکردنی هەستی نەتەوەیی، هیچ شتێکی دیکە ناگەیەنێ.)«340،10»

دیارە، کاربەدەسی دادگەی تورک، ڕاستی فەرمووە: گەر مرۆڤ لە تورکیادا، جگە لە زمانی تورکیی، بە هەر زمانێکی دیکە، بە تایبەتیی، بە زمانی کوردیی بدوێ، هەستی نەتەوەیی تورک بریندارەدەکا. وەک کورد خۆی، نەتەوە نەبێ، هیچ جۆرە هەستێکی نەبێ، لە کۆمەڵگەی مرۆ دابڕابێ، خوا تورک و کوردی، لە دوو قوڕی جیاواز دروسکردبێ!

جا، ئەوە جگە لەوەی، هەر نووسەرێ، شتێکی لە بارەی ڕەچەڵەکی کورد و زمانی کوردییەوە بنووسیایە، کوردی بە تورک و زمانی کوردیی بە دیالێکتێکی زمانی تورکیی دابنایە، پێشوازییان لێ دەکرد، زۆر بە خۆشییەوە پەرتووکەکەیان بۆ چاپ و بلاودەکردەوە. بە خۆڕایی دابەشیاندەکرد، هەموو « بازاڕ، پەرتووکخانە، خوێندنگە، پەیمانگە و زانکۆکانی تورکیا »یان لێ پڕدەکرد. بۆ نموونە: « سمایل بێشکچی » باسی پەرتووکێکی نووسەری تورک « محەمەد شەریف فوڕات » دەکا. لە ساڵی

«1948 »دا، له ژێر ناوی « هەرێمەکانی ڕۆژهەلات و مێژووی ناوچەی وارتۆ »وه نووسراوه. له سالّی « 1960 » دا، له لایەن ژەنەڕالّ « کەمال گورسێل »ەوه پێشەکیی بۆ نووسراوه. پاشان، له سەر ئەرکی شالیارگەی ڕۆشنبیریی تورکیا چاپ و بلاوکراوەتەوه. ژمارەیەکی یەکجار زۆری، به خۆرایی به سەر هەموو مامۆستاکانی زانکۆ و یەکێتییه خوێندکارەکاندا لێ دابەشکراوه. بۆ هەموو ڕۆژنامه و گۆڤارەکان نێرراوه. پەرتووکخانەی خوێندنگەکان، شوێنه سەربازییەکان، دەزگه و مالّه زانکۆییەکانی لێ پڕکراوه. «160،10»

ئێستە، بۆمان ڕوونبۆوه، باری کورد له تورکیادا چۆنه. بۆچی زۆربەی کورد، زمانی زکماکیی خۆیان نازانن؟ دیاره، ئێمه به شێوەیەکی گشتیی باسمانکرد. ئەگینا، ئەم دەرکەوتەیه، له کۆندا زۆر بلاوبووه. به تایبەتیی، له نێو « خوێنەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر، زانا و پیاوه ئایینییەکان » دا، له ڕاده بەدەربووه.

هەر له کۆنەوه، له هەر چوار پارچەکەی کوردستان، دەولّەته داگیرکەرەکان هەمیشه هەولّیانداوه، چەن کوردێکی خۆفرۆش و نیشتمانفرۆش، وەک توله و تانجیی ڕاگرن. به هەر شێوەیه بێ، دەمیان چەورکەن، هانیاندەن، تا به شێوازێکی چەوت و خراپ، له سەر « زمان، هونەر، وێژه، جوگرافیا، مێژوو و ڕەچەلّەکی کورد » بنووسن. زانیاریی هەلّه، له نێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورد و نەتەوه سەردەسەکانی چوار دەولّەتەکەدا بلاوکەنەوه. بەم کارەشیان دەیانەوێ، له لایەکەوه، له ڕێی « نووسەر، شارەزا و ئەکادێمییەکانی کورد » خۆیەوه، هەم باوەڕ به کورد، هەم باوەڕ به گەلانی ناوچەکه و جیهانیش بێنن، ئەو زانیارییه هەلّانه ڕاستن. له لایەکی دیکەشەوه، ئەو زانیارییه چەواشەکراوانه، بۆ دژایەتیکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد بەکاربێنن. چونکه، لەم ڕێیه پتر، هیچ جۆره ڕێیەکی دیکەی هەرزانتریان نەدۆزیوەتەوه!

یەکێ لەو نووسەره کورده خۆفرۆشانه، « ڕەشید یاسمی »یه، که « مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد »ی داناوه. هەر چەنده، هێندێ ڕاستیی، لەم بەرهەمەدا هەیه بەلام، له زۆر شوێندا، به دەسی ئانقەس ڕاستییەکانی

شێواندووه. جگە لەوەی، وەک نووسەر خۆی، دەربارەی بەرهەمەکەی دەڵێ: (لە سەر داواکردنی وەزارەتی ڕۆشنبیریی ئێران نووسراوە، بەو مەبەسەی کە « ڕەگەز و یەکێتی میللەتی کورد لەگەڵ میللەتی ئێراندا « فارسدا ـ ق. کوردێ » ، هەروەها ، یەکێتی مێژوویان و هاوکاریی کورد لە ژیانی ئێراندا پیشاندرێ » )«35،78».

لێرەدا ، نووسەر بە هەموو توانایەوە، زۆر بێباکانـــە دەیەوێ، بیسەلمێنێ، کورد نەتەوەیەکی ڕەسەن نییە، خاوەنی زمان و کەلتووری تایبەتیی خۆی نییە. بەڵکوو، ڕەگەزی کورد لە فارسەکانەوە هاتووە. ئەم دید و بۆچوونانە، جگە لەوەی، لە سەداسەد هەڵەن، لە هەمان کاتیشدا، بە کارێکی چەوت دادەنرێن و بە گران لە سەر نەتەوەی کورد تەواودەبن. بۆیە، هیچ کوردێ بۆی نییە، بە ناوی نەتەوەی کوردەوە گوتار بنووسێ، هیچ جۆرە بڕیارێبدا، کە پێوەندییەکی سەرەکیی بە « جوگرافیا ، مێژوو، زمان، وێژە و کێشە ستراتیژییەکانی کورد »ەوە هەبێ، بەڵکوو، تەنیا دەزگە ئەکادیمییە کوردییەکان دەتوانن، ئەو جۆرە کارانە بکەن و بڕیاری لە سەر بدەن.

هەڵبەتە، نووسەرێکی وەک « ڕەشید یاسمیی » ، یەکێ لەو کوردە ڕووناکبیرانە بووە، لە سەر داواکاریی، دەوڵەتی ئێران، زمانی کوردیی، بە دیالێکتێکی زمانی فارسیی داناوە. بۆیە، گوتوویەتی: (تا ئەم ساڵانەی دوایی، لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا ، جگە لە نووسینی فارسیی، هیچ نووسینێکی تریان بەکار نەدەهێنا . ) پاشان، دەڵێ: (مێژوونووسان و زانایانی کورد، بە زمانی فارسیی نووسیویانە)«54،78» «شەرەفنامە »شی بە نموونە هێناوەتەوە. بەڵام، ئەم کوردە ناپاکە، تەماشای ئەوەی نەکردووە، بە دەیان هۆنەری کوردمان هەبووە، زۆر لە پێش « شەرەفخان »ەوە، هۆنراوەکانی خۆیان، بە زمانی کوردیی هۆنیوەتەوە. هەروەها ، هەموو ئایینە کۆنەکانی کورد، چ لە پێش و چ لە پاش زایین، بە زمانی کوردیی نووسراون! ئەوە جگە لەوەی، بە هیچ شێوەیە، باسی بندەستیی و چەوساندنەوەی نەتەوەی کوردیی نەکردووە، کە لەو کاتەی ئەو بەرهەمەکەی خۆی نووسیوە، داگیرکەرانی کوردستان، بە هیچ جۆرێ، لە هیچ بەشێکی کوردستان، ڕێگەیان نەداوە، کورد بە زمانی خوی بخوێنی و بنووسێ!

لەبەرئەوە، هێندێ لە نوسەر و زاناکانی کورد، وەک پێویست وەڵامی «یاسەمی »یان داوەتەوە. لەو بارەیەوە، پرۆفیسۆر « کوردۆییف »دەڵێ: (زمانی هەندێک لە هۆزەکانی زووی زاگرۆس، کە لە بنچینەی دروسکردنی میللەتی کورددا هاوبەشییانکردووە، لە خێزانی زمانە ئێرانییەکان بوون. لەم ڕووەوە زمانی کوردیی، وەک یەکێ لە زمانەکانی ئەسڵیی زاگرۆس خزمایەتیی و پەیوەندیی لەگەل زمانەکانی میدیی و پارفیایی و فارسییدا هەبووە، بەلام، بە هیچ جۆرێ لە زمانی فارسییەوە دروست نەبووە و نەکەوتۆتەوە، وەک رەشید یاسمیی وا بێ شەرمانە دەیەوێ، بیسەلمێنێ. بێگومان، هاوبەشیکردنی ماد و پارفیان و فارس لە دروسبوونی میللەتی کورددا بووە بە هۆی بەهێزکردنی پێوەندیی لەگەڵ زمانە ئێرانییەکاندا «میدیی، پارفیایی، فارسیی » ، بەلام، ئەمە بە هیچ جۆرێ نابێ بە بەڵگە بۆ نیشاندانی ئەوەی، کە کورد لە فارسەوە پەیدابووبێ و زمانی کوردیی لقێ بێ لە زمانی فارسیی.)«78، 44-45»
ئینجا، با بزانین، دەوڵەت چۆن دەتوانێ، زمانی ئایین یا زمانی نەتەوەی بالادەس، بە سەر نەتەوەکانی بندەسی خۆیدا بسەپێنێ؟ بە چ شێوەیە، دژایەتی زمانە نەتەوەیی یەکانی دیکە دەکا؟ هەڵبەتە، کە گوتمان دەوڵەت، واتە: « یاسا، دەزگەی ڕاپەڕاندن، دەسەلاتی ڕامیاریی و سەربازیی، لەشکرکێشیی و هێزی پۆلیس، گرتووخانە و ڕاونان، گرتن و کوشتن، توانای مەراڵیی و مەتیریاڵیی » و گەلێ شتی دیکەش دەگەیەنێ. بۆیە، یەکەم کارێ، دەوڵەت پەنای بۆ بەرێ، یاسایە، تا بە هۆی یاساوە، ئەو دید و بۆچوونە شۆڤێنییانەی نەتەوەی بالادەس، بە سەر دانیشتووانی دەوڵەتە فرەنەتەوە و نیشتمانەکەدا بسەپێنێ. با بزانین، یاسای تورکیا، لەو بارەیەوە چیمان بۆ باسدەکا.
لە هەر دوو دەستووری سالانی «1961 و 1982 »دا هاتووە، کە(دەستوور سرووش و دینامیکێتی خۆی لە ڕێبازی نەتەوەیی تورکەوە وەردەگرێ.) «10، 239 » پوختەی هەر دوو خالی سێ و چواری دەستووریش دەڵێ: جگە لە زمانی تورکیی، بە هیچ شێوەیە، هیچ جۆرە زمانێکی دیکەی یاساغ، لە تورکیادا بەکار ناهێنرێ. هەموو « چاپەمەنیی، قەوان، کاسێتی

ڕیکۆردەر، کاسێتی ڤیدیۆ، وێنە » و هەر شتێکی دیکە، پێچەوانەی خاڵی سێ بێ، دەسی بەسەردادەگیرێ. سەیر ئەوەیە، لە کاتێکدا نووسین و بڵاوکردنەوە، بە زمانەکانی دیکەی گەلانی تورکیا قەدەغەدەکا، کەچی، بە هێندێ لە زمانەکانی دیکەی وەک « ئینگلیزیی، فەرەنسیی، ئەڵمانیی، فارسیی، عەرەبیی، ئەرمەنیی » و چەن زمانێکی دیکەش، هەموو شتێ بڵاودەکەنەوە، تەنیا بە کوردیی نەبێ، سزای لە سەر دادەنێن!
هەڵبەتە، مەترسیی کورد و زمانی کوردیی، لە هەموو ئەو گەلانە و زمانەکانیان، بۆ سەر تورک زۆر زیاترە. بۆیە، وا بەو شێوەیە، قەدەغەیان کردووە! هەروەها، دەبینین:لە دەستووری ساڵی « 1983 »دا، لە هەر دوو دەستوورەکەی پێشوو خراپتر نووسراوە. چونکە، چەندین جار، ئەو شتانەی دووپاتکردۆتەوە. لە بڕگەی یەکدا دەڵێ:(ئەم یاسایە، سەرەتا و لیستەی تایبەتیی، بۆ چاپەمەنیی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ ڕێکدەخا. ئەوانەی پێوەندییان، بە زمانە قەدەغەکراوەکانەوە هەیە، بە مەرجێ بایەخ بە یەکێتی نێوان « دەوڵەت، خاک، نەتەوە و سەروەریی » بدا، کە هەرگیز لێک جیا ناکرێنەوە، هەروەها، بایەخ بە « کۆمار، ئاساییشی نیشتمانیی و پاراستنی ڕژێمی گشتیی دەوڵەت » بدا.)«240،10»
ئەمە، تەنیا یەک بڕگەی ئەو دەستوورە بوو. بڕگەکانی دیکەشی، گەر خراپتر نەبن، هەرگیز باشتر نین. چونکە، مشتێ نموونەی خەروارێکە، بۆیە هەر هێندە بەسە!
« Tahsin Sarac »، یەکێ لەو نووسەر و هۆنەرە، کوردە خۆفرۆشە بە ناوبانگانەی تورکیا بوو، کە ڕۆڵێکی گەورەی لە « ژیاندنەوە، بوژاندنەوە و گەشەسەندنی زمانی تورکیی »دا بینیوە. دوای ئەوەی، لە ڕێکەوتی (1989/06/28)دا مرد، پتر لە بیستوپێنج « نووسەر، هۆنەر، زمانەوان و ڕۆژنامەنووس »، دەربارەی ژیان و بەرهەمەکانیی، شێوازی نووسین و دەسڕەنگینیی « تەحسین »یان نووسیی و دوان. هەر هەموشیان، پێیان وابوو،(تەحسین بە زمانێکی خاوێنی تورکیی نووسیوویەتی، زۆر هۆگری زمان و وێژەی تورکیی بووە، بە هۆی هۆنراوەکانییەوە، زمانی تورکیی قووڵایی یەکی ڕەسەنی پەیداکرد.)«249،10»

ئەو کوردە ناپاکە، هەمیشە ووشەی کوردیی ڕەسەنی، لە زمانی کوردییەوە دەدزی، زمانی تورکە مەغۆلەکانی، پێ دەوڵەمەند دەکرد، کە ئەوڕۆ تورکەکان، بە چەن ووشەیەکی خاوێن و ڕەسەنی تورکیی دادەنێن! هەر وەک هۆنەری تورک « Refik Durbas » دەڵێ: (تەحسین، هۆنەری زمانی تورکیی خاوێنبوو. ئەو، ئەو مامۆستایە بوو، کە خاوێنترین داڕشتنەکانی زمانی تورکیی، بۆ هۆنراوە گۆڕیی. بە هۆی بەردەوامبوون و سووربوونی، لە سەر چلوورەبەستنی سەلیقەی هۆنراوەیی ئەو، ئەم زمانە بوو بە زمانی هۆنراوە، دوای ئەوەی، لە تورکمانهی کۆن بێژایەوە.)«250،10» بە مەرجێ، وەک « بێشکچی »دەڵێ: (تەحسین کورد بوو. بەڵام، هەرگیز ئەوەی ڕا نەدەگەیاند. بەڵکوو، نکولی لە کوردێتی خۆی دەکرد.) «250،10» هەروەها «بێشکچی »دەڵێ: (تەحسین دەیگوت: من کورد نیم. لەبەرئەوە، ئەرکی سەرشانی من نییە، دژی تیرۆر بکۆشم، کە بەرانبەر کوردەکان دەکرێ، یا داکۆکیی لە مافەکانییان بکەم.)«254،10» ئەوە لە کاتێکدا، چەندین کەڵەنووسەر و هۆنەری مەزنی وەک: « عەلی حەریریی لە سەدەی یازدە، مەلای جزیریی لە سەدەی دوازدە، فەقێ تەیران لە سەدەی چواردە، ئەحمەدی خانیی لە سەدەی حەڤدە و حاجی قادری کۆیی لە سەدەی هەژدە » دا دەبینین، چەندین سەدە لە پێش ئەو کوردە ناپاکەوە ژیاون، هێندێکیان، بیریان لە زمانی نەتەوەیی و وێژەی کوردیی کردۆتەوە، هێندێکی دیکەشیان، سەرەڕای زمان و وێژە، خەمی مێژووی کورد، ڕزگاریی و سەربەخۆیی کوردستانیشیان خواردووە. کەچی، « تەحسین » ێکی بە ڕەچەڵەک کورد، بە « دڵ، دەروون، مێشک و باوەڕ » تورک، لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، پشت لە زمان و نیشتمانەکەی خۆی دەکا، ڕۆژانە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی، لە بەر چاوی سەردەبڕێ، نکولی لە کوردێتی خۆی دەکا و فزە لە خۆی دەبڕێ!

هەڵبەتە، ئێمەش دەزانین، هەر دوو سەردەمەکە، زۆر جیاوازییان هەیە. بەپێی پێشکەوتنی بیری نەتەوەیی و خوێندەواریی بووایە، دیارە دەبووایە، « تەحسین » پتر لەو کەڵەپیاوانەی کورد بکۆشایە. بەڵام، وا دیارە، زۆر گرنگ نییە، گەر هەزارانی وەک « تەحسین »، لە دایک و باوکێکی کورد

و له کوردستانیش لەدایکبووبن، گەر هەستی نەتەوەییان نەبوو، خۆیان بە کورد نەزانی، خۆیان بە تورک فرۆشت، دژی نەتەوەکەی خۆیان ڕاوەستان، کەی ئەوانە کوردن؟ بە پێچەوانەوە، هەمیشە دەبێ، لە ڕیزی دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستاندا دایاننێین. هۆنەرێکی گەورەی پایەبڵندی وەک «ئەحمەدی خانیی »، بۆیە، بە کوردیی دەینووسی، تا بە کورد و جیهان ڕاگەیەنێ، نەتەوەی کوردیش، زمانی تایبەتیی خۆی هەیە. کوردەکان هەر تالانیی و جەنگ نازانن، بەڵکوو، خوێندن و نووسینیشان هەیە، چیرۆک و هۆنراوەش دەنووسن، کەچی ناپاکێکی وەک « تەحسین »، دان بە زمانە زکماکییەکەی خۆشیدا نانێ!

دیارە، ئەم تراژیدیا گەورەیە، بەشێکی زۆری، بۆ لاوازیی هەستی نەتەوەیی دەگەڕێتەوە. وەنەبێ، تەنیا هەر ئێمەی کورد خۆمان، هەستمان بەو کەموکوڕییە گەورەیەکردبێ. بەڵکوو، هەموو ئەو « ئەفسەر، نووسەر، گەڕۆکە بیانیی » و کەسانەی، بە هەر شێوەیە بووبێ، ماوەیە لە کوردستان ژیاون، لە نزیکەوە سەرنجی کۆمەڵگەی کوردەوارییان داوە، هەستیان پێ کردووە، کورد لەو ڕووەوە گەلێ لاوازە. بۆ نموونە: دەیانی وەک « سمایل بێشکچی » پێ لە سەر ئەوە دادەگرن. ئەوەتە، ئەفسەرێکی ڕووسی وەک «Aurianof » لە سەدەی نۆزدەدا دەڵێ:

(هەستی نەتەوەیی لە نێو کوردەکاندا، زۆر لاوازە. بەڵکوو، لەوانەیە لە کردەوەدا هەر نەبێ.)«10، 273 - 274» جا، گەر هەستی نەتەوەیی کورد، لاواز نەبووایە، بۆچی، لە بەرەبەیانی مێژووەوە، لە لایەکەوە جەنگی نێوخۆ لە نێوان کورد ـ کورددا ڕوویدەدا. لە لایەکی دیکەشەوە، هەر کاتێ، شۆڕشێکی چەکداریی بەرپابووبێ، بە هەزاران جاشەکورد دروسبووە، چەکیان بۆ دوژمنی داگیرکەر هەڵگرتووە، نۆکەرییان بۆ کردوون، دژی شۆڕش و نەتەوەکەی خۆیان جەنگاون، وەک کەری دێز، حەزیان بە تۆپینی خۆیان و مردنی خاوەنەکانیان کردووە! بە ڕاستیی، ئەم دوو دەرکەوتە دزێوە چەپەڵە، لە کۆمەڵگەی کورددا، بە خەوش و لاوازییەکی گەلێ گەورە دادەنرێن، پەڵەیەکی گەلێ ڕەش و چڵکنن، تەوێڵی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانە و ئازادیخوازانەی نەتەوەی کوردی، لە سەرانسەری مێژوودا سواغداوە.

# 7. زمانی نەتەوەیی و فاکتەرەکانی گۆڕان :

تا ئێستە، بە تەواویی بۆمان ڕوون نەبۆتەوە، زمانی گەلان بە گشتیی و زمانی کوردیی بە تایبەتیی، کەی پەیدابوون؟ چونکە، مێژووی زمان، وەک مێژووی هیچ شتێکی دیکە نییە، تا بێ سەریەشە، شتێکی لێ هەلکرێنین! زمان، مێژوویەکی لێلی هەیە. بەلام، هێندە دەزانین، لەو ڕۆژەوە تیرە و هۆزەکان، لە ناوچەیەکی دیاریکراودا کۆبوونەتەوە، خۆیان ڕێکخستووە، یەکیانگرتووە، سەریان بە یەکدا کردووە و بڕیاریانداوە، پێکەوە بژین، چەن گەلێکی جیاوازیان پێکهێناوە. لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراویشدا، گەل و نەتەوەکانی، سەر ڕووی ئەم زەوییە دروسبوون. پاشان، بەپێی پێویستییەکانی ژیانی کۆمەلایەتیی، زمانە جیاوازەکانی گەلانی جیهانیش پەیدابوون، تا پێکەوە ئاخافتنکەن و لە یەکدی بگەن. بەلام، هەلبەتە، کاتێکی زۆری ویستووە، تا هەر یەکێ لەو زمانانە، بە تەواویی، ڕەگی قوولی خۆی، لە نێو جەرگەی کۆمەلگەکەدا داکوتاوە، تا پێگەیشتووە و پێشکەوتووە. لە کۆتاییشدا، لە نێو چوارچێوەی، یەکێ لەو چوار خێزانە گەورەیەی زمانەکانی جیهاندا، جێگەی خۆی کردۆتەوە.

هێندێ لەو زمانانە، گەلێ بەهێزبوون، توانای خۆڕاگریی و ژیانیان هەبووە، بۆیە، تا ئەوڕۆش ماونەتەوە. هێندێکی دیکەشیان، لە بەر لاوازیی ڕەگوڕیشەیان، هەر زوو بوونی خۆیان لەدەسداوە و لە بۆتەی زمانەکانی دیکەدا تواونەتەوە. مەرجیش نییە، هەموو ئەو زمانانەی، لە دەس فەوتاندن ڕزگاریانبووە، لەبەرئەوە بووبێ، زۆر بەهێزبووبن، یا ئەوانەی شوێنەواریان نەماوە، تەنیا لەبەرئەوە بووبێ، لاوازبووبن. بەلکوو، شەش فاکتەری زۆر گرنگ، ڕۆلی سەرەکییان، لە مانەوە یا فەوتاندنی، زمانەکاندا گێڕاوە :

یەکەم ـ هەستی نەتەوەیی :

ئەوەی گومانی تێدا نییە، ئەوەیە، پێوەندییەکی توندوتۆل، لە نێوان هەستی نەتەوەیی و زمانی نەتەوەییدا هەیە. تا ئەو هەستە بەهێزتربێ،

زمانی نەتەوەیی پتر بایەخی پێ دەدرێ و پێشدەکەوێ. بە پێچەوانەشەوە، تا هەستی نەتەوەیی لاوازبێ، بایەخێکی زۆر، بە زمانی نەتەوەیی نادرێ و دوادەکەوێ. چونکە، زمانی نەتەوەیی، هەستی نەتەوەیی دەبوژێنێتەوە، ڕەنگوڕووی دەڕازێنێتەوە. بۆیە، بە شێوەیەکی گشتیی، ئەوانەی زمانی نەتەوەیی خۆیان نازانن، هەستی نەتەوەیی یان کزولاوازە. بۆ نموونە: ئەو مەلا کوردانەی، لە باکووری کوردستان، بە زمانی کوردیی خوێندوویانە، لەگەڵ ئەوەشدا، وەک مەلاکانی دیکە، زمانی نەتەوەیی خۆیان نازانن، هەر بە تورکیی خوێندوویانە، هەستی نەتەوەیی یان زۆر بەهێزترە. چونکە، بە زمانە شیرینە ڕەوانەکەی خۆیان، بابەتی « ئایین، مێژوو، زمان و وێژەی کوردی »یان خوێندووە، کە کارێکی زۆری، لە هەستی نەتەوەیی یان کردووە. « سمایل بێشکچی »، ئەو جۆرە مەلایانە بە « ئینتێلێگێنسیا »ی کورد ناودەبا. «245،10»

هەستی نەتەوەیی، بە هەستێکی خۆرسکیی و خاوێن دادەنرێ، لە قووڵایی و ناخی هەموو مرۆڤێکدا، بە شێوە و پلەی جیاواز، جێگەی خۆی گرتووە. لە هەموو قۆناغەکانی، ژیانی کۆمەڵگە جیاوازەکاندا هەبووە. لای هەموو گەل و نەتەوەیەکی، سەر ڕووی ئەم زەوییە هەبووە و هەیە و هەر دەشمێنێ. لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتیدا پەیدا نەبووە. بەڵام، لای هەموو نەتەوەکان وەک یەک نەبووە و نییە و ناشبێ. بەڵکوو، بەگوێرەی بارە «نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی و کەلتووریی » یەکە گۆڕاوە و دەشگۆڕێ، بە پلەی جیاجیا گەشەیکردووە و گەشەشدەکا. لە هێندێ قۆناغدا، زۆر لاواز بووە، شاراوە بووە. کەچی، لە هێندێ قۆناغی دیکەدا، لە سەرەتای بووژانەوە و گەشەکردنیدا بووە. لە هێندێ قۆناغی دیکەشدا، زۆر بەهێز و بە تاووتینبووە. بۆ نموونە: لە قۆناغی سەردەمی، بوژاندنەوەی زمان و کەلتووری نەتەوەییدا دەبینین، لە نێو گەلانی ئەورووپادا، هەستی نەتەوەیی یان لە بووژاندنەوەدا بووە. (بیروباوەڕی ڕێنیسانس و ئەنجامەکانی بە شێوەی جۆربەجۆر، هەستی نەتەوەیی یان لە ناو گەلانی ئەورووپادا ژیانەوە. چونکە، زمانی نوێ بووە ئامرازێک و ئەو بەرهەمە فیکریانەی پێ دەنووسرا، کە لە بەردەسی جەماوەردا بوون.)«82،91»

دووەم ـ ئایین :
هەڵبەتە، هەروا بە خۆڕایی نییە، فاکتەری ئایین، بۆ « مانەوە، گەشەکردن و بڵاوبوونەوەی زمانەکان »، بەهێزترین هۆ بووە. ئەم خاڵەمان، لە باسی زمانی ئایین و زمانی نەتەوەییدا، بە درێژیی باسکرد.
سێیەم ـ دەسەڵاتی دەوڵەت :
هەموومان دەزانین، دەسەڵاتی ڕامیاریی و ئابووریی، چ بایەخێکی گەورە و گرانی، لە ژیانی نەتەوەکاندا هەیە. جگە لەوەی، سەراپای ژیانی ئەندامانی، کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو دەبوژێنێتەوە، کارێکی گەلێ گرنگیش، لە جۆری « پەروەردەکردن، هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەریی، گەشەکردنی زمان و کەلتووری نەتەوەیی » دەکا. بە کوردییەکەی: دەسەڵات، گەل و زمانی مردوو زیندوودەکاتەوە. بۆ نموونە: جووەکان بە هۆی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە، واتا « دەسەڵاتی ڕامیاریی و ئابووریی »، گەلەکەیان لە قڕکردن پاراست و زمانەکەشیان زیندووکردەوە.
بە شێوەیەکی گشتیی، فاکتەری ئایین و دەسەڵات، دوو فاکتەری گەلێ گرنگن و پتر لە فاکتەرەکانی دیکە، کار لە زمانی نەتەوەیی دەکەن.
چوارەم ـ فاکتەری جوگرافیا :
جگە لەوەی، فاکتەری جوگرافیا، کارێکی زۆری لە بڵاوبوونەوەی زمانەکان کردووە. هەڵبەتە، ئەو نەتەوانەی، لە ناوچە شاخاوییەکان ژیاون، لە بەر سەختیی و چڕیی ئەو ناوچانە، کەس دەسی پێیاندا نەگەیشتووە، داگیرکەران بە دەگمەن ڕێیان تێیکەوتووە. ئەوانیش، لە لایەکەوە، بە ئاسانیی زمانەکەی خۆیان، لە تێکەڵابوون و تواندنەوە پاراستووە. لە لایەکی دیکەشەوە، زمانەکە لەو سنوورە تەسکەدا ماوەتەوە و پتر بڵاو نەبۆتەوە. بۆ نموونە: گەر زمانی کوردیی، بە تایبەتیی بەشەدیالێکتی هەورامیی بگرین، دەبینین: تا ئەورۆ پارێزگاریی بوونی خۆی کردووە.
هەروەها، ئەو نەتەوانەی، بیابانشین یا دەشتنشین بوون، فاکتەری جوگرافیا، بە شێوەیەکی دوولایەنە، کاری لە زمانەکەیان کردووە. هەم زمانەکەیان، لە لایەن زمانەکانی دیکەوە، زووتر و پتر کاری تێکراوە. هەم زمانەکەشیان، کاری لە زمانەکانی دیکە کردووە. چونکە، بەپێی

هەڵکەوتی جوگرافیا و بایەخی ستراتیژیی گۆڕاوە، ئەو ناوچانە، هەمیشە لە ژێر گوشاری « پەلاماردان، جەنگ و داگیرکردن »دا بوون. جگە لەوەی، سەرە ڕێگەی کاروان و بازرگانیی، گەلانی جیاوازی ناوچەکە بوون، جۆرە تێکەڵاویی یەک، لە نێوانیاندا سازبووە، یارمەتیی بڵاوبوونەوەی، زمانە جیاوازەکانی داوە.

پێنجەم ـ بازاڕی یەکگرتوو « ئابووریی » :

فاکتەری ئابووریی بە گشتیی و بازاڕی یەکگرتوو بە تایبەتیی، کارێکی زۆر، لە بڵاوبوونەوە و پێشکەوتنی زمانەکان دەکەن. کاتێ بازاڕە پچووکەکان یەکدەگرن، بازرگانیی پێشدەکەوێ، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان قووڵدەبنەوە. ئەو کاتە، بازاڕی یەکگرتوو ڕۆڵێکی گەلێ گرنگ، لە پێشکەوتنی زمانی نەتەوەییدا دەگێڕێ. بۆ نموونە: لە سەدەی پازدەیەم و شازدەیەمدا، بازاڕی یەکگرتوو لە ئەورووپا پەیدابوو، زمانی نەتەوەیی دەرکەوت و گەشەیکرد.

شەشەم ـ پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا :

هەڵبەتە، تا زانست و تەکنۆلۆژیا پێشکەوێ، زمانی نەتەوەیی، پتر بڵاودەبێتەوە و پەرەدەسێنێ. بۆ نموونە: کاتێ ئامێری چاپەمەنیی نوێ، لە «ئەڵمانیا» دۆزرایەوە، شۆڕشێکی گەورەی « زانیاریی، زانستیی و کەلتووریی » بەرپاکرد. بۆ کۆمەڵگەی مرۆ، دەسکەوتێکی گەلێ مەزن بوو، (ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا، کتوپڕ ڕوویدا و لە دەوروبەری ساڵی « 1445ز » دا، « یوحەننا گوتینبێرگ1400 ـ 1468 »ز. توانی، یەکەم ئامێری لە تەختەدروسکراوی چاپکردن دروسکا.)«83،91»

مێژوونووسان، داهێنانەکەی « گۆتینبێرگ »، بە گەورەترین دیاریی گەلی ئەڵمانیا دادەنێن، کە ناوبراو لە سەدەی پازدەیەمدا پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد. تەنانەت، یەکێ لەم بارەیەوە گوتوویەتی:(داهێنانەکەی گۆتینبێرگ، لەو جۆرە کارانەیە، کە یەک جار ڕوودەدەن و دووبارە نابنەوە.)«85،91»

هەروەها، دواتریش بۆ یەکەم جار، یەکەم تایپڕایتەر، لە ساڵی «1867ز »دا، دروسکرا. ئیدی، هێندەی دیکە، باری کەلتووریی، هەنگاوی گەلێ گەورەی، بەرەو پێشەوەنا! دیارە، ئەم فاکتەرانە هەموویان پێکەوە، کارێکی

زۆریشیان، له « هەستی نەتەوەیی، زمان و کەلتووری کورد »یش کردووە. هەر چەندە، کورد هەستی نەتەوەیی لاوازە، بەڵام، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، زمانەکەی خۆی، بە دڵ و گیان پاراستووە. چەندین پێشەوای ڕۆژنامەوانی کوردی وەک: « حوسێن حوزنی موکریانیی، پیرەمێرد و ساڵح قەفتان »، چاکی چالاکییان هەڵکردووە، بە هەموو شێوەیە، ڕاژەی زمانەکەی خۆیان کردووە. بە تایبەتیی کاتێ، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، یەکەم چاپخانە لە کوردستاندا دامەزرا، هەر بە یەکجار، زمان و کەلتووری کوردیی پێشخست.

دەبێ، زمانی نەتەوەیی چیبێ، وا بەو شێوەیە، گەلانی جیهان، هێندە بۆی بە پەرۆشن؟! قوربانیی لە پێناودا دەدەن؟! تۆ بلێیی، ئەو کەسەی زمانێکی دیکە، بە باشی بزانێ، هەر چی بوێ، بە کامی دڵی خۆی بتوانێ، بەو زمانە دەریبڕێ؟ باوەڕ ناکەم، گەر مرۆڤ، جگە لە زمانی دایک، چەندین زمانی دیکەش بزانێ، بە هیچ شێوەیە بتوانێ، چێژی لێ وەرگرێ، بە تەواویی لێیان تێبگا، هەست و هۆشی ببزوێنێ، دەروونی بورووژێنێ، دید و بۆچوونەکانی خۆی پێ دەربڕێ! بۆیە، هۆنەرێکی بە ناوبانگی ئیتالیی وەک «دانتی ئەکیگیری1265-1321 »ز، بە یەکێ، لە پێشەوا مەزنەکانی سەردەمی ڕێنیسانس دادەنرێ. لە بواری بزووتنەوەی « ڕووناکبیریی، وێژەیی، هونەریی، کاری ئەکادیمیی و ڕامیاریی »دا، شۆڕەسوارێکی بێ وێنەی سەردەمەکەی خۆی بووە. لە بری زمانی لاتین، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی بەکارهێناوە. ئەو کەڵە نووسەر و زانا گەورەیە، دەربارەی زمانی نەتەوەیی دەڵێ: (زمانی نەتەوەیی لە توانایدا هەیە، پاڵ بە میللەتەوە بنێ، گۆڕانێکی بنەڕەتی تێدا پێکبێنێ.)«93،91»

« جیۆڤانی پۆکاشیۆ1313 ـ 1375 »ز، نووسەر و ناودارێکی ئیتالی بوو، لە ڕێی زمانی نەتەوەیی و ئامۆژگارییەکانی « دانتی »یەوە توانی، هەستی نیشتمانپەروەرێتی لە ناو جەماوەردا بەرزکاتەوە. بەو پەڕی تواناشییەوە هەوڵیدەدا، لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا پلەوپایەی زمانی نەتەوەیی ئیتالیا جێگیرکا و بیچەسپێنێ، ئەو زمانە، زمانی نووسین و لێکۆڵینەوە بوو، خۆشی بەو زمانە بەرهەمەکانی نووسییەوە.)«114،91»

مێژووی مرۆڤایەتی، بە دەگمەن، بلیمەتێکی وەک « لیۆناردۆ داڤینشی 1452 ـ 1519 »ز. بە خۆیەوە دیوە. « داڤینشی »، لە هەموو بوارە جیاوازەکانی « هونەر، وێژە، زانست و بیر »دا، سوارچاکێکی بێوێنەبوو. بەو شێوەیە لێهاتوو، سەرکەوتوو و بەردەوامبووبێ، تا ئێستا نەبووە. بۆیە، بە ناوبانگترین بلیمەت و داهێنەری، سەردەمی ڕێنیسانس دەناسرێ. «لیۆناردۆ » یەکێ بوو، لەو هونەرمەندە بلیمەت و لێهاتووانەی، بایەخێکی زۆری، بە زمانی نەتەوەیی دەدا. (هەموو تێبینی و بۆچوونە زانستییەکانی، بە زمانی نەتەوەکەی دەنووسییەوە و بە توندیی وەک ڕۆڵەیەکی ئەمەکداری گەل و سەردەمەکەی، دژی زمانی لاتینی بوو. لەم بارەیەوە، بە چەن ووتەیەکی بە نرخ، ڕای خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ: « ... لە نێو زمانەکەی خۆمدا، ئەوەندەم ووشە هەیە، زۆر لەوە زیاترن، تەعبیریان لە شتەکان پێ بکەم و ناوەڕۆکی بیروڕایەکانمیان پێ دەربڕم ... »)«141،91»
بەو شێوەیە دەبینین: زۆربەی زۆری پێشەوایانی ڕێنیسانس، وەک: (دانتی، پەترارک، پۆکاشیۆ، داڤینشی، میخایل ئەنجیلۆ و ئارازمس ... تاد) شانازییان بە زمان و کەلتووری نەتەوەیی خۆیانەوە کردووە. بایەخێکی زۆریان پێ داوە، گەلێکیان پێدا هەڵداوە، ڕاژەیانکردووە. بۆیە، بەو شێوەیە، تەلاری کوشکی ڕازاوەی « زمان، هونەر و وێژەی نەتەوەیی » خۆیان، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی نیشتمانەکانیان تێپەڕاندووە، تا تاکە ئیتالییەکیش مابێ، دەبێ، دەسی ڕێز و خۆشەویستییان بۆ بە سنگەوە بگرن.
لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریشدا، گەلێ « خوێندەواری گەورە، ڕووناکبیری مەزن، نووسەری هێژا، هونەری پایەبڵند و زانای بە ناوبانگ »مان هەبووە و هەیە، کە ژیان و گیانی خۆیان، لە پێناوی « ووشەی پیرۆزی کوردیی، زمانی نەتەوەیی، مێژووی کورد »دا بە هەرزان داناوە. ئەرکی ڕێنیسانسێکی کوردییان، لە ئەستۆی خۆیان گرتووە. ڕاژەیەکی زۆری نەتەوەی کوردیان کردووە. وەک د. « کەمال مەزهەر »یش دەڵێ: (قازی محەمەد و جەلالەت بەدرخان و مەلای گەورە و ئەمین زەکی و پیرەمێرد و حوسێن حوزنی موکریانی و ڕەفیق حیلمی، لەو کەڵانەی کوردن، کە وەک

نەمرانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس، لە پێناوی ورپاکردنەوەی گەلدا، بۆیان بکرایە، خۆیان دەکرد بە کونی دەرزیدا.)«3،91»
پێش هەموو شتێ دەبێ، باسێکی کورتی شوێنی ژیانی کورد بکەین. تا بزانین، نیشتمانی کورد لە کوێوە دەسپێدەکا و لە کوێدا کۆتاییدێ؟ باری جوگرافیا و تۆپۆگرافیای وولاتی کوردان چۆنە؟ بە چ شێوەیە، کاری لە زمانی کوردیی کردووە؟ گەر، ئەو شتانەمان زانی، ئەوا بۆمان ڕووندەبێتەوە، بۆچی کورد، وەک ئاردی نێو درکی لێهاتووە؟ بە هەموو جیهاندا پەرشوبڵاوبۆتەوە؟ بۆ بەو چەشنە، لە یەکدی داپچڕاوە؟ زمانە نەتەوەیی یەکەی، بۆ وای لێ بەسەرهاتووە؟
لێرەدا، پرسیارێ خۆی قووتدەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە، ئایا، لە کەیەوە، ناوی « کوردستان » پەیدابووە؟ زۆربەی شارەزایانی جوگرافیا و مێژوو، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە ووشەی کوردستان، وەک زاراوەیەکی جواگرافیایی،(بۆ یەکەمین جار، لە سەدەی دوازدەیەمی زاییندا، لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا پەیدابووە، کاتێ سولتان سەنجەر، بەشی ڕۆژاوای لە هەرێمە شاخاوییەکان جیاکردەوە و خستییە ژێر دەسەڵاتی شا سولەیمانی خزمییەوە.)« 23،61 »
ئەدی، مەبەسمان لە کوردستان چییە؟ کوردستان، هەموو ئەو خاکە پێکدێنێ، کە لەو ڕۆژەوە، کورد وەک نەتەوە دروسبووە، لە سەری دەژی. دیارە، ئەمە لە مێژووبەکی دێرینەوە، بە زنجیرەیە « قۆناغی مێژوویی، گۆڕانکاریی گەورە و گرنگ »دا تێپەڕیووە، تا ئەوڕۆ لەو نیشتمانە پانوبەرینەدا، بە تەواویی نیشتەجێبووە. کورد، خۆی بە خاوەنی کوردستان دادەنێ، تاپۆیەکی ڕەشی مێژوویی نیشتمانەکەی لە باخەڵ دایە. بۆیە، چۆڵی ناکا، لە پێناویدا خوێندەڕێژێ، قوربانیدەدا و لاشە دەنێژێ.
هەڵبەتە، هەر لە کۆنەوە، چەندین زانا و شارەزای کورد و بیانیی، هەوڵیانداوە، چوارچێوەی سنووری نیشتمانی کورد دەسنیشانکەن. هەر یەکە بەپێی باوەڕ و توانای خۆی، نەخشەیەکی سروشتیی کوردستانی کێشاوە، سنوورەکەی لە سەر زەوی دیاریکردووە. بەڵام، کۆمەڵگەی مرۆ، ڕۆژبەڕۆژ، لە زیادبووندابووە. هەست و هۆش گۆڕاوە. چاوچنۆکیی و

نیازخراپیی، جێگەی بەرچاوڕوونیی و دڵپاکیی گرتۆتەوە، جەنگ و پێکدادان، تەنگی بە ئاشتیی و پێکەوە ژیان هەڵچنیوە. لەبەرئەوە، سنووری وولاتەکان بە شێوەیەکی بەردەوام گۆڕاوە. نەتەوە گەورە و بەهێزەکان، پەلاماری نیشتمانی نەتەوە پچووک و بێهێزەکانیان داوە. خاکەکەیان داگیرکردوون، پیاوەکانیان کوشتوون، ڕۆڵەکانیان بە دیلگرتوون، ژنەکانیان ڕفاندوون. هێندێ جاریش، سەراپای ئاوەدانییەکانیان سوتاندوون. ئەم داگیرکەرانە دوو جۆر بوون. جۆرێکیان لە دوورەوە هاتوون، هەر کە بە ئامانجەکانی خۆیان گەیشتوون، ئیدی، دوای « کوشتنوبڕین، سوتاندن، کاولکردن، ڕوخاندن و تالانکردن »، بە سەرکەوتوویی بۆ نیشتمانی خۆیان گەڕاونەتەوە. جۆرەکەی دیکەشیان، داگیرکەرانێ بوون، شانبەشانی نەتەوەکان لە ناوچەکەدا ژیاون. گەلێ جار و بە شێوەیەکی بەردەوام، لە نێو خۆیاندا لە جەنگ و ئاژاوەدا بوون، تا یەکدی قووتدەن، خاکی نیشتمانەکەیان لە سەر حسێبی یەکدی فراوانترکەن.
جۆری یەکەمیان، زۆر مەترسیی نەبووە. چونکە، کاتێ هاتوون، جەنگیان ڕاگەیاندووە، یا ژێرکەوتوون و پاشەوپاش کشاونەتەوە، یا سەرکەوتوون و ماوەیە ماونەتەوە، ئەوەی ویستوویەتیانە کردوویانە. پاشان، گەڕاونەتەوە. واتە: لە هەر دوو بارەکەدا، خاکەکەیان داگیر نەکردووە، لە سەری نیشتەجێ نەبوون، وەک هەموو ئەو جەنگانەی، لە نێوان یۆنانییەکان و فارسەکاندا ڕوویانداوە.
بەلام، جۆری دووەمیان، گەلێ مەترسی پتر بووە. چونکە، کاتێ هەر داگیرکەرێ، پەلاماری وولاتێکی دراوسێی خۆی دەدا، مەبەسەکەی تەنیا ئەوە نییە، نیشتمانەکەی وێرانکا، سەر بە گەلەکە شۆڕکا، دەسکەوتێکی کاتیی هەبێ. بەڵکوو، مەبەسی ئەوەیە، خاکی نیشتمانەکەی، بۆ تاهەتایە داگیرکا، بە خاکی نیشتمانەکەی خۆیەوە دادروێ، گەلەکەی بتوێنێتەوە، زمانە نەتەوەیی یەکەیان لەنێوبەرێ، ئایینەکەیان بفەوتێنێ، زمان، ئایین و کەلتووری نەتەوەیی خۆیان بە سەرا بسەپێنێ. بۆیە، ئەم جۆرە داگیرکردنە، لە هەموو جۆرە داگیرکردنێکی دیکە، پڕ لە مەترسیترە. ئەو برینە قووڵانەی لە جەستەی نەتەوەکەی دەکا، جێگەکەی وا زوو ساڕێژ نابێتەوە. بەڵکوو،

ڕۆڵەکانی نەتەوەی بندەس، هەموو ژیانیان لە تاو ئازاری چەوساندنەوە و بندەسیی دەناڵێنن. بۆ نموونە: (فارس، عەرەب و تورک) هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، کوردستانیان داگیرکردووە، ئەوەی ئەوان بە کوردیان کردووە، هەرگیز لە بیر ناچێتەوە.
دیارە، لە کاتی داگیرکردنی جۆری یەکەمدا، سنووری نیشتمانەکان، هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە. بەڵام، لە شێوە داگیرکردنی دووەمدا، سنووری جوگرافیای نەتەوەیی، وردوردە دەگۆڕێ. چونکە، داگیرکەرەکە بیر لەوە دەکاتەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ڕۆڵەکانی نەتەوەی بندەس، بیر لە ئازادیی و سەربەخۆیی دەکەنەوە، خۆیان لە ژێردەسیی و کۆیلەیی ڕزگاردەکەن، وولاتەکەیان لەکیسدەچێ. لەبەرئەوە، بە هەموو توانایانەوە هەوڵدەدەن، شوێنە گرنگ و ناوچە ستراتیژییەکان، بە تەواویی لە خاکی نەتەوەی داگیرکراو دابڕن. لە ڕووی بەڕێوەبردن و کاروباری دەوڵەتەوە، بە ناوەندی دەوڵەتەکەیانەوە ببەسنەوە. دانیشتووانی ڕەسەنی ناوچەکە دەرەبەدەرکەن. هەروەها، خەڵکی سەر بە خۆیان، لە شوێنیان نیشتەجێکەن، تا بەرەبەرە، ئەو ناوچانە، بە تەواویی داگیردەکەن، تاپۆی مێژوویی لە خاوەنە ڕەسەنەکەی دەسەننەوە، هەوڵدەدەن، بەڵگەی « مێژوویی، جوگرافیایی و ئەتنۆگرافیایی »، بە هەزار فڕوفێڵ و درۆدەلەسە بۆ دروسکەن، تا بیسەلمێنن، ئەو ناوچانە هەر لە بنەڕەتدا، سەر بە خۆیان بوون.
بۆیە، هەمیشە ئەو سنوورە نەتەوەیی یانە، لە هەڵکشان و داکشاندا بوون و دەبن، لە کەمکردن و زیادبووندا بوون و دەبن. بەو پێیە، کارێکی زۆریش، لە ژمارە و چۆنێتی دانیشتووانی ناوچە و وولاتەکان دەکا. لە هەمان کاتیشدا، کارێکی یەکجار گەورە، لە زمانی نەتەوەیی دەکا. لەتویەتیدەکا، لاواز و بێهێزیدەکا.
بۆ نموونە: وەک لە کوردستانی مەزندا دەبینین، شاری « ئەسکەندەروون ... تاد »لە باکووری کوردستان، لە لایەن تورک، هەموو ناوچەکانی «هەمەدان، بەختیاریی، لوڕستان ... تاد » لە ڕۆژهەڵات، لە لایەن فارس، ناوچەکانی « موسڵ، کەرکووک، خانەقین ... تاد » لە باشوور، لە لایەن عەرەبی عێراقەوە قووتدراون و بە جارێ لە کوردستان دابڕاون.

هەموو ناوچەکانی خۆراوای کوردستان، لە لایەن عەرەبەکانی سووریاوە زەوتکراون و عەرەبێنراون.
لەبەرئەوە، کاتێ ئێمەی کورد دەمانەوێ، سنووری نیشتمانەکەمان دەسنیشانکەین، پێویستە، بۆ ئەو سەردەمانە بگەڕێینەوە، کە هێشتا، داگیرکەران نیشتمانەکەیان، دابەش نەکردبووین، بە قەیچی زۆرداریی، نەخشەی وولاتەکەمانیان پارچەپارچە نەکردبوو.
بە باوەڕی من، ئەو سنوورەی « شەرەفخانی بەدلیسی »، پێش چوار سەدە لەمەوبەر، بۆ کوردستانی دیاریکردووە، بە ڕاسترین بۆچوون و نەخشەی کوردستان دادەنرێ. چونکە، لەو کاتانەدا، ئەو جۆرە بەرنامە شۆڤێنیی و ڕەگەزپەرستانانە، بەو شێوەیەی ئەوڕۆ نەبووە. تا لە لایەکەوە، دان بە خاکی کوردستاندا نەنێن، وەک تورکەکان دەڵێن: کورد لە تورکیادا هەیە، بەڵام کوردستان نییە! لە لایەکی دیکەشەوە، تا لە خاکی نیشتمانەکەمان دابڕن و بە خاکەکەی خۆیانەوەی دادرون، وەک عەرەبەکانی « عێراق و سووریا » و « فارس »ەکانی ئێران دەیکەن.
بەپێی « شەرەفنامە »، سنووری سروشتیی کوردستان بەم شێوەیەیە: (سنوور و کەوشەنی وولاتی کوردان، کە ناوی کوردستانە، لە سەر لێواری زەریای «هورمز »ەوە «1» کە لە سەر کەناری زەریای هیند هەڵکەوتووە ـ دەسپێدەکا و لەوێوە بە خەتێکی ڕاست دەکشێ و دێت هەتا لە مەڵبەندی مەلاتیە «2» و مەرعەش «3» دەبڕێتەوە. وولاتی فارس «4» و عێراقی عەجەم و ئازربایجان و ئەرمەنستانی چکۆلە «5» و ئەرمەنستانی گەورە «6» دەکەونە لای باکووری ئەو خەتەوە. عێراقی عارەب «7» موسڵ و دیاربەکر دەبنە باشووری ئەو سنوورە.)«62، 29-30»
بەڵام دیارە، نەک هەر تەنیا ئەم سنوورە، وەک خۆی نەماوە، بەڵکوو، هەموو شتێ لە کوردستاندا گۆڕاوە. کوردستان، چەن جارێ لە نێوان داگیرکەراندا دابەشکراوە، سنوورە سروشتییەکەی، بەپێی سنووری ئەو ئیمپراتۆریا و دەوڵەتانەی کوردستانیان داگیر و دابەشکردووە، گۆڕاوە.
بۆ نموونە: ساڵی «1639»، دوای جەنگی « چاڵدێران »، بەشێکی بەر ئێرانی سەفەویی و بەشەکەی دیکەی بەر تورکیای عوسمانی کەوت.

هەروەها، دوای جەنگی یەکەمی جیهان، جارێکی دیکە کوردستان، بە سەر دەوڵەتەکانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »دا دابەشکرایەوە. لەبەرئەوە، لە نێوان دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، مشتومڕێکی زۆر، لە سەر کێشەی سنوور دروسبوو. پێبەپێی ئەو کێشە گەورەیەش، سنوورەکە بە شێوەیەکی بەردەوام لە گۆڕاندابووە. بۆیە، دانیشتووانی کوردستانیش، هەر لە جووڵان و کۆچوڕەوێکی بەردەوامدا بوون، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، کاری لە دابەشبوونی زمانی نەتەوەیی، بڵاوبوونەوە و توانای کردووە، زمانەکەی لاوازکردووە، دیالێکتە سەرەکییەکانی، لە یەکدی دوورخستۆتەوە، گرفتێکی زمانەوانیی وای هێناوەتەگۆڕێ، مەگەر هەر لە کورد و زمانی کوردیی ڕوویدابێ!
دەتوانین، بڵێین: لە دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریای مادەوە، کورد خۆشی لە ژیانی خۆی نەدیوە. زمان و ئایینەکەی خۆی لەدەسداوە. ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە تەواویی لە یەکدی دابڕاون، بەربەستی سنوور وەک دیوارێکی پۆلایین، تەنگی بە زمانی کوردیی هەڵچنیوە. دەلاقەیەکی گەورە، لە نێوان دیالێکتەکانیدا پەیدابووە. لە ئەنجامی پۆلێتیک و بەرنامەی شۆڤێنیی، ڕەگەزپەرستیی و فاشییانەی، دەستەی فەرمانڕەوایانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستانیشدا، بارودۆخێکی تایبەتیی وا لە کوردستاندا

---

«1» خەلیج فارسە .. تەنگەیەکی بە ناوی تەنگەی هورمز لێ هەیە.

«2» شارێکە لە مەڵبەندی: خەرپوت، لە کوردستانی باکوور.

«3» شارێکە لە باکووری حەڵەب و باشووری ئەنادۆڵ.

«4» مەڵبەندێکی گەورەیە کەوتۆتە باشووری ئێران و بنکەشی شیرازە.

«5» نیاز « کلیکیا »یە کە ئێستا « ئەدەنە »ی پێ دەڵێن.

«6» ئەو مەڵبەندەیە کەوا کەوتۆتە نێوان گۆلی وان و چیاکانی قەفقازەوە. پێتەختەکەی « ئاران »ە کە ئێستا « یەریوان »ی پێ دەگوترێ.

«7» مەڵبەندێکی گەورەیە و بریتییە لە بەغدا و بەسرا، لە لای باکوورەوە لە تکریت ڕا دەستپێدەکا و بە جەبەل حەمریندا دەڕوا و لە زەریای فارس و لە ڕێژگەی شەت ئەلعەرەب و ناوچەی حەسا دەبڕێتەوە.

سەریهەڵداوە، نەک هەر لە کوردستان خۆیدا، کورد بە کورد نامۆبووە، بەڵکوو، ڕۆڵەکانی کورد، چ بە شێوەی تاک و چ بە شێوەی کۆمەڵ، چ بە ئارەزووی خۆیان و چ بە زۆری زۆرداریی، بە شارەکانی هەر چوار دەوڵەتەکەدا بڵاوبوونەتەوە. پاشان، کۆچوڕەوی گەورە دەسپێکردووە، تا بەشێکی زۆر لە کورد پەرەوازەبوون، بە هەموو دەوڵەتەکانی ناوچەکە و جیهاندا پەرشوبڵاوبوونەتەوە. لەبەرئەوە، لە لایەکەوە ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە زمانەکەی خۆیان پچڕاون. لە لایەکی دیکەشەوە، لە ئەنجامی پرۆسێسی « تورکاندن، فارساندن و عەرەباندن »دا، ئەو سێ زمانە بیانییە لە کوردستاندا، دەسەویەخەی زمانی کوردیی بوون و بە هەموو توانایانەوە، هەوڵیانداوە، جێ بە زمانی کوردیی لەقکەن.
بە کوردیی و بە کوورتیی: لە ڕاستیدا، هەر نەتەوەیەک لە مێژوودا، وەک کوردی لێ بەسەربهاتایە، دوور نەبوو، ئەوڕۆ ناوی لە نێو ناواندا بمایە. بەڵام، سەرەڕای ئەو هەموو پەتپەتییەی بەسەربهاتووە، هێشتا، نەتەوەی کورد توانیوویەتی، بە چاکی پارێزگاریی، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی بکا.
بە شێوەیەکی گشتیی، ئەوڕۆ کورد، لەم ناوچە و وولاتانەدا دەژی: هەموو «گوند، شارۆکە، شارۆچکە و شارە ئاوەدانەکانی کوردستان »ی مەزن. شارە گەورەکانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا ». دەوڵەتە دەرودراوسێکانی ناوچەکە وەک:« لوبنان، ئوردون، میسر، یەمەن، ئیسرایل، پاکستان، ئەفگانستان ». لە کۆمارەکانی قەفقاز و دەوڵەتەکانی ناوەڕاستی ئاسیای وەک:« ئازربایجان، ئەرمینیا، گورجستان، کیرگیزیا، تورکمینستان، کازاخستان، ئوزبێکستان، تاجیکستان ». ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بە تایبەتیی « ڕووسیای فیدراڵ، چیک، سلۆڤاکیا، ڕۆمانیا، هەنگاریا ». هەموو دەوڵەوتەکانی ڕۆژاوای ئەورووپا، بە زۆریی لە « ئەڵمانیا، سوید، دانیمارک، بریتانیای گەورە، فرەنسا، ئیتالیا ». هەروەها لە هەر دوو کیشوەری ئەمێریکا و ئوستورالیا، ژمارەیەکی زۆری کوردی لێ دەژین.
لە بارەی دابەشکردنی نەتەوەی کوردەوە، بەپێی ئەو ناوچانەی، بە هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستانەوە بەسراونەتەوە، پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ »، بەم شێوەیە دابەشیکردووە: (ئەو ناوچانەی بە تورکیاوە بەسرانەوە،

« دیاربەکر، خەرپووت، مەلاتیێ، ئورفە، ماردین، ئەرزنجان، موش، وان، بەدلیس، خۆزات، ماردین، جزیر، ئەرزەرۆم و دەوروبەری » لە لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا، بە کوردستانی تورکیا دەناسرێن. ئەو ناوچە کوردییانەی بە ئێرانەوە گرێ دران، « مهاباد، سەقز، بانە، بۆکان، سنە، کرماشان و ناوچەکانی ڕۆژاوای گۆلی ورمێ و دەوروبەری » بە کوردستانی ئێران دەناسرێن. ئەو ناوچانەی کە بە عێراقەوە جووتباقە کران، بە ناوی کوردستانی عێراق دەناسرێن، ئەویش ئەمانەن : « مووسڵ، کەرکووک، هەولێر، سلێمانی، ڕەواندز، کۆیە، ئامێدی، زاخۆ، ئاکری، چیای شەنگار و دەوروبەری ». ئەو ناوچانەی « قامیشلی، خاسیج ـ حەسەکە، کورداغ، « ناوچەی ڕۆژهەلاتی سووریا »، بە سووریاوە گرێدران. )«81،37 ـ 38»

(لە یەکێتی سۆڤیەت، بە زۆری کوردەکان لە دەڤەری « قوونتاری چیای ئەلەگەزێ، دەڤەری ئەباران، تالین، ئیمیادزین، زانگیزۆر، دارا ئەلەگەزێ » لە ئەرمەنستان دەژین. هەروەها لە دەڤەری « لاچین،کەلبەجاڕ و کوتورلین » لە ئازربایجان و لە گورجستان لە « تەمازەل تفلیس » لە تورکمانستان لە هەر دوو دەڤەری « ماری و باگیری » دەژین. )«81،38»

(جگە لەو ناوچانە، کورد لە هێندێ جێگای دیکەش دەژین. لە ئۆزبێکستان « نزیکی تاشقەند و لە دەشتی برسێتیی » هەن. لە کیرگیزیا پارێزگای ئوشیسکایا و دەڤەری جەلال ئاباد »، لە کازاخستان « نەگەلەک دویر و بازاڕی ئەلمائاتا » هەن. )«81،38»

« مینۆڕسکی » دەربارەی بلاوبوونەوەی کورد و جوگرافیای کوردستان دەڵێ: (گەر ویستمان، هەر لە سەرەتای مێژووەوە، باسی نیشتمانی کوردەکان بکەین، ئەبێ بچینە بەشەکانی ڕۆژهەلاتی دوور و خوارووەوە. ئەم سێ ناوچەیەی خواروو، نیشتمانی کوردەکانن. زنجیرە چیا بەرزەکانی ئەرمینیا، کوردستانی تورکیا، چیاکانی ڕۆژاوای ئێران، بەم شێوەیە ئەبینین: ئێستە کوردەکان، لە خاکێکی فراواندا ئەژین، هەر لە سنووری تورکیا و فارس و کوردستانی عێراقەوە هەتا ئەگاتە ئارارات کە خاکیان لە سنووری ئێمە تێپەڕئەبێ و دێتە ناو قەفقاسمانەوە، کوردەکان لە هەموو زنجیرە چیاکانی ئەرمینیادا لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا ئەژین و سنووری

ژووروویان لە تورکیـادا لە پەنای ئەرز ڕۆمدا کۆتاییدێ. لە خوارووشدا کوردەکان دەسیان بە سەر ناوچەیەکی فراواندا گرتووە، هەتا ئەگاتە کۆتایی دەشتەکانی نێوان دوو ڕووبار، لە ڕۆژاواشەوە سنووریان ڕووباری فوراتە، یاخود بە شێوەیەکی وردتر قەرەسۆ، وە ئەوان لەم سنوورەدا نەوەستاون، بەڵکوو، ڕۆشتوون بۆ قووڵایی ئاسیای پچووک و تەنیا ناوچەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی سواسیـان داگیـر نەکـردووە، بەڵکوو، هەتا نزیکی قونیە لە کلیکیەدا کۆمەڵی جیاجیان هەیە، بەم شێوەیە ئەگەنە زەریای سپی ناوەڕاست.)«112،31-33»

بەو شێوەیە، بۆمان دەردەکەوێ، لە کۆندا، نیشتمانی کورد، گەلێ فراوانبووە. بەڵام، لە ئەنجامی هەموو ئەو جەنگە خوێناوییانەی، لە سەر خاکی کوردستان ڕوویانداوە، چ جەنگی کورد و داگیرکەران، چ جەنگی داگیرکەران لە نێو خۆیاندا بووبێ، وردەوردە، سنووری نیشتمانەکەمان تەنگبۆتەوە. هەروا، ناوچە گرنگ و ستراتیژییەکانمان لەدەسداوە، لە تاو هێرشی داگیرکەران، بۆ ئەوەی کورد خۆی لە « کوشتن، تواندنەوە و لەنێوچوون » بپارێزێ، بەرەبەرە، شوێنە دەشتاییەکانی بۆ داگیرکەران چۆڵکردووە. خۆشی بەرەو چیا سەختەکان هەڵکشاوە، تا چیا وەک سونبولی کوردی لێهاتووە. وەک « مینۆرسکی »ش دەڵێ:

(کورد و چیا لێک جیانابنەوە، هەر لەگەل دەشت دەسیپێکرد، ئیتر کوردەکان بەجێیدێڵن بۆ عەرەب و تورک، تا نزیکی زەریاچەی وانیش بۆ ئەرمەنییەکان.)«112،33» بۆیە، ڕۆژبەڕۆژ تا هاتووە و تا دێش، داگیرکردنەکە بەرفراوانتردەبێ، پانتایی خاکی کوردستانیش، کەمدەبێتەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، کارێکی ڕاستەوخۆی خراپی، لە « ژمارەی دانیشتووان، زاووزێ و زیادبوونی نەتەوەی کورد » کردووە. لە بەر دابڕان و لە یەکدی دوورکەوتنەوە، ناوچەی بەکارهێنانی زمانیش، بەرتەسکبۆتەوە و جیاوازیی نێوان دیالێکتەکانیش زیادیکردووە.

## 8. کورد و زمانی نەتەوەیی :

ئێستە، گەر لەو باسانە گەڕێین، ئاوڕێ لە نەتەوە و زمانەکەی خۆمان بدەینەوە، بارودۆخ و شێوەیەکی زۆر دەگمەن و تایبەتیی دەبینین. با بزانین، چۆن؟ ئاشکرایە، نەتەوەی کورد هەر لە کۆنەوە، خاوەنی نیشتمانی تایبەتیی خۆی بووە، چواردە دەوڵەتی نەتەوەیی و سیوپێنج میرنشینی، گەورە و گچکەی جیاوازی، لە ناوەوە ودەرەوەی کوردستان دامەزراندووە، ئایینێکی دیاریکراوی هەبووە، بە زمانێکی تایبەتیی ئاخافتنیکردووە. کەچی ئەورۆ، زۆربەی ئەو شتانەی لەدەسداوە. سەرەڕای ئەوەش، هێندێ ئەڵقە هەن، لە زنجیرەی مێژووی ئەم نەتەوەیەدا، بە تەواویی دیار نین و گومن، یا شێوێندراون و تێکچوون، یا تەمومژێکی سەیر، باڵی بەسەرداکێشاون، زمانەکەش لە هێندێ ڕووەوە تا ئێستە، بە تەواویی ڕوون نەبۆتەوە!

لە ڕاستیدا، تا ئێستە بە بەڵگەی زانستانە و بە تەواویی، بۆمان ڕوون نەبۆتەوە، نەتەوەی کورد پێش زایین، بە چ زمانێ قسەی کردووە؟ ئایا، ئەم زمانەی ئەورۆ، ئێمەی کورد پێی دەدوێین، هەر بەردەوامیی ئەو زمانەی پێش زایینە، کە مادەکان پێی دواون؟ ئایا، ئێمەی کورد، زمانی نووسین و خوێندنەوەمان هەبووە، یا هەر زمانی ئاخافتنمان هەبووە؟ گەر زمانی نووسینمان هەبووە، بە چ پیتێ نووسیومانە؟ گەر پێش زایین، زمانی نووسینمان نەبووە، ئایا، کورد دوای زایین، کەی دەسی بە خوێندنەوە و نووسین کردووە؟ چ جۆرە ئەلفوبێیەکی بەکارهێناوە؟

بۆ ئەوەی، پتر مەبەسەکەمان ڕوونکەینەوە، لێرەدا نموونەیەک، لە سەر نەتەوەی عەرەب دێنینەوە. عەرەبەکان، پێش زایین و لە سەردەمی نەزانیندا، زمانی نەتەوەیی ئاخافتن و ئەلفوبێی تایبەتیی خۆیان هەبووە. جا، ئیدی ئەوانیش، لە چ نەتەوەیەکی دیکەوە وەریانگرتووە، ئەوەیان گرنگ نییە. نزیکەی هەر بەو زمانەش قسەیانکردووە، کە ئەورۆ پێی دەدوێن. بەرهەمەکانیشیان، هەر بەو ئەلفوبێیە نووسیوەتەوە، کە ئەورۆ بەکاریدێنن. هۆنراوەکانی سەردەمی نەزانین و « حەوت هەڵواسراوە

هەڵبژاردەکان » ، گەواهیی قسەکانمان دەدەن. دوای ئەوەی ئایینی ئیسلامیش پەیدابووە و قورئان هاتۆتەخوارێ، دەقەکانی قورئانیشیان، هەر بە هەمان ئەلفوبێ و زمانی نەتەوەیی نووسیوەتەوە، کە عەرەبەکانی پێش زایین بەکاریانهێناوە و تا ئەورۆش بەکاریدێنن.
جا، گەر ئێستە بمانەوێ، لە بەر ڕۆشنایی ئەو نموونەیەی سەرەوەدا، وەڵامی ئەو پرسیارانەی پێشوتر بدەینەوە، دەبێ، لەو ڕۆژەوە مێژووی ناوچەکە، بۆ کۆمەڵگەی مرۆ ساغبۆتەوە، لێکۆڵینەوەیەکی درێژیی وردی مێژوویی و زمانەوانیی زانستانە بکەین. ئەو لێکۆڵینەوەیە، لە لایەکەوە، لە بنجوبناوانی نەتەوەی کورد و زمانی کوردیی بکۆڵێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە ڕەگوڕیشەی نەتەوەکانی دیکەی ناوچەکە و زمانەکانیان بدوێ، تا بزانین، پێوەندیی نێوانیان چۆنبووە؟ کامیان، پتر کاری لەوی دیکەیان کردووە؟ هەر چەندە، من بۆ خۆم، بە تەنیا باڵ، ئەم کارەم پێ هەڵ ناسوڕێ و لەم بوارەشدا پسپۆڕ نیم. جگە لەوەی، لەم نووسینە کورتەشدا، ماوەی ئەوەمان نییە، هێندەی توانامان هەیە، ئەو کارە بە ئەنجامگەیەنین. بەڵام، لێرەدا ناچاردەبین، سەر بە کۆشی ئارشیڤی مێژوودا بکەین، تا کەمێ دەربارەی ڕەچەڵەکی کورد و زمانەکەمان بدوێین.
پێشەکی دەبێ، ئەوە باش بزانین، هیچ شتێ لەم جیهانەدا، بەقەدەر سەرچاوەی، مێژووی تێکڕای کۆمەڵگەی مرۆ، تاریکونووتەک و تەمومژاویی نییە. تا ئێستە، هەموو ئەو زانیارییانەی، دەربارەی ڕەگوڕیشەی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆ لە بەردەسدان، هێندێکی لە بەر ڕۆشنایی، ئەو کەرەسە جیاواز و پاشماوە بەردین و مسینانەی، کۆمەڵگە هەرە کۆنەکانی مرۆدا هەڵسەنگێنراون. هێندێکی دیکەشیان، لە ئەنجامی کۆکردنەوەی ئێسکە جیاوازەکانی جەستەی مرۆڤ و هێندێ ئاژەڵی دیاریکراودا دەسنیشانکراون، کە لە قوژبنە تاریکەکانی ئەشکەوت و لە ژێر زەویدا، زاناکانی ئارکیۆلۆژیا دۆزیویانەتەوە. دیارە، بێ ئەو جۆرە گەڕان، هەڵکۆڵین و لێکۆڵینەوانە، هیچ جۆرە سەرئەنجامێکمان دەس ناکەوێ. ئەو هەموو ئێسک، کەلوپەل و شوێنەوارانەی، نزیکەی دوو هەزار ساڵ پێش زایین و لە ماوەی شارستانیی یەکەمی کۆمەڵگەی مرۆدا دۆزراونەتەوە،

پاشان، تاقیکراونەتەوە و لێکۆڵینەوەی وردی زانستانەیان لە سەر کراوە، چەن شتێکمان بۆ ڕووندەکەنەوە. ئەو زانیارییانەی تا ئەورۆ، دەربارەی پەیدابوونی مرۆڤ لە بەردەسدان، زیاتر لە خولگەی هەڵسەنگاندن و خەملاندنا دادەنرێن.
هەر وەک، لە جێگەیەکی دیکەی ئەم نووسینەدا، ئاماژەمان بۆ کرد، هێندێ لە زاناکان پێیان وایە، ماوەی دووسەدهەزار ساڵ دەبێ، مرۆڤ پەیدابووە. هێندێکی دیکەش دەڵێن: نزیکەی نیومیلیۆن ساڵ پترە، مرۆڤ لە سەر زەوی دەژی. لەبەرئەوەی، وێنەکان زۆر ڕوون نین، کێ دەتوانێ، ڕیشەی ڕەگەزی کۆمەڵگەی مرۆ، بە تەواویی ڕوونکاتەوە؟! چ زمانێ دەتوانێ، بە تەواویی باسی ئەو سەردەمانە بکا؟! ئایا، کام زانای ئارکیۆلۆژیا، کام ئامێری زانستیی، توانای ئەوەی هەیە، هەر لە سەرەتای درووسبوونی ئەم جیهانەوە، تا ئەورۆ، ئەو خاکوخۆڵەی لە هەر بستە زەوییەکدا، لەگەڵ ئێسکوپروسکی میلیاران مرۆڤدا تێکەڵبووە، لە یەکدییان جیاکاتەوە؟! بە تایبەتیی، گەر زانیمان، خوێندن و خوێندنەوە، لە نێو کۆمەڵگەی مرۆدا، دەوروبەری شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدابووە؟!
لەبەرئەوە، هەر نەتەوەیەک بیەوێ، سنووری نیشتمانەکەی باووباپیری خۆی دەسنیشانکا، ڕەگەزی تایبەتیی خۆی بناسێ، یا لە ڕەگەزی نەتەوەیەکی دیکە بکۆڵێتەوە، جگە لەوەی دەبێ، بە دوای کەرەسەی کۆندا بگەڕێ، پاشان کۆیانکاتەوە، لێیان بکۆڵێتەوە، بەپێی بۆچوونی خۆی، بۆ سەردەمێکی دیاریکراوی مێژوویی یان بگێڕێتەوە، ئەگینا، بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ، بە بەڵگەی ڕوون و زانستانە، هیچ شتێ بسەلمێنێ و بە ئامانجەکانی خۆی بگا. بۆیە، هەموو ئەو زانیارییانەی تا ئێستە هەن، تەنیا لە خانەی قەبلاندنا جێگەیاندەبێتەوە. دەتوانین، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێین: زۆربەی ئەو زانیارییانەی، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، لە سەر کۆمەڵگە جیاجیاکانی مرۆ تۆمارکراون، لە دووتوێی پەرتووکەکاندا پارێزراون، زۆربەی زۆریان، جێگەی گومانن! لەبەرئەوە، چ مێژوونووسانی کورد و چ بیانیی، هیچیان ناتوانن، بەو شێوەیەی دڵیان ئاو بخواتەوە، مێژوویەکی تێروتەسەل و تەواویی، کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، یا سەرجەم

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیمان بۆ بنووسنەوە، بەڵکوو، ئەوەی هەیە، لە سەداسەد هەمووی ڕاست نییە. هێندێکی لە ئەفسانە نەبێ، لە هیچی دیکە ناچێ! هێندێ گەل و نەتەوەش، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن، ڕەچەڵەکێکی ڕەسەنیان هەیە، کۆمەڵێ نووسەری بەکرێگیراویان ڕاگرتووە، ئەوانیش بە سەدان پەرتووکی درۆیان بۆ ڕەشکردونەتەوە! لەگەڵ ئەوشدا، دەربارەی ڕەگەزی مرۆ بە گشتیی و ڕەچەڵەکی کورد بە تایبەتیی، لە « 3500 ـ 4000 » ساڵ پێش زایین زیاتر ناتوانین، لەو زەریا قووڵە بێبنەی مێژوودا مەلە بکەین.
هەمووومان دەزانین، کۆچوڕەوی گەلانی ئاریی « هیندۆ ـ ئەوروپایی » لە مێژوودا، لە شێوەی چەن شەپۆلێکی جیاوازا، لە سەرەتای سەدەی دەیەم و نۆیەمی پێش زایینەوە، لە چیاکانی قەفقازەوە دەسپێکردووە. سەرەتا، لە چیاکانی زاگرۆس گیرساونەتەوە. پاشان، دەستەدەستە و پۆلپۆل، بە ڕۆژهەلات و ڕۆژاوادا، بە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی زاناکانی مێژوو، لەم بارەیەوە بە ئەنجامیانگەیاندووە، کۆچوڕەوی بە کۆمەڵی گەلانی ئاریی، لە دوو قۆناغی جیاوازدا ڕوویداوە. بەو پێیە، گەلانی ئاریی، بە سەر دوو دەستەی جیاوازدا دابەشدەکرێن :
دەستەی یەکەم:گەلانی زاگرۆس. ئەمانەش، خۆیان لە گەلانی « لۆلۆ یا لۆلۆم، گۆتیی، کاسای یا کۆسیی یا کۆشۆ، خالدیی ـ یا ئۆراتۆ، سۆباریی » دا دەبینن.
دەستەی دووەم: میدییەکان و بەردەسەکانیان. ئەمانیش، لە گەلانی « مید، نایریی ـ نەهریی، کاردۆخیی » پێکهاتوون.
هێندێ لە زاناکانی مێژوو، لەو باوەڕەدان، ناوی ئەم گەلە جیاوازانە، هەمووی ناوی کۆنی کورد بووە، هەر گەلەی یا هەر نووسەرێ، لە ناوچەیەکی جیاوازی جوگرافیایی و لە سەردەمێکی مێژوویی جیاوازا، بە یەکێ لەو ناوانە باسیانکردوون و لە پەرتووکە مێژوویی یەکانی خۆیاندا، تۆماریانکردوون. زانای مێژوونووس « ئەمین زەکی » ، دەڵێ:
(کوردستان، نیشتمانی یەکەمی، دەستەی دووەمی مرۆڤ بووە. بەپێی ڕووداوە مێژوویی یەکان، لەوێوە بە لاکانی دیکەی جیهاندا بڵاوبوونەوەتەوە. هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە، گەلانی زاگرۆسی لێ

نیشتەجێبوون، کە لە گەلانی « لۆلۆ، گۆتیی، کاسیی، خالدیی ـ کالدیی و سوبارو ـ هوریی » پێکهاتبوون. )«58،97 ـ 59 »
بە کورتییەکەی، کورد لە نەوەی دەستەی یەکەمیێ، یا ڕاستەوخۆ لە نەوەی دەستەی دووەمیێ، بۆمان دەردەکەوێ: کورد لە ناوچەکەدا، نەتەوەیەکی زۆر کۆنە. بەڵام، ئەم دید و بۆچوونە، پێویستی بە بەڵگەی مێژوویی و لێکۆڵینەوە هەیە. بۆ ئەوەی، ئەو ڕاستییانەش بسەلمێنین، مێژوویەکی نەتەوەیی بۆ هەر نەتەوەیەک دیاریکەین، هێندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، پەنا بۆ بەر سێ فاکتەری گرنگ دەبەن،(خوێن، زمان و نیشتمان)«58،97»
هەر چەندە، مەرجیش نییە، ئەو سێ فاکتەرە بە زۆریی، لە یەک ڕەگەزی دیاریکراودا کۆبنەوە،(بەڵام، بەهێزترین و دەرکەوتوترینیان، فاکتەری زمانە.)«58،97 » بۆیە، ئێمەش لێرەدا، لە بەر ڕووناکیی سەرچاوە مێژوویی یەکاندا، بەگوێرەی توانا هەوڵدەدەین،، سەرەتا، شتێ دەربارەی ئایینە کۆنەکانی کورد پێش چاوخەین. پاشان، بە کورتیی، کەمێ لە مێژووی کورد و زمانەکەی بدوێین.
سەرچاوە مێژوویی یەکان، پیشانمان دەدەن، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە، ئەو سەرزەوییەی ئەوڕۆ، کوردی لە سەر دەژی، چۆڵ نەبووە و ئاوەدانبووە. زۆربەی مێژوونووسان، لەو باوەڕەدان، لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەند بە گشتیی و لە کوردستان بە تایبەتیی، لە چەن گەلێکی دیاریکراو، پتری لێ نەژیاوە. هەر یەکێ لەو گەلانەش، زمانێکی تایبەتییان هەبووە. لەو بارەیەوە دوکتۆر « سپایزەر »، دەڵێ:
(هەر یەکێ لەو چوار گەلەی « زاگرۆس »: لۆلۆ، گۆتیی، کاسایی و سۆباریی یا هوریی، زمانی تایبەتیی خۆیان هەبووە و لە یەکدی جیاواز بوون. بەڵام، هێندێ ناو لەو زمانانەدا، نیشانەی ئەوەن، زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون)«297،97» ڕۆژهەڵاتناس و زاناکان، لە سەر ڕەچەڵەکی ئەم زمانانە، دوو جۆر بۆچوونیان هەیە: هێندێکیان دەڵێن:(زمانی ئەم چوار گەلە، سەر بە زمانە ئارییەکان « ئارییەکانی ئێران » بوون.) بەڵام، هێندێکی دیکەشیان، دەڵێن:(لە کۆمەڵی زمانە قەفقازییەکان بوون.)
«297،97» ئەم گروپەشیان بە « زمانی ئاریی کۆن » نێوزەدکردووە.

تا ئێستە، هیچ جۆرە زانیارییەکی تەواومان، لە سەر ئەم گروپە زمانە ئارییە، لە بەردەسا نییە. چونکە، بەڵگەی نووسراو یا هەڵکەنراو، لە سەر ئەم زمانانە کۆنانە نەدۆزراونەتەوە. هەر چەندە ناکرێ، بە هیچ جۆرێ، دەرگەی پاشەڕۆژ، بە ڕووی توێژینەوەی زانستانەدا داخرێ، بەڵام، تازە لەوەش ناچێ، هیچ جۆرە بەڵگەیەکمان لەو بارەیەوە دەسکەوێ. لەبەرئەوەی لەو سەردەمانەدا، خوێندن و نووسین نەبووە، بەڵکوو، (مێژووی فێربوونی خوێندنەوە و نووسین، لە لایەن گەلانی ئارییەوە تازەیە، لە ساڵی 1400 پ.ز. تێپەڕ ناکا.)«298،97» بەڵام، (بە ڕای زۆربەی لێکۆڵەران، کوردەکان بە پاشماوەی مادەکان دادەنرێن. مادەکانیش، لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا توانییان، دەس بە سەر ناوچەیەکی گەورە و فراواندا بگرن، دەسەڵات بە سەر ئێران و بەشی ژووورووی عێراق و چەن بەشێ لە ئاسیای ناوەڕاستا، هەتا دەگاتە ڕووباری « خالس ـ قزل ئەرمەق»ەوە پەیداکەن. هەر بە هۆی ئەو داردەستە سیاسییەشەوە توانییان، زمان و ئایینی خۆیان، بە سەر دانیشتووانی کۆنی چیای زاگرۆسدا بسەپێنن.)«17،58»

دەربارەی دەستەی دووەمی زمانە ئارییەکان، زۆربەی ڕۆژهەلاتناسەکان، ڕەچەڵەکی کورد بۆ سەر ئەوان دەگێڕنەوە، بە باپیرە گەورەی کوردەکانی ئەورۆیان دادەنێن و دەڵێن: (لە میدییەکان و لقەکانیان پێکهاتوون.) «298،97»

هەر چەندە، لەو بارەیەشەوە، تا ئێستە، هیچ شتێ نەدۆزراوەتەوە، زانیارییەکی ئەوتۆ، لە سەر زمانی میدییەکان و دیالێکتە جیاوازەکانیان، لای شارەزایانی زمان کەڵەکە نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو زمانەی لە زانستی زمانەوانیدا، بە زمانی مادیی ناوی ڕۆیشتووە، تا ئێستە ڕوون نییە، چ جۆرە زمانێ بووە. چونکە، تا ئەورۆ هیچ جۆرە شتێ، بەو زمانە دەس نەکەوتووە، پشکنین و گەڕان، بە دوای کۆنینەکانی ئیمپراتۆریای مادیشدا، لە ناوچەکانی مەڵبەندی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریاکەدا، وەک پێویست نەکراوە و هیچ دەکۆمێنتێ لەو بارەیەوە نەدۆزراوەتەوە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی گومانی تێدا نییە، زمانی مادەکان، زمانێکی

تایبەتیی کۆنی گەلانی ئەو سەردەمەبووە. لە سەردەمی دەسەڵاتی مادەکانیشدا، چەن گەلێکی دیکە هەبوون، جگە لەوەی، زمانی ماد وەک زمانی ڕەسمیی ئیمپراتۆریای ماد بەکارهاتووە، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان قسەیانکردووە. (پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێ، کە خودی زمانی مادیی، بە سەر هەموو ئەو زمانانەی پێش دامەزراندنی ئیمپراتۆریی « ماد » لە خاکی « ماد »ا برەویان هەبوو، زاڵبووە، بۆیە تا ئەو ڕۆژەی زمانی مادیی ساغدەبێتەوە، لە ڕیشەی زمانانی گۆتیی، هووریی « خوریی »، ئۆراتۆیی، کاسیی « کاشیی » گەلێ ووشەی تێدا بەدیدەکرێ، کە شکڵی ووشەی «مادی »یان بە خۆوەگرتووە و ئێستە لە ناو لەهجە و بن لەهجەکانی زمانی کوردییدا دێن و دەچن)«70،50 ـ 51»

بەڵام، زاناکانی زمان، زمانی کوردیی بۆ سەر زمانی میدییەکان دەگێڕنەوە. بەڵگەشیان بۆ ئەمە، تەنیا پەرتووکەکەی ئاڤێستای زەردەشتە. هەر چەندە، بەپێی نەخشەی جوگرافیای نیشتمانی کورد، زەردەشتی پەیامبەر، لە کوردستان لەدایکبووە، (زەردەشت لە ساڵی660 پ.ز.دا، لە شاری ورمێ لەدایکبووە و هەر لەوێش گەورەبووە. لە سەدەی حەوتەمی پ.ز.دا بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتووە. لەوێ لە شاری « بەڵخ »، لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، «گوشتاسب » پاشای ئەو شارە، بڕوای پێ هێناوە و لەوێ جێگیربووە. لە تەمەنی حەفتاوحەوت ساڵیدا، پاش ئەوەی لە نووسینی ئاڤێستا بۆتەوە، کۆچیدواییکردووە. واتە: لە583 پ.ز.دا مردووە.)«33،58»

بەڵام، نە لە هیچ شوێنێکدا نووسراوە، زەردەشت کوردبووە، نە زەردەشت خۆشی باسیکردووە، کە کوردبووە! لەبەرئەوە، ئەم شتانە، پتر لە خانەی میتۆلۆژیای کوردیدا جێگایاندەبێتەوە!

لەو بارەیەوە، د. « جەمال نەبەز » دەڵێ: (هەتا ئێستە لە نێو کورددا، ئایینێکی گشتیی وا پەیدانەبووە، کە کتێبە پیرۆزەکەی بە زمانی کوردیی نووسرابێتەوە و بووبێتە سەرمەشق بۆ زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیی پاشەڕۆژ. هەر چەندە گەلێ بەڵگە هەن، بۆ ئەوەی کە زەردەشت پەیامبەر و داهێنەری ئایینی مەزدایەسنی لە ناوچەی مادەکاندا « واتا کوردستانی ئەمڕۆ » لەدایکبووبێ و بە زمانی خەڵکی ئەو شوێنەش قسەیکردبێ، بەڵام

هیچ بەڵگەیەک بۆ ئەوە نییە، کە کتێبی « ئاڤێستا » بە تەواوەتی بە زمانی مادەکانی ئەو سەردەمە نووسرابێتەوە، یا چەن سەدەیەک پاش مردنی زەردەشت خۆی نەنووسرابێتەوە، گەر چی واش باوە، کە گوایە « گاتاکان » لە زمانی زەردەشت خۆیەوە بیستراون. جا هەر چەندە، پێوەندیی زمانی ئاڤێستا و کوردیی ئەمڕۆ، لە باری زمانەوانییەوە، شتێکە ئینکار ناکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا، پیاو ناتوانێ بڵێ، ئەو زمانە کە کتێبی ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە، کوتومت پاشماوەی زمانی مادەکان بووە. یا بە ووتەیەکی دی « کوردیی نێوەڕاست » بووە. ئەوەش لە کاتێکدا گەر بتوانین، زمانی مادەکان بە « کوردیی کۆن » و کوردیی ئەمڕۆش بە « کوردیی نوێ » بدەینەقەڵەم. دیارە ئەم باسە باسێکی یەکجار فراوان و قووڵە و جێی ئێرە نییە. بەڵام ئەوەی دانی پێدا بنرێ ئەوەیە، فارسەکان پاش مادەکان بە ماوەیەکی زۆر، ئایینی زەردەشتیان وەرگرت. گەرچی کوردەکان خۆشیان لە سەرەتاوە، بەربەرەکانێی ئایینی زەردەشتیان زۆر کرد. بەڵام هێشتا بەر لە فارسەکان بووبوونە زەردەشتی. فارسەکان لە زەمانی شاپووری دووەمدا، ئایینی زەردەشتییان کردە ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت. بێجگە لەوەش دەستکاریکردنی ئایینی زەردەشتی و گۆڕینی و قەڵبکردنی بیروباوەڕەکە لە لایەن فارسەکانەوە، شتێکە مێژوونووسەکان و ئەوانەی خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەم ئایینە بوون، تەنانەت هێندێ لە زاناکانی فارس خۆشیان، بە ئاشکرا دانی پێدا دەنێن. هەرچی جۆرێ بێ، ئایینی زەردەشتیی بە تەواویی لە نێو کوردەکاندا نەچەسپیبوو، کە سەرکردایەتیی ئەو ئایینە کەوتە دەست فارسەکان و بە شێوەیەک کە بە دڵی کاربەدەسەکانیان بوو، خرایەڕوو. کە ئایینی ئیسلامیش لە دەوروبەری 639 ز.دا هاتە کوردستانەوە، بە ماوەیەکی کەم ئایینی زەردەشتی لە هەموو کوردستان و هەموو ئێراندا لەنێوبرد و کتێبە پیرۆزەکەی کە قورئانە و بە عەرەبی نووسراوەتەوە، بە تەواویی جێی ئاڤێستای گرتەوە، کوردەکان هەر چەندە لە سەرەتاوە، بەربەرەکانێی ئەم ئایینەشیان کرد، بەڵام لە ئەنجامدا و لە بەر گەلێک هۆ، بە زۆری بوونە موسوڵمان و دەستیانکرد بە خزمەتکردنی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبیی. ئەوانەی کە لە سەر ئایینە کۆنەکانی

کورد مانەوە، وەک ئێزدییەکان، هەلێکی وایان بۆ نەڕەخسا، کە ئایینەکەیان بکەنە ئایینێکی گشتیی.) «10-9،23»
هەروەها، د. « نەبەز »، لە شوێنێکی دیکەی پەرتووکەکەیدا، لەو بارەیەوە دەڵێ: (کتێبی « ئاڤێستا »، چەن سەدەیەک پاش مردنی زەردەشت خۆی نووسراوەتەوە و دوایی لە لایەن کەسانێکەوە کۆکراوەتەوە، کە هەموویان خەڵکی ناوچەی مادەکان نەبوون. هەر چەندە، گوایە « گاتاکان »، بەشێکیان سروودی زەردەشت خۆین، بەڵام بۆ ئەوەش، هیچ بەڵگەیەکی بنجبڕ بە دەستەوە نییە. جا هەر چەندە، ئەو زمانەی کە « ئاڤێستا »ی پێ نووسراوەتەوە، فارسیی نییە و زمانێکی تایبەتییە و بە زمانی ئاڤێستا نێوی ڕۆیشتووە، ئەمجا لەگەڵ ئەوەشدا، کە بەشێک لە زمانی ئاڤێستا لە هێندێ ڕووەوە، بە تایبەتی لە باری لێکسیکۆلۆژییەوە، لە کوردیی ئەمڕۆ دەچێ، بەڵام دیسانەوە ئەمە بەڵگە نییە، بۆ ئەوەی کە ئاڤێستا، هەمووی کوردیی کۆنە. بە بیروڕای من، زەردەشت جۆتکارێکی خەڵکی ناوچەی ماد بووە و هەر لە نێو خەڵکی وڵاتەکەی خۆیدا، بیروباوەڕەکەی خۆی بڵاوکردۆتەوە. بەڵام پاش ئەوەی، لە لایەن مادە کۆچەرەکانەوە « بەشێکی زۆری کوردی ئەو دەمە » بەربەرەکانی کراوە و لە وڵات دەربەڕێنراوە، چووە بۆ ناوچەکانی دی ئێران و ئایینەکەی لەوێدا بڵاوکردۆتەوە و پاشەجار ئەشکانییەکان «150-224» قسەکانیان کۆکردۆتەوە. دوای ئەوانیش ساسانییەکان «224-652» جارێکی دی کۆیانکردۆتەوە.
دیارە ئەشکانییەکانیش و ساسانییەکانیش، هەر یەکەیان تا ڕادەیەکی زۆر شێوەی زمانی ئەو کاتەی خۆیان، بە سەر زمانی بنەڕەتیی ئاڤێستادا بڕیوە و تێکەڵیانکردووە، بەڵام وا دیارە لەبەرئەوەی کە ئایینی زەردەشت بە زمانی مادەکان بووە، نەیانتوانیوە، زمانی مادەکان بە جارێ لە ئاڤێستا لابەرن و زمانەکانی خۆیان لە جێی ئەو دابنێن. بۆیە ناچاربوون، هێندێ لەو زمانەی کە زەردەشت ئایینەکەی پێ بڵاوکردووەتەوە، تێکەڵ بە زمانەکانی خۆیان بکەن. بە کورتیی لەوە زمانێکی مادیی ـ ئەشکانیی ـ ساسانیی تێکەڵ پەیدابووە و وردەوردە زمانەکانی دی ئێرانیی تێکەڵبووە و بووەتە ئەو زمانەی کە پێی دەڵێن « ئاڤێستا ».)«94-93،23»

جگە لەوەی، کۆمەڵێ لە زانا و ڕۆژهەڵاتناسەکانی دیکەش، ئەم دید و بۆچوونانە پەسەنددەکەن. بۆ نموونە: « دارمیستیتێر »، دەڵێ: (پەرتووکی ئاڤێستای زەردەشت، بە زمانی میدییەکان نووسراوە.)«298،97»
« مینۆرسکی » دەڵێ: (هەر لێکۆڵینەوەیەک لەمەڕ کورد و زمانی کوردیدا، دەبێ لە سەر بنەڕەتی ماد وزمانی مادی پێکبێ.)«16، 7-8»
هەروەها، « تۆفیق وەهبی »ش دەڵێ: (ئەگەر چی لەمەڕ زمانی مادەکانەوە، شتێکی زۆرمان بە دەستەوە نییە، بەڵام ماکەکەی لە ئاڤێستادا، بەرچاو دەکەوێ. جا، بە دڵنیایی یەوە دەڵێین: زمانی مادیی بناغە و هەوێنی گشت ئەو زمانانەیە، کە ئێمە ئەورۆ پێیان دەڵێین: زمانە ئێرانییەکانی سەر بە پۆلی باکووریی - باشووریی.
لە لایەکی تریشەوە، زماناسەکان بە تێکڕایی، لە سەر ئەوە سوورن، کە زمانی کوردیی سەر بە کۆمەڵە زمانەکانی باکووریی - باشوورەییە. زمانی ئاریایی کۆن و ئاڤێستایی و کوردیی کۆن و مادیی، ڕێیان بۆ زمانی کوردیی نوێ، تەخت و خۆشکردووە و پێشڕەو و پێشەنگی وین.)«16،24»
بەڵام، لە ڕاستیدا، تا ئێستە، بە تەواویی زمانی میدییەکان، بۆ کەس ساغ نەبۆتەوە، بۆ ئەوەی، بەراوردێ لە نێوان هەر دوو زمانی ئاڤێستا و میدییەکاندا بکەین، تا بزانین، لە ڕووی گرامەر و ووشە لەیەکچووەکانەوە، تا چەن لە یەکدییەوە نزیکن! هەر چەندە، هێندێ زانا، مێژوونووس، شارەزایانی زمانی کوردیی و زمانە ئێرانییە کۆنەکانی دیکە، وەک « ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی و محەمەد ئەمین هەورامانیی ... تاد » هێندێ بەراوردیان لە نێوان زمانی کوردیی ئەورۆ و زمانی ئاڤێستادا کردووە، چەن نموونەیەکیشیان هێناوەتەوە و دەڵێن: زمانی کوردیی ئێستە، بە بەراوردکردن لەگەڵ زمانی فارسیدا، لە ئاڤێستاوە نزیکترە. بەڵام هێشتا ئەو کارە، بە کارێکی زانستانەی تەواو دانانرێ. جگە لەوەی کاتێ (لە ساڵی331 پ.ز.دا، ئەسکەندەری مەکەدۆنی لە شەڕی ئەربێلای بە ناویانگدا، بە سەر دارای سێیەمدا زاڵبوو، کۆتایی بە دەوڵەتی هەخامەنشیی هێنا.)«23،58» پەلاماری میدیای دا، دەسی بە سەر هەموو پەرتووکخانە گەورەکانی شای ئەخمینییەکاندا گرت و هەموو پەرتووکەکانی

سوتان. له ئەنجامی ئەو کارەشدا، گەورەترین زیان له ئاڤێستا و بەشە جیاوازەکانی کەوت. لەو بارەیەوە « مەسعوود محەمەد »، دەڵێ:(جگە لە چەند بەشێکی کەمی نەبێ، کە هەمووی 83 000 ووشە بوون، ئەوانی دیکەی لە دەس سوتاندن قوتار نەبوون، ئەو بەشانەی سووتابووشن، لە نێو سنگی نەوە لە دوای نەوەی دەسوپێوەند و پیاوە ئایینییەکاندا مابوونەوە، تا لە کۆتایی فەرمانڕەوایی سلوکییەکاندا... لە دەورووبەری ساڵی147پ.ز دا، جارێکی دیکە ئەو بەشانەی نووسرانەوە.)«15,108»
« زوبێر ئیسماعیل »یش دەڵێ:(لە سەردەمی پارتەکاندا، « ئەسکەندەری مەکەدۆنی » لە331ـ 323 پ.ز.دا، هێندێکی وەرگێڕایە سەر زمانی یۆنانیی و پاشان هەمووی سووتاندن. پاشان لە سەردەمی ساسانییەکاندا کۆکرایەوە و نووسرایەوە. « ئەردەشێری پاپاکان » هات و ئایینی زەردەشتی کرد بە ئایینی ووڵات و دەوڵەتی ساسانی.)«53،58 » لە سەردەمی ساسانییەکاندا، ئەردەشێری پاپەکان « 241ـ 225 » پ.ز.(ناوچەی پارتەکانی وەدەست دەخست، کارنامەیەکی هەرتەخشیری پاپەکانیشی ڕێکخست و بڵاویکردەوە. هەر لەو پەرتووکە نیوە مێژوویی و نیوە چیرۆکییەی خۆیدا، بە ئاشکرایی و تێرادیویی، دوو نێوی ماد و کوردی بە یەک نەتەوە دێنێتە بەرچاو و ڕادەگەیەنێ. بە لانی کەمەوە، تا چەرخی شەشەمی زایینی، کورد و ماد هەر وەک یەک نەتەوە نێو براون.
لە جێیەک، لە کتێبی کارنامەکەدا کە بە زمانی پەهلەوی « فارسی ناونجیی » نووسراوە و لە لایەن ئەردەشێرەوە شیکراوەتەوە، هەڵمەت و هێرش بۆ سەر مادەکان، بەو چەشنەی ڕاگەیەندراوە: " ئەردەشێری پاپەکان، پاش کوشتنی ئەردەوانی پێنجەم ـ پاشای پارتەکان ـ قۆشەنێکی قورس و گەورەی لە زابول وەپێکهێنا و ڕۆیشت بۆ شەڕ لەگەڵ کوردان Kurdan ـ پاشای مادەکان ـ " کارنامەکە هەروەها ڕادەگەیەنێ: " مادەکان پێیان وابوو، کە چونکە لە بەرامبەری قۆشەی ئەردەشێردا تێکشکاون و پاشەکشەیانکردووە، ئیدی لە مەترسی ناکەون. بەڵام ئەردەشێر چوار هەزار شەڕکەری پێکەوە نا و خوتوغافڵ، بە سەر کوردانیدا دا و هەزار کەسی لێ کووشتن و ئەوەی مابووشنەوە، یان بە دیلیگرتن، یان برینداریکردن و تفاق

و دانەوێڵەیەکی زۆری لە کوردان ـ پاشای مادەکان ـ و کوڕەکانی زەوتکرد " لێرەشدا، هەروا دەردەکەوێ، کە ئەردەشێر، کورد و مادی هەر بە یەک نەتەوە دەزانی و نێویان دەبا.)«15،16 ـ 16»

هەر چەندە، ئەمانە هەموو وەک دەکۆمێنتێکی مێژوویی، ئەوەمان بۆ دەردەخەن: کورد و ماد هیچ جیاوازییەکیان نەبووە، کورد لە نەوەی مادە و مادەکانیش، بە باپیرە گەورەی کوردەکان دادەنرێن. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، فەرمانڕەوایانی میدیا، دوای ئەوەی مردوون، هیچ جۆرە نووسینێکیان، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بۆ بەجێ نەهێشتووین، تا بزانین، خۆیان دەڵێن چی؟ مێژووی خۆیان و ماد چۆن باسدەکەن؟ بە چ زمانێ پەیڤیوون؟ بۆ ئەوەی، وەک دەکومێنتێکی مێژوویی، بە دەسمانەوەبێ، دید و بۆچوونەکانی خۆمانی پێ بسەلمێنین. ئەوەی پێمانگەیشتووە، تەنیا هێندێ ناوی پاشاکانیانە. ئەویش، لە ڕێی هێندێ لە نووسینەکانی گەلانی دیکەوە وەرگیراوە. لێرەدا، گرفتی سەرەکیی سەرهەڵدەدا، چونکە ناتوانین، بە تەواویی بڕیاربدەین، تا چەن پێوەندیی یا لەیەکچوون، لە نێوان زمانی کوردیی کۆن و ئاڤێستادا هەیە.

لەوانەیە، تەنیا د.« مەکەنزی » و « ڤیلچێڤسکی » پێیان وابێ، کورد لە نەوەی مادەکان نین. چونکە، یەکەمیان ـ دەڵێ:(کوردەکانی ئەوڕۆ، لە بەرەبابی مادەکانەوە نەهاتوونەتە خوارێ)«10،16» دووەمیشیان ـ دەڵێ: (نە بە چۆنێتی دروسبوونی کۆمەڵ، نە بە زمان، کورد لە نەوەی مادەکان نین.)«134،78»

بەڵام، زۆربەی زۆری ڕۆژهەڵاتناس و زاناکانی زمانەوانیی، چ کورد و چ بیانیی، پێیان وایە، کورد لە نەوەی مادەکانن و زمانی کوردییش، لە بنەڕەتدا بۆ سەر زمانی مادەکان دەگەڕێتەوە. لەو بارەیەوە « تۆفیق وەهبی » دەڵێ:(منیش لە سەر ئەو باوەڕەم، کە کورد و ماد، پێوەندییەکی لە پسان نەهاتوویان پێکەوە هەیە و کورد و زمانی کوردیی لە سەر بنجی ماد و زمانی مادی ڕواوە و گۆڕاوە.)«9،16»

« سوجادیی » دەڵێ:(زمانی کوردیی لە سەدەی شەشەمی پێش میلاددا هەبووە، نەوەک هەر هەبووە، بەڵکوو زمانێکی سەربەخۆ بووە)«15،67»

« خاڵ »یش لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (سەرچاوەی کوردیی زمانی « ماد »ی کۆنە، کە « زەردەشت » پێغەمبەر بەو زمانە هاتۆتە خوارەوە. زمانی کوردیی ـ وەک هەموو شتێکی زیندوو ـ لەدایکبووە، وە بەرەبەرە پێگەیشتووە و خۆی دارشتووە، ئینجا بە هەزاران تاشین و ڕێکخستن و بیراز و چەکوشکاریی بەسەراهاتووە، و لە بڕەند و هەساندراوە، وە بەرەبەرە بە پلەی ئاوەدانیی و شارستانییدا سەرکەوتووە، تا لە دوا دەمی دەوڵەتی مادا گەیشتووە بە پلەی هەرە بەرزی شارستانیێتی، یەکێک گەر بە چاوێکی ووردبوونەوە تەماشای ئەو ووتە کوردیی یە کۆنانە بکا، کە ماد بۆیان بەجێهێشتووین ..... تێئەگا کە زمانی کوردیی، دوو سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش بەرزترین و دەوڵەمەندترین زمان بووە.)«102،22 ـ 23»

« مینۆرسکی » دەڵێ: (زۆربەی مێژووزانانی بە ناوبانگ لەو باوەڕەدان، کە « کورد »ی ئیمڕۆ نەوەی « ماد »ەکانی دوێنێن.)«112،563»

هەروەها، « زوبێحی » کۆتایی بەم باسە دوورودرێژ و پڕ لە گرێوگۆڵە دەهێنێ و دەڵێ: (ئەگەر کورد نەوەی مادەکان نەبن، ئەدی نەتەوەیەکی وا کۆن و بە دەسەڵات چی بەسەرهات و ئەو هەموو هۆز و تیرەی کورد، کە بە یەک زمانی ئێرانیی و جیاواز لە زمانە ئێرانییەکانی دیکە قسەدەکەن، لە کوێوە هاتوون؟)«70،33»

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، بۆمان دەردەکەوێ، زمانی کوردیی ڕەگوڕیشەیەکی قووڵی مێژوویی هەیە. بەپێی دید و بۆچوونی، زۆربەی شارەزایانی زمان، ڕەگەکەی بۆ سەر زمانی « ماد »ەکان دەگەڕێتەوە. وەک هەموو زمانەکانی دیکەی گەلانی جیهان، بە چەندین زنجیرە گۆڕانی زمانەوانیدا تێپەڕبووە. وردەوردە، پێشکەوتووە، تا بەم شێوە و قۆناغەی ئەوڕۆی گەیشتووە. (زمانی کوردیی لە زمانە دەوڵەمەندە زیندووەکانە، وە لە ئاهەنگ و شێوە و دەنگا، لەگەڵ ناسکترین زمان کە « فڕەنسزییە » جیاوازییەکی نییە.)«102،15»

## 9. زمانی کوردیی و فارسیی :

زۆر لە مێژە، لە نێوان شارەزا و پسپۆڕەکانی کورد، فارس و بیانییەکاندا، لە سەر پێوەندیی زمانی کوردیی و فارسیی، دەمەتەقێیەکی گەرم هەیە. ئەم شارەزایانە، بە سەر دوو دەستەی جیاوازدا دابەشبوون.
دەستەیەکیان دەڵێن: زمانی کوردیی، وەک هەموو زمانەکانی دیکەی جیهان، زمانێکی سەربەخۆیە. دەستەکەی دیکەشیان دەڵێن: زمانی کوردیی، زمانێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکوو، بە یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی فارسیی دادەنرێ.
ئەوانەی لە نێو چوارچێوەی، سنووری بازنەی دەستەی یەکەمدا دەخولێنەوە، زۆربەیان لە زانا کورد و بیانییەکان پێکهاتوون. بەڵام ئەوانەی، لە دەستەی دووەمدا خۆیان دەبیننەوە، کۆمەڵێکی کەمن، زیاتر لە شارەزایانی فارس، هێندێ مێژوونووسی خۆفرۆشی کورد و ڕۆژهەڵاتناسانی بیانیی پێکهاتوون.
بۆ ئەوەی، ئەم چەڵەمە گەورەیە ڕوونکەینەوە، پێش هەموو شتێ پێویستە، پەنا بۆ بەر دادگەی مێژوو بەرین، تا بزانین، کۆچڕەوی گەلانی ئاریی، کەی دەسپێکردووە؟ مادەکان، لە ناوچەکەدا کەی پەیدابوون؟ پێوەندیی نێوان کورد و فارس، بە مادەکانەوە چییە؟ کامیان لە ناوچەکەدا کۆنترن؟ چ جۆرە پێوەندییەکی مێژوویی، لە ڕووی ڕەگەز و زمانەوە، پێکیانەوە دەبەستێ؟ تا چەن، هەر دوو زمانەکە لە یەکدی دەچن؟ پاشماوەی نووسینە کۆنەکانی، ئەو سەردەمانە چیمان پیشاندەدەن؟ ئایینە کۆنەکانی کورد و فارس، بە چ زمانێ نووسراونەتەوە؟ کام زمان پتر، لە زمانی ئەو ئایینانەوە نزیکترن؟ بۆچی فارسەکان، پێ لە سەر ئەوە دادەگرن، کە زمانی کوردیی، دیالێکتێکی ناوچەیی زمانی فارسییە؟ مەبەسیان لەوە چییە؟ ئەمانە و گەلێ پرسیاری دیکە هەن، گەر توانیمان، لە ڕێی دەمەتەقێیەکی زانستانەوە، وەلامیاندەینەوە، ئەوا دەتوانین، هێندێ لەو گرفتە گرنگە چارەسەرکەین.
سەرەتا پێویستە، بزانین، ناوی هیندۆ ـ ئەورووپایی یا « ئاریی »، لە چییەوە هاتووە؟ لە کۆندا، ئەو گەلانە تەنیا، بە ناوی ئارییەوە ناسرابوون. ئاری، لە ڕووی زمانەوە،(بە واتای ئاگری یا ئاگرپەرست دێت، کە کۆی

ئەبێتە « ئاریانی » یا « ئاگرپەرستان ». چونکە ئەم کۆمەڵە ئاگرپەرست بوون و پێوەندییەکی بەتینیان، لەگەڵ ئاگردا هەبووە. وەک چۆن « حامی » یەکان بتپەرست و « سامی »یەکان خواپەرست بوون. )«44،106»
پاشان، ناوی ئاریی گۆڕاوە، هیندۆ ئەورووپایی جێی گرتۆتەوە. (هیندۆ ـ ئەورووپایی، ناوێکە زمانەوانی فەرەنگی دایانناوە، بۆ زمانێکی گوایا لە زەمانێکی زۆر کۆندا، کۆمەڵێ ئادەمیزاد، کە لە مەڵبەندێکی نەزانراو پێکەوە ژیاون، قسەیان پێکردووە. )«11،70»
زۆربەی زۆری ڕۆژهەڵاتناس و مێژووزانان، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە تا ئێستە، هێندێ شت، بە تەواویی ڕوون نییە. وەک ئەوەی، ئەم تیرە و هۆزە هیندۆ ـ ئەورووپایی یانە، پێش ئەوەی لە شوێنی ژیانی یەکەمیان بجوڵێن و بەرەو ناوچەکانی ژیانی نوێیان بێن، هێندێکیان لە ئێرانی ئەوڕۆ، هێندێکی دیکەیان لە هیندستان و هێندێکی دیکەشیان لە ئەورووپا جێگیربن، کەی لەو ناوچانەدا پەیدابوون؟ چۆن دروسبوون؟ چۆن ژیاون؟ بە چ زمانێ پەیڤیون؟ بۆ لە نیشتمانی خۆیان هەڵکەنراون؟ کەی سەرەتای یەکەمین شەپۆلی، کۆچوڕەوەکەیان دەسپێکردووە؟ چەن ساڵیان پێچووە، تا بە تەواویی گەیشتوون و نیشتەجێبوون؟ کەی بە یەکجاریی، کۆتایی بە کۆچوڕەوەکەیان هاتووە؟ لە ماوەی گەشتەکەیاندا، چییان بەسەرهاتووە؟ چ جۆرە گۆڕانکارییەکیان بەسەرهاتووە؟ لەوانەیە، ئەم پرسیارانە و گەلێ پرسیـــــاری دیکەش، تازە هەروا بێ وەڵام بمێننەوە، یا لە ئایندەدا وەڵامێکیان هەبێ، بەڵام، وەڵامێکی ڕێکوپێک و بنجبڕ نەبێ!
هێندێ شارەزا و مێژوونووسی، وەک د. « کۆنتناوی فرەندیی »، دەڵێ:
(لە دەوروبەری هەزارەی چوارەمی پێش زایین، یەکەم لێشاوی کۆچکردووان هاتۆتە چیاکانی زاگرۆسەوە و وەها دەردەکەوێ، کە لە باشووری دەشتی «سیبیریە و ڕووسیا » وە بووبێ و زاناکان ناوی ئەم بەشەیان ناوە «ئازیانیک ـ ئاسیایی » بۆ جیاکردنەوەیان لە کۆچکەرەکانی دی. )
پاشان، دەڵێ: (لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین، دەستەیەکی دی، لە هەمان شوێنەوە بەرەو زاگرۆس کۆچیانکردووە و بە « ئاری » یا « هیندۆ ـ ئۆرۆپی » ناوبانگیان دەرکردووە و پەلاماری دەستەی یەکەمیان داوە، ئەم

پەلامارە بەڵگەکانی « میسۆپۆتامیا ـ بین النهرین » بە پەلاماری گۆتیی و کاسیی ناویان دەبا ) هەروەها دوکتۆر بەردەوامدەبێ و دەڵێ: (پاشان لەو چەقەوە دوو کۆچکرا، یەکەم بەرەو ڕۆژاوا و چووە ئۆرۆپا، ئەوی دی ناوچەی باشووری بەڵقانی گرتەوە و چووە یۆنانەوە ... هتد)«3،4»

هەڵبەتە، ئەو ناوچانەی « سیبیریا » بە تایبەتیی و ڕووسیا بە گشتیی، سەرمایەکی زۆر دەیگرتەوە، بە تایبەتیی لەو سەردەمانەدا، هەر زۆر ساردتر بووە. چونکە، هۆی گەرمیی لە چاو ئەوڕۆدا، زۆر کەمبووە. لەبەرئەوە، ئەو کۆمەڵە ئیتنییانە، لە بەر گەلێ هۆ، نیشتمانی یەکەمی خۆیان بەجێهێشتووە. لەو هۆیانەش دەتوانین، بڵێین: لە لایەکەوە لە بەر سەرما هەڵاتوون. لە لایەکی دیکەشەوە، بە دوای لەوەڕگای سەوز و دەوڵەمەندا گەڕاون، تا خۆراک بۆ ئاژەڵەکانیان دابینکەن و بە باشیی بیان لەوەڕێن. بۆیە، بە هەر جۆرێ بووبێ، ویستوویانە، خۆیان لەو سەهۆڵبەندانەی ئەو ناوچانە ڕزگارکەن، بە دوای « زەوی بە پیت، ئاوی سازگار، هەوای فێنک، تیشکی ڕۆژ و سەرچاوەکانی ژیان »دا وێڵبوون و گەڕاون. بۆیە، بە خۆیان و مالاتەکانیانەوە کۆچیانکردووە، پۆلپۆل بلاوەیان لێ کردووە. دووریش نییە، هێندێ لەو کۆمەلانە، لە ڕێگە لە یەکدی پچڕابن. لەبەرئەوە، لەوانەیە هەر پۆلێ، ڕووی لە ناوچەیەکی جیاواز و دیاریکراو کردبێ! تا دوای ماوەیەکی دیکە و جارێکی دیکە، دەستەدەستە، یەکیانگرتۆتەوە. لە کۆتاییشدا، بە یەکجاریی لەو ناوچانەی ئەوڕۆدا، گیرساونەتەوە و بە تەواویی نیشتەجێبوون.

ئەوەی دەربارەی ئەو کۆچبەرانە زانراوە، ئەوەیە، یەکەم دەستەی کۆچبەران، (کاتێ کەوتوونە ڕێ، شوێنێکیان بۆ خۆیان ڕەچاو نەکردووە، کە لێی نیشتەجێبن. چاتر بڵێین: ڕەنگە هەر نەیانزانیبێ، هیچ جێگەیەکی تر، جگە لە مەڵبەندی ئەسڵی خۆیان لە دنیادا هەیە، تا جێیان پێ لەقبووە و هەڵقەندراوون. جا بۆیە لە هەر ئەرزێکی جێگەی خۆیان و مالاتیان بوویێتەوە، بارگە و بنەیان لێ خستووە و هەروا بە لەوەڕ هاتوون و بەرەبەرە پامێر« بانی دنیا »و هیندستان و ئێران و کوردستانی ئەوڕۆیان داگرتووە، ئەمانە لە مێژوودا بە خێلاتی« ئاریایی »ناوبانگیان دەرکردوە. )«12.11.70»

بەڵام، گرنگ ئەوەیە، بەپێی ئەو سەرچاوانەی لە بەردەسدان، (بۆ یەکەم جار، لە سەدەی بیستویەکی پ.ز. ناوی « ماد » پەیدابوو. لە سەدەی سیازدەی پ.ز. ، لە ژێر فەرمانڕەوایی « توسە » لە شاری « بەڵخ » دەوڵەتێکی پچووکی مادی هەبوو، کە باجی بە ئاشوورییەکان نەداوە. لە سەدەی نۆیەمی پێش زاییندا، بەرەبەرە ناوی ماد کەوتۆتە ناو نووسینەکانی ئاشوورەوە. ووشەی ماد دوودڵیی و ترسی خستە دڵیانەوە. پاش لە دنیا دەرچوونی « گشتاسب »ی فەرمانڕەوای پێشدادییەکان سالی «902» پ.ز. ، وردەوردە، ئاشوورییەکان دەستیانکرد بە پەلامار و هێرشبردنە سەر وولاتی « ماد و پارس ». ئەمانیش ناچاربوون، کە دەوڵەتێکی یەککگرتووی بە دەسەلاّت دژی ئاشوورییەکان پێکبێنن.) «106، 239 ـ 240».

هەر چۆنێ بووبێ، مادەکان و ئاشوورییەکان، ماوەیەکی زۆر، لە جەنگ و پێکدادانی بوون. ناوچەکە لە ئاژاوە و پشێوییەکی بەردەوامدابووە. تاوێ مادەکان، ئاشووریەکانیان ڕاوناوە، تاوێکی دیکەش، ئاشوورییەکان وولاتی مادەکانیان داگیر و کاولکردووە. بەپێی باوەڕی هێرۆدت، (وولاتی ماد، لە سەرەتاوە لە ژێر دەسەلاتی ئاشوورییەکانا بووە و دوایی ئازادبووە. خەڵکی ماد، ماوەیەک دەوڵەت و فەرمانڕەواییان نەبووە، یەکەمین پاشای ماد کە شاری ئەکباتانی دروسکرد و سەڵتەنەتی مادی دامەزران دیوک «Deiokes » بووە، کە پەنجاوسێ ساڵ حوکمی کردووە و فرائوورت «Phraortes »ی کوڕیشی، کە پارسەکان و هۆزەکانی تری ئاسیای خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە، بیستودوو ساڵ سەڵتەنەتی کردووە. ئەو لە دژی ئاشوورییەکان زۆر تێکۆشاوە، وە زۆر هەولیداوە، شەڕیان لەگەڵدا بکا و لەناویانبەرێ و پەلاماری ئەوانەی ئەدان کە لە دەسیان دەربازبووبوون، ئەگەر چی هێشتا، ئاشوورییەکان لەو کاتەدا « شیرازەیان بە خۆوە مابوو » « فرائوورت » لە شەڕی ئاشوورییەکاندا لەناوچوو، «کیاکساری Kueksares » کوڕی لەشکری مادەکانی کۆکردەوە و ڕێکیخستن. ئەویش چل ساڵ پادشایی کرد. وە زۆر هەولیدا نەینەوای پایتەختی ئاشوورییەکان داگیرکات، بەڵام سەر نەکەوت. چونکە، لەشکرییەکانی « ئەسکیت » ـ سکاییەکان ـ بە سەرکردایەتی مادیا کوڕی پروتووتی چون بە هاواری

ئاشوورییەکانەوە و ڕزگاریانکرد. « ئەسکیتەکان »ماوەی بیستوهەشت ساڵ، دەسەڵاتی خۆیان لە ئاسیادا هێشتەوە و خۆیان پاراست، بەڵام لە دواییدا کیاکسار هێنانیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و دوایی بە هاوکاریی بابلییەکان وڵاتی ئاشوورییەکانی داگیرکرد. ئەو جار « کیاکسار » هەوڵیدا و ویستی، ئەسکیتەکان بە تەواویی لەناوبەرێ .. پاشماوەی ئەسکیتەکان ڕایانکرد بۆ ئاسیای پچووک « لیدی ». وە ئەمە بوو بە هۆی ئەوە کە ماوەی شەش ساڵ شەڕ و لێدان لە نێوان « کیاکسار » و « ئالیات »ی پادشای «لیدی »دا ڕوویدا. لە کاتی دوا شەڕوشۆڕدا، ڕۆژگیرا و هەر دوو لا ئەم ڕۆژگیرانەیان بە نیشانەیەک زانی و بە هۆی ناوبژیکردنی « سیدنسی » پادشای کیلیکیە و « لابنیت » پادشای بابلەوە، پەیمانی ئاشبوونەوەیان بەست. سنووری هەر دوو کیشوەرەکان بە درێژایی ڕووباری « گالیس » کە ئێستا پێی ئەڵێن « قزل ئیرماک » دانرا، وە « ئاستیاگ کوڕی کیاکسار » کچی « ئالیات »ی خواست. لە دوای مردنی « کیاکسار » ئاستیاگی کوڕی چووە سەر تەخت و سیوپێنج ساڵ حوکمی وڵاتی کرد، بە هۆی جموجۆڵی هارپاک «کە یەکێ لە گەورە پیاوانی ماد بوو، وە لە کیاکسار زویر بووبوو » وە بە هۆی کوڕش کوڕی ماندانا کچی ئاستیاک و کامبیس « کمبوجیە »ی پارس سەڵتەنەتەکەی دۆڕاند. )«40،42»

ئەم هەرا و ئاژاوەیەی، نێوان مادەکان و ئاشوورییەکان، هەر بەردەوامبوو، تا مادەکان و بابلییەکان، لەشکرێکی گەورەیان پێکەوەنا، لە ساڵی «612 » پ.ز.دا، بەرەو « نەینەوا »ی پایتەختیان کشان، دوای جەنگێکی خوێناویی، ئیمپراتۆریای ئاشوورییان ڕوخاند. ئیدی، لەو ڕۆژەوە، دەسەڵاتی مادەکان، بە سەر هەموو ناوچەکانی ئێران و نەینەوادا چەسپا و بەهێزبوو.

بە باوەڕی من، پێش ئەوەی شتێ هەبێ، ناوی ئیمپراتۆریای ماد بێ، سەرەتا، مادەکان لە کۆمەڵێ تیرە و هۆزی گەورە و گچکەی جیاواز پێکهاتبوون. هەر یەکێ لەو تیرە و هۆزانەش، لە ناوچەیەکی دیاریکراوی سەربەخۆدا، بە ئازادیی ژیاون. سەرکردەیەکی تایبەتیی، دیاریکراوی خۆیان هەبووە. هێندێکیان کۆچەریی بوون، هێندێکی دیکەشیان، لە گوند و شاری پچووکپچووکدا نیشتەجێبووبوون. زیاتر بە بەخێوکردنی مەڕوماڵاتەوە

خەریکبوون. لەوانەشە، هەموویان یا زۆربەیان، لە ناوچەیەکی دیاریکراودا پێکەوە ژیابن. بەڵام، هیچیان سەریان بۆ یەکدی دانەنەواندووە. واتە: لە نێو یەکدیدا، پچڕپچڕ و پەرشوبڵاوبوون، نەتەوەیەکی یەکگرتوویان پێک نەهێناوە. پاشان، وردەوردە، هەموو یەکیانگرتووە. یەکێ لە هەرە پاشا بەهێزەکانی هۆزەکانی ماد، هەموو تیرە و هۆزەکانی، لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە، بە هەموویان ڕێککەوتوون و ئیمپراتۆریای مادیان دامەزراندووە. ئەو پاشایەش، دەسی بە سەر دەسەلاتدا گرتووە و لە سەر تەختی ئیمپراتۆریاکە دانیشتووە. ئیدی بەرەبەرە، زۆربەی تیرە و هۆزەکان نیشتەجێبوون و لە دەوری ئەو دەوڵەتە کۆبوونەتەوە.

« هێرۆدۆت » دەربارەی مادەکان دەڵێ: (ماد لە شەش هۆز پێکهاتبوون، بووسەکان، پارتاکنەکان، ستروخاتەکتەکان، ئاری سانتەکان، بودییەکان، موغەکان.) لە بارەی شاکانی مادەوە هێرۆدۆت بەم شێوەیە ناویاندەبا :

1. دیۆکۆس « 708 ـ 655 » پ.ز.
2. فرائوتیس « 655 ـ 633 »پ.ز.
3. کوئاکسار « 633 ـ 585 »پ.ز.
4. ئاستیاگس « 584 ـ 550 » پ.ز. = ئەژدەهاک. «8،4 ـ 9»

مێژوونووسەکان، لە سەر ژمارەی پاشاکانی ماد و ماوەی فەرمانڕەواییان، لە نێو خۆیاندا ناکۆکن. (لە داستانی کتێبی ئەرمەنییەکانا، « یوسوی » بەم جۆرەی نووسیوە: « دوای ئەو پولی هیستور ناوی سوڵتانەکانی ماد کە هەشت کەس بوون و « 224 » ساڵ سەڵتەنەتیانکردووە »... هتد) «66،42» لە مێژووی « مار میخایل »دا بەم جۆرەیە: (لە دوای ئەوە کە فەرمانڕەوایی کلدانییەکان کۆتاییهات، مادەکان دەسیانکرد بە حوکمڕانیکردن و بیستویەک پاشایان هەبوو.)«66،42 ـ67»

بەڵام، ئەم سەرچاوەیە، باسی ساڵەکانی فەرمانڕەواییان ناکا. هەروەها، «گیۆرگی سینکل »یش بە(هەشتاوچوار پاشای مادی داناوە)«67،42».

بەڵام، « موسی خورنی » مێژوونووسی ئەرمەنیی، (ناوی « ئاستیاک »ی بە « ئادەهاک » بردووە.)«75،42» دەربارەی ئەژدەهاک نووسیویەتی: (ئاژدەهاک azi«s»DAHAKA ـ « ماردهاک »ی ئاڤێستا، زۆردارێکی

ئەفسانەیی و مارێکی شێوە ئادەمیزاد لە خەڵکی باوری Bawri « بابل » کــە بە دەسی « تراتیلون » TraiTeuna « فــەرەیدوون » کــوژراوە.) «75،42»
لەو بارەیەوە « مەردۆخی » دەفەرموێ: (تا سەرەتای سەدەی «21 پ. ز. »، هیچ دیاردەیەکی ڕامیــاریی و یەکبــوون لەمــانەوە دیار نــیـیـە. چ لە پێش ســەردەمی « پێــشــدادییــەکــانەوە » یانی « 341 3 »پ.ز. و چ لە دوای ئەمــانیــشــەوە، تا وەکــوو ســەردەمی « نینەی » ی فــەرمــانڕەوای کلد و ئاشوورر، یانی سەدەی «21» پ.ز. بەڵام کوردەکانی بەشی ئاراڕات، «27» سەدە پێش زایین، یانی « 700 3 » ســاڵ پ.ز.، دەســتــیــانکردووە بە جوڵاندنەوەی سیاسیی لەگەڵ « شۆمێر و ئەکەد » و « عیلام » بەگژ یەکدا چوون. لێــرەدا بۆمــان دەردەکــەوێ، کــە تا وەکــوو ئەم کاتە، « مــادە »ەکــان بەرەو ڕۆژهەڵات نەهاتوون. ئەگــەر هاتبــێتــیــشــن، خــاوەنی فــەرمــانڕەوایی نەبوون. لەوانەیە لە ژێر چاودێری پێشدادییەکاندا بووبن. یاخود بە شێوەی خێڵەکیی ژیاون و جیاجیا سەرۆکی تایبەتیی خۆیان هەبووە.)«239،106»
ئەز پتــر، لە سەر ئەو باوەڕەم: مــادەکــان، لە چەن تیــرە و هۆزێکی جیــاواز پێکهــاتبــوون. هەر تیــرە و هۆزێکیش، لە ناوچەیەکی دیاریکراودا ژیاون و زمانێکی تایبەتیی جیاواز یا شێوە زمانێکی تایبەتیی خۆیان هەبووە. بەڵام ئەو زمــانانە، لە یەکــدییــەوە نزیکبــوون. چونکە، سەرچاوەکانیــان هەر یەک ســەرچاوەبووە. دوای ئەوەی یەکــێــتــی لە نێــوان تیــرە و هۆزەکــانی مــاددا دروسبوو، ئیدی، زمان و شێوە زمانەکان، زیاتر لە یەکدی نزیککەوتوونەوە. تا لە ئەنجــامــدا، هێندێکیــان بە تەواویی تواونەتەوە و بوونی خــۆیان لەدەســداوە. هێندێکی دیکەشــیــان بە تەواویی زاڵبــوون و لە ڕێگەی دەســەڵاتی مــادەوە، خــۆیان بە ســەر دانیــشــتــووانی ســەر زەوی مــاددا سەپاندووە. (لە قۆناغەکانی مێژوودا، ڕۆژگارێک هاتبووەکایەوە، کە بەبێ ماوە لە دوای ڕۆژگاری یەکێتی هۆزەکانی ماد ـ تەنیا لە دوای ماوەیەکی پەنجا تا حەفتــا ساڵی دەوڵەتی ماد دروســبوو ـ ئەم دەوڵەتە بریتــیبوو لە کۆمەڵێک دەزگەی سەربازیی و دارایی، کە پێوەندیی بەشە ئابوورییەکانی دەوڵەت زۆر لاوازبوو، وە ڕشتەی پێوەندیی لە نێوان هۆز و ناوچەکانی ناو

دەوڵەتدا زۆر سستبوو، وە ئەو هۆزانەی شێوەی زمانە کۆنەکانی خۆیان ئەپاراست، لەبەرئەوە پێکهاتنی قەوارەی زمانێکی یەکگرتووی ماد کارێکی گرانبوو، وە چەن جۆرێ شێوەی زمان و قسەکردن لەناوا هەبووە. بەڵام لە سەدەی سێیەمی پێش زاییندا، کە خاکی ماد کرا بە دوو بەشەوە، مادی خواروو، مادی ئەترۆپاتێن دروسبوو .. مادی ئەترۆپاتێن سەربەخۆیی وەرگرت، چەن پێویستییەک بۆ سەرەتای پەیدابوونی نەتەوەی مادی ـ ئەترۆپاتێن ـ هاتە پێشەوە و درسبوو.

ئەگەر ئەو نووسینانەی ئاڤێستا لە بارەی مادەوە ڕاستبێ، ئەبێ زمانی ئاڤێستا بە زمانی ماد دانێین، زمانی ئاڤێستا زۆر بە باشی لێکدراوەتەوە، کەرەسەیەکی زمانیی زۆری تیایە، هەروەکوو زانراوە، زمانێکی هیندیی و ئەوروپایی و ئێرانییە، بەڵام چەن بەڵگەیەک بە دەستەوەیە، کە ئاڤێستا ئەگەرچی لەگەڵ زمانی ئێرانیی کە ئەو سەرچاوانەی هەیەتی، بە مادی ناو ئەبرێن، نزیکن و لەگەڵ ئەوەشدا بەرامبەرن.)«105 ـ 104،42»

دەربارەی پێوەندیی کورد و پارس، مامۆستا « مەردۆخی » دەفەرموێ:(هەر لە سەرەتای مێژووەوە، کورد و پارس هەمیشە هاودەرد و هاوپەیمان بوون. هاوبیروڕا و هاومەزهەبیی بوون، لە شادیی و خۆشیدا، لە چەوسانەوە و کوشتن و برینداا، وەک یەک بوون و هەرگیز لە یەک جیا نەبوونەتەوە. لە کاتی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی کورددا، پارسەکان بەشداربوون و هاوکارییانکردوون، وەک دەوڵەتی کوردیی « گۆتیی، کاسیی، کیانیی و ماد ». کاتی دەسەڵاتدارێتی پارس، کوردیش بێبەش نەبوون و هاوکاربوون، وەک دەوڵەتی « پێشدادیی، هەخامەنشینیی و ساسانیی ». هەر کات بە هۆی داگیرکردنی بێگانەوە، لە یەک جیابوونایەتەوە، یەکێکیان بکەوتایە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی ترەوە، هەر دوولا ئەکەوتنە بیری یەکگرتن و سەربەستییەوە. وەک سەردەمی فەرمانڕەوایی « کلدە، ئاشوور و عەمالقە ». هەر دوو لا پێڕەوی ئایینی زەردەشت بوون و «ئاهۆرامزدایان » پەرستووە و بڕوایان بە خوای خێر و خۆشی و ئاشتیی بووە. نەفرەتیان لە خوای شەڕ و ئاژاوە و گرانی « ئەهریمەن » کردووە. کورد

بۆ شەڕی ئیسلام دەسپێشخەریکردووە، قوربانییەکی زۆری دا دژی سوپای عـەرەب. لە ئەنجـامـدا کـورد و پارس پێکەوە مـوسـولـمـان بوون. ئەم هاوپەیمانییـە هەروا مایەوە و کاتی پەیدابوونی مەزهەبی شیعـە برێک لە هۆزە کوردەکان لەگەڵ پارسەکاندا مەزهەبی شیعەگەریان پەسەندکرد، « لوڕ، کـەڵهـوڕ، شادرلیی، باودەلیی، کـەرەشـەلیی، بەختـیـاریی، کـولیـائیی، سینامینلیی، پیهرماز، بلکیان، ئەشمیشارت، لەک ... هتد. »کە زیاتر لە سەد هۆزن، کە عـەلی « خ » بە خەلیفەی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ئەزانن. بەڵکوو هەندێ لەم هۆزانە، عـەلی بە خـوداوەند ئەزانن و ئەیپەرستن، وەک هۆزی « نانەکـەلیی، دێرسیـملیی، لە ناوچەی دەرسیم نیشتـەجێن. » لە کتێب و مێژووە کۆنەکاندا، هەمیشە ناوی « ماد و پارس » لە یەک نەبڕاون و بەیەکـەوە ناو براون، تا دەوروبەری سـەدەی پێنجـەمی پێش زایین، ناوی ئێران پەیدابوو، لەبریتی ـ ماد و پارس ـ هەروەها شەڕی کوردەکان لەگەڵ ـ والدین ـ ساڵی « 244 ز. » پێکدادانەکەی قەیسەری ڕۆم « هەرقل » ساڵی « 624 ز. » وەک باسمانکرد، هەر بە لایەنگیریی لە دەوڵەتی ئێران بووە.
برێک لە زاناکانی مێژوو ئەڵێن: پاش ڕوخانی دەوڵەتی ماد، کە بە هۆی کارتێکردنی مادی و مەعنەوی لە لایەن پارسەکانەوە، بەشێک لە مادەکان چوونە پاڵ پارسەکان تێکەڵبوون و هەندێ لە سەرکردەکانیان لە پایتەختی پارس مـانەوە و جـێگیـربوون و پاڵپـشـتـی دەوڵەتی پارس بوون. بۆ وێنە کواکساری دووەم کوڕی ئازیدەپاک سەرکردەیەک بووە، لە سوپای کۆرش لە کاتی پێویستـدا، کوردەکانی کـۆنەکردەوە و شەڕیانئەکرد. بەشێـکی تر لە مادەکان چوونە پاڵ کوردەکانی زاگرۆس)«77،106 ـ 79» هەڵبەتە، لێرەدا دوو خاڵی گرنگ، سەرنجمان ڕادەکێشێ:
یەکەم ـ گەر مادەکانی ئەو ڕۆژە، کوردەکانی ئەوڕۆبن، گەر پارسەکانی ئەو ڕۆژە، فـارسـەکـانی ئەوڕۆبن، ئەمـە ئەوە دەگـەیەنێ، کـورد لە پێش پارسەکانەوە، لە ناوچەکەدا نیشتەجێبووبن.
دووەم ـ ئەم یەکێتیی و دۆستایەتییەی نێوان ماد و پارس، وەک مامۆستا دەڵێ، بەو شێوەیە نەبووە. یەکێتییـەکی پڕ لە خۆشیی و برایانە نەبووە، لە ئارەزوویەکی بێ مـەبەسـەوە نەهاتووە. بەڵکوو، لە ناچاریدابووە، چونکە،

له لایەکەوە، دەسەلات بە دەس مادەکانەوە بووە، پارسەکان لەگەڵ بوون، هەر فەرمانێکیان پێ کرابێ، ناچاربوون، جێبەجێیکەن. له لایەکی دیکەشەوە، مەترسییەکی گەورەی، ئاشوورییەکانیان لە سەر بووە. گەر یەکیان نەگرتایە، هێزێکی گەورەیان پێکەوە نەنایە، هەڵبەتە، لەشکری ئاشوورییەکان نیشتمانە هاوبەشەکەیان داگیردەکردن و خۆشیان قڕدەکردن!
له شوێنێکی دیکەی بەرهەمەکەیدا، مامۆستا « مەردۆخی »، دەربارەی مادەکان دەفەرموێ: ( ماد ـ سالی « 2500 »پ.ز. چەن هۆزێکی دراوسێ و هاوڕەگەز، کە ئارییان پێ وتراوە، لە نەژادی « هیندۆ ئەورووپی » بوون، له ڕۆژهەلاتی و سەرووی ڕۆژهەلاتی دەریای خەزەر نیشتەجێبوون. هەندێکیان بە کشتوکاڵەوە خەریکبوون، بەلام هێشتا لە دەورەی « بەردا » بوون و کەمتر گەشەیانکردبوو. بەشێکی کەمیان ئاسنیان بەکارهێناوە، بۆ هەندێ کاروباری ڕۆژانەی وەکوو ڕاو و کشتوکاڵ، بە ئاژەڵ بەخێکردنەوە خەریکبوون، وەکوو ئەسپ و ماین و مەڕ و بزن. نووسین و خوێندنیان نەزانیوە. هەندێکیان ڕووە و هیندستان کۆچیانکردووە، کتێبی وێراس یانی کتێبی پیرۆزی هیندەکان کە بە زمانی ـ سانسکریت ـ نووسراوە، دەربارەی ژیانی سەرەتایی ئەم گەلە هەندێ شتی ڕوونکردۆتەوە.
بەشێکی تر ڕووەو ڕافیدەین کۆچیانکردووە. کە لە نێوانیاندا دوو هۆزی خاوەن دەسەلات و ئازاد بە ناوی « ماد » و « پارس » هەبوون. هاتنی مادەکان لە ڕۆژهەلاتی زەریای خەزەرەوە، سەدەی « 9 ـ 8 » پ.ز. پێش ئاشوورییەکان باسکراوە، ئاشوورییەکان بە ماد و مادا ناویان بردوون. ئەم نەتەوەیە، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم لە ژێر فەرمانڕەوایی کەیقوبادی کورد، دەولەتێکی بە دەسەلاتیان پێکهێنا و « پارس »ەکان لە خواروی خۆیانەوە ئەژیان، دەستیان بەسەراگرتن و خستنیانە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە. ئەکباتان ـ هەمەدانی ئێستایان کردۆتە پایتەخت.)«118،106»
پرۆفیسۆر « سایس » دەڵێ: (مادەکان هۆزێکی بە دەسەلاتی کورد بوون، لە وولاتی ئاشووردا جێگیربوون و تا خوارووی زەریای خەزەر فەرمانڕەواییانکردووە، بەشی زۆریان لە زمانی هیندۆ ئەورووپایی و لە نەوەی ئاریی بوون.)«119،106»

« مـــەردۆخی » ، لە وەڵامی ئەم بیـــچـــوونەدا ، دەڵێ: (ئەو باســـە لەگـــەڵ مێژووەکانی کورد و یۆنان جیاوازیی نییە. تەنیا ئەوە نەبێت، کە ئەڵێت: مـــادەکـــان لە وڵاتی ئاشـــوور جـــێگیـــربوون. بەڵام مـــادەکـــان دراوســـێی ئاشوورەکـان بوون، لە ئەنجامـدا کە کۆتاییـان بە دەوڵەتی ئاشـوور هێنا و وڵاتەکەشیان داگیرکردن. )«119،106»

بە باوەڕی من، ئەم بۆچوونەی مـامـۆسـتـا « مەردۆخ » زۆر لە ڕاسـتـیـیـەوە نزیکە و لە نێو پەڕەی مێشکدا بە ئاسانیی جێی دەبێتەوە.

د. « کەمال مەزهەر » ، دەربارەی میدییەکان دەڵێ: (میدییەکانیش بە لای کەمـــەوە ، سێ سـەدە لە پێش فـارسـەکـانەوە هاتوونەتە ئێـران و دەوڵەت و شارسـتـانییـەتی خۆیان دروسکردووە و پێوەندییـان لەگەڵ شارسـتـانییـەتە پێشکەوتووەکـانی عـێـراق بە تایبـەتیی و مـیـسـردا پەیداکـردووە و لەگـەڵ کلدانییـەکـان زۆر ڕێکبـوون، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ دەسـیـان خسـتـە ناو دەسی یەک بۆ لەناوبردنی ئیمپراتۆریی ئاشووریی.

بەم جۆرە ، میدییەکان گەلێ کەلکیان، لەو شارستـانییە کۆنانە وەرگرت و هیچ گـومـانی تێـدا نیـیـە ، کـەوا ، لە دوای ئەوەی، فـارسـەکـان بەسـەریانا زاڵبـــوون و ئەمـــان دایانە شـــاخـــەکـــانی زاگـــرۆس بۆ ڕزگـــاربوون، لە دەس ژێردەسـەیی کـۆنە ژێردەسـەکـانی خـۆیان، شـارسـتـانیـیـەتەکـەیان لە وڵاتە کۆنەکەی خۆیان بۆ فـارسەکان بەجێیهێشت، واتە: بێ سێ و دوو دەتوانین، بڵـێین:کاکڵەی شارسـتـانییـەتە پێشکەوتووەکەی فـارسەکـان، بریتـییە لەو شارستانییەتەی باپیرە گەورەی کورد دایمەزراند و بەجێیهێشت. )«11،92»

هەروەها ، دەڵێ: (لەو کاتەشدا ، فارسەکان لە ژێر دەسی میدییەکاندا بوون و مانەوە ، هەتا دەوروبەری ساڵی 550 پێش لەدایکبوون، ئەو کاتەی کۆرشی گـەورە پەیدابوو و تووانی فـارسـەکـان لە ژێر چنگی مـیـدییـەکـان دەربێنێ و دەوڵەتیـان بۆ پێـکبێنێ. لێـرەدا ، ئەم پرسـیـارەمـان دێـتە ڕێ، ئەویش: ئایا ڕێی تێـدەچێ، گـەلێـک بە زمانی گـەلێـکی تر گـفـتـوگـۆ بکا ، کە ژێردەسـەی خـۆی بووبێ؟!! گـەلێ ئەوەندە کـۆنبێ، کـە « 270 » سـاڵ لە پێـش گـەلی فـارسـدا هاتبـێـتە ئەو ناوچەیەوە و دەوری سەد سـاڵێکیش لە پێش ئەواندا دەوڵەتی سـەربەخـۆی خـۆی هەبووبێ و تەنانەت فـارسـەکـانیـشـیـان لە

ژێردەسدابووبێ. ئیتر، چۆن ڕێی تێدەچێ، بوترێ ئەمان بە زمانی فارسیی گفتوگۆیان کردووە!! ئەمە لەوە دەچێ، بلێی: گەلی تورک لە تورکیادا بە زمانی کوردیی ... ئەدوێن!!)«18،92»

دوای ئەوەی، بیروڕای هێندێ لە مێژوونووس، شارەزایانی کورد و بیانیمان، دەربارەی ڕەچەلەکی کورد و مادەکان زانی، ئێستا دەتوانین، بلێین: گومانی تێدا نییە، زمانی کوردیی و فارسیی، دوو زمانی جیاوازن. بەلام، چونکە لە سەرەتادا، سەرچاوەکانیان هەر یەک سەرچاوەبووە، ئەوڕۆش هەردووکیان، بە دوو زمانی سەر بە گروپی زمانە هیندۆ ـ ئەوروپایی یەکان دادەنرێن. کورد و فارسیش، لە مێژوویەکی دێرینەوە، لە ئێراندا پێکەوە ژیاون، نزیکییەکی زۆر، لە نێوان هەر دوو زمانەکەدا هەیە. بەلام، نزیکیی لە نێوان دوو زمانی دیاریکراودا، ئەوە ناگەیەنێ، هەردوو زمانەکە یەک زمانبن و یەکێکیان بە دیالێکتێکی ئەوی دیکەیان دابنرێ. زانستیش سەلماندوویەتی،(گەلان بە زمان و شێوە لێک جیادەکرێنەوە.)«19،92»

پاشان دوکتۆر لە وەلامی « ڕەشید یاسمی »دا دەلێ:(هەروەکوو بۆمان دەرکەوت، گەلی کورد گەلێ لە فارسەکان کۆنترن، هەروەها زمانیشیان. جا گەر ئێمە نەلێین: فارسیی لە کوردییەوە وەرگیراوە، دەسا بیروباوەڕفرۆشان، چۆن ڕووی ئەوەیان هەیە، بلێین: کوردیی لە فارسییەوە وەرگیراوە!)«19،92»جا ئێستە، هەر ئەوە ماوە، بزانین، مادەکان لە سەر چ ئایینێ بوون؟ پەیامبەرەکەیان کێ بووە؟ لە کوێ لەدایکبووە؟ بە چ زمانێ قسەیکردووە؟ پەرتووکە پیرۆزەکەی بە چ زمانێ نووسراوەتەوە؟ ئایا زمانی « ئاڤێستا »، لەگەل زمانی کوردیدا، تا چەن لە یەکدییەوە نزیکن؟

بۆ وەلامدانەوەی هەموو ئەو پرسیارانە، دیسانەوە، ڕوو لە پەرتووکخانە دەولەمەندەکەی مێژوو دەکەین. بەپێی ئەو زانیارییانەی، تا ئێستە، لە سەرچاوە جیاجیاکانی مێژووەوە، بە دەسمان گەیشتوون، پێش ئایینی زەردەشت، هێندێ ئایینی دیکە لە ناوچەکەدا هەبوون. بەلام، ئێمە لێرەدا، لە ئایینی زەردەشتەوە دەسپێدەکەین، چونکە، مەبەسی سەرەکیی باسەکەمانە و پێوەندییەکی تایبەتیی بە زمانەکەمانەوە هەیە.

هەرچەندە، بەپێی سەرچاوە مێژوویی یەکان بێ، زەردەشت لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لەدایکبووە. بەلام، تا ئێستە، بە تەواویی ڕوون نەبۆتەوە، لە چ شوێنێ لەدایکبووە؟ کەی لەدایکبووە؟ ژیانی لە کوێ بەسەربردووە؟ کەی مردووە؟ لەبەرئەوە، مێژوونووس و زاناکانی زمان، دەربارەی ئەو کێشە گەورەیە، بیروڕای جیاوازیان هەیە.

هێندێ بەڵگەی زانستانە هەن، گوایە: زەردەشت،(لە دامێنی زەریاچەی چێنچست ـ ورمێ و باکووری خۆراوای ئێراندا هەڵکەوتووە، کە کوردستانی ئێستە ئەگرێتەوە.

لەم ڕووەوە بارتۆلە، پرۆفیسۆر گۆڵدنەر، خۆرهەلاتناسی ئەڵمانیی هەرتسفلد جەکسۆن، ئێرانناسی مەزنی دانیمارکیی ئارتور کریستێن سن، فەیلەسوفی ناسراوی ئەڵمانیی فریدریک نیچە، مەسعودی گولزاری، نووسەری کرماشانی عیمادەدینی دەوڵەتشاهی، جان ناس، گیرشمن، مورتەزا راوندی، ئۆژین ئۆبێن، دوکتۆر جهانگیراوشیدەری و هەروەها مێژوونووسانی عەرەبی وەک: یاقوتی حەمەوی، ئیبن خردادبە و بلازری و چەندان زانا و نووسەری تریش، دوای توێژینەوەیەکی زۆر و هەوڵێکی زانستانە، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە زەردەشت* لەناو هۆزەکانی میدیا و لە باکووری خۆراوای ئێران « کوردستانی ئێستە »دا هەڵکەوتووە.)«50،101»

---

* ناوی زەردەشت، بە چەندین جۆر دەگوترێ: (زەردەشت، زەرتەشت، زراتوشت، زەراتوشترا و زەرتەشتز. کە ئەمەش بەپێی شێوەی نووسین جیابوونەتەوە، ئەسڵی ووشەکەش بە مەعنا خاوەنی حوشتری زەردە.)«15،68»، بەلام چەندین ساڵە لە نێو کورددا، ئەو ناوە بە « زەردەشت » دەنووسرێ. لێرەدا، بەڕێزان « عەبدوڵڵا قەرەداغی » بە « زەرتەشت » و « محەمەد حەمە باقی » بە « زەرتوشت » نووسیویانە. دیارە ئەمانەیان لە فارسەکانەوە وەرگرتووە! بەلام، جگە لەوەی، من یەکەمیان بە ڕاستر دەزانم، تازە لەناو کوردیشدا، هەر بە « زەردەشت » ڕۆیشتووە. بۆ ئەوەی، تێکستەکەش بە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو بنووسرێ، لە هەموو شوێنەکاندا، لە بری ئەو دووانە، « زەردەشت »م بەکارهێناوە.

سەبارەت بە سالی لەدایکبوونی، هێندێ مێژوونووس لەو باوەڕەدان، کە زەردەشت، (لەنێوان سالەکانی* 850 ـ 650 ی پێش زایین، سەری هالدابێ و لەدوای تەمەنی بیست سالییەوە، کەوتۆتە بیرکردنەوە و ژیانی گۆشەگیریی و ئەشکەوت و کێونشینیی و لە ئەنجامدا لە دوای دە سال، واتە: لە تەمەنی سی سالیدا، پەیامەکەی لە ناو هۆز و ناوچەکەیدا ڕائەگەیەنێ. بەلام، بە سەختیی دژی ئەوەسن و بڕوای پێ ناهێنن. ناچار ڕووئەکاتە ناوچەکانی دامێنتر و لە کێوی ئاویدەر « ئاوشی دەرینە »ی باشووری خۆراوای شاری سنەی ئێستەدا ئەگیرسێتەوە. پاشان، دووەمین کۆچی بۆ باکتریای لێواری جەیحون و ڕووە و کێوی هوگر و ناوچەی باخی «گولباخی » لای خۆرهەلاتی شاری کرماشان دەستپێنەکات. کە لەم ناوچەیەدا بە ئاشکرا، بانگی پەیامبەرێتی ڕادێلێ و لەم کاتەشدا کە گوشتاسپی شای هەخامەنشییەکان فەرمانڕەوایە، بڕوای پێ دێنێ و ئەچێتە سەر ئایینەکەی. لێرە بە دواوە، ئیتر ئاتەشگەدە و مەلبەندەکانی خواپەرستی دائەمەزرێنێ.)« 52،101»

دەربارەی مێژووی لەدایکبوون و مردنی زەردەشت، مامۆستا « سوجادیی » دەلێ: (نووسەرانی یۆنانیی و ڕۆمانیی ـ کە شارەزاییەکەیان زیاتر تێکەل بە ئەفسانەیە ـ سەردەمی زەردەشت بە شەش هەزار سال پێش زایین دائەنێن. بەلام، ئەمە وەنەبێ ڕاستبێ، چونکە بەپێی ئەو ڕوایەتە ئێرانیانە، کە لە پەرتووکی « پندهش »ی پەهلەویدا هەیە، زەمانی زەردەشت ـ ی بە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەم و شەشەمی زایین داناوە. ئەم مێژووەش هەموو شارەزایان و ئێرانیی ناسەکان لە سەری ڕێککەوتوون.. ئەویش ئەوەیە، کە گوایە لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایین لەدایکبووە، لە سالی « 583 »ی پێش زایین لە تەمەنی « 70-77 » سالیدا لە سەر پێپیلکەکانی

---

* لە تێکستەکەدا نووسرابوو، لە نێوان « سەدەکانی »، من سالەکانم بەڕاستر زانی. چونکە، کاتێ باسی سەدە کرا، یەکەم ـ باشتر وایە، بە نووسین بینووسین وەک: سەدەی هەشتەم و حەوتەم و شەشەمی پ.ز. نەک بە ژمارە بییاننووسین. دووەم ـ باوەڕ ناکەم، سەدەی850 ـ 650ی پێش زایین، لە مێژوودا هەبێ!

پەرستشگای « بەلّخ » کوژراوە، لە « گات »ەکانا ناوی زەردەشت هەیە، وە بەپێی دەستووری زمانشناسیی، بە هۆی کۆنیی زمانی « گات »ەکانەوە ناکرێ کە ئەم بەشە لە ئاوێستادا لە سەرەتای هەخامەنشیەکانەوە دابنێین. کەواتە نابێ مێژووی زەمانی زەردەشت، لە مێژووی سەرەوە کەمتر، وە یا زیاتربێ. جا لەبەرئەمە سەردەمی زەردەشت بە « 660-583 »ی پێش زایین دائەنێین.) «16-15،68»

هەروەها، دەربارەی « ئاڤێستا »، « سوجادیی »دەڵێ: (ئەم پەرتووکە وا دەرئەکەوێ، لە سەردەمی « ماد »ەکاندا لە « زار »ەوە کەوتۆتە سەر نووسین، لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا دوو ڕوونووسی تەواوی هەبووە. یەکێ لەمانە لە تەختی جەمشیددا بوو، کاتێ کە ئەسکەندەر لە «331 »ی پێش زاییندا ئاگردانی بنەماڵەی هەخامەنشیی کوژاندەوە و کۆشکی شاهیی تەختی جەمشیدی سووتاند، ئەو ڕوونووسە ئاوێستایە کە لەوێ بوو، ئەمەش سووتا. ڕوونووسەکەی تریشی هەر کەوتەدەست یۆنانییەکان، پاش ئەوەی ئەو شتانەی کە لە بارەی زانست و پزیشکیی و ئەستێرە ژمێرییەوە قسەیەکرد، وەرەیانگێڕایە سەر زمانی خۆیان و بردیان، ئەوەشی کە مایەوە ئەوەشیان هەر سووتان و لەناویانبرد. لە پاش ئەوە کە ئەشکانییەکان ئاشنابوون بە ئایینی زەردەشتیی « بەلاش »ی یەکەمی پادشای ئەشکانیی فەرمانی دەرکرد بۆ کۆکردنەوەی ئاوێستا ـ ئەوەی کە بەردەست ئەکەوێ ـ . لە سەردەمی ئەردەشێری پاپەکانی ساسانیدا، ئایینی زەردەشتی برەوێکی باشی پەیداکرد، فەرمانی دا بە « تەنەسوور » ـ کە هیربدانی هیربد ـ بوو، واتە: گەورەی پاسەوانی ئاتەشکەدەکان، کە ئاوێستا کۆکاتەوە و ڕێکیخاتەوە، ئاوێستا و ئایینی زەردەشتیی ببێ بە یاسا و ئایینی کیشوەری ساسانیی.) «20،68 »

(بەم جۆرە ئاوێستایەکی ڕێکوپێک دروسبوو، کرا بە بیستویەک « نسک » واتە: « بەش »ەوە. لە سەر ئەم ڕێگەیە مایەوە، تا پەیدابوونی ئایینی ئیسلام. لەم کاتەدا یەکێ لەو شتانە کە لە ناودران، ئاوێستابوو! ئەو ئاوێستایەی کە ئێستە ماوە چواریەکی ئاوێستای سەردەمی ساسانییە.) «21،68»

(ئاوێستا، لە سەردەمی ساسانییەکاندا بە پەهلەویی لێکدرایەوە، ئەو لێکدانەوەیەی پێی ئەوترێ « زەند ». کەواتە: زەند واتای تەفسیری ئاوێستا ئەکا بە پەهلەوی.)...(« پازەند »یش شەرحی « زەند »ە و گوایە بە زمانێ نووسراوەتەوە لە زمانی پەهلەویی سووکترە.)«68،24-25»

لە بارەی پەیدابوونی زەردەشتــەوە، مێــژوونووسی یۆنانی « گـزانتـوس » دەڵێ: (« 1080 پ.ز. زەردەشت پەیدابووە. زەردەشتییەکان خۆیان ساڵی « 660 » پ.ز. باسئەکەن.)«91،106»

میستـەر « جاکسنی » شارەزای ئایینی زەردەشت دەڵێ: (زەردەشت لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پ.ز. هاتۆتە دنیاوە و لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی پ.ز. لە دنیا دەرچووە، کە ئەم ڕایە، زۆر نزیکە لە ڕای زەردەشتییەکان خۆیان.)«91،106»

« دیاکـۆنۆف » دەڵێ: (دەربارەی شــوێنی لەدایکبــوونی زەردەشت، بیروباوەڕی جیاواز هەیە. بەڵام، باس و بەسەرهاتەکانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست، زۆریان لەوەدا یەکدەگرنەوە، کە زەردەشت خەڵکی ماد بووە.) «88،42»

« عەبدوڵڵا قەرەداغی » دەڵێ: (لە نووسینەکانی داریوشی یەکەم - ساڵی « 552 پ. ز. »، کە لە بێستوون دایە، ناوی ئاهۆرامزدا وەک خودای یارمەتیی و پاڵپشتی ئەو، زۆر هاتووە. لە هیچ نووسینێکدا ناوی زەردەشت نەهاتووە. لە کاتی فەرمانڕەوایی مادەکان، لە ساڵی «701پ.ز » تا ساڵی « 550 پ.ز. »دا، ناوی ئاهۆرامزدا و زەردەشت نییە.) «46،65» بەڵام، هەر نووسەر خۆی، لە شوێنێکی دیکەی نووسینەکەیدا دەڵێ: (هەتا فەرمانڕەوایی ماد لە ساڵی « 700 پ.ز. »ەوە، ناوی زەردەشت نییە و ... تاد.)«68،65» ئەمە خۆی لە خۆیدا، ناکۆکییەک لە نێوان بیروڕاکانیدا دروسدەکا. چونکە، جارێ دەڵێ: (لە ساڵی701 پ.ز. تا ساڵی 550 پ.ز.دا، ناوی ئاهۆرامزدا و زەردەشت نییە.) جارێکی دیکەش دەڵێ: (هەتا فەرمانڕەوایی ماد لە ساڵی 700 پ. ز. ەوە، ناوی زەردەشت نییە) واتە: لەو مێژووە بە دواوە، ناوی زەردەشت هەبووە!

پاشان دەڵێ: (باوەڕم وایە، زەردەشت، لە سەدەی شەشەمی پ.ز.زدا و لە

کاتی فەرمانڕەوایی داریوشدا بووە. بەڵام تا دوای داریۆشیش وەک پێغەمبەرێ نەناسراو بووە و ناوی نەهاتووە. لە هەموو نووسینەکانی هەخامەنشیدا، ناوی زەردەشت نەهاتووە. لە فەرمانڕەوایی داریوشی یەکەمەوە لە سالی 552 پ. ز. ەوە تا کۆتایی هەخامەنشی ـ هاتنی ئەسکەندەر 323 پ.ز. ، ئەو ماوەیە دووسەد سالێ دەکا. )«69ـ68،65»

بە ڕاستیی، مەگەر هەر نووسەر خۆی، سەر لەم ناکۆکییانە لە دید و بۆچوونەکانیدا دەرکا ، ئەگینا بە ئێمە ناچنەوە سەر یەک! پاشان، دەربارەی کوشتنی « زەردەشت » دەڵێ:(زەردەشت لە تەمەنی حەفتاوحەوت سالیدا، لە شەڕی نێوان ئارجسپ پادشای توران زەمین و گوشتاسپدا، لە کاتێکدا زەردەشت لە بارەگای گوشتاسپدا، لە ئاگردانی خۆیدا بووە، بە دەستی پیاوێک بە ناوی « برات ڕەک ڕەش »ی تۆرانییەوە شەهیدکراوە. بێگومان شەڕەکەش لە سەر جیاوازی ئایینیی بووە. )«79،65»

ئاڤێستا، وەک سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگ، بۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی ماد، ڕەچەڵەکی کورد و زمانی کوردیی، نرخێکی تایبەتیی هەیە.(ئاڤێستا کتێبێکی پیرۆزی ئایینیی زەردەشتە، کە بە زمانێک لە زمانە کۆنە ڕەسەنەکانی ئێرانی و ڕیشەی هیندۆ ئەورووپایی نووسراوە. )«79،42»

هەر چەندە، ئەم دید و بۆچوونانە، دەربارەی لەدایکبوون، کوشتن، ئایینی زەردەشت و باوەڕەکانی هەن. گەلێ لە نووسەران، شارەزایانی زمان و مێژوو باسیانکردوون. بەڵام، تا ئێستە، بە تەوایی ڕوون نەبۆتەوە، ئاڤێستا لە چ سالێکدا نووسراوە؟ کەی پەیدابووە و لە کوێ پەیدابووە؟ بەڵکوو، زاناکانی مێژوو، سەبارەت بەو کێشەیە، باوەڕی جیاوازیان هەیە و بە شێوەیەکی بەردەوام، لێکۆڵینەوەی نوێی لە سەر دەکەن.(هەندێ لە شارەزا و زانایان لەو باوەڕەدان، کە زەردەشت هاوچەرخی داریۆشی یەکەم « 485 ـ 522 »ی پێش زایین بووە. « هرتل » و « هرتسفلد »، ئەوانیش، لەو باوەڕەدان، لە ناو زانا و ڕۆشنبیرەکانی شورەویشدا ئاکاد میسین و.و. ئاسترو ئەویش، باوەڕی هەر وایە. بەڵام، زانا و شارەزایانی تر، سەرەتای کۆنترین بەشی ئاڤێستا، بە زمانە کۆنەکانی تر ئەزانن. )«79،42»

دوور نییە، هێندێ لە خوێنەرانی کورد بڵێن: ئەم باسە باسێکی کۆنە و

گەلێکی لە بارەوە نووسراوە، چ پێویست دەکا، خۆتی پێوە بخافڵێنی و سەری ئێمەشی پێوە بیەشێنی! منیش، لەگەڵ ڕەوانشاد « زوبێحی »دا دەڵێم: (دوو زمانی زۆر کۆنی مادیی و ئاڤێستایی کە گومانی تێدا نییە، ئەو کانیی و سەراوانەن شەقەجۆی زمانی کوردیی ئێمڕۆیان لێ هەڵگیراوە، ئەوەندە دێن، کە نەختێ زیاتر لە شتی دی، خۆیان پێوە ماندووکەین و لێیان بدوێین.)«21،70»
ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، کەمێ بە کورتیی، باسی « ئاڤێستا » و «زمانی ئاڤێستا » بکەین. ئاڤێستا، بە یەکێ لە گرنگترین و دێرینترین، پەرتووکی پیرۆزی گەلانی ئێرانی کۆن دادەنرێ. ئاڤێستا، وەک پەرتووکە پیرۆزە ئایینییەکانی دیکە، لە لایەن خواوە بۆ « زەردەشت » نێررابێ، یا هەر « زەردەشت » خۆی ڕێکیخستبێ و دایناب‌ێ، هێندە بە لای ئێمەوە گرنگ نییە و شتێ لە باسەکەمان ناگۆڕێ. چونکە، ئێمە لێرەدا، باسی لایەنە ئایینیی و خواپەرستییەکەی « زەردەشت » ناکەین، بەڵکوو، تەنیا لە ڕووی مێژوو و زمانەوە لێی دەدوێین.
لەوە دەچێ، تا ئێستە، ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە، لای شارەزایانی زمان، زۆر ڕوون نەبێ. بۆیە، هەر بە « زمانی ئاڤێستا » ناوی رۆشتوە. لەگەڵ ئەوەشدا، مێژوونووسان و پسپۆڕەکانی زمان، تا ئێستە، بە تەواویی نازانن، لە کەیدا نووسراوە؟ بەڵام، هێندێ پسپۆڕ پێیان وایە،(بە لانی کەمەوە، دەورووبەری دە سەدە پێش زایین هەبووە.)«20،4»، «59،101» بەڵام، (ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە و بە هۆی ئاڤێستاوە ناوبانگی دەرکردووە، یەکێکە لە زمانە کۆنەکانی ئێران، کە سەردەمی گەشە و برەوی نازانرێ. بەڵام، خەتی ئاڤێستا، یەکێکە لە تەواوترین خەتەکانی جیهان، کە بە ئایینی دەبیرە، یان بە ئایینی دەبیرەیی ئەناسرێ و لەگەڵ زمانە کۆنەکانی ئارییی، وەک سەنسکریت و پارسی کۆندا نزیکایەتیی و تێکەڵاویی هەیە و گەلێ واژەی هەر یەکە لەم زمانانە، لە یەکتریدا هەن، بە تایبەتیی لەگەڵ زمانی کوردیی ئەمڕۆدا، خزمایەتی و نزیکایەتی زۆرترە، چونکە بە دەیان واژەی زمانی کوردیی، هاوواتا لەگەڵ زمانی ئاڤێستادا هەن.)«61،101»

له بارەی زمانی ئاڤێستاوە، « دیاکۆنۆڤ » دەڵێ: (ئێمە ناتوانین، ئەوە دەسنیشانکەین، کە زمانی ئاڤێستا لە کام شێوەی زمانە، تەنیا یەک شت هەیە، کە لە ئاسیای ناوەڕاست و ...« ئەفغانستانی ئێستە و خۆراسان » پەیدابووە، وە یان ئەگەر لە سەرزەمینی ماد پەیدابووبێ، لە ئەو پەڕی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی خاکی مادەوە بووە.)«89،42»
هەڵبەتە، نەک هەر ئاڤێستا، بەڵکوو، هیچ یەکێ لەو پەرتووکە ئایینییانە، لە سەردەمی پەیامبەرەکانیاندا نەنووسراونەتەوە. بۆ نموونە: « تەورات » دوای ئەوەی پەیامبەر « موسا » مردووە، نووسراوەتەوە. « قورئان »یش لە سەردەمی خەلیفەی سێیەمی ڕاشدین « عوسمانی کوڕی عەفان »دا نووسراوەتەوە. لەبەرئەوە، شتێکی زۆر ئاسایی یە، کە ئاڤێستاش لە سەردەمی پەیامبەر « زرردەشت » خۆیدا نەنووسرابێتەوە.
(بەگوێرەی ئەو نووسراوانەی مانی « سەدەی سێیەمی زایین » کە لە ساڵی «1930»ز لە میسر بەر دەسکەوتوون، وای نیشانئەدەن، کە زەڕدەشت لە سەردەمی خۆیدا، بیروباوەڕی خۆی بە قووتابییەکانی لەبەرکردووە، واتە: هەتا زەڕدەشت، خۆی لە ژیاندابووە، ئاڤێستا نەنووسراوەتەوە، بەڵکوو لە سنگدا پارێزراوە. کەواتە: دواتر، دوای مردنی زەڕدەشت، ئاڤێستا نووسراوەتەوە.)«64،101» هەڵبەتە، گەر لە سەردەمی « زەردەشت » خۆیدا، هیچ لە ئاڤێستا نەنووسرابێتەوە، جگە لەوەی، زۆری لێ فەوتاوە، لە یەک سەردەمی دیاریکراو و بە یەک جاریش نەنووسراوەتەوە.
لە بارەی نووسینەوەی ئاڤێستاوە، مێژوونووسی ئیسلام « مەسعوودی » دەڵێ: (ئاڤێستا بە ئاوی زێڕ، لە سەر دوازدە هەزار پێستەگا نووسرابووەوە.)«14،4» ئاڤێستای ئێستە، لە شەش بەش، شەش «نەسەک » واتە: پەرتووک پێک هاتووە، (گاتا، یەسنا، یەشتا، ئاڤێستای پچووک، ڤایسپەرد، ڤەندیداد.)«65،101»
هەڵبەتە، ئەو پەتپەتیی و کارەساتانەی، بە سەر پەیامبەر « زەردەشت » خۆی، ئایینەکەی، ئاڤێستا و زمانەکەی هاتووە، بە سەر هیچ پەیامبەر، ئایینێکی ئاسمانیی، پەرتووک و زمانە ئایینییەکانی دیکەدا نەهاتووە. ئەوە جگە لەوەی، « زەردەشت » خۆی کوژراوە، ئایین و ئاڤێستاکەشی، لە

هێندێ ڕووەوە شێوێندراوە، پەرتووکەکەشی چەندین جار سوتێندراوە. پاشان، سەرلەنوێ کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە. بۆیە، جار لە دوای جار، ئاڤێستا کەمیکردووە. چونکە، ئایینەکە لە نێوان گەلانی ئێرانی کۆندا، دەساودەسیکردووە. چەندین جار دەسەلاتی فەرمانڕەوایی لە ئێراندا گۆڕاوە. نیشتمانی مادەکان، لە لایەن یۆنانییەکانەوە داگیرکراوە. جا بزانە، چی بە سەر ئاڤێستا و ناوەڕۆکەکەی هاتووە؟ ئەوەی لەو ئایین و پەرتووکە ڕوویداوە، مەگەر هەر، لە نەتەوەی کورد خۆی قەومابێ!!!

لە سەردەمی هێرشەکەی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا، ئاڤێستا تووشی چەلەمەیەکی گەورەبوو. یۆنانییەکان، بەشی زۆریان سووتاند.(چەن سەدەیەک پاش ئەو ڕوودا وە، پاشایانی ساسانیی، دەستیان بە کۆکردنەوەی ئاڤێستا کردەوە. بەشێکیان وەرگێڕا بۆ زمانی باوی دەسەلاتدارییەکەیان «زمانی پەهلەوی ». بەدبەختانە لە هێرشی عەرەبەکاندا، بەشی زۆری نووسراو و نەسکی ئاڤێستای ئەو سەرەدەمە سووتێندرا.)«15،4»

بۆیە، (ئەوەی کە ئێستە، بە ناوی ئاڤێستاوە ماوەتەوە، ئەو ئاڤێستا تەواوە نییە، کە لە ڕۆژگاری خۆیدا بووە. بەلکوو، زۆربەی لە ململانێی سەختی ڕۆژگار و لە نێوان دوژمنانیدا لەناوچووە. وەک لە نووسراوی ئایینی زەردەشتیدا باسکراوە، ئاڤێستا لە کاتی خۆیدا، بە خەتی زێڕین و لە سەر دوازدە هەزار پێستەی خۆشکراوی گا نووسراوەتەوە. ئاڤێستا، لە یەک زەمان و بە دەستی یەک کەس نەنووسراوەتەوە.

لە سەردەمی دارای کوڕی داریۆشی سێیەمدا، فرماندراوە، کە دوو دانە ئاڤێستا بە تەفسیری زەندەوە بنووسرێتەوە، بۆ ئەوەی یەکێکیان لە گەنجینە و کتێبخانەی دەولەتیدا لە پەرسەپولیس « تەختی جەمشید » و ئەوی تریان لە کتێبخانەی ئەرشیفی میللیدا بپارێزرێن. بەلام لە دوای هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ سەر ئێران « 334 پ. ز. » ئەسکەندەر فرمانیدەرکرد، هەرچی ئاڤێستا هەیە، کۆبکرێتەوە و سەرلەبەری بسووتێنرێ. جگە لە هەندێ بەشی، کە بریتیبوون لە زانستی ئەستێرەناسی و پزیشکدانی، کە لەگەل خۆیدا بردنی. ئیتر بەم بۆنەیەوە، ئاڤێستای نووسراویش سەرپاکی لەناوچوو. لەم بارەیەوە، مەسعودی

مێژوونووسی سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی « مەسعودی، ئەبو ئەلحەسەن عەلی بن حسین؟ ـ 957 ز. » کە خۆی لەو پەرتووکەدا، بە ناوی «ئەلتەنبیە و ئەلئشراف » نووسیویەتی و گەلێ زانیاریی دەربارەی زەردەشت و ئاڤێستا و ئایینی دەبیرە تێدایە، ئەڵێ: بە هەزاران نوسخەی ئاڤێستا، لە لایەن هێلینییەکانەوە لەناوچوون و سوتێنران. بەم جۆرە کە دەسەڵاتی هێلینییەکان بە سەر ئێراندا ماوەی 300 ساڵی خایاند، ئایینی زەردەشتیش بێدەنگی و ساردبوونەوەیەکی درێژ و سەختی بەسەرداهات، چونکە هێلینییە داگیرکەرەکان، بە ڕقێکی سەختەوە کەوتنە قەڵاچۆی هەموو سیمایەکی ئایینی زەردەشت و پیر و ماگای زەردەشتی بە درێژایی فەرمانڕەوایی هێلینییەکان، لە ژێر ئەشکەنجە و ئازار و ڕاونان و شاربەدەرکردن و کوشتن و برینداا بوون. بەڵام دوای دەرکردنی هێلینییەکان بۆ دەرەوەی ئێران «77 ـ 52 پ.ز. » ولخشی پاشای ئەشکانی، فرمانی دەرکرد، بەیاننامەیەک بە سەرتاسەری وولاتدا بلاوکرێتەوە و تیایدا ڕابگەیەنرێ، کە هەرچی ئاڤێستا و زەند ئاڤێستا ماون و جێی متمانەن، کۆبکرێنەوە.
دوای ئەمیش، دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانیی، ئەردەشێری کوڕی پاپەک «226 ـ 227 »ز. بە ڕاوێژی تەنسەری پیری پیران، فەرمانیدەرکرد، کە سەرپاکی ئاڤێستای پەرتوبلاو لە بارەگای دەربار کۆکرێتەوە. تەنسەریش بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، هەموو موبەد و پێشەوایانی ئایینی بۆ پایتەخت بانگێشتنکرد و کارەکەیان بە ڕێکوپێکی گرتەئەستۆ. پاشان شاپوری یەکەمی جێنشینی ئەردەشێر، ئەم کارەی ئەنجامدا و ئەم نوسخەیەش دواتر بەر هێرشی ئایینی ئیسلام کەوت «274 ـ 242» ز. ... ئیتر هەمدیسانەوە ئاڤێستا کەوتەوە بەر هێرشی ئایینی ئیسلام و دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای ئیسلام « 632 ـ 651 » ز. کە سەرلەنوێ بوو بە هۆی لەناوچوونەوەی پاشماوەکانی ئاڤێستا و قەدەغەبوونەوەی ئایینی زەردەشتی. لەبەرئەوە، ئاڤێستا سەرلەنوێ کەوتەوە ناو سنگی پیرانی ئایینییەوە. کە ئەوانیش پەیتاپەیتا، لێرە و لەوێ، ڕاوئەنران و لەناوئەبران. ئەوانەشیان کە لەو جۆرە ڕاونانە دەربازبوون، مەگەر زۆر بە نهێنی و لە ناوچە دوورەوپەرێز و شاخاوییە سەختەکاندا خۆیان گرتبێتەوە و تیایدا خۆیان حەشاردابێ.

زۆربەی زۆری پیرە ئایینییە ڕاونراوەکان، لە چەم و دۆڵەکانی هەورامانی تەختدا، ناویان هەیە و یەکێکیش لەوە پیرە بە ناوبانگانە پیرشالیاری یەکەم، یان پیرشالیاری زەردەشتییە، کە خاوەنی کتێبی ئایینی و فەلسەفەی ئایینی ماریفەت پیرشالیارییە.)«101،59 ـ 61»
ئاڤێستا، دوو جۆر بووە: ئاڤێستای گەورە و ئاڤێستای پچووک یا وردە ئاڤێستا. (« یسنا » و « یەشتەکان » و « ویسپرد » ئەمانە بەشێکن لە کتێبی ئاڤێستای گەورە « نسکەکان » کە بە دەستی ئێمە نەگەیشتووە.) «42،80» وا دەردەکەوێ، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، ئاڤێستای گەورە هەبووە و نووسراوەتەوە. بەڵام، هەر زوو لەنێوچووە. پاشان، ئاڤێستای پچووک نووسراوەتەوە، وەک کورتەیەکی ئاڤێستا وایە.
دەربارەی زمانی ئاڤێستای پچووک، دیاکۆنۆف دەڵێ:(زمانی ئاڤێستای پچووک ئەتوانین، بەشێوەی فارسیی کۆنی سەدەکانی شەشەم و پێنجەمی پێش زایینی، بەڵکوو کۆنتر بدەینە قەڵەم .. بە ڕای زۆربە ئەم زمانە هی ئەو کات و ناوچەیە کە ئاڤێستا « زمانی تایبەتیی نووسینی کتێبی زەردەشتی بووە تیایا. واتە: زۆر ڕێی تێنەچێ، لە سەدەکانی پێنجەم و چوارەمی پێش زاییندا » لەوێ پەیدابووبێ. چونکە لەو کاتەدا و هەندێ دوای ئەوەش پەرتووکی ئایینی زۆر نووسراونەتەوە)«42،81»
دیارە، ئاڤێستا لە سەردەمی هەخامەنشییەکان کۆنترە. چونکە، ئەو زمانەی لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەواندا باوبووە، ئەو زمانە نییە، کە ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە. ئەمەش، ئەوەمان بۆ دەردەخا: بە زمانی مادەکان نووسراوەتەوە. بەڵگەشمان ئەوەیە،(ئەو ئەفسانە و باوەڕانەی کە لە ئاڤێستادا هەن، بەر لە سەدەمی پەیدابوونی هەخامەنشییەکانە، ئاڤێستا بە تەواویی ناشارەزای ئیمپراتۆریای هەخامەنشییەکان و پاشاکانیان بووە، وە لەگەڵ ڕۆژاوا واتا ـ بەین ئەلنەهرین ـ و سووریە و ئاسیای پچووک و یۆنان و میسر، یان بە واتایەکی تر لەو کیشوەرانەی کە چەن هۆزێکی جۆربەجۆری سەر بە هەخامەنشییەکان لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زاییندا هاتوچۆی ئەوێیان ئەکرد، زۆر بێ ئاگابوون. وە لەوە ئەچێ، ئەوانەی ئاڤێستایان نووسیوەتەوە، بە تایبەتیی چۆنێتی سەردەمی

خـۆیان باس نەکـردووە، بەڵکوو ئەو شـتـانەی کـە لـە سـەردەمی کـۆنا بە پیـرۆزیان زانیـوە، ئەوانەیان بە پیـرۆز داناوە، وە لـە هەمـان کـاتا ڕواڵـەتی ژیانی سـەردەمی ئەوانەی پەرتووکـەیان ڕێکخـسـتـووە، تـا ڕادەیەک دیارە.) «83 ـ 81،42»

جگە لەوەی، کاتێ یۆنانییەکان، پەلاماری هەخامەنشییەکانیان دا، بەشێ لەوانە هەلاتن و لە ناوچەکانی ئاسیای پچووک و یۆنان گیرسانەوە. (کۆمەڵە خەڵکێکی ئیمپراتۆریای هەخامەنشییەکان، لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زاییندا، لە کـاتی شـەڕەکـانی نێـوان ئێـران و یۆناندا، بۆ ئاسـیـای پچووک و یۆنان ڕۆیشـتـوون، ئەگـەر ئاڤێـسـتـا هەمـوو ڕواڵـەتەکانی ژیانی ئیـمپـراتۆریای هەخامـەنشـییـەکانی نیشـانداية، لەوە نەئەچوو، ئەم باسـەی بەیادا نەهاتبایە.)«641 ـ 640،42» دیارە، گەر زەڕدەشت لەو سەردەمانەدا بژیایە، هەڵبـەتە، باسـێکی ئەو پەلامـاردانەی یۆنانیـیـەکـانی تۆمـاردەکـرد. بەلام، لەوە دەچێ، پێش ئەو مێژووە کوژراوە.

کەواتە، کەی ئاڤێستا نووسراوەتەوە؟ کەمێ پێشـتـر گوتمان: لە سەرەتادا، ئاڤێـسـتـا لە بیـسـتـویەک نسـک پێکهاتبوو. دیارە، هێندێ لەوانە، کـاتێ ئەسکەندەر ئێرانی داگیرکرد، لەناوچوون. ئەمە، ئەوە دەگەیەنێ: ئاڤێستا، پێش ئەسکەندەر نووسراوە. (چونـکە، لەوە ناچێ، لە دوای سەدەی چوارەمی پێش زایین، زانایەکی شـارەزای زمـانی کـۆن و نەریتی کـۆمـەلایەتی ئەو سەردەمە و شارەزای زمانی لەناوچووی ئاڤێستا، ئەمەی زیندووکردبێتەوە و وەکـوو خـۆی دەریهێنابێ. بەلام، گـەر یەک زمـانی ئەدەبی ئاڤێـسـتـایی ـ یا زمـانێـکی گـونجـاو ـ هەبوایە، لەوە ئەچوو لەو سەردەمەدا لە شوێنەواری ئەو زمـانە مـردووە، چەن پارچە نووسـینێـکی وەکـوو « فـرگـرد » ـ بەش ـ ی یەکەمی ویدودات و بەشەکەی تری ئاڤێـستـا ـ کە پەیوەندییان بە ڕۆژگاری دواوەیە ـ نووسرابێتەوە. ئەو باسە ئەدەبییە کۆنانەی لە ئاڤێـسـتـادا هەیە و شێوەی ڕەوانی زمانەکەیە، ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن، کە زمانی یەکەمین بەشەکانی ئاڤێستا، بە زمانی کۆنتر لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایین بزانین، « کە زۆر کەس لە نووسەران و شارەزایان لەو باوەڕەدان، کە زمـانی سەردەمی ناوبراوە. »)« 83،42 »

(بەپێی باس و بەسەرهاتە زەردەشتییەکان، کە لە کتێبی « دنکرت » ـ کە بەشێکی لەو نووسینانەی ئاڤێستایە و بە دەستی ئێمە نەگەیشتووە ـ هەیە، یەکەمین کۆششێک کە بۆ زیندووکردنەوەی ئاڤێستای « بەر لە ئەسکەندەر » دراوە، لە سەردەمی « وەلکش » ـ لەوە ئەچێ ولوگزی یەکەم لە سەدەی یەکەمی زایینیدا ـ دا بووبێت. دوای ئەوە لە سەردەمی یەکەمین پاشای ساسانییەکانا « ئەردەشێری بابەکان »، « 226 ـ 240 »ز. هەندێ نیگاری تازەی لێ پەیدابووبێت و دەستووری ئاڤێستا بە یەکجاری لە سەردەمی شاپوری دووەمدا « 310 ـ 379 »ز. جێگەی خۆی گرتبێ. لەوە ئەچێ بەر لە ئەسکەندەر باسی زیندووکردنەوەی دەستووری ئاڤێستا لە ناوا نەبووبێ، بەڵکوو زۆرتر هەر خەریکی کۆکردنەوەی پەرتووکی ئایینی بوون، کە بە ناوی زەردەشتەوە بووە و ماوەتەوە، ئەوانەی کە لەگەڵ نەریت و یاسای ڕەسمیدا گونجاوە، هەڵیانبژاردووە و بووەتە دەستوورێکی ئایینی.) «42، 83 ـ 84»

گەر ئایینی جوو، لە سەدەی شەشەم و پێنجەمی پێش زاییندا، لە ناو خەڵکیدا بڵاوبووبێتەوە و دەرکەوتبێ، ئەوا ئایینی زەردەشتی، زۆر لە ئایینی جوو کۆنتربووە. هەڵبەتە، ئایینی جوو، دوای ئایینی زەردەشت هاتووە. بۆیە، لە تەوراتدا باسیدەکا. بەڵام دیاکۆنۆڤ دەڵێ: (هەموو ئەو ڕۆنووسانەی ئاڤێستا کە بە دەستی ئێمە گەیشتووە، هینی سەردەمی دواییە و کۆنترین نوسخەیان هینی سەدەکانی سیازدە و چوادەیەمی زایینییە. وە بە زمانی سانسکریتی و پارسی ناوەڕاست لێکدراونەتەوە و تەرجومەکراوە. وەک گوتمان، « ئەسکەندەری مەکدۆنی »، زۆربەی زۆری پەرتووکە پیرۆزەکەی « زەردەشت »ی سووتان. لەبەرئەوە، ئەمە ئەوە ئەسەلمێنێ: (ئەو ئاڤێستایەی لە کۆتایی سەڵتەنەتی پارتەکان و سەرەتای حوکومەتی زنجیرەی ساسانیی ـ لە ماوەی سەدەکانی یەکەم و چوارەمی زایین ـ بە هەوڵوتەقەلای موغەکان کۆکراوەتەوە، لە سەدەی چوارەمی زاییندا، بە شێوەی نووسینی ئارامیی کە پیتی دەنگداری تێدا نەبووە، وە لە سەردەمی داریوشی یەکەم ـ سەدەی چوارەمی پێش زایین ـ پێکهێنراوە و نووسراوەتەوە.) «42، 85 ـ 86»

(هەندێ لە لێکۆڵەران وا ئەزانن، ئەم لادانە لەبەرئەوەبووە، زمانی ئاڤێستا « کە ئێستە بۆ ئێمە دەرکەوتووە » بە زمانی کۆمەلانی خەڵکی ژووررووی ڕۆژاوا نزیکبووبێ. جگە لەمانە زمانەکانی « ژووررووی ڕۆژاوا » و «ژووررووی ڕۆژهەلات » ، لە کۆنترین ڕۆژگارەوە، تا ئێستە وەک پێویستە، نەزانراوە، بەم هۆیەوە بەشبەشکردن و لێکۆڵینەوەی ئاڤێستا و ڕوونکردنەوەی بابەتەکانی و شوێنی پەیدابوونی ڕوون نەکراوەتەوە.) «87 ـ 86،42»
ئەوەی لە ڕۆژگارێکی زۆر کۆنەوە، بە دەس ئێمە گەیشتووە، ئەو بەشەی ئاڤێستایە، کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا « سەدەی سێی پ.ز. ـ پێنجی ز. » پارێزراوە و ماوەتەوە. ئەویش(ئەکرێت بە چوار بەشەوە، وەک:«یسنا، وندیداد ـ ویدودات، یشتەکان و وێسپرد » ... ئەوەی پێوەندیی بە زمانەوە هەبێ، ئەوەیە(ئامۆژگارییە ڕێکخراوەکان، کە لە بارەی زمانەوە کۆنترین بەشی ئاڤێستایە. ئەمانە بەشێکن لە « یسنا ». ئەم ئامۆژگارییانە ئەوانەن، کە پێیان ئەڵێن: « گاتا » ـ گاتاکان ـ وە بریتین لە کۆمەڵە ئامۆژگارییەکی کێشداری ئایینیی و کۆمەلایەتیی، کە قسەی ـ لەو وێنەیەی ـ پێغەمبەرانی تەوراتمان دێنێتەوە یاد. هەندێ لە زانا ئەوروپایی یەکان، کە شارەزای مێژووی زەردەشتن، « گاتاکان » بە هی زەردەشت ئەزانن. ئەم ئامۆژگارییانە بە شێوەی ئەدەبی زمانی سەرەتایی و کۆنتر لە پارسیی کۆن و نزیکتر بە زمانی « ڤیدا »ییە هیندیی یەکان نووسراون.)«79،42»
ئەوەی گومانی تێدا نییە، کاتێ زەردەشت « گاتاکان »ی داناوە، یەکسەر تۆمار نەکراون، بەڵکوو، دوای ماوەیە نووسراونەتەوە. بەلام، لەوە دەچێ، دوای ماوەیەکی کەم تۆمارکرابن. چونکە، لەانەیە(« گاتاکان » ماوەیەکی زۆر بە زارەکی باسکرابن و گێڕرابنەوە، کاهن و پیرەوەکان لە یەکترییەوە بیستوویانە و وەریانگرتبێ و ئەوانیش بۆ خەڵکی تریان گێڕابنەوە. تا دوایی لە کاتی ڕێکخستنی کۆنترین وردە بەشەکانی ئاڤێستادا، لە کاتێکدا کە لە دوای داریوشی یەکەم، کە نووسین بە ئەلفوبێی ئارامیی ئەنووسرا، ئەوانیش نووسراونەتەوە.)«80،42»
بەشی دووەمی « یسنا »(لە پاڕانەوە لە یەزدانەکان و یاسای زەردەشتی و

نەریتە ئایینییەکان و ... « ویسپرد » لە ئاڤێستا VISPE - RATAVO تەواوکەری شێوەی ناوەڕۆکی « یسنا » یە کە لەوە ئەچێ، لە دواییدا نووسرابێتەوە. « یشت » یەشتەکانیش بریتییە لە کۆمەڵە سرود و وتارێک ـ کە هەندێ لەوانە بۆ خواوەندەکان وتراوە ـ هەندێ لەو سرودانە بە شێوەی « گاتاکان » نووسراون. لەوە ئەچێ، نووسینەوەی ئەم کتێبە «وەکوو هەندێ لە بەشەکانی تری « وردە ئاڤێستا » یان « ئاڤێستای پچووک » لە زەمانێکدا بووبێ، کە ئایینی زەردەشت ئەو ناوچەیەی گرتبێتەوە و لایەنێکی ڕەسمیی بۆ خۆی پەیداکردبووبێ. لەبەرئەوە، چونکە لە چۆنێتی یەکتر و گەلێ بابەتی ئایینی ترا وەکوو مەسیحییەکان لە یەکتر ئەچن. وە گەلێ بابەتی ئایینی کە پێش لە ئایینی زەردەشت لە ناو خەڵکدا بەهاداربووە، تیایەتی. لەبەرئەمە بابەتەکانی « یەشتەکان » زۆر فراوان و کۆنن ـ تەنانەت لە « گاتاکان » کۆنترن ـ لەگەڵ ئەوەدا ـ بەڕای ئێمە ـ لە کۆنترا بەشێکبووە، لە کۆمەڵە یاسایەکی ئایینی.)«80،42»

دەربارەی زمانی ئاڤێستا، « دیاکۆنۆڤ » دەڵێ: (بەڵام لە واقیعدا، هیچ گومانی بۆ ناچێ، کە ئاڤێستا یەکەمین جار لە ئاترۆپاتین پەیدابووبێ .. ئەو مەرجە کۆمەڵایەتییانەی کە لە ئاڤێستادا « وە بە تایبەتیی ـ گات ـ ەکان کە کۆنترین بەشی ئاڤێستایە » باسکراوە، لە بارەی چۆنێتییەکەیەوە کە تەنانەت لە کاتی سەڵتەنەتی ماد ـ سەدەکانی حەوتەم و شەشەمی پێش زایینی ـ فەرمانڕەوابووە، زۆر کۆنترە. ئەمەندە بەسە کە بڵێین: هێشتا لە ئاڤێستادا زاراوەی ئاسن لە حەوجۆش جیا نەکراوەتەوە. هەروەکوو ئاڤێستا لە سەرزەمینی ماد نووسراوەتەوە. هەر چۆن بەراوردکرێ، لەوە ناچێ، لە دوای سەدەی نۆیەم و هەشتەمی پێش زایینی نووسرابێتەوە، وە ئەمە خۆی لەگەڵ بەسەرهات و باسەکانی هەندێ لادا هاوشان ئەبوو. ئەم باس و بەسەرهاتانە ـ لە سەدەی چوارەمی پێش زایینددا « زەردەشت » بە سەردەمێکی کۆنەوە ئەبەستێ و باسی لێوە ئەکات.

بەڵام لە سەدەکانی نۆیەم و هەشتەمی پێش زایینددا، لە ئاترۆپاتین بە زمانی ئێرانی قسەیان نەئەکرد، لەوە ئەچێ، ئاڤێستا لە پێشا بە زمانێکی تر نووسرابێ و دوایی وەرگێڕابێتە سەر ئەو زمانە، دیسان ئەمەش گومان

پەیدائەکا. هەموو زاراوە ئایینییەکانی ئاڤێستا و هەموو ناوەڕۆکە ئایینیی و فەلسەفییەکانی ئاڤێستا ـ وەکوو « ئارت Arta، rta » ـ لە ناو هەموو تیرە و هۆزە ئێرانییەکاندا، ڕواڵەتێکی دادپەروەریی و بایەخێکی گشتیی هەیە وە ئەسکیتیی و خوارەزمیی و سگدیی و باکتریایی و پارسەکان، زۆر بە باشی ئەیانزانی، بەڵام عیلامییەکان و هوریان و تیرە و هۆزەکانی ژووررووی قەفقاز ـ واتا ئەو نەژادانەی کە غەیرە ئێرانییەکانی سەرزەمینی مادی ئاترۆپاتێن لەوان بوون ـ شارەزای ئەم زاراوانە نەبوون. ئەم زاراوە و ناوەڕۆکانە وەر نەگیراون، بەڵکوو هەر لە بنەڕەتەوە زمانی ئێرانێن.) «88،42»

لەبەرئەوە، هێندێ لە سەرچاوەکان، کاتی باسی ئاڤێستای ڕاستەقینە دەکەن، دەڵێن: (ئاڤێستای ڕۆژگاری ساسانیی، 700 545 3 ووشە بووە. زەند کە وەرگێڕان و شیکردنەوەی ئاڤێستایە بۆ زمانی پەهلەویی، لە 2 200 094 ووشە پێکهاتبوو. بەڵام ئەوەی ئەورۆ ماوە، تەنیا 000 83 ووشەمان لە ئاڤێستا بۆ بەجێماوە..) «20،4»«61، 101»

(لە ڕۆژگاری ساسانییەکانیشدا، بە هەمان شێوەی دێرین، بەرماوەی ئاڤێستایان لە بیستویەک نەسکدا نووسیوە، کە نێو و لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەکانی لە پەرتووکی « دینکرت »ی پەهلەویدا جێگیرە.) «20،4»

ئێستە، کاتی ئەوەمان هاتووە، هێندێ زانیاریی، دەربارەی ماد و زمانی مادەکان، پێش چاوخەین. تا بزانین، مادەکان بە چ زمانێ قسەیانکردووە؟ ئەو زمانە تا چەن لە زمانی ئاڤێستاوە نزیکبووە؟ ئایا زمانی مادەکان، چەن ئاشنایی و نزیکیی لە لایەک لەگەڵ زمانی فارسیی و لە لایەکی دیکەشەوە، لەگەڵ زمانی کوردییدا هەبووە؟

هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، دەربارەی مادەکان، گەلێ باوەڕی جیاواز هەبووە و هەیە. لە کۆندا، ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسیی وەک « ئیللۆڤایسکی » گوتوویەتی: (مێژووی میدییەکان تاریکە و کەس هیچی لێ تێناگا.) «139،76» دیارە، لەو سەردەمەی ئەم زانایەی تێدا ژیاوە، لە لایەکەوە، هێندێ ڕاستیی کەم دەربارەی مادەکان زانراوە. بەڵام، تا ئەو کاتە بە تەواویی ڕوون نەکراوەتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، زانستی مێژوو بە

تەواویی، لەو بابەتەی نەکۆڵیوەتەوە، ئەنجامێکی ئەکادیمیی ئەوتۆی دەس نەکەوتووە، تا گڕی دڵ و دەروونیان دامرکێنێتەوە و تینوێتی زانیارییان بشکێنێ! بەڵام کاتێ هێندێ زانا و شارەزای وەک « مینۆرسکی، دیاکۆنۆف، ڤیلچێڤسکی ... تاد » هاتوون، چەن کارێکی ئەکادیمییان بە ئەنجامگەیاندووە، جەرگی ئەو تاریکییەیان بۆ شەقکردووین، هێندێ لەو تەمومژەیان بۆ « ئیللۆڤایسکی »یش ڕەواندۆتەوە.
« ئی. م. دیاکۆنۆف » بۆ لێکۆڵینەوە، لە ناوی ماد و مێژووی ماد، پەنای بۆ بەر سەرچاوە کۆنەکانی ئاشووریی و زمانی گەلانی ئەو سەردەمانە بردووە. کاتێ ئاشوورییەکان، ناوچەکانی ئێرانی ئەوڕۆیان داگیردەکرد، چەندین خێڵی جیاواز بەرەنگاریاندەبوونەوە، پەلاماریاندەدان، تا ناوچەکانی خۆیان ڕاویاندەنان. لەو بارەیەوە دیاکۆنۆف دەڵێ: (ئەم خێڵانە، بە جۆرێکی سەرەکیی، خێڵی کۆچەر و بەهێزبوون و ئەسپیان بەخێودەکرد، بۆیەش هێزی چەکدارییان بۆ ئەو سەردەمە زیاتر بەکاربوو ـ واتە: هێزی سوارە و ڕەنگبێ گالیسکەی جەنگیشیان هەبووبێ. سەرچاوەکانی ئاشووریی بەم خێڵانەیان دەگوت « مادای » و ئەوەش لە دواتردا بوو بە ناوی کۆمەڵە خێڵێکی زمان ئێرانیی و دەوڵەتی میدیایان دامەزراند. لەو ڕۆژگارەدا ـ سەدەکانی نۆ تا حەوتەمی پ.ز. ـ خێڵەکانی مادای لە بەشی سەرووی زێی قزل ئۆزوندا و هەندێکیش بەرەو ڕۆژهەلاتتر تا دەگاتە بیابانی دەشتی گەور دەژیان. واتە: تا سەر سنووری ئێرانی ناوەڕاست. بۆیە، ئاشوورییەکان ئەم دوو ناوەیان بۆ ئەم خێڵە بەهێزانە بەکاردەهێنا: « مادای داننوتی » بە مانای مادە بەهێزەکان و « مادای ڕووکووتی » - مادە دوورەکان. )« 76، 141 - 140 »
بەڵام تا ئێستە، بە تەواویی ڕوون نەبۆتەوە، ئەو هۆزانەی ئاشوورییەکان باسیاندەکەن، سەر بە کام گرووپی ئێتنی ئێرانیی بوون. چونکە لەو سەردەمانەدا، هەموو تیرە و هۆزە گەورە و گچکەکان، بە شێوەیەکی جیاجیا و پەرشوبڵاو دەژیان، هێشتا گەل و نەتەوە پێک نەهاتبوو، هێشتا دەوڵەت دانەمەزرابوو. بۆیە « دیاکۆنۆف » دەڵێ: (کەم ڕێی تێدەچێ، ئاشوورییەکان توانیبێتیان یان ویستبێتیان، ئەو خێڵە کۆچەرانەی هێرشیان دەهێنانە سەر

لە یەکترییان جیاکەنەوە. ئێمە ئەوە باش دەزانین، کە لە ماوەی سەدەی زۆردا و تەنانەت لە سەدەی نۆزدەیەمیشدا، ناوی خێڵ و میللەتانی جیاواز تێکەڵ بە یەک دەکران « بۆ نموونە:میللەتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز » و ئەوەش نەک هەر سەبارەت بەو میللەتانەی لە لایەنی ژیار و نەژادییانەوە لە یەکەوە نزیکبوون، نموونەی ئەمە زۆر و ئاشکران، ئێمە بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە، بڵێین: ئاشوورییەکان لە ڕووی ئیتنۆگرافییەوە، بە وردیی خەڵکیان لە یەکتری جیادەکردەوە.)«142،76»

ئەمە پتر لەوە دەچێ، هەموو تیرە و هۆزەکانی ئەو سەردەمە، لە کۆنفیدراسیۆنێکی گەورەدا یەکیانگرتبێ. لەو یەکگرتنەشدا، دوو فاکتەری گرنگ، ڕۆڵی سەرەکیی بینیبێ: یەکەم ـ خزمایەتیی. دووەم ـ زمانی هاوبەش. با بڵێین: ناوی « کۆنفیدراسیۆنی مادەکان » بووە، یا وەک لە مێژوودا ناوی ڕۆیشتووە، ناوی « ئیمپراتۆریای ماد » بووە.

هەڵبەتە، خێڵەکانی ئاریی بە چەندین شەپۆلی جیاجیا، کۆچڕەوەکەی خۆیان بە ئەنجامگەیاندووە. بەڵام گرنگترینیان ئەو دوو شەپۆلە کۆچەیە، کە زاناکان دەسنیشانیانکردووە. ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، شەپۆلی کۆچی خێڵەکانی ئاریی، لە ناوچە شاخاوییەکانی پشت قەفقازەوە، بەرەو ناوچەکانی ئازربایجان زیادیدەکرد. ئاشوورییەکان وردەوردە لاواز و خێڵەکانیش بەهێزتردەبوون. ئیدی، (بەم جۆرە، لە ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی پ.ز.زدا، لە کاتی ڕووخاندنی زۆربەی دەوڵەتە کۆیلەدارە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی دێرین ـ ئۆراتۆ، ئاشوور، بابل و دامەزراندنی، لە سەر کاولگەکانی ئەماندا، دەوڵەتی کۆیلەداریی نوێ ـ میدیا و جێگری ئەوان مەملەکەتی فارسە ئەخمینییەکان، پرۆسێسی هاتنی خێڵەکانی زمان ئێرانی بۆ ناوچەکانی ئاسیای پچووک و ئێرانی ڕۆژاوا، ئەوساکە، تازە دەستیپێکرد و بۆیە، ئەم پرۆسێسە نەیدەتوانی، گۆڕانێکی وا بە سەر لایەنی ئیتنیکی و زمانی دانیشتووانی ناوچە چیاییەکاندا بێنێ، هەر وەکوو چۆن ڕاگوێزانی خەڵک لە ناوچەکانی ڕۆژاوای ئاسیای پچووکەوە ئەم ناوچانەی، واتە هی خێڵە شوانکارە چیاییەکان، بە ڕاژە کەمگرتەوە.)
«146-145،76»

هێندێ لە نووسەران و ڕۆژهەڵاتناسان، کورد بۆ سەر « خالدیی »یەکان دەگێڕنەوە. بۆ نموونە: د. « میخائیلس » پێی وابووە،(کورد نەوەی خالدییەکانی ئینجیلن، کە پاشاکانیان بەپێی چیرۆکێکی عیساییەکان هاتن و کڕنوشیان بۆ عیسای کۆرپە برد. لەم گریمانەدا،« ی.د.میخائیلس » پشتی بە زانیارییەکانی مارکۆپۆلۆ و چەن سەرچاوەیەکی تری سەدەکانی ناوەڕاست دەبەست، سەبارەت بەوەی کە گۆڕی ئەم قارەمانە ئەفسانەییانە لە نزیکی ناوچەی ژیانی « کارد »ەکان دایە و ناوەکانیشیان باش لەگەڵ ناوی « خالد »یاندا دەگونجێن. « ئا. ل. شلێتسێر » ئەم بۆچوونەی میخائیلسی پەرەپێدا و هەر زوو وتارێکی گەورەی بڵاوکردەوە و تیایدا پەیوەندیی کورد و خالدیی جەختکرد. هەر ئەمیش بوو، پلانی گەشتی ڕۆژهەڵاتی بۆ زانایانی ئەڵمانیی، ئەوانەی لە ئەکادیمیای ڕووسیای تازە درووسبوودا کاریاندەکرد، دانا و لایەنی تیۆریی پلانەکەش زۆر لە پلانەکەی د، میخائیلس دەچوو.)«185،76»

هەر چەندە،(تاقە سەرچاوەی زانستیی چەسپاو بۆ میخائیلس و شلێتسێر کتێبی پیرۆز « تەورات و ئینجیل ـ و. » بوو، لە گۆشەنیگای ئەمانەوە، هەموو فاکتێکی واقیعی دەبووایە، لەگەڵ دەقی کتێبی پیرۆزدا یەکبێ.) «190،76» بەڵام، کاتێ هێندێ شت ڕوونبۆوە،(زمانی کوردان ئێرانییە و کەواتە نابێ، خالدییەکانی کتێبی پیرۆزبن، یەکسەر مێژوونووس و فیلۆلۆگە دیانەکان پشتیانتێکرد. وەکوو ئاشکرایە، تیۆریای خزمایەتی گێنێتی و دەوری باڵای کەلتووری میللەتانی زمان هیندۆئەورووپایی لە ڕۆژگاری هەڵچوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ئەڵمانیادا سەریهەڵدا و بەگژ تیۆریای کتێبی پیرۆزدا چوو، کە تا ئەو ساکە لە زانستدا زاڵبوو و هەموو زمانانی جیهانی، جگە لە زمانانی ـ یۆنانیی، لاتینیی، عیبریی و ئارامیی ـ ، کە بەپێی ئەفسانەکانی ئینجیل، باسی عیسای لە خاچدراویان پێ نووسراوەتەوە، بە زمانانی بەربەریی و بێ بایەخی زانستیی دادەنان. تیۆریای دەوری پێشڕەوی میللەتانی زمان هیندۆئەورووپایی لە ژیانی کەلتووریی و مێژوویی جیهاندا، کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتە ئەو پەڕی پەرەسەندنی، بۆ

«کـوونیک » و پەیڕەوکەرانی ـ وەکـوو کـتێبی پیرۆز بۆ مـیـخـائیلس و شلێتسێر ـ بوو بە هەمان سەرچاوەی زانستیی قسە لێ نەکراو. ئەمانەش بە تایبەتیی لە کارەکانی « ڕێنان »دا دەردەکەوێ، کە هەوڵیداوە، لە ڕوانگەی زمـانەوانیی هیندۆئەوروپایی یەوە سـەیری کـتێبی پیـرۆز بکا. بۆیە تەنیـا بەڵگەیەک بۆ نەژادی « ئاریی »کـورد و باپیـرەگـەورەیان « خـالدییـەکـانی سەروو » لە لایەن « کوونیک »ی مێژوونووس زمانی کوردیی بوو، کە ئەو سـاکــە لە « ڕیدیگێـر و پۆتت »دا، بۆ سـەر یەک زمـانی گـەورەی هینـدۆئەوروپایی هاوبەش برابووەوە. )«190،76» ئیـدی ئەوانیش، لە باوەڕەکانی خۆیان پەشیمانبوونەوە.
بەڵام تا کۆنگرەی بیستەمی ڕۆژهەڵاتناسانی جیهان، لە ساڵی « 1938 » لە « برۆکسل » نەگیـرا، پرۆفـیسـۆر « ڤ. ف. مـینـیـرسکی » ، دەربارەی ڕەچەڵەکی کـورد، ڕاپۆرتە بە نرخـەکـەی نەخـوێندەوە، هیچ ڕۆژهەڵاتناسێ نەیتـوانی، یەکـەم هەنگاوی زانسـتـانە لەو بوارەدا بنێ، لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەکادیمییانە، دەربارەی ڕەچەڵەکی کورد و زمانەکەی بکا.
بۆیە، ئەم بیر و ڕایانە هەروا، بە گـومانلێکراویی و لە دڵەڕاوکەدا مـانەوە. بەڵام کـاتێ، « مـینۆرسکی » ، بێـدەنگیی ئەو گـۆمـە مـەنگە پڕ لە ناڕاستـیـیـانەی شڵەقـان، باسە زانسـتـانەکەی پێشکەشکرد، بە ڕەچەڵەکی کـورددا چووەوە، لە چوارچێـوەیەکی مـێـژوویی ڕووندا دایڕشت، ئیـدی ئەو کاتە، جەمسەری هەموو کێشە و باسەکان، زیاتر بۆ لێکۆڵەر و توێژەرەکان ڕوونبۆوە.
لەو بارەیەوە « زوبێـحی » دەڵێ: (خـێـڵاتی ئاریی، کـە ڕوویان کـردۆتە ڕۆژهەڵاتی ئیـمڕۆ، پێش ئەوەی لێک جیابینەوە، ماوەیە پێکەوە لە شوێنێ نیشتەجێبوون کە « ئاوێستا » بە « ئەئیریەنە ڤە ئیجە هـ = ئێران وییج »ی ناودەبا، پاشـان هێندێکیـان بەرەو هیندوسـتـان شۆڕبوونەتەوە و ئەوانی دیکەش بەرەو ئێرانی ئێستا هاتوون. وێ دەچێ ئەو زمانەی کە پێی دەڵێن « هیندوئێرانیی »لکێکە لە لکەکانی زمانی نەزانراوی« هیندوئوڕووپایی » ئەو زمـانە بێ، کە ئەو خێـڵاتە ئاریایی یانە لە نیـشـتـمـانی دووەمیـاندا قسەیان پێ کردووە. )«13،70»

هەڵبەتە، ئەو خێڵانەی لە ئێران نیشتەجێ نەبوون، ملی ڕێگەیان گرتووە و بەرەو هیندوستان ڕۆیشتوون. هەر ئەو خێڵانە لە دوای خۆیان، « ڤیدا » یان وەک یادگارێکی گەلێ بە نرخ بەجێهێشتووە، کە بە زمانی سانسکریتیی نووسراوە.(کۆکردنەوەی ـ ڤیدا ـ لە دەوروبەری 3000 ساڵ پ.ز.دا کۆتاییهاتوە.)« 810،114 »

دەربارەی ئەو زمانەی « ڤیدا »ی پێ نووسراوەتەوە، « زوبێحی » دەڵێ: (زمانی سانسکریتیی کە « ڤیدا »ی پێ نووسراوە، ئەوەندەی تا ئێستە لێمان ڕوونە، وەچی ڕاستەوخۆی « هیندوئێرانیی »یە و زمانێکی تریان لە نێواندا نییە و ئەمە شتێکە نە زمانی « مادیی » دەتوانێ بیبێ و نە ئێمەش بۆمان دەلوێ ئیددیعای بکەین، چونکوو « ماد »ەکان کە بەشێبوون لەو خێڵاتەی بەرەو ئێرانی ئێستا هاتوون، بۆ یەکەم جار لە ساڵی835 پێش عیسا لە بەردەنووسەکانی پاشایانی « ئاشووریی »دا ناویانهاتوە و لە چەرخی حەوتەمی پێش عیساوە زمانەکەیان توانیویە ببێتە زمانی موشتەرەکی هەموو ئەو هۆز و تیرە و خێڵانەی کە لە خاکی « ماد » دەژیان و هەروەها زمانی سانسکریتیی 2300 ساڵێکی بەینە و زۆر ئاشکرایە کە لەم ماوە دووروودرێژەدا، ئەو زمانەی لە پێشدا « ماد »ەکان قسەیان پێ کردوە ـ هیندوئێرانی ـ دەبێ، گەلێ گۆڕانی بەسەرادهاتبێ، بە تایبەتیی کە لە نیشتمانی تازەیاندا تووشی زۆر شتی وا هاتوون، کە لەو سەردەمەدا و بە حوکمی پلەی گەشەکردنی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی، خۆیان نەیانبوە و نەیانتوانیوە بیانبێ. بە لای منەوە لەو ملە و بەربەرەکانییەی « ماد »ەکان لەگەڵ خەڵکی ئەسڵیی نیشتمانی تازەیاندا کردوویانە و سەریشکەوتوون، زمانەکەیان لە خۆیان نەرمتربووە و تا ڕادەیەکی باش سەری بۆ ئەو زمانانەی ئەوسا لەو مەڵبەندەدا باوبوون « ئۆرارتوو، هووریی، لۆللۆ، کاسیی » دانەواندوە و هەر وەک ئەو شتانەی نەیانبوە لەو خەڵکانە فێربوون ناوەکانیشیان هەر لێ وەرگرتوون، ئەوە کارێکە هەموو نەتەوەیەک لە هەموو دەورزەمانێکدا کردوویەتی و دەیکا.)« 13،70 ـ 14»

هەروەها، « زوبێحی » لە زمانی « دیاکۆنۆف »ەوە دەڵێ:(تا ئێستە، ئاسارێکی کۆنینە، کە بە زمانی « مادیی » نووسرابێ، « وەکوو

بەردەنووسی پاشایان » نەدۆزراوەتەوە، تا تێمانگەیەنێ ئەو زمانە چۆنبووە، هۆی نەدۆزرانەوەی ئاسار و بەردەنووسەکان ئەوەیە، « هێشتا لە شوێنەواری مادەکان، تەنانەت شارێ نەخراوەتە ژێر هەلکۆلین ». هەرچییەکی کراوە لە سنوورەکانی خاکی مادبووە. بۆیە بۆ نیشاندانی نموونەی زمانی مادیی، بێجگە لە ووشە و ڕستەی بەردەنووسەکانی « هەخامەنشیی »، یا ئەوانەی بە هۆی کتێبی یۆنانیی و شتی تر پێمان گەیشتوە، شتێکمان بە دەستەوە نییە.)«14،70 ـ 15»

زمانی ئاڤێستا :(ئەم زمانە یەکێکە لە زمانە کۆنەکانی خێزانە زمانی «ئێرانیی » و ئاڤێستای زەردەشت تەنیا بەلگەی نووسراوەی ئەم زمانەیە و هەر بۆیەش ناوی « ئاڤێسایی » بە سەردا دابڕاوە.

هەموو زانایانی زمانەوانیی لەو باوەڕەدان ئەو بەشەی « ئاڤێستا » کە مەشهورە بە « پێنج گات » و خودی زەردەشت بە شیعر دایناوە، لە باری وردەبابەتی زمانەوانییەوە، لە هەموو بەشەکانی دیکەی « ئاڤێستا » کۆنترە و پێش ئەوەی نووسینەوە بە خۆیەوە ببینێ، ماوەیەکی دوورودرێژ دەماودەمیکردووە و « بە لەهجەیەکی تایبەتیی و بە زمانێکی دوورکەوتەی کۆنتر لە پارسیی کۆن « فارسیی هەخامەنشیی » و نێزیکتر لە زمانی «ڤیدا »کانی هیندیی نووسراوەتەوە. ئەم چەشنە ئاساری دەماودەمە لە ڕۆژهەلاتی نزیک و لە وولاتانی تریشدا بینراوە و پێوەندیی کۆمەلایەتیی نیوەی یەکەمی هەزار سالەی پێش عیسا دەنوێنێ. گومانی ئەوە ناکرێ، کە « گات »ەکان دەسبەجێ پاش پەیدابوونیان نووسرابنەوە، زۆر ڕێی تێدەچێ، ماوەیە بە هۆی « کاهین » و پەیڕەوانی ئەم ئامۆژگارییانە دەماودەمیکردبێ و سینگ بە سینگ هاتبێتە خوار، تا پاشان وێڕای کۆنترین بەشەکانی «وردە ئاڤێستا » و تەنیا ئەو کاتەی پاش داریۆشی یەکەم « مر.486 پێش عیسا، ر.ز. » خەتی ئێرانیی لە سەر بنەمای ئەلفوبێتکەی « ئارامیی » بوو بە باو، « گات »ەکانیش نووسرانەوە)«17،70»

وەک گوتمان: تیرە و هۆزە کۆچەرییەکانی « هیندۆ ـ ئەورووپایی » لە سەردەمی جیاجیا و بە چەن شەپۆلێ ڕەویانکردووە. واتە: هەموو لە یەک کات و سەردەمدا، پێکەوە نەجولاون. گەر هەموو ئەو تیرە و هۆزە زۆرانە،

له « کۆنفیدراسیۆنی ماد »دا یەکیانگرتبێ، پاشان ئیمپراتۆریای مادیان دامەزراندبێ، هەڵبەتە لە پێشدا، بە زمانی مادیی قسەیانکردووە. دوای ئەوەی، هەخامەنشییەکان دەسیان بە سەر دەسەڵاتدا گرتووە، زمانی «پارسیی » برەوی پەیداکردووە، لە هەمان کاتیشدا، وەک زمانی دەسەڵات و دەوڵەت پێرەوکراوە. کەواتە: زمانی مادیی لە ڕووی بەکارهێنانەوە، لە زمانی پارسیی کۆنترە. گەر ئەوەشمان سەلماند، کە ئایینی زەردەشت، پێش ئەوەی هەر دوو ئیمپراتۆریای ماد و هەخەمانشیی دامەزرابێ، هەبووە، کەواتە، زمانی ئاڤێستا لە هەر دوو زمانی ماد و پارسیی کۆنتربووە. بۆیە، (زمانی « ئاڤێستایی » لە « مادیی » و « پارسیی » کۆنتر دێتە بەر چاو.)«23،59»

دوای ئەوەی، ئیمپراتۆریای ساسانیی ڕوخا، ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە، زمانی کوردییش وەک زمانی فارسیی، پێ لە قۆناغێکی نوێ دەنێ. بەڵام،(ئێمە لە زمانی « مادیی » ئاخروئۆخری دەوری ساسانیی، بەڵگەیەکی نووسراومان بە دەستەوە نییە، تا بتوانین، بە وردیی ڕایەکی لەسەر دەربڕین، بەڵام ئەمە ڕێگەی ئەوەمان لێ ناگرێ بڵێین: ئەو زمانە لەو زەمانەدا، زمانی « مادیی » بووە کە لە چاو زمانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرێتی « ماد » تطورێکی 1300ساڵەی بەسەرداهاتووە. هەر بەو نیسبەتەی کە زمانی « پارسیی کۆن » تطوری کردووە و بۆتە زمانی «دەری = پارسییک » و ئامادەیی ئەوەی پەیداکردووە زمانی « فارسیی » ئێستەی لێ بکەوێتەوە. مەنتیقی سەلیم ئەوە دەسەپێنێ، کە زمانی مادیش تطوری کردبێ و ئەوەندەی گۆڕانی زمانەوانیی بەسەردا هاتبێ و وەها ساکار بوویێتەوە بۆ ئەوەی دەسبدا زمانی « کوردیی » ئیمڕۆی لێ پەیدابیێ.)«34،70»

شتێکی ئاشکرایە، هەموو ئەو زمانانەی، لە یەکدییەوە نزیکن، یا ئەو گەلانەی، لە ژێر ئاڵای تاکە یەک دەوڵەتدا دەژین، زمانەکانیان کار لە یەکدی دەکەن. هەر بەو شێوەیەش، هەموو زمانە ئێرانییەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریای ساسانیی، کاتی یۆنانییەکان و لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، لە لایەکەوە لە نێو خۆیاندا، لە لایەکی دیکەشەوە،

لەگەڵ دیالێکتە جیاوازەکانیانادا، لە کارلێکێکی بەردەوامدا بوون، بە تایبەتیی، باری نەتەوەیی و ڕامیاریی ئێرانی ئەو سەردەمە، کارێکی زۆری لە گۆڕان و پێشکەوتنی ئەو زمانانە کردووە. شتێکی زۆر ئاساییە، گەر لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەدا، هەر دوو زمانی فارسیی و کوردیی، بە خۆیان کۆمەڵێ دیالێکت و خوار دیالێکتەوە پەیدابووبن. (لە ڕۆژهەڵاتی ئێران « فارسی تازە » و لە ڕۆژاواشی « کوردیی » لێکەوتەوە، کە هەر دووکیان کۆمەڵێ دیالێکت و خواردیالێکتیان هەیە. « پاش بڵاوبوونەوەی ئیسلام، فارسیی نوێ دیالێکتێک بوو، بەپێی بناغەی زۆر کۆن، لەگەڵ دیالێکتەکانی تر تێکەڵبوو، ئەو تێکەڵاوییە پێشان سەردەمی ساسانییەکانیش، ڕوویدابوو» )«114، 25-26»
هەڵبەتە، باری ژیاریی و دەسەڵات، لە پێشکەوتن یا دواکەوتنی زمانێکی دیاریکراودا، ڕۆڵێکی گەلێ مەزن دەگێڕێ. گەر بڵێین: فارسەکان لە کوردەکان بە تواناتر و پێشکەوتووتربوون، هیچ هەڵەیەکمان نەکردووە. چونکە، ئەوان زۆر پێش کورد، دەسیان بە کار کردووە، پتر خەریکی زمانەکەیان بوون، بووژاندویانەتەوە و پێیاننووسیوە. بۆ نموونە: شاکارە بەرزەکەی « فیردۆسیی ـ شانامە »، لە ساڵی « 346 ک/967 ز » گەر یەکەم پەرتووک نەبێ، بە کۆنترین پەرتووک دادەنرێ، کە بە زمانی فارسیی نوێ نووسراوە. کەچی، لەو سەردەمانەدا، کورد هیچ شتێکی نەبووە!
دوای ئەوەی، هێندێ شتمان ڕوونکردەوە، لە لایەکەوە، نزیکەی جۆرە تێڕوانینێکی تایبەتمان، دەربارەی پێوەندیی نێوان، زمانی ئاڤێستا و مادەکان لا کەڵەکەبووە. لە لایەکی دیکەشەوە، زانیارییەکمان دەربارەی پێوەندیی نێوان، هەر دوو زمانی ئاڤێستایی و مادیی لەگەڵ زمانی کوردیدا هەیە. هەڵبەتە، لە ماوەی ئەو سێ هەزار ساڵەدا، چەندین گۆڕانکاریی زمانەوانیی، بە سەر ئەو زمانانەدا هاتووە. گەر زمانی ئاڤێستا و مادیی، لە زمانی کوردیی ئەوڕۆشەوە نزیکبێ، دیارە، بەپێی دوور و نزیکیی یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، تا ئەندازەیەکی زۆر یا کەم، جۆرە لێکچوونێ، لە نێوان هەر دوو زمانی ئاڤێستایی و یەکێ لەو دیالێکتە کوردییانەدا هەیە. بۆیە، نووسەرێکی وەک « زوبێر ئیسماعیل »، لەو

باوەڕەدایە، نەک هەر جۆرە نزیکییەک، لە نێوان زمانی ئاڤێستایی و لقە دیالێکتی موکریدا هەیە، بەڵکوو هەر کوتوکت خۆیەتی و دەڵێ: (زەردەشت بە زمانە میدییە دواییەکەی مادەکان دواوە و لە ژووررووی میدیاشدا کە ئێستە، بە موکریان ناودەبرێ، هاتۆتە دنیاوە. ئەم زمانەی زەردەشت کە وەک لە پاشکۆی ئاڤێستا، زەند ئاڤێستادا دەیبینین، نەک هەر لە شێوەی ئێستەی موکریانەوە زۆر نزیکە، بەڵکوو هەر زمانی «موکری » ش خۆیەتی)«49،58»

هێندێ نووسەری دیکەش، زمانی ئاڤێستا لەگەڵ لقەدیالێکتی هەورامانیدا بەراوردەکەن. پێیان وایە، نزیکییەکی تەواو لە نێوان هەر دوو لایاندا هەیە. لەو بارەیەوە « محەمەد هەورامانیی » دەڵێ:(بەپێی بەراوردێکی سەرپێیی لە نێوان زمانی ئاڤێستا و دیالێکتە کوردییەکاندا دەرکەوتووە، کە زمانی کوردی هەورامانیی نزیکترین دیالێکتە لە ئاڤێستاوە، لە ڕووی یەکگرتەیی ووشە و موفرەدات لە واتادا، لە ڕووی بوونی جیاوازیی لە نێوان نێر و مێدا و وێکچوونی نیشانەی مێ، لە ڕووی پاشبەندی پلەی بەراوردیدا، لە ڕووی نیشانەی«مضاف و مضاف اليه»دا) «50،100»

هەروەها، « پورداود »ی فارس، بە یەکێ لە مەزنترین زاناکانی ئاڤێستا و زمانی ئاڤێستایی دادەنرێ، لە سەر دەسی ئەو ئاڤێستا قەوارەیەکی گرنگی زانستانەی وەرگرتووە، لە « فەرهەنگی ئێرانی باستان »دا، دەڵێ:(زمانی ئاڤێستا زمانی « شمال غربی » ئێرانە کە دەکاتەوە « ماد ».)«16،4»

هێندێ لە مێژوونووس و زاناکانی زمان، چەن بەراوردێکیان، لە نێوان زمانەکانی « ماد، فارسیی، زمانە ئەوروپایی یەکان و زمانی ئاڤێستا »دا کردووە. لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوتووە، پێوەندییەکی زۆر، لە نێوان زمانی ماد و ئاڤێستادا هەیە.(ئەم دوو زمانە، لە گەلێ شتدا یەکدەگرنەوە و زۆر لە یەکەوە نزیکن، بەڵام تا ئەو ڕادەیە نییە، کە هەر دووکیان بە یەک زمان بزانین، وە بەو لێکچوونانەی نێوان هەر دوو لایان قایلبین.)«109،42»

بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، دەڵێن:(زمانی ئاڤێستا مادی نەبووە، بەڵکوو زمانێکی ترە، ڕاستییەکی زۆر کە ئێستا لێرەدا، ماوەی نییە،

باسیانکەین، زمانی ئاڤێستا بە کۆمەڵە لقێکی زمانی « ئەسکیت و ئاسیای ناوەڕاست »ەوە ئەبەستێ. هەر وەک زانراوە، زۆربەی لێکۆڵەرەکانی شوورەویی و ڕۆژاوا، ئاڤێستا بە زمانی ئاسیای ناوەڕاست ئەزانن. بەم جۆرە « غەفووروۆف، جاکسۆن، کیگر، ئالت هیم، باکتریا، ترور سگد، و. ئاستر، مرغیان، تالسوف، هنینگ و خوارەزم، بە زادەگای ئاڤێستا ناوئەبەن. هەروەها، هەندێکی تر لەو باوەڕەدان، کە ئاڤێستا زمانی مادە. «ماکوو لسکی و هرتسفلد » لە سەدەی نۆزدەیەم و گەلێ کەس باوەڕیان وابوو، کە ئاڤێستا زمانی مادە. « یوستی و تا ڕادەیەک ئاشپیکل » و چەن کەسێکی تر، ئەوانیش هەر لەم باوەڕەدابوون. )«42،109ـ110»
لێرەدا ڕاستییەک هەیە، پێویستە بیزانین، ئەویش ئەوەیە، لە سەردەمی کۆندا، پێش ئەوەی مادەکان دەوڵەتەکەیان دامەزرێنن، هەرگیز وڵاتێکی یەکگرتوویان نەبووە. بەڵکوو، لە چەن ناوچەیەکی جیاجیا و دوور لە یەکدییەوە پێکهاتبوو. وەک چەن جارێکیش لەمەوبەر، ئاماژەمان بۆ کرد، لە سەرەتاوە تەنیا تیرە و هۆزەکان یەکیانگرتووە، پاشان، یەکێتییەکی ڕێکوپێک لە نێوانیاندا دروسبووە، هەموو دەزگە سەربازیی و بەڕێوەبەرێتییەکانی دیکەی، تیرە و هۆزەکان و ناوچە جیاوازەکانی وڵاتی مادی پێکەوە بەستووە. بەڵام دواتر(لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زایین، بوو بە دوو بەشەوە: یەکێک « مادی ئەترۆپاتین » ئەوی تر « مادی پچووک ». لە ڕۆژگاری بەندایەتیدا* ئەم دوو بەشە، هەرگیز یەکیان نەگرتۆتەوە و نەبوونەتەوە بەیەک و وە لە ناو هەر یەک لەم دوو کیشوەرانەدا، چەن هۆزێکی تازەی سەربەخۆ پەیدابوون. لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی مادی ئاترۆپاتین، خەڵکی پێشوونانی وڵاتی ئازربایجانن، وە دانیشتووانی مادی پچووک، کە هەموویان جیاوازن، بەشێکی ئەوانی تر نەبوون. لەم هاتوهوتەدا، بەر لە سەرەتای درووسبوونی هۆزەکانی مادی ئاترۆپاتین و ناوچەکانی دەوروبەری، زمانی هۆزەکان « بەر لە زمانی

---

* دیارە، وەرگێڕ مەبەسی « کۆیلە »یە، بەڵام لێرەدا، بە هەڵە وەرگێڕاوە. چونکە « بەند » کۆیلە نییە، بەڵکوو « گیراو » دەگەیەنێ .

نەتەوایەتی » لە کاتی « یەکێتی ماد »دا کە دەسەڵاتداربوون، بەم جۆرە لە ڕۆژگاری بەر لە درووسبوونی مادی ئاترۆپاتین لە خاکی مادا یەک زمانی ڕەسەن و سەربەخۆ « ئێرانیی وە یان کاسپیی » نەبووە. « زمانی مادی ئێرانیی » کە ئەو سەرچاوانەی ئێستا هەن، باسی لێوە ئەکەن، هێشتا زمانێکی خێڵەکیانە و سەرەتاییبوو، لەگەڵ ئەهمیەت و نرخی خۆیا ـ هەر وەکوو لە سەنەد و بەڵگەی زۆر سوود وەرگیراوە ـ تەنیا یەکێبووە، لە زمانە خێڵەکییەکانی سەرزەمینی ماد « وە بە تایبەتیی مادی ڕۆژهەلات ». هەر چۆنبێ، لە کاتی ئەم لێکۆڵینەوەی ئێمەدا، لە ناو سنووری مادی ئاترۆپاتیندا، چەند زمانێکی تر ـ کە غەیرە ئێرانی بوون ـ هەبوون.) «111 ـ 110،42».

ئینجا با لێرەدا، لەو بارەیەوە کورتەیە، دەربارەی دید و بۆچوونەکانی، هێندێ لە زانا و پسپۆڕە بیانییەکان پیشاندەین. جوگرافیناسی کۆنی یۆنانیی بە ناوبانگ « ئەسترابۆن »، کە لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زاییندا مردووە، دەڵێ: (فارسەکان و میدییەکان، لە سەردەمی خۆیاندا، لە یەکدی دەگەیشتن)«299،97» ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: لە لایەکەوە، ئەو دوو زمانە لە یەکدی جیاوازبووبن. بەلام، لە لایەکی دیکەوە، لە یەکدییەوە نزیکبووبن.

پرۆفیسۆری مێژوونووس « سایس » دەڵێ: (میدییەکان لە چەن تیرە و هۆزێکی کورد پێکهاتبوون، لە ڕووی زمانیشەوە، ئاریی «هێندۆئەورووپی » بوون)«299،97» نوێنەری دەوڵەتی بریتانیای گەورە لە عێراق « ویلسن » لە ساڵی 1920دا، دەڵێ: (گەلی کورد، ڕاستەوخۆ لە نەوەی میدییەکانن و زمانەکەشیان بە یەکێ لە زمانەکانی خۆراوای ئاسیا دادەنرێ.) «299,97» هەروەها، گەلێ لە ڕۆژهەلاتناسە بە ناوبانگەکانی دیکەی وەک « باسیل نیکیتین، ن. مار و مینۆرسکی »ش لەو باوەڕەدان و دەڵێن: (ڕاستە زمانی کوردیی، لە زمانە هیندۆئەوروپاییەکانە و سەر بە کۆمەڵەی زمانە ئێرانییەکانە، بەلام زمانی کوردیی، زمانێکی تەواو سەربەخۆیە، پێشکەوتنی ڕاستەقینەی کۆنی خۆی هەیە، لە زمانی فارسیی کۆن کۆنترە، کە تابلۆ بە ناوبانگەکەی دارای پێنووسراوەتەوە.)«19،45 ـ 46»

هەر چەندە، « مینۆرسکی » پێشـتـر باوەڕێکی دیکەی هەبوو. یەکێ لەو هەڵانەی مینۆرسکی ئەوەیە، لە لایەکەوە دەڵێ: (ئێمە زۆر باش ئەزانین، کە کـوردەکـان لە ڕووی زمـانەوە ئاری نین، بەڵـکوو زمـانەکـەیان ئەچێـتـە ناو کۆمەڵی زمانە ئێرانییەکانەوە)«46،112» کەچی، هەر خۆی دوای ماوەیە قسەکەی خۆی بیردەچێتەوە و لە هەمان بەرهەمدا، لە باسی « زمان، ئەدەب و نووسین »دا دەڵێ: (زمـانی کـوردیی لە بنەمـاڵەی زمـانی ئارییـە. وەکـوو زانراوە پێکاتووە لە زمانی ئێرانیی و ئەفغانیی و بلوجیی و ئەسیتینیی و گەلێ شێوەزمانی کۆن و تازەی تریش، زمانی کوردیی فارسیی نییە و کرابێ بە کـوردیی، بەڵـکوو زمـانێـکی سـەربەخـۆیە و یاسـای فـۆنێـتـیک و سینتەکسیسی تایبەتیی خۆی هەیە، پێوەندیشی بە زمانی فارسییەوە، وەکوو پێوەندیی سربی بە ڕووسییەوە وایە، یان بە شێوەیەکی وردتر، وەکوو پێوەندیی زمانی ئاریی سویسریيە شاخاوییەکان بە زمانی ئیتالییەوە وایە. هەروەها، زمـانی کـوردیی بەسـراوە بەم و بەوەوە. هەروەها بە شـێـوەیەکی ڕاسـتەوخـۆ بەسـراوە بە زمـانی « ئاڤـێدحسـتـا »وە، کە کـتـێـبی پیـرۆزی «ئاڤێستا » کتێبی ئاگرپەرستەکانی پێ نووسراوە، بیروڕایەکیش هەیە، کە زمانی کوردیی وەکـوو بەشی زۆری شێوەزمانە تازەکانی تری ئێران، بەشی زۆری کۆڵەکەکانی دروسبوونی لە زمانی میدی کۆنەوە وەرگرتووە ... میدیا ئەو فـەرمـانڕەوایەتیـیـەیە کـە فـەرمـانڕەوایەتی ئێـرانی کـۆنی کـردووە.) «83،110»

هەر چەندە، لێرەدا کـاتی ئەوەمـان نییـە، بە درێژیی باسی زمـانی فـارسـیی بکەین، تا بزانین، پێوەندیی ئەم زمانە لەگەڵ زمانی مادەکاندا چۆنبـووە؟ لە بنەڕەتدا لە کـوێوە هاتووە؟ بە چەن قـۆنـاغدا تێپەڕبووە؟ دوور و نزیکیی لە زمـانی کـوردییـەوە چۆنە؟ بەڵام، بە شـێـوەیەکی گـشـتـیی دەتوانین، بە دڵنیـاییەوە بڵێین: ئەم زمانە فارسییەی ئەوڕۆ، گەلانی دانیشتووی ئێران پێی دەدوێن و پێی دەنووسـن، هەر هەمـان زمـان نییـە، کـە فـارسـەکـان لە سەرەتای نیشەجێبوونیانەوە لە ناوچەکەدا، قسەیان پێ کردووە. بەڵکوو، بە چەندین قـۆناغی جیـاوازی مێـژووییـدا تێـپەڕبووە، تا ئەم زمانە تێکەڵاوە سەیرەی ئەوڕۆی لێ دەرچووە!

بە کورتیی، هێندێ لە ڕۆژهەلاتناسەکان لەو باوەڕەدان، لە پێش زایینا، مادەکان، لە چەن تیرە و هۆز و گەلێکی جیاواز پێکهاتبوون، بە هەموشیان نەتەوەی مادیان پێکهێناوە. زمانی فارسیی ئەوڕۆش، بە دیالێکتێ لە دیالێکتەکانی زمانی مادیی ئەو سەردەمە دادەنێن. جگە لەوەی، فارسەکان قەوارەیەکی تایبەتیی و زمانێکی نەتەوەیی یان نەبووە، تا لە سەردەمی ساسانییەکاندا دروسبووە. واتە: نەتەوەی ماد، بە هەموو خەسلەتە نەتەوەیی یەکانی خۆیەوە، هەر هەمان نەتەوەی هەخامەنشییە و هیچ گۆڕانێکی نەتەوەیی و زمانەوانیی بە سەردا نەهاتووە، بەلکوو، تەنیا دەسەلاتی ڕامیاریی لە پاشایەکەوە بۆ پاشایەکی دیکە و لە بنەمالەیەکەوە بۆ بنەمالەیەکی دیکە گۆڕاوە و گواسراوەتەوە. کەواتە دەتوانین، بلێین :
« ئیستیاغ »ی شای مادەکان و « کۆرش »ی هەخامەنشیی، هەر دووکیان لە نەتەوەی ماد بوون. بەلام، دوو دەسەلاتداری جیاوازبوون، لە ئەنجامی جەنگی نێوانیاندا، دەسەلات لە یەکەمەوە بۆ دووەم گواسراوەتەوە.
مامۆستای مێژوونووس « محەمەد عەلی عەونی »، لەو بارەیەوە دەلێ:
(نەتەوە لە سەردەمی بنەمالەی هەخامنشییەکاندا « کیانییەکان » لە ڕووی زمان، خەت، هەموو پێکهاتە و خەسلەتەکانییەوە، هەر هەمان نەتەوەی میدییەکانە، بە گواستنەوەی فەرمانڕەوایی لە میدییەکانەوە بۆ « ئەنشان ـ ئەنزان » پاشان بۆ « پارس »، جگە لە بنەمالەی شاکان، هیچی دیکەی لێ نەگۆڕاوە. « پارس » یا « پارسوا »، تەنیا یەکێ لەو هۆز و گەلانەی نەتەوەی میدیابووە، قەوارەیەکی سەربەخۆ و زمانی تایبەتیی خۆی نەبووە، تا لە سەردەمی ساسانییەکاندا دروسبووە. کەواتە نەتەوەیەکی ڕاستەقینەی دیکە نەبووە، پێی بگوترێ « فارسی یەکەم ـ پارسی کۆن ». هەروەها، نەتەوەیەک بە ناوی « ئەلپرت ـ ئەشکان » نەبووە، لەبەرئەوەی ئەوانیش دووبارە، یەکێ لە هۆزەکانی نەتەوەی میدیا بوون، لە دوای ئەسکەندەری مەکدۆنیی و جێگرەکانییەوە، فەرمانڕەوایی ئێرانیان کردووە. ئەشکانێکان بە ناوی دامەزرێنەری بنەمالەی فەرمانڕەوای ئەشکان و پارسییەکانیش، بە ناوی « پارس ـ خۆراسان »ی نیشتمانە ڕەسەنەکەیانەوە ناونران) (298،97»

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لەو سەردەمانەدا ڕوویانداوە، گۆڕانکاریی دەسەڵاتی بنەماڵەیە بۆ بنەماڵەیەکی دیکە بووە. لە ئەنجامی کۆدەتایەکی نێوخۆی و لە نێو هەمان نەتەوەدا ڕوویانداوە، واتە: گۆڕانکارییەکی نێوخۆیی بووە. لەبەرئەوە، بە کۆدەتایەکی نەتەوەیی و زاڵبوونی نەتەوەیەک بە سەر نەتەوەیەکی دیکەدا دانانرێ، وەک ئەوەی نەتەوەیەک، جێگەی نەتەوەیەکی دیکەی گرتبێتەوە، بەڵکوو بە ڕووداوێکی ناوچەیی، بە بەردەوامبوونی دەسەڵاتی مادەکان و بە گۆڕانکارییەکیش بەرەو تەواوبوونی، یەکێتی گەلانی ئاریی ئێران دەژمێررێ. بەڵگەی ئەم بۆچوونەش، خۆی لەو قسەیەی « داریوش » لە « نقش روستم »دا دەبینێ، کاتێ دەڵێ: (من هەخامەنشییم، واتە: لە بنەماڵەی « هەخامەنش »م. «پارسی کوڕی پارس »م، واتە: لە هۆزی « پارس »م. ئاریم و لە ڕەگەزی ئارییایم، واتە: میدیی.)«299،97»

شتێکی بەڵگە نەویستە، لەو سەردەمانەدا، چەن زاراوەیەکی ئیتنیی وەک «گەل » و « نەتەوە » نەبووە، تەنانەت هێشتا گەلەکانیش، بە تەواویی دروس نەبوون. زمانی نەتەوەیی ڕەسەن، خاوێن و یەکگرتوو نەبووە. لەبەرئەوە، گەر بە تێگەیشتن و پێناسەی ئەورۆ، سنووری بۆ ئەو کۆمەڵە ئیتنییانە دیاریکەین، ناوێکیان لێ بنێین، بە باوەڕی من، نەتەوەی« ماد » پڕ بە پێستی خۆیەتیی و ناکرێ، ئەو زاراوەیە پشگوێخرێ. نەتەوەی مادیش، لە کۆمەڵێ تیرە و هۆزی گەورە و گچکە، بێدەسەڵات و دەسەڵاتداری جیاجیا پێکهاتبوون. هەمویان لە وڵاتی ماددا پێکەوە ژیاون. دوور نییە، هەر تیرە و هۆزێکیش، بە دیالێکتێکی زمانی مادیی جیاواز، قسەیانکردبێ. چونکە، هەموو لە یەک ناوچەدا پێکەوە نەژیاون، بەڵکوو، لە یەکدییەوە دوور و پەرشوبڵاوبوون.

زمانی فارسیی، هەر لە کۆنەوە تا بەم شێوەیەی ئەورۆ گەیشتووە، بە سێ قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕبووە :

1. زمانی فارسیی کۆن یا « پارسیی »:

ئەم زمانە، زمانی ئەو خێڵە « ئاریایی »یانەیە کە پاش گەیشتنە خاکی ئێرانی ئێستە، لە ناوچەیەکی کە ئیمڕۆ پێی دەڵێن « فارس »

نیشتەجێبوون و ناوی خۆشیان بە سەر مەڵبەندەکەدا بڕیی و بە « پارس = فارس » ناوبانگی دەرکرد کە وەکوو لە پێشدا باسمان کرد، خۆی ووشەیەکی « مادی »یە، مەڵبەندەکەش لە کاتی ئیمپراتۆریای « ماد »دا بەشێبوو لەو ئیپراتۆریایە و بۆیە زمانی مادیی کە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی ماد بووە زۆر کاری کردۆتە سەر ئەو زمانە و کاتێ لەساڵی 559ی پێش عیسادا ئیمپراتۆریای « ماد » بە دەسی « کۆرش » ڕمێنرا و ئیپراتۆریای « هەخامەنشیان » دامەزرا، زمانی پارسیی کۆنیش بوو بە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت، ئەو جار نۆرەی ئەوە هات کە ئەو کاریکاتە سەر زمانی مادیی.)
«22،70» بە کورتییەکەی، ئەم زمانە خەڵکی ناوچەی پارس، لە پێش و پاش سەردەمی هەخامەنشییەکان، لە خۆراوای خوارووی ئێران قسەیان پێ کردووە. بەڵام کاتێ ئەسکەندەر لە «331 پ.ز. »دا، دەسی بە سەر ئەو ناوچەیەدا گرت، ئیدی بە تەواویی کوژایەوە و نەما.
2. فارسیی ناوەڕاست (پەهلەوی):
لەم قۆناغەدا، هەموو زمانەکانی، سەردەمی ناوەڕاستی خێزانە زمانی ئێرانیی، ئەمانەن بوون: (پارتیی، پارسیی، خوارەزمیی، خۆتەنیی، سوغدیی. دوو زمانی پارتیی و پارسیی هەر دووکیان بە « پەهلەویی » ناوبانگیان دەرکردووە، چونکوو لەو زمانانە ئەوی ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە زمانی کوردیی یەوە هەبێ، هەر پارتیی و پارسییە، بۆیە لەم گەلەزمانە هەر باسی ئەم دوانەیان دەکەین.)«24،70»
زمانی پارتیی « پەهلەویی »(زمانی پارتیی زمانی خێڵاتی ئاریایی «پارت »ە کە لە خاکی خۆراسانی گەورەی ئەوێ زەمانێدا نیشتەجێبوون و لە ساڵی 250ی پێش عیساوە دەسەڵاتی حوکوومەتی خۆیان لەو مەڵەبەندەدا دامەزراند و پاش لەناوبردنی دەزگەی دەستەڵاتی یۆنانێکان، دەستیان بە سەر هەموو میراتی هەخامەنشییدا گرت و جێگەی یۆنانەکانیان گرتەوە، پێتەختەکەشیان لە شاری هێکاتۆم پیلۆس « سەد دەروازە » کە ئیمرۆ « دامغان » ی لە شوێن بنیاتنراوە، گواستەوە بۆ تەیسەفۆن « مەدایین ». زمانی ئەم « پارت »انە لە زمانەکانی باکووری ڕۆژئاوایی خێزانە زمانی ئێرانییە و زانایانی زمان و کۆنینەناسەکان، بە

«پەهلەویی ئەشکانیی » یا « پەهلەویی باکووریی » و هەندێ جاریش بە پارتیی = فرثیی » ناودەبەن و لەگەڵ زمانی مادیی بە دەستەیەکیان دادەنێن.)«25،70»
ئەو زمانانەی، ناویان ناون پەهلەویی ساسانیی: {زمانێکی پاش ئاڵوگۆڕبوونی دەستەڵات لە ئەشکانییەکانەوە بۆ ساسانیان، وەبرەو کەوتووە ئەو زمانەیە کە زانایانی زمانەوانیی بە « پەهلەویی ساسانیی » یا «پەهلەویی جنووبیی » ناودەبەن کە گۆیا هەر وەک « پارسیی کۆن » لە دەستەی جنووبی ڕۆژاوایی خێزانە زمانی ئێرانیی حسێبدەکرێ.
ئەم لکەی زمانی پەهلەویی، پاش ڕوخانی دەستەڵاتی ئەشکانیان « 224 » پاش عیسا، بەرەبەر جێگەی لکەکەی تری (پەهلەویی باکووریی «ئەشکانیی» = پارتیی « فرثیی » گرتۆتەوە و تا 651 ی پاش عیسا کە «یەزدگورد » ئاخرین پاشای ساسانیی کوژراوە، زمانی ڕەسمیی بووە و بە پێچەوانەی زمانی مادیی و پارسیی کۆن، بەڵگەیەکی نسبتا زۆر «بەردەنووس و کتێب » بەم زمانە بە دەستەوە هەیە و « درێژترین بەردەنوسی ساسانیی، بەردەنووسیی « پەیکولیی »یە لە کوردستان، باکووری « قەسری شیرین » و بە دوو زمانی ڕەسمیی ئەو زمانە، زمانی پەهلەویی ئەشکانیی و زمانی پەهلەویی ساسانیی لە لاتەنیشتەکانی بورجێکی چوارگۆشە نووسراوە، وێنەی پاشا « ئەرسیی » لە هەر چوار تەنیشتی بورجەکە نەخشکراوە. بەڵام، ئەم بورجە ڕماوە و قاعیدەکەی نەبێ، هیچی لە شوێن خۆی نەماوە.)«26،70»
بە کورتییەکەی، هەموو ئەو زمان و لقانە، لە سەردەمی ئەشکانییەکان و ساسانییەکانەوە «300 پ.ز. ـ 226 ز » دەسپێدەکا. کاتێ ئیسلامەکان ناوچەکەیان داگیرکرد، لە سەدەی حەوتی زاییندا کۆتاییانهات.
3. فارسیی نوێ :
لە سەدەی چوارەمی کۆچی ـ نۆیەمی زایینەوە دەسپێدەکا، بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیووە، تا بەم زمانەی ئەوڕۆ گەیشتووە.
زمانی مادیی، کارێکی زۆری لە هەر سێ قۆناغەکەی زمانی فارسیی کردووە. بەڵام، بە پلەی یەکەم، کارێکی زۆری لە زمانی پارسیی کردووە،

چونکە، لە یەک سەردەمدا پێکەوە بوون. ئەم کارتێکردنانەش، پتر بەو بەڵگە و کۆنینانەدا دەردەکەوێ، کە زانایانی ئارکیۆلۆژیا دەسیانکەوتووە. هەموو ئەو بەڵگانەی لە مێژووشدا، بە هۆی پشکنین و شتە کۆنینەوەکانەوە دۆزراونەتەوە، ئەوەمان بۆ ڕووندەکەنەوە: کە لە بەڵگەکانی بابل و عیلان کۆنترن و لەوانەوە وەرنەگیراون.(بەڵکوو لە « ئۆرارتوو » خوازراوەتەوە و ئەوە خۆی لە خۆی وا دەگەیەنێ، کە لێرەشدا شوێنی بەتاڵ و بۆشایی هەیە و ئەو شوێنە بەتاڵانە دەتوانن، تەنیا لەوحەکانی پاشایانی ماننایی و مادیی بن و هیچی تر. ئەو بەڵگانەی سەرەوە نیشاندەدەن: کە پارسەکان «ئێرانێکان » خەتی بزمارییان لە « ماد »ەکانەوە وەرگرتووە. ئەوە بۆمان دەردەخا، کە تەئسیری زمانی « مادیی » لەسەر زمانی « پارسیی » هەر فرێدانی ووشە نەبووە، بەڵکوو، خەت و ئەلفوبێتەکەش دەگرێتەوە.) «23،70»

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، پێویستە، ئەوەش بڵێین: خزمایەتیی و نزیکیی، نێوان هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، لە کۆندا وای لە هێندێ شارەزای زمان و ڕۆژهەڵاتناس کردبوو، کە زمانی کوردیی، بە لقێ لە زمانی فارسیی دانێن. چونکە، گەلێ ووشە لە هەر دوو زمانەکەدا هەن، گەر وەک یەک نەبن، زۆر لە یەکدییەوە نزیکن.

زۆربەی زۆری شارەزا، ڕۆژهەڵاتناس، زمانەوانەکانی بیانیی و کورد، لە سەر ئەو باوەڕەن: زمانی کوردیی ئەوڕۆ، بە یەکێ لە زمانەکانی هیندۆ ـ ئەورووپایی دادەنرێ. لە هەمان کاتیشدا، لە بنەماڵەی هیندۆ ـ ئێرانیی و لە خێزانە زمانی « ئێرانیی » جیا ناکرێتەوە. لەگەڵ زمانی « فارسیی » شدا، خزمایەتیی نزیکی هەیە. ئەوە جگە لەوەی، شتێکی ئاشکرایە، هەموو زمانێ بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گۆڕان دایە،(زمانی هەر وولاتێک ـ ئەگەر ڕووداوەکانی مێژوو نەیانگۆڕیبێ ـ زمانی دانیشتووانی کۆنی ئەو وولاتەیە، وەکوو باسکرا ڕووداوەکانی مێژوو، دەسەلاتگۆڕکێی سیازدە قەرن نەیتوانیوە، لە بەشی ڕۆژارای « ماد »ا شتێ بگۆڕێ و دانیشتووانی ئەم بەشەی « مادستان »ی کۆن ئیمڕۆ کوردن کە « نەوەی میدییەکانن » ئاخۆ! بێجگە لەوەی کە بڵێین زمانی « کوردیی »ش لە بنەڕەتا ئەنجامی

گۆڕان و گەشەکردن و پەرەسەندنی زمانی « مادیی »یە، شتێکی ترمان لە دەس دێ؟ نەخێر! چونکوو هەموو بەڵگەیەکی مێژوویی کە زانایان ـ تەنیا بۆ مەبەسی خزمەتی زانست ـ داویانەتە بەر لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە، تا ئێستە، هەر ئەو حەقیقەتەیان ئاشکراکردووە کە زمانی « کوردیی » ئیمڕۆ بەروبۆی تطور و تەکامولی زمانی « مادیی » دوێنێیە.) «34،70»

شتێکی ئاشکرایە، زمانیش، وەک هەموو شتێکی دیکەی زیندوو، بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی دادەنرێ. هەموو دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش، بەپێی یاسایەکی تایبەتیی گۆڕان، بە شێوەیەکی بەردەوام لە گۆڕاندان، گەشەدەکەن، تا وردەوردە پەرەدەسێنن و لە نێو جەرگەی کۆمەڵگەدا ڕەگدادەکوتن. هەموو زمانێ، تا بە تەواویی ڕەگدادەکوتێ، لە لایەکەوە، کار لە زمانەکانی دیکەی گەلانی دەوروبەری خۆی دەکا. لە لایەکی دیکەشەوە، زمانەکانی دیکە کاری تێدەکەن. جا ئەو کارتێکردنە، هەمیشە دوو لایەنی دەبێ. هەڵبەتە، هەمیشە هەر بە چاکە کار لە یەکدی ناکەن، بەڵکوو، کارتێکردنەکە بە چاک یا بە خراپ ڕوودەدا. گەر بە چاکبوو، ئەوا زمانە کارتێکراوەکە پتر گەشەدەکا و پێشدەکەوێ. بە پێچەوانەشەوە، گەر بە خراپبوو، ئەوا لاوازیدەکا و بەرەبەرە دەیپوکێنێتەوە. جاری واش هەیە، زمانە کارتێکراوەکە بەرگەناگرێ و لەنێودەچێ.

هەڵبەتە، گەر ئەم یاسایە، بۆ هەموو زمانەکان ڕاستبێ، ئەوا دەبێ، بۆ زمانەکانی « ئاڤێستایی، مادیی، پارسیی، فارسیی ناوەڕاست و نوێ و کوردیی »ش هەروابێ. چونکە، هیچ یەکێ لەو زمانانە، لە یاسای کارتێکردنی زمانەکان لە یەکدی بەدەرنین. بۆیە، زمانی مادیی، لە لایەن هەموو ئەو زمانانەوە کاریتێکراوە، کە لە دوای ڕووخاندنی ئیمپراتۆریای مادەوە هەبوون، دەسەڵاتیان لە وڵاتی مادا پەیداکردووە، لە ڕێی ئەو دەسەڵاتەشەوە، کارێکی زۆری لە زمانی مادەکان کردووە. هەروەها، ئەویش کاری تێکردوون.

گەر سەرنجێکی مێژوویی، لە هێندێ لە زمانەکانی جیهان بدەین، دەبینین: ئەم زمانانەی نەتەوەکان ئەوڕۆ قسەی پێ دەکەن، لەگەڵ زمانی دانیشتووانی پێشووی ئەو ناوچە و وڵاتانەدا، زۆر جیاوازییان هەیە. بۆ

نموونە: (لە میسر زمانی میسری کۆن جێگەی خۆی بە قبتییەکان و دوایی بە یۆنانیی و لە ئەنجامدا بە عەرەبیی دا. لەگەڵ ئەوەشدا، کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لەناوچوون و لە وولاتی خۆیان دەر نەکران و بەبێ گۆڕان تا ئێستە ماونەتەوە. هەروەها، لە عێراقدا، دیسان زمانەکانی سۆمەریی و هوریتیی و بەرێکوپێکی جێگەی خۆیان دا بە « ئاشووریی - بابلیی »، «ئەکەدیی » و ئارامیی و عەرەبیی. لە ئاسیای ناوەڕاستدا، زمانە ئێرانییەکانی وەکوو « خوارزمیی و سکدیی و باکتریائیی و پارتیی » بوو، بە زمانی تورکیی « ئەزبەک و قرەقلپاقیان و تورکمان ». هەروەها، ئەم گۆڕانانە بە سەر زمانی مادیشدا هاتووە. بەڵام، هۆی بنەڕەتی گۆڕینی ئەم زمانانە ئەوە نییە، کە خەڵکەکانی ئەم کیشوەرە یان ئەم سەرزەمینە نەمابن و خەڵکی تر هاتبنە جێگەکانیان، وە بەم هۆیەوە هۆزەکانی ئێستە - لەگەڵ ئەوەدا کە ماوەیەک بە زمانێکی تر قسەیان ئەکرد - بە شێوەی گشتیی نەوەی ڕاستی دانیشتووانی کۆنی ئەم کیشوەرانەشن. ئەو دانیشتووانەی کە میراتی ڕۆشنبیریی و مێژوویی و نەژادییان بە هۆزەکانی ئێستە گەیاندووە.)« 111،70 » دیارە، لە کۆندا ئەو گەلانەی، دراوسێی یەکدی بوون، یا پێکەوە ژیاون، لەبەر چەن هۆیەکی دیاریکراو، هەمیشە جۆرە تێکەڵاوییەک، لە نێوانیاندا دروسبووە. لە هێندێ لە بوارەکانی ژیاندا، بە تایبەتیی وەک: «خووڕەوشت، ئایین و زمان »، کاریان لەیەکدی کردووە. بە تایبەتیی، گەر زمانی ئەو گەلانە، هەموویان لە یەک خێزانەزمانی دیاریکراو بووبن، هەر زۆر کاریان لە یەکدی کردووە. چونکە، گەلێ ووشەی هاوبەش لە نێوان ئەو زمانانەدا هەبووە. ئەو نزیکیی و ووشە هاوبەشانە، تەنیا لە زمانی کوردیی و فارسیدا نەبووە و نییە، بەڵکوو، لە لایەکەوە لە هەموو زمانە ئەورووپایی یەکان خۆیاندا هەبووە و هەیە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان زمانی کوردیی و زمانە هیندۆئەورووپایی یەکانیشدا، ئەو لێکچوونی ووشانە بەدیدەکرێن. بۆ نموونە:

لە زمانی کوردیی و فەڕەنسیدا، « برۆ و ئەژنۆ و... » هەر یەک واتایان هەیە. لە زمانی کوردیی و ئیتالییدا، « برۆ، کێ، کاروان و... »، هەر یەک شتن. هەروەها، لە زمانی ڕووسیدا، هێندێ ووشە هەن، لە کوردیشدا

هەر هەمــان واتايان هەيە. وەک « بەران، بازاڕ، بروّڤ ... تاد » هێندێ ووشەی دیکەش هەن، لە یەکدییەوە زۆر نزیکن. وەک « ژنە ـ ژن، مشکە ـ مشک، سپاسیبە ـ سوپاس، سەباکە ـ سەگ .. تاد ».
بەڵام، کـاتێ گـەلێکیـان خـاکی گـەلەکـەی دیکەی داگـیـرکـردووە، بە هەمـوو شێوەیە هەوڵیداوە، «خوورەوشت، ئایین، ئایینزا و زمان »ەکەی خۆی، بە سەردا بسەپێنێ. بە هەمان شێوەش، «خوورەوشت، ئایین و زمان »ی گەلە داگیرکراوەکەش، بە شێوەیە لە شێوەکان، کاری لە کەلتوور و زمانی گەلی سـەردەس کـردووە. بەڵام، گـومـانی تێـدا نیـیـە، ئەو کـارتێکردنە لە چاو کارتێکردنی زمانی گەلە داگیرکەرەکەدا، کەمتربووە. بۆیە، لەو ڕێگەیانەوە، هێندێ ووشەی زمـانی هەر دوو گـەلە سـەردەس و ژێردەسـەکـە، تێکەڵاوی یەکدی بوون. هێندێ جاریش، ئەو ووشانە وایان لێهاتووە، نەناسرێنەوە، لە بنەڕەتدا سـەر بە کـام زمـانەیان بوون. جا ئەو تێکەڵاوییەی، لە بەرەبەیانی مـێـژووە، لە نێـوان کـورد و فـارسدا پەیدابووە، کـارێکی زۆریان لە یەکـدی کردووە و گەلێ ووشەی هەر دوو زمانەکە، تێکەڵاوی یەکدی بوون.
د. « کەمال مەزهەر » ، لەو بارەیەوە دەڵێ:( دەوروبەری ساڵی 550ی پێش لەدایکبوون، دەوڵەتی میدی پاش جەنگێکی گەورە، لە نێوان شای میدی ئیستیاجز و شای فارس کۆرشی گەورەدا فەوتا. بەم جۆرە فارسەکان، کە جاران ژێردەستەی میدییەکان بوون، وایان لێهات، میدییەکانیان کەوتە ژێردەست، ئەمـانیش کـە سـەربەخـۆیی یان نەمـا، بەشی زۆریان بەرەو شاخەکانی کوردستان بوونەوە و لەوێ لەگەڵ گەلانی ئەو ناوە تێکەڵبوون و گەلی کوردیان پێکهێنا. ئینجا ئەوی گومانی تێدا نییە، تێکەڵییەک لە نێوان ئەم میدی و فارسانەدا پەیدابووبوو، چونکە، فارسەکان ماوەیەک لە ژێردەسی مـیـدییـەکـاندا بوون. ئەمـانیش، مـاوەیەک لە ژێردەسی ئەواندا. بێگومـان، ئەو تێکەڵیـیەش کاریکردۆتە سەر هەر دوو زمـانەکە و سـووکە یەکچوونێکی لە نێوانیاندا پەیداکردووە.
ژمارەیە لە مێژوونووسان، دەربارەی ئەم لەیەکچوونە دەڵێن: گەلێ هەبووە، ناوی پارسیی بووە، کە لە گەلە هیندۆ ـ ئەورووپایی یەکان بوون و بەشێکیان تێکەڵ بە فـارس و بەشـێکیـشـیـان تێکەڵ بە کـورد بوون و تیـایاندا

تواونەتەوە. ئەمەش، بۆتە هۆی ئەوەی، چەن ووشەیەک لە زمانەکەیان، تێکەڵ بە فارسیی و کوردیی بێ، ئێستەش ئەو ووشانە بوونەتە هۆی پەیداکردنی ئەم لەیەکچوونەی نێوان کوردیی و فارسیی.)«92،21 ـ22 ».
بەو پێیەی، هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، لە بنەڕتدا لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵاون و لە یەک گروپە زمانن، لەبەرئەوە، گەلێ ووشە لە هەر دوو زمانەکەدا هەن، لە ڕووی ڕووخسار و واتاوە، وەک یەک وان و یەک شت دەگەیەنن. بۆیە، بە تەواویی ناتوانین، بڵێین: ئەو ووشانە لە سەداسەد کوردین یا فارسین. بەڵکوو، ئەز پێموایە، لە بنەڕەتدا لە چەن ووشەیەکی « ئاریی، مادیی، ئاڤێستایی و زمانە کۆنەکانی دیکەی گەلانی ئێران » پێکهاتوون. ئەوڕۆش، وەک چەن ووشەیەکی هاوبەش، لە نێوان هەر دوو زمانەکەدا بەکاردێنرێن.
« تایەر سادق »، بەپێی دووروو و نزیکی ووشەکان، لە زمانیی کوردیی و فارسییەوە، ئەو ووشانەی، بە سەر سێ دەستەدا دابەشکردووە. بۆ هەر دەستەیەکیش، هێندێ لەو ووشانەی بە نموونە هێناوەتەوە.
بەشی یەکەم: ئەو ووشانەن، کە لە هەر دوو زمانەکەدا، چ لە ڕووی ڕوخسار و چ لە ڕووی واتاوە، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان نییە.
بەشی دووەم: ئەو ووشانەن، کە لە هەر دوو زمانەکەدا، تەنیا بە یەک پیت لە یەکدی جیادەکرێنەوە. بەڵام بە واتا وەک یەک وان.
بەشی سێیەم: ئەو ووشانەن، کە لە ڕوخسار و واتادا جیاوازن و خەسڵەتی زمانێکی سەربەخۆیان پێوە دیارە.
هەر چەندە، بەشی دووەمیان، زۆر تێکەڵاوی زمانی کوردیی بوون و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، لە هێندێ ناوچەی کوردستانیش، هەر بەو شێوەیە بەکاردێنرێن، وەک فارسەکان بەکاریدێنن. وەک:(ئەو ـ ئۆ، پۆڵا ـ پۆلاد، خانو ـ خانە، ئێستر ـ ئەستر، ئەشکەوت ـ شکفەت، ئاوڵە ـ ئابڵە، ئاوێنە ـ ئاینە، ئاو ـ ئاب، برۆ ـ ئەبرۆ ،بەرامبەر ـ بەرابەر ... تاد)
بەڵام، ئێمە لێرەدا، بە پلەی سەرەکیی، تەنیا بەشی یەکەمان لا مەبەستە، چونکە، لەگەڵ باسەکەماندا، بە تەواویی دەگونجێ. بۆیە، ئەو نموونانەی نووسەر هێناونێتییەوە، کتومت وەک خۆیان دەیانگوێزینەوە. وەک:

(ئەسپ، ئەنجام، ئەگەر، ئەندام، ئومێد، ئاخوڕ، ئارەزو، ئامانج، ئاواز، ئازاد، ئازادی، ئاین، ئاسمان، ئاشنا، ئاشکرا، ئاهەک، ئاهەنگ، ئارد، ئاخ، بەخت، بەد، بێگانە، بڵیند، بت ـ بوت، بادام ـ بادەم، باوڕ، بیشە، برادەر، بریانی، بەهەشت، بەند، بەندە، بەندەگی، باغچە، بازو، بەهرە، برنج، بەهار، بەستە، بەربەر، باریک، بێ، بەختیار، بەختیاری، باڵ ـ بال، باڵدار ـ بالدار، باڵا ـ بالا، باز، بازرگان، بازرگانی، بازاڕ، باغ، بار، باران، بەر، تەخت، تەختە، ترش، ترس، تەنها، تەڕ، تەرازو، تەندروست، تەڵە، ترومپا، تەشت، تفەنگ، تف، تیژ، تیر، تازە، تاق، تاک، تۆپ، تەنگ، تەماشا، تیمار، ترياک، تاریک، تەنگانە، پار ـ پارساڵ، پارە، پارچە، پاک، پیش، پیشەوا، پەرست، پەند، پەسند، پیر، پیشە، پیشەوەر، پەریشان، پەردە، پەنیر، پێغەمبەر، پڵینگ ـ پلینگ، پەڕ، پینە، پینەدۆز، پایتەخت، پیادە، پیادەڕۆ، پیاڵە ـ پیالە، پەنجەرە، پشقل، پیرەمێرد، پەیمان، پوڵ، پەشیمان، جام، جۆ، جۆڵا ـ جولا، جوان، جگەر، جەرگ، جار، خاک، خۆڵ ـ خۆل، خوێش، خۆش، خۆشەویست، خورما، خاڵ ـ خال، چالاک، چوست، چەرم، چارە، بێ چارە، چاپ، چاپخانە، چەهرە، چەتر، چەند، چەرخ، چاک، چونکە، چەنە، دامەن « دامێن »، دەریا، دو، دور، درشت، دلبەر، دلاوەر، دلێر، دە، دەمار، درەخت، دڕندە، دەست، دروست، دان « ددان »، دانە، دانا، داس، دیوار، داڵان، دەرد، درەخشان، دەم، دارا، دارایی، دریغ، دلارام، دەستە، دار، ریش، ریشە، روو، دوڕو، ران، راست، راستە، ریسوا، رەنج، رەنجبەر، رەنگ، رەنگین، رەوا، رەوان «گیان»، رازیانە، رازی، زین، زبر « زور »، زەرە، زقوم، زو، زیان، ساڵ، ساڵانە، ساڵنامە، سەنگ، سەنگین، سەنگەر، سەر، سەردار، سەرباز، سەرکار، سزا، سرکە، سەرین، سەگ، سوپا، سرود، سم، سەرگین، سوار، سود، سۆراخ، سەد، سوپاس، سەربەست، شەکر، شاد، شادی، شادمان، شمشیر، شیر، شێر، شێوە، شل، شیرین، شەرواڵ، شانە، شاگرد، شەبۆ، شەرم، شەش « شیش »، شاباش، فەرمان، فەرماندار، فەرمودە، فریز، فرچە، قاز، قاو، قولنج «کۆلنج »، کەس، کەم، کەمین، کەندو، کار، کاروان، کاروانسەرا، کارەسات، کارمەند، کارخانە، کان «کانگە »، کودو

«کولەکە » ، کوپ، کەپر، کەپەک، کەپەنک، کەژاوە، کەڤکیر، کەڕ، کەنیزە، کرم، کشت، کشت و کاڵ، کەشتی، کاهو، کەرە، کاغەز، کەمەر، کەمەربەند، کولینگ، کۆشەش، کۆشک، گەرد، گۆشە، گەردەن «گەردان » ، گوشاد، گران، گرانی، گوگورد، گورگ، گەزاف، گورز، گەچ، گەرم، گەنج، گوم، گڵ، گوڵ، گوڵدار، گوڵزار، گۆنا ، گەڵو، گورگ، گۆیا ، گەل، گەلە، گۆڕ، گۆڕستان، گاز، گەرما ، گەدا، گومان، لاڵ، لالە، لامپا ، لەشکر، لان، لۆر، لەرز، لولە، لات، لاف، مەرگ، مەگەر، مەیمون، میوە، مازو، مو، مس، مار، مز، ماست، میخ، مۆم، مشت، مەزە، مەرد، میرزا، مزە، مورد، مەست، مانەند، نەوە، نیشان، نمونە، نیاز، نرخ، نۆکەر، نۆزدە، نان، نانەوا، نیگار، نم، نیزە، ناز ـ نازدار، نازەنین، نۆش، واژە « باج » ، وێران، والا ، هەر، هیچ، هەزار « ئەزار » ، هەشت، یەک، یار، یاد، یان، یاداشت، یاخود)«63،112 ـ 116».

ئەوەی گومانی تێدا نییە، لە هەر یەکێ لەو قۆناغانەی، زمانی فارسیی پێدا تێپەڕبووە، زمانەکە جیاوازبووە. لە هەر قۆناغێکدا، بەپێی دەسەلاتی فەرمانڕەواکان گۆڕاوە و وردەوردە پێشکەوتووە. دیارە، لە قۆناغی سێیەمدا، زمانی عەرەبیی و ئایینی ئیسلام، کارێکی زۆریان لێ کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر چەندە، ئەز پێمـوایە، سەرچاوەی ئەو زمانانە هەموویان، لە بنەڕەتدا هەر یەکبوون، پاشان، لە بەر چەندین هۆی دیاریکراو، لە یەکدی جیابوونەتەوە. بەلام، هێندێ لە زمانەوان و مێژوونووسەکانی وەک « جۆن مالکۆلم، سدنی سمیس، مێجەر ئەدمۆنس، مێجەر سۆن » و گەلێکی دیکەش، لەو باوەڕەدان: (ئەو زمانە کوردییەی ئەورۆ، کوردەکان قسەی پێ دەکەن، نە لە کۆن و نە لە ئێستەدا، هەرگیز دیالێکتێکی زمانی فارسیی نەبووە و لەویشەوە وەرنەگیراوە. بەلکوو، زمانێکی سەربەخۆی پاکی ئاریی ناسراوە، خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە و بە قۆناغە مێژوویی یەکانی گۆڕانی زماندا تێپەڕبووە. زمانی کوردیی، لە زمانی فارسیی کۆنیش کۆنترە، جگە لە چەن ووشەیەکی ئیسلامیی کەم نەبێ، تێکەلاوی زمانەکە بووە، کە لە زمانی فارسیشدا هەن، تەنیا زمانێکە لە ناو زمانەکانی خۆرهەلاتی ناوەندا، لە دەس کارتێکردنی

زمانی عەرەبیی رزگاربووە. وا دیارە، زمانی کوردیی و فارسیی، هەر دووکیان لە یەک سەرچاوەوە هەڵقوڵاون، پاشان، جیابوونەتەوە و هەر یەکەشیان بە سەر چەن دیالێکتێکدا دابەشبوون.)«97،305ـ308»

د. « نەبەز »یش دەڵێ:(زمانی کوردیی، گەر بێتو بە تەرازووی زمانەوانیی بکێشرێ، زمانێکی سەربەخۆی زیندووە و شێوە و زاراوەی هیچ زمانێکی دی نییە. بە کورتیی: زمانێکە، وەک هەموو زمانێکی سەربەخۆی دی، دەستووری مۆرفۆلۆژیی و فۆنۆلۆژیی و لێکسکۆلۆژیی تایبەتیی خۆی هەیە.)«92،23»

هەروەها، « هوارت ـ Hwart و دارمیستیتێر Dormesteter » و هێندێ لە زاناکانی دیکەش لەو باوەڕەدان و دەڵێن:(زمانی ئاڤێستای زەردەشت، زمانی میدییەکانی پێشوو و کوردیی ئێستایە.)«97،309 »

« مەسعوود مەحەمەد »یش دەڵێ: (زمانی ئاڤێستا، لەگەڵ زمانی فارسیی کۆندا جیاوازە و یەک شت نین)«108،24». لە هەمان کاتدا، « زوبێر ئیسماعیل »یش، دەڵێ:(زمانی کوردیی، یەکێکە لە زمانە ئێرانییەکان و سەر بە لقی ژووروری ڕۆژاوایە، هەر چەندە ئەم زمانەش لە ڕووی ڕەگەزەوە، لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا سەر بە خێزانی هیندۆ ـ ئارییە، بەڵام دراوەتە پاڵ ئەو زمانەی کە مادەکان پێی دواون و لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا، لە ناوچەی گۆمی ورمێ ژیاون.)«58،17» پاشان، دەڵێ: (دەتوانین، زمانی کوردیی، بە کۆنترین نموونەی نووسراوی زمانە ئێرانییەکان و کۆنترین زمانیش لە خێزانە زمانی هیندۆ ـ ئەورووپایی دانێین. لە پاش نووسراوەکانی « میتانیی » و « حیسی » یەکان و « ڕەک ڤیدا »ی هیندی، کە لە سەدەی دوازدەیەمی پێش زاییندا بە زمانی سانسکریتیی نووسراوەتەوە.)«58، 58-59»

گەر ئێمە قسە لە سەر زمانی کوردیی بکەین، هەڵبەتە دەبێ، چەن زانیارییەکی کورتیش، دەربارەی نەتەوەی کورد باسکەین. چونکە، کورد و زمانی کوردیی، وەک دوو دیوی دراوێ وان و هەرگیز لە یەکدی جیا ناکرێنەوە. کەواتە، بۆ یەکەم جار ووشەی کورد، وەک زاراوەیەکی ئێتنیی، کەی پەیدابووە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، زۆر ئاسان نییە.

پێش ئەوەی، وەک ئەورۆ هێندێ زانیاریی دەربارەی کورد ڕوونبێتەوە، گەلێ لە شارەزایانی جوگرافیا، مێژوو و زمانەوانەکانی بیانیی وەک: «تۆرۆدابخین، هێرۆدۆتس، نۆدکە، کبرت، هارتمان، زەینەفۆن، ستـرابۆن، هابشمان، لهمان هویت، کۆتنکن، مایر، رایسکە، لیرج، ویسباخ، ئەدۆنتس، هۆفمان، موریە، مالکۆلم، فۆن هامەر، د. مریج، سێر سیدنی سمیس، کاترمر، ملتبرن، ئەدمۆنس و ... تاد » لە « ڕەچەڵەک، ناو، مێژووی کورد و زمان »ەکەیان کۆڵیوەتەوە. هەروەها، هێندێ مێژووناسی «فارس، تورک، عەرەب و کورد »ی وەک: « فیردۆسیی، تەبەریی، یاقوتی حەمەویی، ئیبن ئەسیر، مەسعوودیی، ئیبن حۆقل، ئیبن مقەفەع، مەحموود ئالووسیی، ئەولیا چەلەبیی، شەمسەدین سامی بەگ، شەرەفخان، ئەمین زەکی و ... تاد » باسی ڕەچەڵەکی کوردیان کردووە. هەموویان، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، لە مێژوودا کورد، بە گەلێ ناوی جیاجیای وەک «کاردۆ، کورتی، کاردۆخی، کوردۆئین، کوردۆس، کوردوا، کاردکۆ، کاردشۆ، کوردۆش، خالدی، ئۆراتۆ، کورچیخ، کورتیوی، کارتیوای، لۆلۆ، گۆتی، کاسای، سۆباری، ماد، نایری، و ... تاد » ناسراوە. لە هەمان کاتیشدا، زۆربەیان ئەو تیرە و هۆزە کۆنانەی لە ناوچەکەدا ژیاون، بە باپیرە گەورەی کوردی ئەورۆیان داناوە. هەر یەکەیان، لە سەردەمێکی جیاواز و بە شێوەیە لە شێوەکان، ڕۆڵێکی گەورەیان، لە دروسکردنی نەتەوەی کورددا هەبووە. ئەو جیاوازییانەی، لە میانەی ئەم ناوانەشدا هەبووە و هەیە، جگە لەوەی، بەگوێرەی ناوچە گۆڕاوە، هەروەها، بەپێی زمانەکانی «ئێرانیی، ئارامیی، کلدانیی، ئاشووریی، عیلامیی، ئەرمەنیی، یۆنانیی، ڕۆمانیی و زمانی کوردەکانی ئەو سەردەمانە » ناونراون. بەڵام، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی « جوگرافیایی، مێژوویی و توێژینەوەی فیلۆلۆگیی » دووروودرێژدا، زاناکان بەو ئەنجامە گەیشتوون، زۆربەی زۆری ئەو ناوانە، لە زاراوەی « کورد »ی ئەورۆوە نزیکە.

بەڵام، ئەوەی لام ئێمە، تا ئێستە زۆر دیاربێ، بۆ یەکەم جارو بە ئاشکرا، کورد بەو ناوەوە ناسرابێ، ئەوەیە، وەک پرۆفیسۆر « کوردۆییف » دەڵێ: (ووشەی کورد، وەک ناوی میللەتێک، کە لە سنووری چوارچێوەی

کوردستاندا ژیاوە، لە نووسراوەکانی یۆنان و ئەرمەن و سۆمەر ... هتددا بەر چاودەکەوێ. بەپێی ئەو سەرچاوانە، کورد زۆر لە کۆنەوە لە ناوچەکانی ناوەڕاستیی کوردستانی ئێستەدا ژیاوە.)«45،78»
« ئەمین زەکی »دەڵێ:(ناوی کورد لە پێش و لە سەردەمی لەنێوچوونی دەوڵەتی ئاشوورییەکان، چەن جارێ هاتووە.)«97،55-56»
لەگەڵ ئەوەشدا، لە کۆندا، هێندێ نووسەری عەرەب، بە جۆرێکی دیکە لە کوردیان ڕوانیوە. کورد لای عەرەبەکان، وەک گەل و نەتەوەیەکی سەربەخۆ تەماشا نەکراوە،(مەبەسیان میللەتێکی دیاریکراو نەبووە، بەڵکوو بە مانای بەشێکی زۆری خێڵی کۆچەر و زمانی ئێرانی کە بنەمای خێڵەتی و جەنگییان هەبووە و زۆربەیان لە ناوچە شاخاوییەکاندا دەژیان ـ ئەم ناوەیان بەکارهێناوە. بە وتەیەکی تر، زاراوەی « کورد » مانایەکی تری فراوانتری هەیە، وەکوو چۆن ناوی کازاک تەنیا وەکوو ناوی میللەتێک بەکار نایەت. بەڵکوو، بە مانای کۆمەڵە خێڵێکی جیاوازیش کە ڕێکخراوی جەنگییان هەبێت هەر لە زێی « دنێپر »ەوە تا دەگاتە ئالتای. جا لە بەر ئەمەیە، مینۆڕسکی لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ: من باسی ئەو کوردانە دەکەم، کە بە زمانی کوردیی دەدوێن. چونکە، بە ڕای ئەو، « کوردەکان »، کە بە سەر ڕووبەرێکی پانوبەریندا بڵاوبوونەتەوە و لە شێوە و ڕواڵەتی سۆماتییاندا « لەش یا دەرەوە ــ نووسەر » جیاوازیی زۆریان لە نێواندا هەیە.) «76،201-202»
هەر لەو بارەیەوە، « ئەمین زەکی » دەڵێ:(لە سەردەمی هێرشەکانی عەرەبدا، بێژەی کورد ـ ئەلکرد وەک تاک و کوردەکان ـ ئەلئەکراد وەک کۆ، نیشانەی گەلێکی ئێرانی تێکەڵاو یا گەلێکی دراوسێی ئێران بووە.) «97،45»
« ئۆ. ل. ڤیلچێڤسکی » دەربارەی درووسبوون و ژیانی کورد، چالاکیی و وێژەکەی دەڵێ:(لە کۆتایی چەرخی ساسانیدا، کاتێ ئەم ئیمپراتۆریایە ڕووخا و عەرەبەکان، هێرشی بەربڵاوبوونەوەی خۆیان، بۆ وڵاتانی ئاسیای بەرایی دەسپێکرد، لە ناوچە چیاییەکانی میسۆپۆتامیای سەروودا، تووشی خێڵە کوردەکان هاتن، کە ئەو ساکە، وەکوو کۆمەڵێکی ئیتنیکیی تایبەتیی

دروسبووبوون. ئەم خێڵانەی کاکڵەی میللەتی کوردی ئێستاکە بوون، ئەمانیش هەر زوو، بە دەوری خۆیان، بەشدارییەکی چالاکانەیان لە ژیانی سیاسیی و کەلتووری ئاسیای بەرایی سەدەکانی ناوەڕاستدا کرد. سەرچاوەی زۆر و هەمەجۆری نووسرا و فۆلکلۆریی هەن، دەربارەی ئەم مێژووەی سەدەکانی ناوەڕاستی میللەتی کورد و لە کاتی ئێستەدا دەتوانین، بڵێین: هەر نەبێ، بە شێوەیەکی گشتیی ڕوونبۆتەوە. گەر جاران و تا ڕابردوویەکی نزیکیش، مێژووی میللەتی کورد و دەوری لە ژیانی مێژوویی میللەتانی ئاسیای بەراییدا پشتگوێدەخرا، ئەوا دوای پەیدابوونی کارەکانی « ڤ. ف. مینۆرسکی، ئەمین زەکی، حوسێن حوزنی، ڕەشید یاسمیی، ڤ. پ. نیکیتن » و هی تر ـ ئەمە لە تواناداا نابێت. )
«294-293 ،76»

دیارە، تیرە و هۆزە جیاوازەکان، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، چ خۆیان لە ڕووی ئیتنۆگرافیاوە، چ زمانەکانیان لە ڕووی زمانەوانییەوە، کاریان لە دروسبوونی یەکدی کردووە. هیچ گەلێ یا نەتەوەیەک لەم جیهانەدا نابینین، لە سەداسەد لە سەرەتای دروسبوونیانەوە، هەموویان هاو « خوێن، ڕەگەز، ڕەنگ، شێوە، زمان و ... » بن، بەڵکوو، لە چەندین جۆرگەلە « خوێن، نەژاد و ڕەگەزی تێکەڵاو، ڕەنگی جیاجیا، شێوەی جۆربەجۆر، زمانی کارتێکراو » پێکهاتوون. ئەم فاکتەرانە بە جیاجیا، یا هەموویان پێکەوە، کاریان لە دروسبوونی نەتەوەکان کردووە، تا بە تەواویی ئەو پرۆسێسی « دروسبوون، گۆڕان و کامڵبوونەی نەتەوەکان » تەواوبووە و بنجیانداکوتاوە. بۆیە، کارێکی ئاسایی یە، گەر لە کاتی دروسبوونی نەتەوەی کورددا، نەتەوەی فارس، کاری لە دروسبوونی نەتەوەی کورد کردبێ. بەڵام، هەرگیز کورد لە فارسەکانەوە دروس نەبووە.کەواتە، لێرەدا دەبێ، ئەوە بزانین و بە باشی هەستی پێ بکەین، بۆچی هەر لە کۆنەوە فارسەکان بە تایبەتیی، پاشان، عەرەب و تورکەکان بە گشتیی، پێ لە سەر ئەوە دادەگرن، گوایە، کورد نەتەوە نییە ؟!
فارسەکان دەڵێن: زمانی کوردیی بە دیالێکتێکی زمانی فارسیی دادەنرێ. هەروەها تورکەکانیش، هەمیشە هەمان قەوانی سواویان لێداوەتەوە.

هەڵبەتە، گەر ئەمە وابێ، واتە: کورد زمانی نەتەوەیی خۆی نییە، هەر گروپێکی ئیتنیش، زمانی نەتەوەیی نەبێ، ئەوا بە نەتەوەیەکی سەربەخۆ ناژمێررێ. بەڵکوو، بە یەکێ لە خێڵە گەورەکانی نەتەوەیەکی دیکە دەناسرێ. لەو بارەدا، ئەو گروپە ئیتنییە، بۆی نییە، داوای هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی خۆی بکا.

کەواتە، فارسەکان و پاشتریش تورکەکان، هەر لە بنەڕەتدا مەبەسیان ئەوەبووە، وەک نەتەوەیەکی جیاواز، دان بە بوونی کورددا نەنێن. بەڵکوو، بە وەچەیەکی ڕەسەن و سروشتیی خۆیانی دانێن. واتە: ئەو بەشەی لە ژێردەسی تورک دایە، بە تورکی بزانن. ئەو بەشەشی، لە ژێر دەسی فارسەکان دایە، بە فارسی بناسن. ئایا، تراژیدیا و کۆمیدیای، وا پڕ لە سەیروسەمەرە، لە مێژووی هیچ نەتەوەیەکدا ڕوویداوە، بەشێ لە گەلەکەی بە فارس، بەشێکی دیکەی بە عەرەب، بەشەکەی دیکەشی بە تورک دابنرێ؟ ئەدی ئەی کورد خۆی چییە؟!! ئەو ناوە لە چییەوە هاتووە؟!!

لەو بارەیەوە «کوردۆییف» دەڵێ: (بە باوەڕی ئێمە، کورد لە فارسەوە نەکەوتۆتەوە. بەڵکوو، لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی چەن هۆز و میللەتانی کۆن، کە لە چیاکانی زاگرۆس جێگیربووبوون، پەیدابووە. گەلێ لە هۆزەکانی کورد، کە خاوەنی ئایین و باوەڕی جیاوازن، یا جیاوازیی لە ئەتنۆگرافیایاندا هەیە. هەروەها، مانەوەی گەلێ ناوی هۆزی کۆن، لە ناو کۆمەڵی کورددا و هەندێ ناوی جوگرافیای ناوچە شاخاوییەکانی ئاسیای پچووک، کە بوون بە ناوی هەندێ لە هۆزەکانی کورد وای دەردەخەن، کە میللەتی کورد لە ئەنجامی تێکەڵبوونی هەندێ هۆز و میللەتان، کە لە ناوچە شاخاوییەکانی زاگرۆس دەژیان، یا هاتبوون بۆ ئەم ناوچەیە پەیدابووە.)«43،78»

ئەوڕۆ، گومان لەوەدا نەماوە، گەلانی جیاوازی ئێران، لە نەژادی ئاریی کەوتوونەتەوە. ئەم گەلانە، دەوروبەری دوو سێ هەزار ساڵ پێش زایین، لە چیاکانی زاگرۆسەوە بەرەوخوار بوونەوتەوە و لە خاکی ئێراندا نیشتەجێبوون. (کۆمەڵێکیان لە سەروو و سەرووی ڕۆژاوادا جێنشین بوون «ماد»یان پێ ئەڵێن. کۆمەڵەکەی تریان، لە لای خوارووەوە جێنشینبوون «پارس»یان پێ ئەوتن.)«133،68»

« ئۆ. ل. ڤیلچیڤسکی » دەربارەی کورد دەڵێ: (یەکێ لە میللەتە رەسەنەکانی رۆژهەڵاتی نزیکن و لە وڵاتێکی شاخاویی بەرفراواندا، لە رۆژهەڵاتی ئاسیای پچووک و رۆژاوای بانی ئێرانیدا دەژین و کۆمەڵێکی سیما و خەسڵەتی دیار و تایبەت هەر بە خۆیانەوە هەیە و لە ژیار و کەلتووری مادیی و گیانییاندا رەنگیانداوەتەوە. بە زمانێ دەدوێن، بێگومان، لە زمانە ئێرانییەکانی تر جیاوازە و ئەمانە لە ماوەیەکی دوورودرێژدا، دەورێکی تا بڵێی چالاکیان لە ژیانی مێژوویی ئاسیای بەراییدا بینیوە.) «212،76»

هەڵبەتە، هەر فارسەکان خۆیان، ئەم درۆ زانستانەیەیان نەهۆنیوەتەوە، بەڵکوو، هێندێ جار، هانی چەن کوردێکی خۆفرۆشی نووسەریشیان داوە، رەچەڵەکی خۆی، گەلەکەی و زمانەکەی، لەو بەشەی بەو دەوڵەتەوە بەسراوە، بۆ سەر رەچەڵەک و زمانی گەلی بالادەس بگێڕێتەوە. یەکێ لەو کوردە خۆفرۆشانە، « رەشید یاسمی » بووە. لەبەرئەوە، هێندێ لە نووسەر و زاناکانی کورد، وەک « د. کەمال مەزهەر، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ و ... تا » لە کاتی خۆی و لە جێگەی خۆیدا، وەڵامێکی ئەو ورێنانەیان داوەتەوە و دەمکوتیانکردووە.

لەو بارەیەوە پرۆفیسۆر « کوردۆییف » دەڵێ: (زمانی هەندێ لە هۆزەکانی زووی زاگرۆس، کە لە بنچینەی دروسکردنی میللەتی کورددا هاوبەشییانکردووە، لە خێزانی زمانە ئێرانییەکان بوون. لەم رووەوە زمانی کوردیی، وەک یەکێ لە زمانەکانی ئەسڵیی زاگرۆس خزمایەتیی و پەیوەندیی لەگەڵ زمانەکانی میدیی و پارفیایی و فارسییدا هەبووە، بەڵام، بە هیچ جۆرێک لە زمانی فارسییەوە دروست نەبووە و نەکەوتۆتەوە، وەک رەشید یاسمیی وا بێ شەرمانە دەیەوێ، بیسەلمێنێ. بێگومان، هاوبەشیکردنی ماد و پارفیان و فارس لە دروستبوونی میللەتی کورددا بووە بە هۆی بەهێزکردنی پەیوەندیی لەگەڵ زمانە ئێرانییەکاندا « میدیی، پارفیایی، فارسیی) ، بەڵام، ئەمە بە هیچ جۆرێ، نابێ بە بەڵگە بۆ نیشاندانی ئەوەی، کە کورد لە فارسەوە پەیدابووبێ و زمانی کوردیی لقێ بێ لە زمانی فارسیی.) «78،44 - 45»

هێندێ لە شارەزایانی بیانیی، پێیان وایە،(زمانی ئاڤێستا ئەو زمانەیە، کە زەردەشت کتێبە پیرۆزەکەی پێ داناوە، هەمان زمانی مادە و ئەو زمانەیە کە لە وولاتی مادا بەکارهاتووە. جگە لەمەش، ئەڵێن: زمانی ماد لەگەڵ زمانی فارسیی کۆن جیاوازییەکی وایان نەبووە. چونکە، مێژوونووسەکانی یۆنان ئەڵێن: پارس و مادەکان لە یەک گەیشتوون.)«133،68»

هەروەها، زاناکان دەڵێن:(زمانی ماد، سانسکریتیی و فارسیی کۆن، سێ زمانی دەستەبرا بوون و لە دایکە زمانێ زاون کە ئەویش زمانی ئارییە.) «133،68»

مامۆستا « کوردۆییف » دەڵێ:(هەر چەندە، لە زمانی کوردیی و فارسییدا، گەلێک ووشە هەن، وێکدەچن، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێ، بووترێ، زمانی کوردیی لە زمانی فارسییەوە پەیدابووە. زمانی کوردیی چ لە فۆنێتیک، چ لە مۆرفۆلۆژی، چ لە سینتکسیس، چ لە درووسبوونی ووشەدا زمانێکی سەربەخۆیە و ئەم ڕاستییە لە مێژە لە لایەن کوردناسانی سۆڤێتەوە نیشاندراوە و چەسپێنراوە.)«78، 53-54»

هەروەها، دەربارەی زمانی کوردیی، زانای ڕووس« ئۆ. ل. ڤێلچێڤسکی »، ئاماژە بۆ ڕاکانی « مینۆرسکی » دەکا، خۆشی پاڵپشیاندەکا و دەڵێ: (ڤ.ف. مینۆرسکی زۆر ڕاستی گوتووە، کاتێ دەڵێ: زمانی کوردیی، وەکوو ئاشکرایە، زمانێکی لقی ڕۆژاوای گروپەی خوارووی ڕۆژاوای زمانە ئێرانییەکانە، لە باری ئێستاکەیدا، زمانێکی تەواو سەربەخۆیە.

بێگومان، لەوەشدا ڕاستیی گوتووە، کە زمانی کوردیی، لەگەڵ ئەوەی دیالێکتی زۆر و جۆراوجۆری هەیە، کۆمەڵێک سیما و خەسڵەتی تا ڕادەیەک تایبەتیی و چەسپاوی هەیە و دەتوانین، لە هەر یەکێک لەم دیالێکتانەیدا بیاندۆزینەوە. زمانی کوردیی، ئێمرۆکە بەم جۆرەیە و لە سەرچاوە ئەدەبییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا، هەر چەندە، تاکوو ئێستە کەمیان لێ کۆڵراوەتەوە، هەر وایە. هەروەها، لەگەڵ ئەو ڕایەشیدا دەبین، سەبارەت بەو سیمایانەی زمانی کوردیی لە فارسیی جیادەکاتەوە و لە هەمان کاتدا، لە هەر یەک لە دیالێکتەکانیشیدا هەن.)«202،76»

با لێرەدا، پێش ئەوەی کۆتایی، بەم بەشە بێنین، دەربارەی جیاوازیی نێوان،

هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، بە گوتەیەکی « ئەمین زەکی » بلێین: (جیاوازییەکی زەق، لە نێوان ئەو دوو زمانەدا، نزیکەی لە پێنج ڕووەوە هەیە: بێژە، پێکهاتە، داڕشتن، ڕێزمانی سرفی و ڕێزمانی نەحویی.) «313،97» ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە هەرگیز زمانی کوردیی و فارسیی، بە یەک زمان دانانرێن، بەڵکوو دوو زمانی جیاوازن.

بە باوەڕی من، کورد تەنیاوتەنیا، نەوەی مادەکانە. زمانی کوردییش، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە مێژوویی و زمانەوانییانەی بە سەریدا هاتووە، گەلێ گۆڕاوە و پێشکەوتووە. بەڵام، بنچینەکەی لە سەر دینگە پتەو و بەهێزەکانی زمانی « ماد »ەکان داڕێژراوە.

بۆیە، سەرەڕای ئەو هەموو چەرمەسەرییەی بەسەر کورددا هاتووە، تا ئەوڕۆش زۆر بە باشیی خۆی ڕاگرتووە. ئەگینا، گەر ئەو بناوان و ڕەگە قایەی نەبووایە، خۆی لە بەر گەردەلوولی ڕۆژگار، فاکتەری داگیرکردن و لەنێوبردندا ڕا نەدەگرت، هەر زوو دەتوایەوە.

## 10. زمانی ئاخافتن و زمانی نووسین :

شتێکی ئاشکرایە، کاتێ ئەم گەردوونە دروسبووە، سەرەتا مرۆڤ نەیزانیوە، قسەبکا. بەڵکوو، تەنیا بە هۆی لاساییکردنەوەی، ڕووداوەکانی سروشت و بە هێماکردن ئەوەی ویستوویەتی، دەریبڕیوە، هەر چۆنێبێ، یەکدییان تێگەیاندووە. پاشان، وردەوردە، زمانی پڕاوە. ناوی شتەکانی دەوروبەری فێربووە، تاکوتەرا، ووشەی لە دەم هەڵڕژاوە، تا بەرەبەرە، ڕستەی لێ دروسبووە. ئیدی بەو شێوەیە زمانی ئاخافتن، لە خەم ڕەخسیوە. یەکەم جاریش، مرۆڤ هەوڵیداوە، ئەوەی دەیەوێ، بە هۆی وێنەکێشانەوە، بەرانبەرەکەی خۆی تێگەیەنێ، چونکە نەیتوانیووە، بە قسەکردن هەستی خۆی دەربڕێ.

هەمووومان دەزانین، هەموو نەتەوەیەک، دوو جۆر زمانی هەیە، یەکەمیان: لە زمانی « ئاخافتن » و دووەمیشیان: لە زمانی « نووسین » پێکهاتووە. پێش ئەوەی، خوێندن و نووسین پەیدابێ و بڵاوبێتەوە، لە سەرەتای دروسبوونی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، تەنیا زمانی ئاخافتن هەبووە. ئەم زمانی ئاخافتنەش، لە ناو هەر کۆمەڵگەیەکی ئیتنیی دیاریکراودا، بە چەندین ڕووداو و قۆناغی مێژوویی گرنگدا تێپەڕیووە، تا بە تەواویی، شێوەی ئەوڕۆی وەرگرتووە.

وەک پێشتر گوتمان: لە سەرەتاوە نووسین نەبووە، بەڵکوو، تەنیا ئاخافتن هەبووە. ئەوەی مرۆڤ دەیگوت، پاش ماوەیەکی کەم لە بیریدەچۆوە. بەڵام، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی، لە بواری « ئابووریی، بازرگانیی، پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیی » ڕوویدا، ڕۆژبەڕۆژ، پێوەندیی نێوان گەل و نەتەوەکان، تا دەهات، بەرفراوانتر و پانوبەرینتر دەبوو. بۆیە، کۆمەڵگەی مرۆ، بیریان لە شێوە نەخشێ یا نیگارێ کردەوە، تا ئەو پەیامانەی دەیدەن، بە شێوازێکی ڕێکوپێک بیپارێن و لە کاتی پێویستدا، وەک دەکۆمێنتێ پەنای بۆ بەرن. پاشان، هێڵە جیاواز و پیتە جۆراوجۆرەکان دۆزراونەوە. ئیدی، بەو شێوەیە، زمانی نووسینیش سەریهەڵداوە.

دیاره، لە سەرەتادا نووسین، بەم شێوەیەی ئەورۆ نەبووە، بەڵکوو، وردەوردە، پێشکەوتووە، تا بەم جۆرە نووسین و ئەلفوبێیانە گەیشتووە. هێندەی مێژووناس و پسپۆڕەکان، لێکیانداوەتەوە و بۆ کۆمەڵگەی مرۆیان ڕوونکردۆتەوە،(یەکەم جا « سۆمەر »ێکان 3500 ساڵ پێش عیسا لە سەر « قوڕ » و پاش ئەوانیش بە500 ساڵ « میسر »ێکان لە سەر «پاپیرۆس » نووسیویانە.)«67،70»

بەم باسە کورتەی سەرەوەدا، بۆمان دەردەکەوێ،جیاوازییەکی گەورە، لە نێوان هەر دوو زمانی ئاخافتن و نووسیندا هەیە. هەر چی زمانی ئاخافتنە، زۆر لە پێش زمانی نووسینەوە هەبووە، بەڵکوو، زمانی ئاخافتن بە بنچینەی زمانی نووسین دادەنرێ. چونکە، زمانی ئاخافتن، ئەو زمانە ساکارە سروشتییەیە، کە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو پێی دەدوێن و زمانی تێکڕای ڕۆڵەکانی ئەو گەل و نەتەوەیەیە. بەڵام، زمانی نووسین، لە زمانی وێژەی کۆمەڵێکی ئیتنیی تایبەتیی پێکهاتووە.

د. «کەمال فوواد »، دەربارەی زمانی ئاخافتن و نووسین دەڵێ:(یەکێ لەو هەڵە گەورانەی کە بەشی زۆری نووسەرەکان تێیکەوتوون، دەرک نەکردنیانە بەو ڕاستییەی کەوا زمانی کوردییش، وەک هەموو زمانێکی زیندوو، لە زمانی گفتوگۆ و زمانی نووسین پێکهاتووە. ئاشکرایە، زمانی گفتوگۆ بەپێی شوێن و جێگە ئەگۆڕێ، لە گوندێکەوە بۆ گوندێ، لە شارێکەوە بۆ شارێ، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیە... ئەو ئەدەبەی بە زمانی گفتوگۆ نووسراوە یان ئەنووسرێ، پێی ئەوترێ ئەدەبی فۆلکلۆر. زمانی کوردیی لە ئەدەبی فۆلکلۆردا زۆر دەوڵەمەندە. بە هەموو شێوەکانی زمانی کوردیی «هۆنراوە، چیرۆک، داستان، ئەفسانە، پەندی پێشینان و گۆرانی ... » هەیە. بە پێچەوانەی زمانی گفتوگۆوە، زمانی نووسین شێوەیەکی یەکگرتووی هەیە، کە پێی ئەوترێت: زمانی ئەدەبی یان زمانی نەتەوەیی. بە زۆر شێوەی تریش ناو ئەبرێت. بۆ وێنە عەرەب پێی ئەڵێ:« ئەللوغە ئەلفوسحا »، ئینگلیز پێی ئەڵێ: «Standard language»، ئەڵمان پێی ئەڵێ:«Hochsprache»کوردیش پێی ئەڵێ: «کوردیی پەتیی ».)
«19،88 ـ 20»

هەڵبەتە، داهێنانی هێڵ و نووسین، بە گەورەترین دەسکەوت و سەرکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆ دادەنرێ. چونکە، گەر خوێندن و نووسین نەبووایە، بێگومان، هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی گرنگ، لە بوارە جۆربەجۆرەکانی ژیاندا ڕووی نەدەدا.

لەو ڕۆژەوە زمان پەیدابووە، بە تایبەتیی لەو کاتەوە، زمانی نەتەوەیی دروسبووە و زمانی نەتەوەکان لە یەکدی جیاکراونەتەوە، هەر نەتەوەیەک هەوڵیداوە، زمانێکی یەککرتووی « ئاخافتن و نووسین » بۆ خۆی پێکبێنێ. ئەو زمانەش، بە چەندین گۆڕانکاریی گەورە و گچکە و گرنگی مێژووییدا تێپەڕبووە. هەر چەندە، هەر نەتەوەیەک، ڕەوشی ناوەکیی و دەرەکیی تایبەتیی خۆی هەبووە و هەیە، هەر زمانێکیش بەپێی « هەلومەورج و بارودۆخی نەتەوەیی، ڕەوشی کەلتووریی و ڕامیاریی » خۆی، بەرەو پێشەوە چووە و هەمیشەش هەر بەو شێوەیە، بەرەو پێشەوە دەچێ. جا یا، شانبەشانی کاروانی پێشکەوتن و گەشەسەندنی، زمانەکانی دیکەی جیهان ڕۆیشتووە، یا لە کاروان بەجێماوە، بە لەتوپەتکراویی و لاوازیی ماوەتەوە. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، هێندێ خەسڵەتی هاوبەش هەن، لە ڕەوتی پێشکەوتنی مێژووییدا، بە شێوەیەکی گشتیی لە یەکدی دەچن. ئەو خەسڵەتانەش، لە نێوان هەموو زمانەکانی جیهاندا هەیە.

شتێکی ئاشکرایە، هیچ زمانێ بێ دیالێکتی جۆراوجۆر نەبووە و نابێ و نییە. کەواتە، زمانی هەموو نەتەوەیەک، لە کۆمەڵی دیالێکتی جیاواز پێکهاتووە. زمانی یەککرتووش، هێندێ جار، لە یەککرتنی دوو یا زیاتر لە دیالێکتێ پەیدابووە. هێندێ جاریش، یەکێ لە دیالێکتەکانی ئەو زمانە، بە هۆی چەن فاکتەرێکی « جوگرافیایی، مێژوویی، ڕامیاریی، ئابووریی و کەلتووریی »ەوە، بە سەر دیالێکتەکانی دیکەدا زاڵبووە، لە ئەنجامدا، وەک زمانێکی ستانداردی ئەو نەتەوەیە، خۆی بە سەر هەموو دیالێکتەکانی دیکەدا سەپاندووە، زمانێکی یەککرتووی نووسین، بۆ نەتەوەکە پێکهاتووە.

پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە بزانین، یەکێتی نێوان بەشەکانی هەر زمانێکی دیاریکراو، لە « گوێگرتن، قسەکردن، خوێندنەوە و نووسین » پێکهاتووە. مرۆڤ زمانی ئاخافتن « بە تەماشاکردن، وردبوونەوە،

گوێگرتن، لاساییکردنەوە و دووبارەکردنەوە »فێردەبێ. بۆ نموونە: منداڵ بۆ یەکەم جار و لە شوێنەواری یەکەمیدا، لە نێو خێزانەکەی خۆیدا، فێری گڕوگاڵ دەبێ. پاشان، زمانی دەپژێ و قسەدەکا. هەرچی لە زمانی دایک، باوک، برا و خوشکەکانیەوە دەبیستێ، وردەوردە، لە لاپەڕە سپییەکانی مێشکیدا تۆماریدەکا. پاشان، ئەویش هەوڵدەدا، دووبارەیانکاتەوە، تا بە تەواویی قسە فێردەبێ. هەروەها، کاتێ خوێندکارێ، لە وڵاتێکی دیکەی بیانیی دەخوێنێ، لە وڵاتەکەی خۆی دووردەکەوێتەوە، بە هیچ جۆرێ زمانی ئەو وڵاتە نازانێ، هەر چەندە، لە پەیمانگەی تایبەتیی زمان، فێری « خوێندن، نووسین، ڕێزمان و ئەلفوبێیی » ئەو زمانە نوێیە دەبێ، بەڵام، زمانی ئاخافتن، هەر لە ڕێگەی « تێکەڵاوبوون و گوتنەوەوە » فێردەبێ. کەواتە، یەکەم مامۆستای زمانی ئاخافتن، لە کۆمەڵگەوە دەسپێدەکا، بۆیە،(زمان خووە، خوویەکی ئاخافتنیی، واتە: ئەوەی کە دەیەوێ، فێری زمانێ بێ، دەبێ زۆربەی وەخت، خۆی ڕاهێنێ بە ئاخافتن بئاخافێ، لاسایی ئاخافتن کاتەوە، ئەوجا بخوێنێتەوە و ئەوجا بنووسێ. کەوابوو، گوێگرتن و ئاخافتن و لاساییکردنەوەی ئاخافتن و خوێندنەوە و نووسین، کۆڵەکەی سەرەکیی زمان فێربوونن)«304،100» بەڵام، زمانی نووسین، بە زۆریی، مرۆڤ لە خوێندنگەوە فێردەبێ.

گوتمان: زمانی قسەکردن، هەمیشە، پێش زمانی نووسین پەیدادەبێ. لەبەرئەوە، زمانی پەیڤین، پێوەندییەکی یەکجار گەورەی، بە پەیدابوون و دروسبوونی، کۆمەڵگەیەکی ئیتنیی دیاریکراوەوە هەیە. ئەز لەو باوەڕەدام، لەو ڕۆژەوە، نەتەوەکان وەک نەتەوە دروسبوون، مەرجەکانی نەتەوەیان تێدا کۆبۆتەوە و بە تەواویی پێگەیشتوون، زمانی ئاخافتنی هاوبەشی یەکگرتوویان، تێدا ڕەخساوە. هێندێ جاریش، ئەو زمانە، لای هێندێ نەتەوە، پێش ئەوەی، مەرجەکانی دیکەی نەتەوەیان تێدا کامڵبووبێ، وەک: «خووڕەوشتی هاوبەش، باری دەروونیی .. تاد»، بە یارمەتیی فاکتەری ئابووریی پەیدادەبێ.(زۆر جار، پێش ئەوەش کە مەرجەکانی نەتەوە، لە گەلێکدا تەواوبێ، کە زمان یەکێکیانە، زمانی یەکگرتوو پەیدادەبێ.)«9،69»

هێندێ لە شارەزایانی زمانی کوردیی، لەو باوەڕەدان، زمانی یەکگرتووی پەیڤین، لە مێژە لە نێو کورددا سەریهەڵداوە و سەقامگیربووە. لەو بارەیەوە د. « عیززەدین مستەفا رەسووڵ » دەڵێ: (فیلۆلۆژەکانی هەموو جیهان، ئێستە لە سەر ئەو باوەڕەن، لە یەکبوونی سێ شت، لە چەن دیالێکتێکی زماندا، ئەو زمانە ئەکات بە زمانێکی یەکگرتوو. ئەم سێ شتەش ئەمانەن :
1. گراماتیکی زمان.
2. فۆنێتیک.
3. بنەڕەتی فەرهەنگی زمان.)«9،69 ـ 10»
جگە لەوەی، زمانی کوردیی لە مێژە پەیدابووە، (بە هەموو دیالێکتەکانییەوە، بە زمانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو ئەژمێررێ)«10،69»
چونکە(گراماتیک و فۆنێتیک و بنەڕەتی فەرهەنگی، هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیی یەکن، وردە جیاوازییە کە هەیە، هەر ئەوەیە، کە لە دیالێکتی هەموو زمانەکانی جیهاندا بە زیادەوە هەیە. ئەمە ڕای گەلیش لەو لاوە بوەستێ، کە لە هەر کوردێ بپرسی: لە هەولێر یا لە ماردین یا کرماشان یا هەورامان، کە ئەو زمانەی پێی ئەدوێ چییە ؟
نالێ ـ سۆرانیی یا کرمانجیی یا لوڕیی یا گۆرانیی « هەوارامیی »، بەڵکوو ئەڵێ ـ کوردیی.
زمانی یەکگرتوومان هەیە. زمانەکەش چوار دیالێکتی گەورەی هەیە و هەر دیالێکتەش چەن لقێکی لێ ئەبێتەوە، ئەم دیالێکتانە نە یەکئەگرن و نەدەبێ یەکگرن و نە یەکنەگرتنیان دەبێتە بەڵگەی نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردیی. بەڵکوو مانەوە و گەشەسەندنیان، زمانە یەکگرتووەکەمان و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان دەوڵەمەند ئەکات. )
«11،69 ـ 12» ڕاستە، هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، هەر بە کوردیی دەناسرێن، بەڵام بە داخەوە، لە لایەکەوە جیاوازیی نێوان دیالێکتەکان، کارێکی کردووە، زۆربەی زۆری کورد، لە یەکدی ناگەن. چونکە، هەر دوو دیالێکتی « زازایی و گۆرانیی »، لە هەر دوو بەشەکەی دیالێکتی کرمانجیی و بە تایبەتیی لە « کرمانجیی خواروو »ەوە دوورن. لە لایەکی دیکەشەوە، دەرکەوتەیەکی زۆر خراپ و ترسناک، لە نێو کورد خۆی

و وولاته بیانییەکاندا بلاوبۆتەوە، ئەویش ئەوەیە، هێندێ کەس دەڵێن: ئێمە بە « سۆرانیی، یا بادینانیی، یا سولەیمانییانە و هەولێرییانە » قسەدەکەین. لە کاتێکدا ئەم شتانە، بە هەڵە بەکاردێنرێن، چونکە، «سۆران و بادینان »، ناوی دوو ناوچەی جیاواز و « سولەیمانی و هەولێر » ناوی دوو شاری گەورەی باشووری کوردستانن. بۆیە، ڕاستروایە، بڵێین: بە کوردیی قسەدەکەین. بەڵام، گەر یەکێ لێی پرسین، بەکام کوردیی؟ یا بە چ دیالێکتێ دەپەیڤن؟ ئەو کاتە دەتوانین، بڵێین: بە دیالێکتی کرمانجیی خواروو، یا کرمانجیی ژووروو، یا زازایی یا گۆرانی قسەدەکەین!

هەروەها ، دەربارەی زمانی یەکگرتووی ئاخافتن و بنجوبناوانی زمانەکەمان، د. « نەبەز » ، دەڵێ: (جا گەر ئێستە، ئێمە لەم ڕووەوە تەماشای هەر دوو شێوەکە، بە تایبەتیی و زمانی کوردیی بە گشتیی بکەین، دەبینین: لە زمانی کوردیدا، ژمارەیەکی یەکجار زۆر ووشە هەن، کە لە هەموو شێوەکاندا، بە تایبەتیی لە کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەڕاستدا، بە تەواویی لەیەکدەچن. ئەو ووشانەی کە پێوەندییان بە مەڕومالات و کشتوکاڵ و ژیانی سەرەتایی یەوە هەیە، وەک « بەرخ، گیسک، پەز، کەر، کورتان، کار، نیر، بەران، ئاش، کوڕ، کچ، دار، داس، گۆپاڵ، ماش، نیسک، نۆک، چەڵتووک، زوو، درەنگ، کونجی، پیر، لاو، ژن، گەنم، ڕەش و سپی ... هتد »بە نێزیکە لە هەموو شێوەکاندا وەک یەکن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بەڵگەیەکە کە شێوەکانی زمانی کوردیی، هەموو لە بنچینەدا، دەچنەوە سەر یەک زمانی یەکگرتوو، کە ئەویش زمانی کوردییە. چونکە ئەو ووشانەی کە گەلێک لە سەرەتای پەیدابوونیدا پێویستی پێیانە، هەموو لە بابەتی ئەو ووشانەن کە لە سەرەوە نێومان بردن. ) «66،232» جا هەر واشە، با جیاوازیی لە نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردییشدا هەبێ، با کەمێ بە گرانیش، لە یەکدی بگەین، بەڵام، ئێمەی کورد لە مێژە، زمانی یەکگرتووی ئاخافتنمان هەیە.

بەڵام، بۆ زمانی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوە، یا زمانی وێژەی یەکگرتوو، یا زمانی ستاندارد، بێگومان، هیچ جۆرە پێوەندییەکی، بە «دروسبوون، کامڵبوون و پێگەیشتنی مەرجەکانی نەتەوە »وە نییە. واتە:

مەرج نییە، زمانی ستاندارد، لە پێش دروسبوونی مەرجەکانی نەتەوە یا لە کاتی دروسبوونیدا سەردەرێنێ. بەڵکوو، دروسبوونی زمانی ستاندارد، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی، بە کۆمەڵێ فاکتەری « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، جوگرافیایی و کەلتوریی »ەوە هەیە. هەر نەتەوەیەک، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا و لە بەر هەر هۆیەکی تایبەتیی بێ، ئەو زمانە وێژەیی یە یەکگرتووەی لا دروسدەبێ. زمانی ستاندارد، (لای زۆربەی نەتەوەکانی جیهان، لە بەر هۆیەک لە یەکێ لە ناوچەکانی وولاتدا دروسدەبێ. هەر لەبەرئەوەش، زۆربەی خاسیەتەکانی دیالێکتی ئەو ناوچەیەی تێدادەبێ، کە ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەی تێدا دروسبووە. پاش بڵاوبوونەوەی ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە، ئەوسا لەگەڵ دیالێکتەکانی زماندا بە یەکدادەچن و جۆرە تێکەڵبوونێک « تفاعل* » لە نێوانیاندا پێکدێ. گەر تەماشای دروسبوونی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو بکەین، ئەوا لای هەر نەتەوەیەک تەجروبەیەکی تازە دەبینین.)«14،69»

لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە :

هێندێ نەتەوە، ئەو زمانە یەکگرتووەیان، بە هۆی کەلتوورەوە لا دروسبووە. وەک فارسەکان بە هۆی هۆنراوەکانی « حافز » و پەخشانەکانی«سەعدی »، لە شیراز سەریهەڵدا. هەروەها دەتوانین، بڵێین: (ئەم تەجروبەیەی فارس، لە هێندێ دیەنیدا، لە دروسبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئینگلیزیی دەچێ. کە ئەویش تێکەڵبوونی ئەدەبیات و شیعری « جۆسەر »ە لەگەڵ شێوەی لەندەندا کە شیعری « شکسپیر » ڕۆڵی خۆی هەبوو، لە بڵاوبوونەوە و چەسپاندنیدا.)«16،69»

هێندێ نەتەوەی دیکە، بە هۆی کەلتوور و باری ئابوورییەوە، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، ئەو زمانەیان لا دروسبووە. وەک: نەتەوەی عەرەب، پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام دەرکەوێ، سەرەتایەکی بۆ

---

* لێرەدا، د. « عیزەددین »، ووشەی « تەفاعول »ی بە واتای «تێکەڵبوون » بەکارهێناوە. بەڵام، ئەمە هەڵەیە. چونکە، « تەفاعول » بە « کارلێک یا کاڵێکردن » و « تێکەڵبوون »یش بە « خەڵتی » عەرەبیی دێ.

زمانی ستانداردی عەرەب دانابوو. دیارە فاکتەری ئابووریی، کارێکی مەزن لە بڵاوبوونەوە، چەسپاندن و سەقامگیربوونی زمانێکی دیاریکراو دەکا. هەر بۆیە، لە لایەکەوە بە هۆی ئەو هۆنراوانەی، لە « کەعبە » هەڵواسرابوون. لە لایەکی دیکەشەوە، بە هۆی بازرگانی و باری ئابوورییەوە، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، زمانی عەرەبیی بەرەو پێشەوە دەچوو، تا هەر دوو فاکتەرەکە، لە بازاڕی « عوکاز »دا یەکیانگرت و زمانێکی یەکگرتووی بە هێزی عەرەبیی، لە سەر بنچینەی دیالێکتی « قوڕەیش » دامەزرا. (باری ئابووریی مەککە و قوڕەیش و بێدەرامەتیی و ووشکوبرینگیی وایکرد، کە کوڕانی « عەبد شەمس » هەر یەکە ڕێگەیەک بگرنەبەر بۆ ڕزگاربوون لەو بارە ناقۆڵایە. بۆیە، هەر لە کۆنەوە، « ئومەیە » کەوتە بازرگانیی و « هاشم » کەوتە زەیوانی کەعبە و هەر یەکە لە ڕێبازی خۆیەوە، دەرامەتی بۆ تیرە و ناوچەکەی خۆی پەیدادەکرد. بازاڕی « عوکاز ـ عکاظ » یەکگرتنێکی ئەم دوو ڕێبازە و جۆرە تەوژمێکی پروپاگەندەی ئەو زەمانە بوو بۆ هەر دوو ڕێبازەکە. بەم چەشنە، لەگەڵ بازاڕی مەککە و بازاڕی بتپەرستیدا، بازاڕی « عوکاز »یش بە شیعر و بە « شێوەی قوڕەیش » ، کەوتە پروپاگەندە بۆ هەر دوو بازاڕ و لە پاڵ هەموو شوێنەوار و تەئسیری دوو بازاڕەکەدا، ئاوازی شیعری « جاهیلی » و هەڵواسراوە هەڵبژاردەکانی دەرگەی کەعبەی بە دیالێکتی قوڕەیش لە ناو کەعبەدا جێگیرکرد. گەر تەئسیری « عوکاز » بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم دیالێکتە لە سنووری تیرەکانی حیجازدا بووبێ، ئەوا قورئانی پیرۆز و ئایینی ئیسلام بوونە هۆی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی عەرەبیی.)«15،69»

هێندێ نەتەوەی دیکەش، بە هۆی ئایین و ئایینزاوە، ئەو زمانە یەکگرتووەیان لا پەیدادەبێ. هێندێکی دیکەش، بە هۆی ئایین و دەسەڵاتی ڕامیاریی دەوڵەتەوە، دینگە سەرەکییەکانی زمانی یەکگرتووی وێژەیی خۆیان دەچەسپێنن. وەک جووەکان، بە هۆی تەورات و دەوڵەتی ئیسرایلەوە بە ئەنجامیانگەیاند. هەروەها، دەسەڵاتێکی ناوەندیی یەکگرتووی بەهێز، بەرنامەیەکی ڕامیاریی گونجاو، بە هۆی دەوڵەتێکی سەربەخۆی نەتەوەیی یەوە دەتوانێ، بە ئاسانیی زمانی ستاندارد بچەسپێنێ، وەک لای

ڕووسەکان ئەو زمانە چەسپی. (لە سەدەی پازدەدا، مۆسکۆ بوو بە پایتەختی دەوڵەتی یەکگرتوو، نووسین و کاروباری ڕەسمیی بە هەموو وولاتدا، بە دیالێکتی ئەو ناوچەیە دەهات و دەچوو، شاعیران ڕوویانکردە پایتەخت و چیرۆکی ڕووسیی سەریدەرێنا و ئەو شێوەیە بوو بە زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو بۆ هەموو نەتەوەی ڕووس.)«16،69»

دیارە کوردیش، لەم یاسایە بەدەر نییە، زۆربەی شارەزایان و نووسەران، لەو باوەڕەدان، (زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیی، لە سەدەی نۆزدەوە، دەسیکردووە بە دروسبوون و ڕێگەی خۆی گرتۆتەبەر و لە گەشەسەندنایە)«12،69» هەر چەندە، وەک کەمێ پێشتر گوتمان: زمانی یەکگرتووی نووسین، بە شێوەیەکی سروشتیی و بەپێی ڕەوتی گۆڕانکارییە گرنگە مێژوویی یەکان، بە چەن قۆناغێکدا تێپەڕدەبێ، لەبەرئەوە، (زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو شتێ نییە، کە ئارەزووی ئەم پاشا یا ئەو زانا دروسیکات، هەر وەک شتێکیش نییە، کە چەن زانایەک بەپێی نەخشەیەک یا کەتەلۆکێکی ئامادە دروسیکەن. بەڵکوو مێژووی نەتەوە خۆی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دروسدەکات و هەر ئەو نەتەوەیەش ڕێبازی تایبەتیی خۆی هەیە، لە دروسکردنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا.)«12،69»

بەڵام لە هەمان کاتیشدا،« ڕووناکبیر، نووسەر، پسپۆڕ، لێکۆڵەر، زمانناس و زمانزان »ەکانی هەر نەتەوەیەک، دەسێکی باڵایان، لە پێشکەوتن و گەشەسەندنی زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیاندا هەیە. ئەوان دەتوانن، بە شێوەیەکی بەردەوام، بە توێژینەوە ئەکادیمییانە دەوڵەمەندیکەن، کەڵک لە هەموو دیالێکتەکانی زمانەکەیان وەرگرن، بە ووشەی پوخت و پاراو، بە زاراوەی نوێی خۆماڵیی و جیهانیی، پتر بەهێز و پاراویکەن، ڕێزمانێکی یەکگرتوو و ئاسانی بۆ دانێن، هەوڵدەن، بە هۆی هۆکانی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەوە، ئەو زمانە ستانداردەی دەیانەوێ، بە هەموو لایە پێکیبێنن و بچەسپێنن.

هەر چەندە، لە سەرانسەری کوردستاندا، تا ئێستە، لە نێو نووسەرانی کورددا، زمانێکی ستاندارد نییە. بەڵام، وەک گوتمان: لە مێژە، زمانی یەکگرتووی کوردیی پەیدابووە، ئەو زمانەش بە زمانی کوردیی دەناسرێ. لە

ڕووی گراماتیک، فۆنێتیک و بنەڕەتی فەرهەنگەوە، خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە. گرنگترین شتیش ئەوەیە، هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە زمانی نەتەوەیی خۆیانی دەزانن. هەر چەندە، زمانەکەمان لە چەن دیالێکتێکی جیاوازە پێکهاتووە، هەر دیالێکتێکیش، چەن خواردیالێکتێکی دیکەی لێ کەوتۆتەوە. بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێ، لە خۆمان بپرسین: زمانی ستاندارد چییە؟ کاتێ وەڵامی ئەو پرسیارەمان دایەوە، پاشان پێویستە، بزانین، ئەو زمانە لە کەیەوە لە نێو کورددا پەیدابووە؟ زمانی ستاندارد چۆن پەیدادەبێ؟ لە کوێ پەیدادەبێ؟ لە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەدا دەتوانین، بڵێین: زمانی ستاندارد،(بەو زمانە دەوترێ، کە لە زمانی یەکگرتووەوە بە هەموو دیالێکتەکانەوە وەرئەگیرێ، یا بناغەکەی لە یەکێ لە دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێ و زۆر جار پوختەکراوێکی زمانە یەکگرتووەکەیە یا دیالێکتێکی پەتیی، یا بڵێین، پوختەکراوێکی زمانی قسەکردنە. ئەم زمانە دەبێتە، زمانی نووسین و خوێندنەوە و ئەدەبیات و پشت بە هەموو سەرچاوەکانی بەرەوپێشچوون و دەوڵەمەندبوونی زمان، دەوڵەمەند دەبێ و بەرەوپێش دەڕوا. زمانی یەکگرتوو و دیالێکتەکانی زمان و ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوە و زمانی نەتەوە دراوسێکان و ئیستیلاحی زانستی جیهانیی، گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەوڵەمەند بوونەن.)«13،69 ـ 14»

د. «کەمال فوواد»، دەربارەی زمانی یەکگرتووی نووسین دەڵێ:(بەڵام ئاشکرایە، کورد زمانێکی یەکگرتووی نییە بۆ نووسین. هۆی ئەمەش لە پێشا ئەگەڕێتەوە بۆ دابەشبوونی کوردستان هەر لە کۆنەوە تا ئێستە، لە نێوان چەند دەوڵەتێکدا، کە تا ئێستە هیچیان دان بە مافی نەتەوەیی گەلی کوردا نانێن، کە لە پێش هەموویانەوە مافی خوێندن و نووسین و فێربوونە بە زمانی نەتەوەیی خۆی. ئەم بارە ئاڵۆزە بۆتە هۆی لێکپچڕانی کەلتووری نەتەوەی کورد و پەیدابوونی زیاتر لە زمانێک بۆ نووسینی کوردیی، کە ئەمڕۆ خۆی لە دوو شێوەی سەرەکیدا ئەبینێ، کە بە سێ جۆر ئەلفوبێ ئەنووسرێ: کوردیی ڕۆژاوایی یان کرمانجیی ژووروو کە لە تورکیا و سووریا بە تیپی لاتینیی و لە یەکێتیی سۆڤیەت بە تیپی ڕووسیی/

Cyrillic ئەنووسرێ، کوردیی ڕۆژهەڵاتی یان کرمانجیی خوارووی که له ئێران و عێراق بەکاردێ و به تیپی عەرەبی ئەنووسرێ. )«19،88 ـ 20»
مێژووی سەرهەڵدانی زمانی نووسین، بەپێی ناوچه جیاجیاکانی کوردستان، بۆ مێژووی نووسین به زمانی کوردیی دەگەڕێتەوه. دیاره، یەکەم نووسینی کوردیان بۆ بەجێمابێ و بەدەسمانگەیشتبێ، وەک دەڵێن: هۆنراوەکانی «بابا تایەری هەمەدانی »یه، که له نێوان ساڵەکانی «935 ـ 1010»زدا ژیاوه. هۆنراوەکانیشی به دیالێکتی « لووڕیی » نووسیوون. واته: ئەو مێژووه، بۆ نۆ سەده لەمەوبەر دەگەڕێتەوه. (لەبەرئەوەی مێژووی ئەدەبیاتمان، لەو کۆنتر ناو و بەرهەمی شاعیری تری تۆمار نەکردووه، بۆیه ئەبێ، ئەوه بسەلمێنین، که دیالێکتی لووڕیی یەکەم دیالێکتی کوردییه، که پەلی بۆ ئەوه هاویشتبێ، که ببێته زمانی یەککگرتووی ئەدەبیات له کوردستاندا. )
«19،69»
شتێکی ئاشکرایه، لەو سەردەمەدا، دەسەڵاتێکی کوردیی یەککگرتوو نەبووه، تا ئەو دیالێکته وەک زمانی ستاندارد، به سەر هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بسەپێنێ، چونکه(هەردوو حوکوومەتی لووڕی گەوره له ساڵی «550 ــ 827»ک «1155-1601»ز و پچووک له «570 ـ 1250»ک «1174-1834 »ز دا بوون. ) هەر چەنده، بابا تایەریش لەگەڵ هەموو، نووسەر و هۆنەرەکانی دیکەی گەلانی ئیسلامی ئەو سەردەمەدا، زۆر له یەکدی جیا ناکرێنەوه. چونکه، لەو سەردەمانەدا، دەوڵەتی ناسیۆنال له جیهاندا نەبووه. بەڵکوو، (دەوڵەتی ناسیۆنال له دوای شۆڕشی فەرەنسای «1789» دروسبوو)«155،27 » هەموو ئەو دەوڵەتانەی هەشبوون، تەنیا له ئیمپراتۆریای گەوره، دەوڵەته هەرێمیی و میرنشینه ناوچەییەکان پێکهاتبوون. بەڵام، دوای ئەوەی، هێندێ گەل و نەتەوه، میرنشین یا دەوڵەتی تایبەتیی خۆیان دامەزران، ئیدی هەوڵیانداوه، زمانه نەتەوەیی یەکەی خۆشیان، وەک زمانی ستاندارد، له سنووری ئەو قەواره نەتەوەیی یەدا بەکاربێنن. بۆ نموونه: جگه له « بابا تایەر »، چەن هۆنەرێکی ناوداری دیکەی وەک: « مەلا پەرێشان »ی لووڕ، له «901 ک ـ 1495 ز »، له دەوروبەری کرماشان ژیاوه و هۆنراوەی به لووڕیی و هەورامیی گوتووه.

« سەی یاقو 1808 ـ 1881»ز لە نزیک کرماشان ژیاوە و هۆنراوەی بە کەڵهوڕیی گوتووە.
بەڵام لەبەرئەوەی، ئەو زمانە ستانداردە، بەپێی دەسەڵاتی ڕامیاریی باو لە کوردستاندا، بە شێوەیەکی بەردەوام لە گۆڕاندابووە، هەر کاتێ میرنشینێ لە ناوچەیەک یا لە بەشێکی کوردستان ڕوخابێ، ئیدی، لەگەڵ خۆیدا زمانی نووسینەکەشی جوانەمەرگکردووە. تا جارێکی دیکە، لە شوێنێکی دیکەی کوردستان، دەسەڵاتێکی دیکەی کوردیی دامەزراوە، دیالێکتێکی دیکە، بەپێی دانیشتووانی ئەو ناوچەیەی میرنشینەکەی تێدا دامەزراوە، وەک زمانی نووسین خۆی سەپاندۆتەوە. نووسەر و هۆنەرەکانی کوردیش، وردەوردە هەوڵیانداوە، دیالێکتی ئەو ناوچەیە بەکاربێنن، بە کوردیی بنووسن، ئەو دیالێکتە وەک زمانی ستاندارد بەکاربێنن و بڵاوکەنەوە.
بۆیە، کرمانجیی ژووروو لە سەدەی پازدە ـ حەڤدەدا، لە ڕێی دەسوپەنجەی زێڕینی« عەلی هەریریی1010 ـ 1077 »ز،«فەقێ تەیران1307 ـ 1375»ز، « مەلای جزیری1407 ـ 1481»ز، « عەلی تەرمۆکی1591 ـ 1659»ز و «ئەحمەدی خانی1650 ـ 1706»ز یەوە، هەوڵیداوە، وەک زمانی نووسین لەو ناوچەیەدا، جێ بە دیالێکتەکانی دیکە لەقکا و خۆی بسەپێنێ.
گەر دیالێکتی کرمانجیی ژووروو، لە لقەدیالێکتەکانی « بۆتانیی، هەکاریی، بادینانیی، بایەزیدیی، ئاشتایی و ... » پێکهاتبێ، ئەوا لەو سەردەمەدا، نووسەر و هۆنەرەکانی کورد، بە بەشە « بۆتانیی »یەکەی نووسیویانە، هەست و سۆزی دڵ و دەروونی خۆیان دەربڕیوە، هۆنراوەکانیان پێ هۆنیوەتەوە. (بەرهەمی شاعیرانی ئەم دیالێکتە، بەشی بۆتانییەکەی کردووە بە بنکەی دەربڕین و هەوڵی ئەوەی داوە، کە سوود لە دیالێکتەکانی تری کوردیی ببینێ و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو لەو کۆمەڵە دیالێکتە و لە تەئسیری ئەدەبیات و ووشەی زمانانی دراوسێ پێکبێنێ.)«20،69»
لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ میرنشینەکانی نێوان « جزیرە و دەرسیم »، یەک لە دوای یەک تێکچوون، کرمانجیی ژووروو ئەو خەسڵەتەی لەدەسداوە. ئیدی نەیتوانیوە، وەک زمانی ستاندارد، جێگەی خۆی لە کوردستاندا بکاتەوە، ڕەگداکوتێ و پەلوپۆ بهاوێژێ. واتە: لەگەڵ هەڵە مێژوویی یەکە، بۆ

دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی یەکگرتوو، لەدەس کورد چووە، ئەم دیالێکتەش، سەروەریی خۆی وەک زمانی ستاندارد لەدەسداوە و لە پەلوپۆهاویشتن کەوتووە.
بەڵام، بەپێی ڕەوتی گۆڕانکارییە مێژوویی یەکان، بەو پێیەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە خەباتێکی سەختی نەتەوەییدا بوون، هەوڵیانداوە، لە دەس « داگیرکردن، چەوساندنەوە، زۆرداریی و دەسەڵاتی بیانیی »ڕزگاریانبێ. ئیدی جارێکی دیکە، لە ناوچەیەکی دیکەی کوردستان، میرێکی دیکە، میرنشینێکی دیکەی دامەزراندووە. لە سایەی دەسەڵاتی ئەو میرنشینەدا، دیالێکتێکی دیکە سەریدەرێناوە و خۆی سەپاندووە. بۆیە، لە سەردەمی دەوڵەتی « ئەردەلان617 ـ 1284 »ک «1867-1220»زدا، دیالێکتی « گۆران » وەک زمانی ستاندارد، جێگەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروی گرتۆتەوە. لەو سەردەمەشدا، بە تەواویی گەشەیکردووە و جێپێی خۆی کردۆتەوە. هەر چەندە، دەسەڵاتی ڕامیاریی، لە گەشەسەندنی ئەم دیالێکتەدا، وەک فاکتەرێ، کاریگەرێتییەکی زۆری هەبووە،(بەڵام تەنیا بۆ ئەم دیالێکتەی کوردیی، ڕەنگە ئایین و مەزهەب و تەریقەت، هۆیەکی بنەڕەتیی گەشەسەندنی ئەم دیالێکتە بن.)«24،69» چونکە، شارەزایانی مێژوو و زمانی کوردیی لەو باوەڕەدان، بنچینەی زمانی ئایینە کۆنەکانی کورد، لەم دیالێکتەوە زۆر نزیکبووە و لێکچوونێکی تەواو، لە نێوان گاتاکانی زەردەشت و هۆنراوەی هەورامیدا هەیە.(گۆرانیی مەزهەبی گۆرانەکان و شیعری ئایینی ئەهلی هەق بەم شێوەیە نووسراون.)«24،69» هەروەها، « پیرشالیاری هەورامیی، سەیدەی هەورامیی، بێسارانیی، مەولەویی و مەولانا خالیدی میکایلیی جاف 1777 ـ 1826»، هەر بەم لقەدیالێکتەی گۆران « هەورامیی » هۆنراوەکانی خۆیان گوتووە. دیارە، ئەو چەن کەڵەپیاو و هۆنەرە گەورانە، بە تایبەتیی «مەولەویی »، کە خۆی هەورامیش نەبووە، پتر لە ژێر کارتێکردنی شێخ سیراجەدینی تەوێڵە«1774 ـ 1867»ز و ڕێبازی نەقشبەندییدا بوون بۆیە، هەر بە هەورامیش نووسیویانە. « عەلادین سوجادیی » دەربارەی «مەولەویی » دەڵێ:(لە بەر سۆزی مەعنەویاتی شێخ وەسمانی تەوێڵە،

بووە) بە هەورامیی هۆنراوەی گوتووە. چونکە (شێخ وەسمان لە بازاڕی تەسەوفدا قبلەنمای مەولەوی بووە و زمانی شێخ وەسمان زمانی هەورامی بووە.)«274،67» بەلام، هەر لەو سەردەمانەدا و دوای ئەوەی دەولەتی ئەردەلان ڕوخاوە، ئیدی وردەوردە، نوسین بەم دیالێکتەش، بە تەواویی کزولاوازبووە و پێچراوەتەوە.

پاشان، لە سەردەمی میرنشینی باباندا « 1500؛ ـ 1851 »ز، لە ناوچەی قەلاچوالان و سولەیمانیدا، بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو، وەک زمانی ستاندارد، جێگەی خۆی کردۆتەوە، بە تایبەتیی شێوەی سولەیمانیی، کە یەکێ لەو چوار لقەدیالێکتەی کرمانجیی خواروو « سولەیمانیی، سنەیی، موکریانیی و سۆرانیی » پێکدێنێ. لەو کاتەوە تا ئەوڕۆ، وەک زمانی نووسین و خوێندنەوە، لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی ڕۆژهەلات و باشووری کوردستاندا چەسپیوە. هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، چەند هۆنەرێکی پایەبلندی ناوداری وەک: (نالیی «1797 ـ1855 »ز، سالم « 1800 ـ 1855 »ز، کوردیی « 1809 ـ 1849 »ز، مەحویی «1830 ـ 1904» ز،حەریق « 1851 ـ 1907 »ز، پیرەمێرد «1867 ـ1950 »ز، حەمدیی «1876 ـ 1936»ز) و گەلێ هۆنەری پایەبلندی دیکەش، هۆنراوەکانی خۆیان بەم لقەدیالێکتە هۆنیوەتەوە.

جگە لەوەی، زۆربەی زۆری نووسەرانی کورد، هەر چەندە، بە چەن دیالێکت و خواردیالێکتێکی جیاواز پەیڤیون، بەلام، بەرهەمەکانی خۆیان بەم شێوە زمانە تۆمارکردووە، وەک: (حاجی قادری کۆیی «1815 ـ 1892»ز، ئەختەر «1836 ـ 1886»ز، شێخ رەزای تالەبانیی «1835 ـ 1909»ز، سالمی سنە «1845 ـ 1919»ز، مەجدی «1849 ـ 1925»ز،ئەدەب «1859 ـ 1912»ز و ... تاد).

ئیدی بەو شێوەیە، لەو سەردەمەوە تا ئەوڕۆ، ئەو زمانی نووسینە، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە « گۆڕان، پێشکەوتن و گەشەکردن »دابووە. دیارە، زمانیش وەک کۆرپەیەکی ساوا وایە، هەمیشە، لە پەرەسەندن و گەشەسەندندایە، لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا، بە شێوەیە لە شێوەکان، پتر بەرەو« پێگەیشتن، کاملبوون و گەشەسەندن » دەڕوا، تا بە تەواویی

پێدەگا. بۆیە، (ئەو زمانە کوردییەی، یا وردتر ئەوە بێژین، ئەو دیالێکتە کوردییەی لە سەرەتاوە شیعری نالیی و سالم و کوردیی پێ نووسرا، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو، کە خەڵکی سولەیمانی پێی دەپەیڤن. بەڵکوو هەر وەک خەڵکی سولەیمانی خۆیان تێکەڵبوون و گەر شێوەی قسەکردنیان تەئسیری چەن دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تێیدا دیار نەبوویێ. ئەوا چەن بەشە دیالێکتێ هەر کاری تێکردووە. هەروەها، ئەم تێکەڵییە لە زمانە ئەدەبییەکەشدا هەر دیاربووە.)«32،69» جگە لەوەی، « رووداوە گەورە کۆمەڵایەتییەکان، گۆڕانکارییە گرنگە ئابوورییەکان، پێشکەوتنە لەبەرچاوە زانستییەکان، گەشەسەندنی تەکنۆلۆژیا، بڵاوبوونەوەی ئامێری نوێ و پەرەسەندنی هۆکانی ڕاگەیاندن « ڕادیۆ و تیلیڤیزیۆن » بە تایبەتیی و هۆکانی چاپەمەنیی « ڕۆژنامە و گۆڤار » بە گشتیی »، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاریان لە پێشکەوتنی ئەم دیالێکتە بە گشتیی و شێوە زمانی سولەیمانی ــ موکریی بە تایبەتیی کردووە، بە ووشە و زاراوەی جۆراوجۆری « هونەریی، وێژەیی، مێژوویی، جوگرافیایی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، ئابووریی و زانستانە »، دەوڵەمەندیانکردووە.
کەواتە دەتوانین، بڵێین: بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو، لە چاو هەر دوو دەستە خوشکە دیالێکتەکەی دیکەی « لووڕیی و گۆڕان » لە سەرەتادا، پاشتریش بە بەراوردکردن لەگەڵ بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروودا، بۆیە وەک زمانی نووسین، بە سەرکەوتوویی مایەوە و لەنێونەچوو، بەڵکوو بەرەبەرە پێشکەوت و بڵاوبۆوە و ڕۆیی، چونکە :
1. سولەیمانی کە پێتەختی بابانەکان بوو، هەر لەو ڕۆژەوە شار دروسکرا، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانەوە، خەڵکی بۆ هات، لێی نیشتەجێبوون و بە هەموو لایەکیان ئاوەدانیانکردەوە. ئەم کۆمەڵە خەڵکانە، هەر یەکەیان بە دیالێکتی یا خواردیالێکتی ناوچەکەی خۆیان دەپەیڤین. بەڵام، لە ئەنجامدا ناچاربوون، تەنیا بەو شێوە زمانە بنووسن، کە لە سەردەمی میرنشینی باباندا باوبوو.
2. ئەم لقەدیالێکتە، بە ووشە و زاراوەی دیالێکتەکانی دیکە، دەوڵەمەندتر بوو. لەبەرئەوە، ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتربوو، توانای ژیان و مانەوەی پتربوو.

3. نووسەران و هۆنەرانی ناوچە جیاجیاکانی دیکەی کوردستانیش، هەر بەم شێوە زمانە نووسیویانە.
4. کاتێ میرنشین و دەوڵەتەکانی « لوورستان، ئەردەڵان، جزیرە و بۆتان » ڕوخان، هەر دوو دیالێکتەکەی « لوور و گۆران »، هەروەها بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو، ئەو تاووتین و گوڕەی خۆیان نەما و لەدەسیاندا. بەڵام، کاتێ میرنشینی بابان، لە ساڵی «1851ز »دا، دوا هەناسەی ژیانی دەدا، لە لایەن ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە داگیرکرا، ناوچەی سولەیمانی بە تەواویی، بە ولایەتی بەغداوە بەسرایەوە. پاشان، جەنگی یەکەمی جیهان ڕوویدا، ئینگلیزەکان باشووری کوردستانیان داگیرکرد، لەو ماوە درێژەدا، واتە: لە نێوان ساڵەکانی «1851 ـ 1918 »ز، ئەو شێوە زمانە، بەڵگەی بوونی خۆی لەدەس نەدا، نووسەران هەر بەو لقەدیالێکتە دەیاننووسی، هۆنەرەکانیش هۆنراوەکانی خۆیان، هەر بەو شێوە زمانە دەهۆنییەوە.
5. کاتێ، لە باشووری کوردستان، یەکەم و دووەم دەسەڵاتی کوردیی، لە نێوان ساڵەکانی «1918 ـ 1925»ز، بە ڕێبەریی « شێخ مەحموودی بەرزنجیی » دامەزرا، زمانی کوردیی وەک زمانێکی ڕەسمیی، مامەڵەی لەگەڵدا کرا، لە بەڕێوەبەرێتییەکانی دەوڵەتدا، زمانی کوردیی بەکاردێنرا، لە خوێندنگەکاندا، خوێندکارەکان بە زمانی کوردیی دەیانخوێند، ڕۆژنامەکان بە کوردیی چاپدەکران، هەموو شتێ بە زمانی کوردیی ئازادبوو، بە تایبەتیی لەو سەردەمانەدا، چەن نامیلکە و پەرتووکێ، لە سەر « زمان، فەرهەنگ و ڕێزمانی کوردیی » نووسران و بڵاوکرانەوە.
6. ئینگلیزەکانیش، بە پێچەوانەی داگیرکەرە تورکە عوسمانیی و فارسەکانەوە، هەر چەند داگیرکەر بوون، بەڵام، دەستێکی باڵایان لە پێشخستن و بڵاوکردنەوەی زمانی کوردیدا هەبوو. چاپخانەیەکی کوردییان لە سولەیمانی دامەزراند. ڕۆژنامەیەکیان بە زمانی کوردیی دەرکرد. دانیان بە هەموو مافە کەلتوورییەکانی گەلی باشووری کوردستاندا نا. تەنانەت، یەکێکی وەک « مێجەر سۆن »، چەندین گوتاری، لە سەر زمانی کوردیی نووسی، پەرتووکێکی لە سەر ڕێزمانی کوردیش دانا. هەروەها، تا ئێستە، چەندین فەرهەنگی گچکە و گەورە، بەم شێوە زمانە، لە لایەن شارەزایانی

زمانی کوردییەوە دانراوە، کە لە جێگەیەکی دیکەی باسەکەماندا، بە درێژیی لێی دەدوێین.

7. دوای ئەوەی، ئینگلیزەکانیش باشوری کوردستانیان چۆلکرد، زمانی کوردیی هەر وەک خۆی مایەوە، لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییدا، خوێندکارانی کورد بەکوردیی دەیانخوێن.

8. کاتێ کۆدەتاکەی «14/ یولی/1958» یش ڕوویدا، زمانی کوردیی هێندەی دیکە پێشکەوت.

9. دوای ئەوەی، سالی «1970» ، ڕێککەوتننامەکەی یازدەی مارسیش، لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان و دەولەتی داگیرکەری بەعسدا مۆرکرا، زمانی کوردیی بە گشتیی و ئەم شێوە زمانەی سولەیمانی بە تایبەتیی، سەرکەوتن و پێشکەوتنێکی یەکجار گەورەی بە خۆیەوە بینی.

لە بەر هەموو ئەم هۆیانە، بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو و شێوەی سولەیمانی توانی، بەربەرەکانییەکی زۆر بکا، وەک زمانی نووسین و خوێندنەوە بمێنێتەوە، بە تەواویی خۆی ڕاگرێ، بەربەرەکانی هەموو هەولوتەقەلاکانی، دەولەتی داگیرکەری عێراق، بۆ لەنێوبردنی زمانەکەمان بکا. بە شێوەیە تا ئێستەش، تیشکی گەشی ئەو چرا بەهێزەی نووسین، بە کوردیی بە گشتیی و بەم لقەدیالێکتە بە تایبەتیی نەکوژاوەتەوە، بەلکوو، بە پێچەوانەوە، ڕۆژبەڕۆژ، هەنگاوی گەلێ گەورەی بۆ پێشەوە ناوە و بەرەوپێشیشەوە دەچێ.

لەگەل هەموو ئەم ڕاستییانەشدا، ناتوانین، بە تەواویی بلێین: ئەوڕۆ ئێمەی کورد، زمانێکی ستانداردمان هەیە. بەلکوو دەتوانین، بێژین: لەو ناوچانەی بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو، شێوە زمانی « سولەیمانی ـ موکریی » دەنووسن و دەخوێننەوە، تا ڕادەیەکی زۆر، ئەو زمانەمان هەیە. واتە: گەر سنووری جوگرافیایی زمانە ستانداردەکەی ئەم لقەدیالێکتە دیاریکەین، بەم شێویە دەبێ: لە ڕۆژهەلاتی کوردستان ـ جگە لە ناوچەکانی «لووڕستان » و دەوروبەری « ورمێ و شکاک » ، هەر لە «سنە »وە تا «خانە »بەم شێویە دەنووسن. هەر چەندە، هێندێ نووسەر و هۆنەری ئەو ناوچانەش، هەر بەم شێوە زمانە دەنووسن، بەلام هێشتا، ئەوە هەموو شتێ نییە.

له باشووری کوردستان، جگه له ناوچەی « بادینان » ، که هێندێ له نووسەران و هۆنەرەکانی ئەم ناوچەیەش، ئەم لقەدیالێکته به باشی دەزانن، پێی دەنووسن و پێی دەخوێننەوە، هەموو ناوچەکانی دیکه، بەم دیالێکته دەنووسن. جگه لەوەی، له هەموو شوێنەکاندا، کورد بەم لقەدیالێکته دەنووسێ، هەروەها پیتی عەرەبیش بەکاردێنن.
بەڵام له باکووری کوردستان و باشووری پچووک، بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو بەکاردێنن و به پیتی لاتین دەنووسن. ئەمەش خۆی له خۆیدا، جیاوازییەکی گەورەی له نێوان، هەردوو بەشەدیالێکتەکەی کرمانجیی «ژووروو و خواروو »دا دروسکردووە و کەلێنێکی گەورەی، له زمانەکەمان کردووە. بۆیە، گەر زمانی کوردیی، له هەر چوار دیالێکته سەرەکییەکەی کوردیی پێکهاتبێ، ئەوا دیسانەوە هەر ناتوانین، بڵێین: تا ئێستە، یەک زمانی یەکگرتووی نووسینی کوردیمان هەبووە و هەیە!

## 11. زمانی نووسین و خوێندنەوە لای کورد :

گەشەکردنی زمان، وەک پرۆسێسی منداڵبوون و گەورەبوون وایە. سەرەتای دروسبوون و پێگەیشتنی هەیە، بەڵام مردنی نییە. چونکە، بوونی هەر زمانێ، بە بوونی نەتەوەکەوە بەستراوە، گەر ئەو نەتەوەیە نەما، ئەوا زمانەکەش نامێنێ. منداڵی زمان، هەر لە کۆرپەییەوە تا پیردەبێ، بە چەن قۆناغێکدا تێپەڕدەبێ. لە هەر قۆناغێکیشدا، بە شێوەی جیاواز دەگۆڕێ و پێشدەکەوێ. ئەو زمانەی ئێمەی کوردیش، ئەوڕۆ پێی دەدوێین، بە چەن قۆناغێکی مێژوویی گرنگدا ڕۆیشتووە، تا بەم زمانەی ئەوڕۆ گەیشتووە. لە هەر قۆناغێکی مێژوویشدا، زمانەکەمان « شێوەیەکی جیاواز، ئەلفوبێیەکی جیا، ڕێنووسێکی تایبەتیی، ڕێزمان و داڕشتنێکی دیاریکراوی خۆی » هەبووە، کە لە سەردەمەکانی پێش خۆی جیادەکاتەوە. گومانی تێدا نییە، چ زمان و چ وێژەی کوردیی، لە سەردەمی دەسەلات و ئایینە کۆنەکانی کورددا، واتە: پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام، لە کوردستاندا بلاوبێتەوە، لەگەڵ سەردەمی ئیسلام و دوای ئیسلام جیاوازییەکی گەورەی هەیە.
گەر گەشتێکی درێژ، بە ئارشیفی مێژووی زمانی کوردیدا بکەین، بۆ سەرەداوی دەسپێکردن و درووسبوونی زمانی کوردیی بگەڕێین. بمانەوێ، ڕەگوڕیشەی زمانەکەمان، بە تەواویی ساغکەینەوە، ئەوا تووشی گەلێ چەڵەمە دەبین. چونکە، مێژووی زمانەکەمان زۆر ڕوون نییە. لەبەرئەوە، بەڵگەنامەی زۆر ڕێکوپێک و جێی باوەڕمان دەس ناکەوێ. بۆیە دەبێ، لە کاتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زمانەکەماندا، هەوڵدەین، لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستانە لا نەدەین. دەقە ڕاستەکان لە دەقە ناڕاست و دەسکردەکان جیاکەینەوە، تا مێژوویەکی ڕاست و دروستمان دەسکەوێ.
هەڵبەتە، لە ئەنجامی داگیرکردن و دابەشکردنی بەردەوامی کوردستاندا، گەلێ بەڵگەی بوونی زمانەکەمان فەوتاوە. یا لە لایەن دوژمنان و داگیرکەرانەوە شێوێندراوە. ئەوەشی ماوەتەوە، هێندە ڕوون و ئاشکرا نییە، تا بێ سەریەشە و بە ئاسانیی، پشتیان پێ ببەستین و مۆرکێکی کوردییان پێوەنێین. چونکە، لە لایەکەوە هێندێکیان بە تەواویی ئاشکرا نین. لە

لایەکی دیکەشەوە، هێندێکیان جێگەی باوەڕ نین. پێ دەچێ، دروسکرابن. هێندێکی دیکەشیان، پێویستیان بە ڕوونکردنەوەی پتر هەیە.
ئەم بارە، نەک هەر تەنیا لای کورد، وا بەو شێوەیە شێواوە، بەڵکوو، لای هەمــوو ئەو گەل و نەتەوانەی، لە مێــژوودا چەوسێنراونەتەوە، خــاوەنی قــەوارەیەکی نەتەوەیی خــۆیان نەبوون، زمــانەکــەیان تووشی ئەو پاشاگــەردانیی و مــاڵوێرانییــە بووە. بە تایبــەتیی، هێندێ لە زمــانە ڕۆژهەڵاتییــەکان، تا ئێســتە بە تەواویی، ڕەچەڵەکیــان زۆر ڕوون نییــە. هێندێ لەو گەلانە، لە سەردەمی دەسەڵاتی جیــاجیــای خۆیاندا، گەلێ بەڵگەنامەی « مێــژوویی، هونەریی، وێژەیی و زمانەوانیی » ساختــەیان دروسکردووە، بناغەی ئەو بەشە گرنگانەی، مێژووی نەتەوەکانی خۆیان پێ داڕشتــووە و بنچینەکــەیان پتــەوکــردووە. بۆ نموونە: « فــارس، عــەرەب و تورکــەکــان »، لە ســەردەمی دەســەڵاتیــاندا، ئەم کــارانەیان بە ئەنجــامگەیاندووە. بەڵام بە داخـــەوە، لەو بوارەدا کـــورد، لە هەمـــوو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات، هەژارتر و بێدەسەڵاتربووە. چونکە، لە لایەکەوە نە دەوڵەتێکی ناوەندیی یەککگرتووی هەبووە، نە دەسەڵاتێکی نەتەوەیی، لە کوردستاندا هەبووە، تا سەرانی ئەو دەوڵەتە، بیر لەو کارە بکەنەوە، هەموو هێز و توانای خۆیان گردکەنەوە و بەگەڕخەن، ئەو جۆرە کارانە جێبەجێکەن.
لە لایەکی دیکەشەوە، کوردستان لە مێژە داگیر و دابەشکراوە. کورد وەک نەتەوەیەک، هەرگیــز سەر ئەوە نەپەرژاوە، بیــر لەوە بکاتەوە، زمانەکەی خۆی ببوژێنێتــەوە، پێشــیخــا، دەسرەنگینیی خۆی لەو بوارانەدا بنوێنێ. بەڵکوو، تەنیــا مــاوەی ئەوەی هەبووە، داکــۆکــیی لە بوونی خــۆی و نیشتمانەکەی بکا، بە دڵ و بە گیان، زمانەکەی لە تواندنەوە بپارێزێ، تا لەنێو نەچێ، لە بۆتەی ئەو گەل و نەتەوە داگیرکەرانەدا، خۆی و زمانەکەی نەتوێنەوە. ئەوە جگە لەوەی، کــورد هێندە نەتەوەیەکی مــوســوڵمــان، لە خواترس و ســەرڕاسبووە، وایزانیــوە، گەر مێژوویەکی ساختــە، بۆ خۆی و زمانەکەی داڕێژێ، ئەوا نە سەردەگرێ، نە کەسیش لێی قەبوڵدەکا!
دیارە، لێــرەدا دەکــرێ، باسی هەســتی نەتەوەیی کــوردیش بکەین. بە شێــوەیەکی گشــتیی، هەستی نەتەوەیی کورد لاوازبووە و ئێستــەش، ئەو

هەستــە، هەر لاوازە. ئەو لاوازییــە لای کــورد، بە شــێــویە بووە، زمــان و مێژووی نەتەوەیی خۆی، هێندە لا گرنگ نەبووە، پتر لە ژێر کارتێکردنی، زمانی نەتەوە هاونەژاد و موسوڵمانەکانی دەوروبەریدا بووە. زمانی فارسیی و عــەرەبیی لە لایە، ئایینی ئیســلامــیش لە لایەکی دیکەوە، کــارێکی وا گەورەیان، لە هەستی نەتەوەیی و زمانی کوردیی کردووە، تەنانەت، هێندێ لە کــورد، مــێژووەکــەی خۆیان، بە مــێژووی چاخی « بەرد، بتــپــەرســتــیی، گومڕایی و گاوریی »داناوە، هەم ڕۆڵەی گەلە موسوڵمانەکان و هەم هێندێ لە مەلا و پیاوە ئایینییەکانی کورد، وایان لە کورد گەیاندووە، تەنیا زمانی ئایین و گەلی برا، لە زمانی کوردیی باشتر و پێشکەوتووترە. بۆیە، کورد لە هەموو چاخەکانی مێژوودا، لە ڕووی « مێژوو، زمان و هەستی نەتەوەیی » یەوە لاوازبووە.

هەڵبەتە، هەر لە کۆنەوە، هەمیشە هێندێ گرفتی سەرەکیی هەبووە، ڕێی بە «گەشەکردن، پێشکەوتنی مێژوو و زمانی نەتەوەکان »ی ناوچەکە گرتووە، بۆیە، بەو شێوەیەیان لێ بەسەرهاتووە. گرنگترین ئەو هۆیانەش ئەمانەن: «بندەسیی، دواکــەوتوویی، نەزانین، نەخوێندەواریی، ئەلفوبێی تایبــەتیی، خوێندن و نووسین » نەبووە. بەڵگەی مێژوویی نییە، بەڵکوو، ئەوەی هەیە، زۆربەی وەک:« چیــرۆک، داســتــان، ئەفــســانە و فــۆلکلۆر » دەمــبــەدەم و پشتبەشت، پێمانگەیشتووە. هۆکانی ڕاگەیاندن و تۆمارکردن نەبوون، تا لە فەوتاندن بیانپارێزێ. ئەوانەی، بە گێڕانەوەش بە دەسمانگەیشتوون، یا بە تەواویی پێمان نەگەیشتوون، یا لێیان زیاد و کەمکراوە. هێندێکیان، هەر لە بیرچوونەتەوە، هێندێکیــان دیکەشیــان دەسکاریکراون و شێــوێندراون. هێندێ لەو بابەتانەش، ناونیــشانێکی ڕوونیــان نیــیــە، خاوەنەکانیــان دیار نین، یا بە ناوی خوازراوەوە تۆمارکراون.

ئێــمــە، گــەر زۆر دوور نەڕۆین، بۆ ســەردەمــە تاریکەکــانی مــێژووی پێش زاینێکی دوور نەگــەڕێینەوە، ئەوا تــەنیــا باسی ســەردەمی ســاســانیی و ئیسلام بکەین، واتە: لەو گــۆڕانکارییــەی لە دەســەڵاتی ڕامیــاریی، نێــوان فارسەکان و عەرەبەکان « ساسانیی و ئیسلام »دا ڕوویدا، بکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێ، بۆچی لەو سەردەمانەدا کورد، بە زمانی خۆی نەینووسیوە؟

1. ساسانیی و کورد، یەک ئایینیان هەبووە. واتە: زمانی ئایینیان یەکبووە.
2. هەر دوو زمانی نەتەوەیی فارس و کورد، زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون. لەبەرئەوە، کورد لەو سەردەمانەدا، هەر بەو زمانە نووسیویتی، کە ساسانییەکان بەکاریانهێناوە.
3. کاتێ، ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە، یەکەم کارێ کردی، ئایینە کۆنەکانی ساسانیی و کوردی لەنێوبرد.
4. ئایینی نوێ، بە زمانی عەرەبیی بوو. لە ڕێگەی ئایینەکەوە، زمانی عەرەبیی کارێکی زۆری، لە هەر دوو زمانی فارسیی و کوردیی کرد. بە تایبەتیی، خوێندەوارانی کورد، پشتیان لە زمانەکەی خۆیان کرد، بە هەموو شێوەیە هەوڵیاندەدا، زمانی ئایینی نوێ فێربن، ڕاژەیکەن، هەر بەو زمانە نوێیەش دەیاننووسی. سەرەڕای ئەو هەموو ڕاژەکردنەش، هێشتا، عەرەبە موسوڵمانەکانی سەردەمی دەسەڵاتی « ئەمەویی و عەباسیی »، فارسە موسوڵمانەکانی سەردەمە جیاوازەکانی ئیمپراتۆریای «سەفەویی، قاجاریی و پەهلەویی »، هەروەها، تورکە موسوڵمانەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریای عوسمانیی، ڕێگەی ئەوەیان بە کورد نەدەدا، زمانەکەی خۆی بە ئازادیی بەکاربێنێ، بە هەموو شێوەیە دژایەتییاندەکرد، هەوڵی لەنێوبردنیان دەدا.
هەر چەندە، « عەلادین سوجادیی » دەڵێ:(ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەنەبێ، دژی ئەم جۆرە شتانە بێ. بەڵکوو گەورەترین بەڵگە بۆ بەرزیی ئەم ئایینە و بۆ هاندانی ئەم ئایینە بۆ خوێندەواریی و بۆ زانین، یەکەم ئایەتی «قورئان »ە، ئەفەرموێ: « اقرا باسم ربک الذی خلق، خلق الانسان من علق، اقرا و ربک الاکرم، الذی علم بالقلم، علم الانسان ما لم یعلم » )
«146،68»
ڕاستە، ئایینی ئیسلام هانی خوێندن و خوێندەواریی داوە و هانیشیدەدا. بەڵام، ئایا بە چ زمانێ هانیداوە؟ مەبەسی لە چ خوێندەوارییەک بووە؟ چونکە، ئایەتەکە بە زمانی عەرەبیی بووە، پەیامبەرەکەش هەر عەرەب بووە! من پێموایە، لەوێدا، تەنیا مەبەس لە زمانی ئایینەکە بووە، کە عەرەبیی بووە، نەک مەبەس لە زمانە نەتەوەیی یەکانی دیکە بووبێ!

بەڵکوو دەبووایە، هەموو گەل و نەتەوەکان، کاتێ موسوڵمان دەبن، فێری زمانی ئایینەکەش بن. چونکە، ئەرک و فەرمانەکانی ئیسلام، ئایەت و گوتەکانی پەیامبەر، هەموویان هەر بە زمانی عەرەبیی بوون. لەو ڕۆژانەدا، هێشتا بە هیچ شێوەیە، بۆ سەر هیچ زمانێ وەر نەگێررابوون. لەبەرئەوە، ئەو بۆچوونەی مامۆستا ڕاست نییە، زمانی ئایین لە ئیسلامدا، بە زمانی عەرەبیی دادەنرێ. بۆیە، هەر لە کۆنەوە، ئەو گەل و نەتەوانەی، خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیان نەبوون، لە بندەسی گەلێکی دیکەی ئیسلامدا بوون، ڕێگەی ئەوەیان نەداون، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان بۆ خوێندن و نووسین بەکاربێنن.

5. کوردستان، هەر لە مێژوویەکی دێرینەوە داگیر و دابەشکراوە. ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە نێو ئەو گەل و نەتەوانەدا، بە پەرەوازەیی و پەرشوبڵاویی ماونەتەوە. زمانی ئایین و زمانی نەتەوە سەردەسەکانی، بە سەردا سەپێندراوە. ڕێگەی زمانی کوردییان نەداوە، سەردەرێنێ، گەشەبکا، تا کورد لە سەردەمە جیاوازە کانی مێژووی ژیانی خۆیدا، بە ئازادیی پێی بنووسێ و بەکاریبێنێ.

6. فارسەکان، جگە لەوەی لەگەڵ کورددا، یەک ئایینی هاوبەش کۆیکردوونەتەوە، چ لە کۆن و چ ئێستەش، لە ڕووی زمانەوە، بۆرە خزمایەتییەکیان هەیە. بۆیە، هەمیشە فارسەکان زمانی کوردییان، بە بەشێ لە زمانی فارسیی داناوە. بەو دوو فاکتەرە، هەستی نەتەوەیی کوردیان سڕکردووە، بەوە کوردیان لە خشتەبردووە، گوایا، کورد و فارس بران، یەک ئایین و یەک دەوڵەت کۆیاندەکاتەوە، پێویست ناکا، بە کوردیی بنووسن و بخوێنن!

7. تورکە عوسمانییە موسوڵمانەکانیش، بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە، زمانی تورکییان، بە سەر هەموو گەل و نەتەوەکانی بندەسیاندا سەپاندبوو. یەکێ لەو گەلانەش، کورد بووە. گویا، زمانی تورکیی، زمانی دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلام و خەلیفەی موسوڵمانانە. بۆیە دەبێ، هەر تەنیا بەو زمانە بنووسن و بخوێننەوە. تەنانەت نامەنووسینیش هەر بە تورکیی بووە!

8. کوردستان، وولاتێکی گەلێ پانوبەرینە. ڕووبەری خاکەکەی زۆر

گەورەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەسەڵاتێکی یەککگرتووی ڕامیاریی نەتەوەیی کوردیی، لە کوردستاندا دانەمەزراوە، تا زمانی کوردیی، لە هەموو ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بچەسپێنێ و وەک زمانی خوێندن و نووسین بەکاربێنرێ.

9. کورد خۆی، وەک نەتەوەیەک لە مێژوودا هیچ نەبووە. هەر لە کۆنەوە، هەستی نەتەوەیی لاوازبووە. لە پێناوی گەلەکانی دەوروبەریدا، قوربانی بە هەموو شتێکی بە نرخی خۆی داوە. ئایین، بە شێوەیە کاری لێکردووە،(بیر و فیکری وا گوشرابوو، ئەگەر یەکێ کتێبێ، وە یا پەخشانێ، وە یا نامەیەکی بە کوردیی بنووسیایە، بێجگە لەوە کە خۆی ئەوەی بە دڵا نەدەهات، ئەبوو بە جاڕی تیتاڵیی لە ناو مەرمیشا.)«147،68»

لە بەر هەموو ئەو هۆیانەی باسمانکردن، جگە لەوەی، هێندێ هۆنراوە، بە کوردیی هۆنراونەتەوە و بە کوردیی تۆمارکراون، دەقی کوردیی نووسراو، لە مێژوودا زۆر کەمە. زۆربەی زۆری ئەوانەی هەشن، بە یەکێ لە زمانەکانی «فارسیی، عەرەبیی و تورکیی» نووسراون. جا خوێندەواریی و نووسین، گەر بە زمانی دایک نەبوو، گەلێ گرفتی نەتەوەیی لەگەڵ خۆیدا دروسدەکا.

هەر شتێکیش. بە زمانی نەتەوەیی نەبوو، هەر چەندە، هێندێ جار، جۆرە زانیاریی و ئاگادارییەک لای خوێنەر دروسدەکا، بەڵام، لە بواری زمان و وێژەدا، جۆرە نامۆیی و نارەسەنییەک پەیدادەکا. جا، گەر هەر نەتەوەیەک، زمانی نەتەوەیی خۆی لێ قەدەغەکرێ، داگیرکەران نەیەڵن، بە ئازادیی ئاخافتنی پێ بکا، پێی بخوێنێ، ئەوەی دەیەوێ، بە زمانە نەتەوە یی یەکەی خۆی دەربڕێ، ئەوا ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەیە، تووشی نەخۆشی خۆبەکەمزانین دەبن، دوچاری هێندێ گرێی سایکۆلۆژیی دەبن، وەک مرۆڤێکی لاڵیان لێدێ، کە بە تەواویی ناتوانن، قسەبکەن!

بۆ ئەوەی لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، لە شێوەی «نووسین، ڕێنووس، ڕێزمان و پاکیی زمان» یکی تایبەتیی بکەین، پێویستە، بە وردیی سەرنج، لە بەشە جیاوازەکانی وێژەی نەتەوەیی، ئەو نەتەوەیە بدەین، ئەویش لە «هۆنراوە، پەخشان، چیرۆک، پەندیپێشینان، قسەینەستەق، مەتەڵ، گوتار، نامە و بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەریی» پێکهاتووە.

لە کۆندا، خوێندەواریی لە ناو کورددا بڵاو نەبووە. گەر بڵاویشبووبێ، ئەوا لە لایەکەوە، زۆر کەمبووە و لە سنوورێکی تەسکدابووە. بۆیە، هۆنەرێکی نەتەوەیی گەورەی، وەک « حاجی قادری کۆیی » فەرموویەتی :

**هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت**
**بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت**

**یا دەڵێ :**

**میللەتی بێ کتێب و بێ نووسین**
**غەیری کوردان نیە لە ڕووی زەمین** «265-264،45»

لە لایەکی دیکەشەوە، خوێندەواران بەرهەمە وێژەیی یەکانی خۆیان، بە زمانی کوردیی نەنووسیوە. بەڵکوو، بە یەکێ لە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » تۆمارکردووە. هەرچەندە، نەتەوەی کورد سامانێکی وێژەیی گەلێ دەوڵەمەندی هەیە، بەڵام، وا دەردەکەوێ، سامانەکە کەمبێ، چونکە :

1. زۆربەیان تۆمار نەکراون و بیرچوونەتەوە، پاشان فەوتاون.
2. بە کوردیی تۆمار نەکراون، بەڵکوو، بەو زمانانەی نووسراون، بە موڵکی ئەو نەتەوانە دادەنرێن. با لێرەدا، نموونەیەکی زیندوو بێنینەوە :

پێویست ناکا، زۆر بە ناخ و قووڵایی مێژوویییەکی دوور و دێریندا شۆڕبینەوە. بەڵکوو، ئەورۆ بە ئاشکرا دەبینین، نووسەرێکی گەورەی وەک «یەشار کەمال »، بە ڕەگەز کوردە و خۆشی دانی پێدادەنێ. بە یەکێ لە نووسەرە پایەبڵندەکانی جیهان دەژمێررێ. بەڵام، لەبەرئەوەی، هەموو بەرهەمەکانی، بە زمانی تورکیی نووسیوە، لە خانەی وێژەی تورکیدا دادەنرێ. جا ئیدی دەبێ، بزانین، زمان چ ڕۆڵێکی گەورە و گران، لە دەوڵەمەندکردنی کەلەپووری نەتەوەییدا دەگێرێ، چ جۆرە کارێکی گرنگ، بە نا و ناوبانگی نەتەوە دەکا!

لە ڕاستیدا، تا ئێستە، زۆر ڕوون نییە، ئەوەتەی کورد وەک نەتەوەیەک، لە ناوچەکەدا پەیدابووە و دروسبووە، هەر لە سەرەتاوە، چ جۆرە ئەلفوبێیەکی بەکارهێناوە؟ بە چ زمانێ نووسیوێتی؟ کەی خوێندن و نووسین، لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە؟ بەڵام، ئەوەی هێندێ لە شارەزایانی زمان و

مێژوونووسان باسیدەکەن، ئەوەیە، هەر لە کۆنەوە، لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا، لە نێو کورددا بە تایبەتیی لە ناو مادەکاندا، خوێندن و نووسین هەبووە، گەر کورد بە نەوەی مادەکان دانێین. چونکە، لەو سەردەمانەدا، ئایینی زەردەشت لە ئارادابووە و پەرتووکە پیرۆزەکەی ئاڤێستاش، هەر بە زمانی ئەو سەردەمەی مادەکان نووسراوەتەوە.

دەربارەی نووسین، مامۆستا « مەردۆخی » دەفەرموێ:(کوردەکان خاوەنی نووسینێکی تایبەتیی خۆیان نەبوون، لەگەڵ پەیدابوونی خەتی بزماریی، کورد و پارس هەڵسوکەوت و نووسینیان بە خەتی بزماریی بووە.« نلدکە » ئەڵێ: « ئەگەر کتێب و نووسراو لە پاش کوردەکان بەجێبمایە، وا چاوەڕوانئەکرا، لەگەڵ نووسینی پاشاکانی هەخامەنشینی، جیاوازیی نەبووایە. سەدەی دەیەمی پێش زایین، پیاوێ بە ناوی « ماسی سوراتی » پەیدابوو. بەپێی پیتە ئەبجەدییەکان، چەن پیتێکی دۆزییەوە و لە سەری نووسین و هەڵسوکەوتکراوە، کە بە پیتی « ماسی سوراتی » بە ناوبانگە و لەو پیتانە ئەچێ، کە لە سەدەی شەشەمی زاینی دۆزراوەتەوە، کە « پێتی ئاوێستا »ی پێ ئەڵێن ..... تا نزیکی سەردەمی هاتنی ئایینی ئیسلام، پیتی ماسی سوراتی، لە ناو کوردا بەکارهاتووە و لەگەڵ ئەوەشدا، خەتی «ئارامیی، سریانیی و یۆنانیی »یان بەکارهێناوە.)«81،106» ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخا، کە پێش زایین، نووسین لە ناو کورددا هەبووە.

هەروەها، « عەبدوڵلا قەرەداغی » لەو بارەیەوە دەڵێ:(سەرزەمینی ماد، لە سەدەکانی حەوتەم و شەشەمی پ.ز.دا، سەرچاوەیەک بووە، کە هوشیاریی ئایینیی و فەلسەفەی لێوە بڵاوەکردووە و بۆتە بنکەی پێشکەوتنی فەرهەنگیی و ئایینیی. لە هەزارەی یەکەمی پ.ز.دا، خەت و نووسین لە سەرزەمینی مادا هەبووە.ماننایییەکان خۆیان خەت و نووسینیان هەبووە. لەوانەیە، لە ئۆرارتوییەکانیان وەرگرتبێ. گومانی بۆ دەچێ، کە جۆرێ بووە، لە نووسینە بزمارییەکان. لە سەدەی حەوتەمی پ.ز.دا، مادەکان خەت و نووسینیان هەبووە. هەمان خەت و نووسینە، کە ئەمرۆ بە خەتی کۆنی پارسی یان « خەتی هەخامەنشی - ڕیزی یەکەم »ی دادەنێن. لە ڕاستیدا، ئەمە ڕەگەزی مادییە. خەتی بزماریی « پارسیی کۆن »، لە

سەردەمی کۆرشی دووەم و ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پ.ز.، زۆر باوبووە.)«40،65 ـ 41» هەروا، لە شوێنێکی دیکەشدا دەڵێ: (خەتی مێخی « پارسی کۆن » لە سەردەمی کۆرشی دووەم و ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پ.ز.دا زۆر باوبووە. ئەم وتەیە کەمتر ڕێی تێدەچێ، کە ئیمپراتۆریی گەورەی ماد، ڕێنووس یان نووسینی تایبەتیی خۆیان نەبووبێ و پارسەکان خەتیان بووبێ.)«89،65 ـ 92».

ئەم بۆچوونە، دوو لایەنی هەیە. یەکەم: نووسەر پێمان نالێ، ئەم زانیاریانەی لە کوێوە هێناوە؟ چونکە، دەسی بۆ هیچ سەرچاوەیەک ڕانەکێشاوە! دووەم: هەر دوو بۆچوونەکە، جەخت لە سەر ئەوە دەکەن، هێڵ و نووسین لە سەردەمی مادەکاندا هەبووە. چونکە، گەر ئەو هێڵە، لە سەردەمی مادەکاندا نەبووبێ، ئەدی لە سەردەمی دوای ئەواندا، کەی پەیدا بووە؟ لە کوێوە هاتووە؟

بەڵام، دوای زایین جۆرێکی دیکە بووە. بە تایبەتیی، کاتێ ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە، گۆڕانکارییەکی گەلێ گرنگ، بە سەر هێڵ و نووسینی کوردیدا هاتووە. ئەو گۆڕانکارییە بە شێوەیە بووە، زمانی کوردیی، لە گێژاوێکی گەورەدا ڕاگرتووە. وەک مامۆستا « مەردۆخی » دەڵێ: (پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و پەیدابوونی دەسەڵاتیان لە کوردستاندا، پیتە « کوردیی و بزماریی و ئارامیی و یۆنانییەکان »، بە تەواویی لە بیرچوونەتەوە و بەکار نەهێنراون. لە بریتیان خەتی ـ کوفیی ـ بەکارهێنراوە..... پاش پەیدابوونی خەتی « تەعلیق » کورد و فارس، هەر دووکیان بەم خەتە نووسیویانە و لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە لە نووسینیشدا شانبەشان بوون)«82،106».

هەروەها، ئەم پیتانەش، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گۆڕاندابوون. چونکە، عەرەبەکان بە پیتی جیاواز دەیاننووسی، یەک جۆرە پیتی یەککگرتوویان نەبوو، تا ئەو پیتەی قورئانی پێ نووسرایەوە، وەک پیتی یەککگرتووی لێهات. (عەرەبی یەمەن لە کۆنەوە بە نووسینی « مەسنەد » وە عەرەبی شام بە نووسینی فینیقیی وە عەرەبی حیجاز بە نووسینی سریانییان نووسیوە. کە ئایینی ئیسلام پەیدابوو، قورئانی پیرۆز بە نووسینی کوفیی نوسرایەوە.

ئەو نووسینەش زۆر دەسکاریی تێدا کراوە، بۆ ڕێک و جوانی تاکوو گەیشتۆتە پلەی ئیمڕۆ. هەروەهاش سەر و بۆر و ژێر و شەددە و هەمزە و خاڵەکان بۆ پیتەکان دانرا لە لایەن مامۆستای یەکەم « ئەبو ئەسوەد ئەلدەولی » و « نەسیر بن عاسم » و « یەحیا بن یەعمەر » و « خەلیل بن ئەحمەد ». پاش ماوەیەک نووسینی « نەسخ » و « سابت » و « رقعە » و « دیوان » و « عەرەبیی » و فارسیی پەیدابوو، کە ئەو نووسینانە لەو پەڕی جوانییەوەیە.)«8،63» دیارە، لە هەر سەردەمێکدا، ئەو پیتانەی، بۆ نووسینی زمانی کوردیی بەکارهێنراون، پێبەپێی ئەم گۆڕانکارییانەی، بە سەر پیتە عەرەبییەکاندا هاتوون، ئەوانیش گۆڕاون.

دەربارەی ژیاندنەوەی زمانە ئێرانییەکانی ژووررووی ڕۆژاوا،« زوبێرب.ا. » دەڵێ: (مێژووی ئەم ژیاندنەوەیە، سەبارەت بە زمانی کوردیی، بۆ سەدەی دەیەمی زایین « یا دواتر » دەگەڕێتەوە. شاعیرە ناودارەکانی کوردیش، وەک:« بابا تایەری هەمدانیی، عەلی حەریریی، شێخ ئەحمەدی جزیریی »، دەسی بالایان لەم کارەدا هەبووە. هەر دوو کۆمەڵەکەش « ئێرانییەکانی ژووررووە، خواروو » لە جیاتی پەهلەوی کۆن، ئەلفوبێی عەرەبییان بۆ نووسین بەکارهێناوە. بەم جۆرە مێژووی زمانی کوردیی، بەبێ پچڕان لە هەر سێ قۆناغەکەدا، بوو بە مێژوویەکی ئاشکرا و دیار، کە بە زمانی ئاڤێستا، لە سەدەی حەوتەمی پ.ز.دا دەسپێکرد و لە پەهلەویی ئەشکانیدا، قۆناغی دووەمی کۆتایی پێ هات و سەرلەنوێ لە قۆناغی سێیەمدا، بە زمانی ئێستەی کوردیی سەریهەڵدایەوە و ژیایەوە.)«85،58»

بەڵام، « ڤیلچێڤسکی »لە « نەژادی کورد »دا، لە دوو جێگەی جیاوازدا، باسی نووسینی کوردیی کردووە و دەڵێ: (کۆنترین ئاسەواری ئەدەبیاتی کوردیی « شینی وێرانکردنی کوردستان لە لایەن عەرەبەکان »ەوەیە و بەشێکی بە ڕێنووسی ئارامیی لە سەر پێستی ئاژەڵ نووسراوەتەوە و لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا لە سولەیمانی دۆزراوەتەوە. ئەم پارچە بەرهەمە، کە بایەخی مێژوویی و ئەدەبیی یەکجار زۆرە، باسی ئەوە دەکات، چۆن عەرەبە موسوڵمانەکان پەرستگەی ئاگریان لە هەموو کوردستان و هەروەها شارەزووردا، واتە: لە ناوچەی کارکادا، ڕووخاندووە.)«76، 245-246»

لە جێگەی دووەمیشدا دەڵێ :
(کۆنترین زانیاریی ئێمە، دەربارەی زمانی کوردیی، لە ڕووی گەشەسەندنی مێژوویی یەوە، لە « شینی هێرشی عەرەبەکان » کە ڕەشید یاسمی پارچەیەکی لێ بڵاوکردۆتەوە، تێپەڕ ناکات. هەر چەندە، ئەم پارچە شیعرە کەمبێ، بەڵام، ڕێگەمان دەدا، بڵێین: زمانی کوردیی، لە چەرخی ساسانیییەوە، زۆربەی ئەو سیما تایبەتییانەی خۆی، کە لە ماوەیەکی درەنگتردا پێیەوە دیاربوون، هەبوون و لە زمانانی ئێرانی تریان جیادەکردەوە. کەواتە، لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی زایینەوە، ئێمە دەتوانین، وەکوو میللەتێکی خاوەن زمانی سەربەخۆ، باسی کوردان بکەین.)«295،76 - 296» لێرەدا، بە پێویستی دەزانین، بەشێ لەو هۆنراوەیەی باسی کارەساتەکە دەکا، وەک خۆی ڕایگوێزین :

هرمزگان رمان آتران کژان
ویشان شاردەوە کورە گوران
زۆر کار إرب کردنە خاپور
گنای پالە هتا شارەزور
شنو و کنیکا و دیل بە شینا
میری و آزا تلی دروی هوینا
روشت زردشترە مانوە بیکس
بزیکا نیکا هورمز و هیوچکس «447،76»

هەروەها، « مەردۆخی، ڕەشید یاسمی » و چەن کەسێکی دیکەش، باسی ئەم « شینە »یان کردووە. هەر ئەم هۆنراوەیە، مامۆستا « مەردۆخی » بە شێوە و ڕێنووسێکی دیکە نووسیوێتی :

هۆرمزگان ڕەمان ئاتران کوژان
وێشان شاردەوە گۆرە گۆرەکان
زۆر کار ئارەب کردتە خاپوور
گەناو پالە هتا شارەزوور
شنۆ و کینکان وەدیل بشینیا
مێرد و ئازاتای ژە ڕووی هۆینیا

ڕەوشت زەردشت مانەوە بێکس
بەزیبکا نیکا هورمز و هویچکس «93،106»

بەلام، بە باوەڕی هێندێ نووسەر و ڕووناکبیری کورد، کۆنترین هۆنراوەیەک لە مێژووی کورددا دیاربێ، هۆنراوەکانی « بابا تایەری هەمەدانی »ن. (کۆنترین بەلگەی نووسراوی کوردیی، لە دەوری تازەدا، چوارینەکانی« بابا تایەری عوریان »لە سەرەتای چەرخی یازدەیەمی عیسایی لە« هەمەدان »ی ئێستە ـ هەگمتەنای پاتەختی مادەکان ـ بە لەهجەی جنووبیی دایناوون.) «36،70» دەربارەی مێژووی ژیانی « بابا تایەر »، « زوبێر ب. » دەڵێ: (بابا تایەر لە ساڵی « 935 ز »دا لە دایکبووە. لە «1010ی ز »دا کۆچیدواییکردووە.)«86،58» پاشان هێندێ هۆنەری دیکەی وەک: (عەلی حەریریی لە سەدەی یازدە و فەقێ تەیران «1307 ـ 1375 »ز. و مەلای جەزیریی « 1407 ـ 1481 »ز. و ئەحمەدی خانیی « 1650 ـ 1706 »ز. دێ)«106،49ـ50» بەلام، زمانی نووسینی کوردیی، کەمێ درەنگتر بەکارهێنراوە. لەو بارەیەوە پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ » دەڵێ: (نووسینی کوردیی کۆن، کە بە دەسی ئێمە گەیشتووە، بۆ هەر دوو چەرخی دە و یازدەی زایینی دەگەڕێتەوە. تۆری کلاسیکی کوردیی، لە سەدەکانی کۆن و ناوەڕاستی زاییندا، بە زاراوەی باکووریی بوو. لەو سەدانەدا پەرتووکی «تیۆریی، مێژوویی، فەلسەفیی و ئایینیی »دەنووسران.
فەقێ تەیران « 1302 ـ 1375 »ز، مەلای جزیریی « 1407 ـ 1481»ز، ئەحمەدی خانی « 1650 ـ 1706»ز، سمایلی بایەزید «1642 ـ 1709»ز، پەرتۆ بەگی هەکاریی « لە ساڵی 1808ز دا مردووە »، مەلای بایەزیدیی «لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم » و ئەو ناوەدا، بە زاراوەی کرمانجیی ژووروو نووسینەکانی خۆیان نووسیوە.)«36،81»
هەروەها، « مەسعوود محەمەد » دەڵێ: (بەپێی سەرچاوەکان « ئیبن وحشیە » پێش نزیکەی هەزار ساڵ، پەرتووکێکی لە سەر دۆزینەوەی ئاو، بە زمانی کوردیی نووسیوە. ئەمەش کۆنترین نووسینێکە، لە کوردیدا بەر گوێمان کەوتبێ. پاشان هیچ نووسینێکی دیکەمان گوێ لێ نابێ، تا ساڵی هەزاری کۆچی، « 1592ز ـ نووسەر » عەلی تەرماخیی، پەرتووکێ

لە سـەر ڕێزمـانی عـەرەبیی، بە زمـانی کـوردیی دادەنێ. هەروەها، لە نووسـیندا، زیائەدین مەولانا خالیدی شارەزووریی، کـە لە نێـوان سـاڵی «1193 ـ 1242 ک/ 1779 ـ 1826ز »دا ژیاوە، پەرتووکی «عەقیدەنامەی کوردیی » داناوە...)«50،108».

« زوبێـحی » دەڵێ: (ووتمان: چوارینەکـانی « بابا » کـۆنتـرین بەڵگەی نووسـراوی کـوردییـە کـە بە دەسـتـەوە مـاوە، بەڵام بۆ ئەوەی ئاسـاری لەناوچوون، ووتەیەکی دوکـتـۆر عـەبد ئەلحـەلیم منتـەسر دەخـەینە بەرچاو. دوکـتـۆر لە ژمـارە 220ی مـانگی تەمـووزی سـاڵی 1975ی گـۆڤـاری «ئەلعەرەبیی »چاپی کوێتدا ووتارێکی بە ناوی « ئیبن وەحشیە و کتابە فی ئەلفلاحە و هو ئەقدەم ئەلکتب فی ئەلعرەبیە » نووسیوە دەڵێ :

« ... زۆربەی پەرتووکەکانی لە زمانی نەبەتییەوە وەرگێڕاوە، جگە « شەوق ئەلمستەهام فی مەعرفەت رموز ئەلاقلام » ، هیـچی دیکەی لە بەرهەمەکانی خۆی بە عـەرەبیی بڵاو نەکـردۆتەوە. لەم دوا پەرتووکـەیدا گـوتوویەتی: کـە پەرتووکێکی بە زمانی کوردیی لە سەر دۆزینەوەی ئاو و چۆنێتی دەرهێنانی لە زەوییە نەناسراوەکاندا نووسیوە. »

« گـیـوی مـوکـریانی »یش لە فـەرهەنگی مـەهاباددا « ل771 و 772 » ئەم باسـەی درێژتر بەیانـکردووە و بەپێی نووسـینی ئەوان « ئیبن وحـشـیـە » کـتێبی « شەوق ئەلمسـتـەهام ... »ی لە 241ی کۆچیدا نـووسیوە، « 855 ـ نوسەر » دیارە، کە لە دوایی ئەم پەرتووکەیدا باسی وەرگێڕانی پەرتووکێکی کوردیی دەکا، ئەم کارەی دەکەوێتە پێش نووسینی « شەوق ئەلمستەهام » و پەرتووکی لە ساڵانی سەرەتای چەرخی سێیەمدا بە دەست خەڵکەوە بووبێ، هیچ نەبێ، دەبێ، چەن ساڵێ بە سەر دانانیدا تێپەڕیبێ، بۆیە ئەم پەرتووکە کوردییەی « با ناوی لێ بنێین ئاونامە » کە « ئیبن وحشیە »کردوویە بە عـەرەبیی بە لانی کـەمـەوە دەبێ لە سـاڵانی دوایی چەرخی دووەمـدا نووسرابێ.)«38،70».

« کەمـال فـوواد » ، دەربـارەی زمـانی نووسـینی کـوردیی و پەرتووکـەکەی ئیبن وەحـشـیـە دەڵێ: (زمـانی نووسـینی کـوردیی، لە سـەردەمێـکی درەنگدا نەبێ، بەکـار نەهێنراوە. کۆنترین دەقی کـوردیش، بۆ سەدەی شازدە و حەڤدە

دەگـەڕێتـەوە ... هەر قـسـەیەکـیش پێش ئەو مـێـژووە، دەربارەی دەقی نووسراوی کـوردیی بکرێ، بێ بەڵگەیە. ئەو « ئەلفوبێ کوردییـەی » ئیبن وەحشیە ئەلنەبەتی «چەرخی نۆیەم » لە پەرتووکەکەیدا « شەوق ئەلمستەهام فی مـعـرفـەت رمـوز ئەلاقـلام » باسـیـکردووە، ئەلفوبێـیـەکی دروسکراوە، مێژوو هیچ شتێ دەربارەی نازانێ ...)«6,98»، کەچی، هەر دوکتۆر خۆی، کەمێ دواتر، ناکۆکیی لەگەڵ قسەکانی پێشووی خۆیدا پەیدادەکا و دەڵێ: (زمانی نووسینی کوردیی، یەکەم جار، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بەکارهێنراوە.)«13,98» پاشان، چەند نموونەیەک لە سەر (مەلا مەحموودی بایەزیدیی1797 ـ 1858 /عـادات و ڕسـومـاتنامـەی ئەکـرادیە، شـێخ حـوسـێنی قـازی 1794 ـ 1871 /مـەولودنامـە و هەروەها، ڕۆژنامـەی کوردستان لە دەرەوەی وولات 1898 ـ 1902) دێنێتەوە.

هەروەها، دەربارەی زمـانی نووسـینی کـوردیی، د. « جـەمـال نەبەز »یش دەڵێ:(هەر چەندە، بە داخـەوە نازانرێ، لە کـەیەوە بە کـوردیی دەنووسرێ. بەڵام، ئاشکرایە، پاش ئەوەی ئاییـنی ئیسـلام لە کـوردسـتـاندا بنجی خۆی داکوتا، کوردەکانیش وەک فارسەکـان، دەسیانکرد بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبیی بۆ نووسینی زمانەکەیان. هەر چەندە، ئەو بەڵگانەی تا ئێسـتە بە دەسەوەن، واتە:ئەو تێکستانەی بۆمان ماونەتەوە، سەردەمی نووسینەوەیان لە چەن سـەد سـاڵێ تێـپـەڕ نابێ، بەڵام ئەز لەو باوەڕەدام، کـە مـێـژووی نووسینی کوردیی، گەلێ لەو تێکستانە کۆنترە، کە پێمان گەیشتوون و ئەو بەڵا و کوێرەوەرییـانەی بە سەر کـوردستان هاتوون، بوونەتە هۆی لەنێوبردنی بەشـێـکی زۆری نووسـینە کـۆنەکـان و بگرە هەمـووی. چونکە با زۆر دوور نەڕۆین، گـــەر ئەلێکســـاندەر ژابا «1801-1894»ی ڕووس و چەن ئەورووپایی یەکی دی نەبوونایە، کە کەلەپوری نەتەوەیی کورد لە سەدەکانی 17، 18 و 19 و تەنانەت بیسـتـەمـیشـدا کـۆکـەنەوە، سـا هەر یەکـە بە نیـازێکی جیـاواز لەوی دی، ئەوا ئەمـرۆ ئێـمـە، زۆربەی زۆری بەرهەمی هۆنەر و نووسەرەکانی ڕابوردوومـان پێ نەدەگەیشت. ئەوسا وامـاندەزانی، کە هەر نەبوون. بۆ شایەتیی قسـەم : ئەمـرۆ لە چ جێـیـەکی کوردسـتـاندا، دەسنووسی کـتـێـبی « عـادات و ڕسـومـاتنامـە اکـرادیە و اصول نظامـات

کرمانجی »ی مەلا مەحموودی بایەزیدیی دەسدەکەوێ؟ یا کێ هەر نێوی مەلا مەحموودی بایەزیدیی بیستبوو، «کە لە دەوروبەری 1790دا ژیاوە»، بەر لەوەی کتێبەکەی لە لایەن زانای تێکۆشەری ئۆکراینی، « مارگرێت رۆدینکۆ »وە بلاویکرێتەوە؟ لەبەرئەوە لەو باوەڕەدام، کە گەلێ تێکستی کۆنبوون و لەگەڵ لێشاوی ڕۆژگاردا لەنێوچوون و هێندێکیشیان هەر بە ئەنقەست لەنێوبران. بە تایبەتیی چونکە چاپ و چاپەمەنیش نەبووە، لەنێوبردنی یەک دوو دانەی دەستخەت لە کتێبێک، شتێکی یەکجار هاسان بووە لە ڕابوردوودا.)«23،78-79» دەربارەی نووسینەکەی ئیبن وەحشییەش دەڵێ:(ئەوەی ڕاستیبێ، تاقە سەرنجێکی کورتی ئەو کتێبە، کە بە عەرەبی نووسراوەتەوە، بۆمان دەردەخا، کە نابێ عەرەبیی زانێکی بە نێوبانگی وەک ئەحمەد کوڕی وەحشییەی نەبەتی نووسیبێتییەوە، بەڵکوو دەبێ، بێگانەیەک ڕێکیخستبێ، کە عەرەبیشی باش نەزانیبێ.)«23،111» پاشان دەڵێ:(بزووتنەوەی ڕۆشنبیرانەی نەتەوەیی یانە « ... » لە نێو کورددا مێژوویەکی کۆنی نییە. هەمووی پەنجا شەست ساڵێکە کە زمانی کوردیی بۆ نووسین و کاروباری گشتیی کەوتۆتە نێوانەوە. بە داخەوە زروفی سیاسیی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست پاش جەنگی جیهانیی یەکەم هەلێکی وای بۆ نەتەوەی کورد هەڵ نەخست کە بکارێ « بتوانێ » زمانەکەی خۆی بە شێوەیەکی ڕەسمیی بەکاربێنێ و ئەوەبوو لە هەموو کوردستاندا تەنیا کوردەکانی عێراق و یەکێتیی سۆڤیەت بوون کە توانییان بە زمانی خۆیان بکەونە نووسین و پەرەی پێ بدەن و لێیان نەپچڕنەوە.)«24،80»
بە کورتییەکەی دەتوانین، بڵێین: بەپێی ئەوا زانیاریانەی لە سەرەوە باسمانکردن، لە کۆندا تا سەرەتای سەدەی سیازدەیەم، زۆربەی « نووسەر، هونەر و زاناکانی کورد »، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، بە تەواویی پشکوێخستبوو، بەڵام (دوای ئەو مێژووە، لە هێندێ ناوچەی کوردستاندا، وردەوردە، بارودۆخەکە گۆڕا. نووسەر، هونەر و زاناکانی کورد، بەرهەمەکانیان بە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان بلاودەکردەوە، بەو شێوەیە هەوڵیاندەدا، ئەو جێچۆڵییەی نووسەرەکانی پێش خۆیان بەجێیانهێشتبوو، پڕبکەنەوە.)«97،339»

هەڵبەتە، ئەم بارە نالەبارەی زمانی کوردیی تێکەوتووە، لە ئەنجامی گەلێ هۆی « ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی و ئایینیی »دا پەیدابووە. بەڵام، فاکتەری ئایین، لە هەموو فاکتەرەکانی دیکە کاریگەرتر بووە. چونکە، دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام، لە کوردستاندا بڵاوبۆوە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، هێندە بۆ ئایینەکە بە پەرۆشبوون، بە تایبەتیی زاناکانی کورد، هەموو توانای خۆیان بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن، بۆ گەشەپێکردن و پەرەپێدانی ئایینی ئیسلام تەرخانکردووە، زمانەکەی خۆشیان پشکگوێخستووە. بۆیە، لە ئاکامدا دەڵێم: گەر هەر لە کۆنەوە کورد، زمانی خوێندن و نووسینی هەبووایە، هەڵبەتە ئەو هەموو ناودارانەی کورد، ئەوڕۆ دەناسران، چەندین بەرهەممان لە سەر « مێژوو، هونەر، وێژە، ئایین » و بابەتە جیاوازەکانی دیکەی نووسین، بە زمانی کوردیی دەبوو! گەر ئەو لێکدابڕان و پچڕاندنانەش ڕوویان نەدایە، هەڵبەتە ئەوڕۆ، زمانێکی یەکگرتووی نووسینمان دەبوو! لێرەدا، ئەوەی بە لای ئێمەوە زۆر گرنگە، ئەوەیە، ئایا زمانی نووسین و خوێندنەوە، کەی بە تەواویی لای کورد پەیدابووە؟ هەر چەندە، زمانی کوردیی، بە درێژایی مێژووی کورد لە ناوچەکەدا هەبووە و کورد ئاخافتنی پێ کردووە، بەڵام، ئەو هەلە گەورە مێژوویی یەی بۆ گەلانی دیکەی ناوچەکە هەڵکەوتووە، بۆ کورد نەڕەخساوە، تا لە سەردەمێکی کۆنەوە، ئەلفوبێی تایبەتیی خۆی هەبێ و پێی بنووسێ. بەڵکوو، هەموو ئەو « نووسین، زانیاریی و بەڵگانە »ی هەیە و لە بەردەسدان، بە زۆری بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێنەوە. ئەگینا پێش ئەو مێژووە، شتێکی وامان دیارە نییە. (نووسینیش وەک گەلێ شتی دیکە وایە، بە گەلێ قۆناغدا تێپەڕیوە، هەر لە نووسینی « هێرۆغلیفیی » و « بزماریی »وە بیگرە، تا بە « ئەلفوبێ »ی ئاسایی ئەوڕۆ دەگا و لەجیهاندا باوە، هەر پیتەی دەنگێ لە دەنگەکانی زمانان پیشاندەدا و « ژمارەیەکی کەم نەبێ، زمانەکانی مرۆڤ سەردەمی نەخشکردنیان دەس نەکەوتووە، زۆربەیان هەر بە سەر زارانەوە هاتوچۆیانکردووە. مەرجی بنچینەیی بۆ ژیانی زمانێکی دیاریکراو ئەوەیە، قسەی پێ بکرێ، نەک نەخشکرێ. نەک بە نەخشونیگار برازێندرێتەوە. ») «345،64»

جا گەر لە کۆندا، بە هەر شێوەیە بووبێ، زمانی کوردیی بە زمانی خوێندن و نووسین دانرابێ، ئەوا ئەورۆ ئێمە، تەنیا وەک باسێکی تیووریی وشک و نادیاری مێژوویی، کەڵکی لێ وەردەگرین. بەڵام باشتر وایە، بزانین، ئەم زمانەی ئەورۆ، لە پارچە جیاجیاکانی کوردستاندا، وەک زمانی نووسین و خوێندنەوە بەکاردێنرێ، لە کەیەوە سەریهەڵداوە؟

کەمێ لەمەوبەر گوتمان: نووسین و خوێندنەوە بە زمانی کوردیی نەبووە. چونکە لە کۆندا، وەک ئەورۆ لە کوردستان، خوێندنگە نەبووە. بەڵکوو، رۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە سەر دەسی مەلا و شێخەکاندا، بە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » خوێندوویانە. لە بری خوێندنگە، «قوژبنی حوجرە، سەر سەکۆی مزگەوت، سووچی تەکیە و خانەقاکانیان »، وەک خوێندنەگەی ئایینی بەکارهێناوە. شاگرد و فەقێ ئایینییەکانیش، هەموو شتێکیان، هەر بە یەکێ لەو سێ زمانە خوێندووە و نووسیوە، بەرهەمەکانیشیان هەر بەو زمانانە نووسیوەتەوە و کاروباری رۆژانەی ژیانی خۆشیان پێ راییکردووە. لەبەرئەوە، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە، خوێندن لە ناو کورددا بە رێوە نەچووە. بەڵکوو، پتر لە شێوەی خوێندنی ئایینیدا خۆی نواندووە. بۆیە، زۆربەی زۆری خوێندەوار و مەلاکان، زۆر بایەخیان بە زمانی کوردیی نەداوە، بەڵکوو راژەی زمانەکانی دیکەیان کردووە، زۆربەی کاتی خۆیان، بە زمانی ئایین و رێزمانی عەرەبییەوە بە سەربردووە، هەر (خەریکی ئەرێ بابەی ناو مزگەوتەکان بوون و خۆیان بە سەرف و نەحوی هیچوپووچەوە خەیککردووە. « زەرەبە عەمرو زەیدا »یان کردبوو بە ویردی سەردەمیان، تەنانەت شیعری هەڵپەرکێی ئاهەنگەکەشیان کە ئیجازەیان ئەدرایە، بریتیبوو، لە « عەفاریت جەمعی عفریتە، بۆت مردم لانکێ! » بو)«44، 32-33».

لەبەرئەوە، زمانی کوردیی بە تەوایی پشکوێتخرابوو، هێندێ جار، گەر یەکێ بە کوردییەکی رەوان بینووسیایە، گاڵتەیان پێ دەکرد، یا بە گاوریان دادەنا. بۆیە، ئەو خوێندنگەیانە نەیانتوانیوە، بە تەواویی، راژەی زمان و وێژەی کوردیی بکەن. بەڵێ راستە، لە هەموو سەردەمەکاندا، خوێندنگەی ئایینی لە کوردستاندا هەبووە و ئێستەش هەیە،(بەڵام، ئەو خوێندنگەیانە، بۆ

خزمەتی زمان و ئەدەبیاتی کوردیی نەبوون و نین. هەر چەندە، ئەو دەرزانەی لە مزگەوتەکاندا خوێنراون، بە کوردیی لێکدراونەتەوە، بەڵام ئەمە تەنیا بۆ تێگەیاندنبووە، نەک بۆ خزمەتی زمانی کوردیی. لەبەرئەوە، هەر مامۆستایە ئەو کوردییەی بەکارهێناوە، کە لە ماڵەوە قسەی پێ کردووە.) «11،23» واتە: لەو سەردەمانەدا، زمانی کوردیی تەنیا بۆ ئاخافتن بەکارهێنراوە. هێندێ جاریش هۆنراوەی پێ نووسراوە.

کاتێ خوێندنگە دەوڵەتییەکانیش دامەزراون، خوێندکارە کوردەکان، هەر بەو زمانانە خوێندوویانە. چونکە، تا دوای جەنگی یەکەمی جیهان، هەرگیز لە کوردستاندا، خوێندنگەی کوردیی نەبووە. مەگەر تەنیا، ئەو خوێندنگەیەی « عەبدولڕەزاق بە درخان » لە شاری « خوی » کردیەوە، ئەویش بۆ ماوەیەکی کورتبوو، لە «1913/10/24» دا داخرا.

هەروەها، پەرتووکی زانستانەی تایبەتیی، بە زمانی کوردیی بۆ خوێندکاران چاپ نەکراوە. بەڵکوو، ئەوەی هەشبووە، تەنیا چەن پەرتووکێکی کەم و ناوەڕۆک پووچەڵبووە. هەر چەندە، هێندێ ڕۆژنامە و گۆڤارمان هەبووە، تا ئەندازەیەکی باشیش، لە ڕاژەکردنی زمانەکەمان کەمتەرخەمییان نەکردووە. بەڵام، ڕۆژنامەی کوردیی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، بەردوام و فراوان دەر نەچووە. بەڵکوو، هەموویان تەمەنکورت و لاوازبوون. بۆیە نەیانتوانیوە، ڕاژەی زمانی کوردیی بە گشتیی و یەکێ لە دیالێکتە سەرەکییەکان بە تایبەتیی بکەن.

کاتێ جەنگی یەکەمی جیهان تەواوبوو، لە باشووری کوردستان، بارێکی نوێ دروسبوو. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی « شێخ مەحموودی بەرزنجیی » زمانی کوردیی، وەک زمانێکی سەربەخۆ، لە نووسین و خوێندنەوەدا بەکارهێنراوە. سەرەتا، ڕێنووسی فارسیی بەکاردێنرا. (لە ڕێگەی لاساییکردنەوەی ڕێنووسی فارسیی و تورکیی، هەموو کەموکوڕیی و گیروگرفتەکانی نووسینیشیان هاتۆتە ناو نووسینی کوردیی و لە ماوەی ئەم حەفتا هەشتا ساڵەی دواییدا، بەرەبەرە هەست بەم گیروگرفتانەی نووسین کراوە. ئەوەندەی مومکین بووبێ، لە گۆڕێ هەڵگیراون و ئەلفوبێیەکە زیاتر و باشتر، لەگەڵ تایبەتییەکانی زمانی کوردیی گونجێنراوە.)«69،70»

گەر باسی ڕۆڵی بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەریی بکەین، دەبینین: ڕۆژنامەگەریی لە بواری نووسین و ڕاژەکردنی زمانی کوردیدا، لە دوای هۆنراوەوە دێ. چونکە، گەر کۆنترین نووسراوی کوردیمان، لە شێوەی هۆنراوەکانی « بابا تایەر »دا، پێگەیشتبێ، ئەوا یەکەم ڕۆژنامەی کوردیی « کوردستان »، لە سالی «1898»دا دەرچووە. هەر چەندە، ڕۆژنامەکە بە ڕێنووسی کوردیی نەنووسراوە، بەلکوو، بە ڕێنووسی تورکیی دەرچووە. بەلام، بە یەکەم ڕۆژنامەی کوردیی دادەنرێ. چونکە، داکۆکیی لە مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورد کردووە، بۆ سەربەخۆیی کوردستان و ژیاندنەوەی نەتەوەی کورد کۆشاوە.

هەر چەندە، نەتەوەی کورد ئازاد نەبووە، لەگەل ئەوەشدا، کورد لە مێژووی خۆیدا، لە سەرانسەری کوردستان و لە هەندەران، گەلێ ڕۆژنامە و گۆڤاری ئاشکرا و نهێنی، تەمەن کورت و درێژ، وێژەیی و ڕامیاریی دەرکردووە.

ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە، لە هەموو سەردەمەکاندا، ڕۆلێکی گەلێ گرنگیان بینیوە. ڕاژەیەکی زۆری زمانی کوردییان کردووە، بە هەزاران کوردیان، فێری ڕامیاریی و کوردییەکی پوخت و ڕەوان کردووە، هەستی نەتەوەیی بوژاندونەتەوە، بۆ خوێندن و نووسین بە کوردیی هانیداون. بۆ نموونە: ڕۆژنامەکانی « بانگی کورد، ڕۆژی کوردستان، بانگی هەق، ژیان، ژین، ڕیا تازە، هاواری کوردستان، هەولێر و ... » هەروەها گۆڤارەکانی « ڕۆژی کورد، هاوار، دیاری کوردستان، ڕووناکیی، ڕۆژانۆ، هەلالە، کوردستان، گەلاوێژ، هەتاو، هیوا، و ... » ئەمانە، چەن ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی، جیهانی هونەر و وێژەی کوردیی بوون، تاهەتایە، بیر ناچنەوە.

« هێمن »، دەربارەی ڕۆلی بزووتنەوەی ڕۆژنامەوانیی دەلێ:

(مێژووی ڕۆژنامەنووسیی ئێمە، زۆر لە گەلانی دەوروبەرمان بەجێ نەماوە. " کوردستان " یەکەم ڕۆژنامەی کوردیی کە لە سالی «1898 ـ 1902»دا بلاوبۆتەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەل، ڕۆژنامەکانی گەلانی هاوسێ و دەوروبەرماندا نییە. لە سەرەتای ڕۆژنامەنووسییەوە، ڕۆژنامەنووسەکانی ئێمەش وەک ڕۆژنامەنووسەکانی تورک و فارسیان نووسیوە و پێیان شوورەیی نەبووە ووشەی بێگانە بەکاربێنن.)«24،122»

پاشان دەڵێ: (ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحموودی نەمر، ... ئەو ڕاستییە بە تەواویی ڕووندەکەنەوە. پیرەمێردی نەمر، ڕۆژنامەنووسی هەرە گەورە و شاعیری بە ناوبانگی کورد لە " ژین " و " ژیان "دا، ئارام و لە سەرخۆ گۆڕانێکی باشی بە سەر نووسینی کوردیدا هێنا. ئاگایانە و وشیارانە خەریکی بژارکردن و خاوێنکردنەوەی زمانەکەمان بوو، ووشەی ساکار و ڕەسەنی کوردیی، لە باتی ئەوان بەکاردێنا.
گەلاوێژ، گەلاوێژی گەش و بەرز، بە پرشنگی ڕوون و جوانی ئاسمانی ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی کوردیی ڕۆشنکردەوە. خەوالووی ڕاپەڕاندن و شۆڕشێکی پیرۆزی ئەدەبیی هەڵگیرساند. ڕێبازێکی ڕاست و ڕەوانی گرتە پێش، نووسەر و شاعیری پێگەیاندن و بە خەڵکی ناساندن و وەک درەختێکی بە بەر و سێبەر، ڕەگاژویکرد و وەچەی وەک " نیشتمان " و "کوردستان " و " هەلالە " و ڕۆژنامەکانی دیکەی سەردەمی کۆماری کوردستان لە مهابادێ دەرکردن.
نالێم ئەویش زۆر تەواوبوو، نالێم کەموکوڕیی نەبوو، نالێم کە ئەویش شتی بێ تامی تێدا چاپ نەدەکرا. بەلام دەتوانم، بلێم: ئەگەر ئەو ئەستێرە گەشە وا زوو ئاوا نەدەبوو، تووشی ئەم شەوەزەنگە نەدەبووین، کە سەرەدەری تێدا ناکرێ.
بە داخەوە، ئەو تەپوتۆزەی کە پاش شەڕی یەکەم لە تورکیا و ئێران هەستا و لەو وولاتانە خۆی نەگرت. پاش شەڕی دووەم ڕووی لە کوردستانی عێراق کرد، ڕووی لەو پارچەیەی نیشتمانەکەمان کرد، کە تا ڕادەیەک دەرەتانی کوردی نووسینی لێ هەبوو. لە جێدا وەستا، نەڕەویی، نەڕەویی و مەیی، تا ڕۆژی ڕووناکی لێ کردینە شەوەزەنگ. شەوەزەنگێکی تاریکوتنووک و ئەنگوست لە چاو.)«25،122»
هەرچەندە، هێندێ کەس لەو باوەڕەدان، نووسین بە زمانی کوردیی، گەلێ لەوە کۆنترە، کە ئێمە لێرەدا باسی دەکەین. بەڵگەشیان ئەوەیە، باسی هۆنراوەکانی « بابا تایەری هەمەدانیی » دەکەن. بەلام، ئێمە لێرەدا، مەبەسمان دەقی کوردیی نییە، بەڵکوو، مەبەسمان لە ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردییە.

ئێستـه، كـاتی ئەوە هاتووە، لێرەدا شتێ دەربارەی ئەلفوبێی کوردیی روونكەینەوە. من پێموایە، گەر ئەلفوبێی کوردیی لە كۆندا هەبووایە و لە نووسینی کوردیدا بەکاربێنرایە، هەڵبـەتە، چەن نووسەرێكی كورد، لەو سەردەمانەدا، بەرهەمەکانی خۆیان، بە کوردیی دەنووسییەوە. یا با بڵێین: گەر زمانی کوردیی نووسینیش هەبوویێ، دیارە زۆر بڵاو نەبووە، جگە لە چەن هۆنەرێكی کورد، نووسەرەکانی دیکە پێیان نەنووسیوە. بۆ نموونە: میر «شەرەفخانی بەدلیسی» لە ساڵی «1005ک/1596ز»دا، شاکارە بە ناوبانگەکەی خۆی «شەرەفنامە» بە زمانی فارسیی نووسیوە. گەر بە زمانی کوردیی نووسین هەبووایە، یا زۆر بڵاوبووایە، دوور نەبوو، «شەرەفخان» بە کوردیی بینووسیایە! هەر چەندە، هێندێ کەس دەڵێن: «شەرەفخان» کوردیی نەزانیوە، بۆیە شەرەفنامەی بە فارسیی نووسیوە.

بەڵام، دەربارەی زمانی نووسینی، هەموو ئەو پەرتووکە ئاینییانەی، بە زمانی کوردیی نووسراون، وەک «سەرەنجام»ی کاکەیی یەکان، «جیلەوە و مسحەفا رەشی» یەزیدییەکان، تا ئێستە، مێژووەکانیان نەزانراوە. چونكە، مێژووی نووسینیان لە سەر نییە. هەر چەندە، پرۆفیسۆر «قەناتی کوردۆ»، دەربارەی مێژووی نووسینی پەرتووکی «یەزیدی»یەکان، لەو باوەڕەدایە، (لە سەدەکانی «10-11»ی زاییندا نووسراون.)«131،78»

هەر لە کۆنەوە، هێندێ لە«نووسەران، شارەزایان، زاناکانی کورد و دۆستانی بیانیی نەتەوەکەمان» هەوڵیانداوە، ئەلفوبێیەکی تایبەتیی، بۆ زمانی کوردیی دانێن. بە مەرجێ، لەگەڵ سروشت و خەسڵەتە تایبەتییەکانی زمانی کوردیدا بگونجێ. بەڵام، هەموو ئەو هەوڵوتەقەلایانەی دواوە، زۆربەی کات سەریان نەگرتووە. چونكە، لە لایەکەوە، شارەزایانی کورد لە نێو خۆیاندا، لە سەر شێوەی ئەو ئەلفوبێیە، بە تەواویی رێک نەکەوتوون. لە لایەکی دیکەشەوە، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان رێیانهێشتووە، ئەو کارە بە تەواویی سەرگرێ. بەڵکوو، هەمیشە گرفتیان لە بەردەمدا قووتکردۆتەوە. پاشتریش، بە یەکجاریی قەدەغەیانکردووە. بەڵام، هەموو ئەو کۆششانەیکراوە، پتر لە دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانەوە دەسپێکردووە. کاتێ ئیمپراتۆریای عوسمانیی هەڵوەشایەوە،

ئینگلیزەکان دەسیان بە سەر، هێندێ لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەندا گرت. هەر چەندە، لە سەرەتادا شارەزایانی زمان هەولیاندا، ئەلفوبێیەکی لاتینیی بۆ زمانی کوردیی دانێن، بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەلفوبێی عەرەبیشیان فەرامۆش نەکردبوو.
لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە، هێندێ لە شارەزا و زمانزانەکانی کورد، بیریان لەوە کردەوە، ئەلفوبێیەکی کوردیی دانێن، تا کوردیش وەک هەموو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، خاوەنی ئەلفوبێی خۆی بێ، ئەوەی دەیەوێ، پێی بنووسێ، بە مەرجێ لەگەڵ تایبەتمەندیی، خەسلەتی زمانی کوردیی و دەنگەکانیدا بگونجێ. ئەوە بوو، دوو جۆرە ئەلفوبێ دانرا. لە باکوور و خۆراوای کوردستان، ئەلفوبێی لاتینییان دانا. لە ڕۆژهەلات و باشووری کوردستانیش، ئەو ئەلفوبێیەیان هەلبژارد، کە زۆربەی زۆری گەلانی موسولمان پێیان دەنووسی، تا ئەم ئەلفوبێیەی ئەورۆی لێ دەرچوو، کە بۆ نووسینی زمانی کوردیی، ئێمەی کورد بەکاریدێنین.
گومانی تێدا نییە، ئەو ئەلفوبێ و نووسینەی لە سەرەتادا، بۆ زمانەکەمان دانرا و پێی دەنووسرا، وەک ئەم ئەلفوبێ و ڕێنووسەی ئەورۆ نەبووە. بەلکوو، هەر لەو ڕۆژەوە دانراوە، تا ئەورۆ بە ئێمە گەیشتووە، بە چەن قۆناغێکدا تێپەڕبووە. لە هەر قۆناغێکدا، گەلێ گۆڕانی گرنگ، لە هێندێ شتی وەک: « ژمارە، شێوەی نووسین، دەنگی پیتەکان بە تایبەتیی و ڕێنووسی کوردیی بە گشتیی » ڕوویداوە. هێندێ لەو کەموکوڕییانەی لە سەرەتادا هەیبووە، وردەوردە، پڕکراونەتەوە. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، شارەزایانی زمانی کوردیی، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە هەولی ئەوەدان، جۆرە ئەلفوبێیەکی دیکەی ڕێکوپێکتر دانێن، کە بە تەواویی، پێویستییەکانی زمانی کوردیی جێبەجێکا.
بۆیە، هێندێ لە ڕووناکبیر و شارەزایانی زمانی کوردیی هەولدەدەن، ئەو بۆشایی و کەموکوڕییانە پڕکرێنەوە، واز لە پیتی عەرەبیی بێنن و بە پیتی لاتین بنووسن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، گرفتێکی گەورەی بۆ زمانەکەمان دروسکردووە. چونکە، نووسینی کوردیی یەکگرتوو نییە و بە دوو پیت و ڕێنووسی جیاواز دەنووسرێ. ئەوەی کوردی دانیشتووی هەر دوو بەشەکەی

باکوور و خۆراوا پێی دەنووسن، کوردەکانی دانیشتووی پارچەکانی ڕۆژهەڵات و باشوور تێی ناگەن.
بە شێوەیەکی گشتیی، ئەو ڕەخنانەی لەم ڕێنووسەی ئەوڕۆ دەگیرێ، زیاتر پێوەندیی بە « ژمارەی پیتە بزوێنەکان، فۆنێتیک و توانای پیتە عەرەبییەکان »ەوە هەیە، کە تا چەن دەتوانن، دەنگەکانی زمانی کوردیی، وەک پێویست دەربڕن. هێندێ ڕەخنەی دیکەش، لەم ئەلفوبێیە دەگیرێ، وەک:(زۆریی نوختە لەسەر پیتەکان، وێکچوونی شێوەی هەندێ لە پیتەکان، لە کاتی نووسیندا دەبێ، زۆر جار دەس یا قەڵەم لە سەر کاغەز هەڵگیرێ.)«69،70»
لەبەرئەوە، دوای ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهان تەواوبووە، شارەزایانی زمانی کوردیی، بۆیان دەرکەوتووە، ئەو پیتە عەرەبییانە، بۆ زمانی کوردیی زۆر گونجاو نین. بۆیە، یەکێکی وەک:(« مێجەرسۆن » هەوڵیدا، ئەلفوبێیەکی کوردیی بە تیپی لاتینیی دروسکا و دوو کتێبیشی بەو ئەلفوبێیە دەرکرد. بەڵام، ئەلفوبێکەی نەکەوتە برەو. چەن ساڵێ پاش ئەوە، خوالێخۆشبوو، جەلادەت بەدرخان «1887-1951»، لە شام، لە ساڵی«1932»دا، ئەلفوبێیەکی کوردیی لاتینیی دەرکرد، بە نێوی خواستەمەنی « ... » میر هێرە کۆل ئازیزانەوە، کە لە «1927»ەوە پێوەی خەریکبووبوو. جەلادەت لە«15ی مایسی1932»ەوە تا «15ی ئابی1943» بەم ئەلفوبێیە، پەنجاوحەوت ژمارە گۆڤاری « هاوار »ی دەرکرد.....
ئەمەش بە نیازی ئەوەی، کوردەکانی تورکیا کە لە نووسین و خوێندنی کوردیی بێبەشن، کەڵک لەو ئەلفوبێیە ببینن. جا لە هەمان کاتدا، «کامەران بەدرخان »ی برای لە «1942/12/6 ـ 22 / 1943/11» سێ دانە گۆڤاری « ستێر » و لە «1943/5/3 تا 1946/5/27» حەفتاوسێ دانە گۆڤاری «ڕۆژا نوو »ی لە بێروت، هەر بەو ئەلفوبێیە دەرکرد و لە «1938»دا نامیلکەیەکی ئەلفوبێی سیودوو لاپەڕەییشی پێ بڵاوکردەوە. ئەم هەوڵوتەقەلایانە، بوون بە هۆی بڵاوکردنەوەی ئەم ئەلفوبێیە لە کوردستانی سووریا و تا ئەندازەیەکیش لە نێو هێندێ لە کوردە ڕۆشنبیرەکانی تورکیا و عێراقدا.)«23،79-80 »

هەروەها، ئەم هەوڵدانە، لە باشووری کوردستانیش بەردەوامبووە. (هەر لەو کاتەدا، کە بەدرخانییەکان لە سووریا، خەریکی بڵاوکردنەوەی تیپی لاتینی بوون، « تۆفیق وەهبی »ش لە عێراق، جۆرە ئەلفوبێیەکی لاتینی بۆ نووسینی کوردیی هێنایەکایەوە، کە لە ڕووی ئۆرتۆگرافییەوە، بە زۆری لاسایی ئەلفوبێی ئینگلیزیی کراوەتەوە. ئەم ئەلفوبێیە لە ساڵی «1941»ەوە لە گۆڤاری « گەلاوێژ »دا، ناوبەناو بڵاودەکرایەوە. ئەوی ڕاستیبێ، ئەمە کارێکی زۆر خراپبوو، چونکە دەبووایە، « وەهبی و بەدرخانییەکان » پێکەوە هاوکارییان بکردایە و ئەلفوبێیەکی یەکگرتوویان بۆ زمانەکە دانایە. لەوانەبوو، ئێستە هیچ نەبێ، ئەلفوبێیەکی لاتینیی یەکگرتوومان ببوایە. هەر چی چۆنێبێ، ئەو بەختەی کە ئەلفوبێی بەدرخانییەکان لە سووریادا هەیبوو، ئەمەی وەهبی لە عێراقدا نەیبوو. چونکە، کاربەدەسانی ئەو دەمەی عێراق، هەر زوو بەربەرەکانێیان کرد و ڕێی بڵاوبوونەوەیان لێ گرت.

ڕێ نەدان، بە بڵاوبوونەوەی ئەلفوبێی کوردیی لاتینیی لە عێراقدا، هێندێ لە ڕۆشنبیرەکانی کوردی عێراقی ناچارکرد، بیر لە چاککردن و دەسکاریکردنی ئەلفوبێی عەرەبیی بکەنەوە، بە جۆرێ کە بۆ نووسینی زمانی کوردیی بسازێ. یەکێ لەوانەی کە هەر لە کۆنەوە خەریکی بە کوردیی نووسین و ڕێکخستنی ئەلفوبێی کوردیی بوون، بەهەشتی «داماو» حوزنی موکریانی «1893-1947» یە.) (ئەوی تەماشای گۆڤاری « زاری کرمانجیی » بکا، کە لە «1926-1932» لە ڕەواندز، داماو دەریدەکرد، بە تایبەتی ژمارە حەوت، ئەوسا تێدەگا، کە داماویش لە مەیدانی دامەزراندنی ئەلفوبێی کوردیدا، خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە. جا لەبەرئەوەی ئەو دەمە وەزارەتی زانیاریی «...» خۆی دەبوو، ڕێی خوێندن بە کوردیی لە قوتابخانە سەرەتایی یەکاندا بدا، ناچاربووبوو، هەوڵێکی دانانی ئەلفوبێیەکی کوردیش بدا. بۆ ئەم مەبەستەش، مامۆستا «تۆفیق وەهبی »، کە ئەو کاتە کاربەدەستێکی گەورە و دەستڕۆیشتووی میری بوو، فەرمانی پێ درا، ئەلفوبێیەک بۆ قوتابخانە کوردییەکانی عێراق دروسکا. « وەهبی »لە ساڵی «1933»دا، کتێبێکی ئەلفوبێی بە تیپی

عـەرەبیی دەسکاریکراو، بە نێـوی « خـوێندەواریی باو »ەوە لە بەغـدا لە چاپدا. بەڵام، ئەم کـتێبـە ڕێی نەدرا، بچێـتـە قـوتابخـانەکـانەوە، چونکە، هێندێ لە تەنگەتیلکەکـان بەرگرییـانکرد، بە نێوی ئەوەوە کە گـوایە، ئەمـە بێ دینییە، چوکلـەومۆکلـە بخرێتە سەر تیپی عـەرەبیی، کە زمانی قورئانە. لەبەرئەوە، ماوەیەکی زۆری خایاند، تا کـاربەدەسانی عێـراق، چاویان لەوە پۆشی، کە تیـپی عـەرەبیی « کـڵاو »ی کـوردییـان بنرێتـە سـەر. بەڵام، لەم ماوەیەدا، هێندێ گۆڕان هاتنە کایەوە..... لە «1950» بە دواوە، توانرا ئەم ئەلفوبێ " عـەرەبیی ـ فـارسی " یە دەسکـاریکراوە سەربەستتر بەکـاربێنرێ ..... هەر لەم کـاتەدا، هێندێ دەسـتوور بۆ نووسینی ئەو تیپە دەنگدارانە دانران، کە لە سەرەتای ووشەوە دێن. ئەوەش بە هۆی یارمەتیی " هەمزە " و تیپە دەنگدارەکـانەوە. وەک « ئاسمان » لە جیاتی « اسمان »، « ئەمە » لە جیاتی « امە » ..... دەنووسران. ئەم بەشەی دوایی « واتە بەشی هەمزە بەکارهێنان، لەم شوێنانەدا، بە زۆری بە هەوڵوتەقەلای مامۆستا«عەلائەدین سـەجـادیی » هاتەبەرهەم.» ئەم دەسکاریکردنە، بەو شـێـوەیەی باسکرا، بە تەواویی پێڕەو نەکرا، بەڵکوو زۆر و کەم، کارەکە لەسەر زەوقی نووسەر، یا بوون و نەبوونی ئەو تیپانە لە چاپخانەدا وێستابوو.)«23،80-81»

(کوردێکی خەڵکی سلەیمانیش، کە نێوی مەلا « ڕەشید بەگی بابان » بووە، لە ئەستـەمـووڵ خـەریکی داهێنانی ئەلفـوبێـیـەکی کـوردیی بووە، بۆ ئەوەی کتێبێک بە نێوی " مجمەع ئەلبەحرەین فی ئیقتیران ئەلنەیرەین " ەوەی پێ بنووسێتـەوە، کە بریتییە لە وەرگێڕانی کوردیی کتێبێکی " ئەلسەحیح "ی موسلیم و بوخاری، کە ئەمەش کۆمەڵـە حەدیسێکی پەیامبەری ئیسلامە. ئەم زانایە کـە لە «30ی کـانوونی دووەمی1942»دا، کـتـێـبـەکـەی تەواو کردووە، ئاگـای لە هەوڵوتەقـەلای کوردی دی نەبووە. ئەویش ئەلفـوبێـیـەکی کوردیی لە سـەر بنچینەی ئەلفـوبێی عـەرەبیی و فـارسیی داناوە. بەڵام، دەنگە تایبـەتـیـیـەکـانی زمـانی کـوردیی، تا ئەندازەیەکی زۆر لە یەک جیاکردۆتەوە.)«23،82»

(زانای کـورد ئایەتوڵلای مـەردۆخی کـوردسـتـانیی، ئەلفـوبێـیـەکی کـوردیی سیوشەش تیپی، لە ئەلفوبێی عەرەبیی ـ فارسیی دەسکاریکراو چێکردووە

و ئەم ئەلفوبێیەی لە سەرەتای فەرهەنگەکەیدا باسیکردووە. بێجگە لەوەش ڕێنووسێکی تایبەتیی دی بۆ نووسینی کوردیی داناوە و تیپە دەنگدار و بێ دەنگەکانی لە یەک جیاکردۆتەوە و بۆ هەر یەکە نیشانەیەکی تایبەتیی داناوە. کەچی خۆی ئەو ڕێنووسەی نە بۆ نووسینەوەی فەرهەنگەکەی و نە بۆ نووسینی هیچ شتێکی دی بەکار نەهێناوە.)«83،23»
بێجگە لە ئەلفوبێی عەرەبیی ـ فارسیی و ئەلفوبێی لاتین،(دوو جۆرە ئەلفوبێی دیش هەن: یەکێکیان ئەلفوبێی ئێزدییە و ئەوی دیش ئەلفوبێی سریالییە. ئەلفوبێی ئێزدیی، ئەو ئەلفوبێیەیە، کە هەر دوو کتێبە پیرۆزەکەی ئێزدییەکان بەوە نووسراوەتەوە، واتا « مەسحەف ڕەش و کتێبی جەلوە ». هەر چەندە نازانرێ، کەی ئەم ئەلفوبێیە دانراوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە، ئەوەیە، ئەو کەسەی دایناوە، شارەزایی یەکی تەواویی لە ئەلفوبێی عەرەبیش و فارسیشدا بووە. هەموو ئەو دەنگانەی کە لە کوردیدا هەن و بە ئەلفوبێی عەرەبیی و فارسیی دەرنابڕێن، بەم ئەلفوبێیەش دەر نابڕێن.)«84،23 » گەر ئەو پەرتووکانەی د. « نەبەز » باسیاندەکا، بە کوردیی نووسرابن، ئەوە دەگەیەنێ، لەو سەردەمانەدا، ئەلفوبێ و نووسینی کوردیی هەبووە.
کوردەکانی باکووری کوردستان، هەرگیز بە زمانی خۆیان نەیانخوێندووە. بە هیچ شێوەیە، ڕێگەیان نەدراوە، زمانی کوردیی بۆ نووسین و خوێندنەوە بەکاربێنن. هەر چەندە، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە، چەن ڕۆژنامە و گۆڤارێ لە ئەستەمبوڵ دەردەچوو، بەڵام، بە پیت و ڕێنووسی تورکیی دەنووسرا.
لە شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، بزووتنەوەیەکی ڕووناکبیریی سەیهەڵدا. هێندێ جار، کوردەکان نووسینیان بە زمانی کوردیی بڵاودەکردەوە. بە تایبەتیی، دوای ئەوەی « P.K.K. » دامەزرا، ڕۆڵێکی مەزنی لە بووژانەوەی، هەستی نەتەوەیی کوردی باکووردا بینی. گەلێ هەنگاوی مەزنیان ناوە، بایەخێکی یەکجار زۆریان، بە زمان داوە، هێندێ دەزگەی کەلتوورییان دامەزراندووە، گەلێ گۆڤار، ڕۆژنامە، نامیلکە و پەرتووکیان، بە زمانی کوردیی و بە پیتی لاتین دەرکردووە.

له ڕۆژهەلاتی کوردستانیشدا، هەر له کۆنەوە، فارسەکان زمانی کوردییان، بە دیالێکتێکی ناوچەیی ئێران و زمانی فارسیی داناوە. له سەردەمی «سمایلاغای سمکۆ» و جەنگی یەکەمی جیهاندا، هەلێکیان بۆ هەلکەوت، بە زمانی خۆیان بنووسن. ڕۆژنامەیەک بە کوردیی دەرکەن.
هەروەها، دوای جەنگی دووەمی جیهان، کۆماری کوردستان دامەزرا. لەو سەردەمەدا، زمانی کوردیی بە تەواویی بوژایەوە، هێندێ ڕۆژنامە و گۆڤار بلاوکرانەوە، خوێندن بە کوردیی بوو. بەلام، ئەمەشیان زۆر درێژەی نەکێشا، دوای کەمتر له سالێ، ئەوی دروسیشکرابوو، تێکدرایەوە!
ئەم دوو هەولّ و تاقیکردنەوەیە، بە هیچ شێوەیەک، کارێکی گرنگی ئەوتۆی، له پێشکەوتن و چەسپاندنی زمانی کوردیی نەکرد. چونکە، جگە لەوەی هەموو شت گۆڕا، هەر دوای ئەوەش، زمانەکەیان لێ قەدەغە کرا.
دوای ئەوەی شۆڕشی گەلانی ئێران، له سالی« 1979 »زدا ڕوویدا و سەرکەوتنی بەدەسهێنا، کاربەدەستانی ئێران، دانیان بە سەربەخۆیی زمانی کوردیدا نا، ئیدی وردەوردە، جولانەوەیەکی کەلتووریی سەریهەلدا.
لەو ڕۆژەوە، بە شێوەیەکی بەردەوام، هێندێ «گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک» بە کوردیی چاپدەکرێن. جموجۆلێکی گەلێ گەورە، له ناو ڕووناکبیران و نووسەران بە گشتیی و له نێو لاوەکاندا بە تایبەتیی بەدیدەکرێ. لەگەلّ ئەوەشدا، باری فەرهەنگی کوردیی، لەم بەشەدا گەلێ دواکەوتووە. تا ئێستە، ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیان نییە. ئەوە جگە لەوەی، زۆربەی زۆری کوردەکانی ڕۆژهەلات، شارەزاییان له « ڕێزمان، ڕێنووس و نووسینی کوردیی نوێ »دا نییە. پتر له ژێر کارتێکردنی کەلتووری فارسیی دان. له نووسینیشدا، هەر پێڕەوی فارسەکان دەکەن. بۆیە دەتوانم، بلێم: هەر چەندە له کۆنەوە، چەن هۆنەرێکی پایەبلندی وەک:« بابە تایەری هەمەدانیی، ...قێ تەیران، بێتووشی، سەی یاقو، وەفایی، سالمی سنەیی، مەجدیی، ئەدەب، ناری ...تاد »یان تێدا هەلکەوتووە، هێندێ له هۆنراوەکانیان، بە زمانی کوردیی هۆنیوەتەوە، بەلام ئەوڕۆ، نووسەرە باشەکانیان له بواری نووسینی کوردیدا، بە پەنجەی دەس دەژمێررێن. هێندێ لەو نووسەرانەی، کوردییەکی باشیش دەزانن، بە زۆری له نووسەرەکانی باشووری

کوردستانەوە فێربوون. چونکە، ماوەیەکی زۆر لەوێ ژیاون، یا بە هەزار کولەمەرگیی، خۆیان فێری کوردییەکی نیوە باش و نیوە خراپ کردووە. هۆی ئەم دواکەوتن و کوردیی نەزانینەی، زۆربەی زۆری گەلی ڕۆژهەلاتی کوردستانیش، بە شێوەیەکی گشتیی، زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لە مێژووی هاوچەرخی نەتەوەیی خۆیاندا، تا ئەو کاتەی کۆماری کوردستان لە مهاباد دامەزراوە، زمانی زکماکیی خۆیان، تەنیا بۆ پەیڤین بەکارهێناوە. لە خوێندنگەکاندا بە زمانی کوردیی نەیانخوێندووە، خوێندن و نووسین بە کوردیی نەبووە، «ڕۆژنامە، گۆڤار، نامیلکە و پەرتووکیان» بە کوردیی دەر نەکردووە، هەموو ئەو شتانە، تەنیاوتەنیا هەر بە زمانی نەتەوەی بالادەس بوون. تەنانەت، لە هێندێ سەردەم و ناوچەی کوردستانیشدا، قسەکردن بە زمانی کوردیی قەدەغەبووە. بۆیە، چەن ڕۆڵەیەکی نیشتمانپەروەری کورد، باسکی مەردانە و کوردانەیان لێ هەڵکرد، ئالای پیرۆزی ڕاژەکردنی زمانی کوردییان بەرزکردەوە، شەویان بە ڕۆژەوە گرێدا، کۆششێکی زۆریان کرد، تا لاوانی کورد، فێری خوێندنەوە و نووسینی، زمانی نەتەوەیی خۆیان کەن، وەک:« هێمن » دەڵێ:(لەو سەردەمە تاریکوتنووک و ئەنگووست لە چاوەدا، لە مەڵبەندی موکریان، بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ سیاسەتی تواندنەوەی کورد، بە ڕابەری مامۆستا مەلا « ئەحمەدی فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوای نەمر، قازی بۆکان، شێخ ئەحمەدی سریلاوا » و گەلێکیتر لە ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمە پێکهاتبوو، کە ئامانجی ئەساسیی و هەرە گەورەیان پاراستن و پەرەپێدان و بووژاندنەوەی زمان و ئەدەبی کوردیی بوو. کتێب و ڕۆژنامەی کوردییان کە لە عێراق بڵادەبوونەوە، بە زەحمەت پەیدادەکرد و بە ئیحتیاتەوە بە سەر لاوانی بڕواپێکراودا بڵاودەکردەوە، تا فێری کوردیی خوێندنەوە بن.)«82،122» لەگەڵ ئەوەشدا، زمانی کوردیی نەتووایەوە، بووژایەوە و پێشکەوت.

دەتوانین، بڵێین: سەردەمی زێڕینی بوژاندنەوەی زمان و وێژەی کوردیی، لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، بۆ سەرەتای چلەکان دەگەڕێتەوە. بە تایبەتیی، کاتێ کۆماری کوردستان دامەزرا، ئیدی لەو ماوەیەدا، زمانی کوردیی وەک زمانی ڕەسمیی کۆمار ناسرا، کاروبارەکانی ڕۆژانەی دەوڵەت، بە زمانی

کوردیی ڕادەپەڕێنرا. خوێندکارانی کورد لە خوێندنگەکاندا، بە کوردیی دەیانخوێند. چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار بە کوردیی دەرچوون. هەر چەندە، ئەم سەردەمە بۆ کوردی ڕۆژهەلات، لە بواری بوژاندنەوەی « زمان، فەرهەنگ و وێژەی کوردیی »دا، وەک سەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپا وا بوو، بەلام، بە داخەوە، تەمەنی کۆمار زۆر کورتبوو، کۆمارە ساواکەمان، تەنیا یازدە مانگ ژیا. ئەو خۆشیی و شادییە نەتەوەیی یەی، سەرانسەری کوردستانی گرتبووە، هەر زۆر زوو زیندەبەچالکرا و زۆر بەردەوام نەبوو. کاتێ کۆمارەکەش ڕوخا، هەموو شتێ بۆ دۆخی جارانی خۆی گەڕایەوە. زمانی کوردیی قەدەغەکرا، زۆربەی ئەو ڕۆژنامە، گۆڤار و پەرتووکە کوردییانەی دەریشچووبوون، کۆکرانەوە و سوتێندران. هەر لەو ڕۆژەوە تا ئەوڕۆ، خوێندن لە خوێندنگەکاندا، تەنیا بە زمانی فارسیی بووە. هەموو کاروبارەکانی دەولەتیش، هەر بە زمانی فارسیی ڕاپەڕێنراوە. تەنانەت، جلوبەرگی کوردیش قەدەغەکرا. (لە قوتابخانە و ئیدارە، تەنانەت لە کووچە و خەیابان، هەزاران کورد بە تاوانی کوردی گوتن گیران، ئازاردران و سووکایەتییان پێکرا. بەلام، زمانی کوردیی وەک سەرمایەی نەتەوایەتیمان هەر پارێزرا. کورد نەتواوە و ئابڕووتکاویی و ڕیسوایی مێژوو، بۆ پۆلیسی ڕەزاخان مایەوە.)«82،122» زۆربەی ئەو « هۆنەر، نووسەر، زانا و ڕامیار »انەی، لە سەردەمی کۆمارەکەشدا، ڕۆلێکی مەزنیان، لەو پرۆسێسە گرنگەی بوژاندنەوەی زماندا وازیکردبوو، لە ناچاریدا ولاتیان جێهێشت و هەلاتن.
بە کورتیی و کوردیی، زمانی کوردیی، وەک زمانی ئاخافتن و نووسین قەدەغەبوو. بە دیالێکتێکی نێوخۆیی دادەنرا. هیچ جۆرە شتێ، بە کوردیی دەر نەدەچوو. جگە لەو بەرهەمە کەمانەی، « حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران » لە دەرەوەی وولات دەریدەکردن، لە ڕیزەکانی ڕێکخراوەکەیاندا بلاویاندەکردەوە، جاروبار، تاکوتەراشی لێ دەگەیشتەوە کوردستان، ئەویش دەس هەموو کەس نەدەکەوت، بەلکوو بە دزییەوە و چەن کەسێکی دیاریکراو دەیانخوێندەوە. لە هەمان کاتیشدا، ئەو نووسینانەی دێموکرات بلاویدەکردنەوە، بایی هێندە نەبوون، کۆمەلانی خەلک بە زمانی کوردیی، فێری خوێندن و نووسین بکەن. لەبەرئەوە، زۆربەی زۆری ئەو ڕووناکبیر و

نووسەرە کوردانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە فارسیزانێکی باش و کوردیزانێکی خراپ دادەنرێن. وەک «هەژار»یش دەڵێ:(لە ئێران زۆرتر لە کوردان، بە ناشکوری نەبێ، فارسیی لە کوردیی باشتر دەزانن و بگرە کوردیی هەر نازانان.)«30،120»
ئەو تاکوتەرایەی، لە بواری نووسینی کوردیشدا، لە کۆنەوە وەک چەن ڕووناکبیر و نووسەرێکی گەورەی کورد هەڵکەوتوون، وەک:«داماوی موکریانیی، گیوی موکریانیی، هەژاری موکریانیی، هێمن، حەسەنی قزڵجی، زوبێحی» و چەن کەسێکی دیکەش، لەگەڵ ئەوانەی ئەوڕۆش، ئەسپی خۆیان لە گۆڕەپانی نووسینی کوردیدا تاودەدەن، زیاتر لە ئەنجامی ئەوەدابووە، دوای ئەوەی هەڵاتوون، لە کوردستانی بەشەکەی عێراق یا لە عێراق خۆیدا گیرساونەتەوە. ماوەیەکی درێژ لەوێ ژیاون، تێکەڵ بە ژیانی کوردەکانی باشووری کوردستان بوون، کەڵکیان لەو کەمە ئازادییە وەرگرتووە، کە لە بواری چاپەمەنی کوردیدا، هەر لە سەرەتای ساڵەکانی بیستەوە، بە شێوەیە لە شێوەکان لە باشووردا هەبووە. ئیدی، دەقیان بەو ڕەوشە کەلتوورییەوە گرتووە، نووسەرانی هەر دوو پارچەکەی کوردستان، کاریان لە یەکدی کردووە و سوودیان لە یەکدی وەرگرتووە.
ئەم بارە، بەم شێوەیە بەردەوامبوو، تا گرکانی ڕقوکینەی کۆمەڵانی خەڵک، بە تەواویی تەقییەوە. شۆڕشی گەلانی ئێران، لە سەرەتای ساڵی «1979»دا بەرپابوو. دوا پاشماوەی دارودەسەی بنەماڵەی شاکانی پەهلەویی، لە بنوبێخەوە هەڵکەن. ئیدی باری ئێران بە تەواویی گۆڕا. گەلی کوردیش، تا ڕادەیە کەڵکی لەو ڕەوشە نوێیەی ئێران وەرگرت. ئێستە، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، تەنیا چەن ڕۆژمانە و گۆڤارێ، بە زمانی کوردیی دەردەچن، هێندێ نامیلکە و پەرتووکیش بە کوردیی چاپکراون. بەڵام، تا ئەوڕۆ، ڕۆڵەکانی گەل لە خوێندنگەکاندا، هەر بە زمانی فارسیی دەخوێنن.
دوای ئەوەی، شۆڕشی گەلانی ئێران ڕوویدا، بۆ ماوەیەک، ئەو گەلانە ئاهێکیان بە بەرداهاتەوە. گەلی کوردیش لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، کەمێ حەوایەوە. زمانی کوردیی وەک جاران نەما، دەسوپێی کرایەوە و لیفەی لە سەر هەڵدرایەوە. ڕۆڵەکانی گەلی کورد، هەلیان لەکیس نەدا، هەر زوو

ئامبازیبوون و دەس لە ملانی بووکی ئازادیی بوون. « خوێنەوار، ڕووناکبیر و نووسەران » ، هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیانەوە، دەسیان بە نووسین کرد. گەلێ « ڕۆژنامە، گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک » ، بە زمانی شیرینی کوردیی دەرچوون. بەلام مەخابن، لەبەرئەوەی کوردەکانی ڕۆژهەلات، دوای ئەوەی، کۆماری کوردستان ڕوخا ، زمانی خۆیان بۆ خوێندن، خوێندنەوە و نووسین لێ قەدەغەکرابوو، کوردییەک بەکاردێنن، لە زۆر ڕووەوە بێ کەلک و لاوازە. بە ڕێنووسێ دەنووسن، گەر کوردەکانی باشوور، سەد ساڵە لەگەڵ ئەو ڕێنووس و زمانەدا ڕاهاتوون، بیخوێننەوە، بە ئاسانیی لێی تێناگەن.!

شارەزایانی زمانی کوردیی، لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دەبێ، کەلک لە توانا و دەسڕەنگینیی نووسەران و زمانزانەکانی باشووری کوردستان وەرگرن. بە تایبەتیی، لقەدیالێکتی سولەیمانیی، گەلێ گەشەیکردووە و خۆی چەسپاندووە. چونکە، نزیکەی ماوەی سەدەیەک دەبێ، هەموو بەشەکانی زمان و وێژەی کوردیی، بە چاکیی پێشکەوتووە. بە گەواهیی دۆست و دوژمنیش، بزووتنەوەی وێژەیی لەم بەشەدا و لە شاری سولەیمانیی، لە هەموو بەش و شارەکانی دیکەی کوردستان لە پێشترە. تەنانەت، یەکێکی وەک:« مینۆڕسکی »ش لەو سەردەمەدا گوتوویەتی:(کوردەکان لە ناوچەی سولەیمانیی و سابلاغ، چاکتر و باشتر و پێشکەوتووترن لە کوردی شوێنەکانی تر. )«169،106»

کوردەکانی ڕۆژهەلات، هەر لە کۆنەوە، لە سەر دەسی مەلا و مامۆستاکانی کوردەکانی باشووردا، فێری خوێندنەوە و نووسینی زمانی کوردیی بوون. بە تایبەتیی لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا، گەلێ خوێندەوار بۆ کوردایەتی، ڕوویان لە مهاباد کرد. جگە لەوەی، لە کۆنەوە زمانی کوردیی، لە باشووردا بەکاردێنرا، هێندێ « ڕۆژنامە، گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک »ی پێ چاپدەکرا. هێندێ لەو بەرهەمانە، بە تایبەتیی دیوانی هۆنراوە، بە دزییەوە دەس خوێنەواران دەکەوت، زۆر بە تامەزرۆیی دەیانخوێنەوە و لەبەریاندەکرد. هەروەها ،چەن ڕووناکبیر و نووسەرێکی وەک:« سەعید ناکام، عوسمان دانش، کەریم زەند، قانعی هۆنەر ... تاد » لەوێ بوون، ڕۆژەی زمانی کوردییان کردووە، خوێندکاری کوردیان پێگەیاندووە. « مەلا ئەحمەدی فەوزی » کە یەکێ لە مامۆستا گەورەکانی کورد و خەلکی شاری

سولەیمانی بوو، لە بەر هەر هۆیەک بێ، لە ناوچەی «موکریان»گیرسابۆوە و مەلایەتیی دەکرد. «هێمن» دەربارەی ئەو پیاوە بلیمەتە دەڵێ:(من دسکردی فەوزیم. ئەو هەڵیوەشاندمەوە و تێکیهەڵشێلام و سەرلەنوێ دروسیکردمەوە. ئەو دەرکی زانین و فێربوونی بۆ کردمەوە. ئەو ڕێگەی ژیانی نیشاندام. بێگومان، ئەگەر نەچووبامە خزمەت فەوزی و لە کن ئەو مامۆستایەم نەخوێندبا، ڕێبازی ژیانم ئەو ڕێبازە نەدەبوو، کەگرتم و پێیدا ڕۆیشتم و ئێستەش بەرم نەداوە.

ئەو تێیگەیاندم من ڕۆڵەی کوردم و کوردیش نەتەوەیەکی بێبەش و چارەڕەش و زۆرلێکراوە و دەبێ ڕۆڵەکانی لە پێناوی ڕزگارکردنیدا فیداکاریی بکەن و لەخۆبوردویی نیشاندەن. ئەو فێری کردم چۆن بنووسم و چۆن شیعر بڵێم. ئەو فێری کردم وڵاتەکەم خۆشبوێ و پێی هەڵبڵێم. ئەو حالیکردم کوردیی زمانێکی ڕەوان و بەربڵاو و دەوڵەمەندە و دەکرێ ئەدەبێکی گەورە و دنیاپەسەندی هەبێ.

ئەو حاجی قادری کۆیی، نالیی، کوردیی، سالم، مەولەویی، حەریق، مەحویی، ئەدەب و وەفایی پێناساندم و شیعرەکانی ئەوانی بۆ شیکردمەوە. ئەو فێری ڕۆژنامەخوێندنەوە و ڕۆمانخوێندنەوەی کردم. ئەو دیوانی شاعیرە شۆڕشگێڕەکانی فارسیی بۆ پەیداکردم و هانیدام بیانخوێنمەوە و شتیان لێ فێربم. بەڵام، سوێندی دام، قەت بە فارسیی شیعر نەڵێم و هەتا بۆ خۆم دەکرێ، بە کوردیی بنووسم.)«10، 121»

پاشان دەڵێ:(فەوزی بە بڕوای من یەکێکە لە گەورەپیاوانی مێژووی کوردستان، کە داخەکەم شوێنەوارەکانی فەوتان و خۆشی لە بیرچۆتەوە. ئەو لاوە کوردانەی لە سەردەمی پاشایەتی ڕەزاخانی پەهلەویدا کە بە تەقلیدی ئەتاتورک خەریکبوو، گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بتوێنێتەوە و یەکێ لەو سێ کوچکە ئاورەبوو کە پەیمانی سەعدئابادی پێکهێنابوو، ئازایانە کوردایەتیان دەکرد، یا ڕاستەوخۆ شاگردی فەوزی بوون یا شاگردی شاگردەکانی ئەو. بە تایبەتیی پێشەوا قازی موحەممەدی شەهید شانازی بەوەوە دەکرد کە شاگردی فەوزی بووە.)«11، 121»

پاشاتر دەڵێ:(ئێمە یانی ئەو پۆلە لاوەی لە زەمانی پەهلەویەوە یەکترمان گرتبوو و دۆستانە پێکەوە کارماندەکرد. مەیدانمان بۆ ئاوەڵابۆوە و چالاکی خۆمان پەرەپێدا. دەماننارده عێراق ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیان بۆ دێنانین و دەمانخوێندەوە. من شیعری خۆم و شیعری شاعیرەکانی ترم بە خەت بۆ لاوەکان دەنووسیەوە و بڵاومدەکردنەوە. دلشادی ڕەسوولی لە عێراقەوە

هاتبۆوە. ئەو ئیملای کوردیی لە هی ئێمە باشتربوو و خەتیشی خۆشتربوو و زۆریشی شیعری بێکەس و پیرەمێرد و ئەحمەد موختار جاف و حەمدی لەبەربوون و بە خەت بلاویدەکردنەوە. گۆڤاری گەلاوێژ رۆلێکی باشی یاریکرد و لاوەکانمان فێری کوردیی خوێندنەوە بوون.)«19، 121»

ئەمە، پوختەی ئەو ئەزموونە گەورەیە بوو، کە « هێمن »ی پایەبلندی کورد، بۆی تۆمارکردووین. بۆیە دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام، کەلک لەو ئەزموونە گەورەیەی باشووری کوردستان وەرگیرێ. پێویست ناکا، نووسەر و روناکبیرانی رۆژهەلات، هەر لە خۆیانەوە، یا چاو لە فارسەکان کەن، زاراوەی زمانەوانیی داتاشن، سەر لە خۆیان و رۆلەکانی نەتەوەکەمان بشێوێنن. بەلکوو دەبێ، هەولدەن، ئەوا زاراوە زمانەوانییانە بەکاربێنن، کە لە کۆنەوە لە باشووردا بەکاردێ و تا رادەیەکی زۆر چەسپیوە. بۆ نموونە: لە بری ئەوەی بنووسن: « لە نووسراوێکدا، رێکخراوی » دەنووسن: « لە نووسراوەیەکدا، رێکخراوەی ». لە راستیدا، ئەمە ناکرێ، هەر نووسەر و پارچەیەک، بە ئارەزووی خۆی بنووسێ. چونکە، گەر وا بێ، هەرگیز رێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی سەر ناگرێ!

هێندێ لەو «گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک »انەی، لە دوای سالەکانی حەفتا و لە سەرەتای هەشتاکاندا چاپکراون، لە هەموو روویەکەوە کەموکوڕییەکی زۆریان تێدا بەدیدەکرێ. بە تایبەتی، ئەوانەی لە ناوەوەی وولات نووسراون. گەر خوێنەری هێژا، ئەم دید و بۆچوونەم لێ ناسەلمێنێ، با بفەرمووێ، تەماشایەکی هێندێ لەم بەرهەمانەی خوارەوە بکا :

1. کریس کۆچێرا، مێژووی کورد لە سەدەی 20 و 19دا، وەرگێرانی لە فرەنسییەوە محەمەد ریانی.

2. محەمەد صالحی ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل)، ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست.

3. هێمن، پاشەرۆک، لە بلاوکراوەکانی سەییدیان.

گەلێکی دیکەش هەن، پێویست بە ناوهێنانیان ناکا، کە بە راستیی، نە رێنووسیان لە رێنووسی کوردیی دەچێ، نە لە وەرگێران و نووسینی بەرهەمەکانیشدا سەرکەوتوون، نە هێز و پێز و دارشتنێکی ئەوتۆیان هەیە،

مرۆ دڵی پێ خۆشکا و کوردییەکەی لەم دووره وولاتییەدا پێ دەمەزەردکاتەوه. جگه لەوەی، هیچ جۆره دەستوورێکی نووسین و زامانەوانیی تێدا رەچاو نەکراوه. بە دەیان پێشگر و پاشگری تێدایه، به جیا و دوور له چاوگ و کردارەکانەوه نووسراون. « واو »ی ئامرازی لێکدەر، زۆر بە کەمی بەکارهێنراون. هەر ووشەیه به سەر چەند بڕگەیەکدا دابەشکراوه و دوور له یەکدییەوه ڕیزکراون. ئامرازی لێکدەر و پێوەندیی، لە پیتی ووشە هەڵوەشێندراوەکان جیا ناکرێنەوه. به گران نەبێ، لاپەڕەیەکت بۆ ناخوێندرێتەوه. تا پەرتووکێ تەواودەکەی، دەبێ، کاتێکی زۆر به لێوردبوونەوه و بردنەوەسەریەکی ووشه و واتاکانیان بەسەربەری. هەر چۆنێبێ، گەر سەرەتای هەموو کارێ وا دەس پێ نەکرابێ، دەمگوت: نەبوونی له بوونی باشتره!
بۆیه دەتوانم، بڵێم: نووسینی کوردەکانی ڕۆژهەڵاتم، وەک نووسینی کوردەکانی باشووری کوردستانی، سەرەتای سی و چلەکانی سەدەی بیستەم دێته پێش چاو. تازه وەک خوێندکارێکی ساوا، لەو خوێندنگه گەورەیەی زمان و وێژەی کوردیدا پەلدەهاوێژن و دەیانەوێ، له سەرەتاوه و له پۆلی یەکەوه دەسپێبکەن. ئەمەش، هیچ ئەنگییەکی تێدا نییه، کارێکی گەلێ باشه، گەر باسکی مەردانەی لێ هەڵماڵن، چاو لە کوردی باشوور کەن، ئەو گەنجینه گەورەیەی زمان و وێژەی کوردیی، که له ماوەی حەفتا هەشتا ساڵێکدا نووسراوه و گردکراوەتەوه، به جوانی کەڵکی لێ وەرگرن. سەرەتای هەموو کارێکیش، هەروا دەسپێدەکا و گەلانی بندەسی جیهانیش، هەو وایان کردووه.
لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، تا ئێستە، یەک ئەلفوبێی کوردیی، بۆ هەر دوو بەشەدیالێکته سەرەکییەکەی زمانی کوردیی «کرمانجیی خواروو و ژووروو» نییه، هەر چەندە، ئەو ئەلفوبێیانەی هەشن، دیسانەوه یەککگرتوو نین. له دوای ڕێککەوتننامەکەی «11/مارسی/1970»شەوه، زمان و نووسینی کوردیی، جۆره پێشکەوتن و گەشەکردنێکی تایبەتیی به خۆیەوه بینی. دەوڵەتی بەعس، بە ڕەسمیی دانی به هێندێ له مافه نەتەوەیی و کەلتوورییەکانی گەلی باشووری کوردستاندا نا. بەپێی خاڵی یەکی ئەو

ڕێککەتننامەیە، (زمانی کوردیی، وەک زمانی یەکەم لەو ناوچانەدا کە زۆربەیان کوردبوون، وەک زمانی دووەم لە عێراقدا بەکاردێنرا.)«354،19». یەکێتی نووسەرانی کورد، لە نووسین و پەخشوبڵاوکردنەوەی کوردیدا، ڕۆڵێکی لەبەرچاویان گێڕا. مامۆستایانی کوردستان، پەرتووکی خوێندنگەکانیان بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕا. «کۆڕی زانیاریی کورد» دامەزرا، هێندێ پرینسیپیان بۆ ڕێنووسی زمانی کوردیی دانا.

بە کورتییەکەی، هەلێکی زێڕین، بۆ بوژاندنەوە و گەشەسەندنی زمانی کوردیی ڕەخسا. لە هەموو لایەکەوە، هەوڵێکی زۆر بۆ پێشخستنی زمان و فەرهەنگی کوردیی درا. بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا،هێشتا زمانێکی ستانداردی نووسین، ئەلفوبێیەکی یەککرتوو و ڕێنووسێکی دیاریکراو، لە باشووری کوردستاندا نەچەسپیوە. گەڕەلاوژێییەکی سەیر پەیدابووە، بە تایبەتیی لە نوسینی ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستاندا، ئەم پاشاگەردانییە، بە ئاشکرا دەبینرێ. جگە لەوەی تا ئێستەش، هەر دوو ناوچەی «بادینان و سۆران»، هەر یەکە بە لقەدیالێکتی خۆیان دەنووسن. گەر چی، لە ژێر سایەی دەسەڵاتی «پارتی دیمۆکراتی کوردستان»دا، تا ئێستەش، لە زۆربەی ناوچەکانی «بادینان»، هەر بە زمانی عەرەبیی دەخوێنن و دەنووسن!

کوردەکانی خۆراوای کوردستان، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، بە ئازادیی بە زمانی کوردیی دەیاننووسی. بەڵام کاتێ لە ساڵی «1945»دا، دەوڵەتی سووریا دامەزرا، ئیدی ئەو مافە ڕۆشنبیرییەشیان لێ زەوتکرا.

ئەو کوردانەی، بە کۆمارەکانی سۆڤیەتی هەڵوەشاوەشدا بڵاوبوونەتەوە، وەنەبێ، باری خوێندن و نووسینیان، لە باری کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان باشتربووبێ. پێش ئەوەی، کۆمۆنیستەکان دەسەڵات وەرگرن، زمانی کوردیی بە زمانێکی سەربەخۆ دا نەدەنرا. بە شێوەیەکی گشتیی، کورد بە زمانی خۆی نەیدەخوێن. ئەلفوبێیەکی کوردیی دیاریکراوی نەبوو. تەنانەت، هێندێ لە ڕۆژهەڵاتناس و زمانزانەکانی «رووس»یش، زمانی کوردییان بە دیالێکتێکی زمانی فارسیی دادەنا! هەر چی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی زمانەوانیشیان، لە سەر زمانی کوردیی دەکرد، هەر بۆ ئەو

مەبەستەبوو. (بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن، کوردناسیی لە وەزعێکی ژێردەسیدا بوو. زمانی کوردیی دەخوێنرا و لێی دەکۆڵرایەوە، نەک وەک زمانێکی تایبەتیی، نەک وەک زمانی نەتەوەیەک، بەڵکوو وەک کەرەسەی یاریدەدەر بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی فارسیی کۆن. لە باتی ئەوەی کوردناسیی لەو ژێردەسییە ئازادکرێ و شێوەیەکی سەربەخۆ وەرگرێ، کەچی هەندێ لە کوردناسان دەسیانکرد بەوەی، کە کوردناسیی بە ڕێگەیەکی چەوتا بەرن.) «70،78»

کوردەکانی « سۆڤیەت »یش، جۆرە ئەلفوبێیەکی سریالیان بۆ خۆیان داناوە. (لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە، هەلیان بۆ هەڵکەوت، بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن. لە «1921»دا ئەلفوبێیەکی لاتینیی بە تیپی ئەرمەنیی بلاوکرایەوە. بەڵام، پاش ئەوەی تاکە کتێبێکی پێ دەرچوو، زانرا کە ئەم ئەلفوبێیە بە کاری نووسینی کوردیی نایەت. ئەوەش بوو بە هۆی ئەوەی تا «1929»، هەموو جۆرە نووسینێکی کوردیی بوێستێ. هەتا لەو ساڵەدا، دوو کەس: «عەرەبی شامۆ و مارەگۆلێف»، ئەلفوبێیەکی لاتینیان دانا و لە «1930/1/1»دا، بە شێوەیەکی ڕەسمیی خرایەکار. بەڵام، ئەم ئەلفوبێیە، بە داخەوە زۆر نەژیا و گۆڕا بە ئەلفوبێی سریالی، کە لەگەڵ سروشتی زمانی کوردیدا، بە هیچ جۆرێک ڕێک ناکەوێ. ئەلفوبێی سریالی، بە زۆری لە ساڵی «1946»ەوە بەکاردەبرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، زانا کوردەکانی ئەوێ هەستیان بە ناتەواویی ئەم ئەلفوبێیە کردووە. لەبەرئەوەیە جاروبار، لە سنووری توانستیاندا، هەر بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسن.) «84،23»

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، دەڵێم: ئەز لەو بڕوایەدام، لەگەڵ ئەوەشدا، زمانی کوردیی، لە چەن دیالێکت و خواردیالێکتێ پێکهاتووە، ئێمەی کورد، بناغەی زمانێکی ئاخافتنمان هەیە. بەڵام تا ئێستە، زمانێکی یەکگرتووی نووسینمان نییە.

هەر چەندە، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژووی نەتەوەی کورددا، بەپێی دەسەڵاتی ڕامیاریی، لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا، هەر سەردەمەی دیالێکتێ یا خواردیالێکتێ، وەک زمانی نووسینی ئەو سەردەمە، خۆی لەو

ناوچەیەدا سەپاندووە. تا ڕادەیەکیش، لە سنووری دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە پەڕیوەتەوە، لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە.
بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، ئەو جۆرە خۆسەپاندن و بڵاوبوونەوەیە، لە لایەکەوە نەیتوانیوە، لەوە زیاتر بڕکا، زمانێکی یەکگرتووی ئاخافتن و نووسین، پێکەوە نێ. لە لایەکی دیکەشەوە، لە نرخی دیالێکتەکانی دیکەی، زمانی کوردیی کەم نەکردۆتەوە. بەڵکوو، لە پاڵ ئەوەشدا و لە هەر ناوچەیەکدا، کوردەکانی دانیشتووی ئەو ناوچانە، بە دیالێکت و خوار دیالێکتی خۆیان پەیڤیون. هیچ زیانێکی بەو دیالێکتانەی دیکە نەگەیاندووە. چونکە، زمانی قسەکردن و زمانی ستاندارد، بە دوو شتی جیاواز دادەنرێن.

# 12. زمانی کوردیی و هۆنراوە :

« مەلا عەبدولکەریمی مودەریس » ، دەفەرموێ: (لە کۆشی ئەم کوردەوارییەی ئێمەدا، گەلێ ئەدیبی پایەبەرز پەردەوەردەبوون، کە بە گوێرەی سەردەم و رێوشوێنی خۆیان، هیچیان لە ئەدیبانی بە ناوبانگی وولاتانی تر کەمتر نەبووە. بەڵام، کەمیان بۆیان هەڵکەوتووە، لەگەڵ مردنیانا، ناویان کوێر نەبێتەوە و نیشانەیەکیان لە پاش بەجێبمێنێ و هەواڵێکی کەموکورتیان بزانرێ.) «3،54»

بەڵێ، نەتەوەی کورد لە مێژووی خۆیدا، گەلێ هۆنەری گەورە و گچکە، ناسراو و نەناسراوی هەبووە. بۆیە، لەو بارەیەوە رۆژهەڵاتناسێکی گەورەی وەک: « مینۆرسکی » ، گوتوویەتی: (هونەری هۆنراوە لە ناو کوردەکاندا زۆر فراوانە.) «88،112» جا گەر نەتەوەیەک، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، بە سەدان هۆنەری تێدا هەڵکەوتبێ، هەڵبەتە، بە کارێکی ئاسایی دەژمێررێ، گەر پێوەندییەکی توندوتۆڵ، لە نێوان هۆنراوە و زمانەکەیدا هەبێ!

لە باسەکانی پێشوودا گوتمان: یەکەمین نووسینی کوردیمان بە دەسگەیشتبێ، هۆنراوەکانی « بابا تایەری هەمەدانیی » بوون. ئەو هۆنراوانە، بە زمانی کوردیی و بە دیالێکتی لووڕیی نووسراون. گەر هۆنراوەکانی « باباتایەر » ، لە مێژووی وێژەی کوردیی بە گشتیی و لە بواری هونەری هۆنراوەدا بە تایبەتیی، یەکەم نووسینێکی کوردیی بێ و بە دەسمانگەیشتبێ، ئەوا گومانی تێدا نییە، یەکەم جار نووسینی کوردیی، هەر بە هۆنراوە دەسیپێکردووە. وەک پرۆفیسۆر « مارف خەزنەدار »یش دەڵێ: (ئەدەبی کوردیی وەکو ئەدەبی نەتەوەکانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە شیعر دەسیپێکردووە. شیعر لە پێشەوە بووە و هەمیشە لە پەخشان باوتربووە.) «73،96» گەر نووسینی کوردیی، بە هۆنراوە دەسیپێکردبێ، دەبێ، هۆنراوە لە زمانی کوردییدا، چ جۆرە رۆڵێکی گرنگی بینیبێ؟ بە چ شێوەیە، راژەی زمانی کوردیی کردبێ؟

هەمووومان دەزانین، بە تایبەتیی لەو سەردەمانەدا، خوێندەواریی لە ناو ریزەکانی نەتەوەی کورددا نەبووە. یا هەبووە، بەڵام زۆر کەمبووە. جگە

لەوەی خوێندن و نووسین، بە زمانی کوردیی نەبووە، هۆنراوەکانیش هەر بە دەمی گوتراون، دەماودەم و ناوچەبەناوچە ڕۆیشتوون و بڵاوبوونەتەوە، پاشان، کاتێ خوێندن و نووسین پەیدابووە، نووسیویانەتەوە. یا خوێندن و نووسین هەبووە، بەڵام لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا، زۆر بە کەمی بڵاوبووە، زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی کورد نەخوێندەواربوون. ئا لەو کات و ساتە مێژوویی یانەدا، لەو ڕۆژە تاریکونووتەکانەدا، هۆنراوەی کوردیی بە چەن شێوەیە، ڕاژەی زمانی کوردیی کردووە :

1. لە فەوتان و لەنێوچوون پاراستوویەتی.
2. لە قالبێکی وێژەیی بەرز و جواندا، دایرشتووە و ڕازاندوویەتییەوە.
3. بە شێوەیەکی بەردەوام، بوژاندوویەتییەوە، گەشەی پێ کردووە و پێشیخستووە.
4. بە ووشەی نوێ، ناسک و شیرین، دەوڵەمەندیکردووە.
5. ئەو نیمچە زمانە ستانداردەی ئەوڕۆ، لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستاندا هەیە، بە زۆری بۆ هۆنراوە و بەرهەمی هۆنەرەکان دەگەڕێتەوە.
6. خەرمانی هۆنراوەی کوردیی، وەک سامانێکی دەوڵەمەند وایە، لە هەموو سەردەمێکدا، بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی بەکاردێنرێ. چونکە، مێژووی وێژەی کوردیی، (نزیکەی هەزار ساڵ دەبێ.) «104،78» هەڵبەتە، لەو ماوە درێژەدا، گەلێ هۆنەر هەبوون، بەرهەمی وێژەییان هەبووە، بەرهەمەکانیان بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی زمانی کوردیی، بایەخی تایبەتییان هەیە.

شتێکی ئاشکرایە، لە کۆندا کورد، دەمی لە باسەکانی « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و زانست » نەداوە. یا زۆر کەم، خۆی لە قەرەی ئەو باسانە داوە. چونکە، هەم توانای نەبووە، خۆی لەو بوارانە بدا، هەم ئەو جۆرە باس و نووسینانە، لە کوردستاندا بڵاو نەبووبوونەوە، تا کوردیش بەپێی توانای خۆی، لە سەریان بنووسێ و باسیانکا. بەڵکوو، پتر لە بوارەکانی « مەتەڵ، پەندیپێشینان، گۆرانیی، مۆسیقا و هۆنراوە »دا، دەسڕەنگینیی خۆی نواندووە. (زمانی کوردیی، لەبەرئەوەی خوێندن و نووسینێکی کۆمەڵایەتیی و زانیاریی و ڕامیاریی نەبووە، لە درێژایی مێژوودا، تەنیا لە باری هۆنراوە و مۆسیقا و مەتەڵ و پەندیپێشینانەوە

توانیوێتی خۆی ڕاگرێ، وە لە پێشهاتە نالەبارەکانی مێژوو خۆی بپارێزێ.
لە سەدەکانی پاش داهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، واتە: لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە تا سەدەی دوازدەیەم و سیازدەیەمی کۆچی، زۆربەی هۆنەر و هەستیارەکانی کوردستانی خواروو، بە شێوەی گۆرانی هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە، وە لەم شێوە کوردییەدا، وێژەی کوردییان گەیاندۆتە، ئەو پەڕی بەرزیی، چونکە لە ڕێکوپێکیی و جوانیی ناوەڕۆک و بیری ناسکدا شتی تریان نەهێشتۆتەوە کە لە هۆنراوەکانیانا جێیکەنەوە.)«16-15،48»
دیارە، هەر لە کۆنەوە هۆنراوە و زمان، شانبەشانی یەکدی هەنگاویان ناوە. پێبەپێی «کارەساتە نەتەوەیی، گۆڕانکارییە ڕامیاریی، گەشەکردنە کۆمەلایەتیی، پەرسەندنە ئابووریی و پێشکەوتنە کەلتووریی یەکان» گۆڕاون. پێوەندییەکی دیالێکتیکی توند، لە نێوانیاندا هەبووە، پێکەوە بەرەو پێشەوە چوون و گەشەیانکردووە.
سەرەتا، نووسینی کوردیی تەنیا، بە هەر دوو بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو و هەورامیی بووە. هەر چەندە، تا ئێستە، بە تەواویی نازانین، نووسین بە هەورامیی، بۆ چ سەردەمێ دەگەڕێتەوە. بەلام، هێندەمان لا ڕوونە، لە زۆر کۆنەوە، بەم بەشەدیالێکتە نووسراوە. بەلگەشمان ئەوەیە، بە هەر دوو بەشەدیالێکتەکە، گەلێ نووسین و هۆنراوەمان هەیە. هەر چەندە، ئەو نووسینانەی تا ئێستە لە بەردەسدان، بەشی زۆریان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک تۆمار نەکراون و لێکۆلینەوەی زانستانەیان لە سەر نەکراوە. ئەوە جگە لەوەی، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا، گەلێ نووسین و کەرەسەی وێژەیی دیکەمان، بەم دوو بەشەدیالێکتەش، سەرەونگوم بوون و تێداچوون.
لە سەردەمە جیاوازەکانی کۆمەلگەی کوردەواریدا، بەپێی دەسەلاتی ئەو دەولەت و میرنشینە کوردییانەی دامەزراون، لە هەر ناوچە و لە هەر سەردەمێکدا، دیالێتکێ یا خواردیالێکتێکی دیاریکراو، خۆی بە سەر زمانی ئاخافتن و نووسیندا سەپاندووە. هەر بەو دیالێکتەش، هۆنەرەکانی کورد هۆنراوەیان گوتووە. بۆ نموونە: « بابا تایەر، مەلا پەرێشان ... »، هۆنراوەکانی خۆیان بە دیالێکتی « لووڕی » هۆنیوەتەوە. دوای ماوەیە،

دیالێکتی « گۆرانیی » بەشی « هەورامانیی » سەریهەڵداوە، هۆنەرە گەورەکانی وەک: (مەولەویی، بێسارانیی ...) بەو دیالێکتە هۆنراوەکانی خۆیان داڕشتووە. بە تایبەتیی، پێش ئەوەی ئایینی ئیسلام، لە کوردستاندا بڵاوبێتەوە، زمانی ئایینە کۆنەکانی کورد، یا بەم بەشەدیالێکتە نووسراونەتەوە، یا زۆر لێوەی نزیکبوون.

هەروەها، دوای ئەوەی ئایینی ئیسلامیش پەیدابووە و لە ناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە، تا ماوەیەکی دوورودرێژ، ئەو ئایینە کۆنانەی کورد، لەو ناوچانەدا برەوی خۆیان هەبووە. چونک،ە ئایینی ئیسلام(زۆر درەنگ لە هەورامانا بڵاوبووەتەوە و مێژووی بڵاوبوونەوەی لەوێدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەولانا گوشایش سالی « 842 »ی کۆچی « 1438ز ـ نووسەر » ) «13،100»

دیارە، کاتێ ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، یەکسەر لە هەموو ناوچەکاندا، وەک یەک بڵاونەبۆتەوە. بۆیە، هەر وەک لە ناوچەی هەورامانیشدا، لە یەکەم ڕۆژی داگیرکردنی کوردستانەوە، دەنگ و ڕەنگی هەبووە، بەڵام ئەو دەنگ و ڕەنگە، هەرگیز وەک ناوچەکانی دیکەی کوردستان نەبووە. لێرەدا، مەبەس لەوەیە، زۆر بە قووڵی ڕەگی لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا دا نەکوتاوە، بە تەواویی، کاری لە هەست و هۆشیان نەکردووە. لەوانەیە، ئەرکە ئایینییەکانیشیان بە تەواویی جێبەجێ نەکردبێ! چونکە، لە لایەکەوە، ئایینە کۆنەکانی کورد، تا ماوەیەکی زۆریش، دوای ئەوەی ئیسلام دەنگی دایەوە، هەر مابوو، هەم زمانی ئاخافتنی خەڵکی ناوچەکە و هەم ئایینەکەشیان کوردیی بووە. لە لایەکی دیکەشەوە، هێشتا مزگەوت، تەکیە و خانەقاکان دروس نەکرابوون. مەلا، شێخ و زانا کوردە موسوڵمانەکان، بە تەواویی خۆیان بۆ ئایینەکە تەرخان نەکردبوو. لە باوەڕ و بیدەکانی ئایینە نوێکە تێنەگەیشتوون. خەڵکیان هان نەداوە، وشیاریان نەکردنەتەوە و پێیان نەگەیاندوون. تا پیاوێکی ئایینیی لە خواترسی وەک: « مەولانا گوشایش » هاتووە، بناغەی مزگەوتی هەڵداوەتەوە، دەسی بە کارکردووە، وەک ڕێبەرێکی ئایینیی لە ناوچەکەدا، خەڵکی فێری نوێژ و قورئانخوێندن کردووە. ئامۆژگارییەکانی پەیامبەر و ئیسلامی بۆ

باسکردوون. ڕێگەی خواپەرستیی ڕاستەقینەی پیشانداون. لەو بارەیەوە، « مەردۆخی » دەڵێ: (دانیشتووانی هەورامان، هەر چەندە موسوڵمان بووبوون و نوێژ و ڕۆژو و یاساکانی ئیسلامیان بەجێدەهێنا، بەڵام هێشتا هەندێ خووڕەوشتی زەردەشتییان تێک نەدابوو، تا ساڵی « 842 »ی کۆچی « مەولانا گوشایش »بابا گەورەی مەردۆخییەکان هات و دەسیکرد بە فێرکردنی قورئان و بڵاوکردنەوەی یاساکانی ئیسلام بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە ناوچەی هەورامانـدا. سەرەڕای ئەوەی نزیکەی هەشت سەدەونیو بە سەر ئەم گۆڕانەدا تێپەڕیبوو، ئەیانویست، لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە و یاخبنەوە و بگەڕێنەوە سەر دینەکەی « پیر شەهریار »* کە بە یەکێ لە پیاوچاک و بڵاوکەرەوەی ئایینی زەردەشتییان زانیوە لە ناوچەکەدا. )«106، 187-188»

پاشان بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو خۆی سەپاندووە، چەن هۆنەرێکی پایەبڵندی وەک:« مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی و ... »هۆنراوەیان پێ گوتووە. دواتریش، لە سەردەمی بابانەکاندا، بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو پەرەیسەندووە. هەر چەندە، تا ئێستە بە تەواویی نازانین، نووسینی کوردیی، بە تایبەتیی هۆنراوەی کوردیی، بە بەشەدیالێکتی «کرمانجیی خواروو » کەی دەسپێکردووە؟ بەڵام دەتوانین، بڵێین: لە سەرەتای ساڵەکانی بیستی سەدەی نۆزدەیەمەوە، بە شێوەیەکی هونەریی و ڕێکوپێک سەریهەڵداوە. ئەم مێژووەش، میرنشینی بابان و «نالیی1797-1855 » هۆنەر و بلیمەتمان بیردەخاتەوە.

لە ڕاستیدا، لەو سەردەمەدا قوتابخانەی بابان، پرشنگی زێڕینی خۆری وێژەیی خۆی، بە زۆربەی سوچ و قوژبنەکانی، باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بڵاوکردۆتەوە. بە تەواویی ڕەگی قووڵی، لە مێژووی خەباتی نەتەوە و کاروانی وێژەی کوردیدا داکوتاوە. سەرەتای قۆناغێکی نوێی، بۆ هۆنراوەی کوردیی داناوە. بە هەموو واتای ووشە، بوومەلەرزەیە بووە، لە گۆمێکی مەنگی بێدەنگی وێژەی کوردیدا ڕوویداوە و بە جارێ ئەو گۆمە

---

* پیرشەهریار و پیرشالیار هەر یەکن.

مەنگەی تەقاندۆتەوە،(کۆدەتایەکی سەرەکیی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، لە سەر دەسی سێکوچکەی بابان « نالیی و سالم و کوردیی » بەرپابوو، ئەم ئینقیلاب و تازەکردنەوەیە، بە ڕابەرایەتی مامۆستا نالیی بوو.)« 6،13 »
بۆیە، تا کوردێ مابێ، دەبێ، سەری ڕێز و نەوازش، بۆ ئەو سێ ئەستێرە گەشەی، ئاسمانی وێژەی کوردیی دانەوێنێ.
هۆنەرە بە ناوبانگەکانی وەک:(نالیی، مەحویی، کوردیی و سالم ...) هۆنراوەکانی خۆیان بەم خواردیالێکتە هۆنیوەتەوە. ئەو کەڵەهۆنەرانە، گەلێ هەنگاوی گەورەیان ناوە، بە شێوەیە، تا ئەوڕۆش ئەو شێوە وێژە و دیالێکتە، جێگەی خۆی، لە وێژە و نووسینی، بەشێکی زۆری کوردەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستاندا کردۆتەوە. لە هەر یەکێ لەم قۆناغە مێژوویی یانەشدا، هەر یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، ڕاژەیەکی گەورەی زمانی کوردییان کردووە.
بەڵێ ڕاستە، هۆنراوەی کلاسیکی کوردیی، لە سەردەمی بابانەکاندا، لە ناوچەی سولەیمانیدا سەریهەڵدا. ڕاستە « نالیی، سالم و کوردیی »، لە مێژووی وێژەی کوردیدا، بە سێ کەڵە هۆنەری گەورەی کورد دادەنرێن.
ڕاستە، ئەم سێ هۆنەرە بلیمەتە، قوتابخانەی هۆنراوەی کلاسیکیی کوردیان دامەزراند. زمانی کوردییان پێشخست، وێژەی کوردییان بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو زیندووکردەوە، گیانێکی نوێ و ڕەسەنیان، بە بەری وێژەی کوردیدا کرد و بووژاندیانەوە. بەڵام، هەر چەندە ئەمان دامەزرێنەری بوون، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی، هەموو قوژبن و کەلەبەرێکی ئەو قوتابخانە وێژەیی یە، بە تەواویی پڕکەنەوە. بەڵکوو، لە ڕووی « زمان، داڕشتن، ڕەوانبێژیی و جوانناسیی »ەوە، هەر چی کەموکوڕییەکی هەبوو، هۆنەری گەورەی کورد « مەحویی »، ئەوی پێی کراوە، کردوویەتی.
« مەحویی »، بەپێی توانای خۆی هەوڵیداوە، کەموکوڕییەکانی پڕکردوونەتەوە. پاشان چەندین هۆنەری وەک(شێخ ڕەزای تاڵەبانیی، حەریق، حەمدیی، ناریی، کەمالیی و بێخود ... تاد) هاتوون، زیاتر گەشەیان بەو قوتابخانەیەکردوە. تا ئەوڕۆ دەبینین: لە چڵەپۆپەی وێژەی کوردیی تێپەڕاندووە.

ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، باسێکی زمانی هۆنراوەکان بکەین، بۆ ئەوەی بزانین، ئەو هۆنراوانە بە چ زمانێ نووسراون؟ چۆن پێشکەوتوون؟ کەی زمانی کوردیی پەتیی، لە هۆنراوەی کوردیدا پێڕەوکراوە؟
لە سەرەتادا، هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، بەگوێرەی ئەو تێکەڵاوییەی لەگەڵ نەتەوەکانی دەروردراوسێدا هەیانبووە، هەروەها، بە گوێرەی ئەو سەردەمەی ئەو نەتەوانە، لە کوردستاندا دەسەڵاتیان هەبووە، هۆنراوەکانی خۆیان، بە زمانێکی تێکەڵاوی « کوردیی ـ فارسیی، کوردیی ـ عەرەبیی، کوردیی ـ تورکیی » هۆنیوەتەوە. بەشی زۆری هۆنراوەی کلاسیکی کوردیی، سەریان رووتبووە، لە کڵاو و جامانەی کوردیی بێبەشکراون. بەڵکوو، تەپلەی « فارسیی، چەفتە و عەگالی عەرەبیی، تەرپووشی تورکیی »ان لەسەرکردووە. بە تایبەتیی زمانی عەرەبیی، کارێکی زۆری لە نووسین و زمانی کوردیی کردووە. چونکە، قورئان و گوتەکانی پەیامبەر، کە زمانی ئایینی ئیسلامن، کارێکی وا خراپیان، لە بیروباوەڕی خەڵکی کورد کردبوو. یا بڵێین: ئەوان وا لە کێشە و باسەکە گەیشتبوون، بە شێوەیە دەماری هەست و هۆشی نەتەوەیی یان سڕکردبوون، زمانی کوردییان بە زمانێکی خراپ و ناموسوڵمان دادەنا. لەبەرئەوە، خوێندەوارانمان گەر بە کوردیش نووسیبێتیان، هەوڵیانداوە، گیانێکی ئیسلامانە، بە بەر نووسینەکانیاندا بکەن. هەمیشە، بە دوای ووشەی بیانیی قەبەقەبە، زلزل، قورسقورس و ئاڵۆزدا گەڕاون، تا کێش و سەرەوای، هۆنراوەکانیانی پێ برازێننەوە و لەنگ نەبێ.
هەڵبەتە، لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا، چ هۆنراوە و چ زمان، لە گۆڕانێکی بەردەوامدابوون. بەرەبەرە، زمانی هۆنراوە پاکبۆتەوە. هۆنەرەکانی کورد، هۆنراوەکانیان بە کوردییەکی پەتیی هۆنیوەتەوە. ئیدی، وردەوردە، کاری لە زمانی کوردییش کردووە، بەرەو کوردییەکی پەتیی بردووە. لە ووشەی بیانیی پاکیکردۆتەوە. لەو ڕێیەشەوە، کارێکی زۆری، لە بەشەکانی دیکەی وێژە بە تایبەتیی و زمانی ئاخافتن بە گشتیی کردووە. بۆیە، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، زمانی هۆنراوە بە تایبەتیی و زمانی کوردیی بە گشتیی، بە چەن قۆناغێکی پاکبوونەوەدا تێپەڕبووە :

قۆناغی یەکەم ـ هەموو ئەو هۆنەر و نووسەرە کلاسیکییانە دەگرێتەوە، کە بە زمانێکی نیوە « کوردیی ـ عەرەبیی » تێکەڵاو نووسیوویانە، زمانی ئایین کارێکی زۆری لە زمانە نەتەوەیی و وێژەیی یەکەیان کردووە. وەک لە هۆنراوە ڕۆمانسییە کلاسیکییەکانی « مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی، نالیی، مەحویی ... هتد »دا دەردەکەوێ.

قۆناغی دووەم ـ هۆنەر و و نووسەرەکانی کورد، بە زمانێکی تایبەتیی نووسیویانە، وردەوردە، زمانەکەیان لە ووشەی بیانیی پاکبۆتەوە، بەڵام، بە تەواویی کوردییەکی پەتییان بەکار نەهێناوە، وەک لە هۆنراوەکانی « شێخ نووری شێخ سالح » و سەردەمی یەکەمی « گۆران »دا دەردەکەوێ.

قۆناغی سێیەم ـ هۆنەر و نووسەرەکانی کورد، باسکی چالاکییان لێ هەڵماڵیوە، بژارێکی باشی زمانەکەیان کردووە، بە زمانێکی ڕەوان و کوردییەکی پەتیی نووسیویانە، وەک « پیرەمێرد »، سەردەمی دوواییی «گۆران » و هۆنەر و نووسەرەکانی دواتریش بەرهەمەکانی خۆیان بەو شێوە زمانە تۆمارکردووە. (لە زۆربەی نووسینەکاندا، ئەو زمانە ئەدەبییە ناوەندییە ئەبینین، کە لە شێوەی ڕۆمانتیکی کوردیدا، بە تایبەتی لە شیعری شێخ نووری و سەردەمی یەکەمی گۆراندا بەکارهاتووە. واتە نە زمانە تێکەڵەکەی شیعری کلاسیکیی یە « جزیریی، خانیی، نالیی، مەحویی ... هتد »، نە کوردیی پەتیی تەواوە « پیرەمێرد، سەردەمی دوواییی گۆران و پاش ئەو ». یا لە هەندێ شوێندا بەرەو کوردیی پەتیش چووبێ.)«22،12»

ئەوانەی، ڕاژەی زمانی کوردییان کردووە، ئەوانەی، کێڵگەی زمانی کوردییان، لە دڕکوداڵی ووشەی بیانیی بژارکردووە، زمانێکی پوختیان بۆ گەڵاڵەکردووین، دەبێ، تا مێژووی کورد هەیە، بە شانازییەوە ناویان تۆمارکا و هەمیشە یادیانکاتەوە. چەن «کەڵەپیاو، نووسەر و هۆنەر »ێکی وەک: « ئەورەحمان بەگی بابان، شێخ نووری شێخ سالح، پیرەمێرد، عەبدوڵلا گۆران و ڕەشید نەجیب »، لە نووسەرە هەرە دەسڕەنگینەکانی کورد بوون، کە لە سەر دەسی ئەواندا، قوتابخانەی کلاسیکیی هۆنراوەی کوردیی نوێنکراوەتەوە. سەرەتای قۆناغێکی تازەیان، لە مێژووی وێژەی کوردیدا دامەزراندووە. بەرگی کۆنی لە کارکەوتووی هونەرییان، لە بەر

هۆنراوەی کوردیی داماڵیوە، جارێکی دیکە سەرلەنوێ، بە بەرگی نوێ و ڕازاوە پۆشتەیانکردۆتەوە. بە هەموو جۆرێ و لە هەموو بوارەکانی وێژەدا، چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، شێوازێکی نوێیان پێرەوکردووە. هۆنراوەی کوردییان، لە دەس کۆتوپێوەندی کێش و سەرەوا قووتارکردووە. گەلێ زاراوەی کوردیی نوێیان دۆزیوەتەوە. بە کوردییەکی پەتیی، بە زمانێکی ئاسان، ساکار، ڕەوان و شیرین، هۆنراوەکانی خۆیان بۆ هۆنیوینەتەوە. هەر چەندە، سەردەمەکان جیاوازبوون، بەڵام، ئەوان لە بری ئەوەی، وەک هۆنەرە کلاسیکییەکانمان، خۆیان بە ووشەی بیانیی و قورسەوە ماندووکەن، باسی چاوی کاڵ و زوڵفی ڕەش بکەن، پتر باسی گرفت و کێشە سەرەکییەکانی نەتەوەکەیان بۆ کردووین، لەگەڵ ئازاری ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیاندا ژیاون.

لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، زۆر بە کورتیی، باسی پێوەندیی نێوان «هۆنراوە، گۆرانیی و زمان» بکەین. هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هۆنراوە پێوەندییەکی زۆری، بە گۆرانیی و مۆسیقاوە هەبووە. هەمیشە هۆنراوە، وەک کەرەسەیەکی خاو، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند و بە پیت، لە کاری هونەریدا بەکارهێنراوە. گەلێ هۆنراوەی ڕەوان و جوان، لە ڕێگەی ئاواز و گۆرانییەوە، جێگەی شیاوی خۆیان، لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا کردۆتەوە. بە هۆی گۆرانیی و سروودەوە، کۆمەڵانی خەڵک، بە دەیان هۆنراوەی هۆنەرەکانی کوردیان لەبەرکردووە. لە ڕێی گۆرانیشەوە، هۆنراوەکان کارێکی زۆریان، لە زمانەکەیان کردووە، فێری گەلێ ووشەی کوردیی پەتیی کردوون، لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاریانهێناوە.

لەوانەیە، گەر چەن هونەرمەند و بلیمەتێکی وەک: «قادر دیلان، ئەنورە قەرەداخیی، دڵشاد محەمەد سەعید ... » نەبووایە، ئاوازی بە سۆز و دڵڕفێنیان، بۆ هێندێ لە هۆنراوەی هۆنەرەکانی کورد دانەنایە، چەن گۆرانیبێژێکی دەنگخۆشی وەک:«حەسەن زیرەک، محەمەدی ماملێ، عەلی مەردان، تایەر تۆفیق، ڕەفیق چالاک، سالح دیلان ... » نەبووایە، بە دەنگە بە سۆزەکانیان نەیانگوتایە، ئەو هۆنراوانە لە لایەن ڕۆڵەکانی گەلەوە، بەو شێوەیە بایەخیان پێ نەدرایە. وەک هەموو هۆنراوەکانی

دیکەی هۆنەران، چەن جاریّ دەخویّندرانەوە، پاشان، لە بیردەچوونەوە.
بەلاّم، دەبینین:گۆرانیی و مۆسیقا ، گیانیّکی پڕ لە نەمریی بە بەرداکردوون، وەک چەپکە گولیّکی ڕازاوەی بۆنخۆش، لە ناو باخی گولاّنی، هەموو هۆنراوەکانی دیکەدا دیارن و جیّگەی تایبەتیی خۆیان هەیە.

بۆ نموونە: گەر لە پەنجاکان و شەستەکاندا، چەن هونەرمەندیّکی وەك (مەحموودی حەمەی لەیلیّ، رەفیق چالاك، قادر دیلان...تاد) ئاوازیان بۆ چەن هۆنراوەیەکی وەك(قژکالّی لیّوئالّی، باخچەی پاشا... تاد)ی "گۆران"ی نەمر دانەنایە، چەن دەنگخۆشیّکی وەك "عومەر دزەیی" بە گۆرانیی نەیانگوتایە، یا چەن کۆمپازیتەریّکی بلیمەتی کورد، ئاوازیان بۆ چەن هۆنراوە و سروودیّکی وەك (نەورۆز، دەمی ڕاپەڕین، بەری بەیانە، ئازادیخواین کوردین ئیّمە، ئەی رەقیب)ی (پیرەمیّرد، هەردیی و دلّدار) دانەنایە، هۆنەر و دەنگخۆشیّکی وەك "سالّح دیلان" و چەن گۆرانیبیّژیّکی دیکە نەیانچڕیایە، باوەڕناکەم، ئەو هۆنراوە و سروودانە، بەو شیّوە فراوانییە، لە ناو کۆمەلاّنی خەلّکدا بلاّو بونایەتەوە، بەو جۆرە کاریان، لە هەست و هۆشی جەماوەر بکردایە و لەبەریانکردایە!.

مامۆستا « قادر دیلان »، لە چاوپیّکەوتنیّکدا، ڕۆلّی تیپە هونەرییەکانی کوردستان هەلّدەسەنگیّنیّ. دەربارەی کارتیّکردنی گۆرانیی و مۆسیقا، لە هەستی نەتەوەیی و زمانی ئاخافتنی کۆمەلاّنی خەلّک دەلّیّ:
(بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەموو چەوسانەوە و زولّم و زۆردارییەی سی سالّە بە سەر کورددا لە عیّراقدا سەپیّنراوە، هەر بەرهەمیّکی هونەریی ئەو تیپانە بە هەنگاویّکی نەبەردانە هەلّدەسەنگیّنم، چونکە، ئەو بەرهەمە هونەرییانە، بە کەموکوریشیانەوە، ڕۆلّیّکی زۆر گرنگیان بینیوە لە بووژاندنەوە و گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتیی کورددا. باوەڕم وایە، هەر ئەم جۆرە هەنگاوانە بوون، کە بوونە مایە و هەویّنی ڕاپەڕینیش. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، سالّی1958، کە بە سالّی لافاوەکەی سولەیمانی بە ناوبانگە، ئیّمە، بۆ کۆکردنەوەی یارمەتیی لیّقەوماوانی لافاو، هاتینە شاری هەولیّر، ئاهەنگ بگیّڕین. باوەڕبکە، ئەو کاتە خەلّکی شاری هەولیّر و ئەو لادیّیی یە کوردانەی، نیشتەجیّی شار بوون، بەشیّکی زۆریان، بە تورکمانییەکی شکاو قسەیاندەکرد. گوایا، ئەوەی تورکمانیی بزانیّ، شارستانییە و لە

چینی ڕۆشنبیرانه، وای لێهاتبوو، زمانی تورکمانیی چاک تەشەنەی سەندبوو لە هەولێر، بەڵام پاش هەرەسهێنانەکەی1974 ، هەندێک هونەرمەندی خوێنگەرمی کورد، « تیپی باوەجیی کۆیە »یان جێهێشت و هاتنە هەولێر، لەوانە: کاک « وریا ئەحمەد » و کاک « سەردار ئەحمەد »ی شمشاڵژەن، لەگەڵ دەستەیەک هونەرمەند، تیپی هونەری هەولێریان پێکهێنا. لە ماوەی چەن ساڵێکدا، بە دەیان بەرهەمی نوێ و دەنگخۆشی نوێیان بە کورد ناساند و ئەو ڕۆحە نەتەوەیی یەشیان زیاتر ژیاندەوە. دەتوانم، بڵێم: خەڵکی ساویلکەشیان، لە گێلمەگێلمەی تورکمانیش ڕزگارکرد. )«83،12-13»

لێرەدا، گەر چەن نموونەیەک، لە سەر هۆنراوەی کوردیی بێنینەوە، تەماشایەکی ئەو زمانە پاک و پاراوە کەین، کە لەو سەردەمانەدا پێیان نووسیوە، دەبینین: هۆنەرەکانی کورد بە چ شێوەیەکی جوان، زمانەکەیان بۆ ڕازاندوینەتەوە، خاوێنیانکردۆتەوە و ڕاژەی زمانی کوردییان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، هێندێ کورد هەبوون، هەستی نەتەوەیی یان لاوازبووە، ڕێزی خۆیان و زمانەکەیان نەگرتووە، بۆیە، گەر نووسەرێ بابەتێکی بە کوردییەکی پەتیی و ڕەوان نووسیبێ، یا دەقێکی قورئانی وەرگێڕابێ، یا گەر هۆنەرێ هۆنراوەیەکی بە کوردیی گوتبێ، ئەوا زۆر بە توندیی، هێرشیان بۆ بردووە، پەلاماریان داوە، بە پیاوخراپ و گاور ناویانبردووە. بۆ نموونە: یەکێکی وەک « نالیی »، کە بە پێغەمبەری هۆنراوەی کلاسیکی کوردیی دادەنرێ، شانازییەکی زۆری، بە کوردێتی خۆی و زمانەکەیەوە کردووە. زمانەکەی زۆر لا شیرین و ئازیز بووە. هەر چەندە، جاروبار، هۆنراوەی بە عەرەبیی و فارسیش گوتووە، بەڵام، خۆی بە بەختەوەر و سەربەرز زانیوە، کە هۆنراوەی بە زمانی دایک هۆنیوەتەوە. بۆیە، لە وەڵامی ئەو جۆرە کەسانەی ڕەخنەیان لێ گرتووە، فەرموویەتی:

طەبعی شەککەرباری من، کوردیی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مقصوودی، لە « عمدا » وا دەکا
با لە مەیدانی فەصاحەتدا، بە میثلی شەهسەوار
بێ تەئەممول بەو هەموو نەوعە زوبانی ڕادەکا

کەس بە ئەلفاظم نەڵێ: خۆ کوردییە، خۆ کردییە
هەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی طالیبی مەعنا دەکا
بێتە حوجرەم، پارچەپارچەی موسوەدەم بکرێ بە ڕۆح
هەر کەسێ کووتاڵ و پارچەی بێ بەدەڵ سەودادەکا
شیعری خەڵقیی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکیی؟!
کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟! «107-106،51»
دیارە، لە سەردەمی «حاجی قادر»دا، ڕۆڵەکانی کورد، توانای ئەوەیان نەبووە، بە زمانەکەی خۆیان، بەرهەمی فەلسەفیی و ڕامیاریی بنووسن، پاشان، چاپیکەن، بڵاویکەنەوە و خەڵکی بیانخوێنێتەوە. (بۆیە، حاجیش لە ئاخری تەمەنیدا، بڕیاری داوە، هەر بە کوردیی بنووسێ. ئەگەر چەن دێڕە شیعرێ فارسیی هەیە، هی هەڕەتی لاوەتی و فەقیایەتی ئەون.) «66،121» لەبەرئەوە گوتوویەتی:
مەڵێن فەصاحەتی کوردی بە فارسی ناگا
بەلاغەتێکی هەیە، هیچ زوبانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەصصوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها
کە خۆتی تێ نەگەیێنی، لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەمووی هەزەیانە خودا بەڵای لێ دا
بەڵام ئەوانی کە صەڕرافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شەه ڕەوایی دەزانن، چ سککەیێکە ڕەوا
چ حیکمەتێکە کە ئاثاری کوردە نامووسی
نە کیمیایە نە عەنقا، لە بەینی ئێمە نەما
ئیلاهی نەیخەیە بەر چنگی مەندەبووری لەئیم
نقوودی حاجی کە نەیدیوە خوسرەوو دارا «37،45»
ئەڵبەتە، هۆنەرێکی پایەبڵندی خواپەرستی وەک «مەحویی»، شانازیی بە کوردێتی خۆیەوە کردووە، بۆیە فەرموویەتی:
بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیطاعەم کرد
لە ئیبتیداوە کە بەیتێ موناسبی دیوان ...
گەدایەکی وەکو «مەحوی» قەلەندەرێکی کورد

میثالی پادشەهی فورسە صاحیبی دیوان ... «158،94»
هەروەها، « مەحوبی » شانازیی بە زمانی زکماکیی خۆیەوە کردووە و گوتوویەتی :
لە « همزیە » و لە « بردە »م چونکە کەم دی ئیستفادەی کورد
منیش ئەم « کوردییەم » دانا لە ڕیزی ئەو قەصیدانە ... «160،94»
« پیرەمێرد »ی بلیمەت و هۆنەریش، دەربارەی زمانی کوردیی، نیشتمانەکەی، مافی نەتەوەکەی و کوردبوونی خۆی فەرموویەتی :
ئێمە کە کوردین لە لامان وایە
کوردی زیانێکە زۆر بێ هاوتایە
ناوی پێغەمبەر حەمەی رەسوڵە
نوێژمان بە کوردی لای خوا قبوڵە
ئەگەر تەڵقینم بە کوردی نەدرێ
گوێی لێ ناگرم با کفنم بدڕێ
گەر مەڕنەمووکەی عارەب لێم پرسێ
وای تێنەخوڕم کە ئەو بترسێ
ئەمە دینمە و دینێکی بە حەق
لەسەر پێستی خۆم ئەگەر بکرێم شەق «61،44»
دەربارەی زمانی کوردیی دەڵێ :
ئەم کوردیەی ڕەوانە
کە ئاسان و گرانە
پێغەمبەری زیانە
بۆیە وا کەوتە دواوە «289،44»
« هەژاری موکریانیی »، یەکێ لەو نووسەر و هۆنەرە، هەڵکەوتوو، بلیمەت و گەورانەی کورد بوو، هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە، بە هەموو توانایەوە کۆشاوە، ڕاژەی زمان و وێژەی کوردیی بکا. لەو سەردەمە ئەنگوستە لە چاوانەی، زمان و وێژەی کوردییدا، بە« زمانێکی ڕەوان، کوردییەکی ڕەسەن و پەتیی، تەڕوپاراو، شیرین و ناسک »، ووشەی لە هەموو دیالێکتەکانەوە دەخواست، هەم بەرهەمەکەیی و هەم زمانەکەی پێ موتوربە

و دەوڵەمەند دەکرد. چەندین بەرهەمی وەک:« ئاڵەکۆک و بەیتی سەرەمەڕ »ی بۆ تۆمارکردووین. چەندین بەرهەمی وێژەیی وەک:« مەم و زینی خانیی، چوارینەکانی خیام، مەلای جزیریی » لە کرمانجیی ژووروو و زمانی فارسییەوە، بۆ سەر کرمانجیی خواروو، بۆ گۆڕیوین. « هۆزی گاوان و شەرەفنامەی » بە کوردییەکی ئەوتۆ داڕشتووە و ڕازاندۆتەوە، لە بری «شەرەفنامە » وەک « هێمن » دەڵێ: « هەژارنامە »ی بڵاوکردوینەتەوە. زمانی نووسین و داڕشتنەکەی، یارمەتییەکی گەلێ گەورەی، زۆر لە نووسەرانی کلاسیک و تازەپێگەیشتووی کورد داوە. تا بێ هەڵەوپەڵە، بێ گرێوگۆڵ، بێ گیروگرفت، نووسینەکانی خۆیانی پێ بڕازێننەوە. لەو باوەڕەدام، لە ڕێی « هەنبانەبۆرینە »وە، زمانی کوردیی، هێندەی دیکە خاوێنکردۆتەوە و گەشەی پێ کردووە. « هەژار »، جگە لەوەی نووسەر و هونەرێکی شارەزابووە، کوردێکی پاک و خەباتگێڕێکی کۆڵنەدەریش بووە.
جا با ئێستە، یەکێ لە هۆنراوەکانی بە نموونە بێنینەوە، تا بزانین، لە ساڵی «1948» دا، بە چ زمانێکی سفتوسۆڵ نووسیوێتی؟ بە چ جۆرە کوردییەک گوتوویەتی؟ چۆن کوردێ بووە؟ چۆن کاری لە ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد کردووە؟ کاتێ، لە دەربەدەریی و دوور لە زێدی خۆیەوە، گوتوویەتی :

بە دەربەدەری یان لە ماڵی خۆم — لە خاکی عەرەب، لە ئێران و ڕۆم
کۆک و پۆشتەبم، ڕوت و ڕەجاڵ بم — کۆشکم دەقات بێ، وێرانە ماڵ بم
ئازا و ڕزگار بم شادان و خەندان — یان زنجیر لە مل لە سوچی زیندان
ساغ بم جحێڵ بم بکرم گوێس وانان — یان زار و نزار لە نەخۆش خانان
دانیشم لە سەر تەختی خونکاری — یان لە کۆڵانان بکەم هەژاری
کوردم و لە ڕێی کورد و کوردستان — سەر لە پێناوم گیان لە سەر دەستان
بە کوردی دەژیم بە کوردی دەمرم — بە کوردی دەیدەم وەرامی قەبرم
بە کوردی دیسان زیندو دەبمەوە — لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە

«18،52»

هەر چەندە، « مێجەر سۆن » لە کوردستاندا، ئەفسەرێکی داگیرکەری سوپای ئینگیز بوو، ئەو کاتە لێپرسراوی شاری سولەیمانی بوو. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، بە شێوەیە لە شێوەکان، بۆ هەر مەبەستێ بووبێ، هەوڵیداوە،

زمانی کوردیی ببوژێنێتەوە، پێشیخا، نووسەرانی کورد بە کوردییەکی پەتیی بنووسن،(بۆ گەیشتن بەم مەرامە هاتووە، خەلاتی بەوانە پێشکەشکردووە، کە نووسراو یا هەڵبەست بە کوردیی پەتیی بنووسن و بڵێن، ... لەم ڕووەوە « شێخ نووری شێخ ساڵح » کە شاعیرێکی نیشتمانی ئەو سەردەمە بووە، هەڵبەستێکی بە کوردیی پەتیی ووتوە و خەلاتی وەرگرتووە، « پیرەمێرد »یش یەکێک بووە، کە بە تەواویی هەوڵیداوە، ئەو نیازە بەجێبهێنێت، بە ڕاستیی لە هەڵبەستەکانی دواییدا ئەمە زۆر بە ئاشکرا دەرئەکەوێت ...)«44، 41-42» هەڵبەتە، کاتی خۆی ئەم پێشنیازەی « مێجەر سۆن » ، کارێکی زۆری لە نووسەر و هۆنەرەکانی کورد کردووە، تا ئەندازەیەک، زمانی کوردیی لە ووشەی بیانیی پاککردۆتەوە.

## 13. گێژاوی زمانەوانیی :

لە بابەتەکانی پێشوودا، پوختەیەکی مێژووییمان، دەربارەی ڕەچەڵەکی کورد و زمانی کوردیی پێش چاوخست. بەو کورتە مێژوویی یەدا، بۆمان ڕووندەبێتەوە،(کورد نەتەوەیەکی هیندۆ ـ ئەورووپاییە، زمانەکەی لە لقی ئاریی گروپە ئێرانییەکانە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستانەی زاناکانی کورد و بێگانە سەلمێندراوە، نەتەوەی کورد، لە نەوەی میدییەکانە.)«17،34» بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەو ڕاستیانەشدا، ئەوڕۆ زمانەکەمان دواکەوتووە و لە گێژاوێکی گەورەی زمانەوانیدا گیریخواردووە. بۆیە دەبێ، پێش هەموو شتێ، لە خۆمان بپرسین، ئەم زمانە بۆ وای لێ بەسەرهاتووە؟

ئەز لەو بڕوایەدام، دوای ئەوەی، شای هەخامەنشییەکان «کۆرش ـ کەیخەسرەوی گەورە»، لە ساڵی «550 پ.ز. »دا، دەسی بە سەر ئیمپراتۆرییای میدیادا گرت، دوا شای میدییەکانی « ئیستیاغ ـ ئیختو ویکۆ »ی لەنێوبرد و دەوڵەتی نوێی هەخامەنشیی دامەزراند، ئیدی، لەو ڕۆژەوە تا ئێستە، نەتەوەی کورد، لە سەر خاکی نیشتمانی باپیرانی خۆی، بە کۆیلەیی و ژێردەسیی ژیاوە و دەژی. لەبەرئەوە، بە هەموو شێوەیە، سەربەستیی خۆی لەدەسداوە، کەسێتی نەتەوەیی پێشێلکراوە و تێکشکێنراوە. وردەوردە، زمانەکەشی لێ قەدەغەکراوە و بەرەو لاوازبوون ڕۆشتووە، زمانی گەلە سەردەسەکانیان بە زۆر و بە زەبری شمشێر، بە سەردا سەپاندووە. ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیش، لە ناچاریدا ئەو زمانانەیان، لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا بەکارهێناوە.

بە کورتیی و کرمانجیی، دوای ئەوەی دەسەڵاتی میدیا لەنێوچووە، نەتەوەی کورد هیچی نەماوە و ئەوەی هەشیبووە، لە دەسیداوە. ئەوەی مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەوەیە، تیرە و هۆزەکانی ماد، لە ماوەیەکی دیاریکراودا، هەموو دوژمنەکانی خۆیان، لە ناوچەکەدا تێکشکاندووە، تا لە ساڵی «700پ.ز.»دا، ئیمپراتۆریای گەورەی مادیان دامەزراندووە. بە تایبەتیی، دوای ئەوەی، لە «612 پ.ز. »دا، ئیمپراتۆریای ئاشوورییان لەنێوبردووە،

ئیدی بە جارێ، سنووری دەسەڵاتیان فراوانبووە. هەڵبەتە لەو سەردەمانەدا، زمانی مادییشیان بە سەر هەموو ناوچەکانی بندەسیاندا سەپاندووە. بۆیە، لەو کاتەوە تا ئایینی ئیسلام لە کوردستان بڵاوبۆتەوە، نزیکەی سیازدە سەدە دەبێ. (لەم ماوە درێژەدا خاکی مادی گەورە و پچووک و ئەو خاکانەش کە خراونە سەر خاکی ماد لە باری عەسکەریی و سیاسییەوە گەلێ دەساودەسیانکردووە و دەسەڵاتی سیاسیی کەوتۆتە دەسی نەتەوە و خەڵکی جۆربەجۆر کە زمانیان لەگەڵ زمانی مادەکان لێک جیابووە و هەر دەسەڵاتێک هاتووە زمانی خۆی وەکوو زمانێکی ڕەسمیی بە سەر وولاتدا سەپاندووە، لە هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارانەدا، هەموو بابەتەکانی کۆمەڵایەتیی کالوکرچ و نەمەییوبوون، ئەم دەسەڵات گۆڕکێیە ناتوانێ، لە سەر ئەو بابەتانە بێ تەئسیر بێ و کاریان تێ نەکا. مێژوو گەلێ ڕووداوی وای لە بیرە، کە دەسەڵاتی سیاسیی لە وولاتێک بۆتە هۆی گۆڕانی بنەڕەتیی نەتەوایەتیی ئەو شوێنە، زمان هەر لەوێ ڕاوەستێ. شوێنەواری کارتێکردنی دەسەڵاتگۆڕکێ لە ڕۆژهەڵاتی خاکی ئیمپراتۆری « ماد »ا ئیمرۆ بە ئاشکرا دەبینرێ، بەڵام لە ڕۆژاوای « ماد »ا ئیشەکە پێچەوانەیە و نەک هەر وەکوو خۆی ماوە، بەڵکوو دەسەڵاتی « ماد »ان چلۆنایەتیی نەتەوەیی و زمانی هەندێ شوێنی کە پاشان خراوەتە سەر خاکی ماد گۆڕیوە و هێناوێتییە سەر ڕچەی تطوری مادیی و شانبەشانی بەشەکانی ڕۆژاوای ماد تطوری پێکردوون.) «33،59»

پاشان، عەرەبەکان هاتوون. ئەوانیش، لە سەردەمی « عومەری کوڕی خەتاب » و لەساڵی «640 ز »دا، لە ژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا، کوردستانیان داگیرکردووە. زمانی عەرەبییان، بە سەر نەتەوەی کورددا سەپاندووە. دەربارەی ئەو جەنگانەی، لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستاندا ڕوویانداوە، پرۆفیسۆر « مینۆرسکی » دەڵێ: (لە سەدەی یازدەیەمدا سەلجووقییەکان ناوچەکەیان داگیرکردووە. دوای ئەوە، کوردەکان ناچارکراون، کە تێکۆشن، تێکۆشانێکی توندوتیژ لە دژی مەغۆلییەکان. لە سەدەی سیازدەیەمدا لە دژی هۆلاکۆخان و دوای ئەوە لە دژی تەیووری لەنگ کە لە دەوروبەری ساڵی1400ی زاییندا چارەنووسیان لە کوردستاندا

و به تایبەتیی لە دەووروپشتی ئامێدیی خۆیدا تێشکاندووە.)«50،112»
پاشان، کاتێ ئیمپراتۆریای عوسمانیی لەساڵی «1299ز» و ئیمپراتۆریای سەفەویش لە ساڵی «1501ز»دا دامەزراون، دواتریش شەڕی چاڵدێران لە (23/ئۆگەستی/1514ز) لە نێوانیاندا قەوما، لە ئەنجامدا، بەپێی پەیمانی زەهاوی ساڵی «1639ز»، کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا دوولەتکرد.
ئیدی لەو ڕۆژەوە، چارەنووسی کوردستان بە سەفەویی و تورکە عوسمانییەکانەوە بەسرایەوە. هەر دوو لایان، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیان ناچارکرد، لە بری زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، زمانەکانی تورکیی و فارسیی فێربن. دوای ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهانیش تەواوبوو، جارێکی دیکە خاکی کوردستان، بە سەر پێنج دەوڵەتی نوێدا بەخشرایەوە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە زۆر فێری زمانەکانی «تورکیی، عەرەبیی، فارسیی، ڕووسیی، ئازەریی، ئەرمەنیی، گورجیی، ئوزبێکیی و کیرگیزیی» کراون.
دیارە، لەو ڕۆژەوە تا ئێستە، کورد زمانی ئەو نەتەوە داگیرکەرانەی، لە کاروباری ژیانی ڕۆژانە و دەوڵەتدا بەکارهێناوە، هەر بەو زمانەش لەگەڵیاندا دواوە و ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانیشی ڕاپەڕاندووە. ئەو جۆرە ئەلفوبێیانەشی لە نووسیندا بەکارهێناوە، کە ئەو نەتەوانە لە سەردەمی مێژوویی جیاجیادا پێیان نووسیوە. زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆشی، تەنیا بۆ ئاخافتن لەگەڵ خێزان و ڕۆڵەکانی گەلەکەیدا بەکارهێناوە.
لەبەرئەوەی، خاکی کوردستان، بە درێژایی مێژوو داگیر و دابەشکراوە. نەتەوەی کورد، ئازادیی و سەربەخۆیی نەتەوەیی پێشێلکراوە. پتر لە «2600» ساڵ، کورد لە نیشتمانەکەی خۆیدا چەوسێنراوەتەوە، تاڵان و دەربەدەرکراوە. لە ئەنجامی، ئەو هەمووماڵوێرانیی و چەڵەمە نەتەوەیی یە گەورانەدا، لە بەر ئەو هەموو پەتپەتیی و چەرمەسەرییەی بەسەریهاتووە، لە لایەکەوە فریای ئەوە نەکەوتووە، ئاوڕێ لە زمانی زکماکیی خۆی بداتەوە، بیری لە خوێندن و نووسین بە زمانی کوردیی بکاتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، زانایانی ئایین و نووسەرانی کورد، پێیان شوورەیی نەبووە، زمانی خۆیان، تەنیا بۆ قسەکردن بەکاربێنن و بە زمانی نەتەوە سەردەسە داگیرکەرەکانی «عەرەب، تورک و فارس» بنووسن و بخوێننەوە.

لێرەدا شتێ هەیە، دەبێ باسیکەین. لە کۆندا، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا، زۆربەی « ڕووناکبیر، نووسەر و زاناکانی کورد » ، لە بری ئەوەی، بایەخ بە زمان و کەلتووری کوردیی بدەن، زیاتر خۆیان بە هونەر و وێژەی «فارسیی، عەرەبیی و تورکیی »ەوە خەریککردووە. زۆربەی بەرهەمەکانیشیان، هەر بەو زمانانە نووسیوەتەوە، بێ ئەوەی ئاوڕێ، لە زمان و کەلتووری نەتەوە هەژارە بندەسە چەوساوەکەی خۆیان بدەنەوە. ئەو زانایانە، بە شێوەیە ڕاژەی زمانی عەرەبیی بە تایبەتیی و فارسییان بە گشتیی کردووە، گەر بەراوردێ لە نێوان ئەو زمانانە لە پێش ئیسلام و لە پاش ئیسلامدا بکەین، جیاوازییەکی زۆر دەبینین. (زمانی عەرەبیی، نزیکەی1400 ساڵە، وەک زمانێکی ئایینیی پیرۆز، بە هەموو زانایانی موسوڵمان خزمەتیدەکەن. تەنانەت، گەلێ لە زانایانی کوردیش، هەموو ژیانی خۆیان بۆ تەرخانکردوە، وەکوو دەبینین، ئیمڕۆ بۆتە زمانێکی عالەمی. یاخۆ زمانی فارسیی هەر لە چەرخی چوارەمی کۆچییەوە کەوتۆتە خۆی و ئیمڕۆ بە جۆرێ پێشکەوتووە، ئەگەر بێت و لەگەڵ زمانەکانی پێش ئیسلام پێکیان بگرین، تووشی سەرەگێژە دەبین.)«7،70»
لەبەرئەوە، شتێکی سەیر نییە، گەر زانایەکی گەورەی بە ناوبانگی ئیسلامی وەک:« ئیمام محەمەد غەزالی1058 ـ 1111 »ز گوتبێتی: (دینەوەریی و ئامێدیی و شارەزووریی کورد، ستوونی دینی ئیسلامەتین، گەر خودا ئەو سێ کوردەی بە ئیسلام نەدابا، لەوانەبوو، ئیسلامەتیی تێکبتەپێ.)«651،105» بۆیە، لەو بوارەدا بە دەیان «ڕووناکبیر، نووسەر، هونەر و زانای گەورەی کورد » دەبینین، تەنیا بە زمانی نەتەوە سەردەسەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان نووسیویانە. جا ئەو هۆیانەی وای لێ کردوون، بە یەکێ لەو زمانانە بنووسن، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، پێوەندیی بە کورد خۆیەوە هەبێ، یا نەبێ، زۆر گرنگ نییە. بە کورتیی دەتوانین، لە چەن خاڵێکدا چڕیانکەینەوە :
1. لە پێش هەموو شتێکا دەبێ، ئەوە بڵێین: هۆی ئەم گاڵتەجارییە هەر چییە بووبێ، لاوازیی هەستی نەتەوەیی، بە خاڵێکی گەلێ گرنگ دادەنرێ. چونکە، کورد لە چاو نەتەوەکانی دیکەی دراوسێیدا، زۆر بە

درەنگ، هەستی نەتەوەیی جوڵاوە و گەشەیکردووە. بۆیە، زۆر بایەخی بە زمانەکەی خۆی نەداوە.
2. هێندێکیان، هەر لە بنەڕەتدا ناپاکبوون، وازیان لە نەتەوە و خاکەکەی خۆیان هێناوە.
3. هێندێکیان، هەر خۆیان ترسنۆکبوون. لە هیچدا نەبوون، سەری خۆیان کزکردووە، تەنیا ویستویانە، بە هێمنیی بژین، بێ ئەوەی مشووری ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیان بخۆن.
4. هێندیکیان، هەر لە بنەڕەتدا هەلپەرستبوون، لە پێناوی پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی و پارەدا، خۆیان و نیشتمانەکەیان فرۆشتووە.
5. هێندێکیان، خۆیان و هۆزەکەیان، یا گەل و نەتەوەکەیان، بە سووک تەماشاکردووە. لەبەرئەوە، خۆیان بە ڕۆڵەی یەکێ، لە نەتەوەکانی دیکەی وەک: « فارس، عەرەب و تورک » داناوە.
6. هێندێکیان، هەر خۆیان کەمتەرخەمبوون. زمانی کوردییان، بە زمانێکی هیچ زانیوە. ویستوویانە، لاسایی « نووسەر، هۆنەر و زاناکانی عەرەب، تورک و فارس » بکەنەوە. لەبەرئەوە، لە پێناوی چەن تورەکە زێڕ و کیسە دراوێکدا، وەک زوڕناژەن و شایەری دەرباری بارەگای شا و سوڵتانەکان، بە زمانی ئەو نەتەوانە، بەشانوبازووی « خەلیفەکانی عەرەب، شاکانی فارس و سوڵتانەکانی تورکیاندا » هەڵداوە.
7. ئەوانەی، لە دایک و باوکێکی کورد کەوتوونەتەوە، بەڵام، خۆیان بە کورد نەزانیوە، ڕێزی زمانەکەی خۆیان نەگرتووە، بە زمانێکی دیکە پەیڤیوون و نووسیوویانە. گەر زمانی زکماکیشیان نەزانیبێ، بە هیچ شێوەیە هەوڵیان نەداوە، فێربن. یا ئەوانەی، خۆشیان بە کورد زانیوە، بەڵام، زمانی کوردییان نەزانیووە، هەوڵیشیان نەداوە، خۆیان فێرکەن.
8. هێندێکیان، لە کوردستان نەژیاون و لە وولاتەکانی « تورک، عەرەب و فارس » ژیاون. لەبەرئەوە، هیچ جۆرە هەلێکیان بۆ نەڕەخساوە، تا فێری زمانی کوردیی بن.
9. ئایدۆلۆژیای ئیسلام، کارێکی یەکجار زۆری، لە بیر و هۆشی هێندێکی دیکەیان کردووە و کاسیکردوون. بۆیە، لایان گرنگ نەبووە، لە پێناوی چی

و کێدا دەکۆشن؟ بۆ کێ دەنووسن؟ ڕاژەی کام زمان دەکەن؟ زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان، بە قوربانی زمانی ئایین و دەوڵەت کردووە. هەروەها، لەو سەردەمانەدا باوبووە، شانازییان بە ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبییەوە کردووە. بۆیە، تەنانەت هێندێ کەس، خۆیان بە عەرەب داناوە. ئەمەش، هەر تەنیا لە ناو کورددا بڵاونەبووە، بەڵکوو، ئەم پەتایە، لە نێو زۆربەی گەلە ئیسلامییەکاندا باوبووە. (لەو سەدانەی عەرەب دەورێکی گرنگیی دەبینی، لە کۆمەڵایەتیی و ئایین و سیاسەتدا « لە نێوان هەندێ لەو میللەتانەی ئایینی ئیسلامیان وەرگرتبوو »، زۆر باوبوو، کە بە شانازییەوە خەڵک ئەسڵی خۆی بە عەرەب دابنێ. جا ڕۆشنایی ئەم وەزعەش لە بەسەرهات و داستانەکاندا تیشکی داوەتەوە. لە سەرێکی کەوە خۆ بە عەرەبدانان بەو مەبەستە بووە، کە ئەسڵی خۆیان و قەومیان بشارنەوە. ویستوویانە، خۆیان لەگەڵ کۆمەڵی سەرکەوتوو دانێن. ئەمەش ڕێگەیەک بوو بۆ خۆ دوورخستنەوە و خۆپاراستن لە گەڵێ ناخۆشی و کوێرەوەریی و بێبەختیی.)«127،78»
10 . هێندێ نووسەری دیکەش هەبوون، بە دڵ و بە گیان کورد بوون. بەڵام، لەبەرئەوەی ڕێگە نەدراون، بە کوردیی بنووسن و خۆیان بە کورد دانێن، ناچاربوون، بە یەکێ لەو زمانانە بنووسن، نازناوێکی « فارسیی، عەرەبیی یا تورکیی » بۆ خۆیان دانێن، تا ئەو دەوڵەتانە ڕێگەیاندەن، نووسینەکانیان بڵاوکەنەوە. بە تایبەتیی لە « تورکیا، ئێران و سووریا »، ئەمە زۆر ڕوویداوە. هەر وەک « سمایل بێشکچی »ش دەڵێ:
(نووسەری کورد ناتوانێ، ناوی ناسنامەی نەتەوەیی خۆی بێنێ. گەر ئەو کارەیکرد، چاوەڕێدەکا، بە شێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵ کەن. بە خاوەن هەستی نەتەوەیی، ڕەگەزپەرست و شۆڤێنیی، تاوانباریکەن.)«10،235-236» پاشان دەڵێ: (ئایا مایەی شیوەن و گریان نییە، نووسەرێکی کورد بە تورکیی بنووسێ؟ خۆی بە کلکی وێژەی تورکیدا هەڵواسێ؟)«10،236» هەڵبەتە، ئەمە وەک ڕێبازێ، نەک هەر تەنیا، لە لایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە پێڕەوکراوە، بەڵکوو، هەر بە شێوەیەکی گشتیی، (ڕۆشنبیرەکان لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا، خۆیان

باش دەزانن، پێویستە، ناسنامەیەکی ڕەگەزی بیانیی بۆ خۆیان دانێن، تا کۆمەڵگە دانیان پێدا بنێ، شوێنێکی دیاریکراو لە نێو کۆڕی ڕووناکبیراندا، بۆ خۆیان داگیرکەن. ئەوانیش، لەگەڵ ئەو شێوازی بیرکردنەوە و ڕەوشتەدا خۆیان ڕادێنن، کە سیستێمی پەروەردەکردنی ئەو وڵاتە پێڕەویدەکا.)«10، 250»
بۆیە، لە کۆندا، زۆربەی ئەو نووسەر و زانا کوردانەی ئیسلام، بەرهەمەکانی خۆیان، بە کوردیی نەنووسیوە. هۆنەرەکان هۆنراوەکانیان، بە کوردیی نەهۆنیوەتەوە. کەم هۆنەری کلاسیکیی کورد هەیە، گەر بە کوردییش هۆنراوەی گوتبێ، بە یەکێ یا پتر لە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » هۆنراوەی نەگوتبێ. زۆربەی زۆریان، زمانەکەی خۆیان پشگوێخستووە، مەگەر تاکوتەرا، شتێکیان بە کوردیی نووسیبێ، ئەگینا سەراپای بەرهەمەکانیان، بە زمانەکانی دیکە نووسیوە. گەر بە کوردییش نووسیبێتیان، ئەوا لە بەر هەر هۆیە بووبێ، خۆیان بۆ ڕاگیر نەکراوە، جاروبار شتێکیشیان هەر بە زمانی نەتەوە دراوسێکان نووسیوە. وەک: (تاج ئەلملوک ئەبو سەعید بوری، ئیبن مستەوفی ئەربیلی، ئیبن خەلەکان، سەیفەدین ئەبو بەکر ئەلئەیوبی، ئەبو فیدای ئەیوبی، ئیدریسی بدلیسی، مفتی ئەلسەقەلەین ئەبو سعوودی عەمادی، ماە شەرەف خانمی ئەردەلانی.)«97، 333» هەروەها، چەندین نووسەر و زانای دیکەی وەک: (ئەبو حەنیفەی نەعمانی کوڕی سابت، ئیبنو قوتەیبەی دینەوەریی، ئیبنو خەلەکان، ئەبو عەلی قالی دیاربەکریی، ئەبو فیدا، محێدینی خەلاتی، ئیبنو حاجیبی شارەزووریی، ئەبو حەنیفەی دینەوەریی، ئیبنو جنی، ئیبنو سەلاح، مەلا ڕەحیمی بارزان، عەلامە بێتوشی، ئیبنو لحاج، ئامێدیی، ئیبنو قوح، ئیبنو ئەسیرەکان، ئەبو بەکری موسەنیف، مەلا جامی، زەرەقلی، ئیبنو سیرین، شێخ عەبدولباسیت و هەزارانی تر.)«105، 650 ـ 651»
لە مێژووی سەردەمیشماندا، گەلێ نووسەرمان هەبووە و هەیە، بە زمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان نووسیویانە و دەنووسن، وەک(ئەحمەد شەوقی، مەعروف ڕەسافی، جەمیل سدقی زەهاوی، مەحموود تەیموور، عایشە تەیموور، بلند حەیدەریی، خەیرەدین ئەلزەرکەلیی، محەمەد کورد عەلی،

عەباس مەحموود عەقاد، مستەفا جەواد، سەلیم بەرەکات لای عەرەب، رەشید یاسەمی، محەمەد موکریی و محەمەد قازیی لای فارس، نووسەری بەناوبانگیش یەشار کەمال لای تورک، چەن ناوێکی دیار و ناسراون، پێویستیان بە ناساندن نییە.)«39،27» * هەروەها، هۆنەری بە ناوبانگی گەورەی ئێران « ئەبو قاسمی لاهوتیی »ش، کورد بووە و بە فارسیی نووسیوێتی.

زۆر سەیرم لێهات، کاتێ لە ژمارە پێنجی مانگنامەی « پەیام »دا، ناونیشانی کورتیلە گوتاریکم بینی، نووسرابوو « یادی نووسەر و وەرگێڕی کۆچکردووی کورد « محەمەدی قازی » بەخێر بێت! » ئیدی بە پەلە، بە کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گوتارەکەدا گەڕام، تا بزانم، ئەو برایە، چی لە سەر نووسیوە؟! هەڵبەتە، وەک کورد دەڵێ: دیارە ئەو برایە، گا بە گوندا دەناسێ! محەمەدێ هەر لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە، تا ئەو ڕۆژەی چاوی لێکناوە، لە تاران ژیابێ، باوەڕ ناکەم، لە ژیانیدا یەک بەرهەمی کوردیی نووسیبێ. بەڵکوو، وەک نووسەری گوتارەکە، بە شانازییەوە باسیدەکا، دەسی ڕێزی لێ دەنێ و دەڵێ: (ژمارەی کتێبی تەرجەمەکراوی قازی لە فەڕەنسییەوە بۆ سەر زمانی فارسیی دەگاتە حەفتا و لەوانە « دایک »ی ماکسیم گۆرکی و « نان و شەراب »ی ئیگنیا تسیوسیلۆنە و « دوورگەی پنگوین »ی ئاناتۆڵ فرانسن.)«16،15» هەر چەندە، محەمەدی قازی وەک نووسەر دەڵێ: (ژمارەیەک کتێبی لە بواری مێژوو و ئەدەبی کوردیدا وەرگێڕابووە سەر زمانی فارسیی.)«16،15» بەڵام، بە باوەڕی من، محەمەدی قازی نە نووسەری کورد بووە، نە یەک تۆزقاڵ ڕاژەی زمانی کوردیی کردووە. بەڵکوو، جێگەی خۆیەتی، گەر فارسەکان شانازیی پێوە کەن، یادیکەنەوە، پەیکەریشی بۆ داچەقێنن، چونکە، ئاغای قازی تەنیا لە داک و بابێکی کورد بووە، ئەگینا بە هیچ شێوەیە، ڕاژەی مێژوو و وێژەی کوردیی نەکردووە.

---

* هێندێ لە ناوی ئەو نووسەرە کوردانەی، لەم سێ سەرچاوەیەدا هاتبوون، دووبارەکرابوونەوە. لەبەرئەوە، هەر تەنیا جارێ نووسیمن.

ئەو چەن بەرهەمە کوردییەی، بۆ سەر زمانی فارسیشی وەرگێڕاوە، دیسانەوە، هەر لە خانەی ڕاژەکردنی زمانی فارسیدا دادەنرێ. ئایا نووسەر پێمان نالێ: گەر ئاغای قازیی لە سالی «1909»دا لەدایکبووبێ، دوای پازدە سال لە تاران نیشتەجێبووبێ، واتە: لە تەمەنی بیستوچوار سالییەوە تا مردووە، هەر لە تاران ژیابێ، ئەدی لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا، ئەو نوسەرە بەرزەی « فارس! »، بۆچی لە کوردستانە کاولبووەکەی خۆیدا نەژیاوە؟ ئەویش، وەک نووسەر و ڕووناکبیرەکانی دیکەی کورد، بۆچی ڕاژەی زمان و وێژەی گەلەکەی خۆی نەکردووە، بە تایبەتیی، لەو سەردەمە پڕ لە ناخۆشییەی، ڕۆژهەلاتی کوردستانی پێدا تێپەڕبووە، خۆشی لە بنەمالەی قازیی و خزمێکی نزیکی پێشەوا بووە؟! هەروەها، جگە لەوەی، وەک نووسەر دەلێ: (هێرشێکی زۆری کردۆتە سەر کەسایەتیی سمکۆ و ئەم هەلوێستەی بۆتە هۆی تووڕەیی کۆمەلانی گەلی کورد.)«16،15»

ئەوە جگە لەوەی، تەنیا بنەمالەکەیان دەتوانن، یادی پیاوێکی وا بکەنەوە، باوەڕ ناکەم، تاهەتایە، نەتەوەی کورد شانازیی بە ڕۆلەی واوە بکا. سەرەڕای ئەوەی هیچی بۆ کورد نەکردووە، هێشتا، هێرشیش بۆ سەر قارەمانێکی نەتەوەیی وەک « سمکۆ » بەرێ! وەک نووسەریش دەلێ: (بزووتنەوە نەتەوایەتییەکانی گەلی کوردی، وەک دیاردەیەکی سەلبی سەیرکردووە.)«16،15» ئیدی بۆ دەبێ، بە نووسەرێکی کورد دانرێ؟ یادی بکرێتەوە؟(بە خەم و کەسەری زۆرەوە، هەوالی کۆچی دوایی)ڕاگەیەنرێ! ئایا، هەر لەبەرئەوەی، لە بنەمالەی پێشەوا « قازی محەمەد » بووە، وا بەو شێوەیە دەسی ڕێزی لێ دەنرێ؟ جا کەواتە، لە بەر خاتری « بارزانیی مستەفا »ش دەبێ، ڕێز لە گیانی « عوبێدوللا »ی کوڕی بگرین، لە کاتێکدا باوکی لە باشووری کوردستان، دژی دەولەتی داگیرکەری بەعس، شۆڕشی دەکرد، ئەو لە بەغدا پیاوی ئەو ڕژێمە بوو! بە ڕاستی گوناهە، مێژوو بەو شێوەیە تۆمارکرێ. پێویستە، هیچ جۆرە خاتر و خۆتری تێنەخوێندرێتەوە، « مەڕ بە پێی خۆی و بزن بە پێی خۆی هەلواسرێ »!

یا هێندێ کەس، هەر لە خۆیانەوە، هێندێ ناویان بیستووە، بێ ئەوەی بزانن، کێن؟ چییان کردووە؟ ڕاژەی کام زمان و نەتەوەیان کردووە، تفەنگ

بە تاریکییەوە دەنێن، شانازیی بە ناوەکانییانەوە دەکەن. بۆ نموونە: یەکێ، لە « یادی125 ساڵەی کۆچی دوای نالی »، کە هەر لە سەرەتاوە ناونیشانەکەی هەڵەیە! گوتارێکی درێژی نووسیوە، لە جێگەیەکدا دەڵێ: (یادکردنەوەی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی، مەلای جزیریی، مەولەویی، سالم، کوردیی، مەستورەخانم، شێخ ڕەزای تاڵەبانیی، ئیبن ئەزرەقیی، ئیبن خەلەکان، بێتووشیی، شێخ مارفی نودێ و ئەبووبەکری موسەنیف و ... تا. ڕادەی نامۆبوون، بە مێژووی نەتەوایەتیمان پیشاندەدات. هۆشی مێژووییمان لە مێژوومان نامۆیە. نامۆبوون بە مێژوو، ناسنامە و ئاگایی ئێستە و داهاتووی لێ دژوار و ئاوەژوو کردووین.)«3،123»

ئیدی، هەروا نووسەری یادەکە، کۆمەڵێ ناوی تێکەڵاوکردووە، بێ ئەوەی هەستی بەوە کردبێ، ئەو ناوانە، هەر یەکەیان لە بوارێکی جیاواز و تایبەتدا کاریانکردووە و لە یەکدی جیاوازبوون. هەندێکیان لە بواری مێژوو، وێژە، ئایین و ... تاد دا ئەسپی خۆیان تاوداوە، هەموویان هەر ڕاژەی زمان و نەتەوەکەی خۆیان نەکردووە. بەڵکوو، یەکێکی وەک « ئیبن خەلەکان » کە بە ڕەچەڵەک کورد و خەڵکی گوندی « خەلەکان »ی لای «ڕانێ »یە، بە هیچ شێوەیە، لایەکی بە لای زمان و نەتەوکەی خۆیدا نەکردۆتەوە، تا نەتەوەی عەرەبیش مابێ، شانازیی پێوە دەکەن. ئیدی بۆ دەبێ، بێ هۆ ناوی چەن زانایەکی گەورەی ئایینی ئیسلام، لەگەڵ ناوی کەڵەهۆنەرەکانی وەک « مەلای جەزیریی، مەولەویی، بێسارانیی، سالم، کوردیی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی » تێکەڵکرێ و لە یادی « نالیی » دەسوپەنجە ڕەنگین و سەنگیندا، تێهەڵکێشکرێن؟!!

با لێرەدا، نموونەیەک لە سەر ئەو مەلا موسوڵمانە سەرلێشێواوانە بێنینەوە. « موفتی پێنجوینی »، بە یەکێ لە هونەرە گەورە نەتەوەیی و پێشکەوتووخوازەکانی کورد دادەنرێ. هۆنراوەکانی بە کوردییەکی پەتیی نووسیوە. داکۆکیی لە ژنان کردووە. کەچی، کۆلکە مەلایەکی گێل و نەزان، لەوانەی بە هەڵە لە ئایین گەیشتوون، هەستی نەتەوەیی یان سڕبووە، لە بیری کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی شۆراونەتەوە. لە کوێرە دێیەکی نزیک شاری « بانە »، لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دەژیا. هۆنراوەیەکی درێژ

دەهۆنێتەوە، لەگەڵ نامەیەکدا بۆ « موفتی پێنجوێنی » دەنێرێ. گللەییەکی زۆری لێ دەکا، گوایە، چۆن باسی ژن دەکا ؟ چۆن بە زمانی کوردیی، نامە دەنووسێ و هۆنراوە دەهۆنێتەوە؟ ئەم کارانەش بە لادان لە ئایین و کۆتایی جیهان دادەنێ و دەڵێ :

داخی بە جەرگم ئاخر زەمانە

نیشانەی چاکی و ڕوو لە نەمانە

پاشان دەڵێ :

کاغەز نووسینیش کوردی زمانە

دیارە نیشانەی ئاخر زەمانە «50، 164-165»

« موفتی » هۆنەریش، بە هۆنراوەیەک وەڵامی دەداتەوە. دوای ئەوەی باسی ژن و ئازارەکانی ژیانی ژنانی بۆ دەکا، پاشان بۆی ڕووندەکاتەوە، کە پیاوێکی چەن دواکەوتوو و نەزانە، بۆیە دەڵێ :

عالەم بە سنعەت چوون بۆ ئاسمان

تازە تۆ ئەگەڕێیت بۆ ئاخر زەمان؟

پاشان دەڵێ :

نووسین بە کوردی تا کەی کوفرە لات

بۆچ لات ناخۆشە زمانی وولات

لێم زویر نەبی، هاوڕێی ژینتم

کوردم وێنەی تۆ هەم هاودینتم «50، 165-166»

لێرەدا، مەبەسم ئەوە نییە، نووسەرانی کورد بە هیچ شێوەیە نابێ، بە زمانی بیانیی بنووسن. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، گەلێ بە پێویستی دەزانم، «ڕووناکبیر، نووسەر و ئەکادیمیەکانی کورد »، دەربارەی « مێژووی کۆن و نوێی نەتەوەی کورد، جوگرافیای کوردستان، گرفتە سەرەکییە ڕامیاریی و نەتەوەیی یەکانی کورد »، بە زمانە جۆربەجۆرەکانی گەلانی جیهان بنووسن، تا لاپەڕە پرشنگدارەکانی « هونەر و وێژەی کوردیی، مێژووی کۆمەڵگەی کورد، لانکەی شارستانێتی کوردستان، ڕووی گەشی بزووتنەوەی کوردایەتی »، بە گەلانی سەر ڕووی ئەم زەوییە بناسێنن. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم، زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان

پشگوێخەن، یا بە زمانی نەتەوە سەردەسەکان، باسی بابەتێ بکەن، هیچ پێوەندییەکی بە کوردەوە نەبێ!
ئەوە جگە لەوەی، کێشەی نووسین بە زمانی نەتەوەیی، کێشەی کۆمەڵایەتیی و ڕامیاریی، هەسکردن بە بوونی قەوارەیەکی سەربەخۆ لای نەتەوەی کورد، بە بەراوردکردن لەگەڵ نەتەوەکانی دیکەدا، کێشەیەکی زۆر تازەیە. لەبەرئەوە، لەچاخە کۆنەکاندا، ئایین و ئایینزا بە چ زمانێ بووبێ، هەر ئەو زمانە وەک زمانی نووسین بەکارهێنراوە. بۆیە، کورد نەیتوانیوە، زمانەکەی خۆی بە سەربەستیی و بە ئاشکرا بەکاربێنێ، بە تەواویی کاری تێدا بکا، ڕێکیخا، ڕاژەیکا، پەرەی پێ بسێنێ و گەشەی پێ بکا. بەڵکوو، بە پێچەوانەوە، ساتبەسات و ڕۆژبەڕۆژ، تا هاتووە، گرفتی زمانەوانیی زیادیکردووە، دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، لە یەکدیی جیابوونەتەوە، بەرەبەرە، لە یەکدیش دوورکەوتوونەتەوە و جیاوازییان لە نێواندا دروسبووە.
بۆ نموونە: گەر ژمارەی هەموو کورد، لە کوردستانی مەزندا، بە لانی کەمەوە، بە سی میلیۆن کەس دانێین، جگە لەو کوردانەی بە دیالێکتی گۆران دەپەیڤن، ئەوا نزیکەی پازدە میلیۆنی، بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو، دە میلیۆنی بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو، چوار میلیۆنیشی بە زازایی « دملی » دەدوێن. ئەم دوو دیالێکتە ئەورۆ، لە نووسیندا بەکاردێنرێن، لە یەکدی جیاوازن و ئەوانەی قسەی پێ دەکەن، بە شێوەیەکی گران لە یەکدی دەگەن. جگە لەوەی، لە هێندێ ڕووشەوە، کەمێ جیاوازییان هەیە. لە بەر ئەم هۆیانە، لە ئەنجامدا زمانەکەمان، بە پارچەپارچەیی ماوەتەوە و یەکی نەگرتووە. دیارە، لە مێژووی نەتەوەکان و کۆمەڵگەی مرۆدا، هەمیشە چەن کارەسات و ڕووداوێکی گرنگ ڕوویداوە، بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ، ڕەوتی پێشکەوتنی « زمان، هونەر و وێژە »ی ئەو نەتەوانەی، لە شوێنی خۆیدا ڕاگرتووە، یا بەرەو دواوەی بردووە. بەڵام، ژیان بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گۆڕاندا بووە، بە شێوەیەکی بەردەوامیش، هەر لە گۆڕان و پێشکەتندا دەبێ. ئەم خەسڵەتەش، « گیانی نەبەزین، وەرەی بەرز، هێزی خەباتێکی بێوچانی »، بە نەتەوەکانی جیهان بەخشیوە

و دەبەخشێ. بۆیە، هەر کاتێ نەتەوەیەکی دیاریکراو، پێی لە یەکێ لە پێپیلکەکانی مێژوو هەڵخلیسکابێ، هەر زوو هەڵساوەتەوە، ملی ڕێی کاروانی پێشکەوتنی « هونەر، ویژە و زانست »ی وەبەرگرتۆتەوە، هەموو گرفتە کۆنەکانی پێشووی لە بیرچۆتەوە، لەگەڵ تەوژمی هاوچەرخی ئەو سەردەمەدا، بەرەو پێشەوە تەکانیداوە و هەنگاوی گەورەی ناوە.

جگە لەوەی، لە بەر کزیی و لاوازیی هەستی نەتەوەیی، کۆمەڵێ «کوردپەروەر، زانا و شارەزای زمانی کوردیی »، بیریان لەوە نەکردۆتەوە، یا نەیانویستووە، خۆیان تووشی ئەو دەردەسەرییە کەن، ئەلفوبێیەکی تایبەتیی، بۆ زمانی کوردیی دانێن و بنچینەی ڕێزمانێکی هاوبەشی پتەوی بۆ دارێژن. لە کۆتاییشدا، زمانێکی یەکگرتووی خوێندنەوە و نووسین بێتەگۆڕێ و ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە زمانی زکماکیی خۆیان بخوێنن.

« مەسعوود محەممەد » لەو بارەیەوە دەڵێ:(نەتەوەی کورد، هەرگیز زمانی نووسینی نەبووە، هەروەها خوێندنگەشی نەبووە، تا نووسین بە کوردیی فێری ڕۆڵەکانی خۆی بکا، بیریشی لەوە نەکردۆتەوە، بە کوردیی بنووسێ، بەڵکوو بە هۆی ئەو ناخۆشییە هەمیشەییەی دووچاری بووە، هەرگیز هەستی بەوە نەکردووە، بە کوردیی نەنووسین کەموکوڕیی بێ)«48،108» تەنانەت، نموونەیەکی لە سەر هێندێ کورد هێناوەتەوە، کە کاتی خۆی سوکایەتییان بە زمانەکەی خۆیان کردووە و گوتوویانە: (زمانی فارسیی شیرینە و زمانی عەرەبیی زمانی پەیامبەرە و زمانی تورکیی زمانی چاکەیە و زمانی کوردییش زمانێکی خراپە)«48،108» بۆیە، « موفتی پێنجوینی »یش، پلاری لەو جۆرە کەسانە گرتووە، دەردی دڵی خۆی هەڵڕشتووە، بە هۆنراوەیەکی چل دێڕی، لە ژێر ناوی « ناساندن »دا، لە ساڵی «1946»دا، دەربارەی زمان گوتوویەتی :

ئێستەش بە کوردیی تەفسیری قورئان<br>
کفرە لای گەلێ نەفام و نەزان<br>
بەڵام بە تورکی یان بە فارسی<br>
گەشکەدارئەبن بۆیان بنووسی<br>
وا عەرەبیمان کۆڵەکەی دینە

تورکی و فارسی بۆچ وا شیرینە؟
« ضرب المثل »یک هەبوو لە ناومان
ئەمانخوێندەوە ڕوون ئەبوو چاومان
عەرەبی کەوهەر تورکی زۆر هونەر
فارسی شەکەر کوردی ترِی کەر
ژیشک بێچووی خۆی لا شل و نەرمە
کەچی بێچووی من مشاری سەرمە
ئەو تێیگەیاندین هوشیاری کردین
ئەم نەزانینەی لە سەر لابردین
هەر کەسێ کەسە حەرفێکی بەسە
گەورەمە هەر کەس کە فریاد ڕەسە
دوژمنیش پەیکوڵ دەرێنێ لە پێم
گەر خاسی نەڵێم ئەبێ چی بڵێم «50، 168-169 »
جا گەر ئەمە، نموونەیەکی زەق و بەڵگەیەکی لە چاوچەقیوی، لاوازیی و ساکاریی هەستی نەتەوەیی، هێندێ لە باپیرە کوردەکانمان نەبێ، ئیدی دەبێ، لەوە زیاتر نیشانەی چیدیکەبێ؟!
هەڵبەتە، ئەم بارەی زمانی کوردیی تێکەوتووە، گەلێ هۆی جیاوازی هەبووە، وەک: (باری نەتەوەیی، نەخوێندەواریی، دواکەوتن و کارتێکردنی ئایین و ..) بەڵام، زۆربەی بۆ کارتێکردنی ئایین دەگەڕێتەوە. چونکە، هێندەی ئایینی ئیسلام، کاری لە هەست و هۆشی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد کردووە، هێندە کاری لە هەست و هۆشی، نەتەوەکانی دیکەی ناعەرەب نەکردووە. ئەو کارتێکردنە بە شێوەیە بووە، تەنانەت، لە سەردەمی میرنشینە کوردییەکانیشدا، نووسەر و زانا ئایینییەکانی کورد، زۆربەی زۆری بەرهەمەکانی خۆیانیان، بە زمانەکانی « عەرەبیی و فارسیی » نووسیوە.
بۆ نموونە: زانایەکی گەورەی بە ناوبانگی وەک، « شێخ مارفی نۆدێی - بەرزنجیی/ 1753 ـ 1838 »کە لە کوردستاندا ڕێبەری ڕێبازی « قادریی » بووە، لە سەردەمی هەرەتی دەسەڵاتی بابانەکاندا، لە سولەیمانی ژیاوە.

دوای ئەوەی، « برایم پاشا »ی بابان، لە « 1784ز »دا، شاری سولەیمانی دروسکرد، « شێخ مارف » یەکێ بووە، لەو خێزانانەی لەگەڵ بنەماڵەی میرەکانی باباندا، شاری سولەیمانیان ئاوەدانکردۆتەوە. هەر خۆشی، بناغەی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی دامەزراندووە. یەکەم مامۆستا و ئیمامی مزگەوتەکەش، هەر خۆی بووە. چەندین شاگردی گەورەی، ئایینیی پێگەیاندووە. چەندین دانراوی ئایینیی بەرزی، لە پاش بەجێماوە. پتر لە بیست بەرهەمی لە بواری هۆنراوە و بەرهەمی وێژەییدا داناوە، زۆربەیانی بە زمانەکانی عەرەبیی و هێندێکیشیانی بە فارسیی نووسیوە. کەچی، جگە لە « ئەحمەدی » کە بۆ کوڕەکەی « کاک ئەحمەدی شێخ »ی نووسیوە، هیچی دیکەی بە کوردیی لە پاش بەجێ نەماوە. (ئەم زانا دەرکەوتووە، لە بوارە جیاوازەکانی هونەر و زانستدا، پتر لە چلوشەش بەرهەمی بە هەر دوو زمانی « عەرەبیی و فارسیی » داناوە ..... نامیلکەیەکی پچکۆلەی داناوە، ناوی ناوە « ئەلئەحمەدیە فی تەرجومەت ئەلعەرەبیە بیلکوردیە » ئەوەش، فەرهەنگۆکێکی عەرەبیی کوردیی قەبارە پچکۆلانەیە، بۆ ئەو مەبەستە نا، خزمەتی زمانی کوردیی بکا، کە ئەویش و زۆربەی زانا کوردە موسوڵمانەکانی دیکە ـ خوا لە گوناهیان خۆشبێ ـ پشکۆییان خستبوو، بەڵکوو، تەنیا لە بەر چەن هۆیەکی کەسێتی بووە، کە کوڕەکەی فێری عەرەبیی بکا.)«38،27» جگە لەوەی « ئەحمەدی »یش، لە عەرەبییەوە بۆ کوردیی نووسراوە.(واتە: فەرهەنگی عەرەبییە نەک کوردیی)«15،102»

ئەوە لەکاتێکدا، زۆر لە پێش ئەو سەردەمەی شێخ مارفی تێدا ژیاوە، چەندین « نووسەر، هۆنەر و زانای کورد »، هەموو یا هێندێ لە بەرهەمەکانی خۆیان، بە کوردیی نووسیوە. وەک:« بابە تایەری هەمەدانیی 935 ـ 1010ز. عەلی حەریریی1010 ـ 1077ز. فەقێ تەیران1307 ـ 1375ز. مەلای جەزیریی1407 ـ 1481. عەلی تەرماخیی1591 ـ 1659ز. پیسارانیی1641 ـ 1702ز. ئەحمەدی خانیی1650 ـ 1706ز ... تاد ». تەنانەت، لەو سەردەمەی ئەویشی تێدا ژیاوە، چەندین هۆنەری پایەبڵندی کوردی وەک:«مەولانا خالید1783 ـ 1826ز. نالیی1797 ـ 1855ز. سالم 1800 ـ 1866ز. مەولەویی1806 ـ 1882ز. مەلای جەباریی1806 ـ

1876ز. سەی یاقو1808 ـ 1881ز. کوردیی1809 ـ 1849ز. حاجی قادری کۆیی1815 ـ 1892ز. مەحویی1830 ـ 1904ز ... تاد)، بەرهەمەکانیان بە کوردیی نووسیوە و هۆنراوەکانیان، بە زمانی شیرینی کوردیی هۆنیوەتەوە!

ئیدی، وەک ڕوونمانکردەوە، پیاوە خوێنەوار و ڕووناکبیرەکانی ئەو سەردەمانەی کورد، ڕوویان لە زمانی بیانیی و پشتیشیان لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیان کردووە، بۆیە، وەک د. « نەبەز »دەڵێ:

(بەو شێوەیە کوردەکان بە دابەشکراویی و پەرشوبڵاویی مانەوە، بوون بە پاشکۆی ئەم و ئەو، یەکێتی بیری هاوبەش و یەک بیروباوەڕی ئایینی کۆیان ناکاتەوە، کاروباری خۆیان پشکوێخست، وازیان لە زمان و وێژەکەی خۆیان هێنا، گاڵتەیان بە کەلتوور و کەلەپووری خۆیان دێ، لە نێوان ئەم و ئەویشدا بە دڕدۆنگی ماونەتەوە.)«32,22»

هەر چەندە، نەتەوەی کورد، لە مێژووی دوورودرێژی نەتەوەیی خۆیدا، چ لە سەر خاکی کوردستان و چ لە دەرەوەی کوردستان، چەندین دەوڵەت و میرنشینی گەورە و گچکەی جیاوازی دامەزراندووە، بەڵام، هەرگیز یەک دەوڵەتی نەتەوەیی نێوەندیی یەکگرتووی، لە کوردستاندا دا نەمەزراندووە. لەو بارەیەوە د. « نەبەز » دەڵێ:(گەر چی کورد، تا ئێستە دەوڵەتێکی نێوەندیی یەکگرتووی نەبوو، کە پشتی شێوەیەک لە شێوەکان بگرێ و ئەدەبیات بەو شێوەیە زۆرکا، بەڵام، لە ڕابوردوودا چەن ئەمارەتێکی سەربەخۆ هاتنەکایەوە، کە ئەدەبیاتی کوردیی تێیاندا پەرەیسەندووە. جا لەبەرئەوەی، ئەمانە چەن ئەمارەتێکی جیاجیابوون و تەنیا یەک ئەمارەتی یەکگرتوو لە کایەدا نەبووە، دیارە لە هەر ئەمارەتێکدا، ئەدەبیات بە شێوەیەکی دی گەشەیکردووە.)«23-11»

بەڵام، ئەز لەو باوەڕەدا نیم، میر و پاشاکانی کورد، لە بەر « چاوچنۆکیی، هەڵپەی دەسەڵات و کورسیپەرستیی، ناکۆکیی، ناپاکیی، بێگانەپەرستیی و بیری تۆڵەسەندنەوە »، بە هیچ شێوەیە، بایەخیان بە زمانی کوردیی دابێ. یا تەنانەت، بیریان لەوە کردبێتەوە، زمانی کوردیی، بە زمانی ڕەسمیی ئەو دەوڵەت و میرنشینانە دانێن. بەڵکوو، بە زمانەکانی

«فارسیی، عەرەبیی و تورکیی »، کاروباری دەسەلاتی قەڵەمڕەوەکانیان ڕاپەڕاندووە. دەربارەی ئەو سیوپێنج میرنشینەی کورد لە مێژووی خۆیدا دامەزراندووە، د. « کەمال فوواد » دەڵێ: (لەو میرنشینانەدا، کەلتووری ئیسلامی زاڵبووە، زمانی عەرەبیی و فارسیی، وەک زمانێکی ڕەسمیی تێیاندا بلاوبووە)«6،98».

لێرەدا دەبێ، قسەیە بۆ خوا و بۆ ویژدانی نەتەوەییشمان بکەین: سەرەڕای ئەوەی لە بەرەبەیانی مێژووەوە، داگیرکەران بە هەموو شێوەیە، کوردستانیان داگیر و دابەش و کاولکردووە. سەرەڕای ئەو هەموو « گرتن، کوشتنوبڕین، ڕاونان و دەربەدەریی »ەی، بە سەر ڕۆڵەکانی کورددا هاتووە. سەرەڕای ئەو هەموو « کوێرەوەریی، چەرمەسەریی، زۆرداریی، ژان و ئازار »ەی، کۆمەلانی خەڵک چێشتوویانە. سەرەڕای ئەو هەموو بارودۆخە نالەبارەی، خەڵکی کوردستان پێیدا تێپەڕبوون. سەرەڕای ئەو هەموو « نەخۆشیی، هەژاریی، نەزانین و نەخوێندەواریی »ەی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد دیویانە. هەر چەندە، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، زمانێکی یەکگرتووی ئاخافتن و نووسینمان نەبووە و نییە، بەلام، هێشتا باووباپیرانمان، زمانەکەی خۆیان وەک زمانی ئاخافتن، لە نێو کاسەی سەر و قەفەزەی سنگدا، بە دڵ و بە گیان، لە تواندنەوە و شێواندن پاراستووە. لە پێناوی نەفەوتاندنی زمانەکەی خۆیاندا، گەلێ قوربانیی گەورەیان داوە. هێندێ جاریش، سەر و ماڵیان لەو ڕێگشیەدا داناوە.

« مینۆرسکی » لەدوا نووسینیدا، لە ساڵی «1966»دا، دەربارەی کورد، لە گوتاری « کورد نەوەی مادەکانن » دەڵێ: (ئەوەی مایەی سەرسوڕماندن و بەڵگەی یەکێتی کوردەکان بێ، زمانەکەیانە. هەر چەندە، لە نێوان شێوەکانیدا، جیاوزایشی تێدا هەبێ، بەلام، لە ڕووی دەنگ و ڕێزمانەوە، هەر تەنیا یەک زمانە ...)«97،58».

نابێ، ئەوەشمان لا سەیربێ، ئەوەتەی نەتەوەی کورد هەیە، خاوەنی دەولەتێکی ناسیۆنالی یەکگرتووی خۆی نەبووە. بۆیە، هەر لە کۆنەوە، لە ڕێگەی دەزگەیەکی بە هێزی خاوەن توانای « مرۆیی، کەلتووریی و ئابووریی دەولەت »ەوە، بە هیچ جۆرێ وەک پێویست، ڕاژەی زمانەکەمان نەکراوە.

کەچی، هێشتا ووشەی پشکۆی گەشی، نێو ئاگردانی زمانی کوردیی، هەر گەشە و وورشەی دێ، هەر زیندووە و نەمردووە، لە بەردەم شەقی ڕۆژگار و دەسی گلاوی تواندنەوەدا، بە تەواویی خۆی ڕاگرتووە و لە خەمی تواندنەوە ڕەخسیوە، وەک هێندێ زمانی دیکەی لێ بە سەر نەهاتووە، ڕەشەبای داگیرکردن لەنێوبردبێ، چەوساندنەوە تواندبێتییەوە و لە بیری بردبنەوە. شتێکی سەیر نییە، گەر ڕۆژهەڵاتناسێکی وەک « مێجەر سۆن » گوتبێتی: (لە ساڵی401 پێش لەدایکبوونەوە، ئەو کاتەی زەینەفۆن گەلی کاردۆخی پێکەیشت، کوردستان بووە جێنیشتەنی گەلێکی کۆن، کە خاوەنی زمانی تایبەتیی خۆی بووە. ئەم گەلە خۆیان و زمانەکەشیان، لە هەموو تێکەڵییەک پاراستووە و ئەگەر بێتو کوردیی لەگەڵ هەر زمانێکی تر بەراوردکەین، دەبینین: کورد زمانی خۆی لە هەموو گەلێکی تر زیاتر پاراستووە، بەڕادەیەک جیاوازییەکی زۆر نییە، لە نێوان کوردیی ئێستە و کوردیی پێش سەدەها ساڵدا.)«19،92»

جا هەر واشە، لە ڕاستیدا، هەر نەتەیەک لە مێژوودا، وەک کوردی لێ بەسەربهاتایە، دوور نەبوو، ئەوڕۆ ناوی لە نێو ناواندا بمایە. بەڵام، سەرەڕای ئەو هەموو پەتپەتییەی بەسەریهاتووە، هێشتا نەتەوەی کورد توانیویەتی، بە چاکی پارێزگاریی زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆی بکا.(بە ڕاستیی جێگەی سەرسوڕمانە، کە زمانی کوردیی، لە هەنگامەی ڕۆژگارانی ڕابردوودا، کەلانە دەربازبووە، ئیمڕۆ لە مەیدانی پێشکەوتندا، بەرەو تەکامول پەلدەکوتێ، مێژوو نیشانماندەدا، گەلێ زمانی وا لەناوچوون و ئاسەواریان بڕاوەتەوە، کە دەیەکی ئەوەی بە سەر زمانی کوردیی هاتووە، بە سەر ئەوان نەهاتووە. جا زمانێ کە ئەو هەموو تێن و توانەی هەبێ، کە هەڵسووڕهەڵسووڕی چەرخی زەمانە نەیتوانیبێ، لە ژێر خۆیدا بیپلیشێنێتەوە، توانای ئەوەشی هەبێ، زۆر بە خێرایی گەرد و تۆزی ئەم ڕێگە دوورە لە شانی خۆی بتەکێنێ و لە ڕیزی زمانانی پێشکەوتووی ئەم دەور و زەمانەدا جێگەی خۆی بکاتەوە.)«8،70»

هەر لەم باوەڕەوە، گەر زمانی کوردیی، لەگەڵ زمانی « ئینگلیزیی، فرەنسیی، ڕووسیی، ئەڵمانیی » و هێندێ لە زمانەکانی دیکەی زیندووی

گەلانی جیهان بەراوردکەین، ئەوا بە ڕاشکاویی دەتوانین، بلێین: زمانی کوردیی، لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر دواکەوتووە. بەڵام، گەر بالای زمانەکەمان، بە بالای زمانی « تورکیی، فارسیی، تاژیکیی، ئازەریی » و زمانە مردووەکانی دیکەی، گەلانی ناوچەکە بگرین، سەرەڕای ئەو هەموو «داگیر و دابەشکردن، چەوساندنەوەی نەتەوەیی و قەدەغەکردنی زمانی کوردیی » ، هێشتا هەر تای تەرازووی زمانی کوردیی، لە تای تەرازووی ئەو زمانانە، گەلێ سەنگینتر و قورسترە.
ماموستا « خاڵ »یش لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (ئەتوانم بلێم، ئەمە دوو هەزار ساڵە، خەرمانی زمانەکەمان، لە لایەن دراوسێکانمانەوە بە جەنجەڕی زۆر و ستەم گێرەکراوە و کوتراوە و شەنوکەوکراوە و بە بادراوە، لەگەڵ ئەمیشە یەشتا لە زمانی فارسیی دەوڵەمەندترە، چە جای تورکیی.
بێگومان، ئەوەتی زمانی کوردیی هەیە، گەلێ زمانی تر لەدایکبوون و هاتوونەتە جیهانەوە، لە پاشا نەیانتوانیوە، لە بەر وەیشوومەی ڕۆژگارا بوەستن، بەڵکوو مردوون و لەناوچوون، بەڵام زمانی کوردیی وەک کێوی «پیرەمەگروون » وەستاوە و سنگی داکوتاوە، وە لە بەر هیچ سێلاوێکی ڕۆژگار و گێژەلووکەیەکی چەرخی کەچڕەفتارا نەلەرزیوە و دانەچلەکیوە، ئەمەش وا بزانم، لەبەر دوو شتە:
1. کوردستان شوێنێکی شاخوداخاویی زۆر سەختی کووڕی وایە، کە هەرگیز بێگانە نەیتوانیوە، تیا هەڵکا، وە بەم بۆنەیەوە، گەلی کورد هەر وەک خوێنی بە پاکیی ماوەتەوە، زمانەکەشی بە چاکیی ماوەتەوە.
2. کورد مەردییەکیان هەیە، دووانیان کە لە شوێنێک کۆببێتەوە، بە زمانی خۆیان نەبێ، قسە ناکەن، وە هەرگیز دەس لە زمانەکەیان هەڵ ناگرن، نابینییت، برا فەیلییەکانمان سێسەد ساڵە لە بەغدان، کەچی هێشتا زمانەکەی خۆیان فەرامۆش نەکردووە، وە لە ناو خۆیانا هەر بە کوردیی قسەئەکەن. )«25،102»
بەلێ، زۆر ڕاستە، هەر زۆر لە کۆنەوە، کورد گوتوویەتی: کورد بە چیاوە ماوە! ئەمەش خۆی لە خۆیدا، وەک هەموو دەرکەوتەیەکی دیکە، لایەنی باشە و خراپەی هەیە. گەر یەک لایەنی باشەی هەبێ، تەنیا ئەوەیە، کوردی

لە دەس ملهوڕیی و زۆرداریی، زمانی کوردیشی لە دەس تواندنەوە و لەنێوچوون پاراستووە. گەر یەک خراپەشی هەبێ، ئەوەیە، کورد هەموو ناوچە دەشتایی و شوێنە تەختاییەکانی کوردستانی چۆلکردووە، بۆ نەتەوە دراوسێ داگیرکەرەکانی بەجێهێشتووە.
بۆیە، ڕۆژهەلاتناسێکی وەک « مینۆرسکی » گوتوویەتی:(بە شێوەیەکی گشتیی ئەتوانین، بلێین: کورد و چیا لێک جیا نابنەوە، هەر لەگەل دەشت دەستپێکرد، ئیتر کوردەکان بەجێیدێلن بۆ عەرەب و تورک، تا نزیکی زەریاچەی وانیش بۆ ئەرمەنییەکان.)«33،112»
بەلام، بریا هێندەی باووباپیرانمان، بە تەنگ پاراستنی زمانەکەیانەوە بوون، نیو هێندەش، بە تەنگ « یەکێتی ڕیزەکانی گەل، برایەتی کورد و کورد، پاراستن و ڕزگارکردنی نیشتمان »ەکەیانەوە بوونایە. بیریان لە «یەکێتیی، تەبایی، ئازادیی، سەربەخۆیی نەتەوەیی » بکردایەتەوە و دەولەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزرانایە. چونکە، هێندێ نەتەوە، زمانی نەتەوەیی خۆیان لەدەسداوە، تا ئێستەش بە زمانی نەتەوەیەکی دیکە دەپەیڤن و دەنووسن، کەچی خاوەنی دەولەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیانن!
گەر لێرەدا، بەراوردێکی پچووک، لە نێوان « زمان، چارەنووس و مافی نەتەوەکان »دا بکەین، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کورد بە گشتیی، دریغی لە پارێزگاریکردنی زمانی ئاخافتنی نەتەوەیی خۆی نەکردووە. هەمیشە لە سەر حسێبی زمانەکەی خۆی، قوربانیی بە خاک داوە!
بۆیە، گەلێ ناوچەی گرنگی وەک:(هەمەدان، ورمێ، موسل و ئەسکەندەرون ... تاد)، لە خاکی نیشتمانەکەی دابڕاوە. دەتوانین، بلێین: نزیکەی لەدەسچووە. تا ئێستەش، دەولەتی ناسیۆنالی خۆی بۆ دانەمەزراوە. لە کاتێکدا، چەندین گەلی وەک: «تاجیک و ئەفگان، هیندییەکانی باکوور و چەن گەلێکی ئەفریکایی »، بەو چەشنەی کوردیان لێ بەسەر نەهاتووە، تا ئەوڕۆش خاوەنی زمانی نەتەوەیی خۆیان نین. بەلام، هیچ پارچە زەوییەکیان لەکیس نەچووە، لە سەر خاکی نیشتمانەکەی خۆیان دەژین و دەولەتی ناسیۆنالی خۆشیان هەیە.
با لێرەدا و لە کۆتایی ئەم بەشەدا، باسی خالێکی دیکەی گرنگ بکەین.

له مێژووی پڕ له ڕەنجەڕۆیی و شەرمەزاریماندا، بە هەزاران کوردمان هەبووە و هەیە، لەو زەریا پانوبەرینەی «زمان، هونەر، وێژە و مێژووی گەلانی جیاوازی جیهان »دا، هێندە شارەزا و لێهاتوون، وەک بێچوە مراوی مەلەدەکەن. کەچی، لە « زمان، هونەر، وێژە و مێژووی نەتەوە »کەی خۆیاندا، گەر بیانگوشی، تلّپی تەڕی زانیاریان تێدا نییە. کاتێ لێشیان دەپرسی، بۆ بەو شێوەیە، لە کەلەپور و فەرهەنگی نەتەوەکەی خۆتان دابڕاون، هەموو تاوانەکە، لە ئەستۆی داگیرکەرانی کوردستانەوە دەئاڵێنن!
سەیرە! وەک ئەوەی لەم جیهانەدا، تەنیا خاکی کوردستان داگیرکرابێ، تەنیا نەتەوەی کورد ژێردەسبێ و داگیرکەران بیچەوسێننەوە! ئەدی بۆ تەماشایەکی لاپەڕەکانی مێژووی گەلان نەکەین، بزانین، هەموو ئەو گەلانەی ڕۆژێ لە ڕۆژان، وەک کورد بندەسبوون، چۆنچۆنی پارێزگاریی زمان و سامانی نەتەوەیی خۆیان کردووە؟!
با لێرەدا، تەنیا دوو نموونە بێنینەوە. جووەکان ئەوەتەی هەن، لە خاکی خۆیان دەربەڕێنراون. لە هەموو قوژبنێکی ئەم جیهانەدا دەچەوسێنرانەوە. بە دەربەدەریی و ترسولەرزەوە دەژیان. دەتوانم، بڵێم: لە کورد خراپتریان بەسەرهاتووە. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، بە باشترین شێوە پارێزگاریی« ئایین، زمان، کەلتوور و ترادیسیۆن »ی خۆیان کردووە. ئەرمەنییەکان لە تورکیادا، گەر لە کورد خراپتریان بەسەر نەهاتبێ، ئەوا هەرگیز باری ژیانیان، لە کورد باشتر نەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، زمانەکەی خۆیان بە باشیی پاراستووە و پەرەشیان پێ داوە.

## 14. گرفتەکانی زمانی کوردیی :

ئەورۆ زمانەکەمان، تووشی گەلێ گرفتی لاوەکیی و سەرەکیی بووە، هەرە گرنگەکانیان، ئەمانەی لای خوارەوەن :

### 1/ دیالێکت و خواردیالێکت :

با لێرەدا، پێشەکیی ئەو زاراوە جیاجیانەی بۆ دیالێکت، لە زمانی کوردیدا بەکاردێنرێن، کەمێ لێیان وردبینەوە و روونیانکەینەوە. پاشان، زاراوەیەکی گونجاویان لێ هەڵبژێرین. بە داخەوە، وەک کورد لە هیچ شتێکدا یەککگرتوو نەبووە و نییە، لە بەکارهێنانی زاراوەکانیشدا یەککگرتوو نییە. هەموو ئەمانە:« زار، زمان و زبان » بۆ زمان و « زاراو، زاراوا، زاراوە، شێوە، بەش، بن، خوار، نیمچە، بێچوو، لەهجە و دیالێکت »، بۆ یەک مەبەس بەکاردێنرێن. بەڵام، لە ڕاستیدا ئەم ناوە زۆرانە، لە زماندا نە باشە و نە نیشانەی دەولەمەندیی زمانەکەش دەگەیەنێ. چونکە، جگە لەوەی پێویستە، تەنیا یەک زاراوە هەبێ، بۆ ئەو مەبەستە بەکاربێنرێ، هەر یەکەشیان واتایاکی تایبەتیی هەیە و بۆ مەبەستێکی دیاریکراو دەبێ. لەبەرئەوە، من لە سەرانسەری نووسینەکەمدا، لە بری ئەو هەموو زاراوانە، بۆ هەر یەکێ لە یەکەکانی زمان، زاراوەی « دیالێکت، بەش و لقە دیالێکت » بەکاردێنم، هەروەها، خواردیالێکتیش بۆ هەر دوو « بەش » و « لق »ەدیالێکت بەکاردێنم. بۆ نموونە: دیالێکتی کرمانجیی، دیالێکتێکی سەربەخۆیە. لە خوار ئەوەوە، هەر دوو بەشەدیالێکتی کرمانجیی « خواروو و ژووروو »پاشان، لە مانیش پچووکتر، لقەدیالێکتەکانیانی «سولەیمانیی، موکریی، بادینانیی و ... » دێن.

بە داخەوە، تا ئێستە، نەک هەر زۆربەی زۆری کورد، بەڵکوو، هێندێ لە ڕووناکبیر و نووسەرەکانیشمان، جیاوازیی لە نێوان(زمان، دیالێکت و خوار دیالێکت)دا ناکەن. بۆیە، هێندێ جار لە نووسینەکانیاندا، هەڵەی گەلێ زەق دەبینرێ. لە بری ئەوەی بڵێن: زمانی کوردیی، دەڵێن: زمانی «سۆرانیی، بادینانیی، زازایی، هەورامیی یا سولەیمانیی ... تاد» ئەمە خۆی لە خۆیدا، هەڵەیەکی گەلێ گەورەیە. چونکە، بەپێی بنەما

زانستییەکانی زمانەوانیی، هەر زمانێ بەگوێرەی دروسبوون و هەڵکەوتی تایبەتیی خۆی، لە چەن دیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە. واتە: هەموو زمانێ، بە سەر چەن دیالێکتێکدا دابەشدەکرێ. پاشان، گەر هەر دیالێکتێ لەو دیالێکتانەش، بەپێی ناوچە جوگرافیاکان دابەشکرێن، ئەوا هەر دیالێکتێ، چەن بەشێکی دیکە، لە بنباڵی خۆی دەگرێ. کەواتە، بە هەموو دیالێکت و خواردیالێکتەکان، یەک زمانی یەکگرتووی دیاریکراو پێکدێنن. بۆیە، بۆ نموونە بە هەموویان دەڵێن: زمانی کوردیی، زمانی عەرەبیی، زمانی ئەڵمانیی یا ... تاد.

دیالێکت ـ « Dialect »، زاراوەیەکی لاتینییە، لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا بەکاردێنرێ. لە زمانی عەرەبیدا « لەهجە »ی پێ دەگوترێ. بەڵام، لە زمانی کوریدا، تا ئێستە، چەن زاراوەیەکی وەک: «زار، زاراو،زاراوا، زاراوە، شێوە، بەش،بن، خوار، نیمچە، بێچوو) بۆ دیالێکت، بەش و لقەکانی داتاشراوە. لە ڕاستیا، بە تەواویی دیار نییە، کامیان بۆ بەش و کامیان بۆ لقەدیالێکت بەکاردێنرێن. چونکە، هەر نووسەرەی بەپێی دید و بۆچوونی خۆی، یەکێکیان بەکاردێنێ. جگە لەوەی، هەموو زاراوەکان، چ بۆ بەش و چ بۆ لقەدیالێکتەکان تێکەڵاوکراون. هەروەها، لە دیالێکتیش پچووکتر، بە زمانی بیانیش « Sub Dialect یا Semi » و لە عەرەبیشدا « تەحتە ئەللەهجە یا شوبە لەهجە » بەکاردێنرێن.

ئەم زاراوانە، لە ڕواڵەتدا یەک واتایان هەیە. بەڵام، جگە لەوەی هێندێکیان بە هەڵە بەکاردێنرێن، لە هەمان کاتیشدا، سەر لە خوێنەر دەشێوێنن. بۆ نموونە: « شێوە » ڕاست نییە و « شکل »ی عەرەبیی دەگەیەنێ. د. « کەمال فوواد » دەربارەی « شێوە و زاراوە » دەڵێ: (یەکەمیان زیاتر بە مانای یەکێک لە شێوە ئەدەبییەکانی نووسین « Written Languge » دووەمیان بە مانای یەکێک لە شێوەکانی زمانی گفتوگۆ « Spoken language »)دێ.«26،88» بۆ ئەوەی خۆمان، تووشی ئەو گرفت و هەڵانە نەکەین، بە باوەڕی من، لە بری « شێوە یا زاراوە » باشتروایە، زاراوە بۆ « مصطلح »ی عەرەبیی، « Herminus »ی لاتینی و « Termin »ی ئینگلیزیی بەکاربێنین. بەڵام، لە بری ئەو دووانە،

«دیالێکت » ، لە زمانی کوردیدا بچەسپێنرێ. چونکە، واتاکەی لەبێ گونجاوترە، هەموو خوێنەوارێکی کوردیش تێیدەگا. دیارە، ئەو بەشانەی لە خوار دیالێکتیشەوە دێن، شارەزایانی زمانی کوردیی، چەن ناوێکی جیاوازیان بۆ داناون. وەک: (بندیالێکت، خواردیالێکت، نیمچەدیالێکت و بێچووەدیالێکت و ...) کە هەموویان هەر یەک واتایان هەیە. بۆ نموونە: « تۆفیق وەهبی » ، زاراوەی « بێچوو »ی داناوە. هێندێ « بندیالێکت » و هێندێکی دیکە « خواردیالێکت » و هێندێکی دیکەش « بەشەدیالێکت » دەنووسن. بە لای منەوە، « بەشەدیالێکت » لە هەموویان ڕێکوپێکتر و گونجاوترە، بەڵام « خوار، بن، بێچوو و نیمچە » دیالێکتیش دەگونجێن. مامۆستا « وەهبی » ، زمانی کوردیی بە سەر چوار دیالێکتی سەرەکیدا دابەشکردووە: «کرمانجیی، گۆرانیی، زازایی و لوڕیی » هەر دیالێکتێکیشی، بە سەر چەن بێچووەدیالێکتێکدا دابەشکردۆتەوە. پاشان، لە خوار ئەوانیشەوە، هێندێ بەشی دیکەی داناوە، بەڵام، ناوی لێ نەناون، نازانین، چییان پێ دەڵێن؟ بۆ نموونە: بەپێی ئەم دابەشکردنە، گەر دیالێکتی گۆران بگرین، دەبینین: لە «باجەلانیی، کاکەیی، زەنگنەیی و هەورامانیی »پێکهاتووە. نەک وەک « محەمەد ئەمین هەورامانیی » ، لە گەلێ جێگەی نووسینەکەیدا دەنووسێ: (زمانی کوردیی هەورامانیی)«5،100» بەڵکوو دەبووایە، بینووسیایە، بێچووەدیالێکتی هەورامیی. هەروەها، د. « کەمال فوواد »یش، لە هێندێ شوێنی گوتارەکەیدا «چەند سەرەتایەکی زمانەوانیی » ، چەن جارێ چەمکی(ئەو دوو زمانە ئەدەبی یەی)«25،88» بەکارهێناوە و دووبارەیکردۆتەوە. مەبەسیشی لە(دوو زمانە ئەدەبی یە)کە، (کوردیی ڕۆژاوایی یان کرمانجیی ژووروو ... کوردیی ڕۆژهەڵاتی یان کرمانجیی خواروە)«20،88» جگە لەوەی، ئەو دوو بەشە زمانێکی جیاواز نین، بە هەر دووکیشیان یەک دیالێکتی کرمانجیی پێکدێنن. چونکە، لە هەموو دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردیی، لە یەکدیەوە نزیکترن. بۆیە دەبووایە، کادیرێکی ئەکادیمیی وەک د. « کەمال » ، ئەو هەڵە گەورەیەی نەکردایە، هەر لە ئێستەوە بڕیاری، دوو زمانی وێژەیی کوردیی نەدایە، بەڵکوو ڕاستروابوو،

بینووسیایە: هەر دوو شێوە زمانی کوردیی، کە لە نووسیندا بەکاردێنرێن، وەک لە ڕەخنە و تێبینییەکانی خۆشیدا، ڕوونیکردۆتەوە!
هەروەها، زۆربەی زۆری کورد، بە هەڵە لە کاتی ئاخافتن و هێندێ جار لە نووسینیشدا، زمانی یا دیالێکتیی «سۆرانیی و بادینانیی »بەکاردێنن. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا، هەڵەیەکی زمانەوانیی گەلێ گەورەیە. چونکە، یەکەم: « بادینان و سۆران » ناوی دوو ناوچەی دیاریکراوی باشووری کوردستانن. دووەم: هەر یەکەیان لە ژێر خانەی بەشەدیالێکتێکدا پۆلێنکراون، وەک «بادینانیی » لقێکە لە بەشەدیالێکتی کرمانجی ژووروو. « سۆران »یش لقێکە لە بەشەدیالێکتی کرمانجی خواروو. ئەو دوو بەشەدیالێکتەش، یەک دیالێکت پێکدێنن، ئەویش بە کرمانجیی ناسراوە. بۆ نموونە: ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسیی « روجیە لسکۆ » دەڵێ:(زمانی کوردیی، بە بەشێ لە کۆمەڵە ئێرانییەکان دادەنرێ، دوو دیالێکتی سەرەکیی هەیە. ئەوانیش، «کرمانجیی و صۆرانیی »یە. هەر دووکیشیان چەن دیالێکتێکی ناوچەیی جیاوازی دیکەیان تێدایە.)«11،18» جگە لەوەی، ئەم دابەشکردنە بە هەڵەیەکی گەورە دەژمێررێ، « سۆرانی »یش بە « صۆرانیی » نانووسرێ. هەروەها، بەپێی فاکتەری جوگرافیا، نەک لە ڕووی جیاوازیی زمانەوانیی نێوان دیالێکتەکان، زمانی کوردیی دابەشکردووە. لە مەشیاندا، دیسان بە هەڵەدا چووە، کاتێ دەڵێ:(کرمانجیی، زۆر جار، بە دیالێکتی باکوور دەناسرێ، لەم هەرێمە کوردییانەشدا « کوردستانی باکوور و خۆراوا » و قەفقاز، هەروەها بەشی باکووری کوردستانی ئێران و عێراق بڵاوبۆتەوە. بەڵام «سۆرانیی » پێشی دەگوترێ: « باوکی کوردیی »، لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی خواروو، واتە: لە ناوچەی سولەیمانیی بە تایبەتیی بەکاردێنرێ.) «11،18» سەیر ئەوەیە، ئەم پەتای « سۆرانیی و بادینانیی »ە، لە ڕێگەی کورد خۆیەوە، گەلانی دیکەی جیهانیشی گرتۆتەوە. ئەوانیش، کوردیی «سۆرانیی » و « بادینانیی » بەکاردێنن. لەبەرئەوە، ڕاستروایە، لە بری ئەو دوو زاراوەیە، تەنیا زمانی کوردیی/ دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو بەکاربێنین. بە داخەوە، « پارتیی » و « یەکێتیی »ش، هێندەی دیکە ئەو گرفتەیان قووڵکردۆتەوە.

جگە لەوەی، هەر لە یەکەم سەرنجەوە دەتوانین، بلێین: بەرهەمەکەی «هەورامانیی »، «زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوورد دا »، لە ناونیشانەکەیدا سەرکەوتوو نییە. چونکە، جگە لە هەڵەی ڕێنووس، لە ڕووی زمانەوانیشەوە، واتاکەی هەڵەیە. ووشەی « زار » دوو جۆر واتای هەیە.

یەکەم : دەتوانین، لە باتی زمان، نەک لە بری دیالێکت بەکاریبێنین. کە دەڵێین: زاری کوردیی، واتە: زمانی کوردیی. دیارە، «زاراو، زاراوا و زاراوە »ش، هەر لە زارەوە وەرگیراون، وەک چۆن « ئاییینزا » لە ئاییینەوە وەرگیراوە.

دووەم : لە هێندێ ناوچەی کوردستاندا، ووشەی « زار » بە « دەم » دێ. بۆ نموونە: لە هێندێ شوێن دەڵێن: زارم دێشێ، وەک، مامۆستا خۆشی لە جێگەیەکدا، بۆ ئەو مەبەسە بەکاریهێناوە، کاتێ دەڵێ:(دەنگ بچووکترین کەرەسەی زمانە، ئەگەر زانیمان زمان ئاخافتنە، لە زارەوە « دەم » بە هۆی بەشداربوونی هەندێ ئەندامانی ئاخاوتنەوە و بای هەناسەوە بە ڕێکوپێکی بە پێی پێویستی دێتە دەرەوە ..)«74،100» جگە لەوەی، گریمان دەتوانین، « زار » لە بری « زاراوە » بەکاربێنین، دیسانەوە هەر هەڵەیە. چونکە، « زار » تاکە و « زارەکان »کۆیە، وەک بە عەرەبییەکەیدا دەردەکەوێ،« ئەللەهجات »نووسراوە، نەک« ئەللەهجە»بێ! خۆ گەر تەنیا، هەر دوو بەشەدیالێکتەکانی « هەورامانیی و سۆرانیی » بەراوردکردایە، ئەو کاتە دەبووایە، ناونیشانەکەی بە شێوەیەکی دیکە بووایە. دوای ووشەی « زار »یش، لە ناونیشانی پەرتووکەکەدا، زمانی کوردیی دێ. دەبووایە، کوردی بە دوو « ی » بنووسرایە. چونکە، گەر دوو ووشە بە دوای یەکدیدا هاتن و هەر دووکیان بە پیتی « ی » کۆتاییانهات، دواووشەیان بە دوو « ی » دەنووسرێ. بۆ نموونە: (بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی، زمانی کوردیی و ... تاد). هەروەها. بۆ ووشەی « بەراوورد دا »ش، ڕاستروایە، بە « بەراووردکردندا» بنووسرێ. کەواتە، ناونیشانی پەرتووکەکە، بەم شێوەیە ڕاستر، شیرینتر، ڕەوانتر و کوردیترە: « زاراوەکانی زمانی کوردیی لە تەرازووی بەراووردکردندا ».

هەر لێرەدا دەمەوێ، دەربارەی « زمان، زبان و زار »، شتێ ڕوونکەمەوە. ئەویش ئەوەیە، لە زمانی کوردیدا، زۆربەی زۆری کورد، ئەو سێ ووشەیە، بۆ دوو مەبەس بەکاردێنێ. زمان وەک بابەتی زمانەوانیی و ئەندامەکەی نێو دەمە. لە ڕاستیشدا، هەر سێکیان پێوەندییان بە بابەتی زمانەوانییەوە هەیە. دەتوانین، بڵێین: زمانی کوردیی، زبانی کوردیی یا زاری کوردیی. هەروەها دەتوانین، بڵێین: زمانم دێشێ، زبانم دێشێ یا زارم دێشێ. هەڵبەتە، ئەمە بەپێی دیالێکت و ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەگۆڕێ. بەڵام، ئەز پێشنیازدەکەم، « زمان » بۆ بابەتی زمانەوانیی و « زبان »یش بۆ ئەندامەکەی جەستەی مرۆڤ « نێو دەم » بەکاربێنرێن. بۆ ئەوەی ئێمەش، دوو زاراوەی جیاوازمان هەبێ، ئەو دوو شتەش، بە ئاسانیی لە یەکدی جیاکەینەوە. هەر کە گوتمان: زمان، بزانین، مەبەسمان چییە. یا کە گوتمان: زبان، یەکسەر بەرانبەرەکەمان لێمان تێبگا، مەبەسمان زمانی کوردیی نییە، بەڵکوو بەلاکەی نێو دەمە!

لە هێندێ زماندا، بۆ هەر دوو شتەکە، دوو ووشەی جیاواز بەکاردێ. بۆ نموونە: لە زمانی عەرەبییدا « ئەللیسان و ئەللوغە »یان هەیە. هەر چەندە، « ئەللیسان » پتر بۆ زبان دەبێ، بەڵام « لیسان ئەلعرب »یش دەگوترێ. لە زمانی ڕووسیدا « یەزیک » بۆ هەر دوو مەبەسەکە بەکاردێ. لە زمانی ئینگلیزیی و سویدیدا، دوو ووشەی جیاواز هەیە. وەک لە ئینگلیزیدا « Language » بۆ زمان و «Tongue» بۆ زبان، لە سویدیدا « سپرۆک - Språk » بۆ زمان و « Tung » بۆ زبان باوە. هەر چەندە، لە زمانی ئینگلیزیشدا، هێندێ جار، « Mother tongue »یش بەکاردێ، بەڵام، زۆر بە کەمی.

« هەورامانیی »، خۆی ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێ، کە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بە هەڵە ناودەبەن، لە بری « کرمانجیی ژووروو و خواروو »، ووشەی « بادینایی و سۆرانیی » بەکاردێنن. کەچی، هەر خۆشی لە چەن شوێنێکی بەرهەمەکەیدا، ئەو هەڵەیە دووپاتدەکاتەوە. بۆ نموونە: (ناوچەکانی دیاربەکر و بەدلیس و ماردین و بۆتان و حەکاریی و ئاکرە و شێخان و پارێزگای دهۆک، سەرپاکی بە زمانی کوردیی بادینانیی

گفتوگۆدەکەن. ناوچەکانی موکریان و سۆران و پارێزگای سلێمانیی و کەرکووک بە زمانی کوردیی « سۆرانیی » گفتوگۆدەکەن. ناوچەی هەڵەبجە و هەورامانی عێراق و هەورامانی ئێران و لە نێوان کرماشان و سنە و پێنجوین بەرەو خواروو « کوردستانی خواروو » بە زمانی کوردیی«گۆران » گفتوگۆدەکەن.)«68،100» هەر چەندە، نووسەر خۆی لە ژێر سەردێڕی «بەراوردکردنی زاری هەورامانی و سۆرانیی لە ڕووی دەنگسازییەوە »، پەراوێزێکی بۆ داناوە و دەڵێ:(مەبەست لە زاری « سۆرانیی » زاری کرمانجیی نێوەڕاستە بە شێوەیەکی گشتیی و دیالێکتی سلێمانیی بە شێوەیەکی تایبەتیی، وەک « هەڵەیەکی باو » بەو جۆرە ناونراوە و بە سەریا سەپێنراوە.)«85،100» هەر وەک پێشتر ڕوونمانکردەوە، لێرەدا زار بەکار نایە، بەڵکوو، زار بە زبان دێ، نەک بە دیالێکت. جگە لەوەی، «هەورامانیی و سۆرانیی » دوو دیالێکتی سەربەخۆ نین، بەڵکوو هەر یەکەیان لقەدیالێکتێکن و سەر بە دوو دیالێکتێکی جیاوازن. هەروەها، نە « سۆرانیی » دیالێکتە و نە « کرمانجی نێوەڕاست ».« سولەیمانی »یش دیالێکت نییە، بەڵکوو، دیسانەوە لقەدیالێکتێکی کرمانجیی خوراووە. جا گەر ئەو جۆرە شتانە، لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، وەک « هەڵەیەکی باو! » ڕۆشتبێ و بە سەریاندا تێپەڕیوبێ، بۆچی دەبێ، نووسەرێکی وەک مامۆستا، ئەو هەڵە باوە دووپاتکاتەوە؟! ئەدی ئەرکی سەرشانی ڕووناکبیر و نووسەر چییە، گەر هەڵە زمانەوانییەکان، بۆ یەکدی و بۆ ڕەشەخەڵکەکە ڕاست نەکەنەوە؟!

ئەز پێموایە، مامۆستا دەبووایە، ئەو هەڵانەی دووبارە نەکردایەتەوە، بەڵکوو، بە شێوەیەکی ڕاست و ئەکادیمییانە بینووسیایە. لە بری ئەوەش، دوای ئەوەی ناوی ئەو جێگایانەی کوردستانی دەبرد، بیگوتایە: دانیشتووانی ناوچەی یەکەم، بە کرمانجیی ژووروو گفتوگۆدەکەن. دانیشتووانی ناوچەی دووەم، بە کرمانجیی خواروو دەپەیڤن و دانیشتووانی ناوچەی سێیەمیش، بە دیالێکتی گۆرانیی ئاخافتندەکەن. چونکە، «بادینانیی » بە لقێ لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو، « سۆرانیی » بە لقێکی بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو دادەنرێن. هەروەها،

«گۆرانیی» دیالێکتێکی سەربەخۆیە و ئەو ناوچانە بە بەشەدیالێکتی «هەورامانیی» قسەدەکەن. بۆیە، نووسەر دەبێ، بە تایبەتیی کاتێ دەنووسێ، لە لێکدانەوە و بیروڕادەربڕینەکانیدا، زۆر وردبێ، سەرنج لەو ووشانە بدا، کە لە سەر ڕووپەی کاغەز دەیاننەخشێنێ.
ئێستە، کاتی ئەوە هاتووە، کەمێ لە گرفتی دیالێکت و بەشەدیالێکتەکانی زمانی کوردیی بدوێین. ئەوەی لای هەمووان ئاشکرایە، هیچ زمانێ لەم جیهانەدا، بێ دیالێکتی جۆراوجۆر نەبووە و نییە. هەر چەندە، هێندێ لە زاناکانی زمان دەڵێن : هەر زمانێ خاوەنی چەن دیالێکتێکی زۆری جیاوازبێ، ئەوە دەوڵەمەندیی ئەو زمانە پیشاندەدا. بەڵام، نەتەوەی کورد، هێندە گرفتی نەتەوەیی و ڕامیاریی هەیە، بوونی ئەو دیالێکتە جۆربەجۆرانەش، هێندەی دیکە گرفتەکانی کوردی زیادکردووە. چونکە، ئەو دیالێکتانە، بە شێوەیەک لە یەکدی جیابوونەتەوە و دوورکەوتوونەتەوە، نەک هەر ڕۆڵەکانی کورد، لە هەر پارچەیەکی کوردستان، بە دیالێکتێکی جیاواز دەپەیڤن، بەڵکوو، تەنانەت لە یەک پارچەشدا، هەر ناوچەیەک بە دیالێکتێ یا بەشەدیالێکتێکی جیاواز قسەدەکەن. بۆیە، کوردی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، بە گران لە یەکدی دەگەن. تەنانەت، هێندێ جاریش، بە زمانی داگیرکەرەکان، ئاخافتێ لەگەڵ یەکدی دەکەن و لە یەکدی تێدەگەن.
هەر چەندە، ئەز لەو باوەڕەدام، هەر وەک چۆن لە سەرەتادا، زمانە « هیندۆ ـ ئەورووپایی »یەکان، هەموویان یەک زمان بوون، پاشان، بەپێی ڕەوتی گۆڕانکارییە مێژوویی یەکان، ئەو هەموو زمانانەی لێ جیابۆوە، ئەوڕۆش هەر یەکەیان سەربەخۆیی خۆیان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا، بە هەموویان هەر یەک گرووپ پێکدێنن. هەروەها، بەو چەشنەش، هەموو ئەو دیالێکت و خواردیالێکتە کوردییانە، لە بنەڕەتدا یەک زمانی یەکگرتووبوون. پاشان، وردەوردە و بە هۆی چەن فاکتەرێکی« مێژوویی، جوگرافیایی، بارودۆخی ڕامیاریی و نەتەوەیی، ئاستی کولتووریی و ... » نەتەوەکەوە، لە یەکدی جیابوونەتەوە و لقوپۆپیان لێ بۆتەوە. داگیرکەرانی کوردستانیش، کاتێ کوردستانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە، هێندەی دیکە ئەو دابڕان، لە

یەکدی دوورکەوتنەوە و جیاوازییەی نێوان دیالێکتەکانیان قووڵتر کردۆتەوە. شتێکی ئاشکرایە، ئەو دیالێکتانە هەموو پێکەوە، زمانی کوردیی پێکدێنن. گەر چی یەکێکیان لە هەموویان دەوڵەمەندتر، ڕەوانتر، پاراوتر، شیرینتر، پاکتر و زاڵتریشبێ. بەڵام، دیسانەوە، هەر یەکێ لەو دیالێکتانە، بەپێی دابەشبوونی «دێمۆگرافیا، جوگرافیای بەشەکانی کوردستان، باری ڕامیاریی و نەتەوەیی» بەکاردێنرێن. لەم قۆناغەی ئەوڕۆ، نەتەوەی کوردیشی پێدا تێپەڕدەبێ، بە هیچ شێوەیە ناکرێ، یەکێ لەو دیالێکتانە، بە سەر هەموو کوردەکانی دانیشتووانی کوردستاندا بسەپێنرێ و زمانێکی یەکگرتووی ئاخافتن، بۆ لە یەکدی گەیشتن بەدیبێنرێ.

لەبەرئەوە، بڕوا ناکەم، هیچ جۆرە مەترسییەک، بۆ سەر زمانەکەمان پەیدابێ، گەر کوردی هەر ناوچەیەک بە دیالێکتەکەی خۆی قسەبکا. بەڵام، بە مەرجێ قسەکردنی ئاسایی ڕۆژانەی، ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، تێکەڵ بە زمانی نووسین نەکرێ. بۆ نموونە: (نابێ یەکێک هەستێ و لە گۆڤارێک یا جێیەکی دیدا، بە « ئەدی کوو بابم » و « ئەوە لۆچی ئەنگۆ گەمەی دەکەن » و « گۆشت خاس لە وازار فرە هەس» و « بیم وەقوروان ڕیشی چەرمووگت »شت بنووسێ.) «92،23» چونکە، گەر بەو شێوەیەی قسەدەکەین، هەر بەو شێوەیەش بنووسین، ئەوا بە هیچ جۆرێ ناتوانین، لە ئایندەدا زمانێکی یەکگرتووی نووسین پێکبێنین. هەروەها، گەر لە هەر ناوچەیەک، دیالێکتێ یا بەشەدیالێکتێکی تایبەتیی، لە نووسیندا تێکەڵاوکەین، دێرێ بە کرمانجیی خواروو و یەکێکی دیکە بە کرمانجیی ژوورووە، یا زازایی و هەورامانیی تێکەڵکەین، ئەوا جگە لەوەی، زمانی ستاندارد بەو شێوەیە دروس نابێ، هەر بە یەکجارییش، سەر لە خەڵک دەشێوێنن، لە کۆتاییشدا، ڕۆژبەڕۆژ، زمانەکەمان لاوازدبێ و دەپوکێتەوە.

تاقیکردنەوەی گەلانی جیهانیش سەلماندوویانە، تەنانەت، گەر نەتەوەیەک خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆشیبێ، دیالێکت هەر دەمێنێ، گەر چی ئەندامانی ئەو نەتەوەیە، بە زمانێکی ستانداردیش بنووسن، بەڵام لە ناوچەکانی خۆیاندا، هەر بە دیالێکتە تایبەتییەکانی خۆیان دەپەیڤن.

جگە لەوەی، ئێمەی کورد، لە بواری ئاخافتن و لە یەکدی گەیشتندا، گرفتی گەورەمان هەیە، لە هەمان کاتیشدا، هێندێ جیاوازیی لە نێوان دیالێکتەکاندا هەیە. میر « جەلادەت بەدرخان » دەڵێ:(زمانی کوردیی، دوو ڕەگەزی نێر و مێ، دوو ژمارەی تاک و کۆی تێدایە. جیاوازیی ڕەگەز و ژمارە، لە هەموو ئەو ووشانەدا هەیە، کە وەک ناو بەکاردێنرێن. هەروەها، بە سەر زۆربەی ڕاناو و ئاوەڵناوەکاندا دەچەسپێ، کە بە شێ لە ووشە گۆڕاوەکان پێکدێنێ.)«111،18»

بە باوەڕی من، ئەم بۆچوونە هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە، ئەو جیاوازییانەی نووسەر باسیاندەکا، لە نێوان هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا نین، بەڵکوو، لە ڕووی ڕێزمانەوە، جیاوازییەکی سەرەکیی، لە نێوان هەر دوو بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووددا هەیە. لە کرمانجیی ژووروودا، ڕەگەزی نێر و مێ لە یەکدی جیادەکرێتەوە. هەروەها، لە بەشەدیالێکتی « هەورامیی »شدا، جیاوازیی لە نێوان نێر و مێدا هەیە. ئەم جیاوازییەش، زیاتر لە ئاخافتندا دەردەکەون. بەڵام، وەک د. « نەبەز » دەڵێ: (پێویستە، نێر و مێ بخرێتە پشگوێ، وەک زمانە ئەدەبییەکەمان خستوویەتییە پشگوێ.)«27،23» لە نێوان ئەم دیالێکتانەدا، لە نێوان هەموو ئەو پیتانەی بۆ زمانی نووسینی کوردیی بەکاردێنرێن، گەلێ گرفتی «مۆرفۆلۆژیی، فۆنۆلۆژیی و لێکسیکۆلۆژیی » هەیە. بۆیە، چاکتروایە، کوردی هەر ناوچەیەک، بە دیالێکتی تایبەتیی خۆی بدوێ، هیچ دیالێکتێ، بە سەر دیالێکتەکانی دیکەدا، بە زۆر نەسەپێنرێ. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەوڵدرێ، لە ڕێگەی ئاخافتن و نووسینەوە، وردەوردە، هەر دوو بەشە سەرەکییەکەی زمانی کوردیی، کرمانجی « ژووروو و خواروو » لە یەکدی نزیککرێنەوە.

سەرەڕای گرفتی کرمانجیی ژووروو و خوراوو، ئەوڕۆ، گرفتێکی دیکەشمان بۆ زیادبووە. ئەویش ئەوەیە، ڕووناکبیران و نووسەران هەوڵدەدەن، هەر یەکەیان بە دیالێکت یا بەشەدیالێکتەکەی خۆیان بنووسن. بۆ نموونە: ئێستە، نووسەرە زازۆکییەکانیش، بە دیالێکتەکەی خۆیان دەنووسن. زازایی(لە ڕۆژاوای کوردستانی تورکیا قسەی پێ ئەکرێ، لە ئەدەبی

فۆلکلۆردا دەولەمەندە، بەلام تا ئەم دوایی یە وەک زمانی نووسین بەکار نەهاتووە)«23،88» کەچی، لە دەرەوەی وولات، لە سەرەتای هەشتاکانەوە، هێندێ گۆڤاری کوردیی، چەن لاپەڕەیەکیان بۆ ئەم دیالێکتە تەرخانکردووە و بە پیتی لاتین پێی دەنووسن، بەم کارەشیان، هێندەی دیکە، زمانەکەیان کەرتکەرتکردووین. وەک هەر دووگۆڤاری « بەربانگ »لە سوید و« هیوا » لە پاریس. جگە لەوەی، هێندێ نووسەری زازاکیی، بە دیالێکتەکەی خۆیان، چەن نامیلکە و پەرتووکێکیان نووسیوە. گەر ئەم دیالێکتە، لەگەڵ بەشەدیالێکتی کرمانجی ژووروودا، یەک نووسین پێڕەوکەن، گەلێ باشترە. چونکە، هەر دووکیان لە یەکدییەوە نزیکن و لە یەک پارچەی کوردستاندا دەژین، هەر دووکیان بە لاتین دەنووسن، بەلام، ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی، لەو ناوچانەدا دەژین، دەتوانن، بە دیالێکتەکەی خۆیان قسەبکەن.

با لێرەدا، نموونەیەک لە سەر نزیکبوونەوەی، دوو بەشەدیالێکتی جیاواز بێنینەوە: بەشەدیالێکتی هەورامیی، لە هەموو ناوچەکانی هەورامانی ڕۆژهەلات و باشووری کوردستان، خەڵکێکی زۆر قسەی پێ دەکەن. ئاشکرایە، هەر لە کۆنەوە، گەلێ لە هۆنەرە ناسراوەکانی کورد، هۆنراوەکانی خۆیان بە هەورامیی هۆنیوەتەوە. نکولی ناکرێ، هەورامیی لە وێژەی فۆلکلۆردا، سامانێکی گەلێ دەولەمەنی هەیە. بەلام، وەک زمانی نووسین، تەنیا بۆ هۆنراوەگوتن بەکارهاتووە. دوای ئەوەی، ئەو توانایەشی نەما، ئیدی بۆ هۆنراوەش زۆر بە کەمی بەکارهاتووە. بە تایبەتیی، لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، لە پەلوپۆکەوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەورامییەکان لە ناوچەکانی خۆیان و لە نێوان خۆیاندا، هەر بە شێوەی هەورامی دەپەیڤن، کەچی بە بەشەدیالێکتەکانی کرمانجیی خوارووش ئاخافتندەکەن و دەنووسن.

بۆیە، لەو باوەڕەدام، لە پاشەڕۆژدا دەتوانین، لە بەر ڕۆشنایی ئەم نموونەیەدا، زمانێکی یەکگرتووی ئاخافتن و نووسین دروسکەین، بە مەرجێ سەرەتا، ئەلفوبێیەکی یەکگرتووی کوردیی پێڕەوکەین. زۆر گرنگیش نییە، هەر ئەلفوبێیەبێ، بەلکوو، گرنگ ئەوەیە، ئەلفوبێیەکی یەکگرتوومان هەبێ.

هەر چی چۆنێبێ، زمانی یەککگرتووی ئاخافتن بە گشتیی، زمانی یەککگرتووی نووسین بە تایبەتیی، بە هۆی دەزگەکانی دەوڵەتەوە پێکدێ. گەر منالآنی کورد، لە منالییەوە بە شێوەیەکی دیاریکراو خوێندیان، ئیدی وردەوردە، نەوە لە دوای نەوە، فێری ئەو شێوە زمانە دەبن، پێی دەخوێنن و دەنووسن، تا وایان لێ دێ، تەنیا بەو شێوە تایبەتییە دەنووسن و ئەو زمانە یەککگرتووە کوردییە دێتە ئاراوە.

ئەورۆ، لە باشووری کوردستان، گۆڕانکارییەکی باش هەیە. بەڵام، «خوێندن و نووسین بە زمانی کوردیی، بزووتنەوەی ڕووناکبیریی. چالاکی هونەریی و وێژەیی »، بەپێی ناوچە و شارەکان دەگۆڕێ. بۆ نموونە: لە ناوچەکانی سەر بە پارێزگاکانی « سولەیمانیی، کەرکووک و هەولێر »، جگە لەوەی، زۆربەی زۆری دانیشتووان، بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووو دەپەیڤن و دەنووسن، ئەو جوڵانەوە و چالاکییانە، هەر لە سەرەتاوە لەو پەڕی لووتکەدا بووە. بە تایبەتیی، شاری سولەیمانیی، بە دانپێدانانی دۆست و دژمن، کورد و بیانیی، لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا، ناوەندی « کەلتوور، بوژاندنەوەی زمان، هونەر و وێژەی کوردیی »بووە.

بەڵام، لە ناوچەی بادینان، جگە لەوەی بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو دەپەیڤن، هێندێ جاریش پێی دەنووسن، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆش، نە خوێندن و نووسین بە زمانی کوردیی بووە، نە ئەو « بزووتنەوە و چالاکییە ڕووناکبیریی، هونەریی و وێژەیی »یەی تێدا بەدیدەکرێ. بۆیە، ئەم ناوچەیە، لە زۆر ڕووی « ڕوونابیریی، کۆمەلایەتیی، ڕامیاریی و هۆشی نەتەوەیی »یەوە، لە چاو ناوچەکانی دیکەی باشوور، زۆر دواکەوتووە. هێندەی من ئاگاداربم، لە ناوچەی بادینان، پەرتووکی خوێندنگەکان بە کوردیی لە چاپ نەدراون و چاپخانەشی تێدا نەبووە. هۆکەشی، هەم بۆ داگیرکەری دەوڵەتی عێراق و هەم بۆ سەرانی « پارتی » دەگەڕێتەوە!

بۆیە دەبێ، سەرەتا لەم بەشەی کوردستانەوە دەسپێکرێ. هەوڵێکی زۆر بدرێ، هەر دوو بەشەدیالێکتەکەی کرمانجیی « خوارووو و ژووروو »، لە یەکدی نزیککرێنەوە. بە یەک جۆر ئەلفوبێ بنووسرێ. یەک جۆر ڕێنووس بەکاربێ. خوێندن و نووسین، لە خوێندنگەکاندا بە یەک بەشەدیالێکتی

تایبەتیی بێ. تا بە لانی کەمەوە بتوانین، لە پارچەیەکی کوردستاندا، زمانەکەمان ڕێکخەین و ببوژێنینەوە!
پیرەمێردی نەمر، گەلێ هەوڵی لەگەڵ پێشخستنی زمانی کوردیی داوە، لە لایەکەوە ویستویەتی، یەک جۆر پیت لە ڕێنووسی کوردییدا بەکاربێ. ئەوە بوو، پیتی لاتینیی دانا. بەڵام، لەم کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو. لە لایەکی دیکەشەوە دەیویست، یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، وەک زمانی نووسین بچەسپێنێ. دیسانەوە، لەمەشەدا هیچی بە هیچ نەکرد. تەنانەت هەوڵیدا، دیالێکت و خواردیالێکتەکان لە یەکدی نزیکاتەوە، بۆیە(هەندێ نووسینی بە شێوەی بادینانیی بڵاوکردەوە، ئەمیش ئەنجامی هەر وەکوو ئەنجامی پیتە لاتینییەکەی بوو!! گەلی نەخوێندەوار و پچرپچر، ئەو گەلەی کە هیچ شوێنێکی ئاگای لە شوێنێکی تری نەبوو، ئیتر چۆن لە شێوەکانی یەکتری ئەگەیشتن.)«36،44»
هەر وەک د. « کەمال فوواد » دەڵێ:(هەموو خوێندەوارێکی کوردی دڵسۆز و هۆشیار پێویستە، هەوڵدا، خۆی فێری یەکێ لەو دوو زمانە ئەدەبییە بکا، کە ئەمڕۆ لە نووسینی کوردیدا بەکاردێن، وە ئەگەر بتوانرێ، فێری هەر دووکیشیان بێ. لێکۆڵینەوەش لە هەر یەکێ لە زاراوەکانی زمانی کوردیی، ئەگەر بە کوردیی بوو، پێویستە، بە یەکێ لەو دوو زمانە ئەدەبییە بێ. هەروەها، لێکدانەوەی وشەکان و لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی و ئەدەبیی لە بارەی هەر یەکێ لە زاراوەکانەوە بنووسرێن. بەکارهێنانی شێوەیەکی سێیەم لە نووسینی کوردیدا، نەک هەر کارێکی نارێست و نابەجێیە، بەڵکوو زیانبەخشیشە، لەگەڵ ئەو هەنگاوانەشدا ناگونجێ، کە بە نیازی پێکهێنانی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو ئەنرێن. کوردێکی ناوچەی هەورامان لە کوردستانی ئێران یان عێراق، لەگەڵ ئەو سامانە ئەدەبییە گەورەیەشدا کە بە هەورامیی هەیە، ئەگەر بە کوردی بنووسێ، بەو زمانە ئەدەبییە کوردییە ئەنووسێ، کە ئەمڕۆ لە کوردستانی ئێران و عێراق باوە، نەک بە هەورامیی. هەروەها کوردێکی کرمانشایی یا خانەقینی ... برا دملی « زازایی »یەکانیشمان پێویستە نووسینەکانیان بەو زمانە ئەدەبییە کوردییە بێ، کە ئەمڕۆ کوردەکانی تورکیا و وسوریا و سۆڤیەت پێی

ئەنووسن نەک بە زازایی، بێگومان ئەمە هیچ ڕێگە لەوە ناگرێ، کە سەدان بەڵکوو هەزاران هۆنراوە و تێکستی ئەدەبیی جۆربەجۆر بە هەموو زاراوەکانی زمانی کوردی بنووسرێن و بڵاوکرێنەوە، بەڵام لێکدانەوە و لە سەر نووسینیان پێویستە، بە یەکێ لەو دوو زمانە ئەدەبییە بێت کە ئەمڕۆ کورد لە نووسیندا بەکاریئەهێنێ.)»25،88»

لێرەدا، گەر کەموکوڕیی و هەڵەیەکی زەق، لە نووسینەکەی د. «کەمال»دا هەبێ، ئەوەیە، دوکتۆر ئەو دوو شێوە سەرەکییەی زمانی کوردیی، «ڕۆژاوایی و ڕۆژهەڵاتیی»، کە پێیان دەنووسرێ، هەر یەکەشیان لە نووسیندا، پیتێکی جیاواز بەکاردێنن، بە دوو زمانی جیاوازیی وێژەیی دادەنێ. بەڵام، ڕاستەکەی ئەوەیە، هەر دووکیان بە دوو شێوە نووسینی وێژەیی، یەک زمان دادەنرێن، نەک دوو زمانی جیاواز بن!

بە کورتیی: هەر چەندە، زمانی کوردیی، لە کۆمەڵێ دیالێکت و خوار دیالێکتی جیاواز پێکهاتووە، لە هەر سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، نووسەرانمان بە یەکێ لەو دیالێکتانە، بەرهەمەکانی خۆیان نووسیوە. پاشان، بە هۆی کۆمەڵێ فاکتەرەوە، ئەو دیالێکتە وەک زمانی نووسین، لە کارکەوتووە، دیالێکتێکی دیکە جێگەی گرتۆتەوە. لەبەرئەوە، وردەوردە، چەن نەوەیەک، لە خوێندنەوەی ئەو بەرهەمە کوردییانە و بەو دیالێکتانە، بێبەشبوون و دوورکەوتوونەتەوە. چونکە، بە گران لەو شێوە زمانە وێژەییانە گەیشتوون و بەرهەمەکانیان بە ئاسانیی بۆ نەخوێنراوەتەوە..

جگە لەوەی، لەو سەردەمانەدا بەرهەمی کوردیی، زۆر بە کەمی چاپ و بڵاوکراوەتەوە. یا ژمارەیەکی کەمی لێ بڵاوکراوەتەوە. پاشان، دوای ماوەیەکی کورت فەوتاوە. هەروەها، هەر لە کۆنەوە، خوێنەوار لە ناو کورددا کەم و ئارەزووی خوێندنەوەیان لاواز بووە.

بەڵام، لە کۆتایی ئەم باسەدا، منیش لەگەڵ ڕەوانشاد «زوبێحی»دا دەڵێم: (لەهجە، لە زمانەکاندا بەرووبۆی گەلێ هۆیانە، کە هێندێکیان ڕەنگە بە کۆششی ئینسان لەناوچن، بەڵام هێندێکیان، بە لای منەوە، لە هەلومەرجی ئێستە و دواڕۆژێکی نزیکیشدا، لەوانە نین، قورسایی خۆیان لە سەر زمانەکەمان لابدەن. لەوەش زیاتر دەتوانم، بڵێم: نەک هەر زمانی کوردیی،

بەڵكوو، پێشكەوتووترین زمانی زیندووی سەر زەویی، ئەوەی لە بارا نییە، کە خۆی لە هەبوونی « لەهجە » ڕزگارکا. )«40،70»
بۆیە، گەر زمانێکی یەکگرتووی خوێندنەوە و نووسین هەبێ، دیالێکتەکانی زمانی کوردییش، بەرەبەرە، لە یەکدی نزیکدەبنەوە. دیالێکتەکانیش، بە هیچ جۆرێ، زیان بە زمانی کوردیی ناگەیەنن، مەترسیی بۆ سەر پاشەڕۆژی زمانەکە نییە و نابێ!

## 2/ ڕێزمـــــــــــان :

هەرچەندە، هێندێ نووسەر و زانای کورد، لە ساڵەکانی بیستی ئەم سەدەیەوە، خۆیان بە ڕێزمانی زمانی کوردییەوە ماندووکردووە. بەڵام، لە نێوان چەرخەکانی حەڤدە و نۆزدەدا، کاتێ دیانە ئەوروپایی یەکان، بە کوردستاندا بڵاوبوونەوە، بۆ ئەوەی لە نێوا کورد و خالیدییەکاندا، پروپاگەندە بۆ ئایینی فەلە بکەن، ئا لەو کاتەوە، لێکۆڵینەوە لە ڕێزمانی کوردیی سەریهەڵداوە. لەو بارەیەوە « ڤیلچێڤسکی »، دەڵێ: (یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم چالاکییە، یەکەم ڕێزمانی زمانی کوردیی بوو، کە لە لایەن م. گارتسۆنی دۆمینیکانییەوە دانرا. )«184،76»
ئەو پیاوە، خەڵکی « ئیتالیا » بوو. یەکەم پەرتووکی لە ساڵی «1875»، لە سەر ڕێزمانی زمانی کوردیی دانا، «397،76» بە ناوی :
Maurizio Garzoni. Grammatico et Vocabolario della Lingua Kurda. Nella stamparia della sar Congrecazione di Propaganda Fide. Rom , 1875.
ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد نابێ، دڵیان لە خۆیان بمێنێ، لەبەرئەوەی، درەنگ ڕێزمانەکەمان بۆ نووسراوەتەوە، یا کەمتەرخەمیی تێدا کراوە. چونکە، هەر نەتەوەیەک، وەک کوردی بەسەربهاتایە، ئێستە، تەنیا ناوی لە ئارشێفی مێژوودا بۆ یادگار دەما. گەر تەماشایەکی نەتەوەکانی دەوروپشتی خۆمان و دوور بکەین، دەبینین: نەتەوەیەکی بە دەسەڵاتی خاوەن زمان و فەرهەنگی وەک « ئینگلیز »، کە بە سەدان پیاوی « ڕوونابیر، نووسەر، هونەر و زانا»یان هەبووە، خۆر لە ئاڵاکەیان ئاوا نەدەبوو، تەنیا (لە سەدەی هەژدەدا، زمانی ئینگلیزیی، ڕێزمانی بۆ نووسرا. )«21،103»

زانایەکی وەک « سیبەوەی »، خۆی ئێرانی بوو، زۆر بایەخی بە زمانەکەی خۆ ی نەدەدا، بەڵکوو، خەریکی زمانی عەرەبیی بوو، بۆیە،(لە سەدەی دووەمی کۆچیدا، بنچینەی سەرف و نەحوی عەرەبیی کۆکردەوە و ڕێکی پێدا.)«22،103»

هەرگیز نابێ، ئەوەمان بیرچێ، گەر هەر نەتەوەیەک، ڕێزمانێکی یەکگرتووی هەبوو، جگە لەوەی دەتوانێ، بە ئاسانیی زمانێکی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوە پێکبێنێ، زمانەکەشی، لە هەموو جۆرە مەترسییەک دەپارێزێ. با ئەو نەتەوەیەش، دووچاری دەیان دەرد و گرفتی سەختی «نەتەوەیی، ڕامیاریی و ئابووریی »یش بووبێ، هەر هەڵدەسێتەوە و نامرێ. چونکە، هیچ جۆرە بەربەستێ ناتوانێ، ڕێگە بە یەکێتیی زمانی ئاخافتن بگرێ، ڕێزمانی هەموو زمانێکیش، وەک پەرژینێکی قایم وایە، پارێزگاریی زمانەکە دەکا.

وەک چەن جارێ لەمەوبەر، باسماکرد: زمانی کوردیی، لە چەن دیالێکت و بەش و لقەدیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە. ئەم دیالێکتانە، لە نێو خۆیاندا، لە هێندێ ڕووەوە جیاوازییان هەیە. یەکێ لەو جیاوازییە گرنگانە، جیاوازیی ڕێزمانە. پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ »، لەو بارەیەوە دەڵێ:(لە لێکسیک و فۆنێتیک و بنیاتی ڕێزماندا، هەر دوو زاراوەی ژووروو و خواروو جیاوازییان هەیە)«9،80». هەروەها، « « مارتین ڤان برۆنەسن » دەڵێ:(ئەم زاراوانە، تەنیا لە رووی لێکسیکۆلۆژیی و فۆنۆلۆژییەوە، جیاوازیی بەر چاویان نییە، بەڵکە لە هەندەک ئاکاری ڕێزمانیی گرنگیشدا لێک دوورن)«56،95»

هەڵبەتە، دیالێکتەکان لە نێو خۆیاندا، لەو بوارانەدا جیاوازییان هەیە، بەڵام، جیاوازییەکە هێندە نییە، چارەسەری نەکرێ.

تا ئێستە، نەک هەر زمانێکی یەکگرتووی نووسینی کوردیمان نییە، بەڵکوو ڕێزمانێکی یەکگرتووشمان نییە. چونکە، زمانی کوردیی، لە چەن شێوەیەکی جیاواز پێکهاتووە، هەر شێوەیە، بە جۆرە پیتێکی تایبەتیی دەنووسرێ. جیاوازییش ،لە نێوان گرامەری هێندێ لە شێوەکاندا هەیە. لەو بارەیەوە، د. « کەمال فوواد » دەڵێ:(هەموو خوێندەوارێکی هوشیاری

کورد، پێویستە دەرک بەم ڕاستییە بکات، دوای خەیاڵ نەکەیت و وا بزانێت کە لە باری ئەمڕۆی کوردستاندا ئەتوانرێت زمانی نووسین و ئەلفوبێی کوردیی بکرێت بە یەک و لە سەر بنچینەی ئەم خەیاڵە فەرهەنگ بۆ زمانی کوردیی دابنێت و گرامەری زمانی کوردیی بنووسێتەوە. کە وتمان فەرهەنگ یان گرامەری زمانی کوردیی ئەبێت، ڕوونی بکەینەوە مەبەسمان لە فەرهەنگ و گرامەر بۆ چ زمانێکە، بۆ زمانی نووسین و ئەدەبیاتی کوردیی یان بۆ زمانی کوردیی بە هەموو شێوەکانییەوە؟ بێگومان ئەکرێت، فەرهەنگ بۆ هەر دوو زمانی نووسینی کوردیی دابنرێت، ئەوەندەی بتوانرێت، ووشەی شێوەکانی تری تێدا بنوسرێت، بەڵام، بە ڕوونکردنەوەی پێویستەوە. دانانی فەرهەنگێک بۆ زمانی کوردیی بە هەموو شێوەکانییەوە، کارێکی سەخت و درێژخایەنە، پێویستی بە هاوکاریی زانایانی کورد هەیە لە هەموو بەشەکانی کوردستان.)«20،88»

پاشان دەڵێ: (لە گرامەر داناندا، کارەکەمان گرانترە. چونکە، جیاوازیی نێوان شێوەکانی زمانی کوردیی، لە ڕووی گرامەرەوە یەکجار زۆرترە، تا جیاوازیی نێوان وشەکان. لە دەربڕینی دەنگەکاندا، لە گۆڕینی وشەکاندا، لە دارشتنی ڕستەکاندا، شێوەیەک لەگەڵ ئەوی تر جیاوازە. لەبەرئەوە ناکرێت، گرامەرێکی یەکگرتوو بۆ زمانی کوردیی دابنرێت، بە هەموو شێوەکانییەوە. یەکەم هەنگاوی ڕاست بەرەو دانانی گرامەری زمانی کوردیی، دیاریکردنی ئەو شێوەیەیە کە گرامەرەکەی پێ دائەنرێت. پێویستە هەر لە سەرەتاوە، ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە ئەو گرامەرە بۆ چ شێوەیەکە، بۆ یەکێکە لە شێوەکانی زمانی نووسین و ئەدەبیاتی کوردیی یان بۆ یەکێکە لە شێوەکانی زمانی گفتوگۆی کوردیی؟ گرامەریش بە زۆری بۆ زمانی نووسین و ئەدەبیات دائەنرێت نەک بۆ زمانی گفتوگۆ.)«21،88»

لێرەدا پێویستە، کەمێ شیرۆڤەی ئەم دید و بۆچوونەی د. «کەمال فوواد» بکەین. ڕاستە، جیاوازیی لە نێوان گرامەری شێوەکاندا هەیە. بەڵام، ئەو جیاوازییە بایی هێندە نییە، دوو گرامەری جیاواز، بۆ زمانی کوردیی دانێین و هەر شێوەیەک بە شێوەکەی خۆی بنووسێ. چونکە، لە ئەنجامدا یەک زمانی یەکگرتووی نووسینی کوردیی پەیدا نابێ. بەڵکوو، دوو زمانی

نووسینی کوردیی پێرەودەکرێ و زمانەکەمان دووکوتدەکرێ. لەو ڕێیەشەوە، وردەوردە، دوو زمانی جیاوازی گفتوگۆ و نووسین سەرهەڵدەدا و نەتەوەکەش دوولەتدەبێ! بەڵام، گەر ئەو جیاوازیی نێر و مێیەی، لە هێندێ شێوەی کوردیدا هەیە، تەنیا لە قسەکردندا بەکاربێنرێ، لە زمانی نووسیندا پشکوێخرێ، ئەوا لە داهاتوودا دەتوانین، گرامەرێکی یەکگرتوو، زمانێکی نووسینی یەکگرتووی کوردیی پێکبێنین. لەو ڕێگەیەشەوە، هەم شێوەکانی زمانی کوردیی لێک نزیکدەکەینەوە، هەم زمانەکەمان و نەتەوەکەشمان لە لەتوپەتکردن دەپارێزین. بەڵام دیارە، ئەمە کارێکی زۆری دەوێ، تەنیا، دەسەڵاتی دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردیی دەتوانێ، ئەم خەونە دێرینە بەدیبێنێ!

(وەک لە پێشەوە وتمان: کورد خاوەنی زمانێکی یەکگرتوو نییە بۆ نووسین، بەڵکوو ئێستە، دوو شێوەی سەرەکی بەکاردێنێت لە نووسینی کوردیدا، کە هەر یەکەیان بە درێژایی ڕۆژگاری ڕابردوو، لە شێوەیەکی ئەدەبیی تایبەتیدا خۆی گرتووە و کەم و زۆر « بەپێی ناوچەکان » لە زمانی گفتوگۆ دوورکەوتۆتەوە. هەر یەکەیان خاوەنی فەرهەنگی وشە و گرامەری خۆیەتی. هەندێک جار یەکن، هەندێک جار جیاواز. بۆ وێنە: لە ڕۆژاواییدا دوو دەستە جێناو pronoun هەیە، دەستەی ئەز «تو، ئەو، ئەم، هوون، ئەو»، دەستەی من « تە، وی/وێ، مە، وە، وان » کە هەر یەکەیان دەستووری بەکارهێنانی خۆی هەیە. لە ڕۆژهەڵاتیدا هەر یەک دەستە هەیە « من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان » جگە لەوە، جێناوی لکاوی هەبوون possessive « ـ م، ـ ت، ـ ی، ـ مان، ـ تان، ـ یان » لە ڕۆژاواییدا نییە.
ڕۆژهەڵاتی: (کوڕم، کچت، منالی ... یان : کوڕی من، کچی تۆ، منالی ئەو ...) لە ڕۆژاواییدا تەنیا: (کوڕۆ من، کەچا تە، زارۆکێن وی/وێ)
کرداری Passive لە ڕۆژاواییدا بە خستنە پێشی هاتن پێکدێ: هات زانین « ێ »، هاتیە زانین « ێ »، دێ « تێ » زانین « ێ ». لە ڕۆژهەڵاتیدا، بە خستنە پاشی ڕا/ڕێ بۆ سەر ڕیشەی کردار پێکدێت « زانین/ ڕیشە: زان » : زانرا، زانراوە، ئە « دە » زانرێت. گەلێ جیاوازیی تریش کە دەستوورێکی یەکگرتوو کۆیان ناکاتەوە.)«88، 21 ـ 22»(بۆیە پێویستە لە دانانی

گرامەردا، ڕۆژاوایی و ڕۆژهەلاتی لە یەکتر جیابکرێنەوە و بە نیازی نزیککردنەوەیان بەراوردی پێویست لە نێوانیاندا بکرێت. جگە لەوەش، ئەوەندەی بکرێت هەر دوو زمانە ئەدەبییەکە بە هەر دوو تیپە لاتینی و عەرەبییەکە بلاوبکرێنەوە. ئەمەیە ڕێگای ڕاست بۆ نزیککردنەوەی هەر دوو شێوەکە لە یەکتر و هەنگاونان بەرەو زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو، نەک سەپاندنی یەکێکیان بە سەر ئەوی کەدا، یان کۆششی بێ سوود بۆ پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتوو لە تێکەلاوکردنی هەر دوو شێوەکە، کە هەرگیز پێک نایەت « مەگەر بە زەبری جەلجەلوت! » چونکە زمان داناتاشرێت، بەلکوو وەک هەر شتێکی زیندوو پەیدائەبێت و ئەوەندەی خزمەت بکرێت و هەلی لە باری بۆ بێتە پێشەوە گەشەئەکات و پێشئەکەوێت، بەپێی پێویستی ژیانیش ئەگۆڕێت و پەرەئەسێنێت، یان زۆری بۆ دێت، کزئەبێت و لەناوئەچێت. زۆر زمانی گرنگ لە سەر ئەم ڕووی زەوییە هەبوون، زمانی ئاییني و ڕەسمی بوون، ئێستە لە کارکەوتوون، وەک: «زمانی سۆمەری، ئێلامی، ئەکەدی، بابلی، فارسیی باستان، ئارامی، ئاوێستایی و لاتینی» و گەلێکی تر. زۆر هەولیشدراوە بۆ پێکهێنانی زمانێکی جیهانیی یەکگرتوو لە تێکەلکردنی چەن زمانێک، بۆ وێنە: ئێسپێرانتۆ/Esperanto سەری نەگرتووە و لە ژمارەیەکی کەم زیاتر کەس فێری نەبووە. یان ئەو هەولانەیدراون بۆ دروستکردنی زمانێکی ئینگلیزیی سادە/ Basic English بۆ زوو فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە هەموو ولاتانی جیهاندا، بە نیازی کۆلۆنیالی و پەرەپێدان و جێگیرکردننی دەسەلاتی داگیرکەرانی ئینگلیز. کەچی لەگەل ئەوەشدا کە دەسەلاتێکی سیاسیی و ئابووریی و سەربازیی بەهێزیشی لە پشتەوە بووە.)«22،88»

بۆ هەموو ئەو جیاوازییانەی، دوکتۆر باسیاندەکا، ئێستە، نزیکەی هەموویان لە دیالێکتە جیاجیاکاندا بەکاردێنرێن. بەلێ، ڕاستە بە هیچ جۆرێ، پێویست بە سەپاندنی دیالێکتێ بە سەر دیالێکتێکدا، یا شێوە زمانی ناوچەیەک بە سەر ناوچەیەکی دیکەدا ناکا. چونکە، ئەو تێکەلاوبوونە، بە شێوەیەکی خۆرسکیی خۆی دروسدەبێ. بەلام، هەرگیز بە

دروستی نازانم، هەر دوو زمانی « ئێسپێرانتۆ و ئینگلیزیی سادە »، بە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بچوێنێ، تا زمانێکی یەکگرتووی نووسین دروسبێ. چونکە، دەوڵەتە کۆلۆنیالییەکانی ئەورووپا دەیانویست، هەر دوو زمانەکەی پێشوو، بە سەر چەن گەل و نەتەوەیەکی جیهاندا بسەپێنن، کە هیچ جۆرە پێوەندییەکی نەتەوەیی پێکیانەوە نابەستێ. بەڵام، کورد هەر یەک نەتەوەیە، با چەن دیالێکتێکی جیاوازیشی هەبێ، با هێندێ جیاوازیی وەک گرامەریش، لە نێوان هێندێ لە بەشەدیالێکتەکانیدا هەبێ!
پاشان، دەڵێ:
(ئەو ڕاستییەش نابێ، فەرامۆشبکرێ، کە ناوەکان/ Nomen لە کوردیی ڕۆژاواییدا، « هەروەها لە هەورامیی و زازایی و چەن شێوەیەکی تریشدا » نێر و مێیان هەیە، پێویستە دیاریکرێن. چونکە، لە کاتی بەکارهێناندا ئەگۆڕێن. لە کوردیی ڕۆژهەڵاتیدا ئەمە پێویست نییە. بۆ وێنە: گەل و ڕۆژ لە هەر دوو شێوەکەدا یەک مانایان هەیە و وەک یەک ئەوترێن. لە ڕۆژاواییدا یەکەمیان نێرە و دووەمیان مێیە. لە خستنە سەر «ئیزافە »دا ئەگۆڕێن بەم شێوەیە: گەل ـ ێ کورد. ڕۆژ ـ ی کورد. کەچی لە ڕۆژهەڵاتیدا جیاواز ناوەستێ: گەل ـ ی کورد، ڕۆژ ـ ی کورد. هەروەها لە کاتی بانگکردن/ Vocative یان بەکارهێنانی ناوەکان لە هەندێک شوێنی ڕستەکاندا نێر و مێ لە ڕۆژاواییدا جیاواز ئەگۆڕێن. لە ڕۆژهەڵاتیدا بە زۆری وەک یەک ئەگۆڕێن. بۆیە یەکێک لەو سەرەتایانەی کە پێویستە لە دانانی فەرهەنگی زمانی کوردیدا ڕەچاو بکرێت، ئەوەیە کە لە پێشەوە بنووسرێت بۆ چ شێوەیەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویستدا لە بارەی گرامەری ئەو شێوەیەوە.)«24،88»
ئێستە، جیاوازیی لە ڕێزمانی هێندێ لە دیالێکت و بەشەدیالێکتەکانی وەک کرمانجیی خواروو، ژووروو و هەورامانیدا هەیە. بەڵام، ئەو جیاوازییانە، هێندە ترسناک نین، تا لە ئایندەدا، ڕێزمانێکی یەکگرتوو دانەنرێ، زمانێکی ستاندارد دروس نەبێ. گەر، هەر دوکتۆر خۆی، کەمێ لێبووردنی هەبووایە، لەو بوارەدا یەکەم هەنگاوی بنایە، دەبووایە، هێندە بەو شێوە ووشک و ڕەقوتەقەی لقەدیالێکتی سولەیمانی نەینووسیایە.

بەڵکوو، خۆی لە نووسینی لقەدیالێکتی موکریی نزیککردایەتەوە، کەڵکی لە بەشەدیالێکتەکانی دیکەش وەرگرتایە. ووشەی جۆربەجۆری لێ بخواستنایە و نووسینەکەی خۆی پێ برازاندایەتەوە.
ئەگینا، « ئەزانیت » و « دەزانیت » دەبێ، چ جیاوازییەکی گەورەیان لە نێواندا بێ؟! کێ لێیان تێ نەگا؟! ئایا لە لقەدیالێکتی سولەیمانیشدا، چ خەڵک و چ نووسەرەکان، چ لە ئاخافتن و چ لە نووسیندا، « هات زانین »، بە شێوەیەکی دیکە بەکار نایەنن؟! وەک: « هاتەکوشتن، هاتەکایەوە، هاتینەکۆتایی و ... » هەڵبەتە، ئەم جۆرە ڕاڤەکردنە، لە ژێر کارتێکردنی بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو لقی بادینانییدا پەیدابووە. ئەدی هەر بەو شێوەیەش، دیالێکت و بەشەدیالێکتەکانی هەموو زمانێک، وردەوردە، لە یەکدی نزیک نەبوونەتەوە و نابنەوە و تێکەلاویش نابن؟!
هەر چۆنێبێ، نابێ، «شەونخونیی، ماندووبوون، هەوڵوتەقەلا و دەسوپەنجەی ڕەنگینی » ، مامۆستایانی زمانی کوردیمان بیرچێ. ئەوانەی، ڕاژەی ڕێزمانی کوردییان کردووە، ئەوانەی، یەکەم بەردی بناغەی ماڵی زمانەکەیان بۆ داناوین، ئەوانەی، بە هەوڵی مەردانەی خۆیان، چەن بەرهەمێکی گرنگیان، لە سەر ڕێزمان و دەستووری زمانی کوردیی بۆ نووسیوین. چەن زانایەکی وەک « سەعید کابان لە ساڵی1927 ، تۆفیق وەهبی لە ساڵی1929، نوری عەلی ئەمین لە ساڵی1960 ، جگەرخوێن، شێخ محەمەدی خاڵ » بوون. وەک پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ »ش، دەڵێ: (لەوانەی گرنگترین کاریان، لە سەر ڕێزمان و پێکهاتنی پەیڤینی فەرهەنگی زمانی کوردیی کردبێ، دەبێ باسی لێکۆڵینەوەکانی مەزنترین زانا و کەسێتی جڤاکی تیۆریی نەتەوەی کورد « جەلادەت عالی بەدرخان، کامەران عالی بەدرخان، تۆفیق وەهبی، سەعید کابان و نووری عەلی ئەمین » بکەین.)«20،81»
لە ڕاستیدا، ڕێزمان شتێکی هێندە ئاسان نییە، تا هەموو کەس بە ئاسانیی تێیبگا. بەڵام، باشتروایە، هەموو کوردێ زمان و ڕێزمانەکەی خۆی بە باشیی بزانێ. بە تایبەتیی ڕووناکبیران و نووسەران دەبێ، شارەزاییەکی تەواویان لەو بوارەدا هەبێ. لە هەمان کاتیشدا، ڕێزمانی

هەموو زمانێ هێندە بەربڵاو و قورسە، هیچ مەلەوانێکی زمانزانی باش ناتوانێ، لەو زەریا پانوبەرینەی زمانەوانییدا مەلەبکا. بەڵکوو، گەر جەمسەرە سەرەکییەکان و باسە گرنگەکانی ڕێزمان، بە باشیی بزانین، ئەوا لە کاتی نووسیندا پەکمان ناکەوێ، بە کوردییەکی « ڕاست، ڕەوان، جوان و بێ هەڵە »دەنووسین. لەو بارەیەوە « مەسعوود محەمەد » دەڵێ:
(قەواعیدی عەرەبیی، دە جار لە عەرەبیی زەحمەتترە. گەرەترین نووسەر و بوێژی عەرەب ڕزگار نەبوون لە هەڵەی قەواعیدی. کەس نییە « قەواعیدی ئەللوغە ئەلعەرەبییە » بزانێ و هەڵەی تێدا نەکا. بەڵام، دەیان میلیۆن کەس عەرەبیی دەزانن، هەزاران خوێنەر و ئەدییبیش هەن، پوختەیەکی باشی قەواعید دەزانن، کە کافیی بێ بۆ نووسین و تێگەیاندن.)«27،105»
بۆیە دەبێ، بە شێوەیەکی ئاسان بنووسین، تا بە ئاسانترین شێوە، خوێنەر تێگەیەنین، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە گرنگیی و چۆنێتی زمانەکەمان ئاگاداریانکەینەوە، تا شارەزاییەکی باشیان هەبێ.
ڕێزمان، وەک زەلکاوێ نییە، ئاوی تێدا وەستابێ، نە لەبەری بڕوا، نە ئاوی بێتەسەر، تا بۆگەنکا. بەڵکوو، ڕێزمانی هەموو نەتەوەیەک، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گۆڕان و گەشەکردن دایە. لەبەرئەوە، ئەرکی ئەم گەشەکردنە، بە زۆری لە سەر شانی شارەزایانی زمان و پسپۆڕە ئەکادیمییەکانی زمانی کوردییە. بۆیە دەبێ، لەو بوارەدا هەوڵێکی مەردانەمان بۆ بدەن، ئاوڕێکی نوێ لە ڕێزمانەکەمان بدەنەوە، تا ڕێزمانێکی ئاسان و یەکگرتوومان بۆ دانێن.

## 3/ ئەلفوبێی کوردیی :

تا ئێستە، نەک هەر ئەلفوبێیەکی دیاریکراو و یەکگرتووی نووسینمان نییە، بەڵکوو، شارەزایانی زمانی کوردیی، لە نێو خۆشیاندا، بە تەواویی لە سەر ناوی « تیپ و پیت، ژمارەی پیتە کوردییەکان بە گشتیی و پیتە کۆنسۆنانت و ڤاوڵەکانیش بە تایبەتیی ڕێک نەکەوتوون. پێشەکیی، بە پێویستی دەزانم، هێندێ شت، لەو بارانەوە ڕوونکەمەوە.
« تیپ و پیت »، دوو وشەی کوردیی ڕەسەن و پەتین، لە بری« حەرف »ی عەرەبیی و « Letter »ی ئینگلیزیی، لە زمانی کوردیدا بەکاردێنرێن. بە

باوەڕی من، بڕیار لە سەر یەکێکیان بدەین، ئەی ئەوە باشترە، ھەر نووسەرێ بە ئارەزووی خۆی، یەکێکیان بەکاربێنێ.
د. « کەمال فوواد » پێی وایە، « تیپ » لە « پیت » گونجاوترە و دەڵێ: (پیت لێرەدا، بە مانایParticle نەک Letter بەکارھاتووە. کە من بۆ دووەمیان تیپ « لاتینیTypus » بەکارئەھێنم. لە عەرەبیدا، بۆ ھەر دووکیان« حەرف» بەکارئەھێنن.بۆ وێنە ئەڵێن:« ئەلحروف ئەلئەبجەدییە »، بی مەبەسی دووەم. وە ئەڵێن:« حروف ئەلجەر و ئەلعەتف »، بۆ مەبەسی یەکەم. ھەر ئەمەشە کە گەلێکی تووشی ئەو ھەڵەیە کردووە، کە بۆ ھەر دوو مەسەلەکە لە کوردیدا « پیت » بەکاربێنن و جیاوازیی لە نێوان « تیپ » بۆ « حەرف ـ Letter » و « پیت » بۆ « حەرف ـ Prticle »دا نەکەن.) «38،88» بەڵام، ئەز لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم. بە لای منەوە، زاراوەی «پیت » لە « تیپ » ڕاستر و گونجاوترە. چونکە، لە کوریدا «تیپ » بە کۆمەڵێ مرۆڤ دێ، واتای « فرقە »ی عەرەبیی و « Group »ی ئینگلیزیی دەگەیەنێ. لە کاتی خۆشیدا، لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا، لە لایەن نووسەران و شارەزایانەوە، لەم بارەیەوە، گەلێ زانیاریی و ڕوونکردنەوە پێشکەشکراوە. جگە لەوەی(لیژنەی مامۆستایانی سولەیمانی، بڕیاریان لە سەر داوە، لە نوسراوی زاراوەی کوردیی ساڵی 1960 ژمارە شەش لە لاپەڕە دەدا)بلاوکراوەتەوە.«83،63» کەواتە، با ھەر دوو زاراوەی« تیپ و پیت » ھەبێ، بەڵام « پیت » وەک زاراوەیەکی زمانەوانیی و « تیپ »یش وەک زاراوەیەکی گشتیی بەکاربێنین. بۆ نموونە: لە گۆرانی ناوچەی گەرمیان، لە باشووری کوردستان دەڵێن: « تیپێ سوار ھا بە ڕێوە. » وا تە: دەستەیە یا کۆمەڵێ سوار. ھەروەھا، بۆ وەرزش بەکاردێ، وەک:« تیپی تۆپی پێی پیرەمەگروون ». جگە لەوەی، لە شۆڕشی نوێماندا، « ی. ن. ک. »، وەک زاراوەیەکی سەربازیی بەکاریھێنا. ناوی بەتالیۆنی جارانی بە « تیپ » دەبرد. وەک تیپی بیستویەک.
ئاشکرایە، کورد تا ئەوڕۆ، ئەلفوبێیەکی یەککرتووی نییە. ئەو ئەلفوبێیانەی بەکاریشدێنرێن، بە تەواویی، پێویستیی زمانی کوردیی پڕ

ناکەنەوە. ئەم گرفتی نەبوونی ئەلفوبێی یەکگرتووەش، لە ڕێی زمانی کوردیدا، بە سەختترین کۆسپ دادەنرێ. هەر ئەمەش وای کردووە، زمانێکی یەکگرتووی نووسینمان نەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا، (باری خوێندەواریی، ڕۆشنبیریی، زمان و کەلتووری کورد، زۆر دواکەوتووە. تەنیا لە بەشێکی خوارووی کوردستان دەتوانرێ، بە کوردیی بخوێنرێ و بنووسرێ... لە ڕووی نووسینەوە، هەر پارچەیەک جۆرە پیتێ بەکاردێنێ، بە جۆرە دیالێکتێ دەپەیڤێ، دەنووسێ و دەخوێنێتەوە. لە باکوور و خۆراوای کوردستان، بە تیپی لاتین دەنووسن. هەر چەندە، کوردەکانی باکووری کوردستان، زۆربەیان، زمانی زکماکیی خۆیانیان لە بیربراوەتەوە و زمانە تورکییەکە، بە سەر زمانی دایکدا زیاتر زاڵە. لە ڕۆژاوای کوردستان، زیاتر لە ژێر کارتێکردنی زمانی عەرەبیی دان. لە خوارووی کوردستان، بە پیتی عەرەبیی و بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروو دەنووسن، لەگەڵ کوردەکانی بندەسی تورکیا و سووریادا جیایاندەکاتەوە. لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، بە پیتی عەرەبیی و هێڵی شکستەی فارسیی دەنووسن و زیاتر لە ژێر تاووتینی کەلتووری فارسیی دان.)«38,34»
کوردە پەرشوبلاوەکانی، کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی کۆنیش، بە پیتی «کریلیکی ـ Cyrillic »ڕووسیی دەنووسن. واتە: ئەلفوبێیەکی تایبەتیی نەتەوەیی یەکگرتوومان نییە. ئەم جیاوازیی بەکارهێنانی ئەلفوبێیەش، گرفتێکی گەورەی دروسکردووە، کارێکی وای کردووە، کوردی پارچە جیاجیاکانی کوردستان، نووسینەکانی یەکدیان بۆ ناخوێنرێتەوە. تەنانەت، کوردەکانی بندەسی تورکیا، هەر چەندە، هەموویان بە پیتی لاتین دەنووسن، بەلام، ئەوانەی بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن، لەگەڵ ئەوانەی بە زازایی دەپەیڤن، جگە لەوەی، بە گران لە یەکدی دەگەن، هەر یەکەشیان بە دیالێکتەکەی خۆی، بە پیتی لاتین دەنووسێ. بۆیە، تەنیا نووسینەکانیان بۆ دەخوێنرێتەوە و زۆر لێی تێ ناگەن. لەبەرئەوە، زازایی یەکانیش بە دیالێکتی خۆیان ئاخافتن دەکەن و دەنووسن. تەنانەت « گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک » بە زازایی بلاودەکەنەوە. بۆ نموونە: گۆڤاری « بەربانگ »، ئۆرگانی فیدراسیۆنی کۆمەلە کوردستانییەکان لە سوید، بە پیتی عەرەبیی

و لاتین چاپدەکرێ. لە هەمان کاتیشدا، بە هەر دوو بەشەدیالێکتەکانی کرمانجیی« سەروو و خواروو » و دیالێکتی زازاکیی، گوتارەکان دەنووسرێن و بڵاودەکرێنەوە.
بە شێوەیەکی گشتیی، لە سەرەتادا، شێوەی پیت و نووسین، جیاوازبوون. پاشان، بەرەبەرە، گۆڕانکارییان بە سەردا هاتووە. هەر وەک لە بەشی «زمانی نووسین و خوێندنەوە لای کورد »دا باسمانکرد، سەرەتا عەرەبەکانی یەمەن، نووسینی « مەسنەد »، شام « فینیقیی » و حجاز «سریانی»یان بەکارهێناوە. پاشان، عەرەبە ئیسلامەکان بە نووسینی «کوفیی » نووسیویانە. دوای ماویە، نووسینی « نەسخ، سابت، ڕوقعە، دیوان، عەرەبیی و فارسیی »ش پەیدابوو. ئیدی، بەو شێوەیە بەردەوامبوو، تا ئەم نووسینانەی ئەوڕۆیان لێ کەوتۆتەوە.
سەرەتا دەبێ، ئەوە بزانین، ئەو پیتانەی ئەوڕۆ، بۆ نووسینی بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو بەکاردێن، کە بە پیتی عەرەبیی ناسراون، لە بنەڕەتدا لە « ئارامیی »یەکانەوە وەرگیراون. چونکە، لە کۆندا عەرەبەکانیش، وەک کورد، خاوەنی پیتی تایبەتیی خۆیان نەبوون. بەڵام، لە ئارامییەکانەوە وەریانگرتووە، پاشان، مۆرێکی خۆیان پێوە ناوە و داگیریانکردووە، وەک هەموو شتێکی دیکەشیان داگیرکردووە!
باوەڕ ناکەم، هیچ نەتەوەیەک هەبێ، گرفتی زمانەوانیی نەبێ. هەمووشمان دەزانین، ژمارەی پیتەکانی ئەلفوبێی نەتەوەکان، وەک یەک نین. بۆ نموونە: گەلانی ئەوروپا، زۆربەی پیتەکانیان، لە زمانی لاتینەوە وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو یەکێ لەو زمانانە، خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە. ژمارەی پیتە لاتینییەکان بیستوشەش پیتن. کەچی،(لە زمانی فرەنسییدا سیوشەش دەنگ هەیە «16 ڤاول، 17کۆنسۆنانت و سێ نیوە کۆنسۆنانت » لە زمانی ئینگلیزیدا، چلوچوار دەنگ هەیە. « 24 کۆنسۆنانت و نیوە کۆنسۆنانت، 20 ڤاوڵی سادە ولێکدراو » )«103، 55-56».
هەر بەو پێیەش، پیتە « عەرەبیی، فارسیی و کوردیی »ەکان، جیاوازییان هەیە. ژمارەی دەنگەکانیان، لەگەڵ ژمارەی پیتەکانیاندا، یەک ناگرنەوە. بۆ نموونە: زمانی فارسیی لە سیودوو پیت پێکهاتووە. بەڵام بیستونۆ

دەنگی هەیە. « بیستوسێ کۆنسۆنانت و شەش ڤاوڵ ».
هەروەها، پیتە عەرەبییەکان لە بیستوهەشت پیت پێکهاتوون. ئەمانەن :
(ا . ب . ت . ث . ج . ح . خ . د . ذ . ر . ز . س . ش . ص . ض . ط . ظ . ع . غ . ف . ق . ک. ل . م . ن. و . ه . ی).
دەربارەی ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردیی، گەلێ بیر و باوەڕی جیاواز هەیە. هەر یەکە، لە شارەزایانی زمانی کوردیی، باوەڕێکی تایبەتیی، دید و بۆچوونێکی دیاریکراویان هەیە. هەروەها، ئەم پیتانە بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیوون، تا ئەم بارەی ئەوڕۆیان وەرگرتووە. لەو پیتە عەرەبییانەی، لە سەرەوە پیشانماندان، سەرەتا تەنیا بیستویەک پیتیان بۆ زمانی کوردیی دەگونجا، وەک:(ا . ب . ت . ج . ح . خ . د . ر . ز . س . ش . غ . ف . ق . ک. ل . م . ن. و . ه . ی ). بەڵام، حەوت پیتەکەی دیکەیان( ث . ص . ض . ذ . ط . ظ . ع)، بە هیچ جۆرێ، بۆ نووسینی کوردیی و لەگەڵ زمانی کوردیی ناگونجێن. هەروەها، پێنج پیتی تایبەتییشمان هەیە، لە زمانی کوردیدا بەکادێنرێن، لە زمانی عەرەبیدا نین. وەک:(پ . چ . ژ . ڤ . گ). هەر چەندە، ژمارەی پیتەکان زیادیکردوو و بوو بەبیستوشەش پیت، بەڵام، سەرەڕای ئەوەش، گرفتی نووسینی کوردیی، بە تەواویی چارەسەر نەکرا.
لەو بارەیەوە « تایەر سادق » دەڵێ:(چونکە نووسینی کوردیی، چۆن لە زار دەرئەچێ، وا ئەنوسرێ، بە ئاسانیی و بێ ماندووبوونی مێشک. لەبەرئەوە، بە پێویست زانرا، کە پێنج پیتی تر بە نیشانە جێبەجێکرێ، وەک پیتی ڕێی گران « ڕ »، پیتی لامی قەڵەو « ڵ »، پیتی واوی کراوە « ۆ »، پیتی هێی کز « ە »، کە بەرامبەرەکەی سەرە لە عەرەبیی، پیتی « ێ » ی خاو « ێ » . واتە: ژمارەی پیتەکان بوون بە سیویەک پیت.) پاشان نووسەر دەڵێ:(زۆر نییە، بیر لە « ئا » کراوەتەوە، کە « ئا » نرخی پیتە ئەلفی کورت « ئـ » وە ئەلفی درێژ « ا » بۆ کوردیی وا ئەگونجێ، کە بنووسرێ «ئاسن » نەک « آسن ».« ئاسمان » نەک « آسمان ».« ئازا » نەک «آزا».) واتە: بو بە سیودوو پیت.) دواتریش دەڵێ:(لێرەدا شێوەی کافی شێواو هەیە، وەک کێو . کێرد . کێڤ . هەر چەند وێنەیەکی تایبەتی بۆ

نەکێشراوە. هەروەها شێوەی گافی شێواو وەک گیا . گێژ . هەنگوین . پێویستە، هەر دوو دەنگ بە پیت دابنرێ.)«9،63 ـ 10» کەواتە، ژمارەی پیتەکان بوون بە سیوچوار پیت. بەڵام، هێندێ لە شارەزایانی دیکەی زمانی کوردیی، باوەڕێکی دیکەیان هەیە. بۆ نموونە:« تۆفیق وەهبی »، بەچل پیتی دادەنێ. «12،17 ـ 14» هەروەها، بەپێی دید و بۆچوونی «خاڵ»، زمانی کوردیی لە بیستوحەوت پیت پێکهاتووە. «27،102»

« کوردۆییڤ »، ژمارەی پیتەکانی زمانی کوردیی، چ لاتین و چ ئارامیی، بە سیوشەش پیت دادەنێ.(ا ، ئا . ب . پ . ت . ج . چ . ح . خ . د . ر . ڕ . ز . ژ . س . ش . ع . غ . ف . ڤ . ق . ک. گ . ل . ڵ . م . ن. و . و ، ئو . ۆ ، ئۆ . وو . هـ . ە ، ئە . ئـ . ی . ی ، ئی . ێ ، ئێ) «26،80 » بە باوەڕی من، تەنیا سیوسێ پیتیان تەواون. ئەو سێ پیتەی، نووسەرانیش دایانناوە، لە جێگەی خۆیاندا نین، چونکە :

یەکەم: پیت و دەنگیان تێکەڵکردووە، لەوانەیە جیاوازییان لە نێوان پیت و دەنگدا نەکردبێ.

دووەم: ئەو سێ پیتە « ئو، وو، ئی » هەر یەکەیان، لە بنەڕەتدا لە دوو پیت پێکهاتوون. یەکەمیان « ئـ ، و » دووەمیان « و ، و » سێیەمیشیان « ئـ ، ی »ن. هەر کاتێ بمانەوێ، هەر یەکێ لەو پیتە ئاوێتانە بنووسین، ئەوا بە دوو پیت دەینووسین، ئیدی پێویست ناکا، ئەو جووتە پیتانە، بە پیتێکی سەربەخۆ دانێین!

« جەلادەت بەدرخان »، پتر لە پیتە لاتینییەکان دەدوێ، ژمارەشیان بە سیویەک پیت دادەنێ. «18، 23-24» نووسەرێکی دیکە، « عەزیزی ئیبراهیمی » ئەلفوبێی کوردیی چ بە لاتین و چ بە عەرەبیی، بە سیوشەش پیت دەقەبڵێنێ. «72، 11-15»

کۆمەڵێ شارەزای دیکەی وەک: « عەبدولڕەحیمی وەفا عەبدولکەریم ، بە سی پیت، « گیوی موکریانیی و کامەران بەدرخان » بە سیودوو پیت و «مستەفای خوڕڕەمداڵ » بە بیستونۆ پیتی دادەنێن. «15،72»

هەروەها، د. « نەبەز » دەڵێ:(لە زمانی کوردیدا سیوپێنج تیپ بەکاردێنرێ.)«1،25»

د. « کەمال فوواد » پێی وایە، جگە لە پیتەکانی « غ ، ح ، ع » سیوچوار پیتمان هەیە. «90، 32-33»

لێرەدا دەمەوێ، شتێ باسکەم: هەر یەک ژمارە لە ماتماتیکدا، وەک یەک پیت وایە لە زماندا. کاتێ دوو ژمارە یا پتر یەکدەگرن، تا ژمارەیەکی ئاوێتەی پچووک یا گەورە دروسکەن، وەک ئەوە وایە، دوو پیت یا پتر لێکدرێن، تا ووشەیەکی سادە یا ئاوێتە پەیدابێ. پاشان، ڕستەشیان لێ دروسدەبێ. کەواتە: ژمارەی پیتەکانی هەر زمانێکی دیاریکراو، وەک ژمارە سەرەکییەکانی زانستی ماتماتیک وایە. چونکە، ژمارە سەرەکییەکان، لە هیچەوە بۆ نۆ « 0 - 9 » دەسپێدەکا. ئیدی، لەو دە ژمارەیە، مرۆ بە ئاسانیی دەتوانێ، هەرچی بوێ، بە ئارەزووی خۆی، ژمارەی دیکەی لێ دروسکا و پێی بنووسێ. جا، هەر لە خانەی دەیانەوە بیگرە، تا بە کۆتایی خانەی هەموو ژمارەکانی جیهان دەگا.

دیارە، زمانیش هەر وایە. هەموو زمانێ، لە کۆمەڵێ پیتی دیاریکراو پێکهاتووە. هەر بە هۆی ئەو پیتانەشەوە دەتوانین، هەر چیمان بوێ، پێی بنووسین. بۆ نموونە: لەو ژمارە سەرەکییانە، ژمارەیەکی تایبەتیی وەک « 000 789 456 123 » مان دەسدەکەوێ. هەروەها، بەرانبەر بە مەش، ئەو پیتانەی هەمانە، چەن ووشەیەکی وەک: «کورد بە دانیشتن، ماڵی وێرانە»ی پێ دەنووسین. لێرەدا دەتوانین، بڵێین: بنچینەی ئەم دوو نووسینە نوێیەی، تازە دەسمانکەتووە، هەر بە یەک شت دادەنرێن. چونکە، هەر دوو ژمارە و ڕستە نوێکە، لە یەک سەرچاوەی سەرەکییەوە هاتوون، کە ژمارە و پیتە سەرەکییەکانی ماتماتیک و زمانەکە دروسیانکردوون. کەواتە، هەموو زانستێ، زمانی تایبەتیی خۆی هەیە. بۆیە، هەرواش دەڵێن: « زمانی ماتماتیک، زمانی ئەندازیاریی، زمانی پزیشکیی، زمانی ڕامیاریی و ... تاد ».

گومانی تێدا نییە، هەر زمانێ تا ژمارەی پیتەکانی زۆرتربێ، ئەوە بە نیشانەی دەوڵەمەندیی ئەو زمانە دادەنرێ. چونکە، دەتوانرێ، هەموو دەنگە جیاوازەکانی خۆماڵیی و بیانیی پێ دەرببڕێ، هەموو ووشە و زاراوە کوردیی و جیهانییەکانیشی، پێ بنووسرێ. بەڵام، خۆ ناکرێ، هەر

لەبەرئەوەی، زمانەکەی خۆمان دەوڵەمەنکەین، هەر لە خۆمانەوە، پیت لەم زمان و لەو زمانەوە بخوازین. چونکە، هەموو زمانێ تایبەتمەندیی خۆی هەیە، ئەو پیتانە دەبێ، لەگەڵ خەسڵەتی زمانی کوردیی و فۆنێتیکەکەیدا بگونجێ.
هەموومان دەزانین، پیتەکانی هەموو زمانێ، بە سەر دوو دەستەدا دابەشدەکرێن. دەستەی یەکەمیان: بە لاتینی « کۆنسۆنانس ـ Consonanas » ، بە ئینگلیزیی « Consonant » ، بە عەرەبیی «صەحیح، ساکن، صامت، حەبیس و ... »ی پێ دەگوترێ. دەستەی دووەمیشیان: بە لاتینی« ڤۆکالیس ـ Vocalis » ، بە ئینگلیزیی «ڤاوێلس ـ Vowels » ، بە عەرەبیی « صائیت، عیلە، مصەوت، حەرەکە، طەلیق و ... »یان ناوناون.
کۆنسۆنانت: (ئەو دەنگەیە، کە بە هۆی ژێیە دەنگیەکانەوە دروس دەبێ و بە هۆی هەواوە لە دەمدا کەم و زۆر ڕێگەی پێ دەگیرێ و بە شێوەی دەنگی ئاوازەدار دەچێتە دەرەوە. )«80،100» ڤاوڵیش: (دەنگی زارەکی دەنگدارن، بەوە دەناسرێن، کە لە پاش دەرچوونیان لە کانگای دەنگەوە بە ناو بۆشایی دەمدا سواری هەوای دەم دەبن و شێوەی چۆنێتی ئاوازەی هەر یەکێکیان کەوتۆتە ئەستۆی زمانەوە. )«79،100»
لە دابەشکردنی پیتەکانیشدا، چ پسپۆڕ و زانایانی بیانیی، چ زماناس و زمانزانەکانی کورد خۆی، لە نێو خۆیاندا ڕێک ناکەون. هەر یەکەیان باوەڕێکی جیاوازیان هەیە. تەنانەت، لە سەر ناوی هەر دوو جۆرە پیتەکانی، یەک بۆچوونی تەواو و یەکگرتوویان نییە. کوردیش، هێندێ ناوی جیاوازی وەک:« بێدەنگ، نەبزوێن، دەنگبەر، ساز » بۆ کۆنسونانتەکان، « دەنگدار، بزوێن، دەنگبزوێن، خۆدەنگ، ناساز و ... » بۆ ڤاوڵەکان داناوە. بۆ نموونە :
« تۆفیق وەهبی » ، ڤاوڵەکان بە پیتی بزوێن یا دەنگبزوێن و د. « مارف خەزنەدار » بە پیتی بزوێن و دەنگداری دادەنێن.« تایەر سادق » کۆنسۆنانت و ڤاوڵەکان بە « ساز و ناساز » ناودەبا. « زوبێحی » و د.«ئەوڕەحمانی حاجی مارف » دەڵێن: بزوێن باشترە، چونکە هەموو پیتێ

دەنگی هەیە، پیتی دەنگدار و پیتی بێدەنگ ڕاست نییە. (کۆڕ تیپی دەنگدار بە « حەرف صەحیح و صامت »ی عەرەبیی دەداتە قەڵەم. ڕاستییەکەی « حەرف صحیح » و « حەرف صامت » هەر دووکیان یەکن و بێ دەنگن. لە کاتێکدا « حەرف عیلە » دەنگدارە. واتا « تیپەبزوێن » و « تیپی دەنگدار » هەر دووکیان یەک مانایان هەیە و یەکن. ئەوەی ببزوێ دەنگدارە و ئەوەی نەبزوێ بێ دەنگە. )«88،24». لەبەرئەوە، من وا بە باشی دەزانم، هەر زاراوە ئینگلیزییەکان بەکابێنرێن.

دەربارەی ژمارەی، هەر دوو بەشە پیتەکانی کۆنسۆنانت و ڤاوڵ، « تۆفیق وەهبی » ، لە هەر دوو بەرهەمی (دەستووری زمانی کوردی/1928) و (خوێندەواری باو/1933)دا، کە دەربارەی ڕێزمانی زمانی کوردیی نووسیونی، تەنیا (هەشت دەنگی بزوێن و بیستوپێنج کۆنسۆنانتی دیاری کردووە لەگەڵ نیمچەبزوێنێکیشدا. )«58،100» کەچی، لە گوتاری (زانیاری گشتیی پێشەکیی/1983)دا، ژمارەی ڤاوڵ و کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردیی زیاددەکەن. (ئەلفوبێی کوردیی، کە لە ئەلفوبێی عەرەبییەوە وەرگیراون، بریتین لە چل تێپ. ئەم چل تیپە بەپێی کاریانەوە لە نووسیندا، دوو بەشن:

1. تیپی دەنگبەر.
2. تیپی بزوێن.

دەنگبەرەکانی کوردیی ... بیستونۆ تیپن)«12،17» و (بزوێنەکانی کوردیی: ئەمانە بریتین لە یازدە تیپ)«14،17» بە ڕاستیی نازانم، لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا، چۆن زمانی کوردیی، ئەو شەش پیتەی زیادکرد، بە مەرجێ، ئەو پیتە عەرەبییانەی لە زمانی کوردیدا نین، نەیبژاردوون، تۆ بڵێی، زمانیش زاووزێبکا، من نەمزانیبێ؟!

هەروەها، لە « بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کورد »دا دەڵێ:(لە زمانی کوردیدا حەوت پیتی بزوێن هەیە: a دوو جۆرە (ئا ـ ا) وەک: ئاو ـ با. e سێ جۆرە (ئە، ـە، ە) وەک: ئەوە، بابە، وەرە. e خەتی لەسەرە، چوار جۆرە (ئێـ ، ێـ ، ێ، ئێ) وەک: ئێران، دێم، دێ، ئێ ئێ. i هەشتی لەسەرە، چوار جۆرە (ئیـ ، یـ ، ی ، ئی) هەموویان خەتیان لەسەرە. وەک:

ئیدی، سیروان، ئی منه، هەموویان خەتیان لەسەرە. o دوو جۆرە، (ئۆ ، ۆ) وەک: ئۆخەی، سۆران. u جۆرێکە، ( و) وەک: کورد، u هەشتی لەسەرە، دوو جۆرە، (ئومێد، سور، ئو، و) هەموو واوەکان خەتی لەسەرە. واتا بە دوو واو دەنووسرێن.)«16، 49 ـ 50»
د. « مەکاریۆس » ، سیودوو کۆنسۆنانت و نیمچە کۆنسۆنانتی دیاریکردووە، واتە: بیستونۆ فۆنیم و سێ دەنگی نیمچە کۆنسۆنات. ئەم دەنگانەش تایبەتن بە زمانی کوردیی سلێمانییەوە)«100، 123»
(دوکتۆر مەکەنزی بۆ دیالێکتی، یاخود گروپە دیالێکتی خواروو، کە سلێمانی بە نموونە وەرگیراوە، بۆ ئەو گروپە بیستونۆ دەنگە کۆنسۆنانت و سێ شێوە دەنگ و دوو نیمچە بزوێنی دیاری کردووە.)«100، 123»
هەروەها، کۆمەڵێ نووسەر و شارەزای دیکەی، وەک: « تایەر سادق » دەڵێ:(پیتی ساز « صەحیح » بیستوهەشت پیتن. پیتە ناسازەکان«عیلە » شەش پیتن « ئەلفی درێژ ـ ا . و . ۆ . ە . ی . ێ . »)«63، 36»
« عەزیزی ئیبراهیمی » ڤاوڵ بە هەشت و کۆنسۆنانت بە بیستوهەشت «72، 11-12» ، « جەلادەت بەدرخان » ڤاوڵ بە هەشت و کۆنسۆنات بە بیستوسێ «18، 25» ، د. « کەمال فوواد » ڤاوڵ و نیوە ڤاوڵ بە دە و کۆنسۆنانت بە بیستوسێ «90، 24-25 » پیت دادەنێن.
د. « نەبەز »یش دەڵێ:(لە زمانی کوردیدا هەشت تیپی بە دەنگ هەیە و ئەم دەنگانە دوو جۆرن :
1. تیپی بە دەنگی کورت : u ، i ، e.
2. تیپی بە دەنگی درێژ : u ، a ، i ، e ، ۆ.)«25، 21 ـ 22»
تیپی بێدەنگیش، ئەو تیپانەن کە بەبێ یارمەتی تیپێکی بە دەنگ، دەنگەکانیان دەرناکەوێ. بێجگە لەو هەشت تیپەی سەرەوە، هەموو تیپەکانی تری زمانی کوردیی بێ دەنگن.)«25، 22»
بە باوەڕی د. « ئەوڕەحمانی حاجی مارف » ، پیتە بزوێنەکانی زمانی کوردیی هەشت دانەن. ئەوانیش ئەمانەن :
( ا ، ە ، ێ ، یی ، ۆ ،و ، ۆ)«7، 25»
لە ڕاستیدا، مرۆڤی کورد، بە دەس ئەم شارەزایانەوە سەری لێ تێکدەچێ.

ئایا، تا ئێستە، ئەو هەموو شارەزا کورد و بیانییانە نەیانتوانیوە، لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیی ڕێکوپێک بکەن، لە نێو خۆیاندا، لە سەر ژمارەی پیتەکان بە گشتیی، پیتە ڤاوڵ و کۆنسۆنانتەکان بە تایبەتیی ڕێککەون؟!! سەیرە! بەو شێوەیە جیاوازیی لە نێوانیاندا هەبێ! خۆ،(دەنگ و « دەنگ بزوێن »، دەسکردی ئینسان نین و بۆیەش کەسێ بە هەر زمانێ قسەبکا بۆی نییە و نابێ دەسکارییان بکا، وەک یەکێ بێ و هەر لە خۆیەوە بڵێ فلانە دەنگم قبووڵە و فیسارە دەنگ بزوێنم ڕا لێ نییە. بەڵام، پیتەکانی ئەلفوبێتکە، ئادەمیزاد بۆ ڕاپەڕاندن و هاسانکردنی کاروباری خۆی دایهێناون، ئەگەر ئەم ئەرکەیان پێ جێبەجێ نەکرێ ئەو دەمە دەسکارییکردن یا گۆڕینیان دەبێتە پێویست.)«69،70»
لێرەدا دەمەوێ، بە کورتیی لە هێندێ پیتی عەرەبیی وەک ( ث . ص . ض . ذ . ط . ظ . ع) بدوێم، کە هێندێ نووسەری کورد تا ئەوڕۆش، بە تایبەتیی نووسەرە کلاسیکییەکانمان، لە نووسینی کوردیدا بەکاریاندێنن.
هەر چەندە، هێندێ پیتی وەک « ط، ظ، ع » وەک دەنگ، لە لقە دیالێکتی « بادینانیی »دا دەبیسرێن، بەڵام، وەک پیت نین. ئەمەش، لە ئەنجامی ئەو تێکەڵاوبوونە دووروودرێژە مێژوویی یەوە هاتووە، کە لە نێوان گەلی عەرەب و دانیشتووانی ئەو ناوچانەدا پەیدابوون. دەتوانین، بڵێین: ئەو دەنگانەیان لە عەرەبەکانەوە خواستووە. د.« نەبەز »، دەربارەی پیتی «ع »دەڵێ:(هەندێ جاریش تیپی « ع »ی عەرەبیی کە دێتە ووشەیەکەوە و لە کوردیدا بەکاریدێنین، ناچارین، هەر بە هەمزە بینووسین، چونکە تیپی «ع » لە کوردیدا نییە و لە گۆڕینی « e »، « e »، « u »، « u »، «i »، « i »وە هاتووە.)«15،25» ئەمە لە نووسینی لاتیندا ڕاستە. بەڵام، باوەڕ ناکەم، لە ئەلفوبێی عەرەبیدا، لەو ڕووەوە هیچ جۆرە گرفتێکمان هەبێ!
لە ڕاستیشدا، هیچ ووشەیەک لە زمانی کوردیدا، بە پیتی « ع » دەس پێ ناکا، چونکە، « ع » پیتێکی عەرەبییە. تەنیا ئەو ناو و ووشانەنەبێ، کە لە بنەڕەتدا خۆیان عەرەبین. وەک « عەبدوڵڵا، عەلی، عەزیز، عومەر، عارف ... تاد ». بەڵام، لە هێندێ ناوچەی کوردستاندا، تەنانەت ئەو ناوانەش بە پیتی « ح » دەخوێنندنەوە، وەک « حەبدوڵڵا، حەلی، حەزیز،

حومەر، حارف ... تاد». کەچی، بە پێچەوانەشەوە، ئەو ناوانەی بە پیتی «ح » دەسپێدەکەن، بە پیتی « ع » دەیانخوێننەوە، وەک « حەسەن - عەسەن، حوسێن - عوسێن، حاجی - عاجی ... تاد» )«36،63»

هێندێ جار، لە ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستان، ووشەیەکی عەرەبیی وەردەگرن، کەمێ گۆڕانی تێدا دەکەن، پاشان بۆ مەبەسێکی دیکە بەکاریدێنن. بێ ئەوەی بزانن، ئەو ووشەیە لە بنەڕەتدا لە کوێوە هاتووە؟ واتای چییە؟ بۆ نموونە: د. « کەمال فوواد » دەڵێ: ووشەی « جەحێڵ » لە ووشەی « جاهیل »ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. «24،90» لەوانەیە، ئەمە وابێ. بەڵام، باوەڕ ناکەم، کورد ئەو ووشەیەی بەو مەبەسە بەکارهێنابێ. چونکە، چەن جارێکم لە ڕانیە و قەڵادزە و دەوروبەری گوێ لێ بووە، بە لاوێکی تازە پێگەشتووی تەندروستیان گوتووە، جاحێڵێکی قۆزە. واتە: لەو ناوچانەدا بە گەنج و هەرزەکار دێ.

سەیر ئەوەیە، د.«حەسەن حەمە عەلی » ناوێ، ناوەکەی خۆی بە دڵ نەبووە، بە « هەسەن هەمە ئەلی » نووسیوە «90،2» وەک ئەوەی بیەوێ، هەر دوو پیتی « ح ، ع »، لە زمنای کوردیدا، بە تەواویی پاکتاوکا! دەربارەی پیتی « ح » تایەر سادق » دەڵێ:(پیتی « ح » لە کوردیدا زۆر کەم بە کارئەهێنرێ. ئەتوانین، لە باتی ئەم پیتە، پیتی « ه » بە کاربێنین. )«11،63» هەروەها،(پیتی « غ » هەر بەم جۆرەیە، ئەتوانین، پیتی « خ » لە باتیان بەکاربێنین )«11،63»

بەڵام، د. « کەمال فوواد » دەڵێ:(ص/S، غ/g، ح /h : بە بیروڕای من نابنە دەنگی بنچینەیی. لە زمانی کوردیدا، یەکەم - لەبەرئەوەی لە کەم ووشەی کوردییدا بەدیئەکرێن. دووەم - گۆڕینیان بۆ: س . خ ه نابنە هۆی ماناگۆڕینی ووشە. )«26-25،90» بە ڕاستیی، هێندێ دید و بۆچوون سەیرە! دەبێ، بۆچی لە بری ئەو پیتانە، پیتێکی دیکە بنووسین؟!! ئایا، تەنیا هەر ئەو سێ پیتە عەرەبین و پیتەکانی دیکە هەموویان کوردین، وا دەبێ، نەیانووسین؟!!

هێندێ جار، نووسەرانی کورد، هێندێ ناو یا ووشەی کوردیی بە پیتی عەرەبیی دەنووسن، ئەو پیتانەی لە زمانی کوردیدا نین، بەکاریاندێنن. لە

ڕاستیدا، ئەو پیتانە لەگەڵ فۆنێتیکی زمانی کوردیدا ناگونجێن. چونکە، لە زمانەکەماندا، یەک ووشە نابینرێ، بەو پیتانە بنووسرێ، یا ئەو دەنگانەیان هەبێ. لەبەرئەوە، لە بری پیتی « ط »، دوو جۆر « ت »ی سووک و قوورسمان هەیە، هەر دووکیان هەر بە « ت » دەنوسرێن. بەڵام، لە کاتی خوێندنەوەدا دەنگەکانیان جیایە. وەک تیپی « ل » وایە، « ل »ی سووک و قەڵەومان هەیە. لێرەدا لامە قەڵەوەکە، حەوتێ لە سەر لامەکە وەردەگرێ «ڵ» و بەوە لە لامی سووک جیادەکرێتەوە.

هەروەها، هەر دوو پیتی « ث و ص »یش، سووک و قەڵەویان هەیە و هەر دووکیشیان لە کوردیدا، هەر بە « س » دەنووسرێن. بەڵام، پیتە عەرەبییەکانی وەک « ض ، ظ ، ذ »، لە کوردیدا تەنیا بە « ز » دەنووسرێن. جا لەبەرئەوەی، هێندێ کەس خۆیان وا دروسبوون، زمانیان وایە، هێندێ جار، ووشەیە بە پیتی « س » دەسپێدەکا، ئەوان بە « ص » دەریدەبڕن. واتە: بە هەڵە پیتی « س » بە « ص » دەخوێننەوە. ئەوەیان شتێکی دیکەیە. بۆ نموونە: هێندێ کەس هەن، بە « ماست » دەڵێن: «ماصت ». ئیدی خۆ ناکرێ، لە بەر خاتری ئەوان، زمانەکەمان تێکدەین، ووشەی « ماصت » لە بری ووشەی « ماست »، لە زمانی کوردییدا بەکاربێنین و بە سەر خەڵکیدا بسەپێنین.

ڕاستە، پیتی « ص » پیتێکی عەرەبییە. ئێمەی کورد دەتوانین، لە بری پیتی « ص » پیتی « س »دانێین. بە باوەڕی من، بەکارهێنانی پیتی « ص » لە زمانی کوردیدا هەڵەیە. چونکە، پیت وەک ووشە نییە، تا داتاشرێ. ڕاستە دەتوانرێ، لە زمانێکی دیکەوە، چ پیت و چ ووشەش بخوازرێ. بەڵام، بە مەرجێ لەگەڵ دەنگەکانی ئەو زمانەدا بگونجێ. جگە لەوەی، ئەو پیتە، لەگەڵ تایبەتکارییەکانی زمانی کوردیدا ناگونجێ، هەمووی چەن ووشەیەکیشمان هەیە، دەنگی پیتی « س »ی تێدا لە پیتی « ص »ەوە نزیکبێ، ئەو ووشانەش، بە پەنجەی هەر دوو دەس دەژمێررین. بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین، ئەو شێوانە لە بەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەکەی « هەورامانیی »دا کورتکەینەوە، پێش چاوی خوێنەرانی هێژای خەین، کە دەنگی پیتی « س » وەک دەنگی پیتی « ص » وایە.

(1. ئەگەر کەوتە پێش « ـ ە » ەوە و یەک بڕگەیان دروسکرد، شێوە دەنگی « ص » وەردەگرێ، وەک: « سەد » و « صەد ».
2. ئەگەر کەوتە پێش « ـ اڵ » ەوە و بڕگەیەکی دروسکرد، دەبێ بە دەنگی « ص ». وەک « ساڵ » و « صاڵ ».
3. ئەگەر کەوتە پێش « ـ ە » ەوە، دەبێ بە دەنگی « ص »، وەک : «سەوز» و « صەوز » ). «138،99»
هەروەها، دەربارەی دەنگی « ص » لە زمانی کوردیدا، « زوبێحی » دەڵێ: (لە کوردیی ئێستەدا، دەنگێ هەیە، لەم دەنگە بچێ، ئەوی ڕاستیبێ، ناتوانین، دەقاودەق بە « ص »ی عەرەبیی دانێین، بێجگە لە چەن ووشەیەکدا وەکوو « صەگ، صەت ... » و زیاتر ئەم جۆرە دەنگی « ص»ە وەختێ پەیدادەبێ، کە دەنگی « س » دەکەوێتە پێش دەنگی « ت »، سەرەڕای ئەوەش ناتوانین، خۆمان دڵنیاکەین کە دەنگی « س » لە زمانانی پەهلەویی یا ئاڤێستایی و مادییدا، هەروەک « س »ی کوردیی ئێستە، لە دەم هاتۆتەدەر و هیچ نەبێ جاروبارە و لە جیرانەتیی هەندێ دەنگی دیکەدا فیکە و ئاوازەیەکی لێ پەیدانەبووە و لە دەنگی « ص »ی عەرەبیی نزیکی نەکردۆتەوە.)«59،70»
لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەکی دیکەش بێنینەوە. وەک: « سەگ ـ صەگ، سەوزە ـ صەوزە ». بەڵام، بۆ ووشەی « شانس یا شانص »، ئەز هەر دوو ووشەکە بە ڕاست نازانم. چونکە ئەم ووشەیە، نە کوردییە و نە عەرەبییە، بەڵکوو لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە و بە « chance ـ چانس » دەنووسرێ. لەبەرئەوەی، پیتی « چ » لە زمانی عەرەبیدا نییە، عەرەبەکان ناتوانن، ئەو پیتە وەک خۆی چۆن هەیە، بیڵێن و بینووسن، «چ»ەکەیان کردووە بە « ش » و کوردیش بە چاولێکەریی لەوانەوە بەکاریدێنێ. هەر چەندە، تازە ئەو ووشەیە بەو شێوەیە، لە زمانی ئاخافتن و نووسینی کوردیدا، جێگەی خۆی لە نێو خەڵکیدا کردۆتەوە. بەڵام، لەبەرئەوەی ئێمە، پیتی « چ »مان هەیە، ڕاستروایە، لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیدا چۆنە، هەر بەو شێوەیە بەکاربێنین. ووشەی چانس، لە زمانی عەرەبیدا بە « حەظ » و « بەخت » دێ. زۆر لە مێژە، نەتەوەکانی « کورد،

فارس، عەرەب و ... »، ووشەی « بەخت »یان بەکارهێناوە، بەڵام، لە ڕاستیدا نازانم، ووشەکە لە بنەڕەتدا، لە کام زمانەوە وەرگیراوە و بڵاوبۆتەوە.

بە باوەڕی من، بە هیچ شێوەیە نابێ، ئەو جۆرە پیتانەی، لە دیالێکت و خواردیالێکتەکاندا بەکاردێنرێن، لە زمانی نووسیندا بنووسرێن.

د. « کەمال فوواد »دەڵێ: (لە کوردییدا، چەن دەنگێکی تریش بەر گوێ ئەکەون، وەک: ص/ S لەم ووشانەدا: صەد/ Sad. صاڵ/ Sal. صەوز/Sawz. شەصت/Sast ... هتد. ئەگەر لەم ووشانەدا لە جیاتی « ص »، « س » بەکاربێنین، مانای ووشەکان ناگۆڕێن و ووشەی نوێیان لێ دروس نابێ. لە « ئەسپێ » و « ئەصێ/ک »دا نەبێت ووشەی تر لە زمانەکەماندا نابینم کە ئاڵوگۆڕکردنی دەنگی « س » و « ص » تیایاندا بێتە هۆی مانا گۆڕینیان. بۆ ئەمەش، پێویست ناکات، تیپێک بخەینە سەر ئەلفوبێی زمانەکەمان. هەمان قسەش بۆ « غ » ئەشێت. چونکە، لە «خار » و « غار »دا نەبێت ووشەی تر نابینم، کە ئاڵوگۆڕکردنی « خ » و « غ » تیایدا ببێتە هۆی ماناگۆڕین.

دەنگی ط/t و ظ/z لە بادینییدا و ث/t و ذ/d لە هەورامییدا و ع/c لە دزەیی و پشدەرییدا، دیسان نایەنە ناو ئەلفوبێی زمانەکەمانەوە. چونکە، ئەلفوبێی بۆ زمانی نووسین و ئەدەبیات دائەنرێت نەک بۆ شێوە و زمانی گفتوگۆ. لە زمانی ئەدەبیی کوردیی ڕۆژاوایی « کرمانجیی ژووروو » دا، وەک لە یەکێتیی سۆڤیەت و تورکیا و سووریا بەکاردێت، نانووسن طاری/tari « تاریک »، ظارۆک/zarok « منداڵ » ... لێ دنڤیسن: تاریی/,tari، زارۆکzarok .)«21-20،90» ئەو دەنگانە، چۆن هەن، با هەر بەو شێوەیە بیانخوێنینەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک، لە نووسیندا بەکارنەیەنرێن.

هەروەها، دوکتۆر دەربارەی پیتی « ص » دەڵێ: (لە کوردییدا یان هەر وەک خۆی ئەمێنێتەوە یان ئەگۆڕێت بۆ س/s: لە صابون/ sabun دا وەک خۆی ئەمێنێتەوە. بەڵام لە صحراء/ sahra ئەبێت بە سەحرا/ sahra و سارا/sara، صینیە/ siniya ئەبێت بە سینیی/sini .)«22،90»

هەروەها، هێندێ ووشەی دیکەی، لە سەر پیتی « ط ، ض » بە نموونە هێناوەتەوە، هەموویان عەرەبین و بەرانبەرەکەیان لە کوردیدا هەیە.
وەک: (طەلاق/talaq ، طاووس/tawus ، طابور/tabur ). «23،90»
ئێمە لە کوردیدا، لە بری سەحرا « بیابان »مان هەیە. بەڵام، تاووس هەر چەندە عەرەبییە، ئەوەتەی کورد هەیە، هەر پێی دەڵێ: تاووس، نەک طاوس. سابوونیش، لە بنەڕەتدا هەر عەرەبیی نییە، یا لە فارسیی یا لە کوردییەوە وەرگیراوە. گەر ووشەی سینیش لە بنەڕەتدا عەرەبی بێ و بە پیتی « ص » بنووسرێ، گرنگ نییە، چونکە کورد هەر دەڵێ: سینیی.
پاشان(ضرر/darar، غضب/gadab ئەبن بە زەرەر/zarar، غەزەب/gadab. ارض/ard ئەبێت بە ئەرز/arz ، عەرد/ard، ئەرل/arl). «23،90»
لە ڕاستیدا، گەر هەر لێکۆڵەرێ، باسێکی بە کوردیی نووسی، دەبێ، نموونەکانیشی هەر کوردیی بن. ئەو ووشانەی دوکتۆر باسیاندەکا، زۆربەیان عەرەبین، ئەگینا لە زمانی کوردیدا، هیچ ووشەیەک نییە، بەو پیتانە دەسپێکا. بەرانبەرەکانیشی لە کوردیدا دەبن بە: زیان، توڕە، زەوی. بۆ دەنگی ئەم پیتانە، بۆ ئەم ووشە بیانییانە، زمانەوانەکانی کورد دەبێ، گوێ بۆ گوندییەکانمان ڕادێرن، بزانن، چۆن دەخێون، نەک گوێ لە دانیشتووانی شارەکان بگرن، جگە لەوەی زمانی عەرەبیی، لە هەموو ڕوویەکەوە کاری لە زمانیان کردووە، بە زمانێکی تێکەڵاویش قسەدەکەن!
ئەوەی لەم دواییانەدا، پتر سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەبوو، هێندێ نووسەری ناشارەزا، لە زمانی کوردیدا پەیدابوون، بە ئارەزووی دڵی خۆیان و بەپێی ڕێبازێکی نازانستانە، بێ ئەوەی بیر لە پاشەڕۆژی زمانەکەیان بکەنەوە، هەر ڕۆژەی بیانوو بە پیتێ لە پیتەکانی زمانی کوردیی دەگرن، یەکێکیان لێ توڕەدەن و بە کوردییان نازانن، بەڵکوو بە عەرەبییان دادەنێن. ئەوە لە کاتێکدا، گەلانی جیهان هەوڵدەدەن، گەر ژمارەی پیتەکانیان بۆ زیاد نەکرێ، ئەوا بە هیچ شێوەیە، لێی کەم ناکەنەوە. چونکە، ئەوە خۆی لە خۆیدا، دەوڵەمەندیی زمانێکی دیاریکراو پیشاندەدا.
جگە لەوەی، پەڕکردنی ئەو پیتانە، «گرفت، لەنگیی، کەموکوڕیی و

ئاژاوەیەکی گەورە »، لە زمانی کوردیدا دروسدەکا. بۆ نموونە: پیتی « ع » بە « ئـ » و « ق » بە « ک » دەنووسن. گوایە، ئەم پیتانە کوردیی ڕەسەن نین! دیارە، ئەو جۆرە نووسەرانە، تەنیا ئەم چەن پیتە سووک و قەڵەوە تایبەتییە کوردییانە(پ، چ، ڕ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ...) بە کوردیی دەزانن، هەموو پیتەکانی دیکە بە کوردیی دا نانێن، وەک ئەوەی، هەموو پیتە عەرەبییەکانیش لە بنەڕەتدا، عەرەبیی ڕووت بووبن! لەبەرئەوە دەبینین، «عێراق » بە « ئێراک » یا « قەسری شیرین » بە « کەسری شیرین » دەنووسن!
وەنەبێ، ئەم تیۆرییە تازەیەش، لە سەراپای نووسینەکەیاندا پێڕەوکەن، بەڵکوو، سەیر ئەوەیە، لە هێندێ شوێندا « ع » و « ق »ەکان دەسڕنەوە، «ئـ » و « ک » لە شوێنی ئەوان بەکاردێنن! کەچی، لە هێندی شوێنی دیکەی هەمان نووسیندا، وەک خۆیان دەیانهێڵنەوە و دەسکارییان ناکەن. کەواتە، بەپێی بۆچوونی ئەو نووسەرانە بێ، لەمەودوا دەبێ، لەمەودا بە «قۆڕ، قوڕ، قۆڵ، و... تاد» بڵێین: « کۆڕ، کوڕ، کۆڵ » و بە شاری «مەسقەت »یش بڵێین « مەسکەت »! کە هەر یەکێ لەو ووشانە، واتایەکی تایبەتیی جیاوازی خۆیان هەیە! بەو پێیەش بڕوا، زمانەکەمان هێندەی دیکە دەشێوێنرێ و پاشاگەردانییەکە زیاتردەبێ، کورد دەڵێ:ماڵ خۆی لە خۆیدا نەبوو، میوانیش ڕووی تێکرد!
گەر لە جێگەی پیتی « ق »، لە هێندێ ووشە وکاتدا بتوانین، پیتی «ک » دانێین، وەک(ڕقوقین: ڕقوکینە ـ ڕکوکینە، لق: لک، ... تا) ئەوا ناتوانین، بۆ هێندێ ووشەی دیکە، لە بری « ق » پیتی « ک » بەکاربێنین. چونکە، لە لایەکەوە ڕوخساری ووشەکە تێکدەدا و ناشیرینیدەکا. لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ جار واتاکەشی دەگۆڕێ، یا هەر واتای نابێ. وەک(باسووق: باسووک، بۆق: بۆک، تەقە: تەکە، ڕەق: ڕەک، ڕەقە: ڕەکە، زەق: زەک، شەق: شەک، قاز: کاز، قژ: کژ، قرقینە: کرکینە، قۆری: کۆری، قۆڕی: کۆڕی، لەقلەق: لەکلەک، مەشق: مەشک ... تاد) هەروەها، هەر دوو ووشەی « ئاقار و ئاکار »، یەکەمیان بۆ شوێن و دووەمیشیان بۆ ڕەوشت بەکاردێنرێن، گەر لە بری پیتی « ق »، ئاقارەکە بە پیتی « ک »

بنووسین، ئەوا هەر دووکیـان یەک شت دەردەچن و یەک واتایان دەبێ! بەو بۆنەیەوە، قسەیەکی خۆشی د.« کاوس قەفتان »م بیرکەوتەوە. لە کۆڕێکدا ڕوو لە بەشـداران دەکـا و دەڵێ: ئێـوە هەوڵدەدەن، پیـتی « ق » لە زمـانی کـوردیدا نەهێـڵن. بەڵام، هەمـوو یەکـێکتـان بە نێـر و مێـتـانەوە، بەلانی کەمەوە « ق » یکتان تێدایە!

هەر چەندە، هێندێ لە زمـانناسـەکـانی کورد، لە سەر ئەو باوەڕەن، دەنگی «ق» لە بنەڕەتدا، دەنگێکی کوردیی ڕەسـەن نـیـیـە. بەڵام، جگە لەوەی لە مێژەوە، لە زمـانی کوردیدا بەکـاردێنرێ، لە هەمـان کـاتیـشدا بڕوا نـاکەم، هیچ جۆرە بەڵـگەیەکی زمـانەوانیی و زانسـتـانە هەبێ، کە ئەو پیـتـە لە بنەڕەتدا کـوردیی نەبووبێ. چونکە، ئەو دەنگە لە گەلێ ووشـەی کـوردیی کۆن و نوێدا بەدیدەکـرێ. هەرچەندە، دەتوانرێ، هەر دوو پیـتـەکـە « ق » و «ک » بەکـاربێنرێ. بەڵام، تازە ئەو پیـتـانەی، هێندێ لەو نووسـەرانە دەیانەوێ، گـۆڕیان گـوومکەن، لە زمـانی کـوردیدا، بە تەواویی جـێگەی شـیـاوی خـۆیان کـردۆتەوە، گـەر پەڕیانکەین، وەک ئەوە وایە، خشـتێ لە بناغـەی دیواری مـاڵێ دەربێنین. هەر وەک د.« نەبەز »یش دەڵێ :(بە لای منەوە وا باشـە، تـا دەنگی سـووکی « ک » مـان لێ هەڵکەوتبێ، دەنـگی قـورسی « ق » بەکار نەبەین. تەنانەت لەو ووشە بێگانانەشدا کە « ق » یان تێدایە و هاتوونەتە زمانەکەمانەوە. بۆ وێنە تا ووشەی « خەڵک » مان هەبێ، ووشەی « خەلق » بەکار نەبەین.)«23،77-78»

لە کۆتایی ئەم دەمەتەقێیەدا، دەڵێم: با، ئێمەش وەک « میسر »ییەکان، تا دەتوانین، زمـانەکـەمـان ڕەوان و ئاسـانکەین. ئەوان لە ئاخـافـتندا، بە جـۆرێ دەدوێن، لە نووسـیـنیـشـدا بە جـۆرێکی دیکە دەنووسن. بۆیە، دیالێکتەکەیان لای خۆیان، عـەرەبزمانەکانی دیکە و ئەوانەی عـەرەبییش دەزانن، وا ناسک وشیرینکردووە، مرۆڤ هەست بە قورسایی و سەختییەک ناکا، کـاتێ گـوێی لەو دیالێکتـە دەبێ. هەڵبـەتە، هەر هەمـان ئەلفـوبێی عــەرەبیی بەکــاردێنن، بە هەمــان زمــان دەنووسن، هەمــان ڕێنووس پێڕەودەکـەن، کـەچی، لە چاو دیالێکتـەکانی دیکەی عـەرەبیدا، جـێگەی تایبەتیی خۆی هەیە.

بۆ نموونە: ئەوان لە کاتی ئاخافتندا، لە بری پیتی « ذ »، پیتی « د »، لە بری پیتی « ث » پیتی « س » و لە بری پیتی « ق » پیتی « ئـ » بەکاردێنن. بەلاّم، لە کاتی نووسیندا، هەر هەمان پیتەکانی« ذ ، ث ، ق » دەنووسن. ئێمەی کوردیش دەتوانین، لە کاتی ئاخافتندا، دەنگی پیتی «ص» دەربڕین، بەلاّم، لە نووسیندا، هەر پیتی « س » بنووسین!
هەموو ئەو پیتانەی بە کوردیی دادەنرێن، وەک:« پ ، چ ، ژ ، ڤ ، گ ، ڵ ، ۆ ، ێ » هێندێکیان لە زمانە ئێرانییەکان و هێندێکی دیکەشیان لە زمانە هیندۆ ئەوروپایی یەکاندا هەن. بەلاّم، ئەم پیتانە لە زمانی نووسینی عەرەبییدا نین. کەچی، لە زمانی ئاخافتنی عەرەبیدا هەن. هەر چەندە، لەم دواییانەدا، میسرییەکان هێندێ پیتی وەک « پ ، چ ، ڤ »، لە نووسینی ناودا بەکاردێنن، جا نازانم، لە زمانی کوردییانەوە خواستووە، یا لە زمانێکی دیکەوە وەریانگرتووە، یا هەر خۆیان دایانهێناون؟!!
لە دیالێکتە جۆربەجۆرەکانی زمانی کوردیدا، هەر دوو پیتی « ڤ » و «ژ »، زۆر بە ڕوونی لە نووسینە کۆنەکاندا دەردەکەوێ. بۆ نموونە:
(زمانی کوردیی هەورامانیی نێو « یارەسان »پڕە لە ئاوازەی دەنگی « ڤ » و « ژ » )«46،99»
نموونەی ئەو دوو پیتە، لە پەرتووکی « عەلی ئیلاهیی »ەکان دەبینین، کە پتر لە هەشت سەدە لەمەوبەر « 578 ک/1182ز » نووسراوە.(لە نموونە شیعرەکانی سەیدای هەورامیی یەکەمدا، ئەو دەنگانە کە لە « یارەسان » دا بەدیدەکرێن، لێرەش هەن. واتە: بوونی دەنگی « ڤ » بە زۆری و بەکارهێنانی « ژ » لە جیاتی « لە » و بە زۆری بەکارهێنانی ڕاناوی «ئەز» لەگەڵ بوونی موفرەداتی عارەبیی هەورامانیی زۆر کۆندا، بە تەواویی بە پێچەوانەی هەورامانیی دەمی « شێخ شەهابەدین » و سەیدای هەورامیی دووەم و بێسارانیی و مەولەویی، کە ئەو جۆرە دەنگانە بەدی ناکرێن و وەک هەورامانیی هەورامانی تەخت دەنگ و ووشە و موفرەدات بەدیدەکرێن. بە شێوەیەکی ڕوونتر ئەو ئاڵوگۆڕەی بە سەر زمانی کوردیی هەورامانیدا لە ماوەی «800 » ساڵێکدا هاتووە، تەنیا لایەنی دەنگی گرتۆتەوە ... )
«46 ـ 45،100»

دیارە ئەمەش، هۆکەی بۆ پەیدابوونی ئایینیی ئیسلام دەگەڕێتەوە. بە هۆی ئەو ئایینەوە، زمانی عەرەبیی لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوە و کارێکی زۆری لە زمانی کوردیی کردووە. هێندێ لە پیتەکانی زمانی عەرەبیی، جێگەیان بە هێندێ لە پیتە کوردییەکانی وەک « ڤ » و « ژ » تەنگکردووە.
بۆیە، لە دوای ئەو مێژووەوە، نەک هەر لە ناوچەی هەوراماندا، ئەو پیتانە کەم بەکارهاتوون، یا هەر بەکار نەهاتوون. بەڵکوو، لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشدا، بە کارتێکرنی زمانی عەرەبیی لە زمانی فارسیی، ئەو دەرکەوتە زمانەوانییە، بە ئاشکرا دەبینرێ. (زمانی ئایینی تازە، « دەنگ »ی وای تێدا بوو، لە زمانەکانی « ئێرانی »دا بەرچاو نەدەکەوت، گومانی تێدا نییە، کورد یا فارسێکی سەرەتای ئیسلامەتیی، تا ماوەیەکی زۆر نەیتوانیوە، ئەو دەنگانە وەکوو عەرەبێک تەلەفوزبکا، فارسەکان و گەلێ نەتەوەی موسوڵمانی ئێستەش، ئەو دەنگانەیان وەکوو خۆی بۆ ناگوترێ. بەڵام، کورد دەنگی « ض »ی لێدەرکەی، ئەوانی دیکەیان بە چاکیی بۆ دێ و دەیڵێن، بە جۆرێ وەکوو دەنگێکی ئەسڵی زمانی کوردییان لێهاتووە، نەک هەر ئەوەندە و بەس، بەڵکوو، گەلێ ووشەی پەتیی کوردییش، هەندێ لە دەنگەکانیان ـ « ک یا گ »ی کوردیی بە « ق »ی عەرەبیی ـ گۆڕیوەتەوە بەو دەنگانەی کە زمانی ئایینی تازە هێناونیە کوردستان.)«70،35 ـ 36»
دەنگی پیتی « ڤ »، لە هێندێ ووشەی بەشەدیالێکتی « هەورامانیی » کۆن و « بادینانیی »دا، زۆر بە ڕوونی دیارە و دەبیسرێ، بۆ نموونە: هەورامیی کۆن (ئامۆڤە، سەرۆڤە، ژیڤۆڤە، یۆڤە، ئاڤی) لە بادینانیدا بوون بە (هاتەڤە، سەرڤە، ڤەژیڤە یا ژیبۆڤە، پێکڤە، ئاڤ)«130،63» بەڵام، وەک گوتمان: ئەو پیتە کوردیی یە کۆنە، بە کارتێکردنی زمانی عەرەبیی بە گشتیی و زمانی فارسیی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە تایبەتیی، وردەوردە، دەنگی پیتی « ڤ »ی کزکرد و پیتی « و »جێگەی گرتەوە.
دەربارەی هەر دوو پیتی « و » و « ڤ » لە هەر دوو لقەدیالێکتی «سۆرانیی و بادینانیی » سەر بە بەشەدیالێکتی « کرمانجیی سەروو و ژووروو » دەتوانین، چەن نموونەیەک بێنینەوە: (ئاو ـ ئاڤ. سۆلاو ـ

سۆلاڤ. هاوین ـ هاڤین. هەویر ـ هەڤیر. نیو ـ نیڤ. سێو ـ سێڤ، کاروان ـ کارڤان. کەوان ـ کڤان. چاو ـ چاڤ. نوێژ ـ نڤێژ. دارەوان ـ دارڤان. باوی « بادام » ـ باهیڤ. شەو ـ شەڤ. ئاوایی ـ ئاڤاهی. بلاو ـ بەلاڤ. شیو «چێشت » ـ شیڤ. مرۆ ـ مرۆڤ. تەون ـ تەڤن. داو ـ داڤ. هەنگاو ـ گاڤ. زیو ـ زیڤ. گاوان ـ گاڤان. شوان ـ شڤان. شوانکارە ـ شڤانکارە. دەو « دەم » ـ دەڤ. میوان ـ میهڤان. ڕێوی ـ ڕیڤی. ناو ـ ناڤ. ژوان ـ ژڤان. پێوان ـ پێڤان. ئاوا ـ ئاڤا. ڕۆژئاوا ـ ڕۆژئاڤا. پێلاو ـ پێلاڤ. ڕەزەوان ـ ڕەزەڤان. تەور ـ تەڤر. مەلەوان ـ مەلەڤان. )«54،63»

لە ڕاستیدا، گەر ئەم دوو لقەدیالێکتە، لە ڕێگەی ئەم چەن ووشەیەوە، لەگەڵ زمانی کوردیی و فارسیدا بەراوردکەین، جیاوزییەکی گەورە نابینین. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ، کە زمانی کوردیی و فارسیی، لە بنەچەدا هەر یەک زمان بوون. پاشان، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی بە سەر هەر دوو زمانەکەدا هاتوون، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، بە تەواویی جیابوونەتەوە، ئەوڕۆ وەک دوو زمانی جیاواز دادەنرێن، هەر وەک چۆن «سۆرانیی و بادینانیی »ش، وەک دوو لقەدیالێکت جیابوونەتەوە و تەماشادەکرێن.

سەیر ئەوەیە، کوردەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانیش، چاو لە فارسەکان دەکەن، لە بری پیتی « ڤ »، پیتی « و »بەکاردێنن. بۆیە، هەر ووشەیەک پیتی « ڤ » ی تێدابێ، ئەوان بە پیتی « و » دەینووسن و دەیخوێننەوە. بۆ نموونە: (ئەڤین ـ ئەوین، ڤییەنا ـ وێنا، ڤیدیۆ ـ ویدیۆ، ئاڤێستا ـ ئاوێستا، تیلێڤیزیۆن ـ تیلێویزیۆن ... تاد) وەک ئەوەی، ئەو پیتە کوردیی نەبێ! کە ئەمە خۆی لە خۆیدا، نیشانەی گەرەلاوژێیەکی گەورەی زمانەوانیی نەبێ، هیچی دیکە ناگەیەنێ. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا (دەنگی « ڤ V » لە باری فۆنۆلۆژییەوە کۆنترە لە « و W »، هەروەها، لە سەر زمان شیرینتر و جوانترە و لەوەش بترازێ، زۆربەی زۆری نەتەوەی کورد بەو جۆرە دەریدەبڕێ. )«59،23 »

جا نازانم، ئەو پیتە بۆ دەسڕنەوە؟ ئایا، ئەم کارە لە ژێر کارتێکردنی زمانی فارسیدا دەکەن، یا هەر بە ئارەزووی دڵی خۆیان وای دەنووسن و وەک

چۆلەکە ملی ئەو پیتە کوردییە هەڵدەکێشن؟!! ئەوە لە کاتێکدا، ئەو پیتە پیتێکی کوردیی ڕەسەنە و زۆربەی زۆری کورد، لە هەموو دیالێکتەکاندا بۆ ئاخافتن و بە هەر دوو پیتە عەرەبیی و لاتینییەکەش، لە نووسیندا بەکاریدێنن.
لە بەشەدیالێکتی « هەورامیی »شدا، ئەو کارتێکردنە بە ئاشکرا دەبینین.
بۆ نموونە: ئەو ووشانەی لە هۆنراوەکانی سەیدای هەورامیی و لە هەورامیی کۆندا، دەنگی « ڤ » یان تێدابووە، لە هەورامیی نوێدا، بە دەنگی « و » گۆڕاون. وەک: هەورامانیی کۆن(ئاڤاز، تەڤڤە، لکناڤە، ژیڤۆڤە، تاڤام، لەنجییڤە، زنجێڤە، یڤێڤە، ڤەیڤە) هەورامانیی نوێ (ئاواز، تۆوە، لکناوە، ژیڤووە، تاوام، لەنجییێووە، زنجێوە، یوێوە، وەیڤە « وەیوە »)«131،63»
یەکێ لە خەسڵەتەکانی زمانی کوردیی ئەوەیە، بە شێوەیەکی بەردەوام لە گۆڕاندایە. جا ئەو گۆڕانکارییانە، چ لە زیادکردن و چ لە کەمکردنی پیت و دەنگەکاندا بێ. لەبەرئەوە دەبینین، هەمیشە زمانەکەمان بە دوای کورتکردنەوەدا دەگەڕێ، بەرەو ئاسانتر دەڕوا، تا لە پاشەڕۆژدا ئاسانتر و ئاسانتریش دەبێ. ئەم خەسڵەتە نەک هەر تەنیا، لە زمانی کوردیدا هەیە، نەک هەر تەنیا لە نووسینی کوردیی، بە پیتی عەرەبییدا هەیە، بەڵکوو، لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا هەیە، لە نووسینی کوردیی بە پیتی لاتینییشدا هەیە. بۆ نموونە:
ئەو پیتانەی لە ئاخافتندا سواوون و نەماون، باشتروایە، لە نووسینیشدا نەنووسرێن، تا بە کوردییەکی ئاسانتر دەربڕێن و لە سەر زبان شیرینتربن.
بە پیتی عەرەبیی دەتوانین، لە بری « دەستنیشانکردن، دەستنووس، مەبەست، دەست، ڕاوەستە، کەرەستە، ڕابکە، ئیشبکە، ماڵ ئاوا، ڕۆژئاوا، خۆرئاوا و ... تاد » بنووسین:« دەسنیشانکردن، دەسنووس، مەبەس، دەس، ڕاوەسە، کەرەسە، ڕاکە، ئیشکە، ماڵاوا، ڕۆژاوا، خۆراوا و ... تاد » بە پیتی لاتینیش وەک :

Destgeh - Desgeh
Dotmam - Domam
Destmal - Desmal

Cendik - Denik
Bincegn - Biceng
Cehwar - Cihar «83،18»

هەروەها دەتوانین، بڵێین: پیتی « ت » پتر بۆ دڵنیایی لە ڕاستیی ووشە و دروستیی تێگەیشتنەکان بەکاردێنرێ. ئەگینا، هیچ لە واتای ووشەکە و ڕستەکە ناگۆڕێ. بە تایبەتیی، کاتێ کردارێکی « ئێستە ـ Present »مان دەبێ، کۆتایی بە پیتی « ت »دێ، نەک هیچ جۆرە زیانێ بە زمانەکەمان ناگەیەنێ، بەڵکوو هیچ جۆرە هەڵەیەکیش دروس نابێ و ئاواز و مۆسیقای ووشەکەش، لە سەر زبان شیرینتر دەبێ. بۆ نموونە:

تۆ پێشمەرگەیت : تۆ پێشمەرگەی. تۆ ڕابەریت : تۆ ڕابەری.

بۆ ئەوەی زمانەکەمان، لای خۆمان و لای ئەو بیانیانەی دەیانەوێ، فێری زمانی کوردیی بن، بە تەواویی ئاسانکەین، پێویستە، چۆن قسەدەکەین، هەر بەو شێویەش بنووسین. لەبەرئەوە پێشنیازدەکەم، هێندێ پیتی کۆنسۆنانتی وەک « ت . د . ک . ه » هەن، لە ناوەڕاست یا لە کۆتایی ووشەدا دێن، باشتر وایە، بەگوێرەی توانا و لەو شوێنانەدا کە واتا و دەنگی ووشەکەی پێ تێک ناچێ، نەنووسرێن. زۆربەی زۆری کورد، لە زۆربەی کاتدا، لە ئاخافتندا پیتی « ت » دەرنابڕن. لەبەرئەوە، لەو جێگەیانەی پیتی « ت »، لە ناوەڕاست یا لە کۆتایی ووشەدا دێ، هێندێ جار، لە سەر زبان قورسە و هێندێ جاری دیکەش، شتێکی زیادە و پێویست ناکا، بگوترێ و بنوسرێ. بۆیە دەتوانین، چۆن قسەدەکەین، هەر بەو شێوەیەش بنووسین. ئەمەش دوو کەڵکی بۆ زمانەکەمان هەیە: لە لایەکەوە، ووشەکان لە سەر زبان ئاسانتر، ڕەوانتر و خۆشتر دەبن. لە لایەکی دیکەشەوە، چ لای خۆمان و چ لای ئەو بیانییانەی دەیانەوێ، زمانی کوردیی فێربن، زمانەکەمان ئاسانتردەکا. لەم بوارەدا دەتوانین، کەڵک لە بەشەدیالێکتی هەورامیی وەرگرین. بۆ نموونە:لە « سۆرانیی »دا دەڵێین: (بابێت، دەست، دەستەسڕ ... تاد). بەڵام لە «هەورامیی » دا دەڵێن: (بابێ، دەس، دەسەسڕ ... تاد) باوەڕیش ناکەم، شێوەی یەکەم لە شێوەی دووەم شیرینتربێ، یا بە قرتاندنی « ت »، زمانەکەمان تووشی هیچ جۆرە زیانێ بێ!

ئەم کورتکردنەوەیەش پتر، لە کاتی کەسی دووەمی کرداری ڕابردووی تێ نەپەڕدا دەردەکەوێ. بە تایبەتیی، ئەو کردارانەی بە پیتی « ی » کۆتاییان دێ. لەو کاتەدا، « یت » وەردەگرێ. وەک ئەوەی بڵێین:« چوون - چووم، چوو »، تا ئێرە هیچ گۆڕانێکی تێدا ناکرێ. بەڵام دەتوانین، بۆ کەسی دووەم، لە بری « چوویت » بڵێین « چووی ».
لە کرداری ئێستەدا، جۆرێکی دیکە دەبێ، هیچ پێوەندییەکی بە باری کردارەکەوە نییە، چ تێپەڕ یا تێ نەپەڕ بێ، « ی »کەسی دووەم هەر وەردەگرێ. بۆ نموونە: « خواردن ـ دەخۆیت، دەخۆی. نووستن ـ دەنوویت، دەنووی. نووسین ـ دەنووسیت، دەنووسیی ».*
ئەوە جگە لەوەی، کورد هەمیشە، لە کاتی کرداری « فەرمان » یا داواکردندا، هەرگیز ئەو « ت » بەکار نایەنێ و ئەیقرتێنێ. وەک: دەبێت، خۆت بشۆیت، ئینجا بنویت. دەبێ، خۆت بشۆی، ئینجا بنوی.
لێرەدا، چەن نموونەیەک، لە سەر کورتکردنەوەی هێندێ پیت دێنینەوە : پیتی « ت »:(دەیکوژێت ـ دەیکوژێ، دەڕوات ـ دەڕوا، دەخوات ـ دەخوا.). پیتی « ک »:(یەکێک ـ یەکێ، ڕۆژێک ـ ڕۆژێ، کەسێک ـ کەسێ.). پیتی «د»:(بەغداد ـ بەغدا، دەنواند ـ دەنوان، دەڕواند ـ دەڕوان.).هەروەها ، هێندێ جار، پیتێ لە ناوەڕستی ووشەدا دێ، دەتوانین، لە نووسیندا بیقرتێنین و نەینووسین، وەک پیتی « ه »: (سەردەهێنان : سەردەردەهێنێ ـ سەردەردێنێ، سەریدەرهێنا ـ سەریدەرێنا ، سەریاندەرهێنا ـ سەریاندەرێنا. نموونەهێنانەوە: نموونەدەهێنێتەوە ـ نموونەدێنێتەوە. پێکهێنان: پێکبهێنێ ـ پێکبێنێ.)

---

* کاتی خۆی، نامەیەکم بۆ بەڕێوەبەرانی مانگنامەی « پەیام » نارد. لە بەشی «پەیامی خوێنەران » ژمارە دە بڵاوکرایەوە. ویستم، هاوکارییان لەگەڵ بکەم، کەچی، کارەکەم بە خراپ لێ وەرگیرا. « 65 » جار دەسکاریی هەر دوو پیتی « ت، ک »ی کۆتایی ووشەکانیان کردبوو. گوایە، هەڵەی ڕێنووس و ڕێزمانیان بۆ ڕاسکردوومەتەوە! وەڵاممدانەوە. بەڵام نەمنارد. بۆیە لێرەدا بڵاویدەکەمەوە، چونکە، پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەم باسەوە هەیە. تەماشای ل546 بکە.

هێندەی لەو بارەیەوە سەرنجمداوە، زۆربەی کورد لە قسەکردندا، دەڵێن: «دەسم نەشتووە»، کەم دەڵێن. «دەستم نەشتووە». یا دەڵێن: «دەسخۆش، دەس خۆشبێ، دەسی خۆشبێ». کەمتر دەڵێن: «دەستخۆش، دەست خۆشبێ، دەستی خۆشبێ.» چونکە، کاتێ دوو پیتی کۆنسۆنانت، بە دوای یەکدیدا دێن، دووەمیان لە سەر زبان قورسدەبێ، وەک پیتی «ت» کە دوای پیتی «س» دێ. هەروەها، «دروسمکرد، دروسیکرد، دروسیدەکا»، لە «دروستمکرد، دروستیکرد، دروستیدەکا»، لە سەر زبان ئاسانتر، ڕەوانتر و خۆشترە. ئایا چاکتر نییە، هەموو لایەکمان بە وردیی، سەرنجی زمانەکەی خۆمان بدەین، کورد چۆن دەدوێ و چۆن دەنووسێ، ناوی شتەکان لە ڕاستیدا چۆن دەبا، هەر بەو چەشنە ناویان بەرین و بیانخوێنینەوە و تۆماریانکەین؟!!
لە هەمان کاتیشدا، هێندێ ووشە هەن، دەتوانین، کورتیانکەینەوە، بێ ئەوەی واتاکانیان تێکچن، لە سەر زمانیش ئاسانتر و ڕەوانتردەبن. وەک (ئەگەر ـ گەر. ئەگەر چی ـ گەر چی. ئینجا ـ جا. بێجگە ـ جگە. چاکتر ـ چاتر. چەند ـ چەن. خۆرئاوا ـ خۆراوا. ڕۆژئاوا ـ ڕۆژاوا. نەوەکوو ـ نەک. هەتا ـ تا. هەتاهەتایە ـ تاهەتایە. هینی ـ هی. وەکوو ـ وەک. یاخود ـ یا. یان ـ یا. مرۆڤ ـ مرۆ و... تاد)
دەربارەی ئەو ڕێنووسەی، لە ساڵەکانی حەفتادا، بۆ نووسینی زمانی کوردیی، لە لایەن «کۆڕ»ەوە دانرا، تا ئەوڕۆ تەنیا وەک یادگاریێ سەیردەکرێ. چونکە، نەک ئێستە، هەر کەس پێڕەوی ناکا، بەڵکوو تەنانەت، ئەوانەی داشیاننا، خۆشیان پێی نانووسن! ئەمەش، لەبەرئەوە بوو، شێوازێکی گەلێ ناشیرینی هەبوو. کاتێ، بە لاسایپکردنەوەی زمانی عەرەبیی، لە بری دوو «و» یا دوو «ی» نیشانەیان لە سەر پیتەکان دادەنا، یا چوکلەی پیتی «ڕ»، لە بری ئەوەی لە ژێر پیتەکەدا بێ، لە سەر پیتەکە دایاندەنا، کە ئەوە یەکەم: ڕێنووسێکی زۆر ناشیرین بوو. دووەم: وەک «تایەر سادق» و د. «جەمال نەبەز»یش دەڵێن: (پیتی ڕێی گران، نیشانەکەی لە ژێرەوە بێ باشترە، تاکوو لەگەڵ پیتی «ز» یا پیتی «ژ» بە هەڵە نەچین.)«11،63»

پاشان دەتوانین، لە ئەندامانی کۆڕ بپرسین، ئایا، چوکلـە لە ژێر یا لە سەر « ر » کە بێ، چی لە باسەکە دەگۆڕێ؟ ئایا، بەو بڕیارەیان، چ شتێکی نوێیان لە نووسین و ڕێنووسی کوردیدا داهێنا؟

زۆر پێویستە، جیاوازیی لە نێوان، لە لایەکەوە « پیت » و « دەنگ »، لە لایەکی دیکەشەوە، « پیت » و « فۆنیم »دا بکەین. ڕاستە، بە ڕووالەت، هەر دووکیان وەک یەک وان. بەلام، لە ڕاستیدا، لە یەکدی جیاوازن. بۆیە، لە سەرەتادا پێویستە، پێناسەی هەر یەکێ لەو سێ زاراوەیە بکەین و چەن نموونەیەکیشیان لە سەر بێنینەوە.

لە ڕاستیدا، ماوەیەکی زۆر نییە،جیاوازیی لە نێوان « دەنگ » و « پیت » دا دەکرێ. بەلکوو،(زانایان تا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمیش، «دەنگ » و « پیت »یان لە یەکدی جیا نەکردبۆوە، ئەمە و زمانناسانیش، لە نیوەی دووەمی هەمان سەدەدا، بۆ لە یەکدی جیاکردنەوەی « پیت » و «دەنگ » ، کێشەیان هاتە پێشێ و پاش کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمیش، لە ئەنجامی لێکۆلینەوەی زانستیی بۆ دۆزینەوەی شتە نائاشکراکان بە ئەنجامبگەن، کە هەر لە ڕێگەی تیوریی فۆنێتیکدا " فۆنیم " دۆزرایەوە.) «29،3»

پێشتر، بە درێژیی باسی پیتەکانمان کرد. بەلام، با ئێستە بزانین، مەبەسمان لە « دەنگ » و « فۆنیم » چییە؟ « زوبێحی » دەلێ:(زمانی هەموو نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەمینە، وەکوو دیاردەیەکی کۆمەلایەتیی وایە و « کل »ێکە کە لە « جزء »ان پێکهاتووە، ئاتۆمی زمانان دەنگەکانی هەر زمانێکە، ئەگەر مەسەلەکە نەختێ زیاتر خوردکەینەوە دەبێ بلێین: کە ئاتۆمی زمانانیش ئەو « جزئە لا یەتەجزەئە » نییە، وەکوو دێتە بەرچاوان، چونکە زانستی فیزیا دەمێکە ڕوونی کردۆتەوە « دەنگ » لە لەرینەوەی شتێک پەیدا دەبێ « زەبزەبات ئەلصەوتیە » وەک دەبینین، ئەو ئامرازانەی مۆسیقیی کە « ژێ »یان هەیە وەکوو تار، عوود، کەمانچە ... تا بە ئامرازی تایبەتیی میزڕاب « بۆ تار و عوود » و ئارشێ « بۆ کەمانچە» لە تەلەکانیان نەدەن و نەیان لەرێننەوە دەنگیان لێوە نایە، لە مەسەلەی دەنگەکانی زمانێکدا ئەوە ئامرازانەی مووسیقا گەرووی ئینسانە

کە هەندێ « ژێی »ی تێدایە « ئەلئەوتار ئەلصەوتیە » بە هەوایەکی لە دەرووندا دێتەدەر دەکەونە لەرینەوە.) پاشان دەڵێ: (بۆیە کورت و کرمانجیی دەڵێم: دەنگەکانی هەر زمانێک لە لەرینەوەی ژێکانی دەنگی گەرووی ئەم ئینسانانە پەیدادەبێ، کە بەو زمانە قسەدەکەن و ئەم لەرینەوە بە پێچوپەناکانی ناو قورگ و دەمی ئینساندا تێدەپەڕێ، تا دەگاتە ئەو شوێنەی هەر دوو لێو پێکەوە دەنووسێن.)«57،70»
دەربارەی پێناسەی « دەنگ » و « فۆنیم »، د. « کەمال فوواد » دەڵێ: (دەنگ « phone »: پچووکترین یەکانەی وتنە. تیپ « grapheme، type »: وێنەی دەنگە و پچووکترین پارچەیە لە نووسین. فۆنیم « phoneme »: پچووکترین یەکانەی دەنگی زمانە، کە گۆڕینی لە ووشەیەکدا ئەبێتە هۆی گۆڕینی مانای ئەو ووشەیە.)«2،90»
سەبارەت بە پێوەندیی نێوان « پیت و فۆنیم »، گەلێ شارەزای وەک: «جەلادەت بەدرخان و د. کەمال فوواد » دەڵێن: (لە زانستی زماندا، ڕاسترین شێوەی نووسین ئەوەیە، کە بۆ دەربڕینی هەر یەکانەیەکی دەنگیی، یەک تیپ بەکاربێت.)«3،90» بەلام، باشتر شتێکە و باری دەنگی پیتەکان شتێکی دیکەیە. بۆیە، هێندێ جار دەبینین، یەک پیت، دوو دەنگی هەیە. ئەم خەسڵەتەش پتر لە پیتە عەرەبییەکاندا دەردەکەوێ و لە پیتی لاتینیدا ووندەبێ. هەروەها وەنەبێ، ئەم خەسڵەتە تەنیا هەر لە زمانی کوردییدا هەبێ، بەڵکوو لە گەلێ زمانەکانی دیکەی گەلانی جیهاندا هەیە.
بۆ ئەوەی باشتر، لە جیاوازیی نێوان دەنگ و پیت بگەین، لێرەدا نموونەیەک دێنینەوە: ووشەی ئینگلیزیی « Fox » لە سێ پیت پێکهاتووە. بەلام، چوار دەنگی هەیە. چونکە، « x » بە تەنیا دوو دەنگی وەک « ک ، س » وەردەگرێ. لێرەدا دەبینین: ژمارەی دەنگ و پیت جیاواز و دەنگ و فۆنیم، وەک یەکن.
دەنگ لە زمانەکانی جیهاندا، بایەخێکی گەلێ زۆری پێ دەدرێ. چونکە، (دەنگ بەردی بناغەی هەموو زمانێکە و ئەو دەنگانەی ئیمڕۆ لە زمانی کوردییدا هەن « ڕەسەن و ناڕەسەن » بەروبووی تطوری سەدان ساڵە، کە پێداویستیی زمانەکەمان سەپاندوویەتیی و لەقاندنی بەردی بناغەی دیوار

یا خانوو باش نییه.)«60،70 ـ 61» بەڵام، بە مەرجێ لەگەڵ دەستووری زماندا بگونجێ. نەک، هەرکەسێ دەسی پێنووس بگرێ، ماف بە خۆی بدا، بە ڕاست و بە چەپدا، وەک ئاشی کرێوە دەنگ، پیت و ووشە دەرفرتێنێ!
ئەوەی گومانی تێدا نییە، هەر پیتێ دەنگێکی تایبەتیی خۆی هەیە. لە هەمان کاتیشدا، بەگوێرەی جێگەی ئەو پیتە، لە سترکتووری ووشەیەکی دیاریکراودا، دەنگەکەی دەگۆڕێ. واتە: پیتە جیاوازەکان، کار لە دەنگی یەکدی دەکەن. « زوبێحی » دەنگەکانی زمانی کوردیی بە سی دەنگ دادەنێ. بەڵام، دەڵێ:(بە لای منەوە دەبێ ئەم دەنگانەش « واتە: دەنگی ط ، ظ » بهێنرێنە ناو دەنگەکانی کوردییەوە، بەم جۆرە دەنگەکانی زمانی کوردیی ژمارەیان دەبێتە سیودوو دەنگ)«63،70» بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەیە، گوایە ئەم دوو دەنگە لە دیالێکتی باکووردا هەیە. ڕاستە، لە دیالێکتیی باکووردا، ئەم دوو دەنگە دەبیسرێ، بەڵام، ئەم بۆچوونە هەڵەیە. چونکە :
یەکەم: ئەو دەنگانە تەنیا لە ئاخافتندا دەردەکەون، وەک پیت، لە نووسیندا بەکاری نایەنن.
دووەم: ئەو دەنگانە دەنگێکی کوردیی ڕەسەن نین، بەڵکوو لە ئەنجامی تێکەڵاوی دانیشتووانی ناوچەکانی باکوور و گەلی عەرەب پەیدابوون.
سێیەم: ئەوان بە پیتی لاتین دەنووسن، ئەو دوو پیتە دەنگەکانیان بە پیتی لاتین نانووسرێ و دەر ناکەون.
ئینجا، با بزانین،جیاوازیی لە نێوان « دەنگ » و « فۆنیم »دا هەیە، یانا ؟
دەنگ ـ Phone(هەموو دەنگێ ناگرێتەوە، بەڵکوو مەبەس ئەو دەنگەیە، کە لە ئاخافتندا بەکاردێنرێ، وەک کەرەسەیەکی سەرەتایی گفتوگۆکردن، ئیتر ئەو دەنگە کۆنسۆنانت بێ، یاخود بزوێن.)«73،99 ـ 74»
هێندێ لە زماناسان پێیان وایە:(فۆنیم چەپکێ دەنگی ئاخافتنە.) هێندێکی دیکە لەو باوەڕەدان:(فۆنیم ئەو دەنگەیە، کە واتای ووشە دەگۆڕێ.) هێندێکی دیکەش دەڵێن:(فۆنیم، ئەو دەنگەیە، کە توانای بەخشینی واتایەکی تایبەتیی هەیە، لە ناو چەپکێ دەنگی تایبەتیی ئاخافتندا.)«77،100»

(زاناکانی زمان، کۆنسۆنانتەکان و بزوێنەکان بە فۆنیم دادەنێن.) «77،100» بۆ نموونە: هەر دوو ووشەی « شەن » و « شەم » دێننەوە. لە رووالەتدا مۆسیقای دەنگەکانیان، لە کاتی ئاخافتندا وەک یەک وان. بەڵام، لە ڕاستیدا، جیاوازییەک لە نێوان دەنگی « ن » و دەنگی « م »دا هەیە. دیارە، هەر لەبەرئەوەشە، لە ڕووی واتاوە جیاوازییان هەیە. بۆیە دەبێ، هەر دوو دەنگەکە، دەنگی « م » و دەنگی « ن »، هەر یەکەیان بە فۆنیمێکی جیاواز دانێین.

فۆنێم، چەن ڕووالەتێکی هەیە(جۆرە ئاوازێکی تایبەتیی لە نێو چەپکێ یاخود لە ڕیزە چەپکێ دەنگی ئاخافتن لە کاتی گۆکردندا، واتایەکی تایبەتیشی لە نێو ئەو چەپکە دەنگانە و بە هۆیانەوە هەیە ..)«78،100»

هەموو ئەو دەنگانەش، پێبەپێی گۆڕانکارییە مێژوویی و کارەساتە نەتەوەیی یەکان گۆڕاون. لە سەردەمێکدا هێندێ دەنگ لە زمانە کۆنەکانی گەلانی ئێراندا هەبوون، ئەوڕۆ نین. بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە. واتە: لە سەردەمێکی دیاریکراودا، هێندێ دەنگ نەبوون، کەچی ئەوڕۆ پەیدابوون، لە دەنگە ڕەسەنە کۆنەکانیش، لەم زمانانەدا پتر جێگەی خۆیان گرتووە. بۆ نموون:(هەر نووسراوێکی پەهلەویی یا ئاڤێستایی کە تا ئێستە زانایان خوێندوویانەتەوە دەنگی « ص، ع، ق » یان تێدا نییە « گەر وای دانێین، کە تەلەفووزی ڕاستی دەنگەکانی پەهلەوی و ئاڤێستاییمان بە دەستەوەیە » بەڵام، ئێستە ووشەی کوردیی کە بە « ق » دەست پێدەکرێن یا « ق »یان تێدایە، هیچ کەمتر نین لەوانەی بە دەنگێکی ڕەسەنی کوردیی دەسپێدەکرێن و هەروەها « ع »یش کەم نییە، کەچی بێجگە لە چەن ووشەیەکمان دەس ناکەوێ کە بە « ژ » دەسپێبکا و ئەگەر چی ئەم دەنگە لە دەنگە ڕەسەنەکانە، لە پەهلەویی و ئاڤێستاییشدا هەر کەم بووە،)«59،70»

هەروەها،(زمانی ئاڤێسایی کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی زمانی کوردیی دەنگی « ل »ی نەبووە، دەنگێکی هەبووە لە دوو دەنگی « ت، ه » پێکهاتووە کە ئێستە هەندێ کەس وەکوو « ث »ی عەرەبیی یا Th ئینگلیزیی دەیخوێنێتەوە و بەعزێکیش « ته » تەلەفوزدەکەن، وەکوو ووشەی « پەرتهوە » کە ناوی یەکێک لە خێڵاتی ئەشکانیی بووە، گەلێ

کەس بە « پەرثوە »ی دادەنێن و بە عەرەبیی « فرثی »یە، هەروەها لە زمانی ئاڤێستاییدا دەنگی « ذ » و دەنگێکی تێکەڵاوی « خ، ف » هەبووە، ئێستە لەو زمانانەدا کە ئاڤێستایی کاری تێکردوون ئەو دەنگانە نەماوون.)«58،70 ـ 59»
لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەڵێم: بۆ ئەوەی، هەستی نەتەوەیی کورد ببوژێتەوە، بۆ ئەوەی، لە هەموو ڕووەکانی ژیانی نەتەوەیی یەوە پێشکەوێ، بۆ ئەوەی، لە دەس داگیرکردن و چەوساندنەوە ڕزگاریبێ، بۆ ئەوەی، ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانبێ و گەشەبکا، بۆ ئەوەی، هەموو ڕۆڵەکانی کورد، بە تەواویی لە یەکدی بگەن، دەبێ بایەخێکی تەواو بە زمانەکەمان بدەین.
د. « سمایل بێشیکچی »، قسەکردن بە کوردیی، خوێندن و نووسین بە کوردیی، بە یەکێ لە مەرجە سەرەکییەکان دادەنێ و دەڵێ:(پێویستە، هەموو هەوڵێ بدرێ، یەک شێوە زمانی یەکگرتووی نووسینی کوردیی بسەپێندرێ. ئەویش، بەوەی ئەلفوبێیەکی هاوبەش بەکاربێنرێ. بۆ نموونە: لەوانەیە، بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتین، یەکێ لەو هۆ گرنگانەبێ، ئەو سنوورە ڕامیارییانەی ئیمپریالیزم و هاوکارەکانی لە ناوچەکەدا کێشاویانە، بیبەزێنێ.)«315،10» چونکە، بە هۆی ئەو هەموو گرفتە مەزنانەی، زمانی کوردیی هەیەتی، بە هۆی ئەو هەموو دیالێکت و بەشەدیالێکتانەی پەیدابوون، بە هۆی ئەو بارە نەتەوەیی و ڕامیارییانەی، نەتەوەی کوردی تێیدا دەژی، زمانەکەمان لێکدابڕاوە و لێکپچڕاوە، هەر بەشەی بە دیالێکتێ قسەدەکا و بە ئەلفوبێیەکی جیاواز دەنووسێ. بۆیە، (پسپۆڕەکانی زمان لەو باوەڕەدان، ئەلفوبێی لاتین بۆ زمانی کوردیی، پتر گونجاوترە.)«316،10»
کاتێ خوێندکارێکی کورد، ڕێی لە وڵاتێکی ئەورووپایی دەکەوێ و دەخوێنێ، ئەو کاتە لە باریی و بایەخی زمانەکەی خۆی بۆ دەردەکەوێ. چونکە، ئەو پیتانەی لە زمانە ئەورووپایی یەکاندا هەن، نزیکەی هەر هەموویان، لە زمانی کوردییشدا هەن، بەڵام، کاتێ توریستێ یا خوێندکارێکی « تورک، فارس، عەرەب، ئەمێریکای لاتین، ئەفریکا »،

ڕێیـان لەو وولاتە ئەورووپایی یانە دەکـەوێ، ئەو کـاتە هەست بە سـەختـیی گـوتنی ئەو پیتـانە دەکـەن، چونـکە هێندێ لەو پیتـانەیان نـییە. لـەبەرئەوە ناتوانن، وەک پێویست ووشەکان بە شێوەیەکی ڕاست دەربڕن.
بۆ نموونە: لە زمانی رووسیدا، هەموو پیتە کوردییە ڕەسەنەکانی وەک: « ژ، ڤ، گ، چ، پ، ۆ ...) هەن. بە بیرە دەڵێن « پیڤە ـ Puvo ». وێندکارە عـەرەب، ئەمـێـریکای لاتین و هێندێ لە خـوێندکـارە ئەفـریکایی یەکـان، لەبەرئەوەی هەر دوو پیـتی « پ و ڤ »یان نیـیـە، دەیانگووت: « بیفـە » رووسەکانیش لێیـان تێدەگەیشتن، چییان دەوێ، بەڵام هەر بە گاڵتەپێکردن و پێکەنینەوە، دەیانگووت: (بیفەمان نییە، پیڤەمان هەیە!)

## 4/ زمـــــانی ستاندارد :

ئێمە نەک هەر ئەلفوبێیەکی یەکگرتوومان نییە، بەڵکوو، تا ئێستازمانێکی وێژەیی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوەشمان نییە. چونکە، زمانی کوردیی لە چەن دیالێکت و خواردیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە. هەر دیالێکتەش، بە جۆرە پیتێکی تایبەتیی دەنووسرێ. هێندێ جیاوازیی دیکەش، لە نێوان ڕێزمـانی هێندێ لە دیالێکتـەکاندا هەیە. لەبەرئەوە، گـەر بیر لە زمـانێکی سـتـاندارد بکەینەوە، پێـشـەکـیی دەبێ، هەوڵێکی زۆر بدەین، ئەلـفـوبێی کوردیی یەکخەین. هەر چەندە، ئەو کوردانەی بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خـواروو دەدوێن و بە پیـــتی عـەرەبیی دەنووسن، تا ڕادەیەک، زمـانێـکی نیـمچە سـتانداردیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و چەسپیوە. ئەو زمانەش، پتر خۆی لە لقەدیالێکتـەکانی ناوچەی « سـولەیمانی ـ مـوکریی »دا دەنـوێنێ. بەڵام، ئەو کـــوردانەی بە بەشـــەدیالێکتی کـرمـانجـــیی ژووروو دەپەیڤن، هێندێکیـــان بە پیـتی لاتین و هێندێکی دیکەشـیـــان بە پیـــتی عـــەرەبیی دەنووسن، تا ئێـسـتـە، لە نێـو خـۆیاندا، لە سـەر شێـوە زمانێکی تایبـەتیی ڕێک نەکەوتوون و بە تەواویی ڕەگی دا نەکوتاوە.
شـتـێکی گرنگی دیکەش هەیە، لێرەدا پێـویسـتـە، لە سـەری ڕاوەسـتین. ئەویش ئەوەیە، بۆ ئەوەی زمـانەکـەمـان ئاسـانکەین، دەبێ، لە نێـوان دوو ووشـەی وەک یەکدا، ووشە ئاسانەکـەیان هەڵبژێرین و بەکاربێنین. لەگەڵ ئەوەشـدا، لە زمـانی کـوردیدا، هێندێ ووشـە هەن، شـێـوە و ناوەڕۆکـیـان

بەگوێرەی ناوچە و دیالێکت دەگۆڕێ. لەبەرئەوە ناتوانین، بڵێین، کامیان ڕاستــرن. بەڵکوو، لە هەر ناوچەیەک و بە هەر دیالێکتێ، شێوەیەکی تایبەتیی بەکاردێنن. بەڵام، لە زمانی ستانداردا دەبێ، هەرە ڕاستەکەیان بۆ نووسین دەسنیشانکرێ، ئەوی دیکەشیان، گەر لە کاتی ئاخافتندا بگوترێ، هیچ جۆرە زیانێ بە زمانەکەمان ناگەیەنێ. ئەگینا گەر وا نەبێ، زمانێکی تێکەڵاوی درشتی ڕوخسار دزێو دروسدەبێ، هەر کوردێ بە ئارەزووی خۆی و لە شوێنی خۆیەوە، ووشەی نادروست لە دیالێکتەکەی خۆیەوە هەڵدێنجێ و بەکاردێنێ.

زۆربەی نەتەوەکانی جیهان، بە هۆی پەرتووکێکی ئایینیی، یا شاکارێکی وێژەیی یەوە، زمانی ستانداردیان دامەزراندووە. بەڵام، تا ئێستە لە نێو نەتەوەی کورد بە گشتیی، کوردی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بە تایبەتیی، نووسەرێکی مەزنی وای تێدا هەڵ نەکەوتووە، تا بتوانێ، بەرهەمێکی وێژەیی بەرز و بە نرخ بنووسێ، بە مەرجێ شێوازی نووسینەکەی هێندە شیرین، ڕەوان، ئاسان و بەتاووتینبێ، شێوە زمانێکی یەکگرتووی نووسین، چ لە کرمانجی ژووروو و چ لە کرمانجی خواروودا دروسکا. بۆیە، ئەو دوو بەشەدیالێکتەشم لە یەکدی جیاکردەوە، چونکە، شێوەی نووسین و ڕێنووسی هەر دووکیان جیاوازیی هەیە.

هەر چەندە، نووسەر و هۆنەری گەورەی کورد « ئەحمەدی خانیی »، شاکارە بەرزەکەی خۆی « مەم و زین »، لە ساڵی « 1695/1694 ز »دا نووسیوە، لە نێو گەلانی جیهاندا، بە « ڕۆمیۆ و جولێت »ی کوردیی ناسراوە. بەڵام، لەبەرئەوەی، کورد خاوەنی دەوڵەتێکی تایبەتیی نەتەوەیی خۆی نەبووە، کوردستان لە بندەسی هەر دوو ئیمپراتۆریا گەورە داگیرکەرەکەی «عوسمانیی و سەفەویی »دا بووە، جگە لەوەی، « مەم و زین » بە کوردییەکی پەتیی و ڕەوان نەنووسراوە، تا ئەو شێوە زمانەی ئەو پێی نووسیوە، بتوانێ، ئەو ڕۆڵە مەزنە لە زمانی یەکگرتووی نووسینی کوردیدا ببینێ. وەک « هەژار » دەڵێ:(مەم و زینی خانی، پڕیەتی لە عەرەبیی ڕەق و فارسیی گران، ئەمەش نابێ، لە خانیی بگرین. چونکە، ئەو دەمەی ئەو پێی ژیاوە، ئاوا باوەبوو. هونەرمەندیی هەر کەس بەوەدا دەرکەوتووە، کە

زۆر ووشـەی ڕەقی عـەرەبیی و فـارسـیی بەکـاریێنن.)«1،س» ئەوە لە کـاتێکدا، لە مـێژووی گـەلانی جیـهـاندا، چەندین نموونەی زەقی لەو بابەتە دەبینین، تەنیـا هۆنەرێکی مەزن یا نووسەرێکی لێهـاتوو، بە نووسـینەکانی توانیـوێتی، زمـانێکی سـتـانداردی یەکگرتووی نەتەوەیی، بۆ نەتەوەکـەی دامـەزرێنێ. بۆ نموونە: « عـەرەب »ەکـان بە هۆی هۆنراوەکـانی سـەردەمی نەزانین و پاشـتـریش بە هۆی قـورئانەوە، زمـانێکی سـتـانداردیان بۆ خـۆیان دامەزران. فـارسەکـان بە هۆی هۆنراوەکانی « حافزی شیرازیی » و پەخشانە بەرزەکـانی « سـەعـدیی »ەوە، زمـانی یەکگرتووی نووسـینیـان دروسکرد. نووسەرێکی گەورەی بە ناوبانگی وەک « ئەبول قاسمی فـیـردۆسیی »، لە دەوروبەری « 935-1020 »ز. دا، واتە: پتـــر لە هەزار و ئەوەندە ســـاڵ لەمەوبەر، شاکارە بە نرخەکەی « شانامە » نووسیوە، کارێکی گەلێ گەورەی لە زمان، وێژە و مێژووی فارسەکان کرد. «115،125»

« دانتـی » هونەرمـەند، لە سـەدەی چوادەیەمـدا ژیاوە. یەکێ لەو نووسـەرە بلیـمـەتانەی « ئیـتـالیـا » بوو، بە هۆی کـۆمـەڵێ بەرهەمی وێژەیی خۆیەوە توانی، کارێکی یەکـجار گـەورە، لە زمـانی یەکگرتوو و هەسـتی نەتەوەیی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی « ئیتالیا » بکا. ئەو بەرهەمـانە، ئاگرێکی وای لە دڵ و دەروونی، ڕۆڵەکانی ئیتالیادا کردووە، بە شێوەیەکی وا پاڵیان بە کۆمەڵانی خەڵکەوە نا، هەموو شتێکیان لە پێناوی نیشتـمـانەکەیاندا، بەخت دەکرد، تەنیـا بۆ ئەوەی ئازادیی و سـەربەخـۆیی بەدیبـێنن. هێندێ لە گـرنگـتـرین بەرهەمـەکـانی: کۆمەڵێ هۆنراوە، پەخشـانی « ژیانی نوێ » و « کۆمـیـدیای یەزدانی » بوو. (ئەدەبیـــاتی « دانتـی » چ لە ڕووی شـێـــوە و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، لە شـاکـاری « کۆمیدیا »دا ـ کە دوای خۆی بە « کـۆمـیـدیای یەزدانی » ناوبرا ـ گەیشتە لووتکە. ئەم بەرهەمە بە نرخەی، بە گـەوهەری دەروشـەداری هەمـوو دیالێکتـە ئیـتـالیـایی یەکـان و پەندی مـیللی و ئامۆژگاریی بە نرخ و نموونەی مێژوویی ڕازاندەوە.)«96،91»

جگە لەوەی،(« کـۆمـیـدیای یەزدانی » یەکـێکیـشـە لەو چیـرۆکـانەی ناوەڕۆکـێکی قـووڵی نیـشـتـمـانیی هەیە و بە ئاشکرا، تەعـبیـر لە بوونی نەتەوەیی گـەلی ئیـتـالیـا دەکا. نووسـەری « کۆمـیـدیا » خەو بە یەکـێتـیی

ئیتالیا و نەهێشتنی شەڕ و ناکۆکیی ناوخۆیی یەوە دەبینێ و دەیەوێ، دەسەڵاتی دونیایی لە دەس پاپاکان وەرگرێتەوە.)«99،91» بە کورتیی : «کۆمیدیای یەزدانی » وەک ئاوێنەیەک وابوو،(هەر چی زانست و ئاوات و هەستی سەردەمەکەی هەبوون، تێیدا ڕەنگیاندەدایەوە.»)«101،91» پاشان، ئەوە بوو، لە سەدەی یازدەدا «دانتی » توانی، بە هۆی بەرهەمی «کۆمیدیای یەزدانی »یەوە، (بنکەیەکی پتەوی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئیتالیا)پێکبێنێ. «96،91»

گوتمان:« ئەحمەدی خانیی » ، پێش سێ سەدە لەمەوبەر، « مەم و زین »ی نووسیوە. لە بەرهەمە نایابەکەیدا، لە زۆربەی دەردەکانی کۆمەڵگەی کورد دواوە. دژی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی » وەستاوە و گوتوویەتی :

هێندەی کە بە جەرگ و دوورەترسن — کەمتر لە بە یەکگەین دەپرسن
کەس بۆ کەسی نابێ چاودەبەریێ — هەر کەس دەیەوێ زل و لە سەر بێ
لەم سەر ڕەقییە و دەماری زلیان — بێگانە دەبن سواری ملیان
هەر خۆیەتی زلکەوە و .ەش و بۆر — هەر بۆیەیە بوونە هێزی خۆخۆر
کوردیش کە ببایە یەکدڵ و دەست — دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست
پەیدادەبوو باو و گەورەیی و ژین — ناومان دەرئەکرد بە بیر و زانین
جیاوازدەبوو گفتی پاک و ناپاک — پڕ نرخ و بەڕێز دەبوو شتی چاک
«14-13،1»

« خانیی » ، لەگەڵ ئەو هەموو کەموکوڕییەشدا دیوێتی، هێشتا باوەڕی لەق نەبووە. ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردی هانداوە، یەکگرن، پێکەوە برابن، خەباتکەن، لە ژێر سایەی فەرمانی تاقە سەرکردەیەکی کورددا کۆبنەوە، دەوڵەتێکی کوردیی دامەزرێنن، بۆیە فەرموویەتی :

بۆ مەش کە هەبایە پادشایی خوا — تانجێکی پێ ببەخشیایی
پەیدادەبوو ڕێز و گەورەیی و ناو — ڕەنگ و کری مەش دەهاتە بەر چاو
ئێمەی لە کەساسیی دەردەهێنا — بێستانی هیوای وەبەردەهێنا
ترکان نەدەبوون بە سەر مەدا زاڵ — بۆ کوند نەدەبووینە لانە و ماڵ
چۆن بۆ عەجەمان دەبووینە ژێردەست — ژێردەستی شتی وەها نەوی و پەست
«13-12،1»

تەنانەت، لەو سەردەمەشدا، بیری لەوە کردۆتەوە، بە کوردیی بنووسێ، تا لە لایەکەوە، بە خەڵکی بسەلمێنێ، کورد زمانێکی تایبەتیی خۆی هەیە، دەتوانێ، پێی بنووسێ. لە لایەکی دیکەشەوە، هەوڵیداوە، زمانێکی یەکگرتوو بۆ کورد ڕێکخا، بۆیە گوتوویەتی :

بێگانە نەڵێن کە کورد نەزانن بێ نووسەر و هونەر و زمانن «14،1»

بەڵام، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، هەوڵەکانی سەری نەگرت. هەر نەشیتوانی، ئامانجەکانی بەدیبێنێ. چونکە، وەک کەڵە نووسەرانی نەتەوەکانی جیهان، گوێی لێ نەگیراوە. دەسەڵاتێکی کوردیی نەبووە، تا پشگیریی داوا ڕەواکانی بکا.

هەروەها، نووسەری بە ناوبانگی ئیسپانیی « سێر ڤانتس »، کارێکی یەکجار گەورەی، لە زمانی یەکگرتووی « ئیسپانیی » کرد. بە شێوەیەکی وا، (بە نووسینەکانی بنچینە و بناغەی بۆ زمانی یەکگرتووی ئیسپانی دارشت)«175،91».

ئینگلیزەکانیش بە هۆی هۆنراوەکانی « جۆسەر » و « شکسپیر »ەوە توانییان، زمانی ستانداردی خۆیان گەلاڵەکەن. ڕووسەکانیش لە سەدەی پازدەدا، بە هۆی نووسەر و هونەرەکانیانەوە، ئەم زمانە یەکگرتووەی ئەوڕۆیان لا ڕەخسا.

بەو شێوەیە دەبینین، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لەم بوارە گرنگەی ژیانی نەتەوەییدا، لە بواری زمان و وێژەی کوردیدا، تا ئێستە، هیچیان پێ نەکراوە. لەوە دەچێ، کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە، هەر هەوڵیداوە، هەر خەباتیکردووە، کەچی لە هەموو بوارەکاندا، بە دەسی بەتاڵ گەڕاوەتەوە و هیچی دەس نەکەوتووە. وا دیارە، ئێمەی کورد لە کۆندا، هاوچەرخی سەردەمێکی تایبەتیی مێژوویی بووین، لە چاو نەتەوەکانی دیکەی، سەر ڕووی زەویدا دواکەوتووبووین، هێشتا پرشنگی خۆری شارستانێتی لە کوردستان، بە تەواویی هەڵ نەهاتبوو. بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ڕۆژبەڕۆژیش، هەنگاوی بەرەو ئاوابوون ناوە. بۆیە، تاکوو ئێسەش، ئاوات بە بەرەبەیانێ دەخوازین، ڕۆژی سەردەمێکی زێڕینی نوێی، بۆ کورد تێدا هەڵبێ.

هەر چەندە، زمانێکی یەکگرتووی کوردیی نووسینمان نییە، بەڵام، تا ڕادەیەکی زۆر، زمانی یەکگرتووی کوردیی نووسین، لە بەشێکی گەورەی هەر دوو پارچەکەی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، لە مێژە بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو ـ لقەدیالێکتی « سولەیمانیی ـ موکریی » چەسپیوە. کەچی، هێندێ لە نووسەران، هەر بەو لقەدیالێکتە دەنووسن، کە لە سنووری ناوچەی ژیانی خۆیاندا بەکاریدێنن، وەک لەو پێشەکییەی «مستەفا نەریمان » بۆ هۆنراوەکانی « خەلیل منەوەر »ی نووسیوە، بە ئاشکرا دەردەکەوێ. جا گەر، هەر نووسەرێ بەو شێوە زمانەی قسەی پێ دەکا ، بنووسێ، دەبێ، چ جۆرە گەڕەلاوژێیەکی زمانەوانیی،ماڵوێرانییەکی نەتەوەیی و پاشاگەردانییەکی سەیری لێ دەرچێ؟!! کاریش بەو شێوەیە بڕوا، هەرگیز زمانێکی یەکگرتووی تۆکمە و سفتوسۆڵی نووسین، لە نێو کورددا سەرهەڵ نادا!

لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین، نکولی لەوە بکەین، بە شێوەیەکی بەردەوام، نووسەر و شارەزاکانمان هەولیانداوە و هەولیش دەدەن، بەردی بنچینەی زمانێکی ستاندارد دانێن. بەڵام، هەموو ئەو هەوڵانە، تا ئێستە سەریان نەگرتووە. (هەر چی مەسەلەی زمانە یەکگرتووە ئەدەبییەکەشە، ئەوا دەبێ، بزانین، کە هەر چەندە، ئەم ناتەواوییە وەک کەلێنێک لە سەدەی ڕابوردووەوە هەستی پێکراوە، بەڵام، هەتا ئێستە بایەخێکی زانستانە بە دروسکردنی نەدراوە. لە ساڵی 1934دا کۆنگرەیەکی کوردناسەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بڕیاریدا، شێوەی کرمانجیی ژووروو بکاتە شێوەی ڕەسمیی بۆ هەموو کورد. ئەوەش بو لە ئەیلوولی ساڵی1959دا کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی عێراق لە شەقلاوە بڕیاریدا، ئەو شێوەیەی کە بە « سۆرانیی » ناسراوە، بکا بە شێوەی ڕەسمیی و بنچینەی زمانی یەکگرتووی کوردیی دواڕۆژ.) «81،24»

دەبێ، ئەوەش بڵێین: بڕیاردان بە دەس کورد خۆیەتی، بەڵام، جێبەجێکردنەکەی بە دەس خۆی نییە. گەر بڕیاردان و جێبەجێکردن، هەر دووکیان لە دەسەڵاتی کورد خۆیدا بووایە، ئەو کاتە باسێکی دیکە بوو. ئارەزوو و بڕیاردانی کورد، لە دۆڵێکی قووڵی تەنگی وشک دایە و

جێبەجێکردنەکەشی لە دۆڵێکی دیکە خزێنراوە. بۆیە، هەموو ئەو بڕیارانە، ڕووناکییان نەبینیی و هەر بە کۆرپەیی جوانەمەرگبوون. چونکە، زمانی یەکگرتووی نووسین، پێوەندییەکی توندوتۆڵی، بە « ئازادیی نەتەوە، باری ڕامیاریی وولات و دەسەڵاتی دەوڵەت »ەوە هەیە. هەر کاتێ، ئەو شتانە بە دەس کورد خۆیەوە بوو، ئەوا دەتوانین. بڵێین، بڕیارەکانیشمان بە زوویی جێبەجێدەکرێن، هەموو ئامانجەکانمان بەدیدێنرێن، زمانەکەشمان پێشدەکەوێ و زمانی ستانداردی کوردیش، گەر لە سەرتاسەری کوردستاندا سەرهەڵ نەدا، ئەوا لەو بەشە ئازادەی کوردستاندا دروسدەبێ.
ئەم بارە نالەبارەی زمانی ستاندارد، کارێکی گەلێ خراپی، لە زمانەکەمان کردووە. هەر نووسەرێ، بە ئارەزووی خۆی دەنووسێ، نووسینەکان لە هیچ ڕوویەکەوە، لە یەکدی ناچن. لە سەر هیچ جۆرە دەستوورێکی زمان نارۆن. ئەمەش بەوە پاساودەدەن و دەڵێن: لەبەرئەوەی زمانێکی ستاندارمان نییە. بۆیە، ئەو دەستووری نووسینە پێڕەودەکەن، کە خۆیان باوەڕیان پێی هەیە. جارێ ئەمە وایە، لەوەش دەچێ، تا ئاسۆیەکی دووریش نەتوانین، یا ئەو توانا و دەسەڵاتەمان نەبێ، خۆمان لە دەس ئەو گرفتە گەورەیە ڕزگارکەین و ئەو زمانە یەکگرتووە پێکبێنین.
لەوانەیە، هێندێ نووسەر و شارەزای زمانی کوردیی، وا بیرکەنەوە، چونکە، ئەو کوردانەی بە بەشەدیالێکتی کورمانجیی ژووروو دەپەیڤن و دەنووسن، زۆربەی کورد پێکدێنن، لەبەرئەوە دەبێ، ئەو شێوە زمانە وەرگرین و وەک زمانی ستاندارد بیچەسپێنین. بەڵام، مەرج نییە، ئەم بۆچوونە بنچینەیەکی زانستانەی هەبێ. چونکە، زمانی ستاندار، بەپێی کەم و زۆریی ئەو بەشەی نەتەوە قسەی پێ دەکا، بڕیار نادرێ. بەڵکوو، هێندێ فاکتەری دیاریکراوی وەک: باری « نەتەوەیی، ڕامیاریی و ئابووریی »، ئەو جۆرە کێشانە چارەسەردەکەن. جگە لەوەی، چەن نموونەیەکیشمان لە مێژوودا پێش چاودەکەوێ، بەتەواویی بە پێچەوانەی ئەم یاسا دیمۆکراسییەوەیە. زمانی کەمینەی نەتەوەیەک، لەبەر پاراویی، ڕەوانیی و دەوڵەمەندیی، خۆی بە سەر، زمانی زۆربەی ناوچەکانی دیکەی وولاتەکەدا سەپاندووە. بۆ نموونە: ئەو شێوە زمانە عەرەبییەی هۆزی « قورەیش »، لە نیوە دوورگەی عەرەبدا،

قسەیانپیدەکرد، بە هۆی قورئانەوە بوو بە زمانی یەکگرتووی وێژەیی هەموو عەرەب. چونکە، پێغەمبەرەکە لە خۆیان بوو، هەر بەو شێوە زمانەش دەپەیڤی و قورئانەکەشیان هەر بەو شێوە زمانە نووسییەوە. دیارە، گەر زەردەشتیش بمایە و ئایینەکەی بە هەموو کونوقوژبنێکی کوردستاندا بڵاوبووایەتەوە، ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، جێی پێ لەق نەکردایە، هەڵبەتە ئەویش، « ئاڤێستا »کەی خۆی، هەر بەو شێوە زمانە نەتەوەیی یە دەنووسییەوە، کە ئاخافتنی پێ دەکرد. ئەو کاتە، هەر ئەو شێوە زمانەی زەردەشت و ئاڤێستاش جێگیردەبوو، ئەورۆ وەک زمانێکی ستانداردی لێدەهات. لەو بارەیەشەوە، هیچ جۆرە گرفتێکمان نەدەبوو. بەڵام ئەوە بوو، زمانی عەرەبیی لە ڕێی قورئانەوە پێشکەوت، زمانی کوردییش، بە هۆی لەنێوچوونی ئاڤێستا و ئاینەکەیەوە، تووشی ئەم هەموو گرفتەی ئەورۆ بوو.
دەربارەی ڕێنووس و نووسین بە کوردیی، بە لقەدیالێکتی « سولەیمانیی یا موکریانیی »، ئەوەیان زیاتر بۆ نووسەرەکان دەگەڕێتەوە. واتە: هەر نووسەرێ بۆ خۆی ئازادە، کام شێوەی ڕێنووس و بەش یا لقەدیالێکت لە نووسیندا بەکاردێنێ. بەڵام، باشتروایە، یەک شێوەی یەکگرتوو، لە نووسینی کوردیدا پێڕەوکەین، تا سەرەتای زمانێکی یەکگرتووی نووسین و ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی دامەزرێنین. یا گەر، بە هەر دوو شێوە جیاوازەکەش نووسیمان، ئەوا پێویستە، هەر دوو شێوەکە لە نووسیندا تێکەڵاو نەکەین. بۆ نموونە: لە لقەدیالێکتی « سولەیمانیی »دا، پتر پێشگری « ئە » و پاشگری « تر » لە نووسیندا بەکاردێنرێ. بەڵام، لە لقەدیالێکتی « موکریانیی »دا، لە بری ئەوە، « دە » و « دی یا دیکە » بەکاردێنرێ. بۆ پێشگر، لە لقەدیالێکتی « سولەیمانیی »دا، وەک (ئەڕۆم، ئەخۆم، ئەکرم... تاد). لە « موکریانیی »دا دەبێ بە(دەڕۆم، دەخۆم، دەکرم ... تاد). هەروەها، بۆ پاشگریش لە یەکەمدا، وەک(یەکێکی تر، جارێکی تر، کاتێکی تر ... تاد). لە دووەمیشدا دەڵێن:(یەکێکی دی، جارێکی دی، کاتێکی دی یا کاتێکی دیکە ... تاد).
هەروەها، هێندێ ووشەی دیکەی وەک « تیا » و « پیا » « خۆی »... تاد هەن، لە لقەدیالێکتی سولەیمانیدا، هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە. بەڵام، لە

لقەدیالێکتی موکریدا، بە « تێدا » و « پێدا » و« خۆیدا » دەنووسرێ.
جگە لەوەی، لە بری « لە »ی سولەیمانیی، « دە » بەکاردێن. وەک لەگەڵ دەبێ بە دەگەڵ. دیارە، بەپێی ئەو دوو لقەدیالێکتە جیاوازەی زمانی کوردیی بێ، هەر دووکیان ڕاستن. بەڵام نابێ، لە یەک نووسیندا، جارێ شێوەی سولەیمانیی و جارێکی دیکەش شێوەی موکریانیی بەکاربێنین.
لێرەدا، چەن ڕستەیەک بە نموونە دێنینەوە :
لقەدیالێکتی سولەیمانیی :
1. لەم ڕۆژە ڕەشەی نەتەوەکەمانی « پیا » تێپەڕئەبێ.
2. بەغا نزیکەی یەک میلیۆن کوردی تیایە.
3. لە جێی خۆیا نەبوو.
لقەدیالێکتی موکریانیی :
1. لەم ڕۆژە ڕەشەی نەتەوەکەمانی « پێدا » تێپەڕدەبێ.
2. بەغدا نزیکەی یەک میلیۆن کوردی تێدایە.
3. لە جێی خۆیدا نەبوو.
جا، ئەز پێموایە، باشتر و جوانتر وایە، هیچ نووسەرێ لە نووسینەکانیدا، ئەو دوو لقەدیالێکتە تێکەڵاو نەکا. جارێ بە « ئە » و جارێ بە « دە » دەسپێبکا، یا جارێ بە « تر » و جارێکی دیکەش بە « دی » کۆتایی پێ بێنێ. بەڵام، بۆ ئەوەی زمانەکەمان ئاسانکەین، دەتوانین، بە شێوەیەکی دیکە، هەر دوو لقەدیالێکتە تێکەڵکەین، کام ووشە لە کام لقدا ئاسانبێ، ئەویان بەکاربێنین. یا کام ووشە، لە کام لقدا، بە ئاسانیی کوردتدەکرێتەوە، ئەویان بنووسین.
لە هەمـوو زمـانێکدا، هێندێ ووشـەی لێکدراو هەن، لە دوو ووشـە یا پتـر پێکهـاتوون. بۆ ئەوەی لە سەر زمـان ئاسانبن، یەکێ لەو پیتـانە، یا پتر لە پیتێ، لە پیتـەکانی یەکێ لە ووشەکان دەقرتێنرێ. ئیدی، نە لە ئاخافتن و نە لە نووسـیندا بەکـاردێنرێن. دیارە، زمـانی کـوردییش، وەک هەمـوو زمانەکانی دیکەی گەلانی جیهـان، بۆ ووشە داتاشین و لێکدانی ووشەکان، خەسڵـەتی تایبەتیی خۆی هەیە و لەم دەرکەوتەیە بەدەر نییە. وا لێرەدا، لەو بارەیەوە هێندێ نموونە دێنینەوە. (کاک برا ـ کابرا. گا ئاسن ـ گاسن. باوک

پیر ـ باپیر. جوان مێرد ـ جوامێر. ڕەوەند دز ـ ڕەواندز. نەمرد ـ نەمر. کاک نەبی ـ کانەبی. خودا ـ خوا. مەبەست ـ مەبەس. بار ئاش ـ باراش. مام وەستا ـ مامۆستا. بان گردێن ـ باگردێن. مرۆڤ ـ مرۆ. خاوەند ـ خاوەن. بەستەزمان ـ بەسەزمان)«89،63»

هەروەها، « تۆفیق وەهبی »یش، چەن ووشەیەکی لەو بارەیەوە بۆ هێناوینەتەوە. وەک(بار - ئاش ـ باراش. دەڕۆم - ئەماڵەوە ـ دەڕۆمە ماڵەوە. بی - ئابان ـ بیابان. بەرد - ئە - پێ ـ بەردەپێ. کانی - ئاسکان ـ کانیسکان.)«16،17»

شتێکی ئاشکرایە، کوردستان لە نێوان پێنج دەوڵەت و بە سەر چەن نەتەوەیەکدا دابەشکراوە، تا ئەوڕۆش هەر بە داگیرکراوی ماوەتەوە. زمانێکی یەکگرتووی ئاخافتن و نووسینمان نییە. کورد لە هەر بەشێکی نیشتمانەکەیدا ناچارکراوە، زمانی ئەو گەلە سەردەستانە فێربێ، پێیان بخوێنێ و پێشیان بنووسێ. لەبەرئەوە، شتێکی زۆر ئاسایی یە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە هەر دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستاندا، خۆیان لە ژێر کارتێکردنی زمان و وێژەی، ئەو گەلە سەردەسانەدا ببیننەوە.

لە باکووری کوردستان، کورد لە ژێر کارتێکردنی « ئەلفوبێ، زمان، هونەر، وێژە » و هەموو شتێکی دیکەی تورکەکان دان. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بە هەمان شێوە، لە ژێر کارتێکردنی نەتەوەی فارس دان. لە باشوور و خۆراوا، لە ژێر کارتێکردنی کەلتووری عەرەب دان. بۆیە، گەلێ لە نووسەرانی کورد دەبینێن، کوردانە بیر ناکەنەوە، بەرهەمەکانیان کوردانە دانەڕێژراوە. بەڵکوو، لە ژێر کارتێکردنی یەکێ لەو زمانانەدا، بیری لێ کراوەتەوە و دارێژراوە. (دیارە، ئەدەبی خۆمان ئەوەندەی خزمەت نەکراوە و پەرەی نەگرتوە، کە هەستی فێربوونی ڕووناکبیر و خوێندەوارانی کوردی عێراق ڕازی بکا. ناچارن لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە فێربن و زانستیان بەرەو ژوور بەرن، بیانەوێ یا نەیانەوێ، دەکەونە ژێر تەئسیری زمانی عەرەبییەوە. بۆیە، کاتێک دەنووسن، ڕستەکان وەک عەرەبیی دادەڕێژن. یا باشتر بڵێم: بە عەرەبیی بیردەکەنەوە و بە کوردیی دەنووسن. ڕستەی وا دەبینم، هەموو ووشەکانی کوردیی ڕەسەنن، کەچی تێی ناگەم. چونکە، لە

سەر ڕێزمانی عەرەبیی دارێژراوە. ئەویش، زۆر لە ڕێزمانی کوردیی دوورە.)
«29،122»
نووسەری کوردی وا هەن، گەر لە ڕووی ڕێنووس و دارشتنەوە، بەرهەمەکانیان هەڵسەنگێنین، ئەوا دەبێ، سەرلەنوێ هەموویان دارێژینەوە. بە شێوەیەکی ویژەیی ڕێکوپێک، لە سەر بنچینەیەکی زانستانەی دەستووری زمان بیاننوسینەوە. زۆربەی نووسەرەکانی باشووری کوردستان، چونکە، لە بندەسی دەوڵەتی داگیرکەری عێراقدا پەروەردەبوون، هەر بە عەرەبیی خوێندوویانە، بە شێوازی عەرەبیی دەنووسن، دارشتنەکانیان بە ئاشکرا، شەقڵی عەرەبیی پێوە دیارە. لە ڕێنووس، دارشتن و دەستووری زماندا، گەلێ لاوازن، بە شێوەیەک، کارێکی زۆری لە ناوەڕۆکی بەرهەمەکانیشیان کردووە. لێرەدا دەتوانین، چەن نموونەیەک، لە سەر نووسینی هێندێ لەو نووسەرانە بێنینەوە :
« عەبدوڵڵا ئاگرین » دەنووسێ:(... پێشێلی ڕەنجی سەرکەوتوانەی ئەو هەموو تاقیکردنەوەیەی میللەتان لە تێکڕای بوارەکانی زانست و ئەدەب و ڕۆشنبیریدا ناکرێت.)«7،94» ڕاستروایە، بە کوردیی بنووسین:(ڕەنجی سەرکەوتووانەی، ئەو هەموو تاقیکردنەوەیەی میللەتان، لە تێکڕای بوارەکانی زانست و ئەدەب و ڕۆشنبیریدا، پێشێل ناکرێ).
« سۆران مەحویی » لە نووسیندا، زۆر درێژە بە نووسینەکانی دەدا، ووشە لەیەکچووە کوردیی و عەرەبییەکان دووبارەدەکاتەوە، وا دەزانێ، بەو شێوەیە، نووسینەکەی بە پێزدەبێ، یا دەتوانێ، خوێنەر باشتر تێگەیەنێ. لێرەدا چەن نموونەیەک دێنینەوە، بێ ئەوەی دەسکاریی ڕێنووسەکەی بکەین:
(شارەزا بوون و ئاشنا کردنی ڕۆشنبیرانی نەتەوەی کورد بە میرات و کەلەپووری ئەدەبی تورکی و لەو ڕوانگەیەشەوە سوود وەرگرتن لەو کەلەپوورە و مووتووربەکردنی لە ویژە و ئەدەبی کوردی دا و هەروەهاش بەستنەوەی جەمسەری زۆری زانست و زانیاری یەکانی ئەو نەتەوەیە بە نەتەوەکانی ژێر دەستەی خۆیانەوە، کە ئەوانیش بە حوکمی نزیکییان، لە وولاتانی ئەورووپایانەوە وەرگرت بو.)«201،94» لەم کۆپلەیەدا،(میرات و کەلەپوور، ویژە و ئەدەب) دووبارەبوونەتەوە.

هەروەها دەڵێ: (خستنەوەی دووبەرەکی و بەربەرەکانییەکی نارەوایانە، بە ناوی ئاین و دینەوە لە نێوان و میانەی شێخانی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی دا و لە پاڵ و پەنای ئەوانەش دا گەیشتنی عوسمانی یەکان بە مەرام و ئەو ئاواتانەی گەرەکیان بوو.)«94، 201»
جگە لەوەی رێنووس و دارشتنەکەی گەلێ لاوازە، هەموو جووتە ووشەکانی (ئاین و دین، نێوان و میانە، پاڵ و پەنا، مەرام و ئاوات) تەنیا جوونەوە و دووبارەکردنەوەی ووشە عەرەبییەکان نەبن، هیچی دیکە نین. ئەمەش، بە پێچەوانەوە، لە لایەکەوە خوێنەر وەرسدەکا. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم دارشتنەکە لاواز و بێپێزدەکا، هەم نووسینەکەش بە خۆرایی درێژدەکاتەوە.
(لەسەر ئەساس و بناغەی مەنتیق دامەزراون و ئەمەش پرن لە ووشە و دەستەوازی قورس و گران)«94، 217-218» ئەساس و بناغە، قورس و زل، ووشە و دەستەواز.
هەروەها دەڵێ: (فەرموو، کێ ی تریش هەیە لە نووسەران شتێکی باش و چاکتریان زیاتر لەم تێ بینیانەی من شک و گومان دەبات با بیخاتە روو، ...)«94، 222» باش و چاک، شک و گومان. (شاعیر بەوە قایل و ناوەستێتەوە و زیاتر پێ لەسەر رازی دڵ و ئاوات و هیوا و مەبەستەکانی رادەگرێت و هەردەم تیژ و سوورە لەسەر رایەکانی ...)«94، 226» رازی دڵ، ئاوات، هیوا و مەبەست. تیژ و سوور. (لە هەمان کاتیش دا خۆ لاخستن و کەنارگرتنی مرۆڤە لە گشت خراپەکاری یە گیانی و رۆحی یەکان ...)«94، 233» گیانی و رۆحی. (سەرجەم ئەو شتانەیان لا کارێکی ئاسایی و بە سادەوساکاری دێتەبەرچاویان.)«94، 235» ئاسایی، سادە و ساکار. (لەم کاتەدا و لە هەر دوو بارەکەدا، لە کار و ئیشی خۆیان قایل و رازی نین و « نوکرانی زات » یان « نەفس شکاندنی » خۆیان و « خۆ بە هیچ گرتن » لە ئاستی هەموو شتەکاندا، وێردی سەر زمان و قسەیی ناو دڵ و هەست و سۆز و ئەندێشە و خەیاڵیانە.)«94، 236» کار و ئیش، قایل و رازی، ئەندێشە و خەیاڵ. (پاشان ئەو شتە پچووکانە هێدی هێدی و وردە وردە زل و گەورە دەبن ...)«94، 237» هێدی هێدی، وردە وردە، زل و گەورە. (پاشان مەحوی زیندوو خۆی بە کۆمەڵەوە و چوون

یەک هەموو لایەک تیژ و هاندەدات لەسەر ئەوەی لە دنیایی بێ بەها و بێ ڕەواج و بێ نرخ یاخی بن ..)«241،94» تیژ و هان، تیژدەکا و هاندەدا. بێ بەها، بێ ڕەواج و بێ نرخ.(ئەوەمان لە لا ساخ و یەکالا دەبنەوە،)«245،94» ساخ و یەکالا. (گومان کردن و شک چوون)«246،94» (ئێش و ئازار)«249،94» (پێشەنگی کاروان و قافڵە) «250،94» (چەوتی و هەڵەکانم بۆ ڕاست بکەنەوە).(گەورە و مەزن، ژان و ژێ و ئازار)«252،94» ئایین و دین، گیان و ڕۆح، لە گەلێ جێگەدا دووبارە دەکاتەوە، وەک لە لاپەڕەکانی(202, 224, 233,228, 238) دەیبینین.

« هێمن »ی هۆنەر، لە ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە، نامەیەک بۆ « کەریمی حسامی » لە « سوید » دەنێرێ. لە نامەکەد دەربارەی نووسەرانی کورد، دەڵێ:(نووسەر دەبێ، لە نێو خەڵکدا بێ و لە خەڵک فێربێ و ئەوەی فێری بووە، بە وردی و جوانی بیداتەوە بە خەڵک... تاد)«94،86» هەروەها، لە هەمان نامەدا، دەربارەی نووسین و زمان دەڵێ.(کاکە ئێمە لە ئەدەبی دەوڵەمەندی زمانی فارسی کە خزمی هەرە نیزیکی زمانەکەمانە کەڵک وەردەگرین. وەک نووسەرەکانی ئەو دیو نین* بە عەرەبی بیربکەینەوە و بە کوردی بنووسین و ئەویش بە کوردی داتاشراو. ئەگەر بە فارسیش بیر بکەینەوە دیسان زۆر لە زمانەکەی خۆمان دوور ناکەوینەوە. چونکە، ڕێزمانەکەمان هێندە لە ڕێزمانی فارسیی دوور نییە. هەتا پێمان بکرێ، خۆ لە وشەی داتاشراو دەپارێزین. خۆ ئێمە لە خەڵکی دیکە زیاتر نین. بە داخەوە فەرهەنگێکی ئەوتۆی کوردیمان لە دەس دا نیە کە منداڵێکی کورد ڕازیکا.)«96،86 » هەر « هێمن » خۆی، لە « پاشەڕۆک »دا دەڵێ: کوردی لای ئێمە کوردی نازانن. زۆر ڕاستە، زۆربەی زۆری نووسەرانی کورد، لە باشووری کوردستاندا، لە ژێر کاریگەرێتی « زمان، فەرهەنگ، ڕێزمان و ڕێنووسی عەرەبیی » دان. بەلام، بە داخەوە کوردی ڕۆژهەلات، تا ئێستەش، هەر بە فارسیی بیردەکەنەوە، وەک فارس دەنووسن.

---

* مەبەسی نووسەرەکانی خوارووی کوردستانە.

با لێرەدا، سەرنجێ لە ڕێنووس و داڕشتنی، نووسەر و هۆنەرەکانی ئەوڕۆی ڕۆژهەلاتی کوردستان بدەین، تا بزانین، زمانی کوردیی، لە چ ئاستێکدا خۆی دەبینێ.
بە شێوەیەکی گشتیی، نووسینەکانیان لە ڕووی « ڕێنووس، داڕشتن و دەستووری زمانی کوردیی »ەوە، گەلێ لاوازن. بە ڕاستیی، لە هێندێ جێگەی نووسینەکانیاندا، دەردی « هێمن » دەلێ: خوێنەر لێیان تێ ناگا!
بۆ نموونە: « سدیق بۆرەکەیی » دەنووسێ: (دیارە لە وەها بارێکی ئالۆزدا هۆنراوەکان و شوێنەوارەکانی مەستوورە دەستاودەست کەوتووەو لە ناوچووە)«5،48» جارێ، پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە بزانین، « وەها » دەربڕینێکی فارسییە. لە کوردییدا « وا » دەنووسرێ. جگە لەوەی، وەها یا وا پێش ووشەی « بارێکی »ناکەوێ. چونکە، وا ئاوەڵناوە و شێوەی بارەکە پیشاندەدا، کە زۆر سەختە. لەبەرئەوە، ئاوەڵناو لە پێش باسکراوەوە نایەت. بۆیە، ڕاستە وایە، بنووسرێ: « لە بارێکی وا ئالۆزدا » هەروەها، لە جێگەیەکی دیکەشدا دەنووسێ: (بە زمانی زکماکی خۆیان نووسراویان بۆمان بەجێ هشتوون ...)«6،48 » بۆیان بەجێهێشتووین. یا دەنووسێ: (تەنانەت گەلانی بێگانەش سوودیان لێ یان وەرگرتووە و شانازیشیان پێ یان کردووە)«7،48» ڕاستەکەی ئەمەیە: (..... سوودیان لێ وەرگرتوون و شانازیشیان پێوە کردوون.)هەروەها دەنووسێ: (ئەوە بوو ئەردەلانی یەکان لە هێرشێک دا چەند کەسێکیان لێیان کوشت ...)«83،48 » ڕاستروایە، بەم شێوەیە بنووسرێ:چەند کەسێکیان لێ کوشتن.
د. « حوسێنی خەلیقی » لە « بناخە گشتی یەکانی کۆمەڵناسی »دا دەڵێ: (هۆشیاری نەتەوایەتی ئاوات و هیوای گۆڕینی کۆمەڵ بەرەو باشتر و گەیشتن بە دواڕۆژێکی لەبارتر، هەستکردن بە هۆیەکانی دواکەوتن و ملکەچی، نیشانەکردنی کێشەکانی نەتەوەیی، دۆزینەوەی چارە بۆ دەردەکان، تێکۆشان بۆ ڕامالینی تەگەرەی پێشکەوتن. بیری نەتەوایەتی، تێگەیشتن لە نزمبوونەوە و باری ڕاستەقینەی دۆخی نەتەوەیی. لێکدانی هەست و سۆزی نەتەوایەتی و چەسپاندن و پاراستنی قەوارەی نەتەوەیی و تێکۆشان بۆ ڕزگاری و دوا ڕۆژی گەل، نەتەوەی زیندوو دەبێ خاوەن پەیام

بێ. سەرنجی ڕێک و پێککردنی دواڕۆژ بدا.)«251،31» کاتێ، دەقێکی وا دەخوێنینەوە، یەکسەر تێدەگەین، تەنیا ووشەکانی کوردییە، ئەگینا، لە ڕووی دارشتن و واتاوە، بە هیچ شێوەیە، لە کوردیی ناچێ. بەڵکوو، پتر لە وەرگێڕان دەچێ. ئەم چەن ڕستەیەی دوکتۆر نووسیوێتی، هەر لە سەرەتاوە تا « نەتەوەی زیندوو ... » هەموو ئەو کردارانەی تێیدایەتی، بە شێوەی چاوگ هاتوون و گەردان نەکراون. واتە:کاتی کردارەکان دیاری نەکراون. هیچ ڕستەیەکی کوردییش، بێ کردار نابێ، چونکە، واتا ناگەیەنێ! پاشان لە « نەتەوەی زیندوو دەبێ ... » تا کۆتایی دەقەکە، هیچ پێوەندییەکی بەو چەن ڕستەیەی پێشووەوە نییە! ئەمە، چەن نموونەیەک بوو، تا بزانین، کوردەکانی ڕۆژهەڵات چۆن دەنووسن.

بۆیە، پێویستە، چ کوردی ڕۆژهەڵات و چ کوردی باشوور، بە کوردیی بیربکەنەوە، بە کوردیی بنووسن و هەر بۆ کوردیش بنووسن! نووسینی کوردیی، تا بە ووشەی « ساکار، ڕەوان، ناسک و گونجاو » برازێنرێتەوە، نووسینەکە جوانتر و دڵگیرتردەکا. بۆیە دەبێ، بە کوردیی بیری لێ بکرێتەوە، بە کوردیی دارێژرێ، بۆ کوردیش بنووسرێ، تا خوێنەری کورد لێی تێبگا و چێژی لێ وەرگرێ. تا کوردییەکەی ڕەوان و بێ گرێوگۆڵبێ، تا ڕستەکانی کورت و پڕ واتابێ، تا ڕاڤەی دڵفڕێن و ژیکەڵە بەکارهێنرابێ، هێندەی دیکە، جێگەی خۆی، لە دڵ و دەروونی خوێنەردا دەکاتەوە.

وەک « هێمن »یش دەڵێ:(نووسەری کورد دەبێ، خۆی لە دەمارگیریی ناوچەگەرێتی بپارێزێ، کەڵک لە هەموو شێوەکانی زمانی کوردیی وەرگرێ. کام ووشە ڕەسەن و سووک و ئاسان و ڕەوانبێ، لە نووسینەکانیدا، ئەو ووشەیە پتر بەکاربێنێ، کام خوازە لە نێو خەڵکیدا باوە و لە سەر زمان ئاسوچێژی زیاترە، ئەو خوازەیە بخوازێ و بنووسێ. خۆی لە ووشەی ناشراو و نارەسەن و دزێو بپارێزێ، شارەزاییەکی تەواویی لە ڕێزمانی زمانی کوردییدا هەبێ و لە ژێر کارتێکردنی زمانەکانی عەرەبیی، تورکیی و فارسیدا، کەولی خۆی و پێنووسەکەی قووتار بکا.)«100،122»

زمانی یەکگرتووی کوردیی، بەوە دروس نابێ، گەر ووشەیەک، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداچەسپابێ، ئێمە هەمان ووشە لە

دیالێکتێکی دیکەوە وەرگرین و لە نووسینەکانماندا تێهەڵکێشکەین. وەک هێندێ نووسەر لە بری « نزیک ـ نێزدیک. خراپتر ـ خراتر. جنێو ـ جوێن ـ جمێن ـ جون. » دەنووسن. بەڵکوو دەبێ، لە دیالێکتەکانی دیکەدا، بە دوای ئەو ووشە کوردییە پەتییە پوختە ڕەسەنانەدا بگەڕێین، کە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا نین، پاشان بەکاریانبێنین، بڵاویانکەینەوە، بیانچەسپێنین و کەڵکیان لێ وەرگرین. تا لە لایەکەوە، زمانەکەمان بە ووشەی کوردیی ڕەسەن دەوڵەمەندکەین. لە لایەکی دیکەشەوە، زمانێکی تێکەڵاوی چێشتی مجێور ئاسا دروس نەکەین و سەر لە خەڵکی تێک نەدەین.

ئەوەی پێوەندیی بە نووسین و دارشتنەوە هەیە و زۆر گرنگە، ئەوەیە، لە نووسیندا پێویستە، یەکێتییەکی تونوتۆڵ لە نێوان سەرتاپای بابەتەکەدا هەبێ، وەک زنجیرێ لە کۆمەڵێ ئەڵقەی هاوڕەنگ و قەبارە پێکهاتبێ. پچڕپچڕ نەبێ، هەموو بەشەکانی بە باشیی پێکەوە بەسرابن. داهێنان لە شێوازی نووسین و بۆچوونەکانیدا لە ئامێز گرێ. ڕیزکردن و ڕێکوپێککردنی بابەتەکانی، بە ڕوونی پێوە دیاربێ. کاتێ خوێنەر دەیخوێنێتەوە، چەشەیەکی وێژەیی تایبەتیی لێ وەرگرێ، هەست بە تام و چێژێکی دیاریکراو بکا، تەڕوپاراوبێ. ڕەقوتەق و ووشک نەبێ، خوێنەر بێزارکا. لە شێوە و ناوەڕۆکدا بە پێز بێ، چونکە، گەر شێوە دیوی دەرەوەی بەرهەمەکە بێ، ئەوا ناوەڕۆک، دیوی ناوەوەی بەرهەمە وێژەیی یەکە پیشاندەدا.

زمانی نووسینی کوردیی دەبێ، وەک ئەستێرەی ئاسمان بدرەوشێتەوە، وەک ئاوی کانیی بنارەکانی چیای « قەندیل » ڕوونبێ، وەک شەونمی سەر پەڕەی گوڵی بەرەبەیان تەڕبێ، وەک ئاوازی هۆنراوەکانی « گۆران »، ڕەسەن و خۆماڵیبێ، وەک هۆنراوەکانی « هێمن » تەڕوپاراوبێ، وەک هەنگوینی شەمەتلێنکە شیرینبێ، وەک شۆڕەژن چاومەستبێ، وەک کیژەکورد بە گوڕبێ، وەک بەفری کوێستان سپیبێ، وەک شیری بەری دایک خاوێنبێ، وەک کارمامز چاو جوانبێ، وەک بولبول خۆشئاوازبێ، وەک ئەڵماس تیژبێ، وەک شووشە سفتوسۆڵبێ، وەک کریستاڵ زرنگەیبێ، وەک

ئاوێنە تێشکباتەوە، وەک دارگوێز قایمبێ، وەک داربەڕوو ڕەگی قووڵ داچووبێ، وەک چنار باڵای بەرزبێ، وەک سەروو قەدی ڕێکبێ، وەک خونچەگوڵ بگەشێتەوە، وەک گوڵەهێرۆ جوانبێ، وەک چیمەن سەوزبێ، وەک کێڵگەی سەوز بە بەربێ، وەک ڕەز هێشووی گوێ بگرێ ...

## 5/ دەستووری نووسین :

دیارە، هەموو زمانێ، خەسڵەتی تایبەتیی و دەستوورێکی نووسینی دیاریکراوی خۆی هەیە. هەموو زمانێ، بە جۆرە ئەلفوبێیەکی دیاریکراو دەنووسرێ، جۆرە ڕێنووسێکی تایبەتیی بەکاردێنێ. لەبەرئەوە، زۆربەی زۆری، ڕۆڵەکانی نەتەوە و نووسەران، لە نووسیندا پێڕەویدەکەن. ئەمەش، خۆی لە خۆیدا، یەکێتی نووسین و پێشکەوتنی زمانی نووسینی، ئەو نەتەوەیە پیشاندەدا. بە پێچەوانەشەوە، گەر نەتەوەیەک، دەستوورێکی نووسینی تایبەتیی نەبوو، ئەوا هەر نووسەرێ، لە نووسینەکانی خۆیدا، بە شێوە ڕێنووسێکی دیاریکراو دەنووسێ، جۆرە پیتێکی جیاواز بەکاردێنێ، یاساکانی دەستووری نووسین ڕەچاو ناکا. ئەمەش لە نێوان ئەندامەکانی ئەو نەتەوەیەدا، جۆرە ناکۆکیی و ناتەباییەک دروسدەکا، بێ دەستووریی و بێ دیسیپلینیی، ئەو زمانە دەردەخا. سەرەنجامیش، ئاژاوەیەکی زمانەوانیی لە زمانی نەتەوەکەدا دروسدەکا.

گەر، بەراوردێ لە نێوان زمانی کوردیی و زمانەکانی دیکەی جیهاندا بکەین، بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ، زمانی کوردیی، لە ڕووی دەستووری نووسینەوە، تا چ ڕادەیەک دواکەوتووە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەر زمانێ خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە، هەر زمانێ دەستووری نووسینی تایبەتیی خۆی هەیە. بۆ نموونە: لە زمانە ئەوروپاییەکاندا، یەکەم پیتی یەکەم وشە، لە ڕستەدا و لە سەری دێڕ، هەمیشە بە پیتی گەورە دەنووسرێ. هەروەها، ناوی « مرۆڤ، وڵات، شار، گوند، و ... تاد »، لە هەر جێگەیەکی ڕستەکەدابێ، هەر دەبێ، بە پیتی گەورە بنووسرێ. بەڵام، لە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکاندا، ئەم خەسڵەتەمان نییە. جگە لەوەی لە زمانی کوردیدا، ڕاناوی لکاومان هەیە، لە زمانە ئەوروپاییەکاندا نییە. هەروا دەبینین، لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا، لە ڕێزمانەکەیاندا، جیاوازیی

لە نێوان نێر و مێدا هەیە. ڕاناوی تایبەتییان بۆ هەر دوو ڕەگەزەکە داناوە. بۆ نموونە: لە زمانی ئینگلیزییدا، ڕاناوی « He » بۆ نێر و « She » بۆ مێ، لە زمـانی ڕووسیـدا، ڕاناوی « OH ـ ئۆن » بۆ نێـر و « OHA ـ ئەنا » بۆ مێ، لە زمانی سویدیدا، ڕاناوی « Han » بۆ نێر و « Hon » بۆ مێ بەرکـاردێنرێن. کـەچی، جگە لە بەشەدیالێکتی کرمـانجی ژووروو و هەورامـانیی، ئەو جیاوازیی نێر و مێیە، لە دیالێکتەکانی دیکەی زمـانی کوردییـدا نییـە. دیارە، زمـانی کوردیی، باوەڕی بە جیـاوازیی نێوان ژن و پیـاو نییـە و زمـانێکی سۆسیـالیستییـە! لە ڕاستیشدا، ئەم جیاوازییە، یەکـەم جـار، لە زمـانی عـەرەبییـەوە داکـەوتووە. چونکە، بە ئاشکرا لە قورئاندا دەبینین، زمانی قسەکردنی نێر و مێ جیایە!

دوور نییە، تەنیا ئەم خەسڵەتە، دەستووری هەر دوو جۆرە گروپە زمـانەکە، لە یەکدی جیاکـاتەوە، ئەگینا، لە « وێرگول، خاڵ، ڕستەی کورت، ڕستەی درێژ، پەرەگرافی نوێ، نیشـانەی سەرسوڕمان، نیشانەی پرسیار ـ پرسەک و هەموو نیشانەکانی دیکەش »، وەک یەک پێڕەودەکرێن. کەچی، لە ڕووی زمـان و داڕشتنەوە، زۆربەی زمـانەکان، لەگەڵ یەکدیدا جیـاوازیان هەیە. بە تایبـەتیی، هەر دوو گـروپە زمـانە ڕۆژاوایی و ڕۆژهەڵاتییـەکە، هەر زۆر لە یەکـدی جیـاوازن. هەر چەندە، هەمـوو زمـانێ دەسـتووری تایبـەتیی خـۆی هەیە، بەڵام، تا ئەوڕۆ، زمـانی کـوردیی دەسـتوورێکی یەککرتووی نییـە. هەمـوو ئەو دەسـتوورانەی داشنراون، هەر یەکـەیان، لە دەسـتووری یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی دەدوێ، هیچیان دەستوورێکی گشـتیی نین. بۆ نموونە: (دەستـوورەکـەی مێـجەر « سـۆن » کە لەمـەو پێش باسـمـانکرد تەنیا لە شێوەی « سۆران » ئەدوێ، ئەو دەستوورانەی کە« تۆفیق وەهبی»، « مـەلا سەعـید ئەفەندی » و « نووری عـەلی ئـەمین » دایان ناون، تەنیـا شێوەی « سـولەیمانیی » ئەخەنـە پێش چاو. ئەو دەسـتوورەی کـە « دوکـتـۆر کـامەران » و «ڕشید کورد » و « بول بایندر » دایان ناون، بە تەنیا باسی شێوەی کرمانجیی باکوور ئەکەن.)«26،68 ـ 69»

یەکە سەرەکییـەکانی، هەمـوو زمـانێکی نووسین، لە « پیت، ووشە، ڕسـتـە، ئامرازەکـانی لێکدەر، پێوەندیی و بانگکردن، نیشـانەکانی خـاڵبـەندیی »

هەروەها، بەشەکانی ئاخافتن، لە « ناو، ڕاناو، ئاوەڵناو، کردار، ئاوەڵکار، ئامرازی لێکدەر، ئامرازی پێوەندیی و دەنگ) پێکهاتوون. لە باسەکانی پێشوودا، بە درێژیی باسی پیت و دەنگە کوردییەکانمان کرد. بۆیە، پێویست ناکا، جارێکی دیکە لێیان بدوێین. بەڵام، لێرەدا هێندێ لە بەشەکانی دیکە دەدوێین.

زمان، لە یەکە پچووکەکانەوە بۆ گەورەکان دەسپێدەکا. واتە: سەرەتا پیت، ووشە و پاشان ڕستە دێ. هەر چەندە، پیت بە یەکێ لە بنچینەکانی زمان دادەنرێ، بێ پیت نە ووشە و نە ڕستە دروس نابێ. بەڵام، لە زمانی کوردییدا، پیتێ بە تەنیا، مەگەر بە دەگمەن بێ، ئەگینا هیچ جۆرە واتایەک نابەخشێ. کەچی، لە زمانە ئەوروپایی یەکاندا وا نییە، هێندێ پیت، واتای تەواوی هەیە. بۆ نموونە: « Ö » لە زمانی سویدیدا، بە « دوورگە » دێ. لە زمانی کوردییدا، لە دوو پیت و بەرەو ژوور، ئینجا ووشە پێکدێ و واتا دەبەخشێ. وەک: (با، پێ، بێ، کا، لا، خڕ، تڕ، فڕ ...)

ووشە ئەوەیە، لە دوو پیت یا پتر پێکدێ. هەموو ووشەیەکی تەواویش دەبێ، واتایەکی دیاریکراوی هەبێ. بەپێی ژمارەی ئەو پیتانەی، لە درووسبوونی ووشەیەکدا بەشدارییدەکەن، ووشەی ساکار و ئاوێتەمان هەیە. ووشە بە یەکەیەکی سەرەکیی ڕستە دادەنرێ.

بەڵام، ڕستە بە بەردی بناغەی هەموو زمانێ دەژمێررێ. زۆربەی ووشە، لە زمانی کوردیدا یەک واتایان هەیە. بەڵام هێندێ ووشە هەن، دوو یا پتر لە دوو واتایان هەیە. لە هەموو زمانێکدا، چەن ووشەیەک هەن، تەنیا بە خاڵێ یا بە پیتێ، واتاکانیان بە تەواویی دەگۆڕێ وەک: (شیر ـ شێر. گوڵ ـ گول. گۆڵ ـ بۆڵ. گەرماو ـ گەناو. ماد ـ مار. هار ـ بار ...) هەروەها، لە زمانەکانی دیکەشدا، بە هەمان شێوەیە. بۆ نموونە لە زمانی عەرەبیدا: (رەحمەت ـ زەحمەت. نەعم ـ نەغم. ڕوعب ـ ڕوبع. جار ـ جاف. خاف ـ حار ....)لە زمانی سویدیدا :

(God-Gud ,Köra-Göra, Kaka-Kika, Kyla-kula ...)

لە ڕاستیدا، پیت و ووشە، هەر چەن زۆر یا کەم، ساکار یا ئاوێتەش بن، مرۆڤ ناتوانێ، بە هۆیانەوە لە یەکدی بگەن. چونکە، مەبەستێکی وا

گرنگ و ڕوون، بە دەسەوە نادەن، تا بە تەواویی تێبگەین. بەڵام، ڕستە واتاکەی گەلێ فراوانترە. هەر بە هۆی ڕستەوە، کۆمەڵێ مرۆ لە یەکدی دەگەن، زمانی نووسین پێکدێ. کەواتە ڕستە چییە؟
گەر بمانەوێ، پێناسەیەکی کورتی، ڕستە بکەین، دەڵێین: ڕستە لە دوو ووشە یا پتر پێکهاتووە. ووشەکان بەپێی یاسای زمانەوانیی، لە ڕستەکەدا ڕیزدەکرێن. مەرجی سەرەکیی لە ڕستەدا ئەوەیە، بکەر و کرداری تێدابێ، لە رووی ڕێزمانەوە ڕێکبێ، واتایەکی دیاریکراویش ببەخشێ. ڕستە، بەپێی قەوارە دەگۆڕێ و چەن جۆرێکی هەیە، وەک :
1. ڕستەی ساکار:Simple sentence یەک کارا و کاری تێدایە. بۆ نموونە :
ڕستەی دوو ووشەیی ـ کامەران خەوت.
سێ ووشەیی ـ کامەران گۆشت دەکڕێ. بەرزان نانی خوارد.
چوار ووشەیی ـ کوردە لە بازار هاتەوە.
پێنج ووشەیی ـ کوردۆ بە دەسی خۆی کوشتی.
ئیدی بەو شێوەیە، فراوانتر و فراوانتر دەبێ ... وەک: لاوە سەرزلی لووتخواری چڵمن ...، کاژێری دوی پاش نیوەڕۆ، لە شاری سولەیمانی، لە باشوری کوردستان، سەردانی گۆڕەپانی کاوەی ئاسنگەری کرد.
2. ڕستەی لێکدراو: Compound sentence لە دوو ڕستەی ساکار پێکهاتووە، بە هۆی ئامرازی لێکدەرەوە پێکەوە دەبەسرێن. وەک :
کامەران هات و ڕۆی. کامەران هات و کاوە ڕۆی.
3. ڕستەی ئاوێتە :Complex sentence دوو ڕستە لە یەک دەدرێن، یەکێکیان سەرەکییە و ئەوی دیکەیان لاوەکییە. واتە: گەر جیایانکەینەوە، واتای تەواویی نابێ. وەک : کاتێ ڕۆژ هەڵدێ، دەچم بۆ ئیش. ڕستەی یەکەم ناتەواو و دووەمیش تەواوە. «100،310 ـ 311 »
زۆربەی ڕستە لە زمانی کوردیدا، بە کردار کۆتاییدێ. گەر ڕستەکە کورتبوو، ئەوا وێرگولی ناوێ و خاڵ دادەنێین، وەک : من ئاو دەخۆمەوە. کوردە نان دەخوا. بەڵام گەر ڕستەکە درێژبوو، ئەوا بەهۆی وێرگولەوە، دابەشدەکرێ. بۆ نموونە: لەساڵی گرانییەکەی 1920ەوە من و ئازادی برام

و تارای خۆشکم و دایکم و باوکم پێکەوە دەژین. ڕاستروایە، ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە بنووسین: لە ساڵی گرانییەکەی 1920ەوە، من، ئازادی برام، تارای خوشکم، دایکم و باوکم، پێکەوە دەژین. وێرگول لە ڕستەی درێژدا، لە دوای « ناو، کردار، شوێن، کات، مێژوو و ڕستەی کورت »ەوە دێ.

گوتمان: هەموو ڕستەیەک دەبێ، کرداری تێدابێ. بەڵام، هێندێ ڕستە لە زمانی کوردیدا هەیە، گەر بە وردیی سەرنجیان لێ نەدەین، وا دەردەکەوێ، کرداریان تێدا نییە. بۆ نموونە :

من ئازام. من چەوساوەم.

تۆ دووریت. تۆ مەردیت.

ئەو قۆزە. ئەو زیرەکە.

ئێمە سەرڕاستین. ئێمە نەخۆشین

ئێوە گەورەن. ئێوە سەروەرن.

ئەوان دواکەوتوون. ئەوان پێشکەوتون.

گەر سەرنجێکی سەرپێیی لەم ڕستانە بدەین، دەبینین: هیچیان کرداریان تێدا نییە. چونکە، « ئازا، چەوساوە، دوور، مەرد، قۆز، زیرەک، سەرڕاست، نەخۆش، گەورە، سەروەر، دواکەوتوو و پێشکەوتوو » هەر هەموویان ئاوەڵناون. هەروەها، « م ، یت ، ە ، ین ، ن ، » هەر هەموویان بە ڕاناوی لکاو دەژمێررێن.

شارەزایانی زمانی کوردیی، دوو جۆر بۆچوونیان هەیە. دەستەیەکیان، ڕاناوە لکاوەکان بە کردار دادەنێن. دەستەیەکی دیکەشیان پێیان وایە، ئەوانە کردار نین و لە کوردیدا ڕستەی بێ کرداریش هەیە.

« مەسعوود محەمەد » زۆر بە درێژیی لەم باسە دواوە، پێش لە سەر ئەوە دادەگرێ، کە لە زمانی کوردیدا، ڕستە هەیە، کرداری تێدا نییە. ئەو ڕاناوە لکاوانەی پێشتریش پیشانماندان، تەنیا بە ڕاناویان دادەنێ و دەڵێ : (ئینکارکردنی هەبوونی ڕستەی بێ فیعل لە کوردیدا ئەو خلیسکەمان پێ دەبا کە، کوردیی گوتەنی، تەوقی سەری ڕێزمانەکەمان بە ئەرز دەکەوێ، چونکە بەشێکی گرنگ لە بنج و بناخەی زمانەکە هەڵدەتەکێنێ.)« 94.107 »

بەڵام، ئەز پێم وایە، ئەو ڕاناوە لکاوانە، لە یەک کاتدا، دوو ئەرکیان هەیە.

جارێ وەک ڕاناو و جارێکی دیکەش، وەک کرداری یارمەتیدەر، لە ڕستەکەدا خۆیان دەنوێنن. واتە: ڕاناوە لکاوەکان کردار نین، بەڵکوو، وەک کردارێکی یاریدەدەر، جێگەی کردار دەگرنەوە، تا ڕستەکە واتا ببەخشێ.
گەر، بەراوردێ لە نێوان، زمانی « عەرەبیی و کوردیی »دا بکەین، جیاوازییەکی یەکجار گەورە دەبینین. بۆ نموونە: لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن:
انا اذهب الی المدرسه، هو یشتری القمیص فی السوق.
گەر ئەم دوو ڕستەیە، بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕین، دەڵێین :
من بۆ خوێندنگە دەچم، ئەو کراس لە بازاڕ دەکڕێ.
لێرەدا دەبینین: لە زمانی عەرەبیدا، هەمشیە بکەر لە سەرەتای ڕستە و کردار بە دوایدا دێ. پاشان، بەشەکانی دیکەی ڕستەکە تەواودەکرێ. کەچی، لە زمانی کوردیدا، بکەر لە سەرەتا و کردار لە کۆتایی ڕستەکاندا هاتووە، بەشەکانی دیکەی ڕستەکەش، لە نێوان بکەر و کرداردا، جێی خۆیان دەگرن. ئەمە، وەک دەستوورێکی هەر دوو زمانەکە وایە و تا ئەندازەیەکی زۆریش چەسپیوە. بەڵام، ڕستەی یەکەم: من بۆ خوێندنگە دەچم. زۆر لە سەر زبان خۆش نییە، لەبەرئەوە، گەلێ جار کورد ئەم دەستوورە دەشکێنێ، بەو شێوەیەی لە سەر زبان ئاسان و خۆشبێ، دەڵێ: من دەچم بۆ خوێندنگە. کە هەر دوو ڕستەکە یەک واتا دەگەیەنن و لە ڕووی گرامەریشەوە هەر ڕاستن.
لە هەموو زمانەکانی جیهاندا، کاتێ دوو ڕستەی ئاسایی کورتمان دەبێ، دەمانەوێ، ڕستەیەکی ئاوێتەیان لێ پێکبێنین، بە هۆی ئامرازەکانی «لێکدەر و پێوەندیی »یەوە، پێکیانەوە دەبەسین، یا « وێرگول » لە نێوانیاندا دادەنێین. با لێرەدا، نموونەیەک لە زمانی « سویدی »دا بێنینەوە:
گەر، سەیرێکی ئەم دوو ڕستەیە بکەین :
Sten har en syster. Hon heter Karin ستێن خوشکێکی هەیە. ئەو ناوی کارینە. دەبینین: « en syster » لەگەڵ « Hon »دا، تەنیا مەبەس لە یەک کەسە، ئەویش خوشکەکەی « Karin »ە. لێرەدا دەتوانین، ئەم دوو ڕستەیە، بە هۆی « وێرگول » و « ئامرازی لێکدەر »ەوە پێکەوە گرێدەین،

به مــەرجێ ئەو دوو « ناو » و « ڕاناو »ەش، دووباره نەبنەوە. بۆیە، هەر دوو ڕستە ئاساییە پچووکەکە، یەک ڕستەی ئاوێتە پێکدێنن. وەک :

Sten har en syster, som heter Karin « 115،126»

ستێن خوشکێکی هەیە، کە ناوی کارینە. لە کوردیدا دەتوانین، بۆ هێندێ ڕستە، ئەو ئامرازەی « کە »ش بەکار نەیەنین. چونکە، وێرگولەکە جێگەی دەگرێتەوە. تەنیا بنووسین : ستێن خوشکێکی هەیە، ناوی کارینە.

لێرەدا دەمەوێ، دەربارەی چەن ئامرازێ بدوێم، کە لە زمانی کوردیدا زۆر بەکاردێنرێن. پیتی « و »ی ئامرازی لێکدەر، یەکێ لەو پیتانەیە، کە زۆر بەکاردێ، بە شێوەیەک، نووسینەکە ناشیرین دەکا. بۆیە دەبێ، پێویست نەبێ، لە نێوان ووشە و ڕستە کورتەکاندا، زۆر بەکار نەهێنرێ، بەڵکوو لە بری ئەوە، وێرگول دابنرێ. بۆ نمونە: گەر چەن ووشەیەک پێویستی بە ئامرازی لێکدەر هەبوو، ئەوا لە بری پیتی « و » دەتوانین، لە نێوانیاندا وێرگول دانێین، بەڵام، لە نێوان پێش دواووشە و دواووشەدا دەبێ، « و » دانێین، وەک: (لە بوارەکانی نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، فەرهەنگیی، کۆمەڵایەتیی، سایکۆلۆژیی و سۆسیۆلۆژیدا). نەک لە نێوان هەر ووشەیەکدا « و » دانێین و بەم شێوەیە بنووسین: (لە بوارەکانی نەتەوەیی و ڕامیاریی و ئابووریی و فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتیی و سایکۆلۆژیی و سۆسیۆلۆژیدا).

هەروەها پێویستە، کاتێ لە نێوان دوو ووشەدا، یا دوو ڕستەی کورتدا، وێرگولمان دانا، ئیدی « و » دا نەنێین. بە پێچەوانەشەوە، کاتێ « و »مان بەکارهێنا، وێرگول دا نانێین، واتە: تەنیا یەکێکیان بەکاربێنین. بۆ نموونە: هێندێ نووسەر لە کاتی نووسیندا، بە تایبەتیی لە کۆندا و ئێستەش، ئەو نووسەرانەی لە سەر ڕێبازی ڕێنووسی کلاسیک دەڕۆن، وێرگولیش و « و »یش دادەنێن. وەک: زمانی کوردیی، و زمانی هیندیی، و زمانی فارسیی لە بنەڕەتدا، هەر یەک زمان بوون. پاشان جیابوونەتەوە، و هەریەکەیان زمانێکی سەربەخۆیان، پێکهێناوە. ڕاستروایە بەم شێوەیە بنووسین: زمانی کوردیی، زمانی هیندیی و زمانی فارسیی، لە بنەڕەتدا هەر یەک زمان بوون. پاشان، جیابوونەتەوە و هەر یەکەیان زمانێکی سەربەخۆیان پێکهێناوە.

با لێرەدا، شتێ بۆ دز بێژین. ئەز پێموایە، هەموو ئەو پێشنیاز و ڕێنوێنییانەی، لە لایەن پسپۆڕ و شارەزایانی زمان و وێژەی کوردییەوە دەکرێن، کارێکی گەلێ باشن. نووسەرەکانمان دەبێ، تاقیکردنەوە تایبەتییەکانی ژیانی نووسینی خۆیان، بۆ نەوەکانی داهاتوو تۆمارکەن. بەڵام، پێشنیاز و ڕێنوێنیکردن بە شتێک و جێبەجێکردنیشی بە شتێکی دیکە دادەنرێ. دەبێ، ئەو کەسەی پێشنیازی کارێ دەکا، خۆی لە پێش هەموانەوە بە کردەوە جێبەجێیکا. « هێمن » دەڵێ:(هەتا دەتوانین، «واوی عەتف » کەمتر بە دوای یەکدا ڕیزکەین)«31،122»

داوا لە نووسەرانی کورد دەکا، لە نووسینەکانیاندا « واو »ی ئامرازی لێکدەر زۆر بەکار نەیەنن. ئەز، ئەمە بە کارێکی باش دەزانم، لەو بارەیەوە، هیچ تێبینییەکم نییە. کەچی، هەر دوای دوو دێڕ لە نووسینەکەی خۆیدا، ئەو پێشنیاز و ئامۆژگارییەی بیردەچێتەوە، لە دێڕ و نیوێکدا، کە ژمارەی ووشەکانی لە شازدە ووشە پێکهاتوون، حەوت دانە جار ئامرازی «واو »ی لێکدەری، وەک ئەڵقەی زنجیرەی ڤاگۆنی شەمەندەفەر، بۆ پێکەوە بەستنی ووشە و ڕستەکانی بەکاردێنێ! با بزانین، چۆن ئەم کارەی کردووە. (کورتە چیرۆکی باش و وتاری بە کەڵک و چاکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و زانستی و مێژوویی و ڕەخنەی بێ غەرەز و دۆستانە بڵاوکاتەوە.)«31،122» ئەوە لە کاتێکدا دەبێ، ئەو دێڕ و نیوە، بەم شێوەیە بنووسین: (کورتە چیرۆکی باش، وتاری بە کەڵک و چاکی ئەدەبیی، کۆمەڵایەتیی، زانستیی، مێژوویی، ڕەخنەی بێ غەرەز و دۆستانە بڵاوکاتەوە.)کەواتە، بەپێی پێشنیازەکەی خۆی بێ، لەو دێڕ و نیوەدا دەبێ، تەنیا دوو جار « و »ی لێکدەر دووبارەببێتەوە.

بۆیە دەبێ، وەک هەموو زمانێکی پێشکەوتووی خاوەن دەستوور و ڕێزمانی گەلانی جیهان، لە بری ئەو هەموو« واو »ە لێکدەرانە، لە نێوان ووشەکان و ڕەستەکاندا، لە شوێنی پێویستی خۆیدا، وێرگول دانێین. گەر ووشە و ڕستەکانیش پتر لە دووان بوون، ئەوا لە نێوان پێش و دوا ووشەدا، بە هۆی « واو »ی لێکدەرەوە گرێیاندەدەین. واتە: سەرجەمی ووشە و ڕستەی دەقێکی وێژەیی دیاریکراو، بە هۆی وێرگول و پیتی « واو »ی لێکدەرەوە

پێکەوە دەبەسرێن. ئەوە تەنیا، نموونەیەکی نزیکی پێشنیاز و ڕێنماییەکانی مامۆستا بوو، ئەگینا، سەرانسەری دەقی نووسینەکەی بەو شێوەیە ڕازاندۆتەوە! بەڵام، ئێمە لێرەدا، بە پێویستی نازانین، لە نموونەیەک پتر پیشاندەین، هەر کەسێ دەیەوێ، لە ڕاستیی ڕەخنەکەمان دڵنیابێ، ئەوا دەتوانێ، تەماشایەکی سەرجەمی نووسینەکەی بکا!

یەکێ لە خاڵە گرنگەکانی، دەستووری نووسینی هەر زمانێکی دیاریکراو، نیشانەکانی « خاڵبەندیی »ە. هەڵبەتە، بۆ هەر « پیتێ، دەنگێ، ووشەیەک و ڕستەیەک »، جۆرە نیشانەیەکی تایبەتیی هەیە. هەر یەکەشیان بە شێوەیەکی تایبەتیی و لە جێگەیەکی دیاریکراودا، بەکاردێنرێن. نیشانەکانی خاڵبەندیی، گەلێ بایەخیان بۆ خوێنەر هەیە. (نیشانەی خاڵبەندیی، پێوانە و کێشانەی مانا و سەرنج و ڕابەریکردن و خواست و مەبەست و هەموو زاراوەکانی تری خاڵبەندیی بۆ خوێنەر لە نووسیندا دیاریدەکات. کە ئەمەیە دەقی ڕەوانبێژیی و دروستی خوێندنەوە لای خوێنەر، چونکە، دروستیی خوێندنەوە و ڕەوانبێژیی لای خوێنەر لە گوێرەی شێوازی ڕاستنووسینی نووسەرەوە دێتەکایەوە. کەواتە، خوێندنەوەی ڕەوان « ڕاستنووسین » بەرجەستەی دەکات.)«7،2» لێرەدا، نووسەری ئەم چەن دێڕە « ئەکرەم خامۆش »، باسی گرنگیی و بایەخی نیشانەکانی خاڵبەندیی دەکا، کەچی، خۆی زۆر پێڕەوی نەکردووە، لەو شوێنانەی پێویستە، وێرگول دانرێ، ئەو ئامرازی « و »ی لێکدەری داناوە!

بە داخەوە، زۆربەی زۆری نووسەرانی کورد، ئەم نیشانە گرنگانەی نووسینیان پشگوێخستووە. ئەمەش، لە لایەکەوە لە نووسیندا، بە هەڵەیەکی گەورە دادەنرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ جار واتای ڕستەکە وندەکا، خوێنەر بە ئاسانیی لە واتاکەی ناگا.

بۆ نموونە: گەر ووشەیەک یا ڕستەیەک، بە پرسیار دەسپێکردبێ، بەڵام، نیشانەی پرسیاری بە دوادا نەهاتبێ، ئەوا دەتوانرێ، بە جۆرێکی دیکە لەو ڕستە بگەین. تا مەبەسی ڕاستەقینە دەدۆزینەوە، خوێنەر ماندوودەکا. بەڵام، گەر ئەو نیشانەیە هەبوو، ئیدی خوێنەر یەکسەر، لە مەبەسەکە دەگا.

لێرەدا، هەوڵدەدەین، هێندێ لە نیشانەکانی خاڵبەندیی بدوێین، ئەوی

گرنگ و پێویستە، بۆ خوێنەری کوردی ڕووندەکەینەوە. بەڵام، تەنیا لەو نیشانانە دەدوێین، کە زۆر بە پێویستی دەزانم، لای خوێنەران و هێندێ لە نووسەران، تا ئێستە زۆر ڕوون نین. بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین، نیشانەکانی خاڵبەندیی، بەم چەن نیشانانە دیاریکەین: « وێرگول « ، »، وێرگولی خاڵدار « ؛ »، نیشانەی پرسیار « ؟ »، نیشانەی سەرسوڕمان «!»، خاڵ « . »، دووخاڵی لە سەر یەک « : »، کۆمەڵەخاڵ « ..... »، نیشانەی تەقەڵ « ـ »، دووکەوانە « ( ) »، کەوانەی دووجایی « » »، نیشانەی ئەستێرە « * » و ...) لێرەدا، لە چەن نیشانەیەکی گرنگیان دەدوێین :

وێرگول « ، » : ئەم نیشانەیە، بۆ دابەشکردنی ڕستەیەکی درێژ بەکاردێ. بۆ ئەوەی کاتێ، خوێنەر دەخوێنێتەوە، ماندوو و هەناسەسوار نەبێ، لە نێوان دێڕەکاندا، کەمێ بحەوێتەوە. یا گەر، چەن زاراوەیەکی دیاریکراومان هەبوو، یەک لە دوای یەک هاتن، ئەوا وێرگول لە نێوانیاندا دادەنرێ، لە نێوان پێش و دوا زاراوەشدا، ئامرازی « و »ی لێکدەر بەکاردێنرێ. بۆ نموونە: « کوردستان، لە بواری ئابووریی، پیشەسازیی، بازرگانیی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، ڕووناکبیریی، ڕامیاریی و دیپلۆماسیی »دا دواکەوتووە. هەروەها، باشتروایە، لە دوای هەر ڕستەیەکی کورت، کە بە کردار کۆتاییدێ، وێرگول دانرێ، وەک: کەژەکانی ساڵ، لە چوار وەرز پێکهاتووە. « هاوین، پاییز، زستان و بەهار ». هاوین گەرمە، پاییز گەڵاڕێزانە، زستان ساردە، بەڵام، بەهار جوان و ڕازاوەیە.

هەروەها، جۆرە وێرگولێکی دیکەش هەیە، پێی دەگوترێ « وێرگولی خاڵدار ـ ؛ » بە باوەڕی من، ئەم جۆرە زۆر پێویست نییە. چونکە، وێرگولی بێخاڵ دەتوانێ، لە زۆربەی کاتدا جێگەی بگرێتەوە.

پێویستە، جیاوازیی لە نێوان هەر دوو نیشانەی پرسیار و سەرسوڕماندا بکرێ. چونکە، هێندێ جار، مەبەسی نووسینەکە لەم بوارەدا تێکەڵاودەبێ. هەروەها، هێندێ جاری دیکەش، هەر دووکیان پێکەوە بەکاردێنرێن. ئەویش، کاتێ نووسەر هەم پرسیاردەکا، هەم سەریسوڕماوە، وەک « ؟!! » خاڵ، بە یەکێ لە نیشانە گرنگەکانی خاڵبەندیی دادەنرێ. ئەم نیشانەیە،

هەمیشە لە کۆتایی هەر دوو جۆرە ڕستە کورت و درێژەکەدا دادەنرێ. لە ڕستەی درێژدا، دوای ئەوەی ڕستەکە بە هۆی چەن وێرگولێکەوە دابەشدەکرێ، کاتێ مەبەسە سەرەکییەکە تەواودەبێ، ڕستەکە تەوابوو، خاڵ دادەنرێ. نیشانەی خاڵ، کۆتایی هەم بە ڕستە و هەم بە پەرەگرافیش دێنێ. پاشان، ڕستە و پەرەگرافێکی نوێ، دەسپێدەکا.
نیشانەی دووخاڵ، پتر لەم بوارانەی خوارەوەدا بەکاردێنرێ: « بەشەکانی ئاخافتن ـ گوتی : ... دەڵێ : ... » بۆ نموونە هێنانەوە ـ وەک : ... وەکوو : ... بۆ نموونە : .... بۆ وێنە : ... » بۆ بژاردن ـ خاڵی یەکەم : .... برگەی یەکەم : ... ئەمانەی خوارەوە : ... » بۆ واتای ووشە ـ چیا : شاخ » بۆ پێناسەکردن ـ کورد: ئەو نەتەوەیەیە، ئەوەتەی هەیە، لە پێناوی ژیاندا لاشە دەنێژێ. )نیشانەی تەقەڵ، پتر بۆ کاتی گفتۆگۆکردن و بۆ کاری ڕۆژنامەگەریی بەکاردێ. هەروەها، بۆ ئەوەی پێکهاتەی ووشەیەک پیشاندرێ، وەک کورد لە چوار پیت پێکهاتووە. « ک ـ و ـ ر ـ د ». یا لە کاتی باسێکی کورتی لاوەکیدا لە ڕستەدا، یا شتێ بیر خوێنەر بێنیتەوە، یا لە وەرگێڕاندا، وەرگێڕ لە نێوان دوو کەوانەدا شتێ دەنووسێ، پاشان تەقەڵەکە دادەنێ و ناوی خۆی دەنووسێ، یا نیشانەیەک دادەنێ، کە مەبەسی بێ.بۆ نموونە: کورد لە مێژوودا، هەمیشە هەر بەشخوراوبووە. هەرگیز خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبووە.«هێندێ میرنشینی دامەزراندووە ـ ئازاد »
کەوانەکانیش، چ دووکەوانە و چ کەوانەی دووجا، بەپێی دید و بۆچوونی نووسەرەکان بەکاردێنرێن. بەڵام، بە باوەڕی من، باشتروایە، هەموو جۆرە دووکەوانەکان، بۆ گوێزانەوەی دەقێکی دیاریکراو لە بەرهەمی نووسەرێکەوە بەکاربێنرێ. کەوانە پچووکەکان بە هەر دوو جۆرەکەیەوە، بۆ هەموو جۆرە ناوێ بەکاردێنرێ. نیشانەی ئەستێرەش، تەنیا بۆ پەراوێز دادەنرێ.
دوای ئەوەی، هێندێ خاڵی سەرەکییمان، دەربارەی دەستووری نووسین ڕوونکردەوە، ئێستە دەتوانین، هێندێ نموونە، لە سەر بەرهەمی نووسەرە کوردە ناودارەکان وەرگرین، تا بزانین، چۆن دەنووسن! پێویستە، بە شێوەیەکی زانایانە بنووسین، دەبێ، بزانین، چۆن دەنووسین؟ لە کوێوە دەسپێدەکەین؟ لە نێوان ڕستە کورتەکاندا، لە کوێدا وێرگول دادەنێین؟ کەی

ڕستەکە کۆتاییدێ و لە کوێدا خاڵ دادەنێن؟ لە کوێدا ڕستەیەک تەواودەبێ و ڕستەیەکی نوێ دەسپێدەکەین؟ کەی پەرەگرافێ تەواودەبێ و پەرەگرافێکی نوێ دەسپێدەکا؟ لە کوێدا نیشانەی پرسیار و سەرسوڕمان دادەنێین؟

هێندێ نووسەر هەن، ڕستەکانیان زۆر بە شێوەیەکی درێژ دادەڕێژن. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، وێرگول و خاڵ زۆر کەم دادەنێن، وەک ئەوەی دوژمنایەتییەکی دێرینیان، لەگەڵ ئەو دوو نیشانەیەدا هەبێ! بۆ نموونە: نووسەرێکی وەک « مەسعوود محەمەد »، بە دەگمەن وێرگول و خاڵ دادەنێ. ڕستەکانی زۆر درێژن، بەشێوەیەکن، خوێنەر تووشی هەناسەبڕکێ دەکەن. با بەو بۆنەوەیەوە، تەماشایەکی ئەم دەقەی مامۆستا بکەین:

(من هەوڵی ئەساسیم ئەوە بوو کە لە ڕێگەی گرووپە عەشیرەتێکی سەد هەزار کەسییەوە برادەریمان لەگەڵ بەغدا ببێتە هۆی نەپسانی پێوەندی لە نێوان بەغدا و کورددا چونکە نزیکە بڵێم کوێریش دەیدیت بەردەوام بوونی حاڵ و باری سیاسی - پاش تێکچوونی بەینی زەعیم و حیزب - لە کوردستاندا دەکێشێتەوە بۆ پێک کەوتنەوە و هەرا. لەم نوختەیە ئەوندە دڵنیابووم هەتا ئەوەی کە دیدەنیی زەعیم تەگەرەی تێکەوت، بە باقر دجێلیم گوت ئەگەر پێت دەکرێ خۆت ڕزگار بکە چونکە ئەم وڵاتە حەسانەوەی تێدا نەما. باقر بۆی ڕێککەوت بوو بە وەزیری بەلەدیات.) «391،109» گەر سەرنجێکی ئەم کۆپلەیەی مامۆستا بدەین، چەند شتێکی سەیر دەبینین:

1. بە ڕێنووسێکی تێکەڵاو نووسراوە، لە هێندێ شوێندا چاوگەکان پێکەوە نووسراون، وەک « تێکچوونی ». لە هێندێ شوێنی دیکەشدا، بەسەریەکەوە نەنووسراون، وەک « بەردەوام بوونی ». دیارە، چاوگ هەمیشە پێکەوە دەنووسرێن.

2. هەروەها، لە هێندێ جێدا، کردارەکان پێکەوە نووسراون. وەک «دڵنیابووم، تێکەوت، ڕێککەوت ». لە هێندێ شوێنی دیکەشدا، کردارەکان بە شێوەیەکی بڵاو نووسراون. وەک « پێک کەوتنەوە، پێت دەکرێ، ڕزگار بکە ».

3. هەڵەی ڕێنووسی تێدایە. وەک پێوەندی بە دوو « ی » دەنووسرێ.
4. ووشەی عەرەبیی تێدا بەکارهاتووە، لە کاتێکدا لە زمانی کوردیدا، ئەو ووشانەمان چەندین ساڵە هەیە. وەک « ئەساسی، عەشیرەت، حاڵ، سیاسی، بەین، زەعیم، حیزب، نوختە، بەلەدیات ». جگە لەوەی، « حاڵ و باری » بەکارهێناوە، دوو ووشەی عەرەبیی و کوردیین و یەک واتایان هەیە.
5. دەستووری زمان ڕەچاو نەکراوە. هیچ جۆرە نیشانەیەکی خاڵبەندیی دا نەنراوە.
6. لە نێوان حەوت دێڕ و نزیکەی هەشتاوچوار ووشەدا، یەک وێرگول و سێ خاڵی داناوە.
7. ڕستەکانی گەلێ درێژن. خوێنەر نازانێ، لە کوێدا کۆتایی بە ڕستەیەکی کورت دێ و یەکێکی دیکە دەسپێدەکا. لەبەرئەوە، هێندێ لە چاوگ و کردارەکان تێکەڵ بە یەکدی بوون، وەک یەک ئەرکیان هەبێ، وایە. لە هەمان کاتیشدا، داڕشتنی دەقەکەی لاواز و بێپێزکردووە، لە تێکستێکی کوردیی ناچێ، بەڵکوو دەڵێی کوردییە و بە عەرەبیی نووسراوە.
بۆیە وەک نموونەیەک، ئەز پێشنیازدەکەم، ئەم دەقە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بنووسرێ، بێ ئەوەی دەسکاریی ووشە عەرەبییەکان بکەم :
(من هەوڵی ئەساسیم ئەوە بوو، کە لە ڕێگەی گرووپە عەشیرەتێکی سەد هەزار کەسییەوە، برادەریان لەگەڵ بەغدا، ببێتە هۆی نەپسانی پێوەندیی لە نێوان بەغدا و کورددا، چونکە، نزیکە بڵێم: کوێریش دەیدیت، بەردەوامبوونی حاڵ و باری سیاسیی - پاش تێکچوونی بەینی زەعیم و حیزب - لە کوردستاندا، دەکێشێتەوە بۆ پێککەوتنەوە و هەرا. لەم نوختەیە ئەوندە دڵنیابووم، هەتا ئەوەی، کە دیدەنیی زەعیم تەگەرەی تێکەوت، بە باقر دەبێلیم گوت: ئەگەر پێت دەکرێ، خۆت ڕزگاربکە، چونکە، ئەم وڵاتە حەسانەوەی تێدا نەما. باقر بۆی ڕێککەوت، بوو بە وەزیری بەلەدیات.)
« کاکەی فەلاح »، لە نێوان سەدوشەست ووشە و چواردە دێڕدا، تەنیا سێ وێرگول و یەک خاڵی داناوە، لە بری وێرگول، سیوحەوت جار پیتی « و »ی نووسیوە. ئەمەش دەقی نووسینەکەیەتی، بێ ئەوەی دەسکاریی ڕێنووسەکەی بکەین یا هەڵەی ڕێنووسی بۆ ڕاسکەینەوە :

(ئەوەی دەمەوێ لە ئاوێنەی ئەم پێشەکییەدا دەری بخەم ئەوەیە کە تا ئێستا هیچ نەبێ لە دوو توێی کتێبێکدا، بە چەشنێکی ورد و هێمن و بابەتیانە، دەربارەی سەرەتای شیعری نوێی کوردیمان و بار و گۆڕین و چۆنێتی پێشکەوتن و هەڵگێڕ و داگێڕی ڕێگای داهێنان و ناوەڕۆک و شێوە و شێواز و هەوێن و وێنە و ڕواڵەتە هونەرییی و واتاییەکانی شیعری ئەم سەردەمەی کورد لە کوردستانی عێراقدا لە دوو چارەکە چەرخی ئەم دواییەی سەدەی بیستەم بەم لاوە، شتێکی ئەوتۆ ناکەوێتە بەرچاو کە مایەی دڵنیایی و متمانە و پشت پێ بەستن بێت و تا ڕادەیەکی نزیک لە ڕاستیی و درووستیی، ئەو قوتابخانە و ڕێباز و تەوژم و شەپۆلە شیعری یانە دەست نیشـان بکات و کەمێک ئەم تەم و مژ و هەور و هالاوی پاشاگەردانیی و بە هەڵەداچوون و دان پیانەنان و خۆ بردنەپێشەوە و بێ بایەخیی و خۆ نەناسین و ئەو ئاژاوەیەی لەدنیای شیعری کوردیی دا هەیە بڕەوێتەوە و هیچ نەبێ تۆزێک بەرپێی خۆمان ببینین و بە وردیی و بێ لایەنیی و بە ویژدانەوە لە بەرهەمی یەکتر بگەین و بچێژین و بکۆڵینەوە.)
«5،29»
هەروەها، لە نموونەی سێیەمدا، کۆپلەیەک لە نووسینێکی د. «کەمال مەزهەر» پیشاندەدەین، دەڵێ: (بەم جۆرە میدی یەکان گەلێک کەلکیان لەو شارستانی یە کۆنانە وەرگرت و هیچ گومانی تێدا نی یە کەوا لە دوای ئەوەی فارسەکان بەسەریانا زاڵ بوون و ئەمانە دایانە شاخەکانی زاگرۆس بۆ ڕزگار بوون لەدەست ژێردەستەیی کۆنە ژێردەستەکانی خۆیان، شارستانی یەتەکەیان لە وڵاتە کۆنەکەی خۆیان بۆ فارسەکان بەجێ هێشت، واتە بێ سێ و دوو دەتوانین بڵێین کاکڵەی شارستانی یەتە پێشکەوتووەکەی فارسەکان بریتی یە لەو شارستانی یەتەی باپیرە گەورەی کورد دایمەزراندو بەجێی هێشتن.)«11،92» لێرەدا دەبینین، کۆپلەکە لە شەستوپێنج ووشە پێکهاتووە، جگە لەوەی یەک وێرگولی بەکارهێناوە، بە هیچ شێوەیە، نیشانەکانی دیکەی خاڵبەندیشی پێڕەو نەکردووە!
بۆیە، نووسەرانی کورد پێویستە، شارەزاییەکی تەواویان، لە دەستووری زمانی کوردیدا هەبێ، بۆ ئەوەی نووسینەکانیان ڕێکوپێکتربێ، واتای

تەواو بە دەسەوەبدا، دەبێ، لە شوێنی خۆیدا، نیشانەکانی خاڵبەندیی دانێن. بۆ نموونە: « مەحویی » دەڵێ :

سەنەد بێ مۆر و خەط دەعوەیی مەحەبیەت کردنە « مەحوی »
تەعەششوق، بێ دڵێکی داغدار سینەیی ڕێشێ «239،94»

کاتێ « سۆران مەحویی » ، ئەم هۆنراوەیە لێکدەداتەوە، بە هیچ شێوەیە، پێڕەوی دەستووری نووسین ناکا. بە دەگمەن، وێرگول لە نێوان ووشە و ڕستەکاندا دادەنێ. کاتێ ڕستەیەک تەواودەبێ، خاڵ دانانێ. بێ ئەوەی پێویستکا، کۆتایی بە ڕستەیەکی درێژ دێنێ، پەرەگرافێکی نوێ دەسپێدەکا و بۆ سەری دێڕ دەگوێزێتەوە. بۆیە، بە باوەڕی من، هیچ پێویستی نەدەکرد، بەم شێوەیە بنووسێ:

(واتە ئەو کەسانەی ئیدعایی دڵداری یەکی ڕاست و خۆشەویستەکی شیرین و خواپەرستی یەکی بە هەق دەکەن. دەبێ هەمیشە ئەو ئیدعا کردنەیان کە ڕەنگ دانەوەی یاخی بوونێکی دەرون داغداریی و سینەیەکی برینداری پێوەیە. سەرەتا لە خۆیانەوە دەست پێ بکەن و دەربەستی هیچ ئێش و ئازار دان و بوون و نەبوونێک نەبن، چونکە ئیدعا کردنی شتێکی وەها گەورە و قورس ئەبێ هەردەم بەڵگە نامەیی ئەو داوا کردنەوەی پێ بێ.

دیارە ئەگەر کاریش وا دەرنەچوو، ئەوسا ئەو ئیدیعا و داواکردنەیان وەک سەنەدێکی بێ مۆر و خەت دەنوێنێ، کە هیچ نرخ و بایەخێکی نەبێت.)«239،94» هەروەها، لە لاپەڕە « 240 »یشدا، کاتێ هۆنراوەیەکی دیکەی « مەحویی » شیدەکاتەوە، هەمان شێوەی نووسینی پێڕەوکردووە.

مەحوی(یەکەمین شاعیرێکە توانی ڕەگەزی شیعری سۆفی گەرێتی پەتایبەتی شیعری سەر بەڕێبازی تەریقەتی نەقشبەندی بە دیالێکتی کرمانجی خواروو دابڕێژێ و لەو مەیدانەدا سوارچاکی و لێ هاتووی خۆی نیشان بدات و ئینجا زۆر شاعیرانی تر بۆ ئەو مەبەستە شوێن پێی ئەو هەڵبگرنەوە.)«244،94»

هەروەها، هێندێ نووسەر لە نووسین و هێندێ کەس لە ئاخافتنیشدا، هێندێ ووشەی عەرەبیی، بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێنن، عەرەب چۆنی دەڵێ،

ئەوانیش، هەر بەو شێوەیە دووبارەیدەکەنەوە. بێ ئەوەی، گوێ بە جیاوازیی نێوان ڕێزمانی هەر دوو زمانەکە بدەن. بۆ نموونە: (فەنانە، شاعیرە، ئەدیبە، کاتبە، صەحەفیە، دکتورە، طەبیبە، محامیە، موعیلمە، مودەریسە، ئوستازە و ... تاد) ئەمانە هەمووی ووشەی عەرەبین و بە پێی ڕێزمانی عەرەبیی بەم شێوەیە دەنووسرێن. بەڵام، جیاوازیی نێوان نێر و مێ، لە زمانی کوردیدا، لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووادا نییە. هەر چەندە، ئەو جیاوازیی یە، لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو و «هەورامانیی »دا بەدیدەکرێ. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا بایی ئەوەندە نییە، لە نووسیندا پێی لە سەر داگرین و لێی قوولبینەوە، تا ئەم ووشە عەرەبییانە، بە تەرازوویی ڕێزمانی کوردیی پێ بکێشین!
لەبەرئەوە، گەر هەر نووسەرێ دەیەوێ، ئەو ووشانە بە عەرەبیی بنووسێ، ئەوا پێویستە هەر بە شێوەی نێر بینووسێ، واتە (فەنان، شاعیر، ئەدیب، کاتب، صەحەفی، دوکتۆر، طەبیب، محامی، معەلیم، مودەریس، ئوستاز و ... تاد) ئەگینا، لە یەک زماندا، دوو ڕێزمانی جیاواز و ناکۆک پێڕەودەکرێ.
خۆ گەر کوردێ بیەوێ، ئەو ووشانە بە کوردیی بڵێ و بنووسێ، ئەوا بەرانبەرەکانیان، لە مێژە لە زمانی کوردیدا هەن، ئیدی بۆ دەبێ، خۆمان تووشی هەڵە و گرفتی زمانەوانیی بکەین، وەک: « هونەرمەند، هۆنەر، بوێژ، نووسەر، ڕۆژنامەوان، دوکتۆر، پزیشک، پارێزەر، مامۆستای سەرەتایی، مامۆستای ناوەندیی یا ئامادەیی، مامۆستای زانکۆ یا هەر مامۆستا بە گشتیی ... تاد ».

## 6/ ڕێنووس :

گەر سەرنجێکی سەرپێیی، لە ڕێنووسی کۆن بدەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ، زۆربەی زۆری نووسەرەکانی پێشوومان، بە کوردییەکی تێکەڵاو، بە ڕێنووسێکی نێوە « عەرەبیی - کوردیی » نووسیویانە.
بۆ نموونە: « ئەکەم و ئەڵێم » یان بە « اکەم یا اکم، الیم » نووسیوە. ئێستەش، پیاوە بە ساڵاچووەکانمان، هەر بەو شێوەیە دەنووسن. بەڵام، ڕێنووسی نوێی کوردیی ئەوڕۆ، لەگەڵ ڕێنووسی ئەو سەردەمانەدا،

جیاوازییەکی زۆری هەیە، ئەم جیاوازییەش بە ئاشکرا دەبینین. چۆن؟
لە کۆندا، لەبەرئەوەی هەر دوو زمانی « فارسیی و عەرەبیی »، کارێکی زۆریان لە زمانی کوردیی کردووە، کوردیش لە نووسیندا، پیتی عەرەبیی بەکارهێناوە، بە ڕێنووس و هێلّی « عەرەبیی ـ فارسیی » نووسیوێتی، ڕێنووسێکی بلاو، جیاجیا، هەلّوەشاو، تێکەلاّو لە ووشەی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » بەکارهێناوە.
ڕێنووسی کوردیی، وەک هەموو شتێکی زیندووی دیکەی ئەم جیهانە، پێبەپێی گۆڕانکارییە « ڕامیاریی، کۆمەلاّیەتیی، زانستیی، کەلتووریی و ئابوورییەکان »ی کۆمەلّگە دەگۆڕێ. بۆیە دەتوانین، بلّێین: ئەو ڕێنووسەی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، بۆ نووسینی کوردیی بەکارهێنراوە، لەگەلّ ئەو ڕێنووسەی، لە سیی و چلەکاندا پێییان دەنووسی، جیاوازییەکی گەورەی هەیە. یا هەمان ئەو ڕێنووسەی چلەکان، لەگەلّ ئەم ڕێنووسەی ئەوڕۆماندا، گەلێ جیاوازیی هەیە.
گەر بەراوردێکی، زمانی کوردیی و ڕێنووسی سەردەمی فەرمانڕەوایی «شێخ مەحموود »، لەگەلّ زمانی نووسینی ئەوڕۆماندا بکەین، زۆر بە ئاسانیی، بۆمان دەردەکەوێ، ڕێنووسی کوردیی، لە ماوەی ئەم « 70 ـ 80 » سالّەدا، بە چەن قۆناغێکی مێژوویدا تێپەڕبووە، چەن گوڕانکارییەکی گرنگی، بە سەردا هاتووە!! چونکە، ڕێنووس و زمانی کوردیی، لەو سەردەمەدا زۆر سەرەتایی بووە. ووشەیەکی زۆری « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » تێدابووە. بەلاّم، ئەوڕۆ زمانی کوردیی، بە ڕێنووسێکی نوێ دەنووسرێ، لە ووشەی بیانیی خاوێنکراوەتەوە، بە ووشەی کوردیی پەتیی و ڕەسەن دەولّەمەندکراوە، گەلێ ووشەی نوێی وەرگرتووە، هێندێ ووشەی داتاشراوی نوێ، بەپێی گۆڕان و پێشکەوتنی سەردەمەکە، بەگوێرەی پێویستییەکانی زمانی کوردیی، لە زمانی لاتینەوە وەرگیراوە، بەپێی تایبەتمەندیی زمانەکەمان داڕێژراوە و چەسپاوە. بۆ ئەوەی خوێنەری کورد، چ لە ئێستە و چ لە پاشەڕۆژا، ئاگای لە چۆنێتی گۆڕانی ڕێنووس و پاککردنەوەی زمانەکەمان بێ، بەپێی ئەو قۆناغە مێژووییانەی، زمانی کوردیی پێدا تێپەڕبووە، چەن نموونەیەک لە نووسینی کوردیی دێنینەوە.

له سەردەمی دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، له سالّی «1922»دا، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » دەردەچوو. لێرەدا، کۆپلەیەکی پچووک، له ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەکه وەردەگرین، دەڵێ:
(اعلان رسمی ب عموم اغا و کویخا و اهالی دیهات کوردستان. دزی و جردەیی و سایر معاملات بی شرعی بی معنا لم ڕوژەدا له همو وختی زیاتر عیب و گوناهه چونکه امرو ڕۆژ برایتی و دوستی و خزمت دین و ملتە ..... 1922/10/29 » )«45،11»
با لێرەدا، نموونەیەک له سەر ڕێنووس و داڕشتنی نووسینی کوردیی بێنینەوە، بێ ئەوەی، به هیچ جۆرێ، دەسکاریی ڕێنووسەکەی بکەم، یا خاڵ و وێرگولی بۆ دانێم، کتومت وەک خۆی چۆنه، هەر واش دەیگوێزمەوە، تا بزانین، هۆنەر و نووسەرەکانمان، ئەو زمانەی له سییەکاندا پێیان نووسیوە، چۆن بووە! هۆنەری پایەبڵندی کورد، خوالێخۆشبوو « عەلی کەمال باپیر ئاغا » ، هۆی دانانی بەرهەمی « گوڵدەستەی شوعرای هاوعەصرم »، بەم شێویە باسدەکا: (ڕۆژی 14 تموز 1939 پاش عصر له ئەطرافی شاری هەڵەبجه لەسەر حوضێک له باغی شێخ « محمد ئەمین » دا له خدمت جەنابی ذاتێکی موحتەرمی وطن پەروەردا بووم له شعرا و ئەدەبیاتی کورد ئەدواین یەکی لەو ذاتانه جنابی ئەحمەد فەخری بوو ڕوی کردە منو فەرموی : له عالەمەوه دیارە که قەومی کورد زۆر شوعرا و گەورە و به ناوبانگی بووە و هەیە، درێغ که تا ئێستا هیچ کەسێ تەرجەمەی حال و ئەشعاری ئەو شاعرانەی کوردی کۆنەکردۆتەوە. چی ئەبێ؟ ئەگەر تۆ هیچ نەبێ تەرجەمەی حالی شوعەرای کوردی هاوزمان و هاوزبان لەگەڵ هەر یەکێک چەند غەزەلێکیان کۆبکەیتەوە و چاپی بکەی.
منیش لەسەر ئەو فەرمودە و تشویقانەی ئەو تاکیداتی چەندی له یاران و وطن پەروەران دەستم کرد به کۆکردنەوە و نووسینی تەرجەمەی حال و ئەشعاری شاعرانی هاوعەصرم و ناوم نا « گوڵدەستەی شوعرای هاوعەصرم » . )«124،85»
«شێخ نووری شێخ ساڵح، تۆفیق وەهبی، عەبدولواحید نووری و پیرەمێرد» پاشان « گۆران » ، به پێشەوای نووسینی کوردی پەتیی و نوێ دادەنرێن.

با بازانین، هێندێ لەم پێشەوایانە، کاتی خۆی بە چ جۆرە زمان و ڕێنووسێ نووسیویانە؟ پاشان، چۆن گۆڕاوە؟!!

« شێخ نووری »، لە سالّی «1926»دا، کۆمەڵە گوتارێکی دەربارەی «وێژەی کوردیی » نووسیوە، بە بیستوپێنج زنجیرە، لە ڕۆژنامەی « ژیان »دا بڵاویکردۆتەوە. لە یەکێ لەو گوتارانەدا نووسیوێتی: (« هێنانە وجودی رسالەیکی ادبی کورد لەسر شانی ادیب و تجدد پرورەکانمان بە لزومیکی قطعی ازانم » حاشا ثم حاشا من نالیم ادیبم، من نالیم شاعرم، بلام لبر اوەی لە مندالیمەوە فکرم اشتغالی لەگل ادبیاتدا بووە بە تتبعات نختی شارەزاییم هیە وە ام شارەزاییە دائما سوقی اوەی کردوم کە لەم علمەدا کە هیشتا بە زمانی کوردی نەنوسراوەتەوە رسالەییک تالیف و طبع بکەم مع التاسف و ضعیت خصوصیەم دەست نەکەوتنی شعری شاعرە کۆن و تازەکانمان بوو بە اسبابی تاخری ام تشبثە خیرە.)«12-11،84» کەچی، کاتێ « شێخ مەحموود »ی نەمر، لە سالّی « 1956 »دا مردووە، « شێخ نووری » بەم کوردییە پەتییە و بەم هۆنراوەیە، گەرمەشینی بۆ کردووە :

چ نوکی خەنجەرێ بوو، وا بڕیی ڕیشەی دڵ و گیانم؟
چ تینی ئاگرێ بوو، وا بە جارێ جەرگی سووتانم؟
لە سەرچاوەی تەقیوی دڵمەوە خوێناوی ئاڵ و گەش
بە ناو شەرەیانەکانا دێنە سەرچاوەی دوو چاوانم!
لەگەڵ دوودی هەناسەم تێکەڵاوی یەک ئەبێ ئەوسا
ئەبێتە دانەی فرمێسکی خوێن، ئەڕژێتە دامانم!
تەمەز شیری خەفەت بەندی جگەرمی وا کوناودەر کرد
ڕیاندوویە بە یەکتر تانجەڕۆ و زەڵمی دواوانم!
ئەپاڵێرێ پەرەی دڵ نم نمەی خوێناوی لیڵ و وێڵ
ئەڕژێنێ موژەی چاو قەترە قەترە ئەشکی گریانم
وەرن سەیری تەبیعەت کەن لە هەواری ئاه و خوێنی دڵ
کە چۆن تاوێکی هێنا و بارییە سەر مەزرەعەی ژیانم!
بەژارەی خەم سەری هێنایە دەر بەم تاو و بارانە
ڕەریی پۆپکەی عەیش و خۆشیی سەرچنارانم !

ئەمەل نێژرا لە ناو خاکدا، ئەلەم گۆیکە و چرۆی دەرکرد
بە جارێ هەڵکرۆزا سەبزەزاری ناو بەهارانم!
بە کۆچی تۆوە بوو مەحبوویی حەق مەحموودی رەبیانیی
وەک غەزنە بە چۆڵیی مایەوە شاری سولەیمانیی! «68، 105-106»

تەنانەت، «گۆران» لە سەردەمێکدا، چ لە نووسین و چ لە هۆنراوەکانیدا، بە کوردییەکی تێکەڵاوی نیوە کوردیی و عەرەبیی دەینووسی. پاشان، شۆڕشێکی نوێی لە نووسینی زمانی کوردیدا بەرپاکرد، رێگەی نووسینی کوردیی پەتی گرتەبەر. با نموونەیەک لە سەر نووسینێکی کۆنی «گۆران» بێنینەوە، تا بزانین، لە سەرەتادا بە چ شێوەیە نووسیوێتی. «گۆران» لە هەڵەبجە مامۆستا دەبێ، لە «1932/4/4»دا، نامەیە بۆ «پیرەمێرد» دەنێرێ، ناوەڕۆکی نامەکە، باسی ئەوە دەکا، هۆنراوەکانی «گۆران» هەڵسەنگێنێ و یارمەتییبدا. ئێمە لێرەدا، تەنیا کۆپلەیەک بۆ نموونە، لەو نامەیە وەردەگرین، تا خوێنەری کورد بزانێ، رەووتی پێشکەوتنی نووسینی کوردیی و پرۆسێسی بژارکردنی زمانەکەمان، لە کەیەوە دەسپێکردووە و چۆن هاتووە.

أستادی محترم :
رەنگە لە بیریشتان چوبیت: هاوینی رابردو، لە دوکانی حماغای عطار بە ملاقاتیکی بچوکتان فیضی گەورەم چنگ کەوت، بەرامبەر بە ملکەی شعرم، لە ضمنی تشویعا متفائل دیاربون. هەرچەن ئەم ألتفاتەم حرفیا بە جدی وەرنەگرت، بەلام چونکە لە شخصییێکی صلاحیتدار و تجربەدیدەی شعرەوە صادر بوبو، حاشاناکەم، قوەتیکی مؤثری بە هیوام بەخشی. ذاتا پیش ئەوەش مفتونی «پەری شعر» بوم، أنجا بە هەمو أشتهایەکەوە تی ی ألام کە هەرساتە بە رەنگیک، لە شکلی ئەوا دیتە پیش چاوم ...) «44، 83» پاشان، لەسەر نامەکەی دەڕوا و دەڵێ: (بەشکو أوان مصیب بن؟ بەشکو من علتیکی نفسیم لەگەل بیت، سلامتی فکر و ذوقی تیک دابم؟ .... بەشکو من لە ریگای ضلالت بم .... شیطانیکی فاحشە، بە عشقیکی حرام، بە عشقیکی سفیلی ملوث أغوای کردبم؟ أفسوس! ... عمری جوانیم خەسار گیرا لە پی ناوی عشقیکا، کە مایەی هیکلی

مقدسی خا طرەی حرامزادەیەک دەرچوو! ...)«84،44 » کەچی، پاشان ئەو شۆڕشە گەورەیەی لە زمانی کوردیدا هەڵگیرسان!
هەروەها، « تایەر سادق » لە ساڵی « 1969 »دا، ڕێنووسێکی کوردیی پێشنیازکردووە، لەگەڵ ڕێنووسی ئەوڕۆماندا گەلێ جیاوازە. بۆ نموونە: ئەم ووشانە کە چاوگن، ئەو پێشنیازدەکا، بەم شێوەیە بنووسرێ:( تێ کردن، تێ گرتن، جێ ماو، جێ گر، جێ بە جێ، لێ دوربون، لێ خۆش بون، پێ گەیشت، پێ هەڵ گرتن، لێک بونەوە .. تاد)«63، 80 ـ 82» کەچی ئەوڕۆ، بە جۆرێکی دیکە دەنووسرێ. وەک (تێکردن، تێگرتن، جێماو، جێگر، جێبەجێ، لێدووربوون، لێخۆشبوون، پێگەیشت، پێهەڵگرتن، لێکبوونەوە ... تاد).
دەبێ، ئەوە باش بزانین، ڕێنووس، لەگەڵ سەردەم و تەمەنی ژیانی مرۆڤدا دەگۆڕێ. چونکە، لە لایەکەوە وەک چۆن، پێشکەوتن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ڕوودەدا، هەروەها، لە بواری زمانیشدا، ئەو پێشکەوتنە بە شێوەیەکی بەردەوام ڕوودەدا. لە لایەکی دیکەشەوە، تا نووسەری کورد بە ساڵا بچێ، گەر بە شێوەیەکی بەردەوام، چاودێریی گۆڕان و پێشکەوتنەکانی زمان و زمانەوانیی نەکا، ئەوا لە کاروان دوادەکەوێ و لە جێگەی خۆی دەچەقێ. بۆیە، گەلێ نووسەری بە تەمەن، هەر لە سەر ڕێنووسە کۆنەکانی خۆیان، تا سەر بەردەوامدەبن، بێ ئەوەی گوێ بە ڕێبازی نووسینی نوێ و ڕێنووسی تازە بدەن. بۆ نموونە: گەر سەرنجێکی سەرپێیی، لەو ڕێنووسەی «تۆفیق وەهبی » بدەین، کە لە ژمارە یەکی گۆڤاری « هیوا » ی ساڵی «1983»دا، گوتاری « زانیاری گشتی ی پێشەکی » پێ نووسیوە، لەگەڵ ڕێنووسە کۆنەکانیدا بەراوردیکەین، دەبینین: چەن هەنگاوێ بۆ دواوە گەڕاوەتەوە! خوێنەر، زۆر بە گران بۆی دەخوێنرێتەوە. جا گەر، مامۆستا چەن ساڵێکی دیکە بژیایە، هێندێ گوتاری دیکەی لەو بابەتانەی بنووسیایە، لەو باوەڕەدام، ڕێنووسێکی وا قورس و ئاڵۆزی پێڕەودەکرد، پەنا بە خوا، مەگەر هەر خۆی سەری لێ دەرکردایە!
بە کورتیی و بە کوردیی، چەن ساڵێ لەمەوبەر، ئەم چەشنە ڕێنووسە بەکاردێنرا، کە ئەوڕۆ، مەگەر لای بە تەمەنەکان پێڕەوکرێ، ئەگینا، خەریکە

به تەواویی باوی نامێنێ. وەک « ایمه، اوان، ادەمی زاد، نان مان، چاو
یان، یەکێ کی تر، ئاوێ کە، بێ کەس، بم ناسی با، بن میچ، بێ گومان،
دەست ئاو، دەست یاو، ماست ئاو، تێ بی نی، دەس بازی، پاک تر،
شارێ کی تر، دەست لێ هەڵ گرتن، دەستی پێ لێ هەڵ گرت، دەست ماچ
کردن، خوا لێ خۆش بو، چاپ کراو، چاپ خانە، چاپێ کی تر، پێشە وا،
پێشوازی، پێک مانەوە، پیتێ کمان، پەرچەم یەتی، جێ گا، جێ گۆڕین،
ڕەنجێ کمان دواە، جۆلاّیی یان کرد، نەخۆش خانە، خوێ و ئاوک، خوێن
دن، خوێن دەوار، داخ مان نەما، کۆچ یان کرد، کۆچ بار، پێچ کردنەوە، چی
یە، چی تر، هی چی تر، هی چی لێ نازانم، ورچێ کی یان، باڵ دار، نان
دەر، دی بەگە، باس تان کرد، سێ کان یان، باس لێ کراو، دەست کەوت،
دەست کەوت مان، سوپاس ی کرد، سی سە مار، سەگ سار، ڕەش بگیر،
ڕەش بە لەک، پاش ماوە، شۆڕش گێڕ، پێش کەوتن، پێش کەوتوو خواز،
شم شێر، باغ چە، ماف دار، فەرمان بەر، فێڵ باز، تیغ بەند، ڕەق
بوونەوە، تێک دان، فیشەک دان، پی تاک، یەک گرتوو، لێک دراو،
تاریک کستان، ڕێک و پێک، بەرگ درو، مل وان کە، پەرچ دانەوە، هەڵ
گرتن، چۆم مان، کەم ترین، نیە، نی یە، نەم زانی، نە مان زانی، نە تان
زانی، نە یان زانی، نان کەر، شوان کارە، تاوان بار، ئاسن گر ـ ئاسن گەر،
لە کوردی دا، لە سولەیمانی دا، لە دیار بەکر ەوە، لە ئامێد یەوە، خواردنم
ماسی یە، مراوی ی کوردستان، زەوی ی بۆ جوتیار، ئەز دزەیم، شوان
موسلاّوی یە، هەرمێ ی کرێ، زێ ی گەورە، لە دێ وە بۆ شار، هەرمێ
یەک، سێ یەمین جار، لە نووسین دا، نووسینە کەی منت دی، هەزار مێرد،
میرزا ڕۆستەم ... تاد » بەلاّم، ئەوڕۆ بەم شێوەیە دەنووسرێن:« ئێمە،
ئەوان، ئادەمیزاد، نانمان، چاویان، یەکێکیتر، ئاوێکە، بێکەس، بمناسیبا،
بنمیچ، بێگومان، دەستاو، دەستیاو، ماستاو، تێبینی، دەسبازیی، پاکتر،
شارێکیتر، دەسلێهەڵگرتن، دەسی پێ لێ هەڵگرت، دەسماچکردن،
خوالێخۆشبوو، چاپکراو، چاپخانە، چاپێکیتر، پێشەوا، پێشوازیی،
پێکمانەوە، پیتێکمان، پەرچەمیەتی، جێگە، جێگۆڕین، ڕەنجێکمان دواە،
جۆلاّییانکرد، نەخۆشخانە، خوێواوک، خوێندن، خوێندەوار، داخمان نەما،

کۆچیانکرد، کۆچبار، پێچکردنەوە، چییە، چیتر، هیچیتر، هیچی لێ نازانم، ورچێکیان، باڵدار، ناندەر، دیبەگە، باستانکرد، سێکانیان، باسلێکراو، دەسکەوت، دەسکەوتمان، سوپاسیکرد، سیسەمار، سەگسار، ڕەشبگیر، ڕەشبەڵەک، پاشماوە، شۆڕشگێڕ، پێشکەوتن، پێشکەوتووخواز، شمشێر، باغچە، مافدار، فەرمانبەر، فێڵباز، تیغبەند، ڕەقبوونەوە، تێکدان، فیشەکدان، پیتاک، یەکگرتوو، لێکدراو، تاریکستان، ڕێکوپێک، بەرگدرو، ملوانکە، پەرچدانەوە، هەڵگرتن، چۆمان، کەمترین، نییە، نەمزانی، نەمانزانی، نەتانزانی، نەیانزانی، نانکەر، شوانکارە، تاوانبار، ئاسنگەر، لە کوردیدا، لە سولەیمانیدا، لە دیاربەکرەوە، لە ئامێدییەوە، خواردنم ماسییە، مراویی کوردستان، زەویی بۆ جوتیار، ئەز دزەییم، شوان موسڵاوییە، هەرمێی کرێ، زێی گەورە، لە دێوە بۆ شار، هەرمێیەک، سێیەمین جار، لە نووسیندا، نووسینەکەی منت دی، هەزارمێرد، میرزاڕۆستەم ... تاد ».

هەروەها، چەن ساڵێ لەمەوبەر، نووسەران زۆر ووشەیان لە یەکدی جیادەکردەوە و نووسینەکەش زۆر بڵاودەبۆوە، وەک: « بێ کەس، بن میچ، ڕەوان بێژ، بن باخەڵ، سەر بان، لە ناو چوون، پێ لێ هەڵ برین ... تاد » بەڵام، ئێستە زۆربەی زۆری نووسەران، ئەم ووشانە بەم شێوەیە دەنووسن: «بێکەس، بنمیچ، ڕەوانبێژ، بنباخەڵ، سەربان، لەناوچوون، پێلێهەڵبرین ... تاد » چونکە، ئەو ووشانە، هەموو پێکەوە یەک واتا دەبەخشن.

ڕێنووسی کوردیی ئەوڕۆمان، لە سەرەتای قۆناغێکی نوێی نووسین دایە. تا ئێستەش، ململانێییەکی توند لە نێوان ڕێنووسی کلاسیک و نوێدا هەیە. دەتوانین، بڵێین: گەڕەلاوژێییەکی تەواو، لە ڕێنووسی کوردیی ئەوڕۆدا دەدیدەکرێ. بە کورتیی دەکرێ، دوو جۆر ڕێنووسی کلاسیک و نوێی ئەم سەردەمە پیشاندەین :

چەن نووسەرێکی ناسراوی کورد هەن. لە نووسیندا لە سەر ڕێبازی کلاسیک دەڕۆن. لە هێندێ جێگەی نووسینەکانیاندا، ڕێنووسێکی کۆنی سەردەمی پەنجا و شەستەکان بەکاردێنێن. پتر شەقلی داڕشتنی عەرەبیی، بە تەوێلی نووسینەکانیانەوە دیارە. ووشەی عەرەبیی زۆر بەکاردێنن. بە هیچ شێوەیە،

پێڕەوی دەستووری نووسین ناکەن. با لێرەدا، بۆ نموونە کۆپلەیە لە بەرهەمێکی « مەسعوود محەمەد » وەرگرین: (کەواتە دڵ خۆش کردن بەو رواڵەتە بێ بایەخە لە کارێکی وا گرنگدا، کە بڕیار دانی بوون و نەبوونی فیعلە لە ڕستەی کوردیدا، جگە لەوە کە هەرچی زانستی زمانە و هەرچی هۆش و هەست و مەنتیقە گاڵتەی پێ دەکا، هەر خۆی ، واتە ئەو دڵ خۆش کردنە، نیشانەی بێ بایەخ کردنی ڕێزمان و دەستوورەکانیەتی چونکە قبول کردنی رواڵەتی بێ هێز و بێ دەلالەت و بێ نرخ بە بەڵگەی زمانەوانی بۆ ئیسپات کردنی مەسەلەیێکی زلی ڕێزمان هەرچی متمانییە نایهێڵێ و دەمانباتە سەر ئەو قەناعەتە کە وا ڕەنگە لە هەموو سەرەباسەکانی ڕێزماندا توێژینەوەی وەها سەراویی بەکار بێ و بەکار هاتبێ ..)«98،107»
پاساوی ئەم ڕێنووسەی خۆشی، بەوە دەدا و دەڵێ: (خۆم ئازاد زانیوە لە پەیڕەویی کردنی جۆری ڕێنووس، چونکە تا ئێستا بڕیاریک دەرنەچو بۆ دەست نیشان کردنی یەکێک لەو جۆرانەی لە باودان. تا ئەو ڕۆژەی بڕیارێک شوێن خشکەی خامە ڕوون دەکا و بەسەردا ڕۆیشتنی بۆ دەکا بە دەستوور، من و تۆ و هەموو کەسێک دەتوانێ یەکێک لە ڕێنووسە ئاشناکان بکا بە گەشتگەی خامەی.)«179،107» ڕاستە، هەموو نووسەرێ ئازادە، چ جۆرە ڕێنووسێ پێڕەودەکا، بەڵام، زانا و نووسەرێکی وەک « مەسعوود »، بە تایبەتیی شارەزاییەکی تەواویی، لە زمانەکانی «کوردیی، عەرەبیی و ئینگلیزیی »دا هەیە، نەدەبوو، ئەو مافە بە خۆی بدا، خۆی بە پرینسیپی ئازادییەوە ببەستێتەوە، بەڵکوو دەبووایە، جۆرە ڕێنووسێکی نوێی بۆ ئێمە و نەوەکانی داهاتوومان پێشنیازکردایە!
لێرەدا، پێویست ناکا، وێنەی ڕێنووسی نوێ پێش چاوخەین، چونکە، خوێنەر بۆ خۆی بە باشیی دەیبینێ، بە ئاسانیی دەتوانێ، بەراوردێ لە نێوان هەر دوو ڕێبازەکەدا بکا. ئەو کاتە، بڕیاری خۆی بدا. ئەگینا، نموونە زۆرە، لە سەر ڕێبازی ڕێنووسی کوردیی نوێ بیهێنینەوە. بەڵام، با لێرەدا، چەن نموونەیەک، لە سەر شێوەی ڕێنووسی نوێ بێنینەوە :

1. ئێمە، لەگەڵ منالەکان، لە ئاوایی « میرزارۆستەم »، نانمانخوارد.
2. خۆزگە، ئەو کوڕەم بناسیایە. خۆزگە بمناسیایە. خۆزگە بمناسیبایە.

3. خوالێخۆشبوو، پێشەوا « قازی محەمەد »، خۆی پێشوازیی لێ کردین.
4. ئەشکەوتی « هەزارمێرد »، لە شاری « سولەیمانی »یەوە، زۆر دوور نییە.
5. لە گوندی « کانیشەیتان »، ماستاوی ساردیان دەرخواردایین. ماستاومان خواردەوە.

بە باوەڕی من، لەبەرئەوەی نووسینی کوردیی، هێشتا بە تەواویی یەکی نەگرتووە، بۆیە، هەر نووسەرێ چۆنی بوێ، وا دەنووسێ. لەبەرئەوە، ئەوڕۆ سێ جۆر ڕێنووس، لە نووسینی کوردیدا بەدیدەکرێ :

1. ڕێنووسێ بنچینەکەی لە سەر چاوگ دامەزراوە. وەک ئەوەی هەر ووشەیەک، گەر چاوگبوو، بەسەریەکەوە دەنووسرێ. گەر، وەک کرداریش بەکارهێنرا، ئەوا ڕەگەکەی بە جیا و کردارەکە بە جیا دەنووسرێن. واتە: هەموو ووشەیەک، جگە لە چاوگ، بە جیا دەنووسرێ، بێ ئەوەی، گوێ بە واتاکەی بدرێ. بۆ نموونە: « پاککردن، چاککردن، بانگکردن، هەڵوەشاندنەوە، هەڵگێڕانەوە، خۆتێهەڵقورتاندن، تێداچوون، ... تاد ».
ئەمانە هەموویان چاوگن، پێویستە، بەسەریەکەوە بنووسرێن. بەڵام، کاتێ وردیاندەکەینەوە و بە شێوەی کردار بەکاریاندێنین، وایان لێدێ: « پاکم کردەوە، پاکی کردەوە، پاکیان کردەوە، پاکی دەکەمەوە، پاکی دەکاتەوە، پاکی دەکەنەوە. هەڵم وەشاندەوە، هەڵی وەشاندەوە، هەڵیان وەشاندەوە، هەڵی دەوەشێنمەوە، هەڵی دەوەشێنێتەوە، هەڵیان دەوەشێننەوە. خۆم تێ هەڵ قورتاند، خۆی تێ هەڵ قورتاند، خۆیان تێ هەڵ قورتاند، خۆمی تێ هەڵ دەقورتێنم، خۆی تێ هەڵ دەقورتێنێ، خۆیانی تێ هەڵ دەقورتێنن ».
هەروەها، بۆ ووشەکانی دیکەش، هەر بەو شێوەیە دەبێ. لێرەدا دەبینین، لە هەموو ووشەکاندا، ڕەگی چاوگەکە یەک شتە، وەک « پاک و هەڵ ».
ئەویش بەگوێرەی« کات، بکەر، تاک و کۆ » پاشگری « ی ، م ، یان » وەردەگرن و واتای ووشەکان دەگۆڕێن.

2. ڕێنووسێ، بنچینەکەی لە سەر واتای ووشە دامەزراوە. وەک ئەوەی هەر ووشەیەک، گەر واتایەکی تایبەتیی ببەخشێ، بێ ئەوەی گوێ بە سیستێمی چاوگ و ڕەگەکەی بدرێ، هەمووی پێکەوە دەنووسرێ. واتە: گەر چەن

ووشەیەک، یەک واتایان بەخشی، لە تەنیشت یەکدییەوە دەنووسرێن. بۆ نموونە: « پاککردنەوە یا پاککردن ـ پاکمکردەوە، پاکیکردەوە، پاکیانکردەوە. پاکیدەکەمەوە، پاکیدەکاتەوە، پاکیدەکەنەوە. هەڵوەشاندنەوە ـ هەڵموەشاندەوە، هەڵیوەشاندەوە، هەڵیانوەشاندەوە، هەڵیدەوەشێنمەوە، هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەڵیاندەوەشێننەوە. خۆتێهەڵقورتاندن ـ خۆمتێهەڵقورتاند، خۆیتێهەڵقورتاند، خۆیانتێهەڵقورتاند، خۆمیتێهەڵدەقورتێنم، خۆیتێهەڵدەقورتێنێ، خۆیتێهەڵدەقورتێنن ». ئیدی بەو شێوەیە، ئەم سیستێمە، بۆ هەموو ووشەکانی دیکەش پێڕەودەکرێ.

بۆ ئەوەی، بەگوێرەی ئەم سیستێمە، هەموو ووشەکان بە ڕاستی بنووسین، گەر نەمانزانی، ووشەیەک چۆن دەنووسرێ، پێویستە، بۆ چاوگەکەی بگەڕێینەوە، پاشان وردیکەینەوە. بۆ نموونە: ووشەی « هەستان ـ هەستاندن یا هەڵسان ـ هەڵساندن »چاوگە. گەر بمانەوێ، بە شێوەی کردارە جیاوازەکانی و بەپێی کات بینووسین، بەم شێوەیە دەبێ: « هەستام ـ هەڵسام، هەستا ـ هەڵسا، هەستان ـ هەڵسان. هەڵدەستم، هەڵدەستێ، هەڵدەستن. هەلمسێنە، هەڵیسێنە، هەڵیانسێنە. هەڵمسێنن، هەلیسێنن، هەڵیانسێنن ». بەڵام، هێندێ کەس دەنووسن: « هەڵمبستێنە، هەڵیبستێنە، هەڵیانبستێنە. هەڵمبستێنن، هەڵیبستێنن، هەڵیانبستێنن ... تاد ». بە باوەڕی من، ئەم شێوازەی دوواییان، جگە لەوەی لە سەر زبان قورسە، بە هەڵەش دادەنرێ، چونکە چاوگەکە لە بنەڕەتدا، پیتی« ب» تێدا نییە، لەبەرئەوە نابێ، ئەو پیتە زیادکرێ.

3. هێندێ نووسەر، هەر دوو شێوەکەی پێشوو تێکلاودەکەن. وەک ئەوەی ووشەی پاککردنەوە، جارێ بە شێوەی چاوگ دەنووسن، جارێکی دیکەش، لە سەر بنچینەی واتا بەڕێوەدەڕۆن. لەبەرئەوە، هێندێ جار دەنووسن، «پاکی دەکەمەوە »، لە هێندێ شوێنی دیکەشدا دەنووسن، «پاکیدەکەمەوە». واتە: لە نووسینەکانیادا، دوو جۆرە ڕێنووس پێڕەودەکەن. ئەم شێوازە لە هیچ ڕوویەکەوە ڕاست نییە. چونکە، پتر سەر لە خوێنەر و نووسەرە لاوەکانمان دەشێوێنێ.

بە باوەڕی من، هەر یەکێ لەو دوو شێوەیەی یەکەم و دووەم بەکاربێنرێ، هیچ جۆرە زیانێ بە زمانەکەمان ناگەیەنێ. بەڵام، بە مەرجێ شێوەی سێیەمی تێهەڵکێش نەکرێ. ئەوڕۆ نووسەرە لاوەکانمان، زیاتر هەوڵدەدەن، زمانەکەمان ئاسانکەن، بەسەریەکەوە بنووسن، تا لە سەختیی هێندێ گرفتەکانی زمان و ڕێنووس، ڕزگارمانبێ. ئەز پێمڤایە، لە پاشەڕۆژدا، شێوەی دووەم « واتە: ڕێنووس لە سەر بناغەی واتا »، خۆی لە نووسینی کوردیدا دەچەسپێنێ. چونکە، لە هەر دوو شێوەکەی دیکە، باشتر و ئاسانترە. لەبەرئەوەی :

1. کاتی کەمتر دەوێ. چونکە، نووسەر کەمتر دەس بەرزدەکاتەوە، خێراتر شت دەنووسێ.

2. نووسینەکە کورتر دەبێتەوە. چونکە، هەر شتێ بە نووسینی یەکەم دوو دێڕبێ، بە نووسینی دووەم کەمتر دەردەچێ.

3. نووسینی کوردیی، بە شێوە ڕێنووسی یەکەم جیاجیا و بڵاوترە. شێوە ڕێنووسی دووەم، گەلێ پڕتر، ڕێکوپێکتر و جوانترە.

هێندێ کەس هەن، دەیانەوێ، پێڕەوی ڕێبازی ڕێنووسێ نوێ بکەن. بەڵام، وا دیارە، زۆربەیان بە تەواویی لە زمانی کوردیدا شارەزانین. بۆیە، گوێ بە هیچ ڕێوشوێنێکی ڕێزمان و زمانەوانیی نادەن. ئەز پێمڤایە، نابێ هەر لە پێناوی ئەوەی بەسەریەکەوە بنووسین، ئیدی هەرچی لە زماندا هەیە، بە سەر یەکدیدا بترشێنین و گوێ بە هیچ نەدەین. بۆ نموونە: نابێ بنووسین، کارەکەیبەئەنجامگەیاند، بەڵکوو دەبێ بنووسین، کارەکەی بە ئەنجامگەیاند. هەروەها، ئیشەکەیجێبەجێکرد ـ ئیشەکەی جێبەجێکرد. زۆربەی نووسەران، « ئەمشەو، یەکەمجار، کەمجار ... » بەم شێوەیە دەنووسن، بەڵام وەنەبێ، گەر زۆربە کارێکیکرد، ئیدی هەڵە نەبێ. چونکە، هەر یەکێ لەو زاراوانە، لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتوون. وەک « ئەم » و «شەو »، « یەکەم » و « جار »، « کەم » و « جار »، کە هەر یەکەیان پێناسەی تایبەتیی خۆیان هەیە. « ئەم » ناوی هێمایە، « شەو » ناوە و بۆ کات بەکاردێنرێ. « یەکەم » ژمێرەیە و بە ئاوەڵناو دادەنرێ و « جار »یش هەروەها. « کەم » ئاوەڵناوێکە باسی شتێکی دیکە دەکا، « جار » بۆ

ژماردن دەبێ. لەبەرئەوە دەبێ، بە جیا بیانووسین. جا گەر وا نەبێ، ئەدی بۆچی نانووسین:« ئەوشەو، دووەمجار، زۆرجار، هێندێجار ... »
لەوانەیە، هێندێ بڵێن: ئەدی زاراوەی « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ » بۆ بەو شێوەیە دەنووسرێ؟ دەبێ بزانین، ئەمە لە کوێوە هاتووە؟ « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ » بارێکی جیاوازی تایبەتیی خۆیان هەیە. چونکە « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ » ووشەیەکی لێکدراوە، لە « ئەم یا ئەو » و « ڕۆژ » پێکهاتووە. بەڵام، پیتی « ژ » قرتێنراوە، کورتکراوەتەوە و وەک ووشەیەکی نوێ داتاشراوە، تا « ئەمڕۆ یا ئەوڕۆ »ی لێ دەرچووە. ئەو چەن نموونەیەی پێشووش، بە چەن ووشەیەکی لێکدراو و داتاشراو دا نانرێن!
تەنانەت، کاتێ بە سەریەکیشەوە دەنووسین، بە هیچ شێویە نابێ، « ناو، ڕاناوی سەربەخۆ، کردار، ئامرازەکانی پێوەندیی و لێکدەر »، پێکەوە بلکێنین. چونکە، ئەو کاتە، جیاوازیی لە نێوان ئەو ووشە گرنگانەی زماندا نامێنێ، بەڵکوو دەبێ، هەر یەکەیان بە جیا بنووسرێن. بۆ نموونە:
« سولەیمانیخۆشە، عەلیقۆزە، لەدوورەوەهاتم، هانی جوانڕۆمدا. » بەم شێوەیە نابێ، بنووسین. گەر وا بنووسین، دیارە تەنیا دەمانەوێ، ئەوە بسەلمێنین، ڕێنووسێکی نوێمان بۆ زمانی کوردیی داناوە!!! ئەم پێکەوە نووسینانە، بە گوێرەی « ڕاناوەکان، پیتەکان، پێشگر و پاشگرەکان، ناوی مرۆڤ، ئاژەڵ، باڵندە، ڕووەک، جێگە » دەگۆڕێ. دیارە هەر چی ناوی «مرۆڤ، ئاژەڵ، ڕووەک، شتومەک و کەلوپەل » هەیە، بەسەریەکەوە بنووسرێ، گەلێ جوانتر و باشترە. هەر چەندە، لە چەن پیت و ووشەیەکیش پێکهاتبێ، هەر یەک واتا دەگەیەنێ. وەک « دڵئارام، کرێکار، جگەرخوێن، جاڵجاڵۆکە، هەزارپێ، شەنگەسوورە، دارکونکەرە، لاولاو، شاتوو، تووترک، گۆیژەڕەشە، حێلومێخەک، ملوانکە، بازیبەند، پڵپڵە، سیاچەمانە، ئاویسەر، تەنگیسەر، چلچرا، بەرگەسەرین، گوڵدان ...تاد »
نەک « دڵ ئارام، کرێ کار، جگەر خوێن، جاڵ جاڵۆکە، هەزار پێ، شەنگە سوورە، دار کون کەرە، لاو لاو، شا توو، توو ترک، گۆیژە ڕەشە، حێل و مێخەک، مل وانکە، بازی بەند، پڵ پڵە، سیا چەمانە، ئاوی سەر، تەنگی سەر، چل چرا، بەرگە سەرین، گوڵ دان ... تاد ».

بۆ ئەوەی بەسەرەیەکەوە بنووسین، ئەم خاڵانەی لای خوارەوە پێشنیازدەکەم :
1. گەر ووشەیەک، بۆ شێوەی ڕەتکردنەوە بەکارهێنرا، بە دوو جۆر خۆی دەنوێنێ. یەکەمیان ـ گەر لە سەرەتای ووشەکەدا بوو، وەک « ناخۆم »، «نەمخوارد » یا « مەیخۆ » ئەوا پێکەوە دەنووسرێن. دووەمیان ـ گەر شێوەی نێگێتیڤ لە ناوەڕاستی ووشەکەدا هاتبوو، وەک « حەز ناکەم »، «حەزم نەکرد » یا « حەز مەکە » ئەوا پێکەوە نانووسێنرێن و بە جیا دەنووسرێن. هەروەها، لە کۆتایی ووشەشدا هات، هەر بە جیا دەنووسرێ. وەک « دیار نییە، تێیدا نییە، ئاومان نییە، دیاکۆ لە ماڵ نییە و ... ».
2. هیچ جۆرە ناوێ، وەک ناوی « مرۆڤ، مەل، ئاژەڵ، جۆروجانەوەر، وولات، شار، گوند، چیا، دەشت، دارستان. ڕووبار، درەخت، ئامێری جۆراوجۆر... تاد » لەگەڵ هیچ جۆرە کردارێکدا، پێکەوە نالکێنرێن. وەک: « کوردەدەڕوا، کوردبوو، لە عێراقبوو » هەڵەیە. « کوردە دەڕوا، کورد بوو، لە عێراق بوو ... تاد » ڕاستە.
3. تەنیا ڕاناوی لکاو، لەگەڵ کردارەکاندا پێکەوە دەلکێنرێن. بەڵام، ڕاناوی نەلکاو، بە هیچ جۆرێ لەگەڵ کردارەکاندا، پێکەوە نالکێنرێن. وەک: « بە منیگوت،، حەزملێکرد، ئەومبینی، منیخۆشدەوێ ... تاد » هەڵەیە. « بە منی گوت، حەزم لێ کرد، ئەوم بینی، منی خۆشدەوێ.. تاد » ڕاستە. لە کاتی ڕستەشدا، هەر هەمان دەستوور بەکاردێنرێ. وەک :
«خۆزگە منیخۆشدەویست. » هەڵەیە. « خۆزگە منی خۆشدەویست. » ڕاستە. بەڵام دەتوانین، چ پێتی خستنەسەر، چ ڕاناوە لکاوەکان، پێکەوە بنووسین. بۆ نموونە: « من نانم خوارد، تۆ نانت خوارد، ئەو نانی خوارد، ئەوان نانیان خوارد ... » بەم شێوەیە دەبێ: « من نانمخوارد، تۆ نانتخوارد، ئەو نانیخوارد، ئەوان نانیانخوارد ... » .
4. کردارەکان پێکەوە دەنووسرێن، وەک(یاریکردن ـ یاریدەکەم، نانخواردن ـ ناندەخۆم، ڕاکردن ـ ڕادەکەن ... تاد). بەڵام، گەر کردارەکە، بە هۆی چەن ووشە و ناوێکی دیکەوە، لە یەکدی پچڕان، ئەوا بەسەریەکەوە نانووسرێن. هەروەها، بە دوا ووشەی ڕستەکەشەوە نانووسێنرێن. وەک :
ئێمە هەوڵ بۆ سەربەخۆیی دەدەین.

ئەوان حەز لە هەنگوین دەکەن.
تارا نانی لە چێشتخانەی لاوان خواردووە.
لەم سێ ڕستەیەدا دەبینین، چاوگی هەر سێ کردارەکان، لە « هەوڵدان، حەزکردن و نانخواردن »دا خۆیان دەنوێنن. بەڵام، بە چەن ووشە و ناوێ لە یەکدی دابڕاون. لەبەرئەوە ناتوانین، پێکیانەوە گرێدەین، یا کردارەکانی «دەدەین، دەکەن و خواردووە »، لەگەڵ « سەربەخۆیی، هەنگوین و لاوان » دا، پێکەوە بلکێنین. هەروەها، کردارە ئاوێتەکان، لە هەموو شێوەکانیدا «ڕابردوو، ئێستە و ئایندە » پێکەوە دەنووسرێن. وەک: « داهاتن، دەرهێنان، لێکخستن، بازدان، ئاوەدانکردنەوە، لێکنزیکەوتنەوە، دوورکەوتنەوە و ... »
5. جگە لەوەی، هەموو کردارەکان، بە هەر سێ شێوەکانیانەوە « ڕابردوو، ئێستە و ئایندە » هەمیشە پێکەوە دەنووسرێن. وەک « خەوتن ـ خەومدێ، دەخەوم، خەوتبووم. خواردنەوە ـ دەخۆمەوە، دەمخواردەوە، خواردبوومەوە » نەک « حەوم دێ، خەوت بووم. دەم خواردەوە، خوارد بوومەوە. »
6. هەموو ئاوەڵناوەکان، لەگەڵ ڕاناوەلکاو و کردارەکاندا پێکەوە دەنووسرێن، وەک: «سارد ـ ساردە ـ ساردبوو. گەرم ـ گەرمە ـ گەرمبوو. گەورە ـ گەورەیە ـ گەورەبوو ـ گەورەبوون. کورت ـ کورتە ـ کورتبوو ـ کورتبوون. سەرزل ـ سەرزلە ـ سەرزلبوو ـ سەرزلبوون. ورگدڕاو ـ ورگدڕاوە ـ ورگدڕاوبوو ـ ورگدڕاوبوون ». چونکە، گەر « سەرزلە » لە « سەر + زل + ە » پێکهاتبێ و پێکەوە بلکێنرێن، ئەدی بۆ « سەر + زل + بوو » پێکەوە نەنووسرێن؟! چ جیاوازییەکیان هەیە؟ ئەو دوو ئامراز و کرادرە « ە ، بوو » تەنیا لە کاتدا جیاوازییان هەیە، ئەگینا لە هیچ ڕوویەکی دیکەوە، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان نییە.
لەوانەیە، هێندێ کەس بڵێن: « ە » کردار نییە، بەڵکوو ئامرازی پێوەندییە و « بوو » کرداری ڕابردووە. بە لای منەوە، هیچ ڕستەیەک نییە، لە هیچ زمانێکدا، کرداری تێدا نەبێ، واتا ببەخشێ. ڕاستە « ە » کرداری تەواو نییە، بەڵام، جێگەی کردار دەگرێ و ڕۆڵی کردار دەبینێ. وەک پێشتر لەم باسە دواین.

7. بە هیچ شێوەیە نابێ، ئامرازەکانی « لێکدەر، پەیوەندیی و ناوی هێما یا ئاماژەکردن »، لەگەڵ ناو و کردارەکاندا پێکەوە بلکێنرێن. چونکە، جگە لەوەی لە ڕووی ڕێزمانەوە هەڵەیە، هەر یەکەشیان واتایەکی تایبەتیی خۆیان هەیە. بۆ نموونە: هێندێ نووسەر دەنووسن: « ئەمجارە، ئەمساڵ ... تاد » کەچی « ئەو جارە، ئەو ساڵە ...تاد » پێکەوە نانووسن و بە جیا دەیاننووسن. بە باوەڕی من، شێوەی یەکەم بە هەڵە و شێوەی دووەم بە ڕاست دادەنرێ. چونکە، لە هەر دوو شێوەکەدا،(ئەم و ئەو) ناوی ئاماژەکردنن. بۆچی، لە شێوەی یەکەمدا پێکەوە دەیاننووسن و لە شێوەی دووەمدا بە جیا دەیاننووسن؟! کەواتە ڕاستروایە، بنووسن،: « ئەم جارە، ئەم ساڵ »، لە هەموو زمانێکیشدا، هەر وا دەنووسرێ. لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە، دەربارەی هێندێ لە ئامرازەکانی پێوەندیی وەک « بە ، بۆ ، ە ، وەک ، لە ... تاد » و « لێکدەر وەک « و . بەڵام ، بەڵکوو ، یا ، نەک ، چونکە ... تاد » ڕوونکەینەوە :

دیارە، ئامرازەکانی پێوەندیی « بۆ ، وەک » و ئامرازەکانی لێکدەر « بەڵام، بەڵکوو ، یا ، نەک ، چونکە » بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ هیچ ووشەیەکدا پێکەوە نانووسێنرێن. بەڵام، گرفتەکە خۆی لە هەر چوار ئامرازەکەی پێوەندیی وەک « بە ، ە ، ی ، لە » و ئامرزای لێکدەری « و »دا دەبینێ. بۆ؟ گومانی تێدا نییە، هەر دوو ئامرازی پێوەندیی « ە ، ی » بە جۆرێ لە ئامرازە لکاوەکان دادەنرێن. چونکە، هەرگیز بە تەنیا نایەن. بۆ نموونە: لاولاو هاتووە. لە « کرداری هات + پاشگری وو + ئامرازی ە » پێکهاتووە. چونکە، « هاتوو » بێ ئامرازەکە، هیچ ناگەیەنێ، واتاکەی ڕوون نییە. بەڵکوو ئامرازەکە، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، لاولاو هاتووە و کارەکە تەواوبووە، ئێستە لێرەیە. پێوەندییەک لە نێوان « ناو، کات و شوێن »دا پیشاندەدا.

هەروەها، ئامرازی پێوەندیی « ی »ش بەو شێویە دەبێ. بۆ نموونە: کوردە لووتی گەورەیە. لێرەدا ئامرازی « ی » خەسڵەتی « گەورە » بە ناوی مرۆڤ و ناوی ئەندامێکی جەستەی کوردەوە گرێدەدا. بەڵام بۆ « بە و لە »، کەم نووسەر هەیە، گوێ بە دەستووری نووسینی ئەم دوو ئامرازە پێوەندییە بدەن.

زۆربەی نووسەران، لەگەڵ هەموو یەکەکانی زماندا، پێکیانەوە دەبەستن. بۆ نموونە: « لە، لە ناو، لە سەر، لە ژێر، لە بەر، لە لای، لە لایەن، لە ڕۆژی، لە شاری، لە چیا پرسە و ... » ئەمانە، هەموویان پێویستە، بەپێی دەستووری زمان، تەنیا بەم شێوەیە بنووسرێن. کەچی، زۆر کەس پێڕەوی ناکا و دەنووسن: « « لە، لەناو، لەسەر، لەژێر، لەبەر، لەلای، لەلایەن، لەڕۆژی، لەشاری، لەچیا پرسە و ... »

ئەمانە، بۆیە دەبێ، بە جیا بنووسرێن، چونکە، هەر یەکێ لەو ووشانە، بێ « لە » واتایەکی تایبەتیی خۆی هەیە، بە شێوەیەکی تایبەتییش گەرداندەکرێن. واتە: دەتوانین، بێ « لە » بڵێین: « ناو، سەر، ژێر، بەر، لای، لایەن، ڕۆژی، شاری، لە چیا پرسە و ... » واتە: ئەو ووشانە لە یەک ووشە پێک نەهاتوون، بەڵکوو، هەر یەکێکیان لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتوون، بۆیە دەبێ، پێکەوە نەلکێنرێن.

بۆ ئامرازی « بە »ش، بە هەمان شێوە دەتوانین، نموونەیەک بێنینەوە: « بە، بە تایبەتیی، بە گشتیی، بە ئاشتیی، بە خۆشیی، بە ئارەزوو، بە پێ، بە ئۆتۆمۆبێل، بە ڕۆژ، بە شەو، بە شیروانم گوت و ... » بە هەڵەش، بەم شێوەیە دەنووسرێ: « بە، بەتایبەتیی، بەگشتیی، بەئاشتیی، بەخۆشیی، بەئارەزوو، بەپێ، بەئۆتۆمۆبێل، بەڕۆژ، بەشەو، بەشیروانم گوت و ... »

بەڵام، « لەبەرئەوە، بەگوێرەی، بەپێی، جێبەجێکردن، بەڕۆژ ـ گەر ناوی مرۆڤ بێ ـ ، بەس و .. » هەر دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێ، چونکە، بە هەموویان یەک ووشە پێکدێنن.

بە داخەوە، هێندێ لە نووسەرەکان، چاو لە دەستووری زمانی عەرەبیی و فارسیی دەکەن، ئەو ئامرازە پێوەندییانە لەگەڵ ووشەکاندا، پێکەوە دەلکێنن. وەک لە عەرەبیدا دەڵێن: « لە سەر = عەلا، لە ژێ = تەحت، لە ناو = فی، بە ئارەزوو = برغبە، بە ڕەزامەندیی = بموافقە، بە شێوەیەکی تایبەتیی = بصورە خاصە و ... » لە زمانی کوردییدا، ئەمانە هەموو بە هەڵە دادەنرێن، چونکە، دەستوورێکی تایبەتیی خۆی هەیە. مەگەر لە ئایندەدا، دەزگەیەکی ئەکادیمی کوردیی دامەزرێ، بەڵگەی زانستانەی بۆ داتاشێ و بچەسپێ.

بۆ ئامـرازی لێکدەری « و »ش، بە هیچ جـۆرێ، بە هیچ ووشـەیەکـەوە نالکێنرێ. هەر چەندە، زوو نووسـەران پێکیـانەوە دەلکاندن. وەک منو دارا
- من و دارا. کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردیی.
بە کورتیی دەتوانین، گرفتەکانی ڕێنووسی کوردیی، لەم چەن خاڵانەی لای خوارەوەدا، چڕکەینەوە :
1. ڕێنووسێکی یەکگرتووی تایبەتیی و دیاریکراومان نییە. لەبەرئەوە، هەر نووسـەرێ، بە ئارەزووی خۆی دەنووسێ. هەر ووشەیەکیش، بە چەن جۆرێ دەنووسرێ. لە ناو و ووشە کوردییەکاندا، گرفتێکی زۆرمان بۆ پەیدا نابێ، چونکە، خـۆی چۆنە وا دەنووسـرێ. بەڵام، لەو ناوانەی کـوردیی نین، هەر کەسێ چۆنی بە ڕاست بزانێ، بەو شێوەیە دەینووسێ. بۆ نموونە: « حسین » و « محمد » دوو ناوی عەرەبین. کورد بەم شێوانە دەیانڵێ و دەیاننووسێ: «حـسـێـن، حـسـێن، حـسـەین، حـوسـەین و حـوسـێن ». هەروەها، ناوی «محـمد»یش، بەم شێوە جیـاجیایانە دەنووسرێ. « محـەمەد، محـەممەد، مـوحـەمـەد و مـوحـەممەد. » نووسـەری وا هەیە، ئەو ناوە لە یەک بەرهەمی خۆیدا، بە چەن جۆرێ دەنووسێ، کە پێویستە، لە هەمـوو بەرهەمەکەیدا، بە یەک شێوە بینووسێ. (جاری وا هەیە، ناوی جێگەیەک یا کەسێ، بە زیاتر لە ڕێنووسێ نووسراوە. بۆ نموونە: بدلیس، بەدلیس، بیـتلیس. سلیمـانی، سلەیمانی، سولەیمانی، سولێمانی، سلێمانی. ئادیەمان، ئادبیەمان ... تاد) «49،35». لەبەرئەوە، هەمـوو نـاوێ کوردیی نەبوو، پێـویسـتە، بە ڕێنووسی کوردیی بنووسرێ. بۆ نموونە: « طه، طیب، طاهر، صدیق، صمـد، صالح، مصطفی، ظاهر، ثامر، عثمان، ذنون، عبیدالله، فؤاد... تاد » بە کوردیی بە « تەها، تەیب، تایەر، سدیق، سەمەد، سالح، مستەفا، زاهیر، سامر، عوسـمـان، زەنون، عـوبێـدوڵڵا، فـوواد .. تاد » دەنووسرێ. جگە لەوەی، سەنانەت هێندێ نووسەر هەن، لە نووسینەکانی خۆیاندا، یەک جۆر ڕێنووسی یەکگرتوو بەکار ناهێنن. واتە: هەر لە یەک گوتاری کورتی خۆیاندا، هێندێ جار، ناوێ یا ووشەیەکی دیاریکراو، بە چەن شێوەیەکی جیـاواز دەنووسن، کە ئەم جۆرە نووسینانە، زیاتر سەر لە خوێنەری کـورد تێکدەدەن و گرفـتی پتر، لە بەردەم زمانەکەماندا قووتدەکەنەوە.

2. شارەزایانی زمانی کوردیی، دوو واویان « وو » بە پیتێکی سەربەخۆ داناوە و لە یەک واو « و » جیایانکردۆتەوە. هەر چەندە، هەر دووکیان هەر هەمان واتا دەبەخشن، بەڵام، گەر ئەو ووشانەی بە دوو واو دەنووسرێن، بە یەک واو بیانووسین، لە ڕووی ڕێنووسەوە، بە هەڵە دەژمێررێ.

زۆر ووشە هەیە، بە دوو « و » دەنووسرێ. بەڵام، زۆربەی نووسەران بە یەک « و » دەینووسن. کاتێ، لەو بارەیەشەوە پرسیاریان لێ دەکەی، لە وەڵامدا دەڵێن:

یەکەم ـ ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیمان نییە، لەبەرئەوە، هەرچی چۆنێ بنووسین، هەر ڕاستە.

دووەم ـ دەڵێن: گرنگ ئەوەیە، خوێنەر لە مەبەسەکەمان بگا، ئیدی بە یەک « و » یا بە دوو « و » بنووسین، گرنگ نییە.

بەڵام، لە ڕاستیدا، لە ڕووی ڕێنووسەوە وا نییە و هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە، وردەوردە، زمانەکەمان تێکدەچێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە تەواویی فێری ڕێنووسێکی ڕێکوپێک و یەکگرتووی کوردیی نابن. جگە لەوەی، لەگەڵ فۆنێتیک زمانەکەماندا ناگونجێ.

لە زمانەکانی دیکەدا، گەر هەر ووشەیە بنووسین، پیتێکی تێدا دووبارە بوویێتەوە، ئێمە بە یەک پیت بینووسین، یەکسەر بە هەڵە بۆمان دادەنێن. وەک لە زمانی ئینگلیزیدا بە دەرگا دەڵێن: « Door » و بە دوو « O » دەنووسرێ، گەر بە یەک «O » بینووسین، وەک « Dor » بە هەڵە دادەنرێ و ئەو واتایە نابەخشێ. هەروەها، ووشەکانی « Coop, Droop, Loop » لەگەڵ ووشەکانی «Cop, Drop, Lop»دا، جگە لەوەی لە یەکدی جیاوازن، یەک واتاشیان نییە. لە زمانی « سویدی »یشدا « Sugga » بە مێی بەراز و « Suga » بە مژین، « Komma » بە وێرگول و « Koma » بە سەرەمەرگ، « Ärr » بە شوێنی برین و « Är » بە کردار دێن. هەر یەکێ لەو جووت پیتانە بقرتێنین، جگە لەوەی واتاکەیان دەگۆڕێ، لە ڕووی ڕێنووسیشەوە بە هەڵە دەژمێررێ. هەروەها، لە هەموو زمانەکانی دیکەی نەتەوەکانی جیهاندا، هەر بەو شێوەیەیە.

لێــرەدا، چەن نموونەیەک لە سـەر « و » دێنینەوە: ئێــمـە دەزانین، هەمــوو ووشـەیەک، لە چەن پیــتێ پێکهــاتووە. گـەر هەر ووشـەیەک، بە « و » دەسسپێبکا، پێویستە بە دوو « و » بنووسرێ. وەک « ووزە، ووژە، ووڕە، ووشــە، وورشــە، وون، ووتن، ووتـار، وولات، وونجـڕوونجـڕ و ... تاد ». بەلام، لە سالەکانی حەفتادا، « کۆڕی زانیاریی کورد » بڕیارێکیاندەرکرد، گوتیـان: ئەو ووشانەی سەرەتاکانیـان بە دوو « و » دەسپێدەکا، تەنیـا بە یەک « و » بنووسـرێن. چونکە، هیچ ووشـەیەکی کـوردیی بە یەک « و » دەس پێ نـاکـا. جـا ئێـسـتــە، بۆ نووسـەرەکـە خـۆی دەگـەڕێتـەوە، بە هەر شێوەیەکیان بنووسێ، هەڵە نییە. بە باوەڕی من، بە دوو « و » بنووسرێ، گەلێ جوانتـر و ڕێکوپێکتـرە. بەلام، لە ڕاستـیدا، بۆ نووسین، یەک « و » ئاسانترە.
بەلام، گـەر پیـتی « و »، لە ناوەڕاستـی ووشەکەدا هاتبـوو، لە نێـوان دوو پیــتی کــۆنســونانتـــدا بوو، ئەوا دەنگەکــە درێژ دەبێ و بە دوو « و » دەنووسرێ. وەک « ئابووریی، بوون، پووڵ، چوون، خوول، ڕوون، ڕووسیـا، ژوور، سوور، سووریا، قــووڵ، کووره، لوول، لووڕ، نـووسین، نووستن و ... تاد » هەروەها، گـەر هەمـوو ئەو « و »نەی لە نێـوان دوو پیـتی ڤـاوڵ یا پیتێکی کۆنسۆنـانت و یەکێکی دیکەی ڤاوڵدا دێن، ئەوا تەنیا بە یەک واو دەنووسـرێـن. وەک « خــواردن، خــواردنەوە، خــەوتن، زوێر، زەوی، ڕەوین، ڕەوەند، ڕێوی، ڕێواس، سـاوەر، گەوڕک، لەوەڕ و ... تاد ». یا کـاتێ، هەر ووشـەیەک، بە « و » کـۆتاییـدێ، لە دوای پیــتی کـۆنسـۆنانتـەوە دێ، دیسانەوە بە دوو « و » دەنووسرێ. وەک « بەڕوو، پەموو، توو، چوو، خوو، دوو، ڕابردوو، ڕوو، زوو، سنجـوو، شـوو، فـوو، قـوو، لوو، مـازوو، مـوو، هەموو و ... تاد ». مەگەر، ووشەکە کۆتایی بە پیتێکی ڤۆکاڵ هاتبێ.
3. بۆ ئەوەی، پیـتی « ی » لە ڕێنووسی کـوردییـدا، بە شـێـوەیەکی ڕاست بنووسین، تا بزانین، لە کوێدا یەک، یا دوو، یا سێ « ی » بە دوای یەکدیدا دێن، لێرەدا چەن نموونەیەک پێش چاو دەخەین :
هەر کاتێ پیتی « ی »، لە سەرەتای ووشەوە هات، هەمیشە بە یەک« ی » دەنووسرێ. وەک: « یار، باد، یاوەر، یەزدان، یەدەک و ... تاد).

هەروەها، کاتێ پیتی « ی »، لە دوای ناوی « مرۆڤ، شت، جێ » یا ئاوەڵناوێکەوە دێ، هەر بە یەک « ی » دەنووسرێ. وەک: شێخ مەحموودی نەمر. حوسێنی کورد. زایندەی سولەیمانییە. دانیشتووی کوێستانە. خەڵکی گەرمیانە. ئاسنی سارد، ئاوی گەرم ».
هەر کاتێ، باسی جێگەی لە دایکبوونی یەکێکمان کرد، یا نازناوی جێگەمان دیاریکرد، ئەوا بە دوو « ی » دەنووسرێ. وەک: « کۆیی، شارەزووریی، بەغایی، کوفیی، ئینگلیزیی، ڕووسیی ... تاد ». هەروەها، ئاوەڵناوەکانیش کۆتاییان بە دوو « ی » دێ. وەک: « سەروەریی، سەربەرزیی، بەرزیی، گەرمیی، ساردیی، پانیی، درێژیی و ... تاد »
بەڵام، کاتێ پیتی « ی » لە ناوەڕاستی ووشەکەدا هات، دوو باری تایبەتیی وەردەگرێ و بەپێی پیتە ڤاوڵ و کۆنسۆنانتەکان دەگۆڕێن. گەر لە نێوان دوو پیتی کۆنسۆنانتدا بوو، ئەوا بە یەک « ی » دەنووسرێ، وەک(بارین، هاڕین، ڕیچ، ژیژک، شیلان، فیکە، لیر، لیرە، میز، هەڵمین، هیزە، ویرە و ... تاد).
بەڵام، گەر لە نێوان دوو پیتی ڤاوڵ یا پیتێکی ڤاوڵ و یەکێکی دیکەی کۆنسۆنانتدا بوو، یا گەر پیتی « ی »، خۆی لە ووشەکەدا هەبوو، ئەوا هەر بە دوو « ی » دەنووسرێ. وەک :« ئایین، بییر، تییر، زایین، سییر و ... تاد ». هەروەها، گەر هەر ووشەیەک، خۆی بە پیتی « ی » کۆتاییهاتبێ، بە دوو « ی » دەنووسرێ، وەک: « ئابووریی، پیشەسازیی، نەتەوەیی، نیشتمانیی، ویژەیی، هونەریی .. تاد ».
جگە لەوەی، گەر بە دوای ناودا هات، ڕۆڵی ئامرازی پێوەندیی بینی و ئاوەڵناوی پێکەوە گرێدا، یا بڵێین: گەر دوو ووشە یا چەن ووشەیەک، بە دوای یەکدیدا بێن و هەموویان بە پیتی « ی » ئامرازی پێوەندیی پێکەوە ببەسرێن، ئەوا یەکەم و دووەم ووشە، هەر بە یەک « ی » دەنووسرێن و دوا ووشەش بە دوو « ی » دەنووسرێ. وەک: « زمانی کوردیی - زمان + ی + کورد + یی، بزووتنەوەی نەتەوەیی - بزووتنەوە + ی + نەتەوە + یی، ئاماری جوگرافیایی - ئامار + ی + جوگرافیا + یی، ڕووداوی مێژوویی - ڕووداو + ی + مێژوو + یی، بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی - بزاڤ + ی

+ ڕزگاریخواز + ی + نیشتمان + یی، ... هتد » لێرەدا دەبینین، « ی » یەکەم لە نموونەی یەکەم ـ چوارەم، ئامرازی پێوەندییە. لە دوا نموونەشدا، هەر دوو « ی » زاراوەکانی « بزاڤ و ڕزگاریخواز » هەر بە دوو « ی » ئامرازی پێوەندیی دادەنرێن. بەڵام هەموو جووتە « ی »کانی کۆتایی دوا ووشەکان، « ی » ئاساییین، واتای ڕستەکە تەواودەکەن. لە ڕاستیدا، ئەمەش پێوەندییەکی توندی، بە دوا پیتی کۆتایی ووشەکانەوە هەیە. بۆ نموونە: زاراوەی نەتەوە: نەتەوەی کورد، نەتەوەکانی جیهان، بە یەک«ی »، باوەڕی نەتەوەیی » بە دوو « ی » و ئەو هەڵوێستە نەتەوەیی یە، بە هەستی نەتەوەیی یان » بە سێ « ی » دەنووسرێن. هەروەها، ووشەی زانا: زانای گەورە، زانایانی زمان، بە یەک « ی »، بە زانایی، بە دوو « ی » و ئەو کارە زانایی یە، بە زانایی یان سەرکەوتن، بە سێ « ی » دەنووسرێن. ئەو ووشانەی بە پیتی « ی » کۆتاییان دێ، وەک «کوێرەوەریی، جیاوازیی، کۆمەڵایەتیی، ڕۆمانسیی. بە کوێرەوەرییانە، جیاوازییانە، کۆمەڵایەتییانە، ڕۆمانسییانە » دەنووسرێ. بەڵام، ئەو ووشانەی بە کۆنسۆنانت تەواودەبن، بە دوو « ی » دەنووسرێن و دەنگەکان درێژدەبنەوە. وەک: « بابەت ـ بابەتی ـ بابەتیی، پەت ـ پەتی ـ پەتیی، زانست ـ زانستی ـ زانستیی، سەربەست ـ سەربەستی ـ سەربەستیی، کان ـ کانی ـ کانیی، ئازاد ـ ئازادی ـ ئازادیی، هێمن ـ هێمنی ـ هێمنیی، بێلایەن ـ بێلایەنی ـ بێلایەنیی، مەینەت ـ مەینەتی ـ مەینەتیی و ... تاد »، لە شێوەی یەکەمدا یەک « ی »و لە شێوەی دووەمدا دوو « ی » وەردەگرن. چونکە هەر یەکەیان واتایەکی تایبەتییان هەیە. بۆ نموونە: « ئازاد » هەم بۆ ناو و هەم بۆ ئاوەڵناو بەکاردێ. « ئازادی » یەکێ بە یەکێ دڵێ تۆ ئازادی واتە: سەربەستی. بە عەرەبیی بە « حور » دێ. « ئازادیی » مەبەس لە ئازادیی مرۆ یا نەتەوەیە. « ئازادیخواز » ئاوەڵناوە بۆ کەسێ یا کۆمەڵێ، ڕێکخراێ بەکاردێ . بە عەرەبیی یەکەم بە « حوریە » و ودووەمیش بە « احرار » دێ. هەموو ئەو وشانەی پێشوو دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێ : « بابەتانە، زانستانە، سەربەستانە، ئازادانە، هێمنانە، بێلایەنانە، مەینەتانە و ... » نەک بە « بابەتییانە، زانستییانە، سەربەستییانە، ئازادییانە، هێمنییانە،

بێلایەنییانە، مەیەنەتییانە و ... » بنووسرێن. ئەم ووشانەش، لە سەر بناغەی کورد ـ کوردانە، مەرد ـ مەردانە دادەڕێژرێن. تاقە مەبەس ـ تاقانە مەبەس ڕاست نییە. بۆ منالْ دەگوترێ: کوڕێکی تاقانەیە، واتا تاقانە خەسلەتە و دوای ناو یا شت دێ، نەک پێشی بکەوێ.
هەروەها ووشەکانی دیکەی « داهێنەر ـ داهێنان ـ داهێنەرانە، هونەر ـ هونەرمەند ـ هونەرمەندانە، سەرکەوتوو ـ بە سەرکەوتوویی ـ سەرکەوتووانە، ژیر ـ بە ژیریی ـ ژیرانە، کەر ـ کەرێتی ـ کەرانە، شۆڕشگێڕ ـ شۆڕشگێڕیی، شۆڕشگێڕانە، پێشکەوتووخواز ـ پێشکەوتووخوازی ـ پێشکەوتوخوازیی ـ پێشکەوتووخوازانە، کۆنەپەرست ـ کۆنەپەرستی ـ کۆنەپەرستیی، کۆنەپەرستانە، بەهرە ـ بەهرەدار، بەهرەدارانە، کوێر ـ کوێری ـ بە کوێریی، کوێرانە، دلْنەرم ـ دلْنەرمی ـ دلْنەرمیی ـ دلْنەرمانە... تاد»
هەروەها « باوک ـ باوکێتی نەک باوکایەتی. میر ـ میرێتی نەک میرایەتی. ئەندامێتی نەک ئەندامەتی. بەلاّم پیاو ـ پیاوەتی نەک پیاوێتی. کوێخا ـ کوێخایەتی نەک کوێخێتی. کەچی هێندێ ووشەی وەک کورد دەتوانین، بە گوێرەی مەبەسە جیاوازەکانمان، بە کوردێتی و کوردایەتیی بینووسین. بۆ « میرێتی و پیاوەتی » ـ پێوەندیی بە دوا پیتی ووشەکەوە هەیە. « میر » بە پیتێکی کۆنسۆنانتی وەک « ر » کۆتاییهاتووە. بەلاّم « پیاو » بە پیتێکی ڤاولْ « و » تەوابووە. دوای پیتە کۆنسۆنانتەکان دەتوانین، پیتی ڤاولْ بۆ ئاوەلْناوەکان بەکاربێنین، وەک :
« باوکێتی، میرێتی، کەرێتی، بەڕێوەبەرێتی، کوردێتی، ڕیشسپێتی و ... تاد » بەلاّم، دوو پیتی ڤاولْ بە دوای یەکدا قورسە و لە سەر زبان ڕەوان نییە.
هێندێ ووشە هەن، هەر خۆیان بە دوو « ی » کۆتاییاندێ، لە هێندێ کاتیشدا، « ی »یەکی ئامرازی پێوەندیی وەردەگرن، دەبن بە سێ « ی » وەک: « شایی ـ شایی ی لادێ. کۆتایی ـ کۆتایی ی سالْ. لادێ ـ لادێی کوردستان ـ لادێی ی. واتە: خەلْکی لادێ »، بەلاّم، لەبەرئەوەی جوان نییە، سێ « ی » بە دوای یەکدا ڕیزکەین، تا ئێستە، هەر بە دوو « ی » نووسیومانە.

4. هێندێ نووسەر هەن، بە تایبەتیی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، هەموو ئەو پیتە عەرەبییانەی لە زمانی کوردیدا نین، وەک: « ث ، ص ، ض ، ذ ، ط ، ظ » لە نووسینی کوردیدا بەکاریاندێنن. بۆ نموونە: « زوبێحی، هەژاری موکوریانیی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، محەمەدی مەلا کەریم، مەسعوود محەمەد، مستەفا نەریمان، نەوشیروان مستەفا و... » لەو نووسەرانەن، ئەم جۆرە پیتانە و ووشەی عەرەبیی لە نووسینەکانیاندا زۆر بەکاردێنن.

بە ڕاستیی، بنەماڵە ئاینییەکان و مەلای مزگەوتەکان، چەن ڕاژەی زمان و وێژەی کوردییان کردووە، هێندێ جاریش، زمانەکەیان لێ شێواندووین. چونکە، پێوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ مزگەوت و ئاییندا هەبووە و هەیە. قورئان و گوتەکانی پەیامبەر، هەمووی بە زمانی عەرەبیی نووسراونەتەوە. ئەو زمانەش، لە هەموو ڕوویەکەوە، کارێکی زۆری تێکردوون. بۆیە، وا فێربوون و ڕاهاتوون، گەلێ جار لە سەر دەستووری زمانی عەرەبیی دەڕۆن، بە ڕێنووسێکی تایبەتیی دەنووسن، زۆر پیتی عەرەبیی لە نووسینی کوردیدا بەکاردێنن. هەڵبەتە، ئەمە زیاتر لەو کاتانەدا دەبێ، کە ناوی مرۆڤێ، جێگەیە یا شتێ، بە چ شێوە و پیتێ نووسرابێ، ئەوانیش هەر بە هەمان دەستوور و پیتی ئەو زمانە، لە نووسینە کوردییەکەدا دەینووسنەوە. ئەمە جگە لەوەی، لەگەڵ ڕێنووس و دەستووری زمانی کوردیدا ناگونجێ، دوو ڕێنووسی جیاوازیش، لە یەک دەقی وێژەییدا دروسدەکا. بۆ نموونە:

لەو کورتە مێژووەی، مەلا « عەبدولکەریمی مودەڕیس » و کوڕەکەی «محەمەدی مەلا کەریم » ، بۆ ژیانی « مەحوی »یان نووسیوە، ئەم پیتە عەرەبییانە( ث، ص، ض، ذ، ط، ظ)بەرچاودەکەون، کە کوردیی نین و لە زمانی کوردیدا بەکار نایەن، وەک،(« مەحوی » ناوی موحەممەد و کوڕی مەلا عوثمانی ...)«5،47» لێرەدا دبینین، هەموو ناوەکە بە کوردیی نووسراوە، جگە لە ناوی « عوثمان » ، ئەوانی دیکە هەموو پیتەکانی کوردین. ئەو ناوە پێنج جار دووبارەبۆتەوە، کەچی، هەر بەو شێوەیە نووسیویانە! سەیر ئەوەیە، « سوڵتان عەبدولحەمیدی عوثمانیی »ش، جارێ بەو شێوەیە و جارێکی دیکە بە عوسمانیی دەنووسن. «15،14،6،47»

هەروەها، لە هەمان لاپەڕەدا دەبینین، « ئیمامی ئەعظەم » بە ڕێنووسی کوردیی و بە پیتی « ظ »ی عەرەبیی دەنووسن. لێرەدا دەبێ، یا هەموو ناوەکە بە عەرەبیی بنووسرێ، ئەو کاتە، دوو ڕێنووس لە دەقە وێژەیی یەکەدا پەیدادەبێ، یا بە ڕێنووس و پیتی کوردیی تۆمارکرێ، نەک یەک ناو، بە دوو جۆرە پیت و ڕێنووسی جیاواز بنووسرێ! ئەمە خۆی لە خۆیدا، لە ڕووی دەستووری زمان و ڕێنووسەوە، بە هەڵە دادەنرێ. چونکە، وردەوردە ئەو پیتانە، لەگەڵ پیتە کوردییەکاندا تێکەڵدەبن. وا بزانم، بەو کارەش زمانەکەمان نە دەوڵەمەنددەبێ و نە پێشیشدەکەوێ، بەڵکوو خراپتردەبێ. لەبەرئەوە، لەگەڵ خەسڵەتی زمانەکەماندا ناگونجێ.

« محەمەدی مەلا کەریم »، زۆربەی ووشە عەرەبییەکان، بە ڕێنووسی کوردیی دەنووسێ. کەچی، کاتێ ناوێکی عەرەبیی دەنووسێ، بە ڕێنووسی کوردیی ناینووسێ، بەڵکوو عەرەب چۆنی دەنووسێ، ئەویش هەر وای دەنووسێ. تەنانەت، ناوی خۆی و باوکیشی، هەر بە عەرەبیی دەنووسێ. بەڵام، « ‹مەلا »کە بە کوردیی دەنووسێ. بۆ نموونە: « محمدی مەلا کریم »، کوردییەکەی « محەمەدی مەلا کەریم »ە. هەروەها، کۆمەڵێ ناوی وەک: (محمود، شێخ رضای دێلێژە، ابن الحاج، مەلا حسن، مەلا حسین، مەلا احمد) « 43،ج » کە هەموومان دەزانین، بۆ ئەوەی دوو جۆر ڕێنووس پێڕەو نەکەین، ناوە عەرەبییەکان دەبێ، بە ڕێنووسی کوردیی بنوسرێ. وەک: «مەحموود، شێخ ڕەزای دێلێژە، ئیبن ئەلحاج، مەلا حەسەن، مەلا حوسێن، مەلا ئەحمەد. »

هەروەها، « هەژاری موکریانیی »، لەو پێشەکییەدا بۆ لێکدانەوەی دیوانەکەی « مەلای جزیریی » نووسیوە، گەلێ ووشە و ناوی عەرەبیی تووشبووە. هەر چەندە، ووشە عەرەبییەکانی، بە ڕێنووسی کوردیی نووسیوە، بەڵام، بە پیتی عەرەبیی تۆماریکردوون. وەک: « خذمە »ی عەرەبیی بە کوردیی بە « خذمەت » نووسیوێتی. « حدیث »ی عەرەبیی، هێندێ جار بە « حەدیث » و هێندێ جاری دیکەش بە « حەدیس » نووسیوێتی. لە ڕاستیدا دەبێ، تەنیا هەر بە یەک شێوە و بە کوردیش بنووسرێن. جگە لەوانە، وڵاتی « مصر »، جارێ بە « میصر » و

جارێکیش بە « میسر » نووسیویەتی. هەروەها، شاری « مووسڵ »یشی، دەمێ بە « موصل » و دەمێ بە « موسڵ » تۆمارکردووە. ژمارەی « سەد ـ سەدان »، کەرەتێ بە « سەت ـ سەتان » و کەرەتێکی دیکە بە « صەت ـ صەتان » نووسیوە. گەر لە بری پیتی « س »، پیتی « ص »یش بەکاربێنین، نابێ لە چەن دێڕێکدا، هەر جارەی یەکێکیان بنووسین، بەڵکوو دەبێ، یا هەر « سەد ـ سەدان » یا هەر « صەد ـ صەدان » بەکاربێنین، تا هەموو دەقەکە بە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو بنووسرێتەوە.

لە هێندێ جێگەی دیکەدا، ناوێکی عەرەبیی نووسیوە، پیتەکانی بە عەرەبین و تێکستی ناوەکەشی، بە ڕێنووسێکی تێکەڵاوی نیوە کوردیی و نیوە عەرەبیی تۆمارکردووە. وەک: « ئیمام محمدی غەزالی، ئەبو الفیدا، ئیبنوصەلاح، مەلا عبدواللە بێتوشی، رصافی، محمد کورد عەلی، شێخ عبد الباسط عبد الصمدی، طه حوسێن، حافظ، عیمادالدینی جزیری ... تاد » کە ڕاستروایە، بەم شێوەیە بنووسرێن. « ئیمام محەمەدی غەزالیی، ئەبو ئەلفیدا، ئیبنو سەلاح، مەلا عەبدوڵڵای بێتووشیی، ڕەسافی، محەمەد کورد عەلی، شێخ عەبدولباست عەبدولسەمەد، تەها حوسێن، حافز، عیمادەدینی جزیریی ... تا ». ئەگینا گەر بەو شێوەیە نەیاننووسین، لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە هەڵەیەکی گەورە دادەنرێ. «5،49 ـ 25»

« مەسعوود محەمەد »، نەک هەر ناوەکان بە پیتی عەرەبیی دەنووسێ، بەڵکوو لە بەرهەمی « وردبونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردیی »دا، لە بری ئەوەی ژمارە بۆ « پێشەکیی » دانێ، شازدە پەڕەی نووسیوە، ئەلفوبێی تێکەڵاوی « کوردیی ـ عەرەبیی » بەکارهێناوە. واتە: هەموو پیتە کوردییەکانی تێکەڵ بە هەر دوو پیتی عەرەبیی « ص ، ط » کردووە. دیارە، مامۆستا ئەو دوو پیتە بە کوردیی دادەنێ! بەو پێیەش بێ، ژمارەی پیتەکان لای ئەو تەنیا بیستونۆ پیتن! چونکە، دوای ئەوەی بە پیتی « ی » پێشەکییەکەی کۆتایی پێ هێناوە، جارێکی دیکە بە « ا ـ ب » دەسپێکردۆتەوە!

هەروەها « نەوشیروان مستەفا » لە بەرهەمەکەیدا، گەلێ ناو بە پیتی عەرەبیی دەنووسێ. وەک:(د. فوئاد مەعصوم و د. لەطیف ڕەشید.)

«5،116» كە ڕاستەوایە، بەم شێوەیە « د، فوواد مەعسوم و د. لەتیف ڕەشید » بنووسرێ. جگە لەوەی، کۆمەڵێ ناوی بە پیتی کوردیی و هێندێکی دیکەشی بە پیتی عەرەبیی نووسیوە. وەک :(ئەنوەر کەریم، ئەحمەد محەممەد، عەبدوڵلا تۆفیق، حەمید عەزیز، ڕەمەضان سەعید، ڕەضا عەمەر.)«178،116» زۆربەی کورد، ئەو دوو ناوەی دوایی، هەر بەم شێوەیە « ڕەمەزان، ڕەزا »دەنووسن. گەر هەر پیتێکی عەرەبیی لە زمانی کوردیدا بەکاربێنین، بە هیچ شێوەیەک نابێ، ئەو پیتە بەکاربێنین. چونکە لەگەڵ فۆنێتیکی زمانەکەمان ناگونجێ. تەنانەت، هێندێ جار، زمانی عەرەبیی بە ناوی ئەو پیتەوە ناودەبرێ و دەڵێن:« لوغەت ئەلضاد »!

دیارە، ئەم شێوە نووسینە، لە سەر ڕێوشوێنی نووسەر و هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد پێڕەودەکرێ. وەک چۆن لە کۆندا،(مەحویی، نالیی، کوردیی، سالم ... تاد) بە کوردیی دەیاننووسیی و پیتی عەرەبیان لەگەڵدا تێهەڵکێشدەکرد. ئەمانیش، ئێستەش هەر بە یادی ئەو سەردەمەوە و هەر بەو شێوەیەش دەنووسن، وەک ئەم ووشانەی دەیانبینین، لە هۆنراوە کوردییەکاندا بەکارهاتوون، چ ووشەکان و چ هێندێ لە پیتەکان، بە عەرەبیی نووسراون.(ئەعضایی، صۆفی، طەریقەت، طەریق، واعیظ، نەظەر، طەعنە، مەذهەب، ذەهەب، ئەمثال، تەئثیر ... تاد) ئەوەتە چەندین جار، ووشەی « واعیظ و عەرووضییە » لە لاپەڕەکانی (19 ، 30)ی بەرهەمەکەی « مەحویی »دا بەکارهاتووە.

هێندێ نووسەر، لە نووسینەکانیاندا، ووشەی عەرەبیی بەکاردێنن. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ووشانە لە زمانی کوردیدا، بەرانبەرەکانیان هەن و بەکاری ناهێنن. ووشە عەرەبییەکانیش، هەر بە ڕێنووس و پیتی عەرەبیی تۆماردەکەن. وەک لەو پێشەکییەی « مستەفا نەریمان »، بۆ بەرهەمەکەی «خەلیل منەوەر »ی نووسیوە، چەندین جار ووشەی « ظوڵم »ی نووسیوە، «14,7،119» لە کاتێکدا، لە زمانی کوردییدا، ووشەی « زۆرداریی »مان هەیە، نووسەر بەکاری نەهێناوە! بەڵام دەیتوانی، بە پیتی کوردیی بینووسێ، وەک « زوڵم » نەک بە پیتی عەرەبیی بینووسێ. چونکە، خۆشی باش دەزانێ، لە زمانی کوردیدا، پیتی « ظ »مان نییە!

باوەڕ ناکەم، هیچ کەسێ بەقەدەر « مەسعوود محەمەد »، لە نووسینداں، ووشەی عەرەبیی و فارسیی بەکاربێنێ. بۆ نموونە: گەشتێ بە شازدە لاپەڕەکەی پێشەکیی بەرهەمەکەی پێشوویدا دەکەین، تا بزانین، لەو هەوارە چ باسە؟

(مەعلوم، لەهجە، ئەدەب، تەئسیر، جیل، نەفەس، عومر، تەسلیم، قودرەت، دەور و تەسلیم، نەفەس، کتێب، حاڵ، قەدەر، تەعدیل، حورمەت، سادە، تەئویل، فەتوا، جامعە، دیراسە، غەیر، مەوزوعی، زەڕڕەیەک، حیکایەت، متعدی، فیعل، صیغە، تصریف، حیساب، دەربونە، زیهن، زەکاوەت، زەحمەت، شیعر، ڕەسمی، نامەفهوم، فەن، ئیعتیزاز، تیجارەت، تەرجەمە، خەیاڵ، عقلی، تطبیقی، ئیبداع، ئیسپات، مادی، ئەسڵ، واقیع، تەعریف، قەناعەت، عادەتی، ئیشارەت، شهادە الجنسیە، عاشقە.)

«107، ا ـ ی » جگە لە ووشە فارسییەکانی وەک « جوداوازی، خۆش ئامەدی، تەنها، پەنهانی، ملیۆنەها... تاد » بەکاریهێناون، ئەمە تەنیا ئەوەندی، فریاکەوتم، لە شازدە لاپەڕەی پێشەکییەکەیدا بژاردم. هەر یەکێ لەو ووشانەش، چەندین جار دووبارەبونەتەوە. خۆ گەر، هەموو سەدوهەشتا لاپەڕەی پەرتووکەکە بژمێرین، ئەوا دڵنیام، بە سەدان ووشەی بیانیی، هێلانەی لە نێوان دێڕەکانیدا کردووە. بە ڕاستیی، ئەم ووشە فارسیی و عەرەبییانەی مامۆستا بەکاریاندێنێ، نووسینەکەی دەڵێی: کێڵگەی سەوزی گەنمی « قەندەهاریی »ە و ووشەی « سن »ی فارسیی و « کولله »ی عەرەبیی تێیداوە، بۆیە، بە تەواویی پیت و ڕەونەقی لێ بڕیوە!

ئەز ناتوانم، ئەو هەڵە گەورەیە بکەم، بڵێم: خوا نەخواستە، مامۆستا واتای ئەو ووشانە بە کوردیی نازانێ، چونکە شارەزایی و توانای ئەو، لە زمانی کوردییدا بێسنوورە. بەڵام، داخەکەم ئەوەش نموونەیەکی نووسینە کوردییەکەیەتی! سەیر ئەوەیە، ئەم کوردییە تێکەڵاوەی خۆی، بەوە پاساوەدا و دەڵێ: (دیسان دەس پارێزم نەکردوە لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە بۆ مەبەسی تێگەیاندن. زاراوەکانی « ماضی، مضارع، امر، حکم، اسناد، مطلق، فعل، فاعل، مفعول، مصدر، ظرف، صفه، موصوف .. و گەلێکی تری وەک ئەمانە هەموو کەس تێیان دەگا، لەوانەبوو کە وەرم

گێڕابانە سەر کوردیی، بە هۆی ئەوەوە کە وا جارێ خەلق پێیان ڕانەهاتوە، واتا و مەبەسی نووسینەکە بە لای گەلێ کەسەوە زەحمەتتر کەوتبا.)
«179-178، 107»
با بڵێین: ئەو ووشە عەرەبییانەی مامۆستا ڕیزیکردوون، هەموویان پێوەندییان بە زمان و ڕێزمانی کوردیی و عەرەبییەوە هەیە، ئەدی بۆ ووشە ئاسایی یەکانی دیکە دەڵێ چی، کە بە دەیان ساڵە لە کوردیدا، بەرانبەرەکانیان هەیە؟! ئایا، کەی نووسەر و زاناکانمان، فێری نووسینی کوردیی و ووشەی کوردیی ڕەسەن و پەتیمان دەکەن؟ ئایا، ئەوە ڕاستە، هەر لەبەرئەوەی خەڵک لەو ووشانە تێبگا، ئیدی بە کوردییەکی خاوێن نەنووسین؟! ئەدی کەی ئاوڕێ لە زمانەکەمان دەدەینەوە؟! وا بزانم، گەنجی کورد، بە تامەزرۆیی یەوە، نووسینەکانی مامۆستا دەخوێننەوە، بەڵام، خۆزگە خوێنەوارانیشی، فێری کوردییەکی ڕەسەن و ووشەی پەتیی دەکرد!
هێندێ کەس هەن، هەر سێ ناوەکەیان، هەمووی کوردیی نییە. بەڵکوو یەکێ لەو سیانە یا دووانیان، بە کوردیی یا بە عەرەبییە. کەچی، هێندێ جار دەبینین، ناوە کوردییەکە بە ڕێنووسی کوردیی دەنووسن، ناوە عەرەبییەکەش بە ڕێنووسی عەرەبیی دەنووسن. وەک: «مصطفی نەریمان» کە پێویستە، هەر دووکیان بە کوردیی بنووسرێ « مستەفا نەریمان ».
ئەز بۆیە، کاتێ سەرچاوەیەکی کوردیی بەکاردێنم، ڕێنووسەکەی وەک خۆی چۆنە، نایگوێزمەوە و دەسکاریی دەکەم، تا دەقی هەموو نووسینەکە، بە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو بنووسمەوە. چونکە، بە ڕاستیی، نووسینێ بە دوو یا چەن ڕێنووسێکی جیاواز و کۆن و نوێ بنووسرێ، جگە لەوەی، گەلێ ناشیرینە، سەریش لە خوێنەری کورد دەشێوێنێ.

---

سەیر ئەوەیە، لای برایەکی هۆنەر، باسی شێوەی نووسینەکانی مامۆستام کرد، ئەویش یەکسەر گوتی: جا « عەزەمەتی » مەسعوود محەمەد لەوەدایە، کە وێرکول و خاڵ دانانێ، بەو شێوەیە دەنووسێ و ووشەی عەرەبیی بەکاردێنێ. دیارە، خوێنەری کورد وایە، گەر زانایەکی کورد، هەر هەڵەیەکیش بکا، هەر بە خاڵێکی بەهێز بۆی دەژمێرن!

لەبەرئەوە، پێشنیازدەکەم، هەموو نووسەرێکی کورد، بە تایبەتیی ئەوانەی کاری ڕۆژنامەگەریی دەکەن، ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیی دەردەکەن، لە بەرهەمەکانیاندا، یەک ڕێنووسی نوێ بەکاربێنن، تا وردەوردە، خوێنەری کورد، دەق بەو ڕێنووسانەوە بگرێ. لە ئەنجامیشدا، ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردیی دروسبێ.(خەڵکی لە پاشاگەردانیی ڕێنووسی کوردیی ڕزگارکا.)«31،122» کاتێ نووسەرەکانیش، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا، تەماشایەکی بەرهەمەکانی خۆیان دەکەن، لەگەڵ ڕێنووسەکەی خۆیاندا بەراوردیدەکەنەوە، ئیدی هەوڵدەدەن، بەو شێوەیە بنووسن، کە زۆربەی نووسەرانی کورد پێی دەنووسن. جارێکی دیکەش، ئەو ڕێنووسە جۆربەجۆرانە دووپات نابنەوە. وەک « هێمن »یش دەڵێ:(بێگومان ئەگەر نووسەرەکانمان بزانن، نووسینەکانیان ئاوا لە بێژنگ دەدرێن و تەتەڵەدەکرێن، بە سەرنجەوە دەنووسن.)«32،122» بەڵام، بە پێچەوانەوە، گەر کۆنترۆڵی ڕێنووس و نووسین نەبێ، ئەوا کەس گوێی ناداتێ، هەر نووسەرێ، بە ئارەزووی دڵی خۆی، چۆنی بوێ، وا دەنووسێ.

لێرەدا، شتێکی زۆر گرنگ هەیە، دەبێ باسیکەین، ئەویش ئەوەیە، بە هیچ شێوەیە نابێ، دەسکاریی دەقی هۆنراوە کلاسیکییەکانی کوردیی بکەین. ووشە « عەرەبیی، تورکیی و فارسیی »ەکانی وەرگێڕین، ڕێنووسەکەی بگۆڕین. چونکە، هۆنراوە شتێکی تایبەتییە و نابێ، خۆمانی لە قەرەدەین، بە تایبەتیی هۆنراوە کلاسیکییەکانمان، گەر دەسکارییانکەین، جگە لەوەی هەموویان، بە « کێش و سەرەوا »وە بەسراون و لەو چوارچێوەیەدا تێکترنجێنراون، ئاواز و مۆسیقای هۆنراوەکان تێکدەچن. هەروەها، تامی ئامێنێ و خوێنەر چێژی لێ نابینێ. لەگەڵ ئەوەشدا، بە ڕێنووسی ئەو هۆنراوانەدا دەتوانین، مێژووی گوتنیان دیاریکەین. لەبەرئەوە دەکرێ، هەر نووسەرێ بیەوێ، لە پەراوێزی نووسینەکەیدا، واتای ووشە بیانییەکان لێکداتەوە.

5. بە باوەڕی من، پێویست ناکا، گەر ناوێ یا ووشەیەکی عەرەبییمان بە کوردیی نووسیی، لە تەنیشتییەوە، بە عەرەبیش بینووسینەوە. چونکە، خوێنەر ناوەکەی بە کوردیی بۆ دەخوێنرێتەوە و تێیدەگا، ئیدی چ

پێویستدەکا، ناوێ دوو جار، بە دوو ڕێنووسی جیاواز تۆمار بکرێن. بۆ
نموونە: د. « عیززەدین مستەفا » دەنووسێ: (شێخ عەبدوڕەحمانی
ئیبنولخەیات « ابن الخیاط »)«3،55 » یا لە جێگەیەکی دیکەدا،
گووتەیەکی « پیرەمێرد » دێنێتەوە، باسی باپیری کردووە، دەڵێ: (عومری
درێژی خۆی لە ڕێی ئیعلای کەلیمەتوللا « کلمە اللە » و ... تاد)
«7،55» باشتر وایە، تەنیا بە کوردیی بنووسرێ!
ئەز پێموایە، کاتێ دەنووسین، پێوستمان بەوە نییە، هێندێ جار،
ووشەیەکی کوردیی بنووسین و لە تەنیشتیشیەوە، واتاکەی بە عەرەبیی
بنووسین. چونکە:
یەکەم ـ نووسەر لێرەدا فەرهەنگ نانووسێ، تا بەرانبەر هەر ووشەیەک،
واتا عەرەبییەکەی تۆمارکا.
دووەم ـ خوێنەری کورد فێری ئەو ووشە کوردییانە نابن، گەر خۆیان ماندوو
نەکەن، بە دوای واتای ئەو ووشەیەدا نەگەڕێن. چونکە، هەر واتا
عەرەبییەکەیان بینی، ئیدی خۆیان ماندوو ناکەن و تێی دەگەن. گەر
نووسەر ووشەیەکی، لە یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردییەوە وەرگرت،
یا ووشەیەکی بیانیی نوێی تێدابوو، وەک ناوی « ئامێر، خواردن و
کەلوپەل »ی دیکە، یا ووشەیەکی کۆنی بیانیی بەکارهێنا، یا ووشەیەکی
کوردیی داتاشراو بوو، ئەوا باشتروایە، لە کۆتایی بەرهەمەکەیدا،
فەرهەنگۆکێ سازکا و واتای هەموو جۆرە ووشەکان پێکەوە، بە کوردیی
ڕوونکاتەوە. نەک هەموو جارێ، لە تەنیشت هەر ووشەیەکی کوردییەوە،
لە نێوان دوو کەوانەدا، واتا عەرەبییەکانیان بنووسێ، وەک زۆربەی
نووسەران پێڕەویدەکەن، بۆ نموونە: « مستەفا نەریمان » دەنووسێ: هۆز و
عەشایەر «10،119 » هەلپەرستی « ئینتهازیەت » «13،119 » وا بزانم،
تەنیا ووشەی هۆز و هەلپەرستیی بەسە و پێویست بە عەرەبییەکانیان
ناکا. چونکە، ئەو دوو ووشە کوردییە، لە مێژە لە ئاخافتێ و نووسیندا
چەسپاوە و ڕۆڵەکانی کورد بە باشی تێیدەگەن!
6. هەروەها، زۆر کەس لە کاتی ئاخافتێ و نووسیندا، زۆر جار ئەم کردارە
ئاوێتەیە « هاتنەکۆتایی: هاتمەکۆتایی ـ هاتەکۆتایی ـ هاتینەکۆتایی،

هاتنەکۆتایی، دێینەکۆتایی) بەکاردێنن. هەر چەندە، ئەم جۆرە کردارە ئاوێتانە، لە لقەدیالێکتی « بادینانیی »دا پتر بەکاردێنرێ. بەڵام، جوانتر و ڕاستر وایە، لە بری ئەوە بنووسین: (کۆتاییهات ـ کۆتاییم پێ هێنا، کۆتایی پێ هێنا، کۆتاییمان پێ هێنا ـ کۆتاییان پێ هێنا). هەروەها کرداری «دەداتەقەڵەم» یا « لە قەڵەمدەدا »، بە ڕاستیی نازانم، ئەم کردارە نارێک و هەڵەیە لە کوێوە هاتووە، زۆربەی نووسەرانی کورد بەکاریدێنن؟ لە بری ئەوە دەتوانین، کردارەکانی « دادەنرێ، دەژمێررێ، دەناسرێ » بەکاربێنین. چونکە، دەرێتەقەڵەم یا دەداتە قەڵەم، هیچ واتایەکی نییە.

7. لە کێشە و باسی ڕێنووسی کوردیدا، بە ئاشکرا پاشاگەردانییەکی سەیر دەبینین. بە تایبەتیی لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی، چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی وڵات دەردەچن. هەر دەستەی بەرێوەبەرێک، شێوازێکی تایبەتیی بۆ خۆی داناوە، بە موو لێی لا نادا، گەر دڵی هەموو خوێنەر و نووسەرانیشی لە خۆی یەشاندووە! جا سەیر ئەوەیە، هیچیشیان دان بەوی دیکەیاندا نانێن! ئەمە وەنەبێ، تەنیا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا ڕەنگیاندابێتەوە، بەڵکوو، زۆربەی زۆری ئەو نامیلکە و پەرتووکانەیب بڵاویشدەکرێنەوە، لە ڕووی ڕێنووس و دارشتنەوە، بە ئاشکرا، لاوازییەکی زۆریان پێوە دیارە. لە ڕووی دارشتنەوە، گەلێ کالوکرچ و بێپێزن، بەڵام وەک دیارە، کەس بە دۆی خۆی نالێ: ترشە!

سەیر ئەوەیە، نەک هەر جیاوازیی لە نێوان نووسینی نووسەرە جیاوازەکاندا دەبینرێ، بەڵکوو، تەنانەت جیاوازیی لە نێوان ڕێنووسی، یەک نووسەر و لە یەک نووسینی تایبەتیشدا، زۆر بە زەقی دیارە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە نووسەرەکان، زۆر بە پەلە بەرهەمەکانیان دەنووسن، کەم جار پێیدادەچنەوە، یا خۆیان هێندە بە شارەزا دەزانن، بێزیان نایە، پێش ئەوەی بەرهەمەکانیان بڵاوکەنەوە، پیشانی چەن کەسێکی شارەزای دەن، تا هەڵەکانیان بۆ ڕاسکەنەوە و ڕێنماییانکەن! لامان سەیر نەبێ، گەر لە نووسینی نووسەرێکدا، تەنانەت یەک ناوی بە سێ جۆر و بە سێ ڕێنووس نووسیوە، وەک(حوسێن، حسێن و حسەین). یا هێندێ جار، لە گوتاری نووسەرێکی لاودا دەبینم،(چیە، چی یە و چییە) یا (نیە، نی یە و نییە)بە سێ شێوەی

جیاواز نووسراوه! جاریّ له برایه‌کم پرسی، بۆ وا ده‌نووسی؟ کوتی: من به کوردییه‌کی ئاسان ده‌نووسم، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌موو که‌س لیّی تیّبگا!! منیش پیّم گوت: ده‌بیّ، جیاوازیی له نیّوان کوردیی ئاسان و نووسین به هه‌ڵه‌دا بکه‌ی؟ هه‌رچه‌نم کرد، لیّی نه‌سه‌لماندم، منیش له ناچاریدا، « لکم دینکم و لی دین » یّکم بۆ گوت و لیّی گه‌ڕام!

8. با بڵێین: کورد و نه‌ته‌وه سه‌رده‌سه‌کانی کوردستان، ماوه‌یه‌کی زۆره پیّکه‌وه ده‌ژین، له هه‌موو بواره‌کانی ژیاندا، دید و بۆچوونه‌کانی خۆیان، به سه‌ر ڕۆڵه‌کانی کورددا سه‌پاندووه. به‌ڵام، ئه‌دی له‌گه‌ڵ گه‌لانی دیکه‌ی جیهاندا، بۆ به‌و شیّوه‌یه هه‌ڵسوکه‌وت بکه‌ین؟!! ئایا، کورد جگه له زمانه‌کانی « فارسیی، عه‌ره‌بیی و تورکیی »، هیچ جۆره زمانیّکی دیکه‌ی گه‌لانی جیهان نازانیّ، تا که‌ڵکیان لیّ وه‌رگریّ؟ ئه‌و ووشه و زاراوه نوێیانه‌ی، له زمانه‌که‌ماندا نین، لێیانه‌وه وه‌رگرین، به مه‌رجیّ خۆیان چۆنی ده‌نووسن و چۆنی ده‌ڵێن، هه‌ر به‌و شیّوه‌یه‌ش، به ڕێنووسی کوردیی بیانووسین و بیانڵێین؟!! به ڕاستیی، کاریّکی گه‌لیّ خراپه، گه‌ر هه‌ر ووشه‌یه‌کی گه‌لانی ئه‌وروپایی، له زمانه ڕه‌سه‌نه‌که‌ی خۆیانه‌وه وه‌ر نه‌گرین، به‌ڵکوو، له زمانی دووه‌مه‌وه یا سێیه‌مه‌وه وه‌ریانگرین! بۆ نموونه: هێندیّ ووشه هه‌ن، هیچ یه‌کیّ له‌و نه‌ته‌وه سه‌رده‌سانه‌ی کوردستان، دایان نه‌ناون. ئه‌وانیش، وه‌ک ئێمه خاوه‌نی ئه‌و ووشانه نین. به‌ڵکوو، له یه‌کیّ له زمانه‌کانی دیکه‌ی، گه‌لانی ئه‌وروپاوه وه‌ریانگرتووه. ئیدی بۆ ده‌بیّ، ئێمه‌ش له‌وانه‌وه بیانخوازین، به مه‌رجیّ، له‌گه‌ڵ « پیت، ده‌نگ و ڕێنووسی زمانی کوردیی »دا ناگونجێن. له‌به‌رئه‌وه ده‌بیّ، هه‌موو ئه‌و ووشانه، له زمانه ڕه‌سه‌نه‌که‌ی خۆیاندا چۆن نووسراون، به کوردیش هه‌روا بنووسرێن. وه‌ک: « Film فیلم، Telefon تێلێفۆن، Televizion تێلێڤیزیۆن، Radio ڕادیۆ، America ئه‌مێریکا، France فڕه‌نسا، Almania ئه‌ڵمانیا، Africa ئه‌فریکا یا » نه‌ک « فلیم، ته‌له‌فون، ته‌له‌فیزیۆن، ڕادوێ، ئه‌مه‌ریکا، فه‌ڕه‌نسا، ئه‌ڵه‌مانیا » بنووسین!

9. هه‌روه‌ها، بۆ ژماره‌کانی ماتماتیکیش، کاتیّ به نووسین ده‌یانووسین، نابیّ، به شیّوه‌ی جیاواز بیاننووسین. چونکه، یه‌کێتی ڕێنووسی کوردیی

دەشێوێنێ. بۆیە، باشتروایە، بە یەک شێوەی یەکگرتوو بنووسرێن. لە ڕاستیشدا، هەر چەندە، ئەمە بەپێی دیالێکت و ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەگۆڕێ، بەڵام جگە لەوەی ئێمە، باسی زمانی یەکگرتووی نووسین دەکەین، دەبێ، هەمووی بە یەک جۆر تۆمارکرێ، تەنیا هەر یەک شێوەیشیان ڕاستە و ئەوانی دیکەیان بە هەڵە بەکاردێنرێن.

بۆ نموونە:« یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، نۆ، دە، یازدە، دوازدە، سیازدە، چواردە، پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە، بیست، شەست، نەوەد، سەد ... تاد » نەک: « چار، حەفت، یانزە، دوانزە، سیانزە یا سێزدە، پانزە، شانزە، حەڤە، هەشدە، شێست، نۆت، سەت ... تاد » دیارە، نموونەی یەکەم بە ڕاست و جۆری دووەم بە هەڵە دادەنرێ. چونکە، گەر لە سەر شێوەی دووەم بڕۆین، ئەدی « چواردە، حەڤدە، هەژدە و نۆزدە » چۆن بە شێوەی « یانزە، دوانزە ... تاد » دەنووسین؟!

هەروەها، گەر هێندێ ژمارەمان بە نووسین نووسی، ئەوا چاکتر وایە، پێکەوە بنووسرێن. وەک :

«21 ـ 99 بیستویەک ـ نەوەدونۆ. 200 ـ 900 دووسەد ـ نۆسەد. 101 ـ 120 سەدویەک ـ سەدوبیست. 121 ـ 999 سەدوبیستویەک ـ نۆسەدونەوەدونۆ. 235 ـ 999 دووسەدوسیوپێنج ـ نۆسەدونەوەدونۆ. 2 000 ـ 99 000 دوو هەزار ـ نەوەدونۆ هەزار. 1 001 ـ 1 020 هەزار و یەک ـ هەزار و بیست. 1 021 ـ 1 099 هەزار و بیستویەک ـ هەزار و نەوەدونۆ. 1 100 ـ 1 900 هەزار و سەد ـ هەزار و نۆسەد. 1 106 ـ 1 999 هەزار و سەدوشەش ـ هەزار و نۆسەدونەوەدونۆ. 2 000 000 ـ 99 000 000 دوو ملیۆن ـ نەوەدونۆ میلیۆن. 6 500 744 ـ 99 099 999 شەش میلیۆن و پێنجسەد هەزار و حەوتسەدوچلوچوار ـ نەوەدونۆ میلیۆن و نەوەدونۆ هەزار و نۆسەدونەوەدونۆ ... تاد » ئەمە وەنەبێ، تەنیا لە زمانی کوردییدا پێڕەوکرێ، بەڵکوو لە زۆربەی زمانە ئەورووپاییەکانی جیهاندا، هەر بەو شێوەیەی دەنووسن. بۆ نموونە: سویدییەکان بەم شێوەیە ژمارەکانیان دەنووسن: سیودوو ـ trettitvå، دووسەدوسیازدە ـ tvåhundratretton،

هەزار و بیستوشەش ـ ettusentjugosex، سیودوو هەزار و سەدوچلوپێنج ـ trettitvåtusenetthundrafyrtifem ... تاد «70، 126»
هەروەها، باشتر وایە، ساڵەکانیش بە سەر یەکەوە بنووسرێن، وەک :
دوو هەزار و شەشسەدونەوەدونۆی کوردیی، هەزار و نۆسەدونەوەدونۆی زایینیی، هەزار و چوارسەدوبیستویەکی کۆچیی. بۆ نموونە: لە زمانی سویدیدا، بەم شێوەیە دەنووسرێ :

1967 - nittohundrasextisju
1492 - fjortonhundranittitvå «92، 126»

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەڵێم: پێویستە، چاوێ بە ڕێنووسی ئەوڕۆی کوردیدا بگێڕینەوە. تا دەتوانین، خۆمان ماندووکەین، ڕێنووسێکی نوێی ئاسان بۆ زمانەکەمان دانێین، بە مەرجێ، لەگەڵ «خەسڵەت، تایبەتمەندیی، گۆڕانکارییەکانی زمانی کوردیی، پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیاکانی جیهان و پێویستییەکانی کۆمەڵگەی کورد »دا بگونجێ. بە شێوەیەکی بەردەوامیش هەوڵدەین، خۆمان فێری ڕێنووسی نوێ کەین. واز لە ڕێنووسی فارسیی و عەرەبیی بێنین.

## 7/ ووشەی بیانیی :

دیارە، کارێکی زۆر ئاسایی یە، گەر زمانەکانی گەلانی جیاوازی جیهان بە گشتیی، زمانە نزیک و دراوسێکان بە تایبەتیی، کەڵک لە یەکدی وەرگرن، کار لە یەکدی بکەن، ووشەکانیان تێکەڵ بە یەکدی بن. چونکە، هیچ زمانێ لە جیهاندا بەدی ناکرێ، لەم یاسایە بەدەربێ. هەر لەو ڕۆژەوە کورد دروسبووە، لە ناوچەکەدا لەگەڵ چەندین گەل و نەتەوەی وەک : «فارس، ئاشووریی، کلدانیی، ئەرمەنیی، یۆنانیی، عەرەب، مەغۆل، تورک، تورکمان، ئازەر، بلووژ » تێکەڵبووە. لەبەرئەوە ، هەر لە کۆنەوە، هێندێ ووشەی ئەو زمانانە، تێکەڵ بە یەکدی بوون. هەر وەک چۆن، هێندێ ووشەی ئەو زمانانە، لە زمانی کوردییدا، جێگەی خۆیان کردۆتەوە، بە هەمان شێوەش، هێندێ ووشەی ڕەسەنی کوردییش، لە فەرهەنگی نەتەوەیی ئەو زمانانەدا جێگیربووە.
کەواتە: هیچ زمانێکی نەتەوەیی نییە، کەڵکی لە زمانە جیاوازەکانی

دیکەی، گەلانی جیهان وەر نەگرتبێ. بە تایبەتیی، بەپێی ئەو تێکەڵاوبوون، دوور و نزیکیی و داگیرکردنەی گەلان، زمانەکان کارێکی زۆریان لە یەکدی کردووە. واتە: ووشەی بیانیی لە هەموو زمانێکدا هەیە. بۆ نموونە: گەر زمانی عەرەبیی بگرین، ئەوا نزیکەی « 1420 » ساڵ دەبێ، بە هەموو شێوەیەک و لە هەموو لایەکەوە ڕاژەدەکرێ، کەچی هێشتا، بە هەزاران ووشەی لە زمانەکانی دیکەی گەلانی جیهانەوە وەرگرتووە. لەو بارەیەوە، د. « نەبەز » دەڵێ: (بۆتەیەکە بۆ تواندنەوەی هەزاران ووشەی عیبریی، ئارامیی کۆن، ئێرانیی « فارسیی و کوردیی و ... هتد »، سریان، حەبەشەیی، تورکیی، مەغۆلیی، لاتینیی، ویَنانیی و هیندیی و .. هتد. زمانی فارسیش لەم ڕووەوە لە عەرەبی " خاوێنتره " نییه.) «76،23» هەر چەندە، ئەو زمانانە کەڵکیان لە زمانەکانی دیکە وەرگرتووە، کەچی، لە هەمان کاتیشدا، هەر بەو شێوە ڕێنووسەی خۆیان نووسیویانەتەوە، کە لەگەڵ خەسڵەتی تایبەتیی ڕێزمان و فۆنێتیکی زمانەکەیاندا دەگونجێ.

لێرەدا، نموونەیەک لە سەر زمانی « سویدیی » دێنینەوە. « سویدیی »ەکان، بەشی زۆری زمانەکەیان، لە ووشەی « ئەڵمانیی، ئینگلیزیی و لاتین » پێکهاتووە. بەڵام نەهاتوون، هەموو ووشەکان، کوتومت لە زمانە ڕەسەنەکانیاندا چۆنە، هەر بەو شێوەیەش وەریگرن. بەڵکوو، ئەو ووشانەی لەو زمانانەوە وەریانگرتووە، جگە لەوەی، بەپێی زمانەکەی خۆیان، دەنگەکانیان گۆڕیوە و بەکاریاندێنن، لە هەمان کاتیشدا، بە پیت و ڕێنووسی تایبەتیی خۆیان دەینووسن. بۆ نموونە: « Welcome ـ وێلکەم » یان لە زمانی « ئینگلیز »ییەوە وەرگرتووە، واتا خۆشهاتی. بەڵام بە Välkommen ـ ڤێلکۆمێن » دەیخوێننەوە و دەینووسن.

ئەوە جگە لەوەی، زۆربەی زۆری کورد، لە کاتی ئاخافتندا، ووشەی عەرەبیی زۆر بەکاردێنن. بە زمانێکی پوختی کوردیی قسە ناکەن. تەنانەت، گەر بە کوردییش بدوێن، هەمان ووشە بە عەرەبیی بە دوایدا دووبارەدەکەنەوە. هێندێ جاریش، لە نووسیندا ئەم نەریتە پێڕەودەکەن. وەک: « هەست و شعور، ڕێز و ئیحترام، خو و ئولفەت، تەسیحکردن و

هەڵەڕاسکردنەوە، دەنگ و سەدا، جێگە و مەقام، کورت و موختەسەر، زاهیر و ڕواڵەت، وەعد و پەیمان، ویژدان و زەمیر، ناپاکیی و خیانەت، لەعنەت و نەفرەت، خواردنەوە و مەشروب، شەو و ڕۆژ و لەیل و نەهار، ساغ و سەلیم، ڕەخنە و نەقد، گیروگرفت و موشکیلە، عەزیز و خۆشەویست، قانون و یاسا، داب و نەریت و عورف و عادات، پرسیار و سووال، وەڵام و جەواب، دەنگوباس و ئیخبار، هەواڵ و ئیخبار، سەرچاوە و مەسدەر، بەڵگەنامە و دەکومێنت، شیعر و هەڵبەست، شیعر و هۆنراوە، زەعیف و لاواز، سادە و ساکار، پاشا و مەلیک، سیحرباز و جادوگەر، ئایین و دین، ئایینزا و مەزهەب ... تاد)
لە ڕاستیدا، ئەم شێوە قسەکردن و نووسینە، بە کوردیی دانانرێ، بەڵکوو زیاتر لە « ئەحمەدی »یەکەی «شێخ مارفی نۆدێیی » دەچێ، کە بۆ کوڕەکەی دانا، تا فێری زمانی عەرەبیی بێ! چونکە، هەر دوو ووشەکە یەک واتا دەبەخشن، بەڵام، بە دوو زمانی جیاوازی عەرەبیی و کوردیی دەدوێن. جا، ئیدی چ پێویستدەکا، ووشەیەک دوو جار دووبارەکەینەوە و زمانەکەشمان بە خاوێنی ڕا نەگرین؟!
سەیر ئەوەیە، هێندێ لە نەخوێندەوارەکانیشمان، کاتێ قسەدەکەن، ووشەی عەرەبیی قەبەقەبە بەکاردێنن. وەک ئەوەی بیانەوێ، بۆمان بسەلمێنن، ڕووناکبیرن. یا، شتێک لە زمانی عەرەبیش دەزانن. زۆریشیان هەر بە هەڵە، ووشە عەرەبییەکان دەڵێنەوە! ئەم دەرکەوتەیە وەنەبێ، تەنیا لە نێو کورددا هەبێ، بەڵکوو، لە نێو زۆربەی ئەو گەل و نەتەوانەدا هەبووە و هەیە، کە نەتەوەیەکی دیکەی بە هێز و دەسەڵات، خاکەکەی داگیرکردوون و فەرمانڕەواییکردوون. تەنانەت، ئەریستۆکراتەکانی « ڕووس »یش، لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، لە نێو خۆیاندا بە زمانی « فڕەنسیی » گفتوگۆیانکردووە. هەر چەندە، ئەوان لە لایەن « فڕەنسا »وە، هەرگیز داگیر نەکراون. بەڵام، لە لایەکەوە بایەخێکی زۆریان، بە زمانەکەی خۆیان نەداوە. لە لایەکی دیکەشەوە ویستوویانە، خۆیان لە چینە ڕەشوڕووتەکان و ڕەشەخەڵکەکە جیاکەنەوە.
هەروەها، هێندێ لە نووسەرەکانمان لە نووسینەکانیاندا، ووشەی بیانیی

زۆر بەکاردێن. کەچی، هەر بە ڕێنووسی ئەو زمانەش دەیاننووسنەوە. لە کاتێکدا پێویستە، گەر ووشەی بیانییش بەکاربێنین، تەنیا، بە ڕێنووسی کوردیی بیاننووسینەوە. ئەویش، بۆ ئەوەی لە نووسینەکانماندا، دوو جۆر ڕێنووس، پێڕەو نەکەین.(هیچ ووشەیەکی بێگانە نابێ، بە ڕێنووسی ئەو زمانە بێگانەیە بنووسرێ، کە لێوەی وەرگیراوە. چونکە گەر بێتو ئێمە، ئەو ووشە بێگانانە، هەر وەک خۆیان بنووسینەوە، دەبێ منالەکانمان و ئەو بێگانانەی زمانەکەمان فێردەبن، فێری دوو جۆرە نووسین بکەین.....
زمانی عەرەبیی، کە هەزاران ووشەی لە عیبریی و ئارامیی و فارسیی و هیندیی و کوردیی و ویَنانیی و ... هتدەوە وەرگرتووە، نەچوو بە ڕێنووسی ئەو زمانانە بیاننووسێ، ئەمجا ئێمە بۆچی دەبێ، زمانەکەمان لە ڕووی نووسینیشەوە بکەینە دوو زمان؟ ..... بەڵام، گەر هاتوو، ووشەیەکی عەرەبیمان وەرگرت و ویستمان وەک خۆی، بە ڕێنووسی عەرەبیی بیهێڵینەوە، بە نیازی کارێکی تایبەتی، نەک بیکەینەماڵی زمانەکەمان، ئەوا دەبێ، لە دوو کەوانەدا بینووسین.)«77،23»
جگە لەوەی، بەپێی ئەو فەرهەنگەی پرۆفیسۆر « قەناتی کوردۆ »، لە ساڵی « 1983 »دا دایناوە، ژمارەی پیتە کوردییەکان لە سیوشەش پیت پێکهاتوون. بەرانبەر هەر پیتێکیش، پیتە لاتینییەکەی نووسیوە. «26،80» چۆن هێندێ پیتی وەک:(ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ) لە زمانی کوردیدا نین، هەر بەو شێوەیەش، هێندێ پیتی ڕەسەنی کوردیی وەک:(پ ، چ ،ڕ ، ژ ، ڤ ، گ ، ڵ ، ۆ ، ێ ) لە زمانی عەرەبیدا نین. بەڵام، لە زمانە ئەوروپایی یەکاندا هەن. گەر، هەر « ووشەیەک، ناوێ، زاراوە »یەکمان، لە هەر زمانێکی بیانیی دیکەوە وەرگرت، دەبێ. ووشەکە لە زمانە نەتەوەیی یە ڕەسەنەکەی خۆیدا، دەنگەکەی چۆن بوو، هەر بەو شێوەیەش بیلێینەوە، یا خۆیان چۆنی دەنووسن، ئێمەش، هەر بەو شێوەیە بنووسین، بەڵام، پیتی کوردیی بەکاربێنین. لەبەرئەوە نابێ، بۆ ناوی «ئامێر، زاراوە جۆربەجۆرەکان، ناوی مانگەکان، گوند، شارۆچکە، شار و وولات »، وەک « عەرەب، تورک و فارس »ەکان بیاننووسین، بەڵکوو پێویستە، ئەو گەلانە خۆیان چۆنی دەڵێن و چۆنی دەنووسن، ئێمەش هەر

بەو شێوەیە بیاننووسین. نەک، هەر کەسە بە ئارەزووی خۆی بیاننووسێ، یا لە زمانی عەرەبییەوە وەریانگرێ و بەکاریانبێنێ. بەڵکوو وەک گوتمان: لە زمانە سەرەکییەکەی خۆیانەوە وەریاندەگرین. چونکە، ئێمە ئەو پیتانەمان هەن. لێرەدا، چەن نموونەیەک دێنینەوە :

ناوی دەوڵەتی «Portugal»، تەنیا دەبێ، بە پیتی کوردیی بە« پورتوگال» بینووسین، نەک گوتن و نووسینەکەی، لە زمانی دووەمەوە وەرگرین. چونکە، عەرەب پیتی « پ ، گ »یان نییە و بە « برتغال » دەینووسن. یا لەبەرئەوەی فارسەکان، بە دەوڵەتی « پورتوگال » دەڵێن « پرتەقاڵ »، ئیدی کوردەکانی ڕۆژهەلاتیش دەبێ، لەبەر خاتری ئەوان، هەر ئەو ناوە بەکاربێنن. ئەدی، ئەو کاتە، چۆن جیاوازیی لە نێوان « پرتەقاڵ »ی میوە و « پورتوگال »ی وولاتدا دەکەن؟!! یا ڕووسەکان خۆیان، بە پێتەختەکەیان دەڵێن: « Moskva ». کەچی، عەرەب لەبەرئەوەی پیتی «V» یان نییە، بە « موسکو »ی دەنووسن و دەخوێننەوە، لە کاتێکدا ڕاستییەکەی «مۆسکڤە » یە. یا « Chile » لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبیدا، پیتی «چ» نییە، عەرەبەکان بە « شیلی » دەینووسن. بۆیە نابێ، ئێمەی کوردیش لە عەرەبەوە وەریگرین. چونکە، عەرەبیی و کوردیی دوو زمانی جیاوازن و دەبێ، لە زمانە ڕەسەنەکەوە وەریگرین و بە « چیلی » بینووسین. یا با ناوی وولاتی « مصر » وەرگرین: لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا، بە «Egypt » دەنووسرێ. بەلام، چونکە « مصر » ،وولاتێکی عەرەبییە، لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیاندا بە « مصر » دەنووسرێ و دەخوێنرێتەوە، ئێمەی کوردیش دەبێ، لە عەرەبەکانەوە بیخوازین و بە پیتی کوردیی و بە«میسر» بینووسین. هەروەها ، «Japan ، America ، Polen ، Gabon ، Gambia ، Ghana ، Vatikan ، Vietnam و Venezuela» عەرەبەکان بە « یابان، امریکا ، بولونیا ، کابون، کامبیا ، کانا ، فاتیکان، فیتنام و فنزویلا » دەیاننووسن، کە ڕاستر وایە، بە « ژاپۆن، ئەمێریکا ، پۆلۆن، گابۆن، گانا ، گامبیا ، ڤاتیکان، ڤێتنام و ڤێنزەوێلا » بنووسرێن.

هەروەها ، ناوی مانگەکانی ساڵ، پێویستە، بە ئینگلیزیی بنووسرێ. هیچ پێویست ناکا ، بە « فارسیی، عەرەبیی، یا تورکیی » بنووسرێن. چونکە،

گەر تێکستەکە کوردیی بێ، بە کوردیی بنووسێن و بۆ کورد بنووسێن، پێویست بەوە ناکا، بە زمانی نەتەوە سەردەسەکانی کوردستان بیاننووسێن.
جگە لەوەی، ناوی مانگەکان بە ئینگلیزیی :
یەکەم: ڕۆڵەکانی کورد بە باشی فێری دەبن.
دووەم: ئەوڕۆ زۆربەی زۆری گەلانی جیهان، لە هەر پێنج کیشوەرەکەی جیهاندا، هەر ئەو ناوانە بەکاردێنن و وەک شتێکی نێونەتەوەیی لێهاتووە. ئێمەش، لە بری ناوی مانگەکان، بەو زمانانە بنووسێن، پێویستە، تەنیا ناوە ئینگلیزیی و کوردییەکان بەکاربێنین. لە هەمان کاتیشدا پێویستە، دەنگەکانیان لە زمانی ئینگلیزیدا چۆن بن، هەر بەو شێوەیەش بە کوردیی بیاننووسێن. بۆ نموونە: January ـ جەنیوەری یا ژەنیوەری، February ـ فێبروەری، March ـ مارچ. بەڵام، لەبەرئەوەی عەرەبەکان پیتی « چ »یان نییە، بە « مارس » دەینووسن، تازە لە نێو کوردیشدا، هەر بە « مارس » ڕۆیشتووە. « رووس و سوید »ییەکانیش، هەر هەمان ناوە ئینگلیزییەکان بەکاردێنن، بەڵام، لەگەڵ خەسڵەتی زمانەکەی خۆیاندا گونجاندوویانە. بۆ نموونە: سویدییەکان بە « March » دەڵێن: « مارش ـ Mars ». ڕووسەکان پێی دەڵێن: Mart .
دیارە ژمارەش، بە چەن جۆرێ دەنووسرێ، وەک هیندیی (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦ ... تاد) عەرەبیی (1، 2، 3، 4، 5، 6 ... تاد) لاتینیی ( I، II، III ، IV، V ، VI، VII ، VIII، IX، X، XI ... تاد) بە باوەڕی من، باشتروایە، ژمارەکان هەمووی بە عەرەبیی بنووسرێ. لەبەرئەوەی :
یەکەم : ڕۆڵەکانی کورد، لە هەموو بەشەکانی کوردستان بتوانن، بیخوێننەوە و تێیبگەن.
دووەم : ئێستە، هەموو گەلانی جیهان، هەر ئەو ژمارە عەرەبییانە بەکاردێنن.
لە باسی ژمارەدا، جێی خۆیەتی، گەر باسی ژمارەکان بە نووسینیش بکەین. گەر ژمارە « 1 » بەنووسین بنووسێن، ئەوا بەپێی جۆری قسەکردنەکەمان، چەن شێوازێ وەردەگرێ. وەک:« یەک، یەکەم، یەکەمین. دوو، دووەم،

دووەمین. دە، دەیەم، دەیەمین. پازدە، پازدەیەم، پازدەیەمین. بیست، بیستەم، بیستەمین. سی، سییەم، سییەمین. ... تاد » کەچی هێندێ کەس، بە تایبەتیی کوردەکانی ڕۆژهەڵات. بە« یەکهەم، یەکەهەمین. دووهەم، دووهەمین. دەیهەم، دەیهەمین. پازدەهەم، پازدەهەمین. بیستهەم، بیستهەمین. سیهەم، سیهەمین ... تاد » دەنووسن، کە ئەو نووسینانە هیچیان کوردیی نین، بەڵکوو لە فارسەکانەوە فێربوون. یا هێندێکی دیکە دەنووسن: « یازدەم، دوازدەم، سیازدەم ... » ، کە ئەمەش پتر لە شێوە زمانی دیالێکتەکان دەچێ و تێکەڵاوی زمانی نووسینی کوردیی دەکەن. کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە ژێر دەسی فارسەکان دان. لەبەرئەوەی، ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی عەرەبیدا نین، عەرەبیی نازانن، ئەو برە عەرەبییەی دەشیزانن، لە ڕێی ئایینی ئیسلام و فارسەکانەوە فێربوون. چونکە، زمانی فارسیی، گەر ووشە « عەرەبیی، کوردیی و تورکیی »ەکانی لێ دەرێنین، بە تایبەتیی ووشە عەرەبییەکان، شتێکی ئەوتۆی نامێنێتەوە! کەچی، کوردی ڕۆژهەڵات، لە ئاخافتن و نووسیندا، ووشەیەکی عەرەبیی زۆر بەکاردێنن، بەو شێوەیەش بەکاریدێنن، کە فارسەکان دەیڵێن و بەکاریدێنن. بۆیە دەتوانین، بڵێین: زۆر لە ژێر کارتێکردنی زمان و فەرهەنگی فارسیی دان. تەنانەت، لە قسەکردن و نووسینیشدا، لە سەر هەمان ڕێبازی ئەوان دەڕۆن. بۆ نموونە: هەر چەندە، «مەردۆخی » پێی وایە:« ئینسان » لە « ئانزان »ی کوردیی کۆنەوە وەرگیراوە و لە زمانی « ئیبن خەلەکان »ەوە، دەربارەی ووشەی « ئینسان » دەڵێ: (ئانزان ووشەی « ئینسان »ی عەرەبیی لێ وەرگیراوە، کە « ز » کراوە بە « س ». لە هەورامیدا هەر ئانزان بەکاردێ.)«84،106» بەڵام، تازە ئەو ووشەیە، تاپۆی زمانی عەرەبیی پێوەیە. « ئینسان » ووشەیەکی عەرەبییە و بە کوردیی واتای « مرۆڤ » دەگەیەنێ. « ئینسان » لە زمانی عەرەبیدا هەم بۆ « تاک » و هەم بۆ « کۆ »ش بەکاردێنرێ و هەرگیز کۆ ناکرێتەوە. بەڵام، کاتێ فارسەکان ووشەی « ئینسان » بەکاردێنن، وەک «تاک » وەریدەگرن، کۆکەشی لای ئەوان بە « ئینسانەها » دەردەبڕن. دیارە کوردەکانی ڕۆژهەڵاتیش، ئەم دیارییە جوانەیان لە فارسەکانەوە بۆ هێناوین

و دەیانەوێ، زمانەکەمانی پێ بڕازێننەوە! هەر بەو شێوەیە، ووشە کوردییەکانیش کۆدەکەنەوە، وەک « سەد، هەزار، میلیۆن، جار و ... » بە کوردیی بە « سەدان، هەزاران، میلیۆنان، جارەکان و ... » دەنووسرێن. کەچی، چونکە فارسەکان بە« سەدەها، هەزارەها، میلیۆنەها،جارەها و... » دەیاننووسن، کوردەکانی بندەسیشیان، هەر بەو شێوەیە دەیاننووسن.
« تەنیا »ی کوردیی بە « تەنها »ی فارسیی دەنووسن. لە ڕاستیدا، ئەمە کارێکی زۆر هەڵەیە. چونکە، دوو ڕێنووسی جیاوازی «کوردیی و فارسیی» لە زمانی کوردیدا قووتدەکاتەوە. وا بزانم، کاتی ئەوە هاتووە، بژارێکی زمانەکەمان بکەین و لەو ئاژاوەیە ڕزگاریکەین!
ئەوەتە، نووسەرێکی وەک « کەریمی حسامی »، کە لە زۆربەی نووسەرە کوردەکانی ڕۆژهەڵات باشترە، لە « یادی هێمن »دا دەنووسێ:(دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، هێمنیش پاشساڵها دەربەدەری لە نێو پێشوازی گەرمی خەڵکدا گەڕاوە بۆ نیشتمان...)«88،86» « ساڵها »، یەکەم: فارسییە، بە کوردیی دەنووسرێ: « چەن ساڵ » یا « چەندین ساڵ » یا «گەلێ ساڵان ». دووەم: گەر بەو شێوەیەش بینووسین، دەبێ، بە ڕێنووسی کوردیی بنووسین: « ساڵەها » نەک « ساڵها »!
هێندێ ووشەی دیکە، لە زمانی کوردیدا هەن، لە یەکێ لە زمانە دراوسێکانی گەلەکانی ناوچەکەوە، یا گەلانی دوور وولاتەوە وەرگیراون. هەر لە مێژەوە لە زمانی کوردیدا بەکارهێنراون، بە شێوەیە تواونەتەوە، گەر بە وردیی سەرنجیان نەدەین، بە تەواویی ناناسرێنەوە، بنەچەکەیان لە کام زمانی گەلانی جیهانەوە هاتووە. بەڵکوو، وا دەزانین، هەر لە بنەڕەتدا کوردیی بوون. وەک « تام، هەتیو، قات، فەقێ، میرات، خەڵک، خزمەت، تەگبیر، وەخت، عەرد، ئۆمەت، جنۆکە ... تاد» کە بەرامبەرەکانیان بە عەرەبیی « طعم، یتیم، قحط، فقیە، میراث، خلق، خدمە، تدبیر، وقت، ارض، امە، جن ... تاد » پێ دەگوترێ. هەر چەندە، بەشی زۆری ئەم ووشانە، لە زمانی کوردیشدا بە کوردیی هەن، بەلام، لە ئەنجامی ئەو داگیرکردن و تێکەڵاوییەی، لە نێوان هەر دوو نەتەوەی کورد و عەرەبدا پەیدابووە، تازە ئەو ووشانە، لە فەرهەنگی زمانی کوردییدا، جێگەی خۆیان

گرتووە. بە تایبەتیی، لە ئاخافتندا زۆر بەکاردێنرێن. هەروەها، لە هەموو زمانێکدا، ئەو ووشە بیانییانە هەن. بۆ نموونە:
لە زمانی عەرەبییدا، ووشەکانی « قیثارە، قانون، اقلیم ... تاد » لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراون. تەنانەت قورعانی پیرۆز(لە پاکی و ڕەوانیدا مۆجیزاتە ـ دەیان ووشەی نەژاد ڕۆمی، سانسکریتی، پەهلەوی، یۆنانی، کوردیی و ئارامیی کۆنی تێدایە، وەکوو « برهان، دین، ملکوت، طوبی، رضوان، فردوس، ارائک، زرابی، نمارق، کافور، کأس، قواریر، زنجبیل، سندس، استبرق، مائدە، رزق، زخرف، سراج، صراط، قسطاس، رهبان، دأب، بیعە، کنز، سراویل، دراهم، بخس، أمد، أبد، صدقات، قطمیر، اصنام، جناح، سخط، برزخ، جحیم، تنور، زبانیە، جهنم، زمهریر، صرصر، شوا ظ ، شنار، قمطریر، غساق، ضنک، شیئ، کهل، کهف، دلو، یم و سراب » و هی تریش)«25،120» هەروەها ، (ووشەی سەماوەر ڕووسییە. تەماتە ئینگلیزیی. تەرخان، قاچاغ، ئاغا ، خان، خانم، بێگ، مەغۆلین) «28،122 ـ 29» تەنانەت، کورد ووشەی لە زمانی مەغۆلەکانیشەوە وەرگرتووە، وەک :(« ولاخ » لە ئولاغ »ی مەغۆلییەوە وەرگیراوە.) هەروەها ،(یاسا ، قۆناغ، چۆک و بە چۆکداهاتن، تامغە، تەغار، تمەن، نۆکەر، قەیتول، ئۆردو، ئێل، ...)«147،116» وەک گوتمان: هەر چەندە، هەموو زمانێ، کەڵک لە یەکدی وەردەگرێ، هەموو زمانەکان بە ووشەی بیانیی ڕازاونەتەوە، بەڵام، تازە ئەو ووشانە کوردێنراون. چونکە، هێندە لە کۆنەوە، تێکەڵ بە زمانەکەمان بوون، بە شێوەیەکیان لێهاتووە، لەگەڵ ووشە ڕەسەنەکانی زمانەکە خۆیدا، جیاناکرێنەوە. بەڵام نابێ، ئەمە ڕێگەی ئەوەمان بۆ خۆشکا ، پەل بۆ ووشەی بیانیی درێژکەین، زمانەکەمان لە ووشەی بیانیی بارکەین، لە کاتێکدا خۆمان ئەو ووشانەمان هەبێ!
ئەز، لەگەڵ ئەوەدام، تا ووشەی ڕەسەن و شیرینی کوردیمان هەبێ، نابێ، پەنا بۆ بەر ووشەی بیانیی بەرین. لەبەرئەوە، هەرگیز لەگەڵ بۆچوونی ئەو نووسەرانەدا نیم، ماف بە خۆیان و خەڵکی دیکەش دەدەن، بە ئارەزووی خۆیان، گێرە لە خەرمانی زمانی گەلانی دیکەی جیهاندا بکەن.
جگە لەوەی، هەڵبەتە زۆربەی زۆری زمانەکانی جیهان، کەڵکیان لە یەکدی

وەرگرتووە، بەڵام، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، گەر ووشەیەکمان نەبوو، لە زمانی نەتەوە باڵادەسەکانی کوردستانەوە وەریانگرین، وەک هێندێ لە نووسەران و شارەزایانی زمانی کوردیی، بیانووی بۆ دەدۆزنەوە. بەڵکوو پێویستە، ئەو ووشانەی لە زمانی کوردییدا نین، بەرانبەرەکانیان بدۆزینەوە، یا لە زمانی لاتینەوە وەریانگرین! چونکە، هەموو گەلانی سەر ڕووی زەویی، بێ جیاوازیی دەتوانن، کەڵک لە زمانی لاتینیی وەرگرن، ئەو ووشانەی هەر لە بنەڕەتدا، لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیاندا چنگ ناکەون یا «پێشکەوتنی زانست، گۆڕانەکاریی یە نوێکانی سەردەم و داهێنانە تەکنۆلۆژیاکان» دەیسەپێنن، زۆر بە ئاسانیی دەتوانرێ، زاراوەی لێ وەربگیرێ، بە مەرجێ لەگەڵ تایبەتمەندێتی ئەو زمانەدا بگونجێ. (چونکە دەتوانرێ، بە ئاسانیی ووشەی لێ وەربگیرێ و ووشەی تازەی لێ پێکبێنرێ، لە ڕووی دەربڕینیشەوە زاراوەکانی لە سەر زمان سووکتر و ڕەوانترن.)«81،91»
وەک دەزانین، زمانی عەرەبیی، هەزار و چوارسەدوبیست ساڵە، جگە لە عەرەب خۆیان، هەموو گەلانی ئیسلام ڕاژەیدەکەن. دەوروبەری دووسەدوپەنجا میلیۆن عەرەب پێی دەدوێن. عەرەبەکان، پتر لە بیست دەوڵەتی نەتەوەیی یان هەیە. کەچی، سەدان ساڵ دەبێ، بە دەیان ووشەی بیانییان دەسەمۆکردووە، زمانەکەی خۆیانیان پێ دەوڵەمەندکردووە و ڕازاندۆتەوە. بۆیە، بە زمانێکی دەوڵەمەن دادەنرێ، لە فەرهەنگی ووشەشدا، پەکیان لە سەر هیچ ووشەیەک ناکەوێ.
دەربارەی دەوڵەمەندیی زمانی کوردییش، دیارە، دید و بۆچوونی جیاواز هەیە: د. «نەبەز» دەڵێ: (دەوڵەمەندیی زمان، لەوە دایە، کە بۆ هەموو واتەیەک ووشەیەکت ببێ، نەک بۆ واتەیەکی وەک چیا، «شاخ و کێو» و چەن ووشەیەکی دیشت ببێ. بەڵام، بۆ هەزاران واتای فیزیک و تەکنیک ووشەیەکت لێ بچێتە قات. کە گەل پچڕپچڕ بوو و ئاخری شەڕ بوو و بوو بە چەن تیرە و هۆزێکەوە، دیارە هەر تیرەیەک ووشە و زاری خۆی دەبێ و ئەمەش نیشانەی دەوڵەمەندیی زمان نییە و لووتبەرزی پێ ناوێ)
«111،24»
هەر چەندە، نەتەوەی «فارس و تورک»، بە سەدان ساڵە، خاوەنی

دەسەڵات و دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتی خۆیانن، بە هەموو شێوەیە ڕاژەی زمانەکەی خۆیان کردووە و دەیکەن. گەر زمانزانێ، شارەزایی لە زمانەکانی « کوردیی، فارسیی و تورکیی »دا هەبێ، بەراوردێ لە نێوان زمانی کوردیی و هەر دوو زمانەکەی دیکەدا بکا، ئەوا بۆی دەردەکەوێ: زمانی کوردیی، لە هەردوو زمانەکە، دەوڵەمەندتر، خاوێنتر و پاراوترە. ووشەی بیانیی کەمتر تێدایە. هەر چەندە کورد، خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆی نییە، لە ژێر باری ژێردەستیی و چەوساندنەوەی نەتەوەییدا دەناڵێنێ، سەرەڕای ئەو هەموو چەرمەسەرییەی کورد لە مێژوودا دیویێتی، کەچی، هێشتا دەتوانین، بە کوردییەکی پوخت بنووسین، بێ ئەوەی ووشەیەکی بیانیی بەکاربێنین. بەڵام، کارێکی هێندە ئاسان نییە، فارسێ یا تورکێ، تەنانەت نامەیەکیش بە فارسیی یا بە تورکیی بنووسێ، بێ ئەوەی پەنا بۆ بەر زمانێکی دیکە نەبا. هەر بۆیە « حاجی قادر »، تەنانەت لەو سەردەمەشدا گوتوویەتی :

شەبیهی جۆڵا کە ڕازی نەبێ بە سەر دڕی خۆی
مەڵێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا
بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەصوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها
کە خۆتی تێ نەگەیەنی، لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵێی هەمووی هەزەیانە خودا بەڵای لێ دا
بەڵام ئەوانی کە صەڕرافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شەهـ ڕەوانی دەزانن. چ سککەییێکە ڕەوا «37،45»

هەر وەک د. « نەبەز »یش گوتی: لە ڕاستیدا، ئەزیش ناتوانم، بڵێم: زمانەکەمان زۆر دەوڵەمەندە. لەبەرئەوەی، بۆ هەر شتێ چەن ووشەیەکمان هەیە. لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ بۆچوونەکەی ئەویشدا نیم. چونکە ناتوانم، بڵێم: زمانەکەمان هێندەش هەژارە، زۆر ووشەمان نییە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، زمانی کوردیی، لە هەر دوو زمانی « فارسیی و تورکیی» ، گەلێ باشتر، جوانتر، شیرینتر، ڕەوانتر، پوخت و پاراوترە.
هەژاریی و دەوڵەمەندیی زمانێکی دیاریکراویش، تا ئەندازەیەکی زۆر،

پێوەندیی بەوەوە نییە، ئەو زمانە تا چەن پێویستی بە ووشەی بیانیی هەیە. یا تا چەن، لە هێندێ ووشەی زانستانەدا هەژارە و نییەتی. چونکە، لە لایەکەوە، پێشکەوتووترین زمانی جیهان، لە ووشەی بیانیی بە دەر نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەموو زمانێ، لە ووشەی زانستانەدا تا ئەندازەیەک کۆڵەوارە، ناچاردەبێ، ئەو ووشانە، لەو زمانە ڕەسەنانەوە وەرگرێ، کە دایانهێناون. وەک پرۆفیسۆر «کوردۆییف»یش، دەڵێ:

وەنەبێ، دەوڵەمەندیی زمانی کوردیی، بە هۆی ووشەی بێگانەوە بێ، بەڵکوو بە هۆی دروسبوونی ناوخۆی خۆیەتی.)«102،78» واتە: زمانەکەمان لە ڕووی هەڵکەوتی ناوخۆوە، بە زمانێکی دەوڵەمەن دادەنرێ.

گەر پێوانەی دەوڵەمەندیی زمانێ، تەنیا ئەوەبێ، بە لانی کەمەوە، بۆ هەر شتێ ووشەیەکی تایبەتی هەبێ، ئەوا گەلێ لە زمانە مردووەکانی جیهانیش، ئەو خەسڵەتەیان تێدا نییە. چونکە، گەلەکانیان لە بندەسی دەوڵەتە داگیرکەرەکاندا بوون، ماوەی ئەوەیان نەبووە، ڕاژەی زمانەکەی خۆیان بکەن. بۆیە بەو شێوەیە، لە کاروانی ژیار و شارستانیی، گەلانی دیکەی سەر زەویی بەجێماون، لە ئاستی گۆڕانکاریی و پێشکەوتنە زانستیی و تەکنۆلۆژییەکاندا نین.

لەبەرئەوە، ناچاردەبن، ئەو ووشانەی لە زمانەکەیاندا دەس ناکەون، لە زمانەکانی دیکەی گەلانی دەرودراوسێ و دووری جیهانەوە وەریانگرن. هەمووشمان دەزانین، ئەم بارە لە کوردستاندا، تا ئەورۆش هەر بەردەوامە. بۆیە، کورد سەری نەپەرژاوە، بە تەواویی ڕاژەی زمانەکەی خۆی بکا، لە ووشەی بیانیی بژاریکا، ووشەی ڕەسەنی کوردیی بەکاربێنێ، ئەو ووشانەشی نییەتی، بەپێی توانا و بە شێوەیەکی زانستانە داینتاشێ، بە مەرجێ لەگەڵ خەسڵەتی زمانەکەیدا بگونجێ. یا لە زمانەکانی دیکەوە بیانخوازێ و بیانگونجێنێ. ئەمەش، هەر لە زمانی کوردیی ڕووی نەدواوە، هەر لە تەتەوەی کورد نەقەوماوە، بەڵکوو، زۆربەی زۆری زمانە مردووەکانی، گەلانی جیهانی گرتۆتەوە. لەبەرئەوە، گەر بۆ هێندێ شت، ووشەیەکمان لێ قاتدەبێ، بە تایبەتیی، لە بواری زانستدا، بە تەواویی ماڵوێرانین. ئەوا لە هەمان کاتدا، بۆ هێندێ شتی دیکە، چەن ووشەیەکمان

هەیە، کە هەر یەکێ لەو ووشانە، لە یەکێ لە دیالێکت و خواردیالێکتەکانی زمانی کوردیدا بەکاردێنرێن و هەموویان کوردیی پەتین. بەلام، زۆرم سەیر لێدێ، لە کاتێکدا، ئەو ووشە خۆمالیانەمان هەیە، کەچی، هێندێ « ڕووناکبیر، خوێندەوار و نووسەر »، لە نووسینەکانیاندا ووشەی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » بەکاردێنن. کەواتە، ئایا دەبێ، چ جۆرە جیاوازییەکی هەبێ، گەر ووشەیەکی کوردیی ڕەسەن و پەتیمان، بۆ کەرەسەیەکی دیاریکراو نەبێ، ووشەکە لە زمانی عەرەبییەوە نەخوازین، بەلکوو، لە زمانی فارسییەوە وەرگرین؟ بۆ نموونە: گەر هێندێ نووسەری کورد، بە ووشەی « پێنووس » قایل نەبن، ووشەی « قەلەم »یش بە عەرەبیی بزانن، بۆچی دەبێ، ووشەی « خامە »ی فارسیی لە نووسیندا بەکاربێنن؟ گەر « پێنووس »ی کوردیمان هەبێ، ئیدی بۆ دەبێ، « قەلەم »ی عەرەبیی و « خامە »ی فارسیی بەکاربێنین؟

« هێمن »، خۆی یەکێ لەوانە بوو، ڕەخنەی لەو نووسەرانە دەگرت، کە لە بری قەلەم « خامە »ی فارسیی بەکاردێنن. کەچی، خۆی لە « تاریک و ڕوون »دا، لە هۆنراوەی « ڕۆژگاری ڕەش »دا دەلێ :

داخرا دەرکی ڕۆژنامە
شکاون نووکی خامە
کوردی نووستن حەرامە
دوژمن دەلێ بێ تامە «97،121»

هەلبەتە، ئەمە وەک نوکتەکەی « شێخ ڕەزا » وایە. جارێکیان یەکێ لە دەرگا دەدا. شێخ ڕەزا دەپرسێ : کێیە؟ ئەویش دەلێ : بیکەوە منم. شێخ ڕەزاش دەلێ: کێر بە قوزی ژنم. ژنەکەشی هاواردەکا و دەلێ: ئەیەڕۆ! پیاوەکە، ئەوە تۆ دەلێی چی؟ ئەویش دەلێ: خۆ لەبەر خاتری ئەو کوزە بۆگەنەی تۆ، کێش و سەرەوای هۆنراوەکەی خۆم تێک نادەم!

هەروەها، کە « ژن، خوێندکار و پەککەوتە »ی کوردیمان هەبێ، بۆ دەبێ، « ئافرەت، قوتابی و سەقەت » لە « عورەت، کتابی و سەقەط »ی عەرەبییەوە بخوازین. جێی داخە، « پارتیی و یەکێتیی »، هەر لەبەرئەوەی ڕێکخراوە خوێندکارەکانیان لە یەکدی جیاکەنەوە، بۆ ناوی

ڕێکخراوەکانیان، پارتی « قوتابیان » و یەکێتیی « خوێندکاران »
بەکاردێنن، کە هەر دووکیان یەک شت دەگەیەنن. ئەو ڕێکخراوانە، هەر
بەوەش قایل نابن، ڕاژەی زمانی کوردیی ناکەن، ئەو ڕێکخراوانە نەک هەر
کورد دەکوژن و کوردستان وێراندەکەن، بەڵکوو زمانەکەشمان لێ دەشێوێنن!
هەروەها، گەر چەن ووشەیەکمان، بۆ یەک شت هەبێ، بۆ یەکێ لەو ووشانە
بەکار نەهێنین و بە دوای ووشەیەکی دیکەی، یەکێ لە زمانە دراوسێکانماندا
بگەڕێین. « بەلەم، کەشتیی، پاپۆڕ، گەمێ »ی کوردیمان هەیە، کەچی،
هێندێ کەس هەر « باخرە »ی عەرەبیی بەکاردێنن. « زۆر، گەلێ، فرە »ی
کوردیمان هەیە، کەچی، هێندێ کورد، « خەیلی » فارسیی بەکاردێنن.
یا وەک « هێمن » دەڵێ: (ئێمە نابێ، گوێ بدەینە شۆڤێنیستەکانی فارسی،
کە دەڵێن: کوردیی شێوەیەکی فارسییە. بۆ خۆمان دەزانین، زمانەکەمان
زمانێکی سەربەخۆیە و ناترسین و نایشارینەوە، کە خزمایەتی وە تەک
فارسیشدا هەیە. زۆر باش دەتوانین، ووشەی فارسیی وەرگرین، وەک ئەوان
کە لە وەرگرتنی ووشەی کوردیی و هیچ زمانێکی دیکە سڵ ناکەن. بەڵام
هەق نییە، لە باتی ووشەی مەزن، گەورە، زەلام، زل، ووشەی " بزرگ "ی
فارسیی بنووسین، یا لە جیاتی جوان، چەلەنگ، دەلال و شەنگی خۆمان،
ووشەی " قشنگ " لەکاربێنین، کە تورک و فارسی کێشەیان لە سەر
هەیە.)«28،122»
جگە لەوەی، هێندێ نووسەر، دڵیان ئاو ناخواتەوە، گەر هەر هیچ نەبێ،
«پیتێ، ووشەیە یا بەشێکی پچووک لە ووشەکە »، لە زمانێکی بیانییەوە
نەخوازن و لەگەڵ ووشە کوردییەکاندا تێکەڵی نەکەن. تەنانەت، هێندێ لە
نووسەران، « پێشگر و پاشگر »ەکانیش، لە زمانی نەتەوە باڵادەسەکانی
کوردستانەوە دەخوازن و لە زمانەکەماندا بەکاریدێنن. (ئێمە بـــۆ مانای
« نەرێنی »، « بێ »مان هەیە. بۆ « بەکەڵک ، بێکەڵک، بەشەرەف،
بێشەرەف، بەدەماغ، بێدەماغ » کەچی نابەرپرسیارانە پاشکۆی « سز »
بەکاردێنن و دەنووسن « شەرفەسز، دەماغسز و ... تاد » تەنانەت،
پاشگری « امیز »ی فارسیش دەبێتە « خۆشئامێز، دڵئامێز و .. تاد »
بێجگە لە بەکارهێنانی سەدان ووشەی زۆر زەقی فارسیی وەکوو « میهر،

شکستە، پژموردە، بیمارستان، خەستەخانە و ... تاد »؛«8،5»
هێندێ نووسەری دیکە، ووشەی « بەیاز » بەکاردێنن، کە لە ووشەی «بەیاض »ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. گەر، ووشەیەک لە زمانی کوردیدا نەبێ، دەکرێ، ئەو ووشەیە لە هەر زمانێکەوە بخوازین، لە نێو دوو کەوانەدا داینێین. بەڵام، بەرانبەر ووشەی « بەیاز »ی عەرەبیی، ووشەی «پاکنووس »ی کوردیمان هەیە. ئیدی بۆچی، زمانەکەمان بە پاکیی ڕانەگرین و بە ووشەی بیانیی بیشاخنین؟!! جا سەیر ئەوەیە، هەر لەبەرئەوەی چەند نووسەێکی وەک بنەماڵەی « مودەڕیسی و مەسعوود محەمەد » ، ئەو ووشەیە بەکاردێنن، هێندێ نووسەری لاویش، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، دووبارە بەکاریدێننەوە!
هێندێ نووسەر هەن، لە نووسینیشدا، جگە لەوەی ووشەی « کوردیی و عەرەبیی » تێکەڵدەکەن، هەر هەمووشیان یەک واتایان هەیە. بۆ نموونە: « مستەفا عەسکەری » لە پێشەکی دیوانی ئەسیریدا دەنووسێ: (ناچار بووم ـ منی نەشارەزا لە وێژە و ئەدەب و شیعردا ـ ببمە سەرپاڵەی ئەم درەوە ...)«7،53» دیارە، وێژە کوردییە و ئەدەب عەرەبییە. شیعریش بە لقێکی وێژە دادەنرێ. لەبەرئەوە، پێویست ناکا، بۆ یەک مەبەس، سێ ووشە بەکاربێنن. بەڵکوو، تەنیا دەتوانین، ووشەی وێژە بەکاربێنین و بڵێین: منی نەشارەزا لە وێژەدا. یا منی نەشارەزا لە هۆنراوەدا.
« ڕووناکبیر، نووسەر و هۆنەرەکانی کورد » ، لە سەرەتای ساڵەکانی بیست تا سیەکانیش، پتر بە کوردییەکی تێکەڵاوی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » دەیاننووسی. بەڵام، وردەوردە، ئەو جۆرە نووسینانە کزبوون، زمانی کوردیی لە ووشەی بیانیی بژارکرا. بە تایبەتیی، لەو سەردەمەدا، خوارووی کوردستان، لە ژێردەسی « بریتانیا »دا بوو، زمانی کوردیی بوژاندنەوەیەکی بە خۆیەوە دی. جوڵانەوەیەکی لەبەرچاوی مەزن، لە لایەن « ئینگلیز » ەکانەوە، لە «پێشکەوتن، گەشەسەندنی زمانی کوردیی و چالاکیی ڕۆژنامەگەریدا » دەسیپێکرد. ڕۆژنامەی « پێشکەوتن » ، لەو سەردمەدا لە لایەن چەن خوێندەوار و بە پاڵپشتی ئینگلیزەکان دەردەچوو، ڕۆڵێکی لەو جوڵانەوەیەدا وازیکرد. ئەوە بوو، پێشبرکێیەک لە سەر

نووسینی کوردیی پەتیی ڕاگەیەنرا. هێندێ نووسەر و هۆنەر بەشدارییان تێداکرد. هێندێکیشیان وەک:(« شێخ نووری شێخ صالح و جەمیل سائیب و مستەفا سائیب » دەرچوون. « پیرەمێرد »ی ڕەحمەتیش هەر شیعری «بەیانیی بوو لە خەو هەڵسام »ەکەی هەر بە هەوای ئەو موسابەقەیەوە دوای چەندساڵێک نووسیی، لەو ڕۆژگارەوە مەسەلەی بە کوردیی پەتیی نووسین و بژارکردنی زمانی کوردیی، لە ووشەی بێگانە سەریهەڵدا و بایەخی پێدرا.)«47،29 »

دوای ئەوەی «گۆران » لە هۆنراوەگوتنندا، بە تەواویی ناویدەرکرد و جڵەوی پێشڕەوێتی هۆنراوەی کوردیی وەرگرت، ئیدی لەو کاتەوە، ئاڵای کوردیی پەتی نووسین و بژارکردنی زمانی کوردیی لە ووشەی بیانیی هەڵکرد. ئەم مێژووەش بۆ ساڵی «1932» دەگەڕێتەوە،(ئیتر لەوە بە دواوە، بەکارهێنانی ووشەی کوردیی پەتیی و بژارکردنی ووشەی بێگانە لە شیعردا، وەک هونەرێک و داهێنانێک، بۆ « گۆران » دەگەڕێتەوە)«49،29 »

هێندێ نووسەر، لە نووسین و بەرهەمە وێژەییەکانی خۆیاندا، زاراوەی «شیعر و شاعیر »ی عەرەبیی بەکاردێنێن. کەچی، هەر لە هەمان نووسیندا، بە کوردیش، تاوێ « هۆنراوە » و تاوێکی دیکەش، « هەڵبەست » دەنووسن. ئەز پێموایە، پێویستە، بۆ « شیعر » یەکێ لەم زاراوانە « هۆنراوە یا هەڵبەست » و بۆ « شاعیر »یش، « هۆنەر یا هەڵبەستەوان » هەڵبژێرین، بۆ ئەوەی، لە نووسینەکانماندا تەنیا یەکێکیان بەکاربێنین. چونکە ناکرێ، جارێ بە عەرەبیی و جارێ بە کوردیی بنووسین، یا هەر دوو ووشە کوردییەکە « هۆنراوە و هەڵبەست » پێکەوە بنووسین. بۆیە، تا نووسەر بە یەک ڕێنووسی یەکگرتوو، بە یەک چەشنە زاراوەی دیاریکراو بنووسێ، نووسینەکەی گەلێ ڕاستتر، جوانتر، ڕەوانتر، شیرینتر و دڵگیرتر دەبێ.

بە کورتییەکەی، گەر زمانێکی دیاریکراو، خاوەنی ووشەی زۆر و ڕێزمانێکی تایبەتیی خۆی بوو، ئەوا هیچ جۆرە مەترسییەک بۆ سەر ئەو زمانە نییە و نابێ. تەنانەت، گەر چەندین ووشەی بیانیی، لە زمانە جیاجیاکانی نەتەوەکانی جیهانەوە، تێکەڵ بە زمانەکەشیان بێ. چونکە، بە

شێوەیەکی گشتیی،(گرنگیی زمان لە چۆنێتی ڕێزمان و ووشەکانی زمان دایە.)«102،78» نەک لەوەدابێ، تا چەن ووشەی بیانیی، تێکەڵی ئەو زمانە بووە.
هەر چەندە، ووشەی بیانیی ناتوانێ، کار لە تایبەتمەندیی هیچ جۆرە زمانێ بکا، زمانەکە بگۆڕێ، یا ڕێزمان و ووشەکانی زمان تێکدا. بەڵام، هەر چۆنێبێ، زمان تا لە ووشەی بیانیی خاوێنکرێتەوە، تا پاک ڕاگیرێ، تا ڕاژەکرێ، هێندەی دیکە زمانەکە دەبوژێنێتەوە، شیرینتر، گەشاوەتر، جوانتر دەبێ و پێشدەکەوێ.
لەگەڵ ئەم ڕاستییانەشدا دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵدەین، زمانەکەمان لە ووشەی بیانیی بژارکەین. چونکە، گەر ئەم کارە نەکەین، هەر بڵێین: تازە ئەو ووشانە کوردێنراون، وەک ئەوە وایە، بڵێین: لە مێژە کورد لەگەڵ « فارس، عەرەب و تورک »دا تێکەڵاوبوون، لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا پێکەوە دەژین، تازە پێکەوە ڕاهاتوون، ئیدی سەری خۆمان بۆ بیەشێنین، داوای ماف و دەوڵەت بکەین؟

## 8/ ئیدیـــــــۆم :

لە زمانی کوردیدا، بە تایبەتیی لە لقەدیالێکتی سولەیمانیدا، هێندێ ووشەی ئاوێتە هەن، لە دوو ووشەی جیاواز یا پتر پێکهاتوون، بە هەر دووکیان یا بە هەموویان یەک واتا دەبەخشن. لە زانستی زماندا و بە زاراوەی زمانەوانیی، بەم جۆرە ووشانە دەگوترێ:« ئیدیۆم یا فریزیۆلۆژی» .
هێندێ لە نووسەر و شارەزایانی زمانی کوردیی، وەک:« د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، د. نەسرین فەخری، عەزیز گەردیی و جەلال مەحموود عەلی ... تاد » ، لە بەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی، لە دووتوێی پەرتووکەکاندا هەن، پێناسەی جیاجیان بۆ ئیدیۆم کردووە. بۆ نموونە: د. ئەوڕەحمان دەڵێ: ئیدیۆم(پێکهاتنێکی تایبەتیی و ئاڵۆزە، کە لە یەکگرتنی هەندێ ووشە ، واتایەکی تایبەتیی پەیدادەبێ، کە لە مانادا لە ووشە نزیکدەبێتەوە) .
هەروەها ، د. نەسرین دەڵێ:(ئەوەیە کە ڕاستەوڕاست ناوی شتێ نەبەی، بەڵکوو ناوی شتێکی تر ببەی، کە پەیوەندیی بە مانای یەکەمەوە هەبێ، بۆ ئەوەی پیاو لە مانا باسکراوەکە، بۆ مانا مەبەستە هێمابۆکراوەکە بچێ) .

مامۆستا گەردییش دەڵێ: (ئەوەیە وشەیەک یان دەستە وشەیەک بێنی، کە واتایەکی دروستی خۆی هەبێ، هەر لەو کاتەدا، لە ڕستەکەدا مانایەکی تر بدا بە دەستەوە و مەبەست ئەم مانایەی دوایی یە بێ، دیسان دەشێ واتا دروست و نەژادییەکەت مەبەست بێ) «115،71،20،6 ـ 16».

گەر سەرنجێکی ورد، لەو سێ پێناسەیەی سەرەوە بدەین، دەبینین: هەرسێکیان لە ناوەڕۆکدا، لە یەکدییەوە نزیکن و بۆ یەک مەبەسی دیاریکراوی تایبەتیی گوتراون. لەبەرئەوە، لە بەر ڕووناکایی ئەو پێناسانەدا دەتوانین، پێناسەیەکی گشتیی و ئاسانتر دیاریکەین، تا خوێنەری کورد، بە باشی لە پێناسەی ئیدیۆم بگا. ئیدیۆم : لە دوو ووشەی وەک یەک، یا جیاواز، یا لە کۆمەڵێ ووشەی پێکەوە گونجاو، یا ڕستەیەک یا پتر پێکدێ، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، هەموویان یەک واتا دەبەخشن.

ئەز پێموایە، ئەو ئیدیۆمانە، هەروا بە خۆڕایی دروس نەبوون، بەڵکوو، چەن فاکتەرێکی جیاواز، کاری لە « پلەی یەکگرتن، جۆری پێکهێنان و شێوازی دابەشکردن »یان کردووە. لێرەدا دەتوانین، ئەو فاکتەرانە، بەم سێ خاڵەی لای خوارەوە دەسنیشانکەین :

1. پلەی یەکگرتن و پێکەوە نووساندنی ووشەکان.
2. پێوەندیی نێوان ووشە جیاجیاکان لە ڕووی واتاوە.
3. کام ووشە لەو ووشانە، پتر ڕۆڵی سەرەکیی لە پێکهێنانی ئیدیۆمەکەدا وازیدەکا.

لە بەر ڕۆشنایی ئەم خالانەی سەرەوەدا، د. « ئەوڕەحمان »، ئیدیۆمەکانی زمانی کوردیی، بە سەر سێ دەستەدا دابەشدەکا، فریزیۆلیژی « تێکچرژاو، یەکگرتوو و تێکئالاو ».

دیارە، ئەو سێ جۆرە، بە هەرسێکیان ئیدیۆم پێکدێنن. بەڵام، لە ژمارە و جۆری ووشەکاندا، جیاوازییان هەیە. ئەوەی ئێمە لێرەدا، بۆ باسەکەمان کەڵکی لێ دەبینین و زۆر مەبەسمانە، جۆری یەکەم و دووەمە.

ئیدیۆمی تێکچرژاو: (ئەوانەن کە مانای گشتییان بە هیچ جۆرێ، بەند نییە بە مانای ئەو وشانەوە کە پێکیانهێناوە، بەڵکوو، بەشێ لە ئیدیۆمەکە

بریتییە، لە ووشەیەک کە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆی نییە، وەک «شت و مت، گوڵ و موڵ، گێژ و وێژ، هاتەران و پاتەران ... هتد » واتە: بۆیە بونەتە ئیدیۆم، پێکەوە هاتوون و یەکێکیان هیچ واتایەک نابەخشێ و بە هۆی ئەوەوە بە ئیدیۆم دەناسرێن و واتای ئیدیۆمەکەش ئاشکرایە.)
«19،6»

بەپێی ئەو نموونانەی، د. « ئەورەحمان »، لێرەدا پێش چاوی خستوون، پێناسەی ئیدیۆمی تێکچرژاو، زۆر لە شوێنی خۆیدا نییە. چونکە، بە باوەڕی من، ئیدیۆمە تێکچرژاوەکان، لە ڕووکەشدا، لە دوو ووشەی جیاواز پێکدێن. بەڵام، لە واتادا، هەر دوو ووشەکە چوونیەکن. یەکەمیان ـ ڕۆڵی سەرەکیی دەبینێ، دووەمیشیان ـ وەک پاشکۆیەک وایە و دووبارەدەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە هەر دووکیان یەک واتا دەبەخشن. وەک:« هەژارونەدارا، پاکوخاوێن، بەرێزوهێژا، ئیشوکار، ئازیزوخۆشەویست ... تاد ». ئەم جۆرە ئیدیۆمانە، گەر پێکەوە بن، یا جیاکرێنەوە، هەر یەک واتا دەبەخشن. بۆ نموونە: ئیدیۆمی « ئیشوکار »، لە دوو ووشەی ڕووخسار جیاوازی وەک « ئیش » و « کار » پێکهاتووە. بەڵام، هەر دووکیان یەک واتایان هەیە. گەر پێکەوە بن، یا بە جیا بن، وەک « ئیش » یا « کار »، هەر هەمان واتا دەبەخشن. گەر هەر دووکیان پێکەوە بوون، دەبێ، پێکیشەوە بنووسرێن. بەڵام، باشتروایە، هەر یەکێکیان بەکاربێنرێ، بە جیاجیا بنووسرێن، وەک: « ئیش »، « کار ». لە هێندێ فریزی دیکەدا، بە هەر دوو ووشەکە، یەک واتا دەبەخشن. لەبەرئەوە، مرۆڤ ناتوانێ، لە یەکدییان جیاکاتەوە و بە جیاجیا بەکاریانبێنێ. چونکە، گەر جیایانکەینەوە، ووشەی یەکەم ـ لە ئیدیۆمەکەدا، هەر هەمان واتای هەیە. بەڵام، ووشەی دووەم ـ یا واتا نابەخشێ، یا واتایەکی دیکەی جیاواز دەبەخشێ. لەبەرئەوە دەبێ، پێکەوە بەکاریانبێنین، چونکە، بە هەر دووکیان یەک واتا دەبەخشن. ئەو کاتە دەبێ، بەسەریەکەوە بنووسرێن. وەک:« چیاوچۆڵ، تەپوتۆز، توندوتۆڵ، خڕوخۆڵ .. تاد » بۆ نموونە: ئیدیۆمی « چیاوچۆڵ »، پێکەوە بە مەبەسی «شاخ » بەکاردێنرێ. کەچی، گەر جیایانکەینەوە، « چیا » هەر هەمان

واتا دەگەیەنێ، « چۆڵ »یش واتایەکی دیکەی هەیە. هەروەها، هەر سێ فریزی « تەپوتۆز، توندوتۆڵ و خڕوخۆڵ »، پێکەوە یەک واتا بەدەسەوەدەدەن. بەڵام، گەر جیایانکەینەوە، « تۆز، توند و خڕ » واتای تایبەتیی خۆیان دەبەخشن، کەچی، « تەپ و تۆڵ »، بە تەنیا واتایەکی ئەوتۆ نابەخشن، بۆ ئەو مەبەسانە بەکار نایەن، بۆیە لەگەڵ « تۆز و تۆڵ »دا لێکدراون. هەر چەندە، هێندێ پێیان وایە، « تەپ » لەوەوە هاتووە، کاتێ شتێ دەتەکێنی، تەپەی دێ و تۆزی لێ بەرزدەبێتەوە. بەڵام، « تۆز » بە تەنیا واتای خۆی هەیە، ووشەیەکی عەرەبییە، واتای گەردیلە پچووکەکانی خۆڵ دەگەیەنێ.

لە هەمان کاتدا، هێندێ ووشەی دیکە هەن، گەر پێکەوە بەکاربێنرێن، یەک واتا دەبەخشن. بەڵام، گەر بە جیا بەکاربێنرێن، دوو واتای جیاواز بە دەسەوەدەدەن. بۆیە، چۆن دەتوانین، پێکەوە بەکاریانبێنین، هەر بەو چەشنەش دەتوانین، بە تەنیا بەکاریانبێنین. وەک « دووررودرێژ ». گەر پێکەوە بەکاریبێنین، دەڵێین: ڕێگایەکی دووررودرێژە. بەسەرهاتێکی دووررودرێژە. بەڵام، گەر بە تەنیا بەکاریانبێنین، هەر یەکەیان بۆ مەبەسێکی دیاریکراو بەکاردێنرێن. بۆ نموونە: ووشەی « دوور » بۆ ماوە بەکاردێنرێ، وەک: ڕێگەیەکی دوورە. ماڵەکەیان لێرەوە زۆر دوورە. من و تۆ لە یەکدییەوە زۆر دوور نین. هەروەها، ووشەی « درێژ »یش بۆ ماوە بەکاردێنرێ وەک: ڕێگەیەکی درێژە. بۆ پێوان بەکاردێنرێ، وەک: بەرێز درێژە، واتا کەڵەگەتە. ئەو مێزە درێژە. هەروەها، بۆ کاتیش بەکاردێنرێ، وەک: ئەوە چیرۆکێکی درێژە، زۆر دەخایەنێ. ئەو فیلمە درێژە.

لێرەدا دەتوانین، بڵێین: ئەو دوو نموونەیەی مامۆستاش هێناویتییەوە، وەک: «شت و مت، گوڵ و موڵ »، بڕوا ناکەم، لە خانەی فریزدا پۆلێنکرێن. چونکە، مەرجەکانی فریزیان تێدا نییە. بەڵکوو، لە لقەدیالێکتی سولەیمانیدا، ئەو شتانە زۆر بەکاردێنرێن. بۆ زۆربەی شتەکان، پیتی یەکەمی لادەبەن، لە بری ئەوە پیتی « م »ی پێوە دەلکێنن، کە هیچ واتایەک نابەخشێ. بەڵکوو، بە هەڵە لە زمانی کوردیدا بەکارهێنراوە و بەکاریشدێنرێ. هەر چەندە، زیاتر لە زمانی ئاخافتن و زۆر بە کەمیش لە

زمـانی نووسـیندا بەکـاردێنرێ، بەڵام، تازە ئەو هەڵەیە ڕۆشـتـووە، وای لێهاتووە، جێگەی خۆی گرتووە. جا گەر بەو شێوەیەبێ، جگە لەو ووشانەی بە پیتی « م » دەسپێدەکەن، ووشە نییە، لە زمانی کوردیدا فریزی نەبێ، تەنانەت، ناوی « مرۆڤ، ئاژەڵ، پەلەوەڕ و ڕووەک »یش، لە بەر ڕۆشنایی ئەو دوو نموونەیەی مـامۆستـادا، فریزی تایبەتییان دەبێ، وەک: «عەلی و مەلی، سەگ و مەگ، کەڵەشێر و مەڵەشێر، گەنم و مەنم ... تاد »، کە ئەوە خۆی لە خۆیدا هەڵەیە، نە کەس لە ئاخافتندا عەلی ناوێ بە عەلی و مەلی بانگدەکا، نە لە نووسینیشدا بەکاریدێنێ.

دەربارەی فریزی یەککرتووش، د. « ئەوڕەحمان »دەڵێ:(ئەوەیە، کە مانای لە ڕێگەی سەرپاکی ئەو وشانەوە پێکیانهێناوە، ئاشکرا دەبێ، بەشی هەرە زۆری ئیدیۆمی کوردیش، لە بەشی یەککرتوودا دادەنرێ، وەک: زمـاندرێژ، سەرسەخت ... هتد.)«21،6»

لە بەر تیشکی، ئەو زانیارییانەی سەرەوەدا دەتوانین، چەن شتێ دەربارەی چۆنێتی پێکهاتنی ئیدیۆمە کوردییەکان ڕوونکەینەوە :

هێندێ ئیدیۆم هەن، بێ ئەوەی هیچ جۆرە ئامرازێکی پێوەندیی یا لێکدەر پێکیـانەوە ببـەسێ، لە دوو ووشـەی چوونیـەک پێکدێن و دووبارەدەبنەوە. وەک:« هاتـهـات، تێـرتێـر، تـکتـک، تـوێتـوێ، جـارجـار، توولـتـوولێن، توێتوێین، بڕبڕ، بزڕبزڕ... تاد ».

هێندێکی دیکە لەو ئیـدیۆمانە، بە هۆی هێندێ لە ئامـرازەکانی پێوەندیی وەک: « بە، ە ، لە »ەوە گـــرێدەدرێن. بۆ نموونە:« بووکـــەبەبارانێ، پشتبەپشت، شاخبەشاخ، پایزەبرا، باعەباع، جووکەجووک، دەسلەدەس، سەدلەسەد، چاولەدەر ... تاد ».

هەروەها، هێندێکی دیکەشـیـان، بە هۆی ئامـرازی لێکدەری « و »ەوە پێکەوە دەبەسرێن. وەک:« ڕێکوپێک، هیچوپوچ، بەژنوباڵا... تاد ».

ئەو ئیـدیۆمـانەی بە هۆی ئامـرازەکـانی پێوەندیی و لێکدەرەوە دروسدەبن، زیاتر خۆیان لە خانەی فریزی « تێکچرژاو »دا دەبینن.

لە هەمـان کـاتیـشـدا، هێندێ ئیـدیۆمی دیکەمـان هەیە، دووبارە نـابنەوە و هیـچ جـۆرە ئـامـرازێکی پێـوەندیی یا لـێکدەریشی تێـدا بەکـارنـاهێنرێ.

بەڵکوو، دوو ووشەی سەربەخۆ و جیاواز یەکدەگرن، لە ئەنجامدا ئەو ئیدیۆمانە دروسدەکەن. یەکەمیان ـ زیاتر بە شێوەی ناو دێ، دووەمیشیان ـ باسی خەسڵەتێکی دیاریکراوی ئەو ناوە یا ئەو شتە دەکا. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر دووکیان پێکەوە یەک واتا بەدەسەوەدەدەن. لە هەمان کاتیشدا، گەر جیایانکەینەوە، هەر یەکەیان بە جیا واتایەکی تایبەتیی خۆی دەبێ. وەک:«ملدرێژ، کەواسوور، ورگدڕاو، سمێڵفش، قنگقەویلە ». ئەم جۆرەشیان، پتر لە ئیدیۆمی « یەککگرتوو »دا جێگەی خۆی دەگرێ. کەواتە دەتوانین، بڵێین: زۆربەی زۆری ئیدیۆمەکانی زمانی کوردیی، بە پلەی یەکەم، لە جۆری دووەم « یەککگرتوو »، بە پلەی دووەم لە جۆری یەکەم «تێکچرژاو » و پاشان لە جۆری سێیەم « تێکئاڵاو » پێکهاتوون.

ئیدیۆم، لە زمانی کوردییدا، لە شێوازی جیاوازجیاوازدا خۆیان دەنوێنن. هێندێکیان بۆ ناو بەکاردێنرێن، وەک ناوی « مرۆڤ، ئاژەڵ، پەلەوەر، ڕووەک، شوێن، ڕێگە و شتومەک ». بۆ نموونە:« باووباپیران، جروجانەوەر، تەرەتۆڵەکە، قازوقولنگ، دارودەوەن، خاکوخۆڵ، ڕێگەوبان، کەلوپەل ... تاد ». هێندێکی دیکەیان، پێوەندییان بە ئەندامەکانی « جەستەی مرۆڤ، لەشی ئاژەڵ و بەشە جیاوازەکانی ڕووەک »ەوە هەیە، وەک « سەر، ناوچەوان، چاو، دەم، زمان، لووت، سمێڵ، ڕیش، شان، مل، پشت، دەست، پێ، کلک، شاخ، لمۆز، باڵ، دەنووک، ڕەگ، قەد، لق، چڵ، گەلا... تاد ». هێندێکی دیکەیان، پێوەندییان بە دەنگەوە هەیە، وەک دەنگی « مرۆڤ، ئاژەڵ، پەلەوەر، با، ئاو، هەور، کەرەسەی تەقەمەنیی ». بۆ نموونە: « پرخەپرخ، باعەباع، جوکەجووک، وژەوژ، خوڕەخوڕ، شریخوهووڕ ... تاد ». هێندێکی دیکەشیان، باسی خەسڵەتێکی تایبەتیی « کەسێ، شوێنێ، ناوێ یا شتێکی دیاریکراوی تایبەتیی دیکە » دەکەن. وەک: « پۆشتەوپەرداخ، تروفیز، سەرەولێژ، بۆنوبەرامە، لەتلەت ... تاد ».

بەپێی مەبەسی بەکارهێنانیان، بە سەر چەن گروپێکدا دابەشدەکرێن :

1. ئەو ئیدیۆمانەی، یەک واتا دەبەخشن. وەک:« پاکوخاوێن، باخوباخات، باعەباع ... تاد ».

2. ئەو ئیدیۆمانەی، پتر لە یەک واتایان هەیە. ئەم جۆرەیان پتر لە ئیدیۆمە

تێکئالاوەکاندا دەردەکەون. وەک « دووکەڵ لە ماڵی هەڵناسێ » واتە: مرۆڤێکی ڕەزیلە یا هەژارە.

3. ئیدیۆمە دژەکان. وەک « دەسپاک و دەسپیس، وەجاخڕوون و وەجاکوێر، تەمەندرێژ و تەمەنکورت ... تاد ».

4. ئیدیۆمە لە یەکچووەکان. وەک « لووتبەرز ـ ترزل، دەسکورت ـ هەژارونەدارا، درێژدادڕ ـ زۆربڵێ ... تاد ».

5. ئیدیۆمە کوورتەکان. لە دوو ووشە یا سێ ووشە پێکدێن. وەک «متومورروو، مانگەشەو، مانگابەکەڵ ... تاد ».

6. ئیدیۆمە درێژەکان. لە ڕستەیەک یا پتر پێکدێن. وەک « دەڵێی کەڵەشێری سەر بارە دارە. دار پوازی لە خۆی نەبێ، ناقلیشێ، دەڵێی سپڵی لا ورگە... تاد ».

7. هێندێ ئیدیۆمی دیکەش هەن، بە شێوەی هۆنراوە دەگوترێن. وەک : « ڕووبەڕوو دەمچەور، پاشملە دەمتەور ».

پێش ئەوەی چەن نموونەیەک بێنمەوە، بە پێویستی دەزانم، چەن خاڵێکی تایبەتیی ڕوونکەمەوە :

1/ دیارە، لەبەرئەوەی لە کۆنەوە، کوردستان داگیر و دابەشکراوە، بە هۆی ئەو تێکەڵاوییەی، لە نێوان کورد و نەتەوە باڵادەسەکانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەدا دروسبووە، شتێکی زۆر ئاسایی یە، زمانی ئەو نەتەوانە، کار لە یەکدی بکەن و جۆرە تێکەڵاوییەک لە نێوان زمانەکانیاندا پەیدابێ. بۆیە، لەم بوارەدا، هێندێ ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا دەبینین، لە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی »ەوە وەرگیراون، وەک « ئاخروئۆخر، ئاخرخێر، ئاخرشەڕ، ئاشقەوماشقە، بەلاشوحەلاش، ژەقنەمووت، سیاوەحش، قالوبەلا، قوزەڵقوورت، قەرەباڵغ، قەڵەباڵغ، ساڵتموئاڵتم، وارووێخ، ئیلانوبیلان، عورفوعادات، عەیاموزەمان، مەقاموەنزڵ، قالوقیل و ... تاد ». هەر چەندە، ئەم ئیدیۆمانە، بە شێوەیەکی بەرفراوان، ڕۆژانە لە نێو کۆمەلانی خەڵکیدا بەکاردێنرێن و تا ڕادەیەکی زۆر کوردێنراون، بەلام، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا کوردیی نین، ناتوانین، لە ڕیزی ئیدیۆمەکانی زمانی کوردیدا پۆلێنیانکەین.

2/ هێندێ کورد هەن، لە کاتی ئاخافتندا، دوو ووشەی « کوردیی - عەرەبیی یاعەرەبیی - کوردیی، کوردیی - فارسیی یا فارسیی - کوردیی، کوردیی - تورکیی یا تورکیی - کوردیی »پێکەوە بەکاردێنن، کە هەموویان یەک واتا دەبەخشن. بە باوەڕی من ناتوانین، ئەو جۆرە ووشە تێکەڵاوانەش، بە ئیدیۆمی کوردیی دانێین. چونکە، گەر بهاتایە، هەر دوو ووشەکە کوردیی یا عەرەبیی بوونایە، ئەو کاتە باسێکی دی بوو. بەڵام، لەبەرئەوەی هەر ووشەیە بۆ زمانێکی جیاواز دەگەڕێتەوە، لە هەمان کاتیشدا، یەک واتایان هەیە، بە ئیدیۆم دانانرێن. وەک:« ئازا و ڕەشید، بەختیاریی و سەعادەت، تالع و ناوچەوان، جیران و دراوسێ، چەک و سیلاح، حازر و بزر، حازرخۆر، حەرف و پیت، حەیا و ئابڕو، حەیا و شەرم دەنگ و سەدا، ڕەزیل و ڕیسوا، ڕۆح و گیان، ڕێز و ئیحتیرام، زاڵم و زۆردار، سحر و جادو، سڕ و تڕ، سەبر و ئارام، سەربەخۆیی و ئیستیقلال، شەرت و پەیمان، عالوسال، عاشق و دلدار، عاشقە و ماشقە، عەرشوقورش، عەشیرەت و خێڵ، عەشیرەت و هۆز، غەلوغەش، فەرق و جیاوازیی، فەقیر و هەژار، فیز و تەکەبور، قانون و یاسا، قەرار و بڕیار، مشکلە و گیروگرفت، مقدس و پیرۆز، ئەندێشە و خەیاڵ، هەق و ماف، یۆتۆپی و خەیاڵ، یەکپارچە و موتەحید، ... تاد ».

3/ ئەو ووشانەی لە زمانی کوردیدا پێچەوانەی یەکدین. هەر چەندە، بە جۆرێ لە جۆرەکانی ئیدیۆم دادەنرێن، بەڵام، لەبەرئەوەی، هەر یەکێکیان واتایەکی دیاریکراوی تایبەتیی خۆیان هەیە، نابێ پێکەوە بنووسرێن، بەڵکوو بەجیا دەنووسرێن و بەهۆی ئامرازی لێکدەری « و »ەوە پێکەوە گرێدەدرێن. وەک « ئازا و ترسنۆک، ئاو و ئاگر، باکوور و باشوور، بگرە و بەردە، بوون و نەبوون، بەرز و نزم، بەهەشت و دۆزەخ، بینا و نابینا، پاک و پیس، تاریک و ڕوون، تاڵ و شیرین، تایبەتیی و گشتیی، جوان و ناشیرین، جەنگ و ئاشتیی، خۆش و ناخۆش، خۆشەویستیی و ڕق، خوار و ڕێک، دۆست و دوژمن، دوور و نزیک، دیل و ئازاد، ڕاست و چەپ، ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا، ڕەش و سپی، زبر و لووس، زەوی و ئاسمان، ژیان و مردن، ژێر و ژوور، ژێر و سەر، سارد و گەرم، سەربان و بنبان، سەر و

خوار، سەروو و خواروو، قەڵەو و لاواز، کورت و درێژ، کەم و زۆر، گران و هەرزان، گەش و سیس، گەورە و پچووک، گێل و وریا، لاواز و بەهێز، لووتکە و بنار، مان و نەمان، مردن و ژیان، ناوەوە و دەرەوە، نەرم و ڕەق، نێر و مێ، هاتن و ڕۆیشتن، هەڵبەز و دابەز، هەڵگێڕ و داگێڕ، هێنان و بردن، ئەرێ و نەرێ... تاد ». چونکە، ئەمانە هیچیان سینۆنیم نین.

4/ باشتروایە، کاتێ دەپەیڤین یا دەنووسین، ووشە لەیەکچووەکانی «سینۆنیم » زمانی کوردیی، پێکەوە بەکار نەهێنین. چونکە، چ پێویستدەکا، گەر دوو ووشە یەک واتا ببەخشن، دووبارەکرێنەوە؟! وەک: « ئازادیی و سەربەستیی، ئازیز و خۆشەویست، بەڕێز و هێژا، پاک و خاوێن، خەبات و تێکۆشان، هیوا و ئاوات، ئیش و کار... تاد ».

5/ بەڵام نابێ، ئەوەشمان بیرچێ، جۆرێکی دیکە ووشەمان هەن، یەک واتا دەبەخشن. ئەو ووشانە بە « سینۆنیم » ناودەبرێن. دیارە، سینۆنیمەکان لەگەڵ ئەو ووشانەدا، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. چونکە، سینۆنیم تەنیا لە ڕوخساری هەر دوو ووشەکەدا وەک یەک نین، ئەگینا لە واتادا هەر دووکیان وەک یەک وان. بۆ نموونە: (ئامۆزا ـ پسمام، ئاوڵە ـ خروکە، ئاسک ـ مامز. ئەژنۆ ـ چۆک، ئێستە ـ هەنووکە، ئێش ـ ژان. بانگ ـ گاز، بێشکە ـ لانکە، باش ـ چاک. پاک ـ خاوێن، پاشەوە ـ دواوە، پێ ـ قاچ. تازە ـ نوێ، توند ـ قایم، تەسک ـ تەنگ. جام ـ کاسە، جل ـ بەرگ، جۆر ـ چەشن. چاڵ ـ قۆرت، چۆیی ـ هەڵپەڕێ، چەم ـ ڕووبار. خاک ـ زەویی، خۆر ـ هەتاو ـ ڕۆژ، خۆڵ ـ گڵ. درێژ ـ کەڵەگەت، دەرفەت ـ هەل، دێ ـ گوند ـ ئاوایی. ڕوو ـ ڕوخسار، ڕەگ ـ ڕیشە، ڕێک ـ ڕاست. زار ـ دەم ـ زمان، زل ـ گەورە ـ مەزن، زویر ـ زیز ـ تۆراو. ژووروو ـ سەروو، ژین ـ ژیان، ژێکەڵە ـ جوانکیلە. سایە ـ سێبەر، سەنگین ـ قورس، سەوز ـ کەسک. شاخ ـ چیا، شوێن ـ جێگە، شەنگ ـ جوان. فرمێسک ـ ئەشک، فیشەک ـ گوللە، فێربوون ـ ڕاهاتن. قوم ـ مژ، قۆز ـ جوان، قەیچی ـ مقەس. کار ـ ئیش، کورت ـ کوڵ، کەنار ـ ڕۆخ ـ دامەن ـ لێوار. گوم ـ ون ـ بزر، گەڵا ـ پەلک، گەنج ـ لاو. لار ـ خوار، لاشە ـ جەستە، لۆکە ـ پەموو. مافوور ـ فەرش، مژدە ـ مزگێنی، مل ـ

ئەستۆ. ناوەڕاست ـ ناوەند، نزم ـ نەوی، نەوسن ـ چلێس. وریا ـ وشیار ـ زیت ـ گورج، وەرە ـ بێ، ویست ـ ئارەزوو. هاوڕێ ـ برادەر، هەنگاو ـ شاقاو، هێرش ـ پەلامار ـ شالاو. یار ـ خۆشەویست، یاریی ـ وازیی ـ گەمە، یەزدان ـ خوا.)

6/ بەڵام، ئەو ووشە دەسکاریکراوانە، هەر چەندە، لە واتادا جیاوازییان نییە، بەپێی ناوچەکانی کوردەواریی، تەنیا یەک پیتیان لە ناوەڕاست یا لە کۆتایی ووشەدا لێ گۆڕراوە یا پاشوپێش خراوە. وەک (ئارد ـ هارد، ئێستر ـ یەستر ـ هێستر، ئینجا ـ ئەنجا ـ ئیمجا. بازاڕ ـ بازێڕ، بۆ ـ لۆ، بەفر ـ بەرف. پشقل ـ قشپل، پیاز ـ پیواز، پیت ـ تیپ، پێوەند ـ پەیوەند، پێشنیاز ـ پێشنیار. تا ـ تاکوو ـ هەتاکوو، تانجی ـ تاژی، تەرزە ـ تەزرە. جامانە ـ جامەدانە، جل ـ جلک، جنێو ـ جوێن ـ جمێن، جیا ـ جودا. چا ـ چای، چلک ـ چرک، چەکوش ـ چەکوچ. خراپ ـ خراو، خوێن ـ خون ـ خێن، خوێ ـ خێ، خەوتن ـ خەفتن. دان ـ ددان، دوژمن ـ دوشمن، دەنووک ـ دندووک، دوگ ـ دونگ، دێ ـ لادێ. ڕق ـ ڕک، ڕۆن ـ ڕون، ڕێ ـ ڕێگا ـ ڕێگە. زەوی ـ زەمین، زیخ ـ خیز، زێڕینگەڕ ـ زەڕەنگەڕ. ژار ـ ژەهر ـ زەهر، ژێژک ـ ژوژک، ژیلە ـ زیلە. ساغ ـ ساخ، سوتوو ـ سوتی، سوور ـ سۆر. شوتی ـ شفتی ـ شامی، شۆڕ ـ شوڕ، شوێن ـ شون. غونچە ـ خونچە، غەنی ـ خەنی، غەم ـ خەم. فەرمووده ـ فەرمایشت، فەندوفێڵ ـ فەنگوفێڵ، فیکە ـ فیتە ـ فیتو. قەلا ـ قەلات، قین ـ کین، قێز ـ قیز ـ بێز. کولانە ـ کولینە، کوێر ـ کۆر، کۆن ـ کەون. گرنگ ـ گرینگ، گزنگ ـ گزینگ، گسک ـ گەسک. لارە ـ لەرە، لق ـ لک، لۆژ ـ لۆش. منداڵ ـ مناڵ، میوان ـ مێوان، موروو ـ میروو. ناو ـ نام ـ نێو ـ ناڤ، ناوەندیی ـ ناوەنجیی، نوزە ـ نوکە. ورد ـ هورد، وتە ـ گوتە، وەک ـ وەکوو ـ وەکی. هەتاو ـ تاو، هەتیو ـ هەتیم، هەمدیسان ـ هەمیسان. یا ـ یان، یاخی ـ یاغی، یەک ـ یێک.) بە باوەڕی من، ووشەکانی بەشی یەکەم، شیرینتر و ڕاسترن، زۆربەی نووسەرانی کوردیش، هەر ئەو ووشانە لە نووسینەکانیاندا بەکاردێنن. جگە لەوەی، کوردەکانی ڕۆژهەلات، زۆر ڕێنووس و دەنگی دیکەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، یا لە زمانی فارسییەوە وەردەگرن و

لە زمـانی نووسـینی کـوردیی دەترنجێنن. وەک دەمـەوێ ـ دەمـهـەوێ، کـە کوردەکانی ناوچەی سنە بەکاریدێنن. Renaissance ووشەیەکی لاتینییە، پێویسـتـە بەم شـێـوەیە « رێنیـسـانس » بنووسرێ و بـخوێنرێتەوە. کـەچی کوردەکانی ڕۆژهەلات، بە « ڕۆنیسانس » دەیلێن و دەینووسن.
جگە لەوەی، هێندێکیـان هەر لە بنەڕەتدا، کـوردی نین، وەک: « جـودا، چای، خون، زەهر، ساغ ... هتد. »
7/ هیچ ووشەیە لە زمانی کوردییدا، بەقەدەر ووشەی « دەست ـ دەس » ووشـەی لێکدراوی ـ فـریزی لێ دروست ناکـرێ. بۆ نموونـە: (دەسـخـۆش، دەسـقـلێپ، دەسـقـەلێب، دەسـڕەنگین، دەسـڕاست، دەسنوێژ، دەسـجـوان، دەسنووس، دەسکێش، دەسـبـار، دەسبڕاو، دەسشکاو، دەسلەرز، دەسبلاو، دەسسووک، دەسگران، دەسبزێو، دەسباز، دەسگرتنەوە، دەسەسڕ، دەسکرد، دەسکردنەوە، دەسگرە، دەسرازە، دەسگرتن، دەسمـایە، دەسناس، دەسـتـە، دەسکورت، دەسـدرێژ، دەسـشـاش، دەسـپـاک، دەسـپـیس، دەسـتـتـە، دەسپانکردنەوە، دەسلەملکردن، دەسـتـیـاو، دەسەلات، دەسەمۆ، دەستەگۆ، دەستـەندا، دەستـەبەر، دەستـەیە، دەستـەسـتوور، دەسڕاگرتن، دەسەنخۆ، دەسبـەردان، دەسداگـرتن، دەسـقـوچاو، دەسـەنداز، دەسـتـوور، دەسـتـار، دەسشـۆر، دەسنیشـان، دەسوێ، دەسـک، دەسکەوت، دەسشـۆڕ، دەسکەلا، دەسگە، دەسکدەسک، دەسگیر، دەسگێڕ، دەسگیراو، دەسەڕۆ، دەسنەدان، دەسسارد، دەسخاو، دەسهەلکردن، دەسلێهەلگرتن، دەسلێدان، دەسبەکار، دەسلێبوونەوە، دەسبردن، دەسبەجێ، دەسکوژ، دەسلەدەس، دەسلەدەسدان، دەسبـەسـەر، دەسبـەسـەرداگـرتن، دەسبـەئاو، دەسـپـێـوەنان، دەسبـەدەس، دەسـەخوشک، دەسـپـێـوەگـرتن، سـەردەسـە، ژێردەس، بێـدەس، کـەمـدەس، زۆردەس، بە دەسـە، دەسـوبرد، دەسـدرێژیی، دەسـچـێـن، دەسنەپارێز، لەدەسهەلاتن، بەدەستەوەیە، لەدەسیدێ، ) «133-128،63»
بۆ ئەوەی، شـێـوازێکی یەکگرتوو، بۆ ڕێنووسی ئیـدیۆمـەکـان دانێن، زمـانەکـەمان لە گـەڕەلاوژێیی ڕێنووسی جۆربەجـۆر قـووتارکـەین. هەروەها، لەبەرئەوەی هەمـوو ئەو فـریزانەی، لە جۆری یەکەم و دووەمدا پۆلێندەکرێن، جگە لە فـریزە دژەکـان، پێکەوە یەک واتایان هەیە، ئەز پێـشنیـازدەکـەم،

پێکەوە بنووسرێن و لە یەکدی جیا نەکرێنەوە. لێرەدا دەتوانین، هێندێ لەو ئیدیۆمانەی بەشی یەکەم و دووەم، بەپێی پیتی ئەلفوبێی کوردیی، پێش چاوخەین، تەنیا پیتی «ع» نەبێ، چونکە هیچ ووشەیە لە زمانی کوردیدا، بەو پیتە دەس پێ ناکا :

ئاخوداخ، ئازدیخواز، ئاسمانورێسمان، ئاسویەلاس، ئاشبەتاڵ، ئاشناورۆشنا، ئاشوماش، ئالاووالا، ئالوبۆڵ، ئالوگۆڕ، ئالۆزوبالۆز، ئاووهەوا، ئاهونالە، ئاهونزولە، ئایینوئۆیین.

باخوباخات، بارودۆخ، باسوخواس، باعەباع، باقوبریق، باوباران، باوبۆران، باووباپیران، بریقوهووڕ، بڕبڕە، بڕەبڕ، بڕوبیانوو، بڕەنۆک، بزبزۆکە، بزڕبزڕ، بکوژوبیر، بلمەبلم، بنجوبناوان، بنەمۆم، بۆرەپیاو، بۆڕەبۆڕ، بۆڵەبۆڵ، بۆنوبەرامە، بووکەبەبارانێ، بەدزەدزە، بەرچاوتەنگ، بەرچاوتێر، بەرداوبەرد، بەردبەبەرد، بەروبووم، بەردەزەرد، بەرێزوهێژا، بەهێزوپێتەو، بەهێزوتوانا، بەرەباب، بەرەوخوار، بەرەوژوور، بەرەبەرە، بەزموڕەزم، بەژنوبالا، بەشبەش، بەیتوبالۆرە، بیروباوەڕ، بیرورا.

پارچەپارچە، پارەپارە، پاشملە، پاشەڕۆژ، پاکوخاوێن، پانوبەرین، پانوپۆڕ، پاوپوز، پایزەبرا، پرتەپرت، پرتەوبۆڵە، پرخوهووڕ، پرخەپرخ، پڕوپوچ، پڕوپیت، پشتاوپشت، پشتبەشت، پشتویەنا، پلەوپایە، پلتەپلت، پۆشتەوپەرداخ، پۆلبەپۆل، پۆلپۆل، پەتپەتێن، پەرتوبلاو، پەرشوبلاو، پەرلەپێ، پەروباڵ، پەڕوپۆ، پەلبەپەل، پەلپەل، پەلکەزێرینە، پەلوپۆ، پەلەپەل، پەلەپیتکە، پەناوپەسێر، پەنجابەپەنجا، پەنجاپەنجا، پەیتاپەیتا، پیروخەرۆ، پیسوپۆخڵ، پێچاوپێچ، پێچویەنا، پێچولۆچ، پێشکەوتووخواز.

تاجەگوڵینە، تارومار، تاریکونووتەک، تازەکورە، تاسولووس، تاشەبەرد، تاقبەتاق، تاقتاق، تاقوفیق، تاقولۆق، تاکبڕ، تاکبەتاک، تاکتاک، تاکوتووک، تاکوتەرا، تاکوتەریک، تاکوتەنیا، تاکولۆک، تالوسوێر، تاموبۆ، تاموچێژ، تامیتامی، تانوپۆ، تانەوتەشەر، تاووتۆ، تاووتوان، تاووتۆف، تاووتین، ترپوهووڕ، ترشوتاڵ، تریقوهووڕ، ترزل، ترکەڵەک، ترونۆپ، تروتفاق، تروتەشقەڵە، ترووزڕ، تروفیز، ترەتر، ترەمەڕۆ، تکتک، تکەتک، تولتولێن، توندوتۆڵ، توندوتیژ، تونیبابا، تۆیتۆیین، تویتوێ،

تووڕەوترۆ، تووڕەوڕەق، تەپاوتل، تەپڵیتۆپێن، تەپوتل، تەپوتۆز، تەپودووکەڵ، تەپوکۆ، تەپومژ، تەپونم، تەپوهووڕ، تەپەتەپ، تەپەتڕە، تەتەڵەمیران، تەختوبەخت، تەختوتاراج، تەڕپۆش، تەڕپیر، تەڕوپاراو، تەڕوتازە، تەڕوتووشی، تەڕەتۆڵەکە، تەڕەماش، تەسکوتروسک، تەشیڕێس، تەفروتونا، تەقتەق، تەقەتەق، تەقەوڕەقە، تەقوتۆق، تەکولۆ، تەلوسیم، تەڵەکەباز، تەمومژ، تەنکوتیواڵ، تەنگوچەڵەمە، تیپبەتیپ، تیپتیپ، تیروتوانج، تیروشیر، تیفتیفە، تیکانتەپەیهەوشار، تیرتیر، تێروپڕ، تێروتەسەل، تێکوپێک، تێکوتەوتێبڕە، تێکەڵوپێکەڵ، تێکەولێکە.
جارجار، جارجارە، جاربەجار، جاروبار، جرپۆز، جرپوجۆپ، جرتوفرت، جڕوجانەوەر، جرووکەجرووک، جریوەجریو، جگەرگۆشە، جلوبەرگ، جلوجۆڕ، جڵقوفڵق، جموجۆڵ، جۆشوخرۆش، جووتبەجووت، جووتجووت، جووجەڵە، جووکەجووک، جەڕومەنگەنە، جەواڵدڕ، جیاجیا، جیابەجیا، جیڕەجیڕ، جیقوفیق، جیکەجیک .
چاڵوچۆڵ، چاوباز، چاوباشقاڵ، چاوبەرەوژێر، چاوچنۆک، چاوحیز، چاوڕەش، چاوسوورکەر، چاوشۆڕ، چاوقایم، چاوکاڵ، چاوکونەسووژن، چاولەدەر، چاونەترس، چاووڕاو، چرپەچرپ، چرچولۆچ، چرکەچرک، چڕوچاو، چڕەدوکەڵ، چستوچالاک، چڵکاوخۆر، چۆلیقولفە، چۆنچۆنی، چوارچاوە، چوارگورچک، چوارمێخە، چەپوچیڕ، چەپولار، چەقچەق، چەقەچەق، چەکمەبۆر، چەکمەڕەق، چەکوچڕ، چەلومل، چەندوچوون، چەنەباز، چیابەچیا، چیاوچۆڵ، چیتەکەوپیتەکە، چیلکەوچەوێڵ، چینبەچین، چینچین.
حاجیلەقلەق، حەپۆلەمێشخۆر، حەپەحەپ، حەتحەتۆکە، حەچولوور، حەزوبەز، حەلاشوبەلاش، حەلوەلا، حەواڵەبەگەواڵە، حیلەحیل، حینجەوفینجە.
خاتروخۆتر، خاکوپا، خاکوخۆڵ، خاڵوبۆر، خاڵومل، خانومان، خانەبەکۆڵ، خانەبێزار، خانیخانان، خاوخاو، خاوەخاو، خاووخێزان، خاووخلیچک، خاوەنشکۆ، خایەومایە، ختوخۆڕایی، خرتوپرت، خرتوخۆڵ، خرتومرت،

خڕتوهووڕ، خرتەخرت، خرچوهووڕ، خرچەخرچ، خڕخاڵ، خڕکەبەرد، خڕوخۆڵ، خڕوخەپان، خڕومڕ، خرموهووڕ، خرمەخرم، خرنگوهووڕ، خرنگەخرنگ، خڕوهووڕ، خڕەخڕ، خشپوهووڕ، خشپەخشپ، خشوهووڕ، خشەخش، خلێنەگوو، خلێنەوبلێنە، خنجوخۆڵ، خوشوهووڕ، خوشەخوش، خوڕوهووڕ، خوڕەخوڕ، خۆبەخۆ، خواروخێچ، خواوڕاستان، خوتەوبۆلە، خەتوخاڵ، خەلەوخەرمان، خیزوهووڕ، خیزەخیز، خێرەومەند، خوێنتاڵ، خوێنخۆر، خوێنسارد، خوێنشیرین، خوێنگەرم، خوێنمژ، خەڵکوخوا، خەمخوار، خەمخۆر، خەموخەفەت، خەیاڵپلاو، خێراخێرا، خێروبێر، خێلوخوار.
دابونەریت، دابەشدابەش، داخوخەفەت، دادوفیغان، داردەست، داروبار، داروپەردوو، دارودەستە، دارودەوەن، دارودیوار، دارەدارە، داسکودەرزی، دامودەزگا، دانساز، دانکێشان، دانوستان، داوودەرمان، داوێنپاک، داوێنپیس، دڕکوداڵ، دڕوداوێن، درۆودەلەسە، درێژدادڕ، دزاودز، دزبەدز، دزوجەردە، دزەخورجینە، دڵپاک، دڵپڕ، دڵتەڕ، دڵڕاگر، دڵڕەق، دڵسووتاو، دڵشکاو، دڵفراوان، دڵفڕێن، دڵگران، دڵگوشراو، دڵگیر، دڵمردوو، دڵنەرم، دڵوریا، دڵهەڵکەندراو، دڵەخورتێ، دڵەڕاوکە، دڵەکوتە، دوابەدوای، دواڕۆژ، دۆڵاودۆڵ، دۆڵبەدۆڵ، دووبەدوو، دوودڵ، دوودوو، دوورکوژ، دوورودرێژ، دوورودۆست، دووڕناس، دووڕوو، دووزمان، دووگیان، دەبدەبە، دەربەدەر، دەردوبەڵا، دەردەدار، دەردەگا، دەرگاکوت، دەرگاودووتڕ، دەروونڕەش، دەسبڕ، دەسبڵاو، دەسبەجێ، دەسبەدەس، دەسبەردار، دەسبەسەر، دەسبەقلپ، دەسپاک، دەسپیس، دەسپێشخەر، دەسخەت، دەسدرێژ، دەسدەس، دەسڕاست، دەسڕەنگین، دەسڕۆیو، دەسڕەش، دەسسپی، دەسکورت، دەسوبرد، دەسوپێوەند، دەسودەم، دەستەبەدەستە، دەسەپاچە، دەستەدەستە، دەسەوسان، دەسەوکەمەر، دەسەویەخە، دەسیدەسی، دەسلەدەس، دەشتاودەشت، دەشتبەدەشت، دەشتودەر، دەعیەوفیز، دەغلودان، دەقاودەق، دەقبەدەق، دەڵەبەبا، دەڵەدێو، دەڵەسەگ، دەمارگرژ، دەماودەم، دەمبڵ، دەمبەدەم، دەمپاراو، دەمتەور، دەمچەور، دەمخاو، دەمدڕاو، دەمدرێژ، دەمدەم، دەمڕاست، دەمڕەش، دەمسپی، دەمسوور، دەمشڕ، دەمگەرم، دەمویل، دەموچاو، دەمودەس،

دەمــوشک، دەمــوفــلــق، دەمــوولووت، دەمــوویل، دەنگدڕاو، دەنگوباس، دەنگەدەنگ، دەوروبەر، دەوەنبەئاش، دەهۆڵکووت، دیزەبەدار، دیزەبەکۆل، دیمۆکراسیخواز، دێودرنج.
ڕازوگلەیی، ڕازونیاز، ڕاستودروست، ڕاستوڕەوان، ڕاستەوخۆ، ڕاوەشکار، ڕاووڕیس، ڕاووڕێوی، ڕاووڕووت، ڕژدوچرووک، ڕقــوکــینــه، ڕمــووزن، ڕووبازاڕیی، ڕووبەڕوو، ڕووتوڕەجــاڵ، ڕووتوقــووت، ڕووڕەش، ڕووزەرد، ڕووســارد، ڕووســپــی، ڕووســوور، ڕووشکێن، ڕووکــراوە، ڕووگــەرم، ڕووهەڵماڵراو، ڕەپوڕاست، ڕەزاگران، ڕەشبگیر، ڕەشبەڵەک، ڕەشوڕووت، ڕەشــەبا، ڕەشــەخــەڵک، ڕەشــەوڵاخ، ڕەقوتەق، ڕەگــوڕیشــه، ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگوبۆ، ڕەنگوڕوو، ڕیســوگــوریس، ڕیشــەکــێش، ڕێشکەوپێــشکه، ڕێکوپێک، ڕێگاوبان.
زاروزیج، زارەترەک، زاواڕێوی، زاووزێ، زرتەبۆز، زرمــوکوت، زرمــوهووڕ، زرمــــەزرم، زرنگوهووڕ، زرنــگەزرنگ، زڕوزەنگیــانه، زڕوهووڕ، زڕەزڕ، زریکوهووڕ، زریکەزریک، زلزل، زمــانپــاراو، زمــانپــیس، زمــاندرێژ، زمــــانزان، زمــــانلووس، زمـــزم، زۆرزۆر، زۆرەملی، زووبەزوو، زووزوو، زەبروزەنگ، زەردوزۆڵ، زەردوقــــۆڕ، زەردیاوا، زەردیوەلی، زەڕنەقــــووتە، زەڕوهووڕ، زەڕەزەڕ، زیڕوهووڕ،زیڕەزیڕ، زیکوهووڕ، زیکەزیک، زیندەبەچاڵ زەویوزار، زێدونیشتمان.
ژانوژوور، ژانوژێ، ژاوەژاو، ژنبەژن، ژنوژنخواز.
ساتبەسات، ساتوکات، سادەوساکار، ساردوسڕ، سافولووس، ساڵبەساڵ، ســاڵەوســاڵ، ســرتوســۆڵ، ســرتەسرت، سرتەوبۆڵە، ســفــتوســۆڵ، سفرەدڕ، سکسووتاو، سمتوکەفەڵ، سمێڵخوار، سمێڵفش، سمێڵقیت، سمێڵقەوی، ســمــێــڵــقــەیــتــانی، ســواوپواو، ســوکــوبــاریک، سۆرەوتۆرە، ســووکوچرووک، سووکوڕیسوا، سەددەرسەد، سەدلەسەد، سەربەدەر، سەربەرز، سەربەسەر، ســەرپاکی، ســەرتاســەر، ســەرتۆپ، ســەرڕاست، ســەرســەخت، ســەرشــۆڕ، ســەرکــار، ســەرگەرم، سەرلەبەری، ســەرلەنوێ، ســەرمــاوســۆڵە، ســەروبەر، ســـەروبەند، ســـەروپۆتەلاک، ســـەروپێ، ســـەروچاو، ســـەروســـاخت، ســـەروســـەکــوت، ســـەروســـیمــا، ســـەروشــوێن، ســـەروقنگ، ســـەروگــوێلاک،

سەرومڕ، سەرەمەرگ، سەرەوخوار، سەرەوژوور، سەرەوژێر، سەرەولێژ، سەگسار، سەلتوقوولت، سەنگوتەرازوو، سەنگوڕەنگ، سەنگوسووک، سەوداسەر، سەیروسەمەرە، سیرمەڕەق، سیروگژنیژ، سیرومار، سیسوپیس، سیسەمار، سێبەروسایە، سێبەسێ، سێجڕتەکی، سێسێ.
شاتوشووت، شاتەشات، شاخبەشاخ، شاخوداخ، شاخەوشاخ، شاریەدەر، شاشوویش، شانبەشان، شانوبازوو، شانوباهو، شانوشەپک، شانوشەوکەت، شاییولۆغان، شتومەک، شرتوشۆ، شریخوهووڕ، شریخەشریخ، شرکەوپرکە، شڕوالپیس، شڕودڕ، شڕوشیتال، شڕوشێواو، شڕووڕ، شڕەخۆر، شڕەوپڕە، شڕەووڕە، شلوشۆڕ، شلوشەکەت، شلوشێواو، شلومل، شلەشاری، شلپوهووڕ، شلپەشلپ، شلقوهووڕ، شلقەشلق، شۆخوشەنگ، شەپوشۆڕ، شەخسەپەرۆ، شەرموشوورەیی، شەڕانگێز، شەڕفرۆش، شەڕوشۆڕ، شەڕگەڕ، شەڕەدەنووک، شەڕەسەگ، شەڕەشەق، شەڕەشۆق، شەقوبۆکس، شەقوپەق، شەقوشڕ، شەقوشۆق، شەقوهووڕ، شەقەشەق، شەلوپەت، شەلوشکست، شەلوکوێر، شەلوگێڕ، شەنوکەو، شەولەبان، شینوشەپۆڕ، شیواوشیو، شیوبەشیو، شیوودۆڵ، شێتوسەرگەردان، شێتومالوێران، شێتووێت، شێرەبەفرینە .
غەزوبەز.
فاکوفیک، فڕانفڕان، فڕکوهووڕ، فڕکەفڕک، فڕوفیشال، فڕوفێڵ، فڕوهووڕ، فڕەفڕ، فسفسپالەوان، فسکوهووڕ، فسکەفسک، فشوفۆڵ، فشوهووڕ، فشەفش، فلتوهووڕ، فلتەفلت، فەڕوبێر، فەریکەحوشتر، فەریکەدێو، فەریکەکەر، فەریکەنۆک، فەنگوفێڵ، فیڕنەگولە، فیشەکەشێتە، فیشکوهووڕ، فیشکەفیشک، فیکوهووڕ، فیکەفیک، فیلەگێژە، فێلوتەلەکەبازی، فێلوفەرەج.
ڤڕوهووڕ، ڤڕەڤڕ، ڤینگوهووڕ، ڤینگەڤینگ.
قاپرقاچاغ، قاچوقووچ، قاتوقڕ، قاسپەقاسپ، قاووقیژ، قایموپتەو، قرتوهووڕ، قرتەقرت، قرچوهووڕ، قرچەقرچ، قرخوهووڕ، قرخەقرخ، قرموهووڕ، قرمەقرم، قڕوقەپ، قڕوقەپۆز، قڕوهووڕ، قڕەقڕ، قڕەوبڕە، قریشکوهووڕ، قریشکەقریشک، قریوهووڕ، قریوەقریو، قسەزان، قلیوبلی،

قلّپوهوور، قلّپەقلّپ، قنجوقیت، قنجوقۆڵ، قنگقەویلە، قنگلێکەوتوو،
قنگەجنۆکە، قنگەشەڕ، قنگەوتلوور، قوڕوچلّپاو، قوڕولیتاو، قولەیقاف،
قولّپوهووڕ، قولّپەقولّپ، قومارباز، قۆڕەقۆڕ، قووقەقووق، قوولّومەند،
قوونەقوون، قوونەقوونکەر، قەپوپڕ، قەرزوقۆڵە، قەفقەف، قەلوبەرد،
قەڵاچوالان، قۆچەقانی، قۆلبڕ، قیتوقۆز، قیرسیچمە، قیروسیا، قیڕوهووڕ،
قیڕەقیڕ، قیژوهووڕ، قیژەقیژ، قێزندەوبێزندە، .
کاروانکوژە، کارەکەر، کاسەلێس، کاکیبەکاکی، کاڵوکرچ، کاڵەکخۆر،
کاڵەوپێتاو، کانیخان، کتوپڕ، کچاوکچ، کچبەکچ، کڕوهووڕ، کڕەکڕ،
کزولاواز، کزوهووڕ، کزەکز، کسپوکۆ، کسپوهووڕ، کسپەکسپ، کشومات،
کفندڕ، کفندز، کلکوگوێ، کلکەقونێ، کلکەلەقێ، کلکەسوتێ، کڵاوڕۆژنە،
کڵاوسور، کڵاوکڵاوێن، کوتوکوڵ، کوتوکوێر، کوتومت، کوتومزرەقی،
کوڕاوکوڕ، کوڕبەکوڕ، کوردپەروەر، کوڕوکاڵ، کوڵودڵ، کوڵوکۆ، کونبەکون،
کونکون، کونوقوژبن، کونوکەلەبەر، کونەفیشاڵ، کونەمشک، کۆچوڕەو،
کۆترباز، کۆتوزنجیر، کۆسکەوتوو، کۆڵانبەکۆڵان، کۆنەپەرست، کۆنەدۆز،
کۆنەفرۆش، کۆنەقین، کووتبەکووت، کووتکووت، کەراوکەر، کەربازاڕ،
کەرتبەکەرت، کەرتکەرت، کەرتوپەرت، کەروێشکەخەو، کەرەکەر،
کەسوکار، کەشوفش، کەشکەلانیفەلەک، کەشوهەوا، کەفوکوڵ، کەلوپەل،
کەللەبەران، کەللەخڕ، کەللەڕەق، کەللەزل، کەللەشەق، کەڵەکباز، کەڵەگا،
کەمچیکڵدانە، کەمکەم، کەموکوڕیی، کەواسوور، کەوباز، کەوڵسوور،
کەوڵەکۆن، کەینوبەین، کێشەوبەرە، کێواوکێو، کێوبەکێو.
گارەگار، گاوگۆلک، گاوگوێر، گدیگدی، گدەگدە، گڕوپف، گڕوکف،
گڕوکاڵ، گرموهووڕ، گرمەگرم، گڕوهووڕ، گڕەگڕ، گرێوگۆڵ، گژوگیا، گفتوگۆ،
گڤوهووڕ، گڤەگڤ، گلّکۆ، گمەگم، گورجوگۆڵ، گورچکبڕ، گورگانەشەوێ،
گورگەبۆر، گورگەخەو، گورگەزێ، گورگەلۆقە، گوڕنەتەڵە، گوڕەوبڕە،
گوێبڕاو، گوێدرێژ، گوێزل، گوێزەبانە، گۆڕبەگۆڕ، گۆڕوەشار، گۆڕهەڵتەکێنە،
گۆڕهەڵکەنە، گەجەروگوجەر، گەردنکەچ، گەردەلوول، گەرموگوڕ،
گەندەموو، گەنمکەنمێنە، گەندوگوو، گەڕوکوڕ، گەڕوگول، گەڕوکێچەڵ،
گەڕەلاوژێ، گەزبەگەز، گەزگەز، گەلەگورگ، گەندەخۆر، گەورەکچ،

گەورەومەزن، گیاکەڵە، گیانەڵڵا، گیروگرفت، گیزوهوور، گیزەگیز، گێرەشێوێن، گێزوگوڵنک، گێژووێژ، گێرمەوکێشە، گێرەوکێشە، گێلگێلە، گێلەپیاو، گێلەگێل.
لاتولووت، لاتولەوێر، لاجلاج، لارەملە، لافوگەزاف، لامسەرلایی، لاولا، لایەلایە، لایلایە، لچولێو، لقوچڵ، لۆژەلۆژ، لۆقەلۆق، لووتبڕاو، لووتبەرز، لووتخوار، لووتزل، لووتوبزووت، لووتوپووت، لووتەلا، لوورەلوور، لووسوپووس، لەبلەبان، لەبەرەئەوە، لەتبەلەت، لەتلەت، لەتوپەت، لەتوکووت، لەڕولاواز، لەشبەبار، لەشبەدۆشاو، لەشسووک، لەشگران، لەشقورس، لەقولۆق، لەنجەولار، لەنگولۆر، لەوچەلەوچ، لەوسەلەوس، لێوبەبار.
ماتەمات، ماچوموچ، مارانگاز، ماریمارانخۆر، ماسیگر، ماسیگرە، ماشوبرنج، مالانگەڕ، مالاوایی، مالوحاڵ، مانگابەکەڵ، مانگەشەو، مایەپووچ، متومورووو، مرخوهوور، مرخەمرخ، مریشکەبەکر، مرومووش، مروهوور، مرۆپەروەر، مرەمر، مشتومال، مشتومر، مشوهوور، مشەمش، مقۆمقۆ، ملپان، ملشۆر، ملکەچ، ملهوور، ملومووش، منجەمنج، مەرومالات، مەرەگێژ، مەلاخۆرە، مۆرهەڵکەن، مۆسیقاژەن، مۆنوگرژ، مووبەموو، میاوەمیاو، میرخوناو، میرمیران، مینگەمینگ، مێچکەمێچک، مێردەزمە.
ناخونەکخۆر، ناڕاستەوخۆ، نازوجیاز، نازونووز، نازونیاز، نافەکشۆر، نالەنال، نانودۆبر، نانوتف، نانونمەک، ناوبەناو، ناوکەرێژ، ناووناتۆرە، نەختوپوخت، نەدیوبدی، نەرموشل، نەرمونۆڵ، نەرمونیان، نەرەدێو، نەرەنەر، نفتونوێ، نمەکسوێر، نووزەدرێژ، نیشتمانپەروەر، نێرەکوڕ، نێرەکەر، نێرەمووک، نێرەورچ، نێونیگا.
وتوویێژ، ورتەورت، وردکەوپرتکە، وردوخاش، وردورد، وردوقووڵ، وردەوالا، وردەوردە، ورگدڕاو، ورەور، وژەوژ، وشکوبرنگ، وشکەجۆ، وشکەسۆفی، وەجاخکوێر، وەجاخڕوون، وەڕەوەڕ، ویزوهوور، ویزەویز، وێڵوسەرگەردان، وێڵوعەودال.
هاتوچۆ، هاتوهووت، هاتهات، هارتوهوورت، هاروهاج، هارەهار، هاژەهاژ،

هاژەوهوژە، هاشـــوهووش، هاشـــەوهووشـــە، هاوارووڕۆژ، هاوارهاوار، هۆشـــــوگــــۆش، هەتاهەتایە، هەراوزەنا، هەراوهوریا، هەراهەرا، هەرچیوپەرچی، هەرداوهەرد، هەردبەهەرد، هەرزانوتالآن، هەڕەشەوگوڕەشە، هەڕەمــــەکی، هەژارونەدارا، هەژدەهەژدە، هەشـــبـــەســـەر، هەلاهەلا، هەلودەرفـەت، هەلومـەرج، هەللەقـومـەللەق، هەلهـەلە، هەلەکـەسـەمـا، هەڵسوکەوت، هەڵەوپەڵە، هەڵەوەڕ، هەوڵوتەقەلا، هەیەونییە، هیچوپوچ، هێزوپێز، هێزوتوانا.

ئەنجنەنجن، ئیشوکار، ئێسکوپرووسک.

یەکباڵ، یەکبەیەک، یەکتەن، یەکدڵ، یەکدەست، یەکزمان، یەکشەویلە، یەکویەک، یەکەیەکە، یەکیەک.

لە کۆتاییدا، دەڵێم: گەلێ لە نووسەرانی کورد، نووسینەکانیان بە خۆڕایی، بە « ووشەی لێکچوو، چەن ڕستەیەکی لاوەکیی، ڕاڤەکردن »، قەبە و فشوفۆڵ دەکەن، جا ئەو ووشە لێکچووانە، هەر دووکیان کوردیی بن، وەک « گەورە و مەزن و زل »، یا ووشەیەکیان کوردیی و ئەوی دیکەیان «فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » بن، وەک « ئەندێشە و خەیاڵ، وێژە و ئەدەب، شیعر و هۆنراوە و هەڵبەست »، هیچ لە باسەکەمان ناگۆڕێ.

## 9/ فـــــــەرهەنگ :

یەکێ لە کارە گرنگەکانی هەموو نەتەوەیەکی زیندوو، بە دانانی فەرهەنگی زمـان دەسـپـێدەکـا. هەر نەتەویەک، چەن فـەرهەنگی هەبێ، هێندەش زمانەکەی دەوڵەمەنددەبێ. نەتەوەی بێ فەرهەنگ، بە نەتەوەیەکی هەژار و مردوو دەژمێرێ. چونکە، فەرهەنگ بە یەکێ لە دینگە سەرەکییەکانی زمان و نەتەوەکە دادەنرێ. هەر بە هۆی فـەرهەنگەوە دەتوانرێ، هەمـوو دیالێکت، بەش و لقەدیالێکتەکانی زمان کۆکرێتەوە. لە باخچەی هەر ناوچەیەکی دیاریکراو، چەن گـوڵێکی بۆنخۆش بچنرێ و چەپکەگوڵێکی ڕازاوەی زمانی لێ ببەسرێ. هەر بە هۆی فـەرهەنگەوە، خەرمانی ووشەی کوردیی گرددەکرێتەوە، ووشە و زاراوەی میللی، لە لەنێوچوون دەپارێزرێ. فـەرهەنگ، زمـان لە « شـێوانن، لاوازیی، پوکانەوە، داتەپین و مـردن » دەپارێزێ، نەوەی نوێ بە ووشەی کوردیی کۆن و نوێ پێدەگەیەنێ، زمانیان

دەوڵەمەندەکا. هەر بە هۆی فەرهەنگەوە دەتوانین، لە ووشە و زاراوەی دیالێکتە جیاوازەکانی، زمانی کوردیی و زمانەکانی بیانیی، نەتەوەکانی جیهان بگەین. هەموو نەتەویەکی « وشیار، پێشکەوتوو، خاوەن توانا و دەسەلات » ، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، هەوڵێکی زۆریان داوە، تا چەندین فەرهەنگی جۆربەجۆریان نووسیوە. گومانی تێدا نییە، گەلانی جیهان، بایەخێکی یەکجار مەزنیان بە نووسینی فەرهەنگ داوە. بۆیە،(زمانە زیندووەکان، ژمارەی فەرهەنگەکانیان گەیشتۆتە «1500» فەرهەنگ.) «6،63»

بە شێوەیەکی گشتیی، چەن جۆرە فەرهەنگێ هەیە :

1. فەرهەنگی زمانی نەتەوەیی: ئەم جۆرە فەرهەنگە، بە زمانی نەتەوەیی دادەنرێ، لە نێوان دیالێکت و بەش و لقەدیالێکتەکانی زمانێکدا دەنووسرێ. وەک فەرهەنگی کوردیی ـ کوردیی، بە هەر دوو بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوراوو و هەورامانیی.

2. فەرهەنگی زمانی نەتەوەیی ـ بیانیی: ئەم جۆرەیان، بە زمانی نەتەوەیی دەسپێدەکا و بەرانبەرەکەی یەکی لە زمانی نەتەوەکانی جیهان دەبێ. وەک فەرهەنگی کوردیی ـ ڕووسیی.

3. فەرهەنگی بیانیی ـ نەتەوەیی: ئەم جۆرەشیان، بە پێچەوانەی هەر دوو جۆرەکەی پێشوو، بە یەکێ لە زمانە بیانییەکان دەنووسرێ و بەرانبەریشی واتاکانی بە زمانی نەتەوەیی تۆماردەکرێ، وەک « ئینگلیزیی ـ کوردیی » .

بە داخەوە، گەر بەراوردێ لە نێوان نەتەوەی کورد و نەتەوەکانی دیکەی جیهاندا بکەین، دەبینین: کورد بە هۆی گەلێ هۆی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئاییننیی، زمانەوانیی، کەلتووریی »یەوە، لە بواری فەرهەنگدانانندا، زۆر دواکەوتووە. ڕۆڵەکانی کورد، زۆر درەنگ بیریان لە فەرهەنگنووسین کردۆتەوە، زۆر درەنگیش، دەسیان بەو کارە کردووە.

کورد، لە هەر سێ جۆرە فەرهەنگەکە، ژمارەیەکی زۆر کەمی هەیە. بەڵام، ئەو فەرهەنگانەی هەشن، زۆربەیان لەو فەرهەنگانەن، کە لە زمانێکی بیانییەوە بۆ کوردیی نووسراون. زۆربەی هەرە زۆریشیان، « ڕۆژهەڵاتناس، گەڕۆک و شارەزا بیانییەکان » بۆیان نووسیوین. ئەگینا، لەو سەردەمانەدا،

گەر ئەوان نەبوونایە، کورد نەک هەر نەیزانیوە، فەرهەنگ بنووسێ، بەڵکوو هەر بیریشی لێ نەکردۆتەوە! لەو سەردەمە تاریکونووتەکانەدا، کە کورد خەریکی ڕاوی یەکدی بوون، بیرێکیان لە زمانەکەی خۆیان نەکردۆتەوە، زمانی کوردیی بە تەوایی پشکوێخراوە، ئەو کادێرە بیانییانە، باسکیان لێ هەڵماڵیوە، کون و قوژبنی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان گەڕاون، سەرما و گەرمایەکی زۆریان چێشتووە، هێندێ جاریش، تووشی «ناخۆشیی، ڕووتکردنەوە، ئازار، گرتن و کوشتن »یش بوون. بەڵام، هەر کۆڵیان نەداوە، تا دەنکەدەنکە، وەک دانەی مرواریی، ووشەی پەتیی و ڕەسەنی شیرینی کوردییان بۆ هەڵگرتووینەتەوە. پاشان، لێکۆڵینەوەی ورد و قووڵیان لە سەر کردوون، بەپێی باوەڕی ئەو سەردەمەیان، لێکیانداونەتەوە و پۆلێنیانکردوون. دواتریش، چەن فەرهەنگێکیان، وەک یادگارێکی دێرین و بە نرخ، بۆ بەجێهێشتووین. پاشان، ئەو کارانەی ئەوان، وەک بنچینەیەک، لە لایەن شارەزا و زانایانی کوردەوە قۆزراوەتەوە. ئەوانیش، وردەوردە، لە بەر ڕۆشنایی ئەو کارانەدا، خەریکی لێکۆڵینەوە و فەرهەنگدانان بوون. بۆیە، هەزاران سڵاو لە گیانی پاکیان بێ، هەزاران جار،ماڵیان ئاوەدان و کوڕیان بە زاوا بێ.

گەر فەرهەنگدانان، بۆ نەتەوەکانی جیهان، کارێکی ئاسانبێ، ئەوا بۆ کورد، بە کارێکی یەکجار گران دادەنرێ. چونکە :

یەکەم : کورد دەوڵەتێکی نەتەوەیی نییە. لەبەرئەوە، خاوەنی دەزگەی کەلتووریی و ئەکادیمیی خۆی نییە. بۆیە، لەو بوارەدا ناتوانێ، هەم کادێری ئەکادیمیی پێگەیەنێ، هەم بۆدجەیەکی باشی بۆ تەرخانکا، تا ئەو کارانە وەک پێویست، بە ئەنجامگەیەنێ.

دووەم : زمانی کوردیی، لە چەن « دیالێکت، بەش و لقەدیالێکت »ێکی جیاواز پێکهاتووە. ئەم دابەشبوونە، گرفتێکی زۆری بۆ زمانەکەمان و پسپۆڕەکان دروسکردووە. لەبەرئەوە، گەر فەرهەنگێ بۆ هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیی دابنرێ، ئەوا بە کارێکی زۆر سەخت و قورس دادەنرێ. لەوانەیە، فەرهەنگدانان، بۆ یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، کارێکی گەلێ ئاسانتربێ.

سێیەم : لە ماوەیەکی کەمدا ناتوانرێ، ئەو کارانە جێبەجێکرێ. بەڵکوو، پێویستی بە ماوەیەکی درێژ هەیە. لەم کاتەشدا، ئەو توانایەمان نییە.
چوارەم : لە بواری زمانەوانیدا، شارەزا و پسپۆڕی زمانزان و زمانناسمان، زۆر کەمە و بە پەنجەی دەس دەژمێررێن. ئەوانەشی هەن، هێندێکیان چەن کادیرێکی تەمەڵن، لە ئاستی ئەرکە نەتەوەیی و لێپرسینەوەکەدا نین. هێندێکی دیکەیان، وازیان لە تەرخانی تایبەتیی خۆیان هێناوە، خەریکی کارێکی دیکەن. هێندێکی دیکەشیان، سەری خۆیان بەو کارەوە نایەشێنن، چونکە کەڵکی نییە!
ئەم کارە گەورەیەش، پێویستی بە کۆمەڵێ شارەزا و زانای زمانی کوردیی، لە هەموو پارچەکانی کوردستان هەیە، بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە کارکەن، هاوکاریی لەگەڵ یەکدیدا بکەن. بەڵام، بە داخەوە، ئەو شارەزایانەی هەشمانن، ئەوە نین، پشتیان پێ ببەسین، چونکە، لە نێو خۆیاندا کۆک و تەبا نین. گیانی هاوکارییان تێدا نییە، دەسی یارمەتیی بۆ یەکدی درێژ ناکەن. هەر کەس خۆی بە مامۆستا و زانا دەناسێ، کاری کەسی دیکەیان لا پەسەن نییە. لەبەرئەوە، نەک هەر فەرهەنگێ، بۆ هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردیی، کارێکی زۆر گرانە، بەڵکوو تەنانەت، فەرهەنگێ بۆ یەکێ لە دیالێکتە دیاریکراوەکانیش، بە کارێکی سەخت دەژمێررێ.
لەگەڵ ئەوەشدا و تا ئەوڕۆ، گەلێ فەرهەنگ و فەرهەنگۆک، بە شێوەی نامیلکە و پەرتووک، یا لە پاشکۆی بەرهەمەکانیاندا، لە لایەن هێندێ [illegible]ستانی کوردەوە بڵاوکراونەتەوە. هەروەها، هێندێ لە شارەزایانی کوردیش، لەو بوارەدا کاریانکردووە. بەڵام، ئەو فەرهەنگانە، هیچیان فەرهەنگی کوردیی ـ کوردیی نەبوون، بەڵکوو، فەرهەنگێکی تێکەڵاوی کوردیی و یەکێ لە زمانەکانی دیکەی بیانیی بوون. چونکە، فەرهەنگی کوردیی ئەوەیە، لە کوردییەوە بۆ زمانێکی دیکە بنووسرێ. بەڵام، ئەو فەرهەنگانەی لە زمانێکی دیکەوە، بۆ کوردیی نووسراون، پتر لە سەر فەرهەنگی ئەو زمانە دەژمێررێن. وەک: فەرهەنگی « عەرەبیی ـ کوردیی، فارسیی ـ کوردیی، ڕووسیی ـ کوردیی و ... ». ئێمەی کورد، لە چاو زمانەکانی دیکەدا، فەرهەنگمان کەمە.

دەبێ، ئەوەش بزانین، هەر چەندە، لە ساڵی « 1683/1682 »زدا، هۆنەری گەورەی کورد « ئەحمەدی خانیی »، یەکەم فەرهەنگی، بە زمانی کوردیی و بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو داناوە. بەڵام، ئەو فەرهەنگە، جگە لەوەی هیچی دیکەی بە دوادا نەهات، وەک فەرهەنگێکی عەرەبیی تەماشادەکرێ. چونکە، لە عەرەبییەوە بۆ کوردیی نووسراوە. هەروەها، یەکەم کەسێ فەرهەنگی «کوردیی ـ کوردیی » دانابێ، بە سەرکەوتوویی، کارەکانی خۆی بە ئەنجامگەیاندبێ، فەرهەنگەکەی مامۆستا « شێخ محەممەدی خاڵ »، لە ساڵی « 1960 ز »دا بوو، کە سێ بەرگی لە فەرهەنگە تایبەتییەکەی خۆی، لە ژێر ناونیشانی « فەرهەنگی خاڵ »دا چاپکردووە. .

جگە لەو فەرهەنگانەی تا ساڵی « 1975 »، لە بەرهەمەکەی د. «ئەورەحمانی حاجی مارف »دا ناویان نەهاتووە، وەک « قامووسی زبانی کوردی ـ عەبدولڕەحمانی زەبیحی و هەنبانەبۆرینەی ـ هەژار ... تاد» تا ئێستە، چ لە کوردستان و چ لە هەندەران، چ لە لایەن کورد خۆی، چ لە لایەن شارەزایانی بیانییەوە، نزیکەی سەد فەرهەنگ و فەرهەنگۆکی کوردیی بڵاکراوەتەوە.

هەر چەندە، ئەم فەرهەنگانە، وەک گوتمان: لە لایەکەوە لەچاو فەرهەنگی نەتەوەکانی دیکەدا، زۆر کەمە. لە لایەکی دیکەشەوە، (زۆربەی زۆری ئەم فەرهەنگانە، لەبەر گەلێک هۆی ئاشکرا، لەسەر شێوە و ڕێگەیەکی زانستیی دانەنراون، لەگەڵ ئەوەشدا بە نیسبەت کاری فەرهەنگنووسیی کوردییەوە، چەن هەنگاوێکی گەورە نراوە و ژمارەیەک فەرهەنگی سەرکەوتوومان هەیە.)«91،70»

لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، ناوی هێندێ لەو فەرهەنگۆک و فەرهەنگانەی دەسمانکەوتوون، ڕیزکەین، کە « پسپۆڕ، شارەزا، ڕۆژهەڵاتناسەکانی کورد و بیانیی » نووسیویانن. ئەم فەرهەنگانە، لە چەن سەرچاوەیەکی جیاوازەوە کۆکراونەتەوە. لێرەدا، بەپێی مێژووی بڵاوبوونەوەیان، هێندێکیان بە کورتیی، لێ پەنجەڕمێریاندەکەین، تا خوێنەری هێژا بزانن، مێژووی فەرهەنگنووسی کوردیی لە کەیەوە دەسپێکردووە و کام فەرهەنگ لە دوای

کام فەرهەنگەوە هاتووە، بۆ ئەوەی، زنجیرەی مێژوویی فەرهەنگنووسیی کوردیی، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ڕوونکەینەوە :

1. ئەحمەدی خانیی، نەوبەهار ـ 1683/1682 ز .
2. یوسف زیائەدین پاشا خالیدی ئەلمەقدسیی ـ ئەلمەخزومی، ئەلهەدییە ئەلحەمیدییە فی ئەللوغە ئەلکوردییە، ئەستەنبول، 1310هـ ـ 1893م.
3. شێخ مارفی نۆدێ، ئەحمەدیی، سلێمانیی ـ 1895.
4. ئی. ئا. ئۆربیلیی، فەرهەنگی کوردیی ـ ڕووسیی، 1920.
5. جەلادەت عالی بەدرخان، فەرهەنگۆک، گۆڤاری « هاوار »، شام.
6. خەبەرناما ژ زمانێ فەلەیی ـ کورمانجیی، ڕەوان، یەریڤان،1933 .
7. شاکیر فەتاح، فەرهەنگۆک، ئینگلیزیی ـ کوردیی و کوردیی ـ ئینگلیزییە، ڕەواندوز، 1934.
8. خەبەرناما تێرمینۆلۆجی یێ فەلەیی ـ کورمانجیی، یەریڤان، 1935.
9. عەبدوللا زێوەر ـ1941.
10. گیوی موکریانی، « ڕابەر »، عارەبیی و کوردییە، هەولێر، 1950 .
11. گیوی موکریانی، « کۆلکەزێڕینە »، کوردیی ـ فارسیی ـ عەرەبیی ـ فەرەنسیی ـ ئینگلیزیی، چ1، 1955. چ2، 1966.
12. فەرهەنگی کوردیی ـ مراد ئاوڕەنگ « کوردیی ـ فارسیی ».
13. عیززەدین مەلا مستەفا، فەرهەنگۆک بەغدا، 1955.
14. فەرهەنگی مەردۆخ، تاران، 1956. کوردیی ـ فارسیی ـ عەرەبیی.
15. سەمەندیی سیابەند، ئارامیی چاچان، خەبەرناما ئەرمەنیی ـ کوردیی، یەریڤان، 1957.
16. ئی. ئۆ. فاریزۆف، فەرهەنگی ڕووسیی ـ کوردیی، مۆسکۆ، 1957.
17. چ. خ. باکاییێڤ، فەرهەنگی کوردیی ـ ڕووسیی، مۆسکۆ، 1957.
18. فەرهەنگی خاڵ، ب1 ـ 1959-1960، ب 2 ـ1964، ب 3 ـ1976 .
19. نەقابەی م. سولەیمانیی، فەرهەنگۆکی «زاراوەی زانستیی» 1960.
20. ڤ. کوردۆییێڤ، فەرهەنگی کوردیی ـ ڕووسیی، مۆسکۆ، 1960.
21. جەمال نەبەز، هەندێک زاراوەی زانستی، سلێمانی، 1960.
22. جەمال نەبەز، فەرهەنگۆکی زانستی، هەولێر، 1960 ـ1961.

23. گیوی موکریانیی،« مەهاباد » کوردیی و عەرەبییە، هەولێر، 1961.
24. جگەرخوێن، فەرهەنگا کوردیی، ب 1 ـ 2، بەغدا، 1962.
25. عەلادین سەجادیی، کوردیی ـ عەرەبیی ـ فارسیی، بەغدا، 1963.
26. موسا عەنتەر، فەرهەنگا کوردیی ـ ترکی، استانبوڵ، 1967.
27. م. اورەنگ، فرهنگ کردی، تهران، 1968.
28. مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، « دوو ڕشتە »، فەرهەنگێکی عەرەبیی و کوردییە بە هەڵبەست، بەغدا، 1970.
29. عەبدولقادر بەرزنجیی، فەرهەنگی زانیاریی، سلێمانیی،1971.
30. لیژنەیەکی تایبەتیی لە زانا و کوردیی زانی بە توانا، فەرهەنگۆکی زاراوەی پارێزگای سلێمانیی، عەرەبیی ـ کوردیی،1971.
31. معروف قەرەداغی، فەرهەنگی کشتوکاڵ، ب1 ـ 2، بەغدا، 1972 ـ 1973.
32. بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردیی، فەرهەنگی کوردیی ـ عەرەبیی، گۆڤاری « پەروەردە و زانست »، ژمارە 4، بەغدا، 1972.
33. کەمال جەلال غەریب، فەرهەنگی زانیاریی، عەرەبیی ـ کوردیی، ب 1 ـ 2، سلێمانی، 1974.
34. کەمال جەلال غەریب، ئەلقاموس ئەلعلمی، عەرەبیی ـ کوردیی، بەشی یەکەم، 1974.
35. بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردیی، فەرهەنگی کوردیی ـ عەرەبیی، گۆڤاری « پەروەردە و زانست »، ژمارە 7 ـ 8، بەغدا، 1974.
36. زاراوی کارگێڕیی، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ، پێشەکیی و ڕێکخستنی د. کەمال مەزهەر، بەغدا، 193 ـ 1974.
37. زاراوی هەمەچەشنە، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ و لیژنەکانی، پێشەکیی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەغدا، 1974.
38. لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ، دانان و لێدوانی ئەنجوومەنی کۆڕ و لیژنەکانی، پێشەکیی و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، 1974.
39. محەمەد ئەمینی میسری سەییدیان،، کردی ـ فارسی ـ عەرەبی.

40. فەرهەنگی « ئەلقاموس ئەلعەسری » ، کوردیی ـ عەرەبیی، عەلی سەیدۆ گۆرانی.
41. ئەستێرە گەشە، کوردیی ـ عەرەبیی، فازیل نیزامەدین،1977.
42. عەبدوڕەحمانی زەبێحی، قامووسی زبانی کوردی، ب 1 ، 1977. ب 2، 1978.
43. فەرهەنگی لەک و لوڕ، حەمدی ئیزەدپەناە، 1978.
44. کەمال جەلال غەریب، ئەلقاموس ئەلعلمی، ئینگلیزیی ـ کوردیی، بەشی دووەم، 1979.
45. فەرهەنگی فارسیی ـ کوردیی، شوکوڵلای بابان، 1361.
46. هەژار، هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کوردی ـ فارسی، چاپی یەکەم، سروش، تهران، 1369.
47. کەمال جەلال غەریب، ئەلقاموس ئەلعلمی، عەرەبیی ـ ئینگلیزیی ـ کوردیی، بەشی سێیەم، 1983.
48. ق. کوردۆییڤ، ز. یوسف، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی « سۆرانی » ، دەزگای چاپەمەنی « زمانی ڕووسی » مۆسکۆ، 1983.
49. فەرهەنگی ئاری، کوردیی ـ کوردیی ـ عەرەبیی، سابیر حەمەد و عەلی عەبدوڵلا گردعازەبانیی، بەشی یەکەم، 1984.
50. فەرهەنگی نۆبەرە « ئەلباکورە » ، عەرەبیی ـ کوردیی، بەشی یەکەم، گیوموکریانیی، 1984.
51. فەرهەنگی گەنجینە، عەرەبیی ـ کوردیی، عەلی عەبدوڵلا، 1988.
52. فەرهەنگی کوردیی ـ ئینگلیزیی، شەوکەت ئیسماعیل حەسەن، 1989.
53. فەرهەنگ کاروانی، فارسیی ـ کوردیی، ئەبو بەکر ڕەشید، 1993.
54. فەرهەنگی زیوار، جەمال عەبدول، 1996.
55. فەرهەنگی شەوکار، جەمال عەبدول، 1998.

ئەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆکانەی زمانزان و ڕۆژهەلاتە بیانییەکانیش نووسیاویانە، ئەمانەن :

56. ماوریزۆ گارزۆنی 1787 . ئیتالیی ـ کوردیی.

57. پ.س. پالاس، فەرهەنگی بەراوردیی هەموو زمان و شێوەکان، پیترسبورگ، 1787.
58. کلودیۆس جێمس ریچ، 1836 ـ 1837.
59. پێوتەر لێرخ، 1856 ـ 1857 ـ 1858. کوردیی «کرمانجیی ژووروو» ـ ڕووسیی، کوردیی «زازا» ـ ڕووسیی.
60. سامۆل رهیا، 1872، فەرهەنگۆکی کوردیی ـ ئینگلیزیی.
61. ئەلێکساندەر ژابا، 1879. کوردیی ـ فرەنسیی.
62. ئەلبێرت سۆسین، 1887 ـ 1890، فەرهەنگۆکی کوردیی ـ ئەڵمانیی.
63. س. ئا. یەگیزارۆڤ، 1891. کوردیی ـ ڕووسیی و ڕووسیی ـ کوردیی.
64. مێجەر سۆن، لەندەن ـ 1913، بەغدا ـ 1919. ئینگلیزیی ـ کوردیی.
65. باسیل نیکیتین، ورمێ ـ 1916. فەرهەنگۆکی ڕووسیی ـ کوردیی.
66. ئاغا پێترۆس، بەغدا ـ 1920. ئاسووریی ـ کوردیی و یەزیدیی.
67. ر. ف. جاردین، بەغدا ـ 1922. کوردیی ـ ئینگلیزیی.
68. جویس بلاو، پاریس ـ 1965. کوردیی ـ فرەنسیی ـ ئینگلیزیی.
69. تۆفیق وەهبی، نیویۆرک ـ 1965. کوردیی ـ ئینگلیزیی.
70. تۆفیق وەهبی و ئەدمۆنس، لەندەن ـ 1966. کوردیی ـ ئینگلیزیی.
71. ئەرنێست مەکاریۆس، ئەمێریکا، 1967. کوردیی ـ ئینگلیزیی.
72. فەرهەنگی ژەنەڕاڵ ـ ئۆغۆدتۆبابا.

هەروەها، کۆمەڵێ فەرهەنگی دیکەش هەن، چ لە کوردستان و چ لە هەندەران، لە لایەن نووسەر و شارەزایانی زمانی کوردییەوە چاپکراون. لێرەدا نەمانتوانی، لەوە پتر درێژە بەم باسە بدەین. ئەو فەرهەنگانەی لە دوای ساڵەکانی هەرەسی «1975»ەوە، هێندێ لە خوێندکار و پەنابەرەکانی کورد، لە دەرەوەی وولات، بە گەلێ زمانی نەتەوەکانی جیهان دایاننناوە، گەلێکن. بەڵام، زۆربەیان لە جۆری فەرهەنگی بیانیی ـ کوردین.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم: هەر چەندە، کورد زۆر درەنگ، دەسی بە فەرهەنگادانان کردووە. بەڵام، گومانی تێدا نییە، هەموو ئەو فەرهەنگۆک و فەرهەنگانەی هەشن، چ لە کوردییەوە بۆ زمانە بیانییەکانی دیکە بێ، یا

له زمانه بیانییه‌کانه‌وه بۆ زمانی کوردیی بێ، بێ هه‌ڵه نین. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، زۆر گرنگ نییه و ده‌بێ، ده‌سی ڕێزیان لێ بنرێ. به‌ڵام، هێشتا بایی هێنده نین، تینوێتیی « خوێنده‌وارانی کورد، لێکۆڵه‌ر و توێژه‌ره بیانییه‌کان » بشکێنێن. بۆیه، له‌و بواره‌دا ده‌بێ، شاره‌زایان و کادیره ئه‌کادیمییه‌کانی کورد، چاکی چالاکیی لێ هه‌ڵکه‌ن، به هه‌موو شێوه‌یه ڕاژه‌ی زمانه‌که‌ی خۆیان بکه‌ن، ئه‌و ئامانجه مه‌زنه پیرۆزه‌ی، ڕۆڵه‌کانی نه‌ته‌وه‌که‌مان به‌دیبێنن. هه‌ر چی چۆنێبێ، ئێمه‌ی کورد، ئه‌و تۆزه فه‌رهه‌نگ و فه‌رهه‌نگۆکه‌مان هه‌یه، به‌ڵام، کورد پێویستی به پتر و پتریش هه‌یه.

ئه‌ز پێموایه، هه‌نگاوی یه‌که‌م ده‌بێ، له فه‌رهه‌نگه کۆنه‌کانه‌وه بهاوێژین. هه‌موو ئه‌و فه‌رهه‌نگۆک و فه‌رهه‌نگانه‌ی، چ له لایه‌ن دۆسته پسپۆڕه بیانییه‌کانی کورد و چ له لایه‌ن شاره‌زا و فه‌رهه‌نگناسه‌کانی کورد خۆیه‌وه، هه‌ر له کۆنه‌وه تا ئه‌وڕۆ، له سه‌ر زمانی کوردیی دانراون، پێویسته، وه‌ک گه‌نجینه‌یه‌کی به نرخ و له‌بن نه‌هاتووی زمانه‌وانیی کوردیی لێیان بڕوانین و هه‌ڵسوکه‌وتیان له‌گه‌ڵدا بکه‌ین. شاره‌زایانی ئه‌و بواره ده‌توانن، ده‌سێکیان پێدا بێنن، به ته‌واویی بژاریانکه‌ن، سه‌رله‌نوێ له سه‌ر ڕێبازێکی زانستانه ڕێکیانخه‌نه‌وه. پاشان، که‌ڵکیان لێ وه‌رگرن.

له هه‌نگاوی دووه‌میشدا، پێویسته، پسپۆڕ و شاره‌زایانی زمانی کوردیی، گرنگییه‌کی ته‌واو، به فه‌رهه‌نگ بده‌ن، به تایبه‌تیی فه‌رهه‌نگێکی زمانه‌وانیی « کوردیی ـ کوردیی »، له هه‌ر چوار دیالێکته سه‌ره‌کییه‌که‌ی کوردیی دانێن. هه‌روه‌ها ده‌بێ، بایه‌خێکی زۆر، به جۆره‌کانی فه‌رهه‌نگی « ئینسکلۆپیدیی و فیلۆلۆژیی » بده‌ن. زماننزان و زمانناسه‌کانی کورد، به په‌رۆشه‌وه له‌و بواره‌دا کاربکه‌ن.

باشتروایه، سه‌ره‌تا کۆمیته‌یه‌کی زمانه‌وانیی و فه‌رهه‌نگدانان دامه‌زرێنن، وه‌ک هه‌نگاوی یه‌که‌م، هه‌موو ئه‌و فه‌رهه‌نگانه‌ی تا ئه‌وڕۆ نووسراون، کۆکرێنه‌وه. پاشان ئه‌و کۆمیته‌یه، به هه‌موو ئه‌و فه‌رهه‌نگانه‌دا بچنه‌وه، به‌راوردێکیانکه‌ن، به ته‌واویی شه‌نوکه‌ویانکه‌ن و له بێژنگیانده‌ن، هه‌موو سه‌رکوزه‌ری هه‌ڵه و ناڕاستییه‌کانیان توڕده‌ن. ئینجا، له به‌ر ڕۆشنایی میتۆدێکی زانستانه‌دا، سه‌رله‌نوێ ڕێکیانخه‌نه‌وه، که‌ڵکیان لێ وه‌رگرن،

فەرهەنگێکی گەورەی نوێی کوردیی دانێن، وەک « مونجد »ی عەرەبیی وابێ، جێگەی زۆربەی زۆری ووشە کوردییەکانی تێدا بکرێتەوە.

## 10/ رانـــــــاو :

هێندێ جار، زۆربەی کوردە نەشارەزاکانی زمانی کوردیی و هێندێ لە خوێندەوارانیش، لێیان تێکدەچێ، جیاوازیی لە نێوان « پێشگر و پاشگر » و راناوەکاندا ناکەن. ئەمەش، پتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، زۆر بایەخ بە زمان و ڕێزمانی کوردیی نادەن. ئەوەی گومانی تێدا نییە، « پێشگر و پاشگر » و « ڕاناو »، دوو باس و بابەتی جیاوازن. هیچ جۆرە پێوەندیی و تێکەڵاوییەکیان نییە. لەبەرئەوە دەبێ، لە یەکدییان جیاکەینەوە.

پێشگر و پاشگر: لە چەن بەشێکی پچکۆلە پێکهاتوون، خۆیان بە تەنیا هیچ جۆرە واتایەک نابەخشن. بەڵام، لە پێش و پاشی هێندێ ووشەوە دێن، تێکەیشتنێکی نوێ بە واتای ئەو ووشانە دەبەخشن. وەک:(قرژاڵ ـ قرژ + ئاڵ. فیشاڵ ـ فیش + ئاڵ. بەهاران ـ بەهار + ئان. بەیانیان ـ بەیان + ئان. سوتاو ـ سوت + ئاو. خوڕاو ـ خوڕ + ئاو. قوڕاوی ـ قوڕ + ئاوی. خوێناوی ـ خوێن + ئاوی. تینوایەتی ـ تینو + ئایەتی. تینوێتی ـ تینو + ێتی. برسێتی ـ برسی + ێتی. دەسک ـ دەس + ئک. نەوسن ـ نەوس + ئن. باڵندە ـ باڵ + ئندە. دڕندە ـ دڕ + ئندە. سەرۆک ـ سەر + ئۆک. بارۆکە ـ باڕ + ئۆکە، جندۆکە ـ جند + ئۆکە. مێتوولکە ـ مێت + ئوولکە. مێرووڵکە ـ مێروو + ئوولکە. مێشوولە ـ مێش + ئوولە. مێروولە ـ مێروو + ئوولە. دارەکە ـ دار + ئەکە. شوانەکە ـ شوان + ئەکە. ووردیلانە ـ وورد + ئیلانە. خنجیلانە ـ خنج +ئیلانە. خوێندنەوە ـ خوێندن + ئەوە. سوڕانەوە ـ سوڕان + ئەوە. کوپەڵە ـ کوپە + ڵە. گۆزەڵە ـ گۆزە + ڵە. کوڕگەل ـ کوڕ + گەل. گاگەل ـ گا + گەل. بەردەڵان ـ بەرد + ەڵان. ئەحمەدیلە ـ ئەحمەد + یلە. قوڵنگ ـ قوڵ + نگ. بێژنگ ـ بێژ + نگ. براینە ـ برا + یینە. خزمیینە ـ خزم + یینە.) «16، 50 ـ 52»

یا وەک پێشگرەکانی: هەڵفڕی ـ هەڵ + فڕی. هەڵسا ـ هەڵ + سا. هەڵلوشین ـ هەڵ + لوشین. داتاشین ـ دا + تاشین. داهێشتن ـ دا + هێشتن. دانیشتن ـ دا + نیشتن. داهێنان ـ دا + هێنان. ڕۆکردن ـ ڕۆ+

کردن. ڕۆنان ـ ڕۆ+ نان. ڕاگوێزان ـ ڕا + گوێزان. ڕاکردن ـ ڕا + کردن.
بەڵام « ڕاناو »: لە چەن ووشـەیەکی دیاریکراو پێکهـاتووە، لە بری ناوێ بەکاردێ، ئیدی ناوەکە، کەسی یەکەم یا دووەم بێ، تاک یا کۆ بێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. لە زمانی کوردییدا، سێ جۆر ڕاناوی سەرەکیمان هەیە :
یەکەم : ڕاناوی کەسیی ـ ئەمەش دیسانەوە دوو جۆرە :
1. نەلکاو: « سەربەخۆ، جیا، مەند »یشی پێ دەڵێن. بۆ کەسی یەکەم، دووەم و سێیەم، تاک و کۆکەی ئەمانە بەکاردێنرێن: « من، ئێمە، تۆ، ئێوە، ئەو، ئەوان ». ئەم جۆرە، بە شێوەیەکی گشتیی، لە سەرەتای ڕستەدا دێ. بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەنووسرێن، پێوەندیی بە کردارەوە نییە.
2. لکاو: « پێوەنوساو، بەسراو، چالاک »یشی پێ دەڵێم. وەک: «م، مان، ین، ت، تان، یان، ی، ێ، یت، ن). ئەم جـۆرەشـیـان، بە شـێـوەیەکی گشتیی، لە کۆتایی ڕستە کورتەکاندا دێن. لەگەڵ ناو و کردارەکاندا پێکەوە دەنووسرێن و پێوەندیشیان بە کردارەکانەوە هەیە.
لەوە دەچێ، هێندێ نووسـەر هەبن، جیـاوازیی لە نێـوان زمـانی ئاخـافتن و نووسین، زمـانی نووسین و دیالێکتـەکـاندا نەکەن. لەبەرئەوە، ئەم بۆچوونە، لە دابەشکردنی ڕاناوەکانیشدا ڕەنگیانداتەوە. بۆ نموونە: « لیژەی ڕێزمانی کۆڕی زانیاری کورد » بەم شێوەیەی خوارەوە، ڕاناوەکانیان دابەشکردووە :
ا ـ بۆ کەسی یەکەم :
1. تاک : من، ئەز، ئەمن، م .
2. کۆ : ئێمە، ئەمە، ئەم، مە .
ب ـ بۆ کەسی دووەم :
1. تاک : تۆ، ئەتۆ، ئەتوو، توو، تە.
2. کۆ : ئێوە، ئەنگۆ، ئەوە، هەوە، هوین، هنگ، وە .
ج ـ بۆ کەسی سێیەم :
1. تاک : ئەو، ئەوێ، وێ، ویی، ئەویی .
2. کۆ : ئەوان، وان، ئانا، ئەو ، وا .   «107، 124-125»
بە لای منەوە، تەنیـا ئەم ڕاناوانە، « من، ئێـمـە، تۆ، ئێـوە، ئەو، ئەوان » بە ڕاناوی سەربەخۆ دادەنێم، چونکە :

یەکــــەم : ئەو ڕاناوانە هەمـــوو یەک واتایان هەیە و بۆ یەک کـــەس بەکاردێنرێن. بەڵام، بەپێی دیالێکتەکان دەگۆڕێن.
دووەم : ئێـمە باسی زمـانی یەکگرتووی کـوردیی و نووسین دەکـەین، باسی دیالێکتەکان ناکەین، لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، بەو ڕاناوانە دەڵێن چی؟ لە نـووسـیندا دەبێ، هەمـــوو وەک یەک و بە یەک ڕەنگ بنووسین، بەڵام، لە ئاخـافـتندا، هەر کـوردێ ئازادە، چۆن قسـەدەکـا و کـام سینۆنـیـمی ڕاناوەکـان بەکاردێنێ. جا گـەر وا نەکـەین، تا کـوردێ مـابێ، یەک زمـانی یەکگرتووی نووسین پێک نایە.
ئەو دیالێکتـــانە لە هەمـــوو زمـانێکدا هەن، بەڵام، هیچ نەتەوەیەک بەو شـێـوەیە، ڕاناوەکـانی دیاری ناکـا، بەڵکوو، بۆ هەر جـۆرێک و بۆ هەر کەسێک، یەک جۆرە ڕاناوی یەکگرتووی دیاریکراو هەیە.
لە ڕێنووسی کـۆنی کـوردیدا، نـووسـەرەکـانمان ڕاناوەکـانیـان بە ناوەکـانەوە نەدەنووسـان. هەر چەندە، تا ئێـسـتـەش، هێندێ نووسـەر هەر لە سـەر ئەو شێـوازە کـۆنە دەڕۆن، بە تایبـەتیی کـاتێ ڕاناو لە شێوەی کۆدا بەکاردێن. بەڵام، لە ڕاستیدا، ئەو شێوە نووسینە نە ڕاستە و نە جوانیشـە. بەڵکوو، هەموو ڕاناوە لکاوەکـان دەبێ، بەپێی ناوەکانی خۆیان پێکەوە بنووسرێن.
بۆ نموونە: « مـاڵەکەم، کۆڵانەکەم، گەڕەکەکەم. شارەکەمان، نـاوچەکـەمـان، هەرێـمـەکـەمـان. گـەیشـتـین، ڕۆیشـتـین، چووین. خـاکـەکـەت، وڵاتەکـەت، نیـشـتـمـانەکەت. چوویت، هـاتیت، نووسیت. گەلەکەتان، نەتەوەکـەتان، دەوڵەتەکـەتان. یـارەکـەیان، دۆسـتـەکـەیان، دراوسێکەیان. گـیـانەکـەی، چاوەکەی، گوڵەکـەی. دەپەیڤێ، دەنووسێ، دەچڕێ. دەسووتێن، دەگـیـرێن، دەکوژرێن... تاد) نەک (ماڵە کەم، کۆڵانە کەم، گەڕەکە کەم. شارە کەمان، ناوچە کـەمـان، هەرێـمە کـەمـان. گـەیشت ین، ڕۆیشت ین، چوو ین. خـاکـە کەت، وڵاتە کەت، نیشتمانە کەت. چوو یت، هات یت، نووس یت. گەلە کـەتان، نەتەوە کـەتـان، دەوڵە تەکـەتان. یارەکـە یان، دۆسـتـەکـە یان، دراوسێکە یان. ... تاد ».
دووەم : ڕاناوی خۆیی یا هاوبەش : وەک: « خۆم، خۆمان، خۆت، خۆتان، خۆی، خـۆیان) ئەم ڕاناوانەش، هێندێ جـار لە سـەرەتای ڕسـتـەوە، دوای

بکەر دێ. وەک:« من خۆم دەڕۆم. ئێمە خۆمان دێین. تۆ خۆت دەچی. ئێوە خۆتان نایەن. ئەو خۆی هات. ئەوان خۆیان دوورن. » هێندێ جاری دیکەش، بکەر دانانرێ، هەر ڕاناوەکان خۆیان، لە سەرەتای ڕستەکانەوە دێن. وەک: « خۆم دەڕۆم. خۆمان دێین. خۆت دەچی. خۆتان نایەن. خۆی هات. خۆیان دوورن. » لە هەر دوو نموونەکەدا، کۆتایی کردارەکان بە ڕاناوێکی لکاو دێ، بە مەرجێ لەگەڵ ڕاناوە سەربەخۆکەدا بگونجێ.

سێیەم : ڕاناوی هەبوون : وەک: « هی من، هی ئێمە، هی تۆ، هی ئێوە، هی ئەو، هی ئەوان ». وا بزانم، پێویست ناکا، نموونەیان لە سەر بێنینەوە. چونکە، ڕاناوەکان خۆیان دیارن.

بەڵام، ئەم ڕاناوە لکاوانە، هێندێ جار لەگەڵ پێشگرێکدا یەکدەگرن و شێوەیەکی تایبەتیی وەردەگرن، یەکسەر واتایەکی تایبەتیی بە دەسەوەدەدەن. وەک: « پێم = پێ + م ـ پێم گوت. پێمان = پێ + مان ـ پێمان گوت. پێت = پێ + ت ـ پێت دەڵێم. پێتان = پێ + تان ـ پێتان دەڵێم. پێی = پێ + ی ـ پێی بڵێ. پێیان = پێ + یان ـ پێیان بڵێن ».

هەروەها ، هێندێ ووشەمان هەیە، لە زمانی کوردییدا وەک پێشگر وان، گەر بە تەنیا بیانووسین، هێندێکیان واتایەکی جیاوازیان هەیە، هێندێکی دیکەشیان هیچ جۆرە واتایەکیان نییە. لەبەرئەوە، باشتروایە، لەگەڵ کردارەکاندا پێکەوە بنووسرێن. بۆ نموونە: « پێ، تێ، جێ، لێ، وەر، هەر، هەڵ ... تاد » وەک: « پێداگرتن، پێڕەوکردن، پێداهەڵدان، تێکردن، تێترنجاندن، تێهەڵکێشکردن، جێماو ، جێگر، جێبەجێکردن، لێوەشاوە، لێهاتوو، لێوەرگرتن، وەرگێڕان، وەرچەرخان، وەرگەڕان، هەروەها ، هەرئەوە، هەرهەمووی، هەڵبژاردن، هەڵوەران، هەڵلووشین ... تاد ». نەک « پێ داگرتن، پێ ڕەوکردن، پێ داهەڵدان، تێ کردن، تێ ترنجاندن، تێ هەڵکێشکردن، جێ ماو، جێ گر، جێ بەجێ کردن، لێ وەشاوە، لێ هاتوو، لێ وەرگرتن، وەر گێڕان، وەر چەرخان، وەر گەڕان، هەر وەها ، هەر ئەوە، هەر هەمووی، هەڵ بژاردن، هەڵ وەران، هەڵ لووشین ... تاد ».

هێندێ جار، چ لە ئاخافتن و چ لە لە نووسیندا، هەر دوو جۆرە ڕاناوەکە بەکاردێنین. بەڵام، لە هەمان کاتدا، ڕاناوە لکاوەکان، جێگەی ڕاناوە

سەربەخۆکان دەگرنەوە. واتە، دەتوانین، بەکاریان نەهێنین. «ڕاناوی لکاو» لە ڕستەدا دەتوانین، بە چەن شێوەیە بەکاریبێنین، وەک :
من گللەییم زۆر لە تۆ هەیە.
من گللەییم لە تۆ زۆر هەیە.
من گللەییم لە تۆ زۆرە.
یا دەتوانین، یەکسەر بلێین :
گللەییم زۆر لە تۆ هەیە.
گللەییم لە تۆ زۆر هەیە.
من گللەییم لە تۆ زۆرە.
یا دەتوانین، کوتتریکەینەوە و بنووسین:
گللەییم زۆر لێتە.
گللەییم لێتە، زۆر.
لەو زمانانەی، جیاوازیی نێوان نێر و مێ هەیە، ژمارەی ڕاناوە سەربەخۆکان پترن. وەک لە زمانی عەرەبیدا «بۆ نێر ـ هو و مێ ـ هی»، لە زمانی ئینگلیزیدا، «He و She»، لە زمانی سویدیدا «Han و Hon» و لە زمانی ڕووسیشدا، نەک هەر بۆ نێر و مێ، بەڵکوو بۆ مامناوەندییش، ڕاناوی تایبەتیی هەیە. وەک «بۆ نێر OH ـ ئۆن، بۆ مێ OHA ـ ئەنا، بۆ مامناوەندیی OHO ـ ئەنۆ.»
لە زمانی کوردییدا، هێندێ لە ڕاناوەکان «ڕاناوە لکاوەکان»، ڕۆڵی کرداری یاریدەدەر دەبینن. وەک: «م، یت، ین، ن، ە». بۆ نموونە: من مەردم. تۆ ڕووتیت. ئێمە گەورەین. ئەوان سەروەرن. ئەو جوانە.
11/ ئامرازەکانی زمانی کوردیی :
تا ئێستە، هێندێ نووسەر و شارەزا، لە سەر ئامرازەکانی زمانی کوردیی، چەن گوتار و نامیلکەیەکیان نووسیوە. بەڵام، باوەڕ ناکەم، هیچ نوسەرێ وەک د. «برایم عەزیز»، بەو شێوە دووردرێژە، لە سەری نووسیبێ. لەبەرئەوە، لێرەدا هەوڵدەدەین، کەمێ بە درێژیی، سەرنجی دید و بۆچوونەکانی دوکتۆر بدەین، بە دەم باسکردن و دەمەتەقێوە، ئامرازەکانیش ڕووندەکەینەوە. دوکتۆر ئامرازەکان بەم شێوەیە دابەشدەکا :

پارەی یەکەم ـ ئامرازی مۆرفۆلۆژی :

1. ئامـــرازی بانگکردن: (ئەی، هۆ، هێ، یا، ۆ، ە، ێ)«3،9» لە زمـــانی کوردیدا، « هێی » پتر بەکاردێنرێ وەک لە « هێ ».

ئەی گەلی کوردی قـارەمان!. هۆ کاکەی شوان!. هێ نازەنین. هێ خەجێ. هێ دایە. یا پێغەمبەر هاوار. کوردۆ وەرە. عەزۆ برۆ. کورە وەرە. کاکە بچۆ. بابە. برایە. خزمە. بۆ کۆ : براینە. خزمینە. کچینە. خوشکینە. پورێ، خوشکێ، کچێ.

2. ئامـرازی پرسیـــار: (بۆ، چ، بۆچ، بۆچی، ئایا، کەی، چەند، چی، کێ، کامە، کوا، لەبەرچی، « لە کوێ، بۆ کوێ، تا کوێ ») «10،9» بەڵام «چۆن، چلۆن، چۆنچۆنی و چییە »ی لە یادکردووە، ئەمـانیش چوار نیـشـانەی پرسیارن. « چۆنچۆنی » هەر لە « چۆن »ەوە وەرگیراوە، بەڵام ئەوە زیاتر بۆ جەختکردن بەکاردێ. هەروەها، ئەم ئامرازانەی « کام، کامیان، کەنگێ، کوێ، تا کەی، هەتا گەنگێ، کیهە » باس نەکردووە. « کامە و کامیان و کیهە » لە « کام »وە وەرگیراون، وەک: کام چنارە دەڵێی؟. « کەنگێ » لە « کەی »وە وەرگیراوە. « لە کوێ، بۆ کوێ، تا کوێ »لە ئامرازی «کوێ »وە هاتوون. وەک کـوێ دەڵێی؟ « تا کـەی، هەتا کـەنگێ » دوو ئامـــرازی پرسیارکردنی ئاوێتەن، لە « کەی »وە وەرگیروان. « کیهە » لە « کێ »وە نزیکە. بە کوردتییەکەی، هەمـوو ئەو ئامرازانە، بەپێی ناوچە و دیالێکت دەگۆڕێن.

3. ئامرازی سەرسوڕمـان: (هەیهـا، پەکـوو، پەکـوف، حەک، هەک، پێح، پەحا، « تەح، تەحە، تەحا »، ئەک، هەو، چش، « وای، ئای، ئۆخەی »، ئاخ، ئۆف، بەه بەه) «16،9» جگە لەوەی دوکـتـۆر « هەیهـوو، پەح »ی بیرچووە، هێندێ لەو ووشانە بە ئامرازی سەرسوڕمان دانانرێن. بۆ نموونە: « چش » کـاتێ بەکـاردێنرێ، کـە بمانەوێ، بڕیارێ بدەین، یا کـارێ بکـەین، نازانین، قازانج دەکەین، یا زیانی لێ دەبینین، لەبەرئەوە دەڵێین: هەر چەندە دەزانم، یا هەر چەندە نازانم، ئەنجامی ئەو کارە چۆن دەبێ، بەڵام، چش من هەر دەیکەم. جگە لەوەی « وەی » باس نەکـردووە، « وای، ئای » زۆر کـەم وەک ئامرازی سەرسوڕمـان بەکاردێنرێن، بەڵکوو، کـاتێ بەکـاردێنرێن، کە

یەکێ قسەیە بڵێ، یا کارێ بکا، ئەنجامەکەی دیاربێ، مرۆڤ بە دڵی نەبێ، یا بە لایەوە ڕاست نەبێ، لەبەرئەوە دەڵێین: « وای » یا « وەی » کە کارێکی خراپە. « ئای » چی بە خۆی کرد. ئەمانە، پتر بۆ ئەوە دەشێن، یەکێ بە داخەوە، باسی شتێ یا کردەوەی یەکێ یا لایەنێکی دیکە بکا. « ئۆخەی » کاتێ دەگوترێ، کە یەکێ مژدەیەکی خۆشت دەداتێ. وەک، کەسی یەکەم دەڵێ: جەنگی نێوخۆ تەواوبوو. کەسی دووەم دەڵێ: ئۆخەی، دەمێ بوو، چاوەڕوانی هەواڵێکی وابووم.
هەروەها، « ئاخ، ئۆف »یش، تەنیا لەو کاتانەدا دەگوترێن، کە مرۆڤ بیری کەسێکی ئازیزی کۆچکردووی خۆی دەکەوێتەوە، یا یادی بیرەوەرییەکی پیرۆز دەکاتەوە، کە سەری نەگرتووە. ئەو کاتە بە هەناسەهەڵکێشان و بە دەم خەفەتەوە دەڵێ: ئاخ، برا جوانەمەرگەکەم. ئاخ، بۆ نەتەوە ژێردەسەکەم. ئۆف، تا دەمرم بیرم ناچێتەوە. هەروەها، کاتێ یەکێ ئازاری پێ دەگا، یا یەکێ ئازاری پێدەگەیەنێ، هاواردەکا و دەڵێ: ئاخ دەسم سووتا، ئاخ دەس بریندارکردم. ئۆف پشتم شکا، ئۆف ماڵی وێرانکردم.
4. ئامرازی ناسراو و نەناسراو: (کە، ە کە، ێک، ە ک، یەک، ێ) «18،9»
زەریا ـ زەریاکە، دەرگا ـ دەرگاکە. پیاو ـ پیاوەکە، خانوو ـ خانووەکە. ڕێگە ـ ڕێگەکە، هەرمێ ـ هەرمێیەک. لێرەدا دوکتۆر دەڵێ. (ئەگەر هاتوو وشەکە یان ناوەکە کۆتایی بە پیتی بزوێنی « وو، و » هاتبێ ناوەکە ئامرازی « یەک » وەرناگرێ بەڵکوو « ێک » وەردەگرێت، وەک خانوو خانووێک نەک خانوویەک.) «19،9» بە باوەڕی من، ئەمە ڕاست نییە، بەڵکوو دەتوانین، هەر دوو شێوەکە بەکاربێنین. کێو ـ کێوێک، دار ـ دارێک. بۆ ئامرازی « ێ » دەڵێ: (ئەمەش ئامرازێکی نەناسراوە، تایبەتە بەو ناوانەی کە کۆتاییان بە پیتی بزوێن نەهاتووە : گوند گوندێ، کورد کوردێ.) «20،9» بەڵام، ئەمە ڕاست نییە، چونکە لە هێندێ باردا، هێندێ ووشە بە پیتی بزوێنی « و » کۆتاییدێ، کەچی دەتوانین، بەکاربێنین، وەک : لاو ـ لاوێ، پیاو ـ پیاوێ. هەروەها، بۆ ئامرزای « ە ک »ش دەڵێ: (ئامرزاێکی نەناسراوە، بەو ناوانەوە دەلکێ، کە کۆتاییان بە پیتی نەبزوێن، وەک لە خوارەوەدا دیارە :

ژن ژنەک، کوڕ کوڕەک، کچ کچەک.)«20،9» هەر چەندە، ئەم شێوە دەربڕینە، لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروودا زیاتر بەکاردێنرێ. بەڵام، دیسانەوە ئەم بۆچوونەش، هەر ڕاست نییە، چونکە دەتوانین، بۆ هێندێ پیتی ڤاوڵی وەک « و » بەکاریانبێنین. وەک: پیاو ـ پیاوەک، لاو ـ لاوەک. بەڵام، لە هەر دوو بارەکەدا، ڕاسترووایە، بۆ ئەم نموونانە، ئامرازی « ێ » بەکاربێنین و بڵێین: ژنێ، کوڕێ، کچێ، پیاوێ، لاوێ.

5. ئامرازی کۆ:(ا ن ، هات، جات، وات، گەل)«21،9» نووسەر ـ نووسەران، ژن ـ ژنان، پیاو ـ پیاوان. پاشان دەڵێ:(ئەگەر ئامرازی « ا ن » چووە سەر ئەو ناوانەی کە کۆتاییان بە پیتی بزوێن « ا، ی، ێ، ۆ » هاتووە، لێرەدا ئامرازی کۆی « ی » وەردەگرێت و فۆرمی « یان » دروست دەبێت. وەکوو: چیا چیا یان، هەرمێ هەرمێ یان، هەڵۆ هەڵۆ یان)«21،9» دیارە، ئەمە بەپێی نێوچە و دیالێکتە جۆربەجۆرەکانی، زمانی کوردیی دەگۆڕێ. لەبەرئەوە، گەر بە شێوەیەکی ڕەها بیگرین، ڕاست نییە. چونکە، لەو نموونانەی نووسەر هێناونیتیوە، ڕاسترووایە، بەم شێوەیە بنووسرێن: چیا ـ چیاکان، هەرمێ ـ هەرمێکان، هەڵۆ ـ هەڵۆکان.

هەروەها، دەڵێ:(ئامرازی « ا ن » دەتوانێ، بچێتە سەر ناوی دیارخەر، بۆ نموونە: خوێندکاری زیرەک خوێندکارانی زیرەک)«22،9» بە باوەڕی من، ئەم دارشتنە هەڵەیە، چونکە پێویستە، ئاوەڵناوەکە ئامرازی کۆی « ا ن » وەرگرێ، نەک ناوەکە. لەو کاتەشدا، ئاوەڵناوی کۆ بۆ ناوەکە دەگەڕێتەوە، جا هیچ گرنگ نییە، گەر لە دوای ئامرازی « ا ن »ەوە، ناوی دیارخەر بێ، یا گەر بە دوای ناوی دیارخراودا دیارخەرێکی ناسراو هاتبێ، وەک نووسەر لە تێبینی ژمارە یەکدا ڕوونیکردۆتەوە. واتە: دەبێ، بۆ تاک بڵێین: خوێندکاری زیرەک ـ خوێندکارە زیرەکەکە. بۆ کۆش بڵێین: خوێندکارە زیرەکەکان. ئایا دەڵێین: کوردانی زیرەک یا کوردە زیرەکەکان!

لە کۆندا، ئەو ووشانەی بە کۆنسۆنانت کۆتاییاندەهات، بۆ کۆ، ئامرازی « ا ن » بەکاردێنرا. وەک:« داران، ئەسپان ». هەروەها، بۆ ئەو ووشانەی بە ڤاوڵ کۆتاییاندەهات، « یان »یان دادەنا. وەک: « هاوڕێیان، برایان ». بەڵام، لەبەرئەوەی لە سەر زبان ناخۆش و قورسبوو، ئێستە گۆڕاوە.

بۆ کۆنسۆنانتەکان، « ەکان » وەردەگرێ. وەک: « دار + ەکان = دارەکان. ئەسپ + ەکان = ئەسپەکان. » بۆ ڤاولەکانیش، بەپێی مەبەس و ڕستەکە دەگۆڕێ، واتە: هەر دووکیان بەکاردێنرێن. وەک: « هاوڕێیان ـ هاوڕێکان ـ هاوڕێکانم. برایان ـ براکان ـ براکانم ».

ئەوە جگە لەوەی، دەربارەی هەر دوو ئامرازی کۆی « هات و جات »، نووسەر دەڵێ: (ئەم ئامرازە زۆر کەم لە زمانی کوردیدا بەکاردێت و تەنیا لە وشەی « دیهات و میوەهات »دا دیارە)«23،9» پاشان دەڵێ: (هەروەها ئەمیش ئامرازێکی کۆیە و لە زمانی کوردیدا کەم بەکاردێت و لە وشەی «میوەجات »دا دیار دەکەوێت. سەوزە + وات = سەوزەوات. ئاغا + وات = ئاغاوات.)«23،9» بە باوەڕی من :

یەکەم : پاشگری « هات و جات » لە بنەڕەتدا کوردیی نین. لەوە دەچێ، زیاتر لە زمانی عەرەبییدا بەکاربێنرێ. ئامرازی کۆی « ا ت » لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە، کوردیش بەپێی هەڵکەوت و خەسڵەتی تایبەتیی زمانەکەی خۆی، پیتی « ﻫ ، ج »ی بۆ زیادکردووە، لە زمانی کوردییدا، شێوەی « هات و جات »ی وەرگرتووە و جێگەی خۆی گرتووە. وەک :

« تورهات، ترتیبات، مستلزمات، مؤمرات، مؤتمرات ... تاد) .

دووەم : نووسەر، کاتێ نموونەیەکی، لە سەر هەر دوو ئامرازی کۆی « هات و جات » هێناوەتەوە، وا دیارە، لێی تێکچووە. چونکە، لە ژێر هەر دوو ئامرازەکەدا، هەر هەمان نموونەی لە سەر ئامرازی کۆی « هات » هێناوەتەوە. وەک (دیهات، میوەهات، سەوزەوات، ئاغاوات) بەڵام، تەنیا یەک نموونەی بۆ ئامرازی کۆی « جات » هێناوەتەوە، ئەویش« میوەجات »ە کە لە هەمان کاتیشدا دەتوانین، ئامرازی کۆی « میوەهات »یش بەکاربێنین. کەواتە، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەو دوو ئامرازەدا نییە.

6. ئامرازی کردار: (ب، با یە، دە، ە ر، ر ی، ر ا)«24،9» لێرەدا نووسەر، ئامرازی کرداری « ڕ ێ، راو »ی لە بیرچووە. کەچی، نموونەشی لە سەر هێناونەتەوە و نموونەی لە سەر ئامرازی « ڕ ی » نەهێناوەتەوە، وەک کورد ـ کوردەواری. دڵ ـ دڵداری. میوان ـ میوانداری. من پێموایە، « دە » بە ئامرازی کردار دانانرێ، بەڵکوو، وەک پێشگرێ لە لقەدیالێکتی

موکرییدا بەکاردێنرێ. لە بری ئەو « دە »یە، لە لقەدیالێکتی سولەیمانیدا، پێشگری « ئە » بەکاردێ. بۆ نموونە: دەخۆم ـ ئەخۆم، دەکەم ـ ئەکەم، دەشۆم ـ ئەشۆم. جا گەر، « دە » ئامرازی کردار بێ، نووسەر دەبووایە، پێشگری «ئە »شی لە ڕیزی ئامرازەکانی کردارا ڕیزکردایە! خواردن ـ بخۆ، بخواردایە. کردن ـ بکە، بکردایە. پێوان ـ بپێوە، بپێوایە. نووسین ـ بنووسە، بنووسیایە. شێلان ـ بشێلە، بشێلایە. ناشتن ـ دەناشترێ، دەنێژرێ، نێژرا. بینین ـ دەبینرێ، بینرا، بینراو. نووسین ـ نووسەر، نووسراو.

7. ئامرازی پێوەندیی:(بۆ ، ە ، لەگەڵ ، لە ، بە )«28،9» نووسەر هەر سێ ئامرازی پێوەندیی « ی ، وەک و دەڵێی »ی نەنووسیوە. جا نازانم، بیریچووە، یا هەر لە بنچینەدا بە ئامرازی پێوەندییان دانانێ؟!! بۆ نموونە:
بۆ ئامرازی « ی » دەڵێین : کوردۆ چاوی شینە. برایم سمێڵی ڕەشە. جوامێر خوێنی شیرینە.
بۆ ئامرازی « وەک » دەڵێین: نازە وەک گوڵ وایە. لانە وەک کەروێشک خەودەکا. عەلی وەک قەل دەقیڕێنێ.
هەروەها، بۆ ئامرازی « دەڵێی » دەڵێین: قالە دەڵێی گورگە دەلوورێنێ. ئەحە دەڵێی مارە دەفیشکێنێ. خولە دەڵێی سەگە دەوەڕێ.

نووسەر، لە کۆتایی بەشی حەوتەمدا، تێبینییەکی نوسیوە و دەڵێ:(لە ئامرازە سەرەکییەکانی پێوەندیی لە زمانی کوردییدا « و » ە کە پێوەندیی دوو وشە یان دوو ناو یان دوو ڕستە پێکدێنێ.)«9،29-30» لە ڕاستیدا، پیتی « و » ئامرازی پێوەندیی نییە، بەڵکوو، بە ئامرازی لێکدەر دادەنرێ. دیارە، نووسەر خۆشی لەوە بە گومانبووە، ئەگینا ، هەر لە سەرەتادا، لە ڕیزی ئامرازەکانی دیکەی پێوەندیی دەینووسین!

دەربارەی ئامرازەکانی پێوەندیی و لێکدەر، مامۆستا « هەورامانیی » هەر دوو جۆرەکەی تێکەڵاوکردووە.. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، بە هەڵەیەکی گەورەی زمانەوانیی دادەنرێ. چونکە ئامرازی پێوەندیی:(ئەو ووشەیەیە کە لە ڕستەدا بەندیواریی نێوانی ناوێک یا ئاوەڵناوێک یا ئاوەڵفرمانێک لە تەک ووشەکانی تری ڕستەکەدا دەردەخات، وەک: « بە، بۆ، ە، ی، وەک، لە و» «53،118» بەڵام ئامرازی لێکدەر:(ئەو ئامرازەیە، کە دوو شت لە

واتادا « مانادا » به یەکەوە دەبەستێت. وەکوو : « و، بەڵام، بەڵکو، یا، نەک، چونکە »)«59،118» کەچی، مامۆستا « هەورامانیی » دەڵێ:
(بۆ لێکدانەوەی دوو ڕستەی سادە لە سەر یەکتری هەندێ ئامرازی پەیوەز = پەیوەست هەن و ئەمانەش زۆربەیانن. « و، بەڵام ـ وەلێ، یا، نە، بۆیە، گەر ـ ئەگەر ـ ئەر، چونکە، هەرچی، کەی، گەرچی ـ ئەگەرچی، هەر، کە، بە تێکەڵاوی ئامرازی « کە » و « هەر »، داخەکەم، دوای ئەوە، وەلێ، وەختێ، زیادە، سەرەڕای، چەند، تەر، جە»)«100،311ـ314»
ئەمە جگە لەوەی، هەر دوو ئامرازەکەی تێکەڵاوکردووە، هێندێ لەو وشانەش، بە ئامرازی پێوەندیی دادەنێ. بۆ نموونە: بە هیچ شێوەیە، ئامرازە پێوەندییەکانی سەرەوەی نەنووسیوە. هەروەها تەنیا « و، بەڵام، یا، چونکە »ی بە ئامرازی لێکدەر داناوە. « بەڵکوو و نەک »ی، بە ئامرازی لێکدەر لە قەڵەم نەداوە. « بەڵام و وەلێ »ش یەک واتایان هەیە، دوو جار دووبارە کراونەتەوە. جارێ (بەڵام و وەلێ) پێکەوە هاتوون. جاری دووەمیش « وەلێ » بە تەنیا هاتووە. ئەوانەی دیکەشیان کە دەمێننەوە، تەنیا وشەن، وەک هەر وشەیەکی دیکەی زمانی کوردیی بەکاردێنرێن.
8. ئامرازی خۆزی « کاش »:(خۆزگە، خۆزیا، بریا، کاشکێ)«31،9» هەر وەک پێشتر ڕوونمانکردەوە، زمانی کوردیی، لە چەن دیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە. لەبەرەئەوە، لە هەر ناوچەیە، بە شێوەیەکی جیاواز ئاخافتن دەکەن، زاراوەی جۆربەجۆر بەکاردێنن. بەڵام، لەبەرئەوەی بە هەموویان یەک زمان پێکدێنن، ڕەگی وشەکان چوونیەکن. بۆیە ئامرازی« خۆزگە و خۆزیا» هەر بە یەک ئامراز دادەنرێن و دوو ئامرازی جیاواز نین، چونکە ڕەگی هەر دووکیان، لە « خۆز » پێکهاتووە و یەک واتاشیان هەیە.
9. ئامرازی نەفی « نەرێ »: نووسەر دەڵێ:(لە زمانی کوردیدا سێ ئامراز هەیە نەفی پیشاندەدات، وەک « نە ، نا ، نەخێر »)«33،9» کەچی، هەر لە دوای ئەو دوو دێڕەوە دەڵێ:(لەگەڵ مە )«33،9» کەواتە، چوار ئامرازی نەرێمان هەیە! بەڵام « نەء »یش بەکاردێنرێ. لە ڕاستیدا، « نە، نەء و نا» زۆر لە یەکدییەوە نزیکن، هەر کامێکیان بۆ ڕەتکردنەوەی قسەیەک یا کارێ بەکاربێنین، بە هەڵە دانانرێ. بەڵام، « نە » پتر بۆ پرسیارکردن

بەکـاردێنرێ، وەک نەخـۆم؟ نەنووم؟ نەڕۆم؟ بەڵام، وەک نووسـەر دەڵێ: (جاری وا هەیە ئامـرازی « نە » دەکـەوێتـە پێش ناویـش و ناوەکە بە نەفی پێشاندەدا، وەکوو: نە ڕزگارم دی نە ئازاد)«33،9»
بە باوەڕی من، کاتێ کرداری ڕەتدەکەینەوە، لە بری « نە »، ئامرازی « نا » بەکاربێنین. بۆ نموونە: نەخۆم، نەبم، نەنووسم. باشتروایە، بنووسین: ناخۆم، نابم، نانووسم. بەڵام، بۆ کـاتی ڕابردوو، باشـتـروایە، « نە » بەکـاربێنرێ، وەک: نەمـزانیـوە، نەمزانیـبـوو، نەمدەزانی. نەک نامـزانیـوە، نامـزانیبـوو، نامدەزانی. « نەخێر » بۆ وەڵامدانەوە بەکاردێنرێ. « مە » لەگەڵ کرداری فەرماندا دەگـونجێ، وەک: مەخۆ، مەڕۆ، مەنووسە، مەیشکێنە، مەیخۆ، مەیخۆرەوە، مەچۆ، مەکە، مەبە ... تاد.
10. ئامـرازی پلەی بەراورد و باڵا: نووسەر ئەمەی، یەکسەر لە عەرەبییەوە وەرگـێـڕاوە. بەڵام ڕاسـتـتـر وایە، تەنیـا (ئامـرازی پلەی بەراوردکـردن) بەکاربێنین. نووسەر دەڵێ:(لە زمانی کوردییدا سێ ئامـراز بۆ پلەی باڵا و بەراوورد بەکـاردەچن کـە بریتین لە « تر ، ترین، هەرە » ئەم ئامـرازانە تایبەتن بە ئاوەڵناوەوە و دەچنە سەر ئاوەڵناو و پلەی بەراورد و باڵا پێشان دەدەن، بۆ نموونە :جـوان جـوانتـر جـوانتـرین هەرە جـوانتـر)«35،9»
هەڵبەتە، « هەرە » تەنیا پێش ئامرازی بەراوردکردنی « جوانتر » ناکەوێ، بەڵکوو لە هێندێ باردا، لە پێش ئامـرازی بەراوردکـردنی « جـوانتـرین » یشـەوە دێ، وەک نووسـەر خۆی لـە کۆتایی باسەکەیدا، پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە و لە سـەرەتادا باسی نەکـردووە. من پێـموایە، تەنیـا ئەو سێ ئامـرازەمـان نییە، بەڵکوو لە زمانی کوردییدا، ئامرازی « ئەوەندەی تر و هێندەی دیکە» یشـمـان هەیە. بەڵام، گـەر ئەو سێ ئامـرازەی پێـشـوو، بۆ بەراوردکـردنی مەسـەلـەتێکی دیاریکراو، لە نێوان دوو شت یا دوو کەسدا بەکاربێنرێ، ئەوا ئەم ئامرازە، بۆ جۆرە بەراوردکردنێکی تایبەتیی بەکادێنرێن، تەنیا ، بۆ یەک مەسـەلـەتی دیاریکراو و لە یەک کـەسدا، کـە کـاتی ڕابردوو و ئێسـتـەی یا ئایندەی پێشـاندەدا. وەک ئەوەی بڵـێین: جـاران ژینۆ زۆر جـوانبـوو، بەڵام، ئێسـتـە هێندەی دیکە جوانبووە. هەروەها دەتوانین، بڵـێین: جاران ژینۆ زۆر جوانبوو، بەڵام ئێستە، جوانتربووە. یا « جوانترە ».

11. ئامرازی داواکردن و پاڕانەوە : نووسەر دەڵێ:(لە زمانی کوردییدا تاکە ئامرازێک هەیە بۆ داواکردن و پاڕانەوە، ئەویش « تکایە » بۆ نموونە: تکایە قسەمەکەن. تکادەکەم زووتر وەرە.)«37،9»
پارەی دووەم ـ سینتاکسی « نەحەویی »
ئەم ئامرازە بە عەرەبیی « عەتف »، بە ڕووسیی « سینتاکسیچسکیی ـ CUHTAKCUZECKUU »، بە ئینگلیـــزیی « Syntactical »ی پێدەڵێن. شارەزا و زمانەوانەکانی کوردیش، چەن ناوێکیان بۆ ئەم ئامرازە داناوە، وەک: ئامرازی « لێکدەر، یەکخەر، پێوەست، گرێدەر، گەیەنەر ». بەڵام، بە لای منەوە، « لێکدەر » لە هەموویان گونجاوترە.
(ئامرازەکانی سینتاکسی ئەو جۆرە ئامرازانەن، کە دوو ڕستەی سادە بە یەکەوە دەبەستنەوە یان ڕستەیەکی شوێنکەوتوو « تابع » دەگەیەننە ڕستەی سەرەکی « اصلی » لە نێو ڕستەی لێکدراودا بەم ئامرازانە دەوترێت ئامرازی سینتاکسی « ترکیبیی » چونکە ئەو ئەرکەی، کە جێبەجێیدەکەن دەکەوێتە ناو قاڵبی سینتاکسەوە.
ئامرازەکانی سینتاکسیش، کە ئێمە لەم کارەدا قسەیان لە سەر دەکەین ئەمانەن: " ئێستا ، وە ، بەڵام، ئەوسا ، بەڵکوو، ش ، ئینجا ، یا ، ئەگینا ، وەکوو، و، کە، بۆئەوەی، کەچی، تا، چونکە ، ئەگەر، بۆیە.")«65-64،9»
لێرەدا دەبینین، ئەم ئامرازانە، لە دوو شێوەدا خۆیان دەنوێنن : ئامرازی سینتاکسی ساکار، ئەوانەی لە یەک ووشە پێکهاتوون و لێکدراو نین. وەک:(ئێستا ، وە، بەڵام، ش ، یا، و ، کە، تا). جۆری دووەمیان، ئەوانەی کە لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتوون و لێکدراون. وەک:(ئەوسا ، بەڵکوو، ئینجا ، ئەگینا ، وەکوو ، بۆئەوەی، کەچی، چونکە ، ئەگەر، بۆیە.) جگە لەوەی نووسەر، پەنجەی بۆ ئامرازی « ئەودەمە، ئەو کاتە، ئەوجا، ئنجا ، لە پاشان، دوایی » ڕانەکێشاوە، کە نزیکەی هەر واتای «ئەوسا » دەگەیەنن. هەروەها، باسی ئامرازی « نەک ، نەکوو، نەوەکوو، نەوەکا »شی نەکردووە، یا لە یادی چووە، لە نموونەکانیدا ڕیزیانکا. ئەو سیانەی دوواییان، لە یەکەمەوە وەرگیراون. بۆ نموونە: پشت بە نامەرد مەبەسە، نەک « نەوەک، نەوەکوو، نەوەکا » پشت بشکێنێ. ناوی

ئامرازەکانی « بەڵکە، بەڵکم، بەشکوو »شی نەبردووە، کە هەر سێکیان لە « بەڵکوو »ەوە نزیکن. هەروەها، « ئەگەرنا، گەرنا، ئەینا » کە لە ئامرازی « ئەگینا »وە نزیکن، پیشان نەدراون. ئامرازەکانی « تاکوو، تاوەکوو، هەتاکوو، هەتاوەکوو » لەگەڵ ئامرازی « تا »دا ئاشناییان هەیە، لە کاتی بەکارهێنانیشیاندا، هیچ لە واتاکانیان ناگۆڕێ. « لەبەرئەوەی » لە «چونکە »ەوە نزیکن. هەروەها، هێندێ ئامرازی دیکەش هەن، هێندێ لە نووسەران بە ئامرازی لێکدەری دادەنێن، وەک « ڕەنگە، لەوانەیە، ئەدی، وەک، بێگومان » ئاماژەی بۆ نەکراوە. وەک:

ئەم باسە زۆر درێژە، ڕەنگە وا زوو تەواو نەبێ.

ئەو کێڵگەیە زۆر گەورەیە، لەوانەیە دووهەزار دۆنم بێ.

ئەوە لاسە، ئەدی خەزاڵ لە کوێیە؟

نازە کیژێکی جوانە، وەک گوڵ وایە.

ئەوەی تۆ دەیزانی، بێگومان ئەویش دەیزانێ.

هێندێ کەس « فەرمان » لە بری « فعل »ی عەرەبیی بەکاردێنن. بۆ نموونە: دوکتۆر برایم «24-10،9» ڕاستەکەی ئەوەیە، کردار بەکاربێنین.

نووسەر دەنووسێ: (بەڵام لێکۆڵینەوەی ئێمە و نموونەکانی ئێمە لە دیالێکتی سۆرانیدا پیشاندەدەن.) «37،9» سۆرانیی دیالێکت نییە، بەڵکوو لقە دیالێکتە و بە یەکێ لە بەشەدیالێکتی کرمانجی خواروو دادەنرێ. هەروەها، دەنووسێ: (هەر دوو دکتۆران کەریمی ڕەحمانی ئەییووبی و س. ئا. سمیرنۆڤەی خێزانی ...) «37،9»

لە ڕاستیدا، کاتێ ژمارە پێش خەسڵەتێ یا ناوێکەوە دەکەوێ، ئیدی ئەو خەسڵەتە یا ئەو ناوە کۆ ناکرێتەوە. لەبەرئەوە، هەر دوو دکتۆران هەڵەیە، بەڵکوو ڕاستتر وایە، « هەر دوو دوکتۆر » بنووسین. یا دەیتوانی، جیایانکاتەوە، پێش هەر ناوێکیان ناسنامەی دکتۆرییان بۆ دابنێ، وەک « دکتۆر کەریمی ڕەحمانی ئەییووبی و دوکتۆر س. ئا. سمیرنۆڤە ».

هەروەها، نووسەر دەنووسێ: (لەم هەر دوو ڕستانەی سەرەوەدا، لە هەر ڕستەیەکدا دوو مویتەدا هەیە.) «96،9» بێگومان، ئەم دارشتنە گەلێ لاوازە، لە ڕووی ڕێزمانیشەوە، بە هەڵە دادەنرێ. بەڵکوو ڕاستتر وایە،

بنووسین: (لەو دوو ڕستەیەی سەرەوەدا.) یا (لەو ڕستانەی سەرەوەدا.)
نووسەر دەڵێ: (بەڕێز مامۆستا تۆفیق وەهبی، لە ئامراز دواوە، ئەو ناویان بە ووشە دەبات. بە ڕای ئێمە، هەر چەندە لە ڕواڵەت وشەن، بەڵام، لە ئەرک و ئامرازی فەرمان دان. لەبەرئەوە هەر ئامرازن و ووشە نین.) «48،9» ئەز پێموایە، هەر دووکیان بە هەڵەدا چوون. چونکە، کاتێ دوو پیت یا پتر یەکدەگرن، ووشەیەکی دیاریکراو دروسدەکەن. لەبەرئەوە، ئامرازیش هەر ووشەیە، بەڵام، چۆن بکەر، کردار، چاوگ ... لە ووشە پێکهاتوون و چەن ناوێکی جیاوازیان هەیە، هەر یەکەشیان خەسڵەتێکی تایبەتییان هەیە و جۆرە کارێکی دیاریکراو دەکەن، هەر بەو چەشنەش ئامرازیش وایە.
پاشان دەڵێ: [جگەر خوێن هەر باسی ئامرازەکانی گەیەنەر دەکات وەک (ئەگەر، گەر، ئەر، وەر، مەگەر، هەکە، کو، هەتا، حەتا، هنگسێ) لێرەدا ئامرازەکانی(ئەگەر، گەر، مەگەر) هەر یەک ئامرازن. بەڵام، بە ڕواڵەتی دروستبوون لێک جیان، وەک (گەر، مەگەر) هەر ئامرازی (ئەگەر)ن هەروا (ئەر) ئەویش هەر بە واتا و وەزیفەی « ئەگەر » بەکار دێنرێت.]«50،9»
ئەگەر: (ئەم ئامرازەش لە دوو بەش پێکهاتووە لە بەشی « ئە » و « گەر ». بەڵگەش بۆئەوەی، کە ئەمە ئامرازێکی لێکدراوە، ئەوەیە کە « گەر » بە تەنیا بەکاردێ و جاری واش هەیە ئامرازی نەفی « مە » وەردەگرێ و «مەگەر » دروسدەکا پیتە قالبی « ئە »ش، هەر وەک دێتە پێش چاو بۆ دووپاتی بەکاردێ. هێزی ئەم ئامرازە بە پیتە قالبی « ئە » زیاترە لەوەی، کە بەبێ ئەم پیتەقالبە ... بێت. لە هەندێ گۆڤەرانی زمانی کوردیدا «هەگەر »یش هەیە.)«70،9» (هەندێ جار لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا لە بریتی « ئەگەر » « ئەر » بەکاردێ. لە دیالێکتی کرمانجیی سەروودا « ئەر » بە « ئەگەر » واتا دەگەیەنێ وەک ئەو بە بڵاوی بەکارهێنرێ.)«70،9»
(جاری وایە بە پێشگر و پاشگریش دەوترێ ئامراز، جگە لەوەی کە ئامراز ناوە بۆ هەندێ دەربڕین، کە دوو ڕستە بە یەکەوە دەبەستێتەوە یان ڕستەیەک دەگەیەنێتە ڕستەیەکی تر هەروا بەوەش دەوترێت، کە ناوی تاک

دەکاتە کۆ، ناسراو نەناسراو، ... هتد.)«63،9» من پێموایە، پێشگر و پاشگر، لەگەڵ ئامرازدا جیاوازییان هەیە. چونکە، هەر یەکەیان خەسڵەتێکی تایبەتیی خۆی هەیە و کارێکی دیاریکراو ئەنجاندەدەن.
« ئنجا، ئینجا، ئەوجا، جا، ئەوسا، ئەودەم، ئەوکات » نزیکەی هەموویان یەک واتایان هەیە. بەڵام، لە شوێنی جیاجیادا بەکاردێنرێن. (ئنجا، ئینجا، ئەوجا) ڕەگی بنەڕەتی هاوبەشی هەر سێکیان، لە « جا » پێکهاتووە. چەن ئامرازێکی سینتاکسی پەیوەسداری هامبەریی لێکدراون، کە لەگەڵ چەن پێشگرێکی وەک: (ئن، ئین و ئەو)دا یەکیانگرتووە و ئەو ئامرازە لێکدراوەیان دروسکردووە. بە تایبەتیی « ئەوجا »، لە دوو ووشەی « ئەو» و « جار » پەیدابووە. پیتی « ر » کەوتووە و تەنیا « جا »کەی ماوە. «ئەوکات »یش هەر وەک « ئەوسا » وایە، چونکە لە زمانی کوردیدا، «کات » و « سات » نزیکەی یەک واتایان هەیە. بۆ نموونە : کەمێ حەوامەوە، ئینجا (نیجا، ئەوجا، ئەوسا، ئەودەمە، ئەوکاتە) تەماشای دەوروبەری خۆم کرد. « ئینجا » لە هێندێ شوێندا، بە واتای (پاشان، لە پاشان، دوایی، لە دواییدا) دێ.
«کە»وەک ئامرازێکی سینتاکسی گەیەنەر، لە ئاخافتن و نووسینی کوردییدا زۆر بەکاردێنرێ. لێرەدا چەن نموونەیەک لە سەر ئەو ئامرازانە دێنینەوە :

دیارە، کە دەوران ئەبلەپەرستە، هۆشیار و دانا ڕووی لە نووشوستە.

پەردێک کە نەزان بیخاتە ناو ئاو، دەرنایە بە سەد عاقڵی بەناو.

بە سکێ برسیی و بە سکێ تێرین، لێمان ناگەڕێن کە خۆش ڕابوێرین.

خوا عەیبی بزنی خستووەتەڕوو، کەچی کڵاوی کردووە بۆ بەڕو.

قسەی مانگ نییە، تا نەگاتە شەو، گەرما ئاوی سارد ئەخاتە برەو.

پێم مەڵێن، ڕیشت وەک خوری خاوە، کوێر، هەتا دەمرێ، بە هیوای چاوە.

سوار هەتا نەگلێ، نابێ بە سوار، برنج نەکوترێ، ناچێتە بازاڕ.

لەگەڵ ئەوەش ترسنۆکن قورسن بێ هێزن، بەڵام هەرگیز شەلم، کوێرم، دەست ناپارێزن.

ئەگەر قەلەڕەش ڕێنیشاندەربێ، ئەبێ گەورە هەر دەربەدەربێ.
«10510498،8455،87»

(کە ـ ئامرازێکی گەیەنەرە لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردییدا، ئەمە هێجگار باو و بڵاوە و زۆر بەکاردێ، دەتوانرێ، چەندین جۆر ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکیی لە نێو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا. بۆیە، پێی دەوترێ: ئامرازی گەیەنەری گشتیی. ئەم ئامرازە لە ڕووی داهاتنیەوە، لە ئامرازی « کێ »ەوە هاتووە و پێشکەوتنی ئەوە لە زۆر زمانی ئێرانی بەکاردێ، وەک فارسیی و پوشتو ... هتد. جێگەی ئامرازی کە پێشەوەی ڕستەیە لەو حاڵەتەی، کە ڕستەی شوێنکەوتووی کاتی بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکیی. بەڵام، گەر ڕستەی شوێنکەوتووی کاتی بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکیی، بەڵام گەر ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بگەیەنێتە ڕستەی سەرەکیی، جێگەی هەر نێوان ڕستەی سەرەکیی و ڕستەی شوێنکەوتوو دەبێ، ئەم ئامرازە دەتوانێ جێگەی ئامرازی گەیەنەر " ئەگەر " بگرێتەوە.«137،9»
خۆزگە، نووسەرانی کورد، خۆیان لە دووپاتکردنەوەی ئەو ئامرازە « کە » دەپاراست. بە ڕاستیی، هێندێ نووسەر، بێ بۆنە و بە بۆنە بەکاریدێنن. بە شێوەیەک، نووسینەکە لاواز و بێپێزدەکا، خوێنەر بێ تاقەتدەکا. بۆ نموونە: با تەماشایەکی ئەم کۆپلەیەی « محەمەد ڕەسووڵ هاوار » بکەین، تا بزانین، چەن جار ئەو ئامرازەی، لەو دوو دێڕەدا بەکارهێناوە.(بەو جۆرە پاش ئەوە ئیتر بریتانیا لە ناو کۆمەڵی گەلاندا بوو بە شۆڕەسوار و داشەهارە، کە لە مێژ بوو نەخشەی بۆ ئەو ڕۆژە کێشابوو، کە بە ئارەزووی خۆی دەست بگرێت بە سەر ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، کە بڕبڕاگەی ڕێگەی پاراستنی هیندستان و چاڵە نەوتەکانی ئەهواز بوو لە خوارووی ئێراندا،)«14،102» ئەم چەن ڕستەیە دەتوانرا، بە شێوەیەکی جوانتر و بێ ئەو سێ « کە »یە داڕێژرێ!
زمانی هۆنراوە بە تایبەتیی، لەگەڵ زمانی « پەخشان، چیرۆک و بەشەکانی دیکەی وێژە »دا، جیاوازییەکی گەورەیان هەیە. چونکە، لە هۆنراوەدا، هۆنەرەکان بۆیان هەیە، بۆئەوەی «کێش و سەرەوا، ئاواز و مۆسیقا »ی هۆنراوەکانیان بپارێزن و لەنگ نەبێ، ژمارەی کێشی پەنجەی دێڕی هۆنراوەکانیان تێک نەچێ، زۆر جار ووشە کورتدەکەنەوە، یا لە ڕێزمان

لادەدەن و گەلێ شتی سەیر دەنووسن! بۆ نموونە: لەم هۆنراوەیەی « هێمن » دا، هەر دوو ئامرازی سینتاکسی لێکدەری وەک: « ئەگەر » و « گەر » بەکارهاتووە، هەر چەندە، هەر دووکیان یەک واتایان هەیە، بەڵام، لە دوو جێگەی جیاوازدا بەکارهێنراون.

بەهار بوو فەسڵی زستانم
ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
درۆیە گەر وتویانە
بە خونچەیەکی بەهار نایە. «1،87»

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێم: هەموو خوێندەوار و نووسەرێکی کورد دەبێ، شارەزایی یەکی باشی لە ئامرازەکانی زمانی کوردییدا هەبێ. بە شێوەیەکی گونجاو و رێکوپێک، لە کاتی پێویست و لە جێگەی شیاوی خۆیاندا بەکاریانبێنێ. بەڵام، لە دەقێکی وێژەییدا، زۆر دووبارە نەبنەوە، بە شێوەیەک نووسینەکە لاواز و بێپێز بکا.

## 12/ وەرگێڕان :

لەبەرئەوەی، لە بواری وەرگێڕاندا، «کادێری زمان، پسپۆڕی شارەزا و بە توانا»مان زۆر کەمە، بزووتنەوەی وەرگێڕان، بە شێوەیەکی گشتیی دواکەوتووە. زۆر جار، ئەو دەقانەی لە زمانێکی بیانیی دیاریکراوەوە، بۆ سەر زمانی کوردیی وەردەگێڕێن، جگە لەوەی، هەڵەیەکی زۆری زمانەوانیی تێدا بەدیدەکرێ، شێوازی دارشتنەکەشی زۆر لاوازە. هێندێ جاریش، دەقە وەرگێڕراوەکە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، لەگەڵ دەقە ڕەسەنەکەدا جیاوازن. نەشارەزایی لە وەرگێڕاندا، لە نێو خەڵکی ساکاریشدا ڕەنگی داوەتەوە.

وەرگێڕان دوو جۆرە :

یەکەم : لە زمانێکی بیانییەوە بۆ کوردیی.

دووەم : لە کوردییەوە بۆ زمانێکی بیانیی.

ئێمەی کورد، هەر دوو جۆرە وەرگێڕانەکەمان پێویستە. تا لە لایەکەوە، شارەزاییمان لە بەرهەمی نەتەوەکانی جیهاندا هەبێ. لە لایەکی دیکەشەوە، تا ئەو نەتەوانە، شارەزای « زمان، هونەر و وێژەی کوردیی » بن.

هەر چەندە، بابەتی وەرگێڕانمان کەمە، کەچی، ئەوەی هەشە، زۆربەی زۆریان لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیانەوە وەر نەگێڕراون. بەڵکوو، لە زمانی نەتەوە باڵادەسەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە وەرگیراون. بە داخەوە، هێندێ هۆنەر، هۆنراوەی هۆنەرە ناسراو و گەورەکانی نەتەوەکانی جیهانی وەک: « ئاراگۆن، پوشکێن، بابلۆ نیرۆدا، تۆفۆ و شیللی ... تاد » وەردەگێڕن، بێ ئەوەی زمانە ڕەسەنە نەتەوەیی یەکەی ئەو هۆنەرانە بزانن، بەڵکوو، لە زمانێکی دیکەی دووەمەوە وەریاندەگێڕن. واتە: تا دەکرێ بە کوردیی، دوو سێ دەس دەکا. جا، گەر « هەمزەتۆف » گوتەنی: وەرگێڕان وەک گوڵی ئەو دیوی فەرش وابێ، ئەوا دەبێ، لە زمانی دووەمەوە، وەک چی وابێ؟!!

بەڵام، گەر وەرگێڕ، زمانە ڕەسەنەکەی دەقەکە خۆی بزانێ، تواناى بە سەردا بشکێ، ئەوا گومانی تێدا نییە، وەرگێڕانەکە گەلێ لە دەقە سەرەکییەکەوە نزیکتر و باشتردەبێ. بە پێچەوانەشەوە، گەر لە دەقی دووەم و سێیەمەوە وەرگێڕرابێ، ئەوا یەکسەر خوێنەر، هەست بە لاوازیی وەرگێڕانەکە دەکا، چێژی لێ نابینێ، لە زۆر ڕووەوە، ناوەڕۆکەکەی خۆی لە دەسدەدا. چونکە، هەرگیز وەرگێڕانی یەکەم، پڕ بە پێستی دەقە ڕەسەنەکە نییە، جا دەبێ، وەرگێڕانی دووەم و سێیەم، چۆنچۆنی لە دەقە ڕەسەنەکە بچێ؟

لەبەرئەوەی، لە هێندێ ناوچەی باشووری کوردستان، هەر لە کۆنەوە خوێندن و نووسین، بە زمانی عەرەبیی بووە. زمانی کوردیی لە هەموو بەڕێوەبەرێتیی و خوێندنگەکاندا قەدەغەکرابوو، تەنانەت، تابلۆی سەر دوکان و کۆگاکانیشیان، هەر بە عەرەبیی دەنووسی، وەک لە(کەرکوک، خانەقین، ژەنگار و زۆربەی نێوچەکانی بادینان)یش ڕوویدابوو. بەڵام، دوای ئەوەی ڕێککەوتننامەی(11/مارس/1970) مۆرکرا، سەرەتا هەلێکیان بۆ هەڵکەوت، بە کوردیی بخوێنن و بنووسن، هەستی نەتەوەیی یان پاڵیپێوەنان، سەرلەنوێ ئەو شتانەی بە عەرەبیی نووسیبویان، بە کوردیی بینووسنەوە. سەیر ئەوەبوو، بە کوردیی نووسینەکەیان، هێندە خراپبوو، وای لێهاتبوو، لە نێو خەڵکیدا بووبوو بە نوکتە. چونکە، بە

کوردییەکی ڕەسەن نەیاندەنووسی، بەڵکوو، لە عەرەبییەوە وەریاندەگێڕا.
بۆ نموونە : دوکانداری ئیشی ئۆتۆمۆبیل چاککردنی دەکرد، بە عەرەبیی لە سەر تابلۆکەی نووسیبوو «محل رحیم لیللحیم» پاشان، کوردییەکەی کردبوو بە «شوێنی رەحیم بۆ لەحیم!» یا یەکێکی دیکە پەنیری دەفرشت، پێشتر بە عەرەبیی نووسیبووی «محل منیر لیلجبن» پاشان، بە کوردیی نووسیبوی «شوێنی منیر بۆ پەنیر!» ئەم وەرگێڕانانە، ووشە بە ووشە کراوە، جگە لەوەی هەڵەیەکی زۆر گەورەیە، مایەی «پێکەنین، گاڵتەجاریی و پاشاگەردانییەکی گەورەی زمانەوانیی»ش پیشاندەدا.

## 13/ ڕەخنەسـازیی :

تا ئێستە، بە تەواویی نازانین، بزووتنەوەی ڕەخنەسازیی، لە نێو کورددا کەی سەریهەڵداوە، وەک د. «کامیل بەسیر»یش دەڵێ: (مێژوونووسی پسپۆڕ چەن هەوڵبدات، ناتوانێ، سەرەتایەکی زانستیی بۆ بزووتنەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی دەسنیشانکا، چونکە، هیچ سەرچاوەیەکی دێرین لە بەردەسیدا نییە و تا ئێستە چالاکیی نەتەوەی کورد لەم ڕووەوە، بە دەسمان نەگەیشتووە. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە، مێژوونووسی پسپۆڕ لە هەمان کاتدا ناتوانێ، بڕیار بدا، کە باخچەی وێژەی کوردیی لە کۆنترین سەردەمی چەکەرەکردنیدا لە بەرهەمی ڕەخنەسازیی بێبەش بووە و زانا و وێژەرانی کورد هیچ کتێبێک یان وتارێکیان دەربارەی زانستی ڕەخنەسازیی نەنووسیوەتەوە. چونکە، بە ڕوونیی تێبینیدەکات، کە ئەو دارستانە بەهادار و پێگەیشتووە، جا لەبەرئەوەی باری وێژەی کوردیی بەم جۆرە بووە، هەر دەبێ، ڕەخنەسازیی کوردییش شانبەشانی لەدایکبوویێت و ڕەخنەسازە دێرینە کوردەکان لە پێشخستنی وێژەکەیان ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دابێت) «116_115،85».
پاشان، چەن دەقێکی دیکە دێنێتەوە و دەڵێ: (بزووتنەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی بەهێز، لە سەدەکانی دەیەمیی زایینەوە بەرپابووبوو، بەشداریکەرەکانی لە زمانەوان و زانای ڕەوانبێژیی و ڕەخنەساز و وێژەدۆستان دەورێکی گرنگیان لە هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە و خستنەڕووی لایەنی چاک و خراپ لە وێژەی کوردیی گێڕا.) «118،85».

د. « کامیل » بۆ نموونە، سێ سەرچاوەی دەسنیشانکردووە، کە بە کۆنترین بەرهەمی کوردیی لە بواری ڕەخنەسازییدا دادەنرێن :
1. ئەمین فیضی، ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد، 1339 کۆچی، ئەستنبوڵ.
2. علی کمال باپیر اغا، گوڵدەستەی شوعرای هاوعەصرم، چاپخانەی ژیان، سلیمانی، 1939ز.
3. رفیق حلمی، شعر و ئەدەبیاتی کوردی، چاپخانەی نقیض، بغداد، 1941ز. «121،85»
دوکتۆر زۆر بە دڵنیایی یەوە، دەرباری « ئەمین فەیزیی »، دەڵێ: (یەکەم مێژوونووسی وێژەی کوردییە، کە لە دانراوەکەیدا، بە دوای هۆی دەرخستنی بڕیاری ڕەخنەسازییەکانی گەڕابێت و زیرەکانە بۆ هەر ووتەیەکی لێکدانەوەیەکی مێژوویی چەسپاندبێت.)«123،85»
بە باوەڕی من، مێژووی جوڵانەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی، وەک هێندێ شتی دیکەش، لە مێژووی نەتەوەکەماندا، زۆر ڕوون نییە. لەبەرئەوە، گەر واز لەم مێژووە بێنین، ئاوڕێ لە بزووتنەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی ئەوڕۆمان بدەینەوە، گەلێ باشترە.
بە داخەوە، تا ئێستە بە باشیی، لە واتای ڕەخنە نەگەیشتووین. ئەوەی هەیە، زۆربەی لە پێداهەڵدان و باسکردنێکی بێتام و چێژ پتر، هیچی دیکە نییە. بۆیە، مێژوویەکی « وێژەیی، زمانەوانیی و نەتەوەیی » خراپمان بۆ خۆمان تۆمارکردووە. هەموو کوردێ پێویستە، ئەوە بزانێ، ڕەخنە لە هەر بوارێکدا بێ، لە دوو جۆر پێکدێ:« ڕەخنەگرتن لە باوەڕ و هەڵسوکەوتی خۆ و لە خەڵک ». ئەم دوو جۆرەش، دیسانەوە دوو لایەنی ئەرێتی و نەرێتی هەیە. با بزانین چۆن و لای کورد چۆنە؟!!
هەڵبەتە، هەموو نووسینێ، بەرهەمێکی دیاریکراو، لە هەر بابەتێکی «زمان، وێژە، هونەر، کەلتوور، کۆمەڵایەتیی، ئەکادیمیی، ڕامیاریی و نەتەوەیی » بدوێ، وەک چۆن. لایەنی « گەش و وورشەدار، باش و جوان، بەهێز و پتەو »ی هەیە، هەر بەو چەشنەش، لایەنی « سیس و کوژاوە، خراپ و ناشیرین، لاواز و فشۆڵ »ی هەیە. جێگەی داخە، جوڵانەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی، لە بواری جیاکردنەوەی ئەم دوو لایەنەدا، گەلێ

هەژار و لاوازە. جگە لەوەی، ڕەخنەگرمان کەمە و لە بواری ڕەخنەسازیدا، وەک تاقانە تەماشادەکرێن، ئەوانەی هەشن، لەو ئاستەدا نین، ڕەش و سپی لە یەکدی جیاکەنەوە. لێرەدا، دوو خاڵی گرنگ، ڕۆڵی سەرەکیی، لە ڕەخنەی کوردییدا دەبینێ.

یەکەم : پێوەندیی تاکەکەسیی نێوان ڕەخنەگر و ڕەخنەلێگیراو. گەر پێوەندیی نێوان، هەر دوو لا باشبوو، دۆستایەتیی نێوانیان بەهێزبوو، ئەوا ڕەخنەگر، یا چاو لە هێندێ هەڵە و کەموکوڕیی هاوڕێ نووسەرەکەی دەپۆشێ. یا گەر ڕەخنەشی لێ گرت، لە گۆشتی ڕەت ناکا. وەک دەڵێن: گۆشتەکەی دەخوا، بەڵام، ئێسکەکەی ناشکێنێ! گەر زۆر دۆستیش بن، ئەوا بە دەسویەنجەی زێڕینیدا هەڵدەدا. بە پێچەوانەشەوە، گەر ناکۆکییەک لە نێوانیاندا بوو، ئەوا ڕەخنەگر، نەک هەر نووکی خەنجەری پێنووسەکەی، لە گۆشت ڕەتدەکا، بەڵکوو تا سەر جەرگ و دڵیشی دەبا. کارێ بە بەرهەم و کەسێتی نووسەر خۆی دەکا، یا بە دەواری بیابانئنشینی نەکردبێ!

دووەمیان : « پێوەندیی ئایدۆلۆژیی، فەلسەفیی و ڕامیاریی » نێوان هەر دوو لای پرۆسێسی ڕەخنەکە. گەر « نووسەرێ، هۆنەری، زانایەکی کورد »، سەر بە ڕێبازێکی فەلسەفیی جیاوازبێ، لە ڕێکخراوێکی ڕامیاریی دیکەدا کاربکا، لەگەڵ دید و بۆچوونی فەلسەفیی و ڕامیاریی، ڕێکخراوەکەی مامۆستای ڕەخنەگردا جیاوازبێ و نەگونجێ، ئەوا هەر چی خراپە، ئەوەی پێ دەڵێن و پێی دەکەن. بێ ئەوەی، ئاوڕێ لە بەرهەمەکەی بدەنەوە، لایەنە باشەکانی هەڵسەنگێنن، گوێ بە « هەولوتەقەلا، ماندووبوون، ڕاژەکردنی هونەر، وێژە، زمان و نەتەوەکەیان » بدەن. هەر چی قسەی سووکە، نەک هەر بە خۆی، بەڵکوو تەنانەت، بە مناڵ و خێزانەکەشی دەڵێن، بە دەیان درۆودەلەسەی بۆ دروسدەکەن. جا ئەوە باری ڕەخنەی کوردیی بێ، ئیدی، چۆن جووڵانەوەی ڕەخنەسازیی کوردیی پێشدەکەوێ؟ چۆن نووسەر و هونەرمەندەکانمان، گوردەبەسنەوە، هاندەدرێن، تا پتر وەک مۆمێ لە ڕێگەی زمان و کەلتووری نەتەوەکەیاندا بسوتێن؟!! ئایا، نووسەران خۆیان بۆیە ماندوودەکەن، تا بەو شێوەیە، کەسانی بێویژدان و ڕێکخراوە لە هێڵ دەرچووەکان، سووکایەتیی بە خۆیان و ئەندامانی خێزان و بنەماڵەکەیان

بکەن؟!! ئەم دەرکەوتە خراپ و دزێوە، گەر لە نێو چەن نەتەوەیەکی ڕۆژهەڵاتیی وەک کورددا نەبێ، ئەدی لە نێو چ کۆمەڵگەیەکی دیکەی دانیشتووی، سەر ڕووی ئەم زەوییەدا بەدیدەکرێ؟!!
دیارە، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە. گەر نووسەرێ یا هۆنەرێ، لەگەڵ ئەو ڕێبازەی ئەواندا بێ، ئەوا سەری لە حەوت تەبەقەی ئاسمان تونددەکەن، ڕێزێکی زۆری لێ دەگرن. لێرەدا، نموونەیەکی زیندوو دێنینەوە : ئەو «مەسعوود محەمەد »ەی، زۆربەی کاتی ژیانی خۆی، بە خوێندنەوە و نووسینەوە بەسەربردووە، ئەوانەی لە « زیرەکیی، بلیمەتیی، بیرکردنەوە، زۆری بەرهەم و نووسین »دا، شان لە شانی نادەن، بە دەیان پروپاگەندەی ناشیرینی بۆ دەکەن. گەر هەڵەیەک بکا، ئیدی کێچی هەڵەکەی بۆ دەکەن بە گایەک!
گەر نووسەرێکیش بێلایەن بێ، بە شێوەیەکی بەویژدانانە و بە ڕێکوپێکی، ڕەخنە لە بەرهەمی نووسەران و ڕێکخراوەکان بگرێ، ئەوا ئیدی لای هەمووان چارەی لە بنی مەنجەڵ ڕەشتر و ئێسکیشی لە هەژدیهای حەوسەر قوورسترەدەبێ. هەر ئەوەیە، خوێنی لە کاسە ناکەن! بۆ نموونە: « جەلال تاڵەبانیی » چ وەک ڕامیار و چ وەک نووسەر، لە بەرهەمی « کوردستان و ئەلحەرەکە ئەلقەومیە ئەلکوردیە »دا، کاتێ باسی زمان و وێژە دەکا، ناوی کۆمەڵێ نووسەر و هۆنەری مردوو و زیندووی ناوداری کورد دێنێ. کارە هونەریی و وێژەیی یەکانیان هەڵدەسەنگێنێ. دەربارەی هێندێ لەو نووسەرانەی، ئەو سەردەمە لەگەڵ بزووتنەوەکەی خۆی بوون، وەک «نەوشیروان مستەفا، بەکر حوسێن، فوواد قەرەداخی و ... » بە نووسەرێکی خاوەن بەهرە و پێشکەوتووخوازیان دادەنێ.«60،19» چونکە، لە ڕیزی ڕێکخراوەکەی خۆیدا کاریاندەکرد. لەوانەیە ئەو سەردەمە، کەم کەس وەک نووسەر، هەر ناوی ئەوانەشی بیستبێ، بە تایبەتیی « بەکر حوسێن »، لەوانەیە، لە هەموو ژیانیدا، یەک دوو گوتار پتری لە سەر «مادەی دیالێکتیک »، لە عەرەبییەوە بۆ کوردیی وەر نەگێڕابێ، لە گۆڤاری « ڕزگاریی » ئەو سەردەمەی خۆیاندا بڵاویکردبێتەوە! ئیدی دوای ئەوە وەک ئاوی کانی ووشکیکرد! بەڵام، بە چاک و بە خراپ، باسی

چەندین نووسەر و هۆنەری گەورەی وەک « هەژار، هێمن، حەسەنی قزلجیی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی، د. کەمال مەزهەر، مەسعوود محەمەد، جەمال شارباژێڕیی، حەسیب قەرەداخیی، شێرکۆ بێکەس و ... »ی نەکردووە. چونکە، ئەو کاتە، ئەو نووسەر و هۆنەرانە، لەگەڵ باڵەکەی دیکەی شۆڕشی کورددا بوون. بەرهەمەکانیان، لە ڕاژەکردنی شۆڕشی کورددا بوو، لەگەڵ باڵەکەی ئەماندا میانەیان نەبوو. کەچی، دوای ئەوەی کارەساتی هەرەس ڕوویدا، شۆڕشی نوێ هەڵگیرسا، هێندێ لە نووسەر و هۆنەرەکانی کورد، بەپێی باری ڕیالیزمی نوێی کوردستان، سەنگەری خۆیان گۆڕی، هەڵسەنگاندنەکانی « جەلال تاڵەبانیی »یش گۆڕا. ڕێزێکی زۆریان، لە « شێرکۆ بێکەس » گرت، بە شان و بازوویاندا هەڵدەدا! لەگەڵ ئەوەشدا، « شێرکۆ بێکەس »، هەر لە سەرەتاوە، ئەو بەهرە هونەریی و چرۆ هۆنراوەییەی درەختی سەوزی نێو باخی وێژەی کوردیی پێوە دیاربووە! هەر « شێرکۆ بێکەس » بوو، کاتێ دژی پیلانە چەپەڵەکەی، لە « بارزانیی مستەفا » ساڵی «1972» کرا، هۆنراوەی بۆ نووسی، بنەماڵەی بارزانیی و پارتی، ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت، کەچی دوای ئەوەی، بە هۆنراوە ڕەخنەی لە کارەساتی هەرەس گرت، لەگەڵ شۆڕشی نوێی، «یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »دا هاوکاریی دەکرد، نەک لای ئەوان هەر هۆنەر نییە، بەڵکوو ئەوەی خراپیشە پێی دەکەن! لە کاتێکدا، « شێرکۆ بێکەس » بە یەکێ لە لووتکە هەرە بەرزەکانی وێژەی کوردیی ئەم سەردەمە دادەنرێ. گەر، بوونی ڕەتکەینەوە، وەک ئەوە وایە، یەکێ لە کۆڵەکە گەورە و گرنگەکانی ئاسمانی هۆنراوەی کوردیی بڕوخێنین!

هەر چەندە، ئەوە باری ڕەخنەسازیی ئەوڕۆی کوردیانە، هەر چەندە، ئەوە بەلۆیستی ڕەخنەگر و ڕێکخراوەکانمانە، بەڵام، لە ڕاستیدا ناتوانم، بڵێم: ڕەخنەگرمان نەبووە و نییە. هەروەها ناشتوانم، بڵێم: کادیرێکی زۆری باش و ئەکادیمییمان، لە بواری هونەری ڕەخنەگریدا هەبووە و هەیە. بەڵکوو، بەگوێرەی باری « بندەستیی، ناکۆکیی نێوخۆ و دواکەوتوویی کۆمەڵگەی کورد »، لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی نووسینی کوردییدا، جۆرێ لە جۆرەکانی، جوڵانەوەی ڕەخنەگریمان هەبووە، ڕەخنەگریشمان هەر هەبووە. جا

هەڵسوکەوتیان، لەگەڵ جەماوەر و بەرهەمەکانیاندا کردووە؟ تا چەن وێژدانی خۆیان ئازا و ئازاد کردووە؟ بە چ شێوەیە نووسیویانە. ئایا ڕەخنەکانیان، پتر شێوازی گاڵتەجاڕیی یا ئەکادیمییانەی وەرگرتووە؟ ئەمانە هەموو کۆمەڵێ پرسیارن، پێوەندیی بەم باسەوە نییە، بەڵکوو دەبێ، هەر یەکێکیان بە جیا باسکرێن و هەڵسەنگێنرێن.
بە کوردیی و کورتیی: یەکێ لە گرفتە سەرەکییەکانی جوڵانەوەی کەلتووریی کوردیی بە گشتیی، زمانی کوردیی بە تایبەتیی ئەوەیە، « ڕەخنەی بەجێ، کاریگەر، زانستانە، بەوێژدانانە، خاوێن، بە لێکۆڵینەوە و بەڵگەوە »، یا زۆر کەمە یا هەر نییە!

## 14/ سەلیقەی زمانەوانیی :

سەلیقە: ووردبوونەوە، هەستپێکردن، سەرنجی قووڵ، بە دوادا ڕۆیشتن دەگرێتەوە، بۆ ئەوەی، مرۆ لە بنەمای شتێ، یا دیاردەیەکی دیاریکراو بگا. سەلیقەی زمانەوانیش، هەر بەو شێوەیە، بە ووردبوونەوە و لێکۆڵینەوە دروسدەبێ. لێرەدا دەمەوێ، باری سەرنجی خۆم، بەرانبەر چەن بۆچوون و باوەڕێ دەربڕم، تا لە ڕاستیی کێشە زمانەوانییەکان بگەین، لە کۆتاییشدا، سەرنجامێکی باشمان دەسکەوێ.
(لە زمانی کوردییدا، هێندێ ووشە هەن، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە، بە هەڵە بەکارهێنراون و بە هەڵەش بەکاردێنرێن. بۆیە پێویستە، ڕاسکرێنەوە و بە شێوەیەکی ڕاست و گونجاو، لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاربێنرێن. )«18،37»
سەرەتا دەمەوێ، چەن ووشەیەک، لە ژێر مایکرۆسکۆپی زمانەوانییدا شیکەمەوە و شیرۆڤەکەم، تا پتر ڕوونیانکەمەوە و بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لە زمانەکەماندا جێگەی خۆیان بگرن. هەڵبەتە، هێندێ زاراوەی ئیتنی هەیە، پێبەپێی باری سەرنجی « ئایدۆلۆژیی ڕامیاریی، بنەمای فەلسەفیی جیاواز و دیدی ئایینە جیاجیاکان » دەگۆڕێن. بۆ نموونە: ئایینی ئیسلام، هەموو گەلانی موسوڵمانی سەر ڕووی زەوی، بە یەک نەتەوە دادەنێ، ئەویش نەتەوەی ئیسلامە. ئەز، لێرەدا مەبەسم لەو

دیده ئایینییه نییه. بەڵکوو هەوڵدەدەم، ئەو زاراوانە، لە ڕووی « ئیتنیی، ڕامیاریی و زمانەوانیی »ەوە ڕوونکەمەوە.
(دیارە، میللەت ووشەیەکی کوردیی نییە، بەڵکوو ووشەیەکی ئیسلامیی ـ عەرەبییە، لە ڕێگەی ئایینی ئیسلامەوە، لە زمانەکانی کوردیی، فارسیی و تورکیدا بڵاوبۆتەوە. ووشەی میللەت لە قورئانی پیرۆزدا، بە« ملە ـ ملت » هاتووە و چەن جارێ دووبارە بۆتەوە. ئەم ووشەیە لە بنەڕەتدا، لە قورئاندا بۆ مەبەسێکی تایبەتیی و(بۆ دیاریکردنی " کۆمەڵگەی ناموسوڵمان " بەکار هێنراوە)«10،28» بەڵام، ئێستە بۆ ئەو مەبەسە بەکار ناهێنرێ. هەر چەندە، (هێندێک لە گەلە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵات، بە تایبەتی تورک و فارس و تەنانەت کوردیش، ئەم ووشەیەیان لە عەرەبەوە وەرگرتووە، کەچی بە مانای بنەڕەتیی خۆی بەکاری ناهێنن، بەڵکوو بە مانای « گەل »ی کوردیی و People ی ئینگلیزیی و Volkی ئەڵمانیی و هێندێ جاریش بەرامبەر " نەتەوە Nation " بەکاری دەبەن، وەک ئەوەی دەبێژن: Turk Milleti ، " گەل یا نەتەوەی تورک " ، ملت فارس " گەل یا نەتەوەی فارس "، میللەتی کورد " گەل یا نەتەوەی کورد " .)«10،28».
گەل، ووشەیەکی کوردیی پەتیی و ڕەسەنە، بۆ یەکەم جار، لە ساڵانی سییەکان و چلەکانی ئەم سەدەیەدا، لە نووسینەکانی گۆڤاری « گەلاوێژ »دا دەرکەوت. ووشەی گەل لە کوردییدا، زیاتر بە کۆمەڵ دێ، وەک گەلەگورگ، واتا کۆمەڵێ گورگ. گەل، لە بری میللەتی عەرەبیی بەکار نایە، بەڵکوو پێویستە، گەل لە بری « ئەلشەعب » و نەتەوەش لە جیاتی « ئەلئومە »ی عەرەبیی بەکاربێنرێن. باشتریش وایە، میللەت بۆ ئەو مەبەسە بەکار نەهێنین. دیارە، گەل و نەتەوەش جیاوازییان هەیە. گەل بە کوردی دانیشتووی پارچەیەکی دیاریکراوی کوردستان دەگوترێ، وەک گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، یا گەلی کورد لە ئێراندا ... تاد. بەڵام، بە هەموو کوردی پارچەکانی کوردستان، یەک نەتەوە پێکدێنن. هەروەها، عەرەبەکانیش لە هەر وولاتێکی عەرەبیدا، بە گەلی عەرەب ناودەبرێن، بە هەموویشیان یەک نەتەوە پێکدێنن.
کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەو سێ زاراوە ئیتنییە بە هەڵە

بەکاردێن. تا ئێستە لە نێو خۆیاندا، لە سەر بەکارهێنانی ئەو سێ زاراوەیە، بە تەواوی ساغ نەبوونەتەوە. هێندێکیان میللەت و نەتەوە، لە یەکدی جیا ناکەنەوە و بە یەک شتی دادەنێن. وەک پێشتر ڕوونمانکردەوە، میللەت ووشەیەکی عەرەبییە و بۆ کۆمەڵێ بەکاردێنرێ و لە بری گەل و نەتەوە بەکار ناهێنرێ، لەگەڵ نەتەوەشدا، جیاوازییەکی گەورەی هەیە.
هێندێکی دیکەیان، لە فارسەکانەوە فێربوون، دەڵێن: میللەتی ئێران یا نەتەوەی ئێران. لەگەڵ ئەوەشدا، میللەت و نەتەوەش بۆ کورد بەکاردێن. هێندێکی دیکەشیان، لە بری گەل زاراوەی خەڵک بەکاردێن. گەلیش لای ئەوان، خوێندەوارە ڕۆشنبیرە پێشڕەوەکەی خەڵک دەگرێتەوە! جگە لەوەی، ئەم باوەڕەیان، لە کاربەدەسە شۆڤێنیستەکانی دەوڵەتی ئێرانەوە وەرگرتووە، هەر لە بنچینەشدا هەڵەیە. چونکە، ئێران دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، تەنیا یەک نەتەوەی تێدا بژی، بەڵکوو، دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵە. واتە: دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە چەن گەلێکی جیاواز پێکهاتووە. هەر یەکێ لەو گەلانەش، بە گەلێکی سەربەخۆ دادەنرێن و بەشێکی گرنگ لە نەتەوەکانی خۆیان پێکدێن. نەک وەک فارسە شۆڤێنیستەکان دەڵێن و بە هەموو شێوەیە پروپاگەندەی بۆ دەکەن و دەیانەوێ، بە هەر نرخێبێ، لە مێشکی ڕۆڵەکانی ئەو گەلانەی بناخنن، کە لە ئێراندا، تەنیا یەک نەتەوە هەیە، ئەویش نەتەوەی ئێرانییە.
لە ڕاستیدا، ئێران ناوی خاک و دەوڵەتە. لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە هیچ جۆرێ ڕاست نییە، زاراوەی جوگرافیا و ئێتنیک تێکەڵاوکرێ. بەڵکوو دەتوانین، بڵێین: ئێران وەک دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان، لە ڕووی جوگرافیاوە، لە چەن وولاتێکی جیاوازی وەک وولاتی« فارس، کوردستان، ئازربایجان ... تاد » پێکهاتووە. لە ڕووی ئێتنیشەوە، لە چەن گەلێکی جیاوازی وەک: « فارس، کورد، بلوژ، تاژیک،، ئەفغان، ئازەر، تورکمان، عەرەب » پێکهاتووە، بە هەمووشیان دەگوترێ، گەلانی ئێران، نەک میللەتی ئێران یا گەلی ئێران یا نەتەوەی ئێران.
وەک چەن جارێکی دیکە، لە هێندێ نووسیندا ڕوونمکردۆتەوە، ئەم زاراوەیە، لە لایەکەوە ئیمپریالیزمی جیهان و لە لایەکی دیکەشەوە،

کاربەدەسانی دەوڵەتە سۆسیالیستەکانی پێشوو دایاننناوە. چونکە، لە بنەڕەتدا دانیان بە بوونی گەلەکانی بندەسیاندا نەدەنا. وەک چەن گەلێکی سەربەخۆ، هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا نەدەکردن. لەبەرئەوە، هەر لەو ڕۆژەوە، ئەو دەوڵەتانە دامەزراون، هەرگیز نەیانگوتووە، گەلانی «سۆڤیەت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا... تاد» بەڵکوو، هەمیشە بە گەلی «سۆڤیەت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا... تاد» ناویانبردوون. تا لە کۆتاییدا، ئەو دەوڵەتە تیریتۆریالانە هەڵوەشانەوە، چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنال، لە جێگەیان دامەزرا. دیارە، بۆ هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستانیش، داگیرکەران هەر هەمان چاوبەسمان لەگەڵ دەکەن. جگە لە گەلەکانی خۆیان، بە هیچ شێوەیەک دان بە بوون و مافی گەلەکانی دیکەی بندەسیاندا نانێن. بۆیە دەڵێن: گەلی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » و زاراوەی گەلانی « تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » بەکار ناهێنن. بە داخەوە، زۆربەی کوردەکانی ڕۆژهەلات، لە لایەکەوە لەبەرئەوەی، خۆیان بە ئێرانی دەزانن، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەرئەوەی لە زمانی کوردییدا شارەزا نین، ئەو زاراوانە بە هەڵە بەکاردێنن، دید و بۆچوونە شۆڤێنییەکانی نەتەوەی باڵادەسی فارس، دووبارەدەکەنەوە!

دەبێ، ئەوەش بزانین، « ڕووبار، زەریا و ئۆقیانووسەکان »، با هەمووشیان هەر ئاو بن، چۆن لە نێو خۆیاندا، لە چەندێتی و چۆنێتیدا جیاوازییان هەیە، هەر بەو شێوەیەش، « کەمینە، گەل و نەتەوە »ش، لەگەڵ یەکدیدا جیاوازییان هەیە. بۆیە دەبێ، هەر زاراوەیەن پێناسەی تایبەتیی خۆی بۆ بکرێ، لە جێگەی تایبەتیی و لە باری خۆیدا دانرێ.

ئێستە با بزانین، خەڵکی کورد، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، بە ڕەشەخەڵک و خوێندەوارەکانیانەوە، چۆن لە زاراوەی « کەمەنەتەوەیی، میللەت، گەل و نەتەوە » تێگەیشتوون؟ با لەوەش گەڕێین، هێندێ لەو زاراوانە، لە بەکارهێنانی فەرهەنگی ڕامیاریی بە گشتیی و فەرهەنگی زمانی کوردییدا بە تایبەتیی، لەچاو فەرهەنگی ئایینداا، هەر زۆر نوێن. چونکە، گەر زاراوەی « گەل » بگرین، هەموو پەنجا ساڵێ نابێ، بۆ ئەم مەبەسەی ئەوڕۆ بەکاردێ. لێرەدا، پێنج نموونەی زیندوو پێش چاودەخەین :

لە کۆندا، نووسەر و هۆنەرێکی ناسراوی وەک « رەفیق حیلمی »، زاراوەی « نەتەوە »ی بە شێوەیەکی سەیر و شێواو بەکارهێناوە. بۆ نموونە، لە نووسینێکدا باسی « رەمزی مەلا مارف » دەکا و دەڵێ:(ڕەمزی لە سەر سنوری بوێژەکانی دەوری کۆن و تازەدایە، ناتوانین، بڵێین: کە بە تەواویی شاعرێکی تەقلیدییە و هەر پەیڕەوی بوێژە کۆنەکانی کردووە. بە هەموو مانای ووشە، بە شاعیرێکی عەسری و تازەش ناژمێررێت. بەڵام، بە ئەسپایی و لەسەرخۆ، لە هەر دوو نەتەوەکانی وەرگرتووە و لە چەشکەی هەر دوو لادا بەشدارە.)« 25،57 » لێرەدا، مامۆستا زاراوەی نەتەوەی، بە هەڵە، لە بری نەوە بەکارهێناوە. یا کاتێ باسی « سالم » دەکا، دەڵێ:(لە نەتەوەی « صاحبقرانە »)« 55،57 » ئەمە هەڵەیەکی گەلێ گەورەیە. چونکە « ساحبقران » نەتەوە نییە، بەڵکوو بنەماڵەیە. هەروەها دەیتوانی، بنووسێ: لە بەرەبابی « ساحبقرانە ».

« عەزیزی ئیبراهیمی »، بەوەشەوە نەوەستاوە، نەتەوە و هۆزی تێکەڵاوکردووە، کاتێ، لە سەرەتای بەرهەمەکەیدا دەڵێ:(ئەم نامیلکەیە پێشکەش بە برایانی بەڕێز و خوشکانی خۆشەویستم دەکەم، کە بە کورد و تورک و بەلووچ و عەرەب و فارس و هەموو هۆزەکانی تریشەوە.)« 6،72 » هەڵبەتە، لای نووسەر، تا ئەو کاتە، جیاوازیی لە نێوان « نەتەوە » و « هۆز »دا ڕوون نەبۆتەوە، بۆیە ئەو نەتەوانەی بە « هۆز » داناوە! پاشان دەڵێ:(بزانن هەر نەتەوەیەک کە زمان و ئەدەبی بوو ئەژی و سەرئەکەوێ ئەو گەلە جا با دیلیش بێ، هەر خۆ دەناسێنێ و ڕۆژێک دەبێ هەر وەک گەلانی پێشکەوتووی دیکە کۆسپی ژیان لابەرێ و سەرکەوێ...تاد) « 6،72 » لێرەشدا، جارێ زاراوەی « نەتەوە » و جارێکیش زاراوەی « گەل »ی بەکارهێناوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، نووسەر جیاوازیی لە نێوانیاندا ناکا. چونکە، گەر دوو زاراوەی جیاوازبن، هەر کاتێ بە نەتەوە یا گەل شتێکمان نووسی، دەبێ، هەر بە هەمان زاراوەش تەواوکرێ. واتە: دەبووایە، بینووسیایە:« بزانن هەر نەتەوەیەک کە زمان و ئەدەبی بوو ئەژی و سەرئەکەوێ، ئەو نەتەوەیە جا با دیلیش بێ، ... تاد ».

« هێمن »یش، وەک هەموو کوردە نووسەرەکانی ڕۆژهەڵات، لە لایەکەوە

ئەو جیاوازییەی لە نێوان « گەل و میللەت »، لە لایەکی دیکشەوە لە نێوان « گـەل و مـیللەتانی ئێـران »دا نەکـردووە. ئەمـەش لەم چەن دێڕەدا دەردەکـەوێ، کـاتێ دەڵێ: (بەیانی دوو فـڕۆکـە هاتن و چەن نارنجـۆکی پچووکیان بە شاردا دا، ئەرتەشی شاهەنشاهی، ئەو ئەرتەشەی لە کوشتنی میللەتی ئێراندا لاسایی داگیرکەرانی مەغوول و نازی دەکردەوە، تاوێکی بەربەرەکانی نەکرد و پێش ئەوەی لەشکری سوور بگاتە مەهاباد چەکی فڕێدا و وەک تۆوی هەرزن بڵاوبوو.)« 18،121 »

« ئومێد ئاشنا »، لە گوتاری « موفتی پێنجوێنی ـ وەک تێکۆشەرێک لە ڕێگای سەربەستی ئافـرەتدا » دەنووسێ: (شـتـێـکی دیارە کـە نەتەوەی کـوردیش وەکوو دووەم نەتەوەی عێـراق وە بەپێی هەڵکەوتنی جوگـرافـیـای ناوچەکەی و نزیکی لە دەوڵەتی عوسمـانیـەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو ڕژێـمە کـۆن و دواکـەوتووەدا ئەیناڵاند.)« 20،50 » جـارێ، با ئەوە بڵـێـین، ئەو کـاتانەی کـورد، لە بندەسی عـوسـمـانیـیـەکـاندا دەیناڵاند، لە سـەر ڕووی نەخشـەی ئەم جیـهـانە، دەوڵەتێ نەبوو، ناوی عێـراق بێ! ئینجـا، کورد لە عێراقدا، لە ڕووی زمان و زاراوەی ئیتنییەوە، نە ئەوساش و نە ئێستەش، هەرگیزاوهەرگیز نەتەوە نەبووە و نەتەوەش نییە. چونکە، کورد لە هەر کوێیە هەبێ، بە هەمـــووی نەتـەوەیەک پێکدێنێ، کـــوردیش لە سنووری هەر دەوڵەتێکدا بژی، زاراوەی گـەلی بۆ بەکـاردێنرێ. گـەلانی عـێـراقـیش، هەر یەکەیان بەشێ لە نەتەوەکەی خۆیان پێکدێنن، وەک گەلی کورد لە عێراقدا، بە بەشێ لە نـەتەوەی کـورد و گـەلي عـەرەبیش لە عـێـراقـدا، بە بەشێ لە نەتـەوەی عـەرەب دادەنرێن. نەک بڵـێین: نەتەوەی عـێـراق، ئەمـە خـۆی لە خۆیدا، بە هەڵەیەکی گەورەی زمانەوانیی و ئیتنیی دەژمێررێ، بەکارهێنانی هەرگیز ڕاست نییە.

« فاتیح ڕەسووڵ » دەڵێ: (گەلی کورد پێویستی بە پارتێکی مارکسیستی سەربە خۆی تەواو هەیە، کە ڕۆڵێکی سەرەکی و پێشـڕەوانە، لە ڕێنوێنی خەباتی ڕەوای گەلەکەمان و ئەو نەتەوە پچووکانەی لە سەر خاکی کوردستان دەژین، ببینێت.)« 22،41 » لێرەدا، واز لە هەڵەی ڕێنووس دێنین. تەنیا لە مەبەستەکەی خۆمـان دەدوێین. لەم کـۆپلە پچـووکـەی، لە بیسـتـونۆ ووشـە

پێکهاتووه، دوو جار زاراوەی گەل و جارێکیش زاراوەی نەتەوەی بەکارهێناوە. پێشەکیی دەبێ، ڕووی دەمم لە نووسەر کەم و لێی بپرسم: ئایا مەبەس لە گەلی کورد یا گەلەکەمان، تەنیا گەلی کوردە، لە باشووری کوردستان، یا هەموو کورد لە جیهاندا دەگرێتەوە؟ چونکە، ئەوە دوو زاراوە و دوو واتای جیاواز دەگەیەنن. گەر مەبەس لە گەلی کورد، تەنیا ئەو کوردانە بن، لە باشووری کوردستاندا دەژین، ئەوا بەکارهێنانەکە تەواوە. بەلام، گەر مەبەسەکە هەموو کورد بێ، ئەوا بە هەڵەیەکی گەورە دادەنرێ. چونکە، بە هەموو کوردی پارچەکان و هەندەرانیش، ئینجا نەتەوەیەک پێکدێنن. پاشان، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، ئەو کەمەنەتەوەیی یانەی، هەر لە کۆنەوە لە کوردستاندا دەژین، بە « نەتەوە پچووکەکان »یان دادەنێ. جگە لەوەی ئەوانە، نەک هەر نەتەوە نین، بەڵکوو بە گەلیش ناژمێررێن، چونکە لە کوردستاندا خاکیان نییە. بۆیە، بە کەمەنەتەوەیی دادەنرێن. بەلام، کوردستانی ئەورۆ، « جگە لە عەرەبە دەشتەکییە چێنراوەکان » نیشتمانی هەموو ئەو کەمەنەتەوەیی یانەشە، کە لە سەری دەژین، گەر بیانەوێ، وەک برا لەگەڵ کورددا بژین و بۆ خاکوخۆڵەکەی، ئاووهەواکەی بە ئەمەک و دڵسۆزبن! جا ئێستە تێ نەگەیشتین، ئەو پارتە کۆمۆنیستەی داوایدەکا، بۆ هەموو کوردە، یا تەنیا بۆ بەشێ لە نەتەوەی کوردە، کە « گەل »ەکەی مامۆستا دەگەیەنێ!

« نەوشیروان مستەفا »، لە نووسینەکانیدا، بە تایبەتیی لەم سێ بەرگەی یاداشتەکانیدا، گەلێ جار، ئەم زاراوانەی تێکەڵکردووە. لێرەدا، چەن کۆپلەیەکیان، وەک نموونە لێ وەردەگرین.

لە بەرگی یەکەمی بیرەوەرییەکانیدا، دەڵێ:(لە راپۆرتەکەی دا لایەنە سەلبی و ئیجابییەکانی سیاسەتی بەعسی لە کوردستان دا باس کرد بو. ناسینی کورد لە دەستور دا وەکو نەتەوەیەکی سەرەکی و، سەلماندنی مافی ئوتونومی و، ...)«50،116» لێرەدا، جگە لەوەی وەک نووسەرە کلاسیکییەکانی کورد، بە ڕێنووسێکی کۆن و بلاو نووسییێتی، وێرگول و ئامرازی « و »ی لێکدەری پێکەوە بەکارهێناوە، کوردیشی لە عێراقدا بە نەتەوەی سەرەکیی داناوە!

هەروەها، دەڵێ: (ڕزگار کردنی عێراق لە کۆت و زنجیر و پەیوەندییەکانی کۆلۆنیالیزمی نوێ و لە ڕژێمی دیکتاتۆری دوژمن بە گەل و هێنانە سەر کاری حکومەتێکی دیموکراتی ئیئتلافی لە نوێنەرانی پارتییە سیاسییە پێشکەوتووەکان و چینەکانی گەل و نەتەوە سەرەکی و پچوکەکانی عێراق، ...) «80،116» لەم کۆپلەیەدا، دوو زاراوەی جیاواز و ناکۆکی بەکارهێناوە. گەل، نەتەوە سەرەکیی و پچووکەکانی عێراق. یەکەم: گەل و نەتەوە جیایە. لە عێراقدا نەتەوەی تێدا نییە. بەڵکوو لە چەن گەل و کەمەینەیەکی نەتەوەیی پێکهاتووە. دووەم: دەبووایە، گەلانی عێراقی بنووسیایە. سێیەم: نەتەوە پچووکەکان هەڵەیەکی زۆر گەورەیە. چونکە، نووسەر مەبەسی لە تورکمان و ئاسوورییەکانە، ئەوانە کەمەنەتەوەیین و نەتەوە نین. ئەمەشی جارێکی دیکە دووبارەکردۆتەوە، کاتێ دەڵێ: (بەشدار بونی کورد و نەتەوە پچوکەکان لە ئۆرگانە ناوەندییەکان دا بە پێ ی ژمارەیان.) «81،116» لە جێگەیەکی دیکەشدا، بە شێوەیەکی سەیر زاراوەی « نەتەوە » بەکاردێنێ و دەڵێ: (نەتەوەیی کردنی بازرگانیی دەرەوە و چاودێری کردنی بازرگانی ناوەوەی وڵات و گەشەپێدانی دەزگاکانی بەشی گشتی.) «83،116» لێرەدا نازانم، مەبەسی لە زاراوەی « نەتەوەییکردن » چییە ؟! گەر مەبەس لە « دەسبەسەراگرتن » نەبێ، هیچ شتێکی دیکە ناگەیەنێ! هەر چەندە، بە تەواویی نازانم، نووسەر لەگەڵ ئەم ووتەیەی «یەزیدیی »ەکاندایە یانا ؟! بەڵام، بە ڕاستیی ئەو زاراوەیە بۆ یەزیدییەکان پڕ بە پێستی خۆی دادەنرێ. چونکە، وەک لە کۆندا « فەهد »ی سکرتێری پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی عێراق بانگاشەیان بۆ دەکرد، یەزیدییەکان نە کەمینەیەکی نەتەوەیی و نە گەلێکی جیاوازن، بەڵکوو کوردن و بە بەشێ لە نەتەوەی کورد دادەنرێن، بەڵام، لەگەڵ کوردە موسوڵمانەکاندا، ئایینیان جیاوازە، لەبەرئەوە لە جێی خۆیدایەتی، گەر بە میللەتی یەزیدیی ناوبرێن، وەک قورئانی پیرۆز، ئەوانەی باوەڕیان بە پەیامبەران « برایم و موسا » هێنابوو، بە « میللەتی برایم و موسا »ی ناوبردوون. لێرەدا، نووسەر دەڵێ: (یەزیدیەکان بە خۆیان ئەڵێن: « میللەت » و بە دینەکەیان ئەڵێن: « ئولی ئیزدی ». خۆیان بە میللەتی هەڵبژێردراوی یەزدان ئەزانن.) «106،116»

لە بەرگی دووەمی بیرەوەرییەکانیشیدا، دەربارەی کورد دەنووسێ:(ئەم میللەتەی کە ڕەنگە لە دنیای ئەمڕۆدا، تەنیا نەتەوەی گەورە بێت کە هێشتا .... میللەتە بەش بەش و دیلەکەی ئێمەیە کە ناوی: کوردە.) «10،117» جگە لەوەی، لە نێوان بیستودوو وشەدا، سێ جار ئامرازی «کە »ی داناوە، هەر دوو زاراوەی « میللەت » و « نەتەوە »شی، بە یەک واتا بۆ کورد بەکارهێناوە. باوەڕ ناکەم، میللەت نەتەوە بێ! پاشان، لە جێگەیەکی دیکەدا، دەڵێ:(وەرزنامەی کۆمەڵە لە قۆناغێکا دێتە کۆڕی خەباتەوە کە خەباتی گەلەکەمان گەیشتۆتە بەرزترین و بالاترین پلەی، واتە پلەی خەباتی چەکدارانە، واتە لابەلا کردنی ناکۆکی سروشت دوژمنانە و سەرەکی نێوان بورجوازی بێرۆکراتی رەگەزپەرست و شۆڤێنی عەرەبیی عێراق و نەتەوەی کورد لە رێگای بەکارهێنانی زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە و چەکەوە.)«11،117» لێرەدا، گەر مەبەسی لە نەتەوەی کورد، تەنیا کوردی باشوور بێ، ئەوا لە ڕووی زمانەوە هەڵەیە، دەبوو گەلی بنووسیایە. بەڵام، گەر مەبەسی لە هەموو کورد بێ، ئەوا جگە لەوەی، عەرەبی عێراقی لە نەتەوەی عەرەب جیاکردۆتەوە، بەڵام، کوردی لە نەتەوەی کورد جیا نەکردۆتەوە، لە ڕووی نەتەوەیی و ڕامیاریشەوە هەر هەڵەیە، چونکە، ئەو دوژمنایەتییەی لە نێوان کوردی باشوور و بەعس دایە، لە نێوان هەموو کورد و بەعسدا نییە، بەڵکوو تەنیا، لە نێوان کوردی باشوور و بەعس دایە!.

هەروەها، سەرنجمداوە، لە زمانی کوردییدا، چەن ووشەیەکی وەک «داکۆکیی، بەرگریی، بەرەنگاربوونەوە، بەربەرەکانیی، بەرهەڵست، بەرپەرچدانەوە و ... »مان هەیە، واتاکانیان لە یەکدییەوە نزیکن، هەر چەندە، هەر یەکەیان بۆ مەبەسێکی تایبەتیی بەکاردێنرێن، بەڵام، زۆر جار بە هەڵە بەکاردێنرێن. ووشەی « داکۆکیی » لە زمانی کوردییدا، بەرانبەر ووشەی « دفاع » و ووشەی « بەرگریی »ش بەرانبەر ووشەی «مقاومە »ی عەرەبیی دێن. کەچی، هێندێ کەس و نووسەر، لە قسەکردن و تەنانەت لە نووسینەکانیشیاندا، جیاوازیی لە نێوان هەر دوو ووشەکەدا ناکەن. ووشەی « بەرگریی » بە پێچەوانەوە بەکاردێن و بەرانبەر ووشەی « دفاع »ی

عەرەبیی دایدەنێن. داکۆکیی، پتر پشتیوانیکردن دەگەیەنێ، هەوڵدانە، کۆششکردنە، بۆ ئەوەی بە سەر شتێکدا سەرکەوی. وەک دەڵێی: ئازاد داکۆکیی لە ئازادیی دەکا. نەک بەگریی لە ئازادیی دەکا. کاوە داکۆکیی لە خۆی کرد، نەک بەرگریی لە خۆی کرد. بەرگریی، لە بەرگەگرتنەوە هاتووە. بۆ نموونە. ڕاستروایە، بڵێین: کورد لە ساڵی « 1975 »دا بەرگریی بۆ نەکرا. نەک داکۆکیی بۆ نەکرا. هەر دوو زاراوەی « بەرگریی و بەرەنگاربوونەوە » نزیکەی یەک واتایان هەیە، هەر دووکیان بۆ تاکە کەسێک و بزووتنەوەیەکی چەکدارانەش بەکاردێنرێن. بەرەنگاریی یا بەرەنگاربوونەوە، بەگژاچوونەوە دەگرێتەوە. وەک ئەوەی دەڵێین:

کاروان ویستی، لە کاوە بدا، بەڵام کاوە بەرەنگاری بۆوە.

هەر چەندە، سەربازەکە لە کاوەی دا، بەڵام، کاوە بەرگریی کرد و خۆی بە دەسەوە نەدا.

یەکێ یا بزووتنەوەیەکی چەکدارانە دەتوانێ، بەرەنگاری زۆرداریی بێتەوە. بۆ نموونە:

خزعل گەلێ سوکایەتی بە کورد کرد، کوردە بەرەنگاریی بۆوە.

بەرهەڵستیکردن، لە بەرهەڵستەوە هاتووە. واتە: دژایەتیکردن، دوژمنایەتیی. یا بە کۆسپ و لەمپەریش دێ. بۆ نموونە:

سەروو ویستی، بەرهەڵستی سەردار بکا، بەڵام سەردار بەرهەڵستی کرد.

بەرهەڵسکارمان زۆرە، بەرهەڵستمان بۆ دادەنێن.

ئەوەتەی کورد هەیە، بەرهەڵستی بۆچوونەکانی دەوڵەتی عێراق دەکا.

بەربەرەکانیی، لە ڕووی یەکێکدا بوەسی. ڕقەبەریی لەگەڵ کەسێکدا بکەی. بەرپەرچدانەوە، بۆ کەسێ دەبێ، وەڵامی گووتەیە یا کارێکی خراپ بداتەوە. یا کەسە بە یەکێ ببڕێ. دەڵێین: ئەو، ئەو درۆیەی کرد، منیش بەرپەرچمدایەوە. یا بێدەنگمکرد.

هەندێ جار، ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستانیش، بەگوێرەی بەرژەوەند و پاوەری تایبەتی تەسکیی پارتایەتی خۆیان، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، زاروەی ئیتنیی و ڕامیاریی دادەتاشن، بێ ئەوەی لەگەڵ مەبەسەکەیاندا بگونجێ، یا ڕاستییەکی تێدا بێ. ئەمەش پتر زمانەکەمان دەشێوێنێ، نەک

دەوڵەمەندی بکا. بۆ نموونە: چەن ووشەیە هەن، واتاکانیان لە یەکدییەوە نزیکن، وەک: (ڕووخـــان، تێکچـــوون، تەواوبوون، بڵاوەلێکردن، کۆتاییپێهێنان، ئاشبەتاڵ، هەرەس، نسکۆ). لە ڕوواڵەتدا دەتوانین، ئەم ووشانە هەموویان بۆ کارەساتەکەی شۆڕشی 11/سێپتێمبەر بەکاربێنین، بەڵام، لە ڕاستیدا، هەر یەکەیان بۆ مەبەسێکی تایبەتیی و دیاریکراو بەکاردێنرێن.
هەمووومان دەزانین، دوای ئەوەی شۆڕشی 11/سێپتێمبەر، لە ئەنجامی پیلانێکی نێوچەیی و نێودەوڵەتیدا کۆتاییپێهات، هێندێ لەم زاراوانە دەرکەوتن. جاری یەکەم، ووشەی « ئاشبەتاڵ » وەک چەمکێ بۆ ئەو کارەساتە نەتەوەیی یەی بە سەر کورددا هات، لە سەر زاری کۆمەڵانی ڕەشوورووتی گەلی باشووری کوردستانەوە دەرکەوت. بەڵام دواتر، «کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی و یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، وەک نەیارێکی « بنەماڵەی بارزانیی » قۆستیانەوە، لە ئاخافتن و نووسینەکانیاندا، وەک زاراوەیەکی ڕامیاریی بەکاریانهێنا. تەنانەت، ئەوڕۆ ئەو ووشەیە وای لێهاتووە، جۆرە کاردانەوەیەکی لای هێندێ کەس پەیداکردووە. هەر کاتێ، یەکێ باسی ئاشبەتاڵ بکا، یەکسەر دۆست و ئەندامانی پارتی، دەماری تووڕەییان هەڵدەسێ و تووکی سەریان گرژ دەبێ، وەک ئەوەی گرفتە گەورە سەرەکییەکەی کورد، لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیەدا بێ!
گەر لە ڕووی زمانەوانییەوە، لەو ووشەیە بدوێین، دەبینین، « ئاشبەتاڵ » ووشەیەکی لێکدراوە، لە دوو ووشەی « ئاش » و « بەتاڵ » پێکهاتووە. لە هەمان کاتدا، بە یەکێ لە ئیدیۆمە یەککگرتووەکانی زمانی کوردیی دادەنرێ. گەر « ئاشبەتاڵ » بە پێی هەنبانەبۆرینەکەی « مام هەژار » لێکدەینەوە، (دەس لە کار کێشان) دەگرێتەوە. «7،120» بەڵام، گەر بۆ بەسەرهاتەکەی بگەڕێینەوە، ئەوا، « ئاشبەتاڵ » واتە: کاتێ ئاشەوان هەسدەکا، ئاشەکەی خەریکە دانی لێ دەبڕێ، یا بە تەواویی دانی لێ براوە، بۆ ئەوەی ئاشەکە لە کارکردن نەکەوێ، گەر شوێنی ئاشەکە لە ئاواییەوە نزیکبێ، لە سەربانی ئاشەکەوە ڕووەو ئاوایی دەقیژێنێ و دەڵێ:

ئاشبەتاڵ. بەڵام، گەر شوێنی ئاشەکە، لە ئاوایییەوە دووربێ، ئەوا ئاشەوانەکە دەچێ بۆ ئاوایی و لەوێ هاواردەکا: « ئاشبەتاڵ »، تا باراشی بۆ بێنن و چ ئاش و چ ئاشەوان سارد نەبنەوە و لە کار نەکەون.
دیارە، کۆمەڵانی خەڵک، ئەو ئیدیۆمەیان بۆ مەبەسی ڕامیاریی، لەو کارەوە خواستووە و بەکاریانهێناوە. لێرەدا، بە مەبەسی وازهێنان لە کارێ بەکارهاتووە، کە خاوەنەکەی بە کەموکوڕیی و بێ ئەوەی تەواویکا، بەجێیهێشتووە. بەڵام، بە باوەڕی من، ئیدیۆمی « ئاشبەتاڵ »، بۆ تێکچوونی شۆڕشی چواردە ساڵەی گەلەکەمان بەکار ناهێنرێ و لە جێی خۆیدا نییە. چونکە، گەر شۆڕشیش بە ئاش و ژەنەڕاڵ « بارزانیی » بە ئاشەوان دانێین، ئەوا ئەو « ئاش » و « ئاشەوان »ە، دانیان لێ نەبڕابوو، تا هاوار لە کۆمەڵێکی دیکە بکەن و باراشیان بۆ بێنن، بۆ ئەوەی ئاشەکەیانی پێ بگێڕن! بەڵکوو، هەموومان دەزانین، شۆڕشی کورد، لە بەر بێ توانایی ئابووریی و کەمی کەرەسەی جەنگیی، کۆتایی پێ نەهات، لە ڕووی سەربازیشەوە تێک نەشکا، بەڵکوو، هەر لە سەرەتاوە، لە ڕووی ڕامیاریی و دیپلۆماسییەوە، بە تەواویی لاوازبوو. پاشان، لە ئەنجامی پیلانێکی نێونەتەوەییدا تێکشکا و تووشی ئەو ماڵوێرانییە بوو. بەرژەوەندیی زلهێزێکی وەک ئەمێریکاش، ڕۆڵی سەرەکیی لەو تێکشکاندنەدا وازیکرد. لەبەرئەوە لێرەدا، ووشەی « ئاشبەتاڵ » بە هیچ شێوەیە ناگونجێ و بۆ ئەو مەبەسە بەکار ناهێنرێ.
ووشەی « هەرەس » واتە: کاتێ کێوێک یا چیایەک، « بەردی زل، پارچە بەرد، خۆڵ »ێکی زۆری لێ دەبێتەوە و دەڕوخێ، لە بەرزاییەوە بەرەو خوار تلۆردەبێتەوە. ئەو کاتە دەڵێن: کێوەکە یا چیاکە هەرەسیهێنا. یا کاتێ، بەفرێکی زۆر دەبارێ، بە تەواویی سەر «لووتکە، قەدپاڵی کێو و چیاکان» دادەپۆشێ، ئەو بەفرە ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە. پاشان، تیشکی خۆر کاتێ لێیدەدا، وردەوردە دەتوێتەوە، بنەکەی بۆش دەبێ، یا هەر خۆی لە بنەوەدا لە ژێر بەفرەکەدا بۆشاییەک دروسبووە، یەکسەر دادەڕوخێ، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بە گوڕ و بە تاو، وەک شەپۆلەبەفر تلۆردەبێتەوە، هەر چی هەیە، لەگەڵ خۆیدا ڕایدەماڵێ، یا لە شوێنی خۆیدا دایدەپۆشێ. بۆیە بە

هەرەسی بەفـر ناوی دەبەن. بە باوەڕی من، باشـترین ووشـە، ووشـەی «هەرەس »ە. چونکە، کـورد هەمـوو شـتـێکی هەبوو، بەڵام سـەرانی شۆڕشەکە، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی ورد، بۆ باری شۆڕشەکە و گەلەکەمـان بکەن، بێ ئەوەی، ئاگاداریيەکی تەواوییان، لە سەر بارودۆخی نێونەتەوەیی و بەرژەوەندیی زلهێزەکانی جیهان هەبێ، بێ ئەوەی، ئاگایان لە خـۆیان بێ، بەو هەمـوو توانا مـرۆیی و مـەتیـریالیـیـەوە، لە پڕ وەک چیـایەکی بەفـرین، شـۆڕش هەرەسـیـهـێنا ، هەمـوو شـتـێکی لەگەڵ خۆیدا ڕامالی و کۆتایی پێ هات.
دیارە، ئەم زاراوانەش، بەپێی « کـات، توانا ، دەسـەڵات و تەرازووی هێزەکان » دەگـۆڕێن. سەرەتا ، زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی گەل و ڕێکخراوە ڕامیـاریيـەکـانی کـوردسـتـان، لە تاو سـوێی ئازاری ئەو کـارەسـاتە گـەورە نەتەوەیی یە، لە ئاخافتن و نووسینەکانیاندا، تووتی ئاسا ، ئەو زاراوەیەیان دووپاتدەکـردەوە. سـەرکـردەکـانی پارت و بنەمـاڵەی بارزانیش، هێندە پەشۆکابوون، ئاگایان لە خۆیان نەبوو، هیـچیـان لە دەسدا نەمابوو، زۆر گـرنگیـیـان بەو جـۆرە ووشـە و چەمکانە نەدەدا ، یا با بڵـێین: لێی تێ نەدەگەیشتن. بەڵام کاتێ، هۆشیان بە بەر خۆیاندا هاتەوە، زانییان، چییان بە سـەر خۆیان و گـەلەکەیان هێناوە، وردەوردە، خۆیان کۆکردەوە و خـۆیان ڕێکخـسـتـەوە، هێـزی چەکـداریان دامـەزراندەوە، مـەچەک و بـازوویان ئەستووربۆوە، وەک ڕێکخراوێکی ڕامیـاریی بە هێز و توانا ، سەرلەنوێ بۆ گـۆڕەپانەکـە گـەڕانەوە، وەک هێـزێکی چەکـدار لە کـوردسـتـاندا خـۆیان نواندەوە. بە تایبـەتیی، دوای شـۆڕشی گـەلانی ئێـران، بە تەواویی لە دارەدارەکەوتن، سەرپێی خۆیان کەوتنەوە، خوێنێکی نوێ، بە جەستەیاندا گەڕا. ئیدی لەوە بەدوا ، لە کەسیان قەبوڵ نەدەکرد ، زاراوەی « ئاشبەتاڵ » بەکـاربێنێ، بەڵکوو لەبری ئەوە، زاراوەی هەرەسـیـان بەکـاردێنا . تەنانەت، کاتێ لە نزیکەوە، لەگەڵ هێـزە کوردستـانییـەکـانی دیکەشدا، دەسـیـان بە وتووێژکـرد و لە یەکـدی نزیکبـوونەوە، پاشـان، ڕێککەوتن و بەرەی کـوردسـتـانیـیـان دامـەزراند، ئیـدی ئەوانیش، وازیان لەو ووشـەیە هێنا و ووشـەی هەرەسـیـان بەکـاردێنا . هەر چەندە، هەر جـارێ، دەمـبـۆڵەیە،

هەراوهوریایە، لە نێوان پارتی و یەکێتیدا پەیدادەبێ، یا جەنگ لە نێوانیاندا ڕوودەدا، هەر زوو ئەندامان و کادیرەکانی سەرکردایەتی یەکێتی، جارێکی دیکە، ووشەی « ئاشبەتاڵ » بەکاردێننەوە، تا بەو شێوەیە، سووکایەتی بە سەرانی پارتی و بنەماڵەی بارزانیی بکەن. ئەوەبوو، لە بەر نارەزایی پارتی، لە بری ووشەی « ئاشبەتاڵ »، لە نووسیندا زاراوەی « هەرەس »، برەوی پەیداکرد و تا ڕادەیەکی زۆریش چەسپا.
بەڵام، سەرانی پارتی و بنەماڵەی بارزانیی، کاتێ سەرکەوتنی مەزنتریان بەدەسهێنا، جارێکی دیکە بە خۆیاندا چوونەوە. بۆیە، ئێستە ووشەی هەرەسیش بە گاڵتەپێکردن و سووکایەتی دادەنێن. لەبەرئەوە، ووشەیەکی دیکەیان داناوە، ئەویش ووشەی « نسکۆ »یە. جا گەر لە پاشەڕۆژدا، بە تەواویی دەس بە سەر کاروباری کوردستاندا بگرنەوە، تەنیا خۆیان لە گۆڕەپانەکەدا تەراتێنکەن، هیچ لایەنێ لە کوردستاندا، بەربەرەکانیان نەکا، ئەوا ئەو کاتە، جارێکی دیکە، ووشەی « نسکۆ »ش ڕەتدەکەنەوە. دوور نییە، ئەم جارەیان، ووشەیەکی دیکەی لە بارتر، بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان داتاشن، کە زۆر زیاتر لە ڕاستییەوە دووربێ!
با لێرەدا، کەمێ لە ووشەی « نسکۆ »ش بدوێین. لە هەنبانەبۆرینەکەی « هەژار »دا، ووشەی نسکۆ بە (1/ ڕەت، سەرسم. 2/ هەڵەنگوتن) هاتووە. «865،120» دیارە، بە هیچ شێوەیە، نسکۆ بۆ تێکچوون و کۆتاییپێهاتنی شۆڕشی11/ سێپتێمبەر بەکار نایە. چونکە شۆڕش نە مرۆڤ و نە ئاژەڵ بووە، تا ڕەت و سەرسمدا و بکەوێ، جارێکی دیکەش هەڵسێتەوە! هەڵەنگوتنیش بە واتای(توشبوون، کەوتن) دێ «27،120» جگە لەوەی، شۆڕش بۆ کارێکی تایبەتیی ڕامیاریی یا سەربازیی، هەنگاوێکی دیاریکراوی نەناوە، تا لەو هەنگاوەدا، تووشی ئەو هەڵەنگوتنە بووبێ، بەڵکوو، هەموو دەزگە « ڕامیاریی، سەربازیی، کۆمەڵایەتیی و کلەتووریی »ەکانی، هەر لە زاخۆوە تا خانەقین، بە یەک جار لەمەریەک هەڵوەشان، تێکچوون و ڕوخان. پاشان، ماوەی پتر لە ساڵێکیشی بە سەردا تێپەڕی، تا جارێکی دیکە، ئاگری شۆڕشێکی دیکەی نوێی چەکداریی، بە تەواویی کڵپەیسەند، گڕی بەرزبۆوە و هەموو

کوردستانی ڕووناکردەوە. واتە: هەرەسێکی تەواویی « ڕامیاریی، سەربازیی، مەڕالیی و سایکۆلۆژیی » بوو، نەک هەر کاری لە شۆڕشی11/ سێپتێمبەر و گەلی باشووری کوردستان کرد، بەڵکوو، لە هەموو ڕوویەکەوە، کارێکی یەکجار گەورەی، لە سەرجەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی کورد کرد. بە شێوەیە، پشکۆی داخێکی زۆر سەخت و بێ ئەندازەی، بە دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەراندا چزاند و کسپەی لە جەرگیان هەڵسان.
لەبەرئەوە، نە ئاشبەتاڵی دوێنێ و نە نسکۆی ئەوڕۆ، بۆ ئەو کارەساتە لە جێی خۆیاندان و گونجاون، بەڵکوو، لە ڕاستیدا، ووشەی « هەرەس » پڕ بە پێستی ڕووداوەکەیە. بەڵێ هەرەسبوو، هەرەسێکی ماڵوێرانکەرانەی وا، بە هیچ شێوەیە لە بیر ناچێتەوە، تا ئەوڕۆش برینەکانی بە تەواویی سارێژ نەبوون. لاپەڕەکانی مێژووش، زۆر بە وردیی، هێندێ لەو کارەساتانەی تۆمارکردوون، بە شێوەیەکی بەردەوامیش تۆماریاندەکا.
هەروەها، هێندێ ووشەی دیکە هەن، بە هەڵە هاتوون، تا ئەوڕش هەر بە هەڵە بەکاردێنرێن. هەر چەندە، هێندێ نووسەر لە سەریان نووسیوە، بەڵام، خەڵک یا نایانخوێننەوە، یا گوێی نادەنێ! بۆیە، کاتی ئەوە هاتووە، زمانەکەمان لە ووشەی هەڵە پاککەینەوە. بۆ نموونە: (بەروار و ڕێککەوت ، لە سەر تیشک و لە بەر تیشک، لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و شیکردنەوە، بچووک و پچووک، پێشنیاز و پێشنیار، نیشان و پیشان، نێو و ناو، زمان و زبان، ژن و ئافرەت، قوتابی و خوێندکار و شاگرد، قوتابخانە و خوێندنگە، فرین و ڕفین، ئاڵتون و زێڕ، چەوەندەر و چەنەوەر، زانکۆ و زانستگە، ...تاد)
هەر چەندە، هێندێ لەم ووشانە، بەپێی ناوچە و دیالێکت دەگۆڕێن. هەروەها، هێندێکیشیان واتای جیاوازیان هەیە. بەڵام، ڕاستروایە، ووشەی « بەروار » بەکار نەهێنین، چونکە لە « بەرواری بالاوە » هاتووە! « لە ژێر تیشکی » لە « عەلی ضەوئی »ی عەرەبییەوە وەرگیراوە و « لە بەر تیشکی » ڕاسترە.
دەربارەی ووشەی « لێکۆڵینەوە، توێژینەوە و شیکردنەوە »، چەن

تێبینییەکمان هەیە. د. « عیززەدین »، ووشەی « Analiz »ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: (ئەنالیز: ووشەی « Analiz »ی گریکی لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا بە مانای « تەحلیل »ی عەرەبی بەکاردێت، لام وایە ئێمەش بۆ ئەو مەبەسەی بەکاربێنین و ووشەی « لێکۆڵینەوە »ی ئێستا بەکارهاتووی خۆمان بۆ « تەحقیق » بەکاربێنین باشە. هەرچیش ووشەی داتاشراوی «توێژینەوە »یە، ئەوە لای زۆر لە شارەزایان وایە کە دەبێ لەگەڵ ئەو ووشە دەستکردانەدا کە ناشی دروستی کردوون، لادرێن.)«48،30»

لێرەدا دەمەوێ، شتێ دەربارەی « لێکۆڵینەوە » و « توێژینەوە » ڕوونکەمەوە. ئەم دوو زاراوەیە، بۆ دوو مەبەسی جیاواز بەکاردێنرێن، دوو واتای جیاوازیشیان هەیە. بەڵام، هێندێ کەس تێکەڵاویاندەکەن، یا جیاوازییان لە نێواندا ناکەن. « لێکۆڵینەوە »، بۆ دوو مەبەس بەکاردێنرێ. یەکەمیان ـ لە کارێکی « هونەریی، وێژەیی، مێژوویی، ڕامیاریی ... » بکۆڵیتەوە و ڕوونیکەیتەوە. بەڵام، مەرج نییە، وەک تاقیکردنەوەیەکی زانستانە وابێ، کە لە کێڵگە و لابۆرەکاندا دەکرێ و ئەنجامێکی زانستانەی هەبێ. واتە: پتر وەک باری سەرنجدەربڕین وایە. لێرەدا، بە عەرەبیی پتر بە زاراوەی « دراسە » دێ. دووەمیان ـ بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانێ یا لە شتێکی نادیار دێ، وەک « تەحقیق » لە عەرەبیدا بەکاردێنرێ.

بەڵام « توێژینەوە »، بە « بەحس »ی عەرەبیی دێ، کە تەنیا لە بواری تاقیکردنەوەکانی زانستدا بەرکاردێنرێ. جا، د. « عیززەدین »، هەر سێ ووشەی « Analiz »، « لێکۆڵینەوە » و « توێژینەوە »ی تێکەڵکردووە. « لێکۆڵینەوە »ی کوردیی، بۆ « تەحقیق »ی عەرەبیی و « تەحلیل »ی عەرەبیی، بۆ « Analiz »ی گریکی دادەنێ. بەڵام، باسی نەکردووە، «توێژینەوە » بۆ چ مەبەسێ دادەنرێ، تەنیا بە ووشەیەکی داتاشراوی داناوە، بێ ئەوەی بە عەرەبیی یا گریکی، واتاکەی بڵێ، تا بزانین، لە کوردیدا بۆچی بەکاردێ! لەو وایە، خەڵکی « لێکۆڵینەوە » بۆ ئەو مەبەسە بەکاردێنن. لای وایە، ناشییەکانی کورد « توێژینەوە »یان داتاشیوە و دەبێ، لادرێ. « Analiz »یش، بە کوردیی بە « شیکردنەوە »دێ. لە ڕاستیدا، ئەم سێ ووشەیە لە زمانی کوردییدا، بە تەواویی جێگەی خۆیان کردۆتەوە.

ووشـەی » « پچـووک » و « بچـووک »، هەر چەندە هەر دووکـیـان یەک واتایان هەیە، هەر دووکیشیان ڕاستن، بەڵام « پچووک » لە « بچووک » شیـرینتـرە و لە سەر زبان ئاسانتـرە، چونکە پیـتـی « ب » لە سـەر زبان لە پیتی « پ » قورسترە.
« پیشان » بۆ پیشاندان دەبێ و« نیشـان »یش، بۆ نیشانە و نیشـانکردن دەبێ، پێویستە جیاوازیی لە نێوان ئەم دوو ووشەیەدا بکرێ. « پێشنیاز » لە « پێشنیار » ڕاسترە و دووەمیان هیچ نییە.
« ناو و نێو »، لە ڕاستیدا، هەر دووکیان هەر یەک واتایان هەیە، زۆر جار نووسـەران، بە شێـوەیەکی تێکەڵاو بەکـاریاندێنن. بە تایبەتیی « نێـو » لە لقـەدیالێکتی « مـوکریی »دا، زۆر بەکـاردێ. ئەز پێـشنیـازدەکـەم، ئەم دوو ووشـەیە جیـاکرێنەوە، « ناو » بۆ ناوی گـیـانلەبەر و شت، « نێـو »یش بۆ شتێ لە نێو شتێکدابێ، بەکاربێنرێن.
لە کۆندا، هەر چی بیـخوێندایە، بە « شـاگرد » ناویان دەبرد. هـــەر وەک « مـەحویی »ش دەڵێ: «لە شاگردانی کۆڕی عەشقم و شوعلە عەسامە و دەسـتـی پێ دەگـرم ». بەڵام، ئێـسـتـە ووشـەی « شـاگـرد »، بۆ یەکێ بەکـاردێنرێ، لە بندەسی وەستایەکی شارەزادا کاربکا، تا فـیری ئەو کـارەی کا. پاشان ووشەی « قوتابی » لە « کتـابی » عەرەبییەوە وەرگیراوە. بەڵام لە پەنجاکاندا ووشەی « خوێندکار » دانرا، کە لە هەر دوو ووشەکە ڕاستر و باشـتـرە. « قـوتابـخـانە و خـوێندنگە »ش، هەروەها، بە هەمـان شـێـوە خوێندنگە لە قوتابخانە ڕاسترە.
« فڕین » لە « ڕفین » ڕاسـترە. باوەڕ ناکەم، ووشەی « ئاڵـتون » کوردیی بێ، چونکە کـورد هەر گـوتوویەتی: زێڕ و زیو، یا گـوتوویەتـی زێڕینگەر. تەنانەت، لە نێـو تورکـمـانەکـانی کـەرکـووکـیـشـدا، « ئاڵـتـون » بۆ ناوی نێـرینەش بەکـاردێنرا. بۆیە ووشـەی « زێڕ »، لە « ئاڵـتـون » تەواوترە.
«چەوەندەر » ڕاستە و « چەنەوەر » هەڵەیە.
بۆ « زانکۆ و زانسـتـگە »، کـاتی خـۆی لە سـاڵی «1968 »دا، زانکۆ لە سـولەیمانیی کـرایەوە، لە سـەر ئەو دوو ووشـەیە، دەمـەتەقـێـیـەکی زۆر بوو. بەڵام، لە کۆتاییدا هەر « زانکۆ »یان دانا. لە ڕاسـتیـدا، زانکۆ ووشەیەکی

لێکدراوە، لە « زانین و کۆکردنەوە »وە هاتووە. زانین واتای «مەعلومات»ی عەرەبیی دەگەیەنێ. « زانست » پتر بۆ « عیلم »ی عەرەبیی بەکاردێنرێ. بە لای منەوە، زانستگە ڕاسترە. بەڵام گەر پیتی« ت »کەشی لێ بقرتێنین، وەک « زانسگە »ی لێدێ، گەلێ ڕەوانتر و خۆشتردەبێ! سەرەڕای ئەوەی لە نێوان ئەم دوو زاراوەیەدا گیرمانخواردووە، هێشتا هێندێ کەس، زاراوەی «دانشگا »ی فارسییش بەکاردێنن. تەنانەت لە نووسینەکانیاندا و لە نێوان دوو دێڕدا، جارێ دانشگا و جارێکی دیکە زانسگە دەنووسن. بۆ نموونە: «عومەری ئێلخانی » دەنووسێ:( " سوارە " لە زیندان هاتەدەرێ و زەرد و لاواز و بێ واز خوێندنی دانشگای درێژە پێدا و لە ساڵی 1347ی هەتاوی زانسگەی تەواوکرد...)«12،60» دیارە، ئەم جۆرە نووسینە، بە هیچ شێوەیە ڕاست نییە. چونکە، وەک ئەوە وایە، بە دوو زمان بنووسی، ووشەی زمانی فارسیی و کوردیی تێکەڵاوکەی!

هێندێ کەس، لە بری ووشەی « لەو کاتەدا » یا « لەو ماوەیەدا » یا « بەو هۆیەوە » ووشەی « لەو میانەدا » بەکاردێنن. لە ڕاستیدا، « میانە » واتای « نێوان » دەگەیەنێ. کورد دەڵێ: لە میانەی من و تۆدا، هیچ جیاوازییە نییە. یا لە میانەی قسەکانیدا دەگوترێ. ئەم ووشەیەش بەو شێوەیە، ڕەنگە بۆ یەکەم جار،« عەلادین سوجادیی »، وەک هەڵەیەکی زمانەوانیی بەکاریهێنابێ. کاتێ دەڵێ:(لەو میانەیەدا قسە کراوە و ژنە ...ەڕاوەتەوە بۆ ماڵی کەس و کاری خۆی)«154،58» کە ڕاستر وابوو، بڵێ: (لەو بارەیەوە ... ). پاشان، ئەم ووشەیە لە دەنگوباسەکانی « MedTV » ... زۆری بەکاردێنرا، چونکە لە هەموو دەزگەی ئەو تێلێڤیزیۆنە کوردییەدا، ...ک کادێری زمانی کوردیی لێ نەبوو. ئیدی ئەوەی لەوێ دەس بە کاربوو، ...ئارەزووی دڵی خۆی، ووشەی دادەتاشی، بێ ئەوەی بەزەیی بە زمانەکەدا ...ێتەوە، هەر کار بڕوا، ئەوی دیکەی گرنگ نییە.*

---

* لەو بارەیەوە، چەن جارێ قسەم لەگەڵ کردوون، بەڵام، کەڵکی نەبوو. جێگەی داخە، دەزگەی تێلێڤیزیۆنێکی وا گرنگ، شتێکی لەو بابەتە بە هەڵە بڵاودەکاتەوە، کەڵکی نەشارەزاش وا دەزانن، ووشەیەکی ڕاستە و دووپاتیدەکەنەوە!

بۆ « شیعر »ی عەرەبیی، دوو زاراوەی وەک « هۆنراوە، هەڵبەست » و بۆ « شاعیر »یش سێ زاراوەی وەک « هۆنەر، هەستیار و هەڵبەستەوان »مان هەیە، کەچی، زۆربەی زۆری نووسەران، هەر « شیعر و شاعیر »ی عەرەبیی بەکاردێنن. هێندێ جاریش، تێکەڵاوی دەکەن، عەرەبیی و کوردییەکەیان دەنووسن، یا دوو زاراوەی کوردیی لە تەنەیشت یەکەوە ریزدەکەن، وەک ئەوەی بڵێن: کورد بە یەکێکیان تێ ناگا. بۆ نموونە: لە گەلێ شوێنی نووسینەکانی « عەلادین سوجادیی »دا نووسراوە :(لە بارێکا کە هەڵبەست و هۆنراوە هۆیەکە بۆ دەربڕین و ...)«58،68»

زۆربەی نووسەران، ووشەی « هەر » لە هێندێ جێگەدا، لەگەڵ ژمارە و ووشەکاندا پێکەوە دەنووسن، کەچی، لە هێندێ جێگەی دیکەشدا، بە جیا دەیاننووسن. لە ڕاستیدا، لە هەموو بارەکاندا دەبێ، هەموویان بە جیا بنووسرێن. چونکە، لە هەموو جێگەکاندا، هەر یەک واتایان هەیە. بەڵام، بەپێی بەکارهێنان دەگۆڕێ. بۆ نموونە: زۆربەی نووسەران ئەم ووشانە، «هەردووکیان، هەرچەندە، هەروەها ... » بەم شێوەیە دەنووسن. کەچی، هەرگیز نانووسن،(هەرچواریان، هەرتۆ، هەرمن، هەرکەس، هەرهەموو، هەربەو زمانە، لە هەرسەردەمێکدا، کەچی هەردوکتۆر خۆی، هەرخۆی، هەرکارزان ...) بەڵکوو، ئەو ووشە و ڕستانە، لە یەکدی جیادەکەنەوە، وەک:(هەر چواریان، هەر تۆ، هەر من، هەر کەس، هەر هەموو، هەر بەو زمانە، لە هەر سەردەمێکدا، کەچی هەر دوکتۆر خۆی، هەر خۆی، هەر کارزان ...). لەبەرئەوە دەبێ،« هەر » بە جیا بنووسرێ.

هێندێ نووسەر، هێندێ ووشەی فارسیی بەکاردێنێن، یا گوێی نادەنێ، یا نایزانن. دیارە، لە هەر دوو بارەکەدا، هەر هەڵەیە و هەر خراپە. هەر چەندە، هەر دوو زمانی کوردیی و فارسیی، بە یەکێ لە لقە زمانەکانی هندۆئەورووپایی دادەنرێن، لە گەلێ ڕووەوە لە یەکدی دەچن. بەڵام، هەر پێویستە، جیاوازیی لە نێوانیاندا بکرێ. چونکە، زمانەکان چەن لە یەکدیشەوە نزیکبن، هەر دەبێ، تایبەتمەندیی خۆیان هەبێ، خەسڵەتە دیاریکراوەکانیان بپارێزرێ. ئەگینا، گەر وا نەبێ، بۆ بە یەک زمان دانانرێن؟!! با لێرەدا، چەن نموونەیەک بێنینەوە :

«تەنها، جوداوازیی، جوداخوازیی، جوداکردنەوە، جودایی، سێهەم ...»
هەموویان بە فارسیی دادەنرێن و کوردییەکانیان بەم شێوەیە دەنووسرێ :
«تەنیا، جیاوازیی، جیاخوازیی، جیاکردنەوە، جیایی، سێیەم ...»
هێندێ نووسەری دیکە، کاتێ ووشەیە کۆدەکەنەوە، لە بەر ڕۆشنایی، دەستووری ڕێزمانی فارسیدا کۆیدەکەنەوە. وەک ئەوەی هەر دوو پاشگری «گا» و «ها»ی فارسیی بەکاردێنن. وەک: «ساڵەها، جارەها، ئینسانەها، میلیۆنەها ...» ئەمە بە هیچ جۆرێ ڕاست نییە. بەڵکوو دەبێ، بە هۆی «گەلێ» و «چەن، چەندین»ەوە کۆکریێنەوە. بۆ نموونە: «گەلێ ساڵ. گەلێ جار. گەلێ مرۆڤ ...» هەروا بۆ «چەن یا چەندین ساڵ، چەن یا چەندین جار، چەن مرۆڤێ یا چەندین مرۆ، چەن یا چەندین میلیۆن. یا بە میلیۆن، بە ملیۆنان بە میلیار و بە میلیاران ...» هەروەها دەتوانین، لەگەڵ ئامرازی هێماکردندا بەکاریانبێنین و بڵێین: ئەو ساڵانە، ئەو جارانە، ئەو مرۆڤانە. یا ساڵەکان، جارەکان، مرۆڤەکان.
پاشگری «گا» لە «گاە»ی فارسییەوە هاتووە. بە باوەڕی من، باشتروایە، پاشگری «گا»، لە زمانی کوردیدا بەکار نەهێنرێ. بەڵکوو، لە بری ئەوە پاشگری «گە» دابنێین، تەنیا لەو ووشانەدا نەبێ، کە خۆیان بە هەر دوو پیتی «گ، ا» کۆتاییاندێ و پاشگر نین، یا هەر خۆێ بە تەنیا واتا دەبەخشێ. وەک: «گا، مانگا». بەڵام، ئەو ووشانەی بە پاشگری «گا» کۆتاییاندێ، باشتروایە، بە «گە» بیانووسین. وەک: «ڕێگە، دەرگە، فێرگە، ئێزگە، وێزگە، حەشارگە، ڕوانگە، دەسگە، جێگە، خوێندنگە، فرگە، فرۆشگە ...» نەک، «ڕێگا، دەرگا، فێرگا، ئێزگا، وێزگا، حەشارگا، ڕوانگا، دەسگا، جێگا، خوێندنگا، فرگا، فرۆشگا ...»
ئەوەی کارێکی زۆر باشە، گەر پاشگری «کەر» لە زمانی کوردییدا وازلێ بێنین. چونکە، لە بری ئەوە، چەن پاشگرێکی دیکەی یەکترمان هەیە، وەک: «کار» لە سەر ئاوازی «کرێکار، جوتکار و ڕامیار». «زان» لە سەر ئاوازی «زمانزان». «چی» لە سەر ئاوازی «چێچی، پینەچیی» یا «گێڕ» لە سەر ئاوازی «دەسگێڕ، وەرگێڕ» بۆ نموونە: «یاریکەر، یاسکەر، فێرکەر، ڕاوکەر، تەماشاکەر، خەباتکەر ...»

به « یاریزان، باسکار، فێرکار، ڕاوکار یا ڕاوچی، تەماشاکار یا تەماشاوان، خەباتکار یا خەباتگێر ... » با « کەر » تەنیا بۆ ناوی ئاژەڵ بەکاربێ. وەک : « کەر و ماکەر ».
هەروەها، هێندێ ووشە هەن، لە هەموو زمانێکدا کۆ ناکرێنەوە. واتە: تاک و کۆی وەک یەک بەکاردێنرێ. بۆ نموونە: لە زمانی کوردییدا وەک:« پارە، با، باران، بەفر، ئاو، هۆش، هەست، ژیریی، خۆشەویستیی ... » جارێ، لە ڕادیۆیەکی کوردیی شاری ستۆکهۆڵم، گوێم لە برادەرێ بوو، چەن جارێ دەیگوت: « هەستە نەتەوەیی یەکان » کە ئەوە بە هەڵە و هەستی نەتەوەیی، بە ڕاستر دادەنرێ.
ئەم ووشانەش پێش هەر خەسڵەتێ بکەون، ئیدی کۆ ناکرێنەوە. بۆ نموونە:« هێندێ، کەم، زۆر کەم، گەلێ، کۆمەڵێ، چەن، چەند، چەندین ». لەبەرئەوە ناتوانین، بڵێین: (هێندێک نموونان)«84،103» بەڵکوو دەبێ، بنووسین:« هێندێ یا هێندێک نموونە. هێندێ، کەم، زۆر کەم، گەلێ، چەن، چەند، چەندین ـ جار، ساڵ، نموونە ... » نەک« هێندێ یا هێندێک، کەم، زۆر کەم، گەلێ، چەن، چەند، چەندین ـ جاران، ساڵان، نموونان ... » وەک « گۆران »یش دەڵێ: « زۆر قژی زەرد، سەرنجی ڕاکێشاوم ».
ئێستە، کەواتە، واتە، ئەوەتە ... لە ئێستا، کەواتا، واتا، ئەوەتا ... باشترن. بەڵام، دەتوانین، « واتە » لە بری « یعنی » و « واتا »لە بری «مەعنای » عەرەبیی دانێین. گوشار لە فشار جوانترە. لێکۆڵەر لە لێکۆڵەرەوە، توێژەر لە توێژەرەوە و شیکار لە شیکەرەوە ڕاستر و باشترن. قەفقاز لە قەفقاس و قۆقاز ڕاسترە. تسار لە تزار و تەزار و قەیسەر ڕاسترە. لە بری « گیروگرف، تەنگوچەڵەمە و بارودۆخ » بنووسین « گرفت، چەڵەمە و بار »
نووسەران دەبێ، جیاوازیی لە نێوان « دا » بۆ شوێن و « دا »ی کرداردا بکەن. یەکەمیان لە نووسیندا، هەمیشە بە ووشەکانەوە دەلکێنرێن، بەڵام گەر ناو بوو، لە نێوان دوو کەوانەدا دانرابوو، ئەوا لە دەرەوەی کەوانەکە دادەنرێ. وەک: لە سولەیمانییدا، لە کوردستاندا، لە ئەورووپادا و ... لە «سولەیمانیی »دا، لە « کوردستان »دا، لە « ئەورووپا »دا ... بۆ کردار

پێکەوە نانووسێنرێن، گەر لە یەکدی دابڕابوون، وەک :
ئازاد هەوڵێکی زۆری دا.
نامەکەم دا بە ئاران.
کامەران لە کاوەی دا.
ئەمە بۆ کورد دەس نادا.
دەشتوانین، گەلێ جار، پاشگری « دا » پشگوێخەین و نەینووسین.
هێندێ لە نووسەرانی کورد، چەن ووشەیەک بە جۆرێکی تایبەتیی دەنووسن، وەک ئەوەی باوەڕیان بە گۆڕانی زمان نەبێ، یا دژی کورتکردنەوەی ووشەی کوردیی بن. بۆ نموونە: (ڕۆژانەش، ئەوڕۆش، ئەم مانگەش، ئەمەش، ئەمانەش، ئەوەش، ئەوانەش، مەزنەش، ساختەش، لاپەڕەکەش، هەرواش، ...) بەم شێوەیە دەنوسن: (ڕۆژانەیش، ئەوڕۆیش، ئەم مانگەیش، ئەمەیش، ئەمانەیش، ئەوەیش، ئەوانەیش، مەزنەیش، ساختەیش، لاپەڕەکەیش، هەروایش ...). هەر چەندە، ئەم شێوە نووسینە، لە ڕووی ڕێزمانەوە بە ڕاست دادەنرێ. بەڵام، باشتروایە، کورتکرێنەوە و بە جۆری یەکەم بنووسرێن. یا هێندێ نووسەر « ڕەچەڵەک »بە « ڕێچەڵەک » دەنووسن. ئەمەشیان هەر وەک باسەکەی پێشوو وایە.
وردکردنەوە و گەردان، بوون و هەبوون، ئیمپراتۆریا و ئیمپراتۆریەت. ووشەکانی جۆری یەکەم، لە جۆری دووەم باشتر و ئاسانترن.
زۆر بە باشی دەزانم، لە بری « عیادە »ی پزیشکی عەرەبیی، ووشەی «کلینیک »ی لاتینی دابنرێ.
لە بری زاراوەی « السیاسە »ی عەرەبیی، « ڕامیاریی » یا « پۆلیتیک »ی لاتینی لە زمانی کوردییدا بچەسپێنین. وا بزانم، یەکەم جار، زاراوەی «ڕامیاریی » لە لایەن « داماوی موکریانیی »یەوە بەکارهێنراوە. ئەو کاتە، ناوی بکەر بە « ڕامیار » یا « پۆلیتیکار » دەبرێ.
لە زمانی کوردییدا، هێندێ ووشە هەن، لە گوتندا وەک گیرین وان. لەبەرئەوەی، لە کوردییدا شەدەی عەرەبییمان نییە، لە بری ئەوە، بە دوو پیت دەیاننووسین. بۆ نموونە: « گوللە، کوللە، گللەیی، کەللا، هەللا، سەللا ـ وەک ئەوەی دەڵێ لە سەللاوە هات. لە هێندێ جار ڕۆڵەکانی

کورد، جیاوازیی لە نێوان « ئاوارە، دەربەدەر، پەنابەر و نامۆ »دا ناکەن. بۆ نموونە: « محەمەدی مەلا کەریم »، لە بری ئاوارەی کوردیی، ووشەی «غەریب »ی عەرەبیی داناوە، ئەمە گوایە، بۆ خوێنەری ڕووندەکاتەوە، نەبا، لە « ئاوارە »ی کوردیی نەگەن، بە هەڵە عەرەبییەکەیان بۆ دەنووسێ، کە لە ڕاستیدا « غەریب » ئاوارە ناگەیەنێ، بەڵکوو « نامۆ » دەگرێتەوە. «77،43»
سێ ووشە هەن، پێویستە، جیاوازیی لە نێوانیاندا بکەین. چونکە، سێ زاراوەی جیاوازن و هەر یەکەیان بۆ مەبەستێکی تایبەتیی بەکاردێن. ئەوانیش : « بەند، بەندە و کۆیلە »ن.
بەند: گیراو دەگەیەنێ. کەسێ لە گرتووخانەدا لە لایەن لایەکەوە گیرابێ. بەندیخانە یا گرتووخانە. بەند لە بەندەوە نزیکە. بەندە ـ دوو واتای هەیە : یەکەم: زاراوەیەکی کۆمەڵگەی جووتیاریی ـ دەرەبەگییە. بۆ خۆ پچووک پیشاندان لە ئاستی « ئاغا، بەگ، خان و شێخ »ەکاندا بەکاریانهێناوە. وەک بە ڕێزەوە قسەیان لەگەڵ دەکەن و دەڵێن: قوربان، بەندە ئامادەی هەموو شتێکم. لێرەدا مەبەس لەوە نییە، بەندە بە واتای کۆیلە بەکارهاتبێ. هێندێ جاری دیکەش، لە گفتوگۆی ئاسایی نێوان دوو کەسی ناسیاو یا نەناسیاویشدا دەگوترێ. بەندە گوتم: مەبەسی خۆیەتی، واتە: من گوتم. بەندە نەیهێشت ئەو کارە بکەن. لەوانەیە، بۆ پیاوی دەرەبەگەکانیش بەکاربێ. بەندە واتا کۆمەڵایەتییەکەی کۆیلە ناگەیەنێ، چونکە یەکێ پیاوی خەڵک بێ، مەرج نییە، هەموو جۆرە ئازادییەکی خۆی ونکا. بەڵام، کۆیلە هیچ جۆرە ئازادییەکی نییە، بە پیسترین شێوە دەچەوسێنرێتەوە. بەندە بۆی هەیە، واز لەو بار و دەرەبەگە بێنێ و بارکا و بڕوا. بەڵام کۆیلە، مەگەر یەکێ بیکڕێ، یا خاوەنەکەی ئازادیکا، یا مەرگ ڕزگاریکا! زاراوەی کۆیلە:نە بەند و نە بەندە ناگرێتەوە. بەڵکوو «عەبد »ی عەرەبیی دەگەیەنێ.
دووەمیان: واتا ئایینییەکەی دێ. لە نێو موسوڵمانە کوردەکاندا باوە، دەڵێن : ئێمە هەموو بەندەی خواین. لێرەدا مەبەسیان « عەبد »ە.

## 15/ دەزگـەی کەلتووریی و ئەکادیمیی :

لە سەرانسـەری کوردستانی مەزندا، تەنانەت، لە نێو کوردە پەنابەرەکانی دەرەوەشدا، یەک یەکـێتیی یەکگرتووی نووسـەرانی کـورد، یا دەزگـەیەکی کـەلتوریی و ئەکـادیمیی یەکگرتوومـان نـییـە. تا لە لایەکەوە، نووسـەران و ڕووناکبیران، ئەرکە« وێژەیی، کەلتووریی، زمانەوانیی و ئەکادیمییەکانی » سەرشانی خۆیان، وەک پێویست بەجێبێنن. لەلایەکی دیکەشەوە، توانایەکی ئابووریی هەبێ، یارمەتیی نووسەران و ئەکادیمییەکانی کورد بدا، پرۆژەکانی خۆیانی پێ جێبەجێکەن.

هەر چەندە، کێشەی ئابووریی، بە گەورەترین چەڵەمەی ئەورۆی نووسەران و ئەکادیمییەکانی کورد دادەنرێ. ئەو کێشەیە، بە شێوەیەک کاری لە نووسەران کـردووە، بە ئاســانیی ناتوانن، ڕاژەی « زمــان، وێژە و فــەرهەنـگ »ی نەتەوەکـەی خـۆیان بکەن، بەرهەمـەکـانیـان چاپکەن و بڵاوکـەنەوە. جگە لەوەی، بازاڕی چاپەمـەنی کـوردییش، هێندە دڵخـۆشکەر نـییـە، بەرهەمی نووسـەرانی، بە ئاسـانیی تێـدا سـاغـبـێـتـەوە و جـێی ئەو کـەمـوکـوڕییـە ئابوورییەیان بۆ بگرێتەوە.

یەکێ لە گرفتـەکـانی زمـانی کـوردیی ئەوەیە، دەزگـەیەکی چاپەمـەنیی و بڵاوکـردنەوەی نەتەوەییـمـان نـییـە، تا بە شـێـوەیەکی ڕێکوپێک، هەمـوو کارەکانی چاپکردن و بڵاوکردنەوە، لە ئەستۆی خۆی گرێ. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، لە ڕێی خوێندەواریی بە کـوردیی، پەرسـەندنی زمـانی کـوردیی و پێشکەوتنندا، بە کۆسپێکی گەلێ گەورە دادەنرێ.

ئەورۆ، نەتەوەی کـورد، گەلێ « خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسـەر و کادێری ئەکادیمیی » باشی، لە بوارە جـۆربەجـۆرەکـانی « زمـان، وێژە و هونەری کوردیی »دا هەیە، بەڵام، لە لایەکەوە یەکگرتوو نین. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو دەزگە نەتەوەیی یە یەکگرتووەمان نییە، تا هەموو کارەکانیان ئاسانکا. چونکە، بە ڕاستیی لە توانای هیچ خوێندەوار و نووسەرێکدا نییە، بە تەنیا پاڵ، کارەکانی خۆی جێبەجێکا و بەرهەمەکانی بڵاوکاتەوە. جگە لەوەی، کاری بە کۆمەڵ، گەلێ لە کاری تەنیایی و هەر کەس بۆ خۆی باشتـر، بە بەرهەمتر و ڕێکوپێکترە.

## 16/ فاکتەری ســـــایکۆلۆژیی :

گرێوگۆڵە سایکۆلۆژییەکانی، نێو دەروونی نووسەران و ئەکادیمییەکانی کوردیش، خۆی لە خۆیدا، بە چەڵەمەیەکی گەورە و گران دەژمێررێ. ئەو نەخۆشییە دەروونییانە، بە شێوەیە کاری تێکردوون، کەم نووسەر و زانای کورد دەتوانن، تا سەر پێکەوە هەڵکەن، کاری هاوبەش بە ئەنجامگەیەنن و بە کۆمەڵ ڕاژەیەکی زمانەکەمان بکەن. هەر چەن « نووسەر، ڕووناکبیر و زانایەک » ، قۆڵ بە قۆڵی یەکدا دەکەن، ئیدی خۆیان بە شاسواری گۆڕەپانی « وێژە، زمان و زانست » دەزانن. ڕێز بۆ « بەهرە، توانا و دەسڕەنگینیی» ، هاوڕێ نووسەرەکانی دیکەی خۆیان دانانێن. ئەمەش، کارێکی گەلێ نێگێتیڤانە و زامێکی وا قووڵی، لە هەست، هۆش و بیری هونەرمەندان و نووسەرانی کورد کردووە، تەنانەت ناتوانن، پێکەوە لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی « هونەریی، وێژەیی و ئەکادیمیی» یەککگرتوودا کۆبنەوە. لەبەرئەوە، چەندین ڕێکخراوی جۆراوجۆری، کالوکرچ و لاوازیان دامەزراندووە، بە شێوەیە ڕیزەکانی نووسەران و ئەکادیمییەکانی کوردیان لەتوپەتکردووە، وایان لێهاتووە، هەر چەن کەسێکیان پێکەوە ناگونجێن. لێرەدا دەمەوێ، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: زۆربەی زۆری ئەو پێکەوە نەگونجاندنانەش، هیچ جۆرە پێوەندییەکی بە شێوەی « نووسین، کاری هونەریی و تێڕوانینی فەلسەفیی »ەوە نییە. بەڵکوو، پتر بۆ ئیرەیی و ڕکوکینەی تایبەتیی تاکە کەسیی، نێوان نووسەرەکان خۆیان دەگەڕێتەوە. تەنانەت، گەلێ جار، لە هێندێ نووسەرم بیستووە، گوتوویانە: هونەرمەندان، نووسەران و زانایانی کورد، دوودوو سێسێ پێکەوە دەگونجێن و دەتوانن، پێکەوە کارکەن، بەڵام، لەوە تێپەڕکا، زۆر پێکەوە نالکێن و ناگونجێن.

## 17/ ڕۆڵی ڕێکخراوە کوردستانییەکان :

لای هەمووان ئاشکرایە، ئەو ڕێکخراوە « پیشەیی، دیمۆکراسیی و پارتە ڕامیارییانەی کوردستان » ، چ ڕۆڵێکی نێگێتیڤ، لە دواکەتن و کەرتکەرتکردنی « زمان، هونەر، وێژەی کوردیی، ڕیزەکانی یەکێتیی نووسەران و هونەرمەندانی کورد »دا وازیدەکەن. هەر ڕێکخراوێ، بەگوێرەی

بیروبۆچوونی ساکاری خۆی، کاڵفامانە و ناشارەزایانە هەڵسوکەوتدەکا. بەپێی بەرژەوەندیی تەسک و تایبەتیی ڕێکخراوەکەی خۆی، هەنگاودەنێ و بەرنامەکانی دادەڕێژێ. هیچ لایەکیان، گوێ بە بەرژەوەندیی بەرزی نەتەوەکە نادەن. بۆیە، کردار و ڕەفتار، دید و بۆچوونی پارتە بە ناو کوردستانییەکان، بە تەواویی ڕیزەکانی نووسەران و ئەکادیمییەکانی کوردیان لەتویەتکردووە. زمانەکەشیان، بە ووشەی ناشیرین، نارەوا و بازاڕیی سیخناخکردووە.

جگە لەوەی، بە ڕێنووسێکی کۆنی تێکەڵاوی « کوردیی - عەرەبیی، کوردیی - فارسیی » دەنووسن. تەنانەت، ووشە کوردییەکانیشیان، لە نێوان خۆیاندا دابەشکردووە. بۆ نموونە: « پارتی دیمۆکراتی کوردستان » و « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، ناکۆکیی و جەنگە نێوخۆییەکەی نێوانیان، کارێکی وای کردووە، بە شێوەیەک ناوی ڕێکخراوە پیشەیی و جەماوەریی یەکانیشیان، وەک برا بەشکردووە. پارتی - « یەکێتی قوتابیانی کوردستان » و « یەکێتی ئافرەتانی کوردستان »ی هەیە. بەڵام، یەکێتی بۆ ئەوەی لە پارتی جیابێ، لەبری « قوتابیان - خوێندکاران » و لە بری « ئافرەتان - ژنان » بەکاردێنن. بە بڕوای من، لە ڕووی زمانەوە، هەر دوو زاراوەی « خوێندکار و ژن » لە « قوتابی و ئافرەت » کوردیتر، سەنگینتر، ڕەوانتر و شیرینترن.

## 18/ باکـــــــووری کوردستان :

کورد، وەک ئاردی نێو دڕکیی لێهاتووە، جگە لە کوردستانە بێ ئارام و وێرانەکەی خۆیان، بە هەموو دەوڵەتەکانی جیهاندا، بە تەواویی پەرشوبڵاوبوونەتەوە. بە هۆی ئەو گرفتانەی، لە زمان و کەلتووری کوردیشدا هەن، هێندەی دیکە لە یەکدی دوورکەوتوونەتەوە، دابڕاون و پچڕپچڕبوون. بۆیە، گەر کارێکی باشی بۆ نەکرێ، لەوە خراپتریشی بەسەردێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان و نەوەی دواڕۆژ سەریان لێ دەشێوێ. لە پاشەڕۆژدا، زۆر لە سەر خۆیان و زمانەکەمان دەکەوێ.

کوردەکانی باکوور و خۆراوای کوردستان، وەک گەلانی عەرەبیی « جەزایر، مەغریب و تونس »ی، سالی پەنجا و شەستەکان وان. دوای ئەوەی، ئەو

گەلانە، لە دەس ئیمپریالیزمی فەرەنسا ڕزگاریانبوو، بە هۆی مامۆستای زمانی عەرەبیی، دەوڵەتە عەرەبییەکانی دیکەوە، فێری زمانی عەرەبیی کران. چونکە، پێشتر زمانی نەتەوەیی خۆیانیان نەدەزانی.
سەرەتا منداڵەکانیان، لە خوێندنگەکاندا فێری زمان کرد. گەورەکانیشیان، لە سەر پرۆسێسی قەلاچۆکردنی نەخوێندەواریی و فێربوونی زمانی عەرەبیی ڕاهێنا. تا وایان لێهات، زۆربەیان فێری زمانی خوێندنەوە و نووسین بوون. بەڵام، تا ئەوڕۆش، شێوەی قسەکردن و دەربڕینیان، لەگەڵ شێوەی ناوچەکانی دیکەی، وولاتانی عەرەبدا هەر جیاوازیی هەیە. کەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئێستە زمانی فەرەنسیی، لەو سێ وولاتەدا، بە سەر زمانی قسەکردنی زۆربەی زۆری دانیشتواندا زاڵە. بەڵام، ئەوڕۆ لە زۆربەی ناوچە و بەشەکانی کوردستان، ئەو جۆرە « ئازادیی، توانا و دەسەڵات »ەمان نییە، تا ئەو کوردانەی، زمانی زکماکیی خۆیان نازانن، لە خوێندنگەکاندا فێریانکەین. لەبەرئەوە، ئەو خوێندنگە گەورەیە، ئەو مامۆستا دڵسۆز و بلیمەتە، بۆ هەموو کورد بە گشتیی و بۆ کوردەکانی باکوور و خۆراوا بە تایبەتیی، خۆی لە «MED TV »دا دەبینی. چونکە، زۆربەی زۆری کوردەکانی باکوور و خۆراوا، زمانی دایک بە باشی نازانن، لەبەرئەوەی پتر لە حەفتا ساڵە، داگیرکەری هەر دوو دەوڵەتی تورکیا و سووریا هەوڵدەدەن، ئەو زمانەیان لە بیربەرنەوە و بە تورکی چیایی و عەرەبی دەشتەکییان بناسێنن.
بۆیە، زۆر پێویستە، کورد هەوڵبدا، بە زووترین کات، تێلێڤیزیۆنێکی دیکە بکاتەوە، چونکە، تێلێفیزیۆنی نێونەتەوەیی، ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکیی، لە بڵاوکردنەوە و فێرکردنی زمانی کوردییدا دەبینێ. گەر، خۆشمان ئەم ڕاستییە نازانین، ئەوا مەترسی هەرە گەورەی تورکەکان و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستانیش، لە پێش هەموو شتێکدا، خۆی لەو تێلێڤیزیۆنەدا دەبینی. بۆیە، هەر لەو ڕۆژە کرایەوە، تورکەکان درێغییان نەکردووە، هەوڵێکی زۆریان دا، تا بە تەواویی بە داخستنیاندا.
گرفتی سەرەکیی، هەر ئەوە نییە، کوردەکانی باکوور، زمانی زکماکیی خۆیان نازانن، بەڵکوو، جگە لەوەی، دیالێکتەکان لە نێو خۆیاندا

جیاوازییان هەیە، ڕێنووسیش هێندەی دیکە، کارەکەی گرانکردووە. چونکە، گەر لە زۆربەی بەشەکانی کوردستان، بە پیتی عەرەبیی بنووسرێ، ئەوا لە باکووری کوردستان، بە پیتی لاتین دەنووسن. ئەم جیاوازیی دیالێکت و ئەلفوبێیە، کارێکی وای کردووە،(ئەگەر لە سێ بەشەکەی کوردستان « بە هەندەرانیشەوە » بەم ڕێنووسە شتێک بنووسرێ، ئەوا بەشە گەورەکەی باکوور لێی بێئاگایە! ئەوانیش هەرچیان هەیە، ئێمە لێی بێئاگاین! ئەم ڕەوتە شوومە زیاد لە نیو سەدەیە وەهایە. واتە زمانی کوردیی شەقارکراوە و دووفاقییە! « بەفر بۆتە بەرف » و « خاک بۆتە ئاخ » و ... تاد. ئەوەش بووترێ، کە پێش لە بە لاتینینووسین، گرفتی لێتێگەیشتن، هێندە ناحەز و زەق نەبوو! بە نووکەپێنووسێک، زاراوە و ووشەگران و نامۆکانی « کرمانجیی باکوور » بەرهەمەکانی « مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی، فەقێ تەیران و... تاد) ڕاڤەدەکرا و ئیدی تێگەیشتن لە بەرهەمەکە بۆ هەموو کوردێک بوو.)«8،5»
ئایا، چەن ڕووناکبیر و نووسەری، ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، ئاگایان لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە هەیە، کە بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو و بە پیتی لاتین دەردەچن؟ ئایا ناوەکانیان دەزانن؟ یا، ئایا ڕووناکبیر و نووسەرەکانی باکووری کوردستان، تا چەن ئاگایان لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە هەیە، کە بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوراووو و بە پیتی عەرەبیی بڵاودەکرێنەوە؟ جا ئیدی، باسی نامیلکە و پەرتووک، بە هەر دوو بەشەدیالێکتەکە هەر ناکەین! چونکە، زۆربەی نووسەرانی هەر دوو لا، لە بێ خەبەران، سڵاوات لە دیداری کەشکەک دەدەن! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، لە لایەکەوە هیچ لایەکمان، بە تەواویی ئاگامان لە یەکدی نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەر لایەکمان، ئاگامان لە چەندین کێشە و باسەکانی، ڕووناکبیرانی گەلانی جیاواز و بە زمانە جیاوازەکان هەیە، بەڵام، لە هەمان کاتدا، لە نیوەی کەرسەی ڕووناکبیریی کوردیی بێ ئاگاین، کە ئەوە لە یەک کاتدا، بە تراژیدیایەکی کۆمیدیایی دەژمێررێ! چونکە، کوردەکانی باکوور، گەر لە نیوەی ژمارەی هەموو کورد زۆرتر نەبن، بێگومان کەمتر نین! بۆیە پێویستە، کۆڕی زانیاریی کوردستان و شارەزایانی زمانی کوردیی،

بڕیارێکی بنەبڕیی بدەن، هەر هیچ نەبێ، لە سەر ئەم کێشە گرنگەی زمانی کوردیی ڕێککەون، تا یاسا و دەستوورێکی ڕێکوپێک و بڕاوە، بۆ زمانی کوردیی دانێن.

## 19/ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان :

داگیرکەرانی کوردستان، زۆر لە مێژە، هەستیان بە مەترسیی خوێندن و نووسین، بە زمانی نەتەوەیی و بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتین کردووە. بۆیە، هەر لە کۆنەوە، بە هەموو شێوەیەک و لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستانی گەورەدا، ئاخافتنیان بە زمانی کوردیی قەدەغەکردووە. لە خوێندنگەکاندا ڕێگە نادەن، بە کوردیی بخوێنرێ، دژایەتیی خوێندن و نووسین، بە زمانی نەتەوەیی دەکەن. بۆیە دەبێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد هەر لە منالییەوە، بە زمانی داگیرکەران بخوێنن و فێری ئەو زمانانەشبن.
دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بە شێوەیەکی بەردەوام و سیستێماتیک، لە بەر ڕووناکایی بەرنامەیەکی وانەکراو و دیاریکراودا، بەر بە دامەزراندنی « یەکێتیی نووسەران، دەزگە کەلتووریی و ئەکادیمیاکانی » دیکەی کورد دەگرن، تا گرنگیی بە زمان و کەلتووری کورد نەدەن و پێشی نەخەن.
ئەوە جگە لەوەی، نووسینی کوردیی بە پیتی لاتین، لە کوردستان بە گشتیی، لە ڕۆژهەڵات و باشووری مەزن و پچووک بە تایبەتیی، بە کارێکی ناڕەوا و قەدەغەکراو دادەنرێ. تەنانەت، هەر کەسێ بەکاریبێنێ، بە توندیی سزادەدرێ!
ئەورۆ باری ئازادیی کورد وایە، جگە لە چەن ناوچەیەکی دیاریکراوی باشووری کوردستان، ئازادیی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی، لە هیچ پارچەیەکی کوردستانی مەزندا نییە. داگیرکەران ماوەی ئەوە نادەن، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە ئاشکرا، بە زمانی نەتەوەیی خۆیان، ڕۆژنامە و گۆڤارەکان دەرکەن. نامیلکە و پەرتووکەکان بە کوردیی چاپکەن. وێزگە و تێلێڤیزیۆنی تایبەتیی کوردییمان هەبێ، بەڵکوو، زۆربەی نووسین و بڵاوکراوەکان، بە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی » دەردەچن و بڵاودەبنەوە. لەبەرئەوە، لەم بوارانەدا گوشارێکی زۆریان لە سەر داناوین.

## 20/ باری پەنابـــــەران :

پەنابەران، پتر مەبەسەکەم منالان دەگرێتەوە. بە تایبەتیی، ئەو منالانەی دایک و باوکیان کوردن، ئەگینا ، ئەوانەی یەکێکیان کورد نییە، تازە دەبێ، دەسیان لێ بشۆین!

زۆربەی زۆری، منالانی کوردە پەنابەرەکانی دەرەوەی کوردستان، زۆر بە گرانیی زمانی دایک فێردەبن. بە زمانی کوردیی ناتوانن، بنووسن و بخوێننەوە. چونکە، لە سەرێکەوە تێکەلاویی، لە نێوان منال و خێزانە کوردەکاندا زۆر کەمە. منالان تەنیا لە مالەوە، بە کوردیی دەپەیڤن. لە سەرێکی دیکەشەوە، هەم هێندێ دایک و باوک هەن، زۆر منالەکانیان هان نادەن، فێری زمانی زکماکیی خۆیان بن. هەم خۆیان، زۆر بایەخ بە فێربوونی زمانی کوردیی نادەن. چونکە :یەکەم ـ هەست و هۆشی نەتەوەیی یان لاوازە. دووەمیش ـ زۆر پێویستیان بەو زمانە نییە، لەبەرئەوەی پێی ناخوێنن و کاروباری ژیانی رۆژانەی خۆیانی، پێ هەل ناسورێنن. هەر چەندە، تا ئەندازەیەکی باش، زمانی ئاخافتن دەزانن، بەلام، زۆر بە دەگمەن، منالێکی کورد دەبینی، خوێندن و نووسین، بە زمانی کوردیی بزانێ. لەگەل ئەوەشدا، لە زۆربەی ئەو دەولەتانەی کوردی تێدا دەژی، کاربەدەسان مامۆستای زمانی کوردیی بۆ داناون، لە خوێندنگەکاندا، زمانی کوردیی، وەک زمانی دایک دەخوێنن. بەلام، هەم مامۆستاکان ئەوە نین، خۆیان زۆر لەگەل خوێندکارە کوردەکان ماندووکەن، هەم هێشتا بایی ئەوەندە نییە، تا زمانی خوێندنەوە و نووسین فێربن! بۆیە، جگە لەوەی منالانی کورد، لە خوێندنگەکاندا زمانی دایک دەخوێنن، بە پێویستی دەزانم، کەسەکانیان هەولیان لەگەل بدەن، فێری خوێندن و نووسینیان کەن. هەروەها دەبێ، رێکخراوە «کەلتووریی، ئەکادیمیی، دیمۆکراسیی و رامیارییەکانی کورد» یش، بیرێ لەم گرفتە گەورەیە بکەنەوە، چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە. ئەویش بەوەی، چەن خولگەیە بە خۆرایی بۆ منالانی کورد بکەنەوە، هێندێ لە شارەزاکانی زمانی کوردیی، کاتێکی تایبەتییان بۆ دیاریکەن، تا لە پال هەولەکانی مال و خوێندنگەدا، وەک پالپشتێکی بە هێز، یارمەتی منالانی کورد بدەن.

# 15. چی بکەین باشـــە؟

گەر، واز لە ڕەخنە و ڕەخنەکاریی بێنین، وای دانێین و بڵێین: ئەوەی ڕۆی، ڕۆی و تازە لەدەسچوو و ناگەڕێتەوە. وەک دەشڵێن: مردوو بە شیوەن و گریان و ڕۆڕۆ زیندوو نابێتەوە. ئەدی چی بکەین، باشە؟
زانای تورک، د. « سمایل بێشکچی » دەڵێ: (ڕێگەگرتن لە پێشکەوتنی زمان، فەرهەنگ، وێژە و فۆلکلۆر، سەرکەوتووترین شێوەی کۆیلەکردنی میللەتە.) «41,56» کەواتە، ئێمەی کورد، بۆ ئەوەی لەوە زیاتر کۆیلە نەبین و لە دەس کۆیلەیی ڕزگارمانبێ، چی بکەین، باشە؟
گومانی تێدا نییە، گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، نەتەوەی کورد دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتووی ناسیۆنال، لە کوردستانی مەزندا دامەزرێنێ، یا لە یەکێ لە پارچەکانی کوردستان، ئەو ئاواتەی بەدیبێ، بە مەرجێ سەرکردایەتییەکی « نیشتمانپەروەر، دڵسۆز، زانا و شارەزا »، کاروباری فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکە بەڕێوەبەرێ، ئازادیی و دیمۆکراسیی بۆ کۆمەڵانی خەڵک دابینکرێ، ئەوا ئەو کاتە دەتوانرێ، هەموو گرفتەکانی « زمان، کەلتوور، هونەر و وێژە)ی کورد چارەسەرکرێ، کێشەی بەکارهێنانی پیتی عەرەبیی، یا لاتین، یا هەر دووکیان پێکەوە، بە تەواویی یەکلاییکرێتەوە. هەروەها دەتوانرێ، زمانێکی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوە دانرێ. چونکە، تەنیا دەسەڵاتی ڕامیاریی و ئابووریی دەوڵەت دەتوانێ، زۆربەی زۆری گرفتە نەتەوەیی یەکانی کورد چارەسەرکا. لەم بوارەدا دەتوانین، چەندین نموونەی زیندوو، پێش چاوی خوێنەوارانی گەلەکەمان خەین. بەڵام، لێرەدا تەنیا دوو نموونە، پەنجەڕمێردەکەین :
1 . لەو ڕۆژەوە، تورکەکان ئیمپراتۆریای عوسمانییان دامەزران، دەسیان بە سەر کاروباری خەلافەت و ئایینی ئیسلامدا گرت، زمانی تورکییان، بە سەر هەموو گەلانی ناوچە جیاجیاکانی ئیمپراتۆریاکەدا سەپاند. زمانی «دەوڵەت، خوێندن و نووسین » بوو بە تورکیی. بەڵام، خۆیان ئەلفوبێیەکی تایبەتییان نەبوو. بەڵکوو، دەورووبەری حەوسەد ساڵ، ئەلفوبێی عەرەبییان بەکارهێنا. دوای ئەوەی جەنگی دووەمی جیهان کۆتاییهات، هێزەکانی

هاوپەیمان سەرکەوتن و پێتەختی ئیمپراتۆریاکەیان داگیرکرد، لەشکری عوسمانیی تێکشکا و ئیمپراتۆریاکەش لە گرێژنەوە هەڵوەشا. پاشان، کۆماری نوێی تورکیا دامەزرا. دوای ئەوەی، کۆمارەکەش دامەزرا، ماوەیەکی زۆر، هەر ئەو ئەلفوبێیەیان بەکاردەهێنا. بەڵام، پاشان « کەمال ئەتاتورک » ، ئەو ئەلفوبێ عەرەبییەی قەدەغەکرد، لە «1928/4/29»دا بڕیاریدا، ئەلفوبێی لاتین، لە هەموو کاروبارەکانی نووسین و خوێندنەوە، لە کۆماری تورکیای نوێدا بەکاربێنرێ. « مستەفا کەمال » لە ماوەیەکی کورتدا توانی، بە زۆر ئەو ئەلفوبێ نوێیە بە سەر هەموو ناوچەکانی تورکیادا بسەپێنێ. گەر، بە هۆی هێزی لە بن نەهاتووی دەوڵەت و توانای ئابوورییەوە نەبووایە، لەو باوەڕەدام، هەرگیز ئەو کارە سەری نەدەگرت. هەرچەندە، هێندێ کەس پێیانوایە، « ئەتا تورک » بەو کارەی، گەورەترین زیانی لە زمانی تورکیی داوە. لەو بارەیەوە هۆنەری کورد « شێرکۆ بێکەس» چەن تێبینییەکی تایبەتیی بۆ نووسیوم و دەڵێ:(یەکێ لەو کارە هەرە خراپانەی « ئەتا تورک »کردی، گۆڕینی تیپی عەرەبیی بوو بە لاتینیی. ئەمە لە ڕووکەشدا، گوایە وەرچەرخانێکی شارستانیی بوو بەرەو سەردەمی تازەی ئەوروپا. بەڵام، لە جەوهەردا « بڕبڕەی پشتی کەلتووری تورکیی شکاند » چونکە نەوەی تازە و کۆنی لە یەکدی دابڕی و گەورەترین پەرتووکخانەی ڕووناکبیریی تورکی دەرخواردی مشک دا. لەگەڵ ئەوەشدا، کە خاوەنی دەوڵەت و دەسەڵات بوون، نەشیانتوانی، لە سەدا پێنجی ئەو کەلتوورەش بگۆڕنە سەر پیتی لاتینیی!)

2. هەروەها ، پێش ئەوەی دەوڵەتی ئیسرایل، لە ناوچەی خورهەڵاتی ناوەندا، وەک قارچک و دومەڵان هەڵتۆقێ، زمانی « عیبریی » ، تەنیا زمانی ئایین بوو. لە لایەن حاخام و پیاوە ئایینییەکانی دیکەی جووەکانەوە بەکاردێنرا. هەر لە دووتوێی پەرتووکە ئایینییەکانیشدا، قەتیسمابوو. بەڵام، دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسرایل دامەزرا، ئیدی وردەوردە، زمانەکە پایەخێکی زۆری پەیداکرد. لە خوێندنگەکاندا، وەک زمانی خوێندن، بڕیاری لەسەر درا. لە بەڕێوەبەرێتییەکاندا، وەک زمانی دەوڵەت ناسرا و کاروبارەکانی ڕۆژانەی پێ ڕاپەڕێنرا. لە کنێشتە و جێگە ئایینییەکانیشدا،

وەک زمانی ئایین پەیڕەوکرا. لە هەموو جێگە گشتییی، لە سەر تابلۆی «بەڕێوەبەرێتی، خوێندنگە، زانسگە، کارگە، دوکان و بازاڕەکان، لە سەر نیشانەی ڕێگە و شەقامەکان »یش، هەموو ناو و نیشانەکانی پێ نووسرا. تا وای لێهات، وەک زمانێکی نەتەوەیی، جێگەی خۆی گرت. هەموو جوویەک، لە هەر کونوقوژبنێکی ئەم جیهانەوە، لە ئیسرایل کۆکرابێتەوە، فێری ئەو زمانە کران. ئێستەش، بە ئاسانیی قسەی پێ دەکەن، پێی دەخوێندنەوە و پێشی دەنووسن. واتە: زمانی عیبریی، بە هۆی دەسەلاتی دەولەتەوە، لە زمانی ئایینەوە، بۆ زمانی گەلی ئیسرایل گۆڕا و بناغەیەکی پتەوی پەیداکرد. بەو شێوەیە جووەکان، کە هەر خێزانەی سەر بە نەتەوەیەکی جیاوازبوون، زمانێکی یەکگرتووی ئایینیی ـ نەتەوەیی یان بۆ خۆیان پێکهێنا. بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، دەولەت چ ڕۆڵێکی گرنگ و مەزن، لە « بلاوبوونەوە، گەشەسەندن و پێشکەوتنی زمان »دا وازیدەکا.
هەروەها، لە کوردستانیشدا، لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژووی جولانەوەی کورددا، چەن تاقیکردنەوەیەکی پڕ بە پیت، بە کەلک و تایبەتیمان، لەو بوارەدا هەیە. بە تایبەتیی لە ماوەی ئەم حەفتا ساڵەی دواییدا، لە باشوور و ڕۆژهەلاتی کوردستان، چەن فەرمانڕەواییەکی نێوخۆیی دامەزراون، وەک:
1. دوای ئەوەی، جەنگی یەکەمی جیهان کۆتاییهات، هەلێ بۆ کورد هەلکەوت. لە باشووری کوردستان، « شێخ مەحموودی بەرزنجیی »، دوو جار حوکومەتی دامەزران: یەکەمیان لە «2/نۆڤەمبەر/1918» و دووەمیشیان لە «10 /ئۆکتۆبەر/1922»دا بوو.
2. دوای جەنگی دووەمی جیهان، کۆماری کوردستان لە مهاباد، ساڵی «1946 ـ 1947» دامەزرا.
3. ڕێککەوتننامەی «11 /مارس/1970» لە باشووری کوردستان، لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و دەولەتی بەعسدا مۆرکرا.
4. ڕاپەڕینە مەزنە جەماوەرییەکەی، بەهاری «1991»ی کۆمەلانی خەلک لە باشووری کوردستان ڕویدا. پاشان، پەرلەمان هەلبژێررا، میریی هەرێم دامەزرا. لە ساڵی « 1992 »وەوە تا ئەوڕۆ «1999»ش بەردەوامە.
دوای ئەو هەموو ڕووداو، سەرکەوتنە ڕامیاریی و نەتەوەیی یە گرنگانە،

هەموو جارێ، لە و دوو بەشەی کوردستاندا، زمانی کوردیی لە هەموو ڕوویەکەوە بوژاوەوتەوە، پتر گەشەیکردووە، وەک زمانێکی دانپێانراو، لە کاروباری بەڕێوەبردنی دەولەتدا ناسراوە. منالانی کورد لە خوێندنگەکاندا، بە زمانی زکماکیی خۆیان خوێندوویانە. « ڕۆژنامە، گۆڤار، بلاوکراوە، نامیلکە و پەرتووک » هەر بە کوردیی دەرچوون. بەلام، دوای ئەوەی هەموو ئەو هەلانە لەکیسدراون، تاقیکردنەوەکان تێکشێنراون، وردەوردە، ڕەوشی « زمان، فەرهەنگ، هونەر و وێژەی کوردیی »، بەرەو خراپی ڕۆییوە، بە تایبەتیی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، هەموو ئەو دەسکەوتە نەتەوەیی یانەی، کورد بەدەسیهێنابوو، هەر لەگەلێ کۆمارەکە جوانەمەرگبوو، هەر زوو هەمووی زیندەبەچالکران.
بەلام، لە باکوور و باشووری پچووک، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا ئەورۆ، هیچ جۆرە دەسەلاتێکی کوردیی دروس نەبووە. لەبەرئەوە، زمانی کوردیی، بە هەموو شێوەیە قەدەغەکراوە. هەرگیز خوێندن و نووسین بەکوردیی نەبووە. بۆیە، بەو شێوەیە دواکەوتووە. تەنانەت، زۆربەی زۆری کوردەکانی باکوور نازانن، بە زمانی دایک بپەیڤن.
پێش هەموو شتێ دەبێ، ئەوە بزانین، لە کوردستان گەلێ گرفتی نەتەوەیی گەورەمان هەیە. ئازادیی و سەربەخۆییمان نییە. لەبەر ئەوە ناتوانین، ئەو بەرنامانەی هەمانە، وەک پێویست جێبەجێیانکەین. پێویستە، باری نەتەوەیی و ڕامیاریی نەتەوەکەمان ڕەچاوکەین، بەگوێرەی ئەو بارە هەنگاوبنێین. بەلام، ئێمەی پەنابەرانی کورد، لە دەرەوەی کوردستان دەژین، بارێکی جیاوازمان هەیە، هەلێکی زێڕینی مێژوویمان بۆ هەلکەوتووە. لە سایەی ئەو ئازادیی و دیمۆکراسییەی لەم وولاتانەدا هەیە، دەتوانین، گەلێ کاری مەزن و ڕێکوپێکی ئەکادیمییانە بە ئەنجامکەینین، بە تایبەتیی چەندین کادێری ئەکادیمیی، لە بوارە جیاوازەکانی « هونەر، وێژە، زمان و زانست »دا، لەم وولاتانە کۆبوونەتەوە. گەر هەر یەکەیان، کەمێ لێبوردنیان هەبێ، لە کاتی بە نرخی خۆیان بگێڕنەوە، دەسی برایەتیی و هاوکاریی، لە ئێو دەسی یەکدی نێن، دەتوانن، گەلێ قازانج بە زمانی کوردیی بگەیەنن. لەو ڕێگەیانەشەوە، کار لە دید و بۆچوونەکانی نووسەرانی کورد، لە

کوردستان بکەن و ڕاژەیەکی باش پێشکەش بە نەتەوەکەیان بکەن.
هەموو گەلانی سەر ڕووی زەویی، بێ جیاوازیی دەتوانن، کەڵک لە زمانی لاتین وەرگرن، ئەو ووشانەی هەر لە بنەڕەتدا، لە زمانە نەتەوەیی یەکەی خۆیاندا چنگ ناکەون، یا« پێشکەوتنی زانست، گۆڕانکاریی یە نوێکانی سەردەم و داهێنانە تەکنۆلۆژیاکان » دەیسەپێنێن، زۆر بە ئاسانیی دەتوانرێ، زاراوەی لێ وەرگیرێ، ووشەی نوێی لێ دروسکرێ، بە مەرجێ، لەگەڵ تایبەتمەندێتی ئەو زمانەدا بگونجێ. چونکە،(لە ڕووی دەربڕینیشەوە زاراوەکانی لە سەر زمان سووکتر و ڕەوانترن.)«81،93»
لە سەرەتادا، « پیرەمێرد » هەوڵیدا، لە نووسینی کوردییدا، پیتی لاتین بەکاربێنێ. چونکە، لەو سەردەمەدا، نووسین بە لاتین، نیشانەی پێشکەوتنبوو. بۆ ئەم مەبەسە، هێندێ پیتی لاتینی پەیداکرد، لە ڕۆژنامەکەیدا و بە پیتی لاتین دەینووسی، بە ئومێدی ئەوەی، خوێنەواران لایان باشبێ و پێڕەویکەن. دوای ئەوەی دەسەڵاتی عوسمانییەکان نەما، تورکە کەمالییەکان دەسەڵاتیان وەرگرت، وازیان لە پیتی عەرەبیی هێنا و پیتی لاتینیان بەکارهێنا. ئەم هەنگاوەی تورکەکان، کاری لە «پیرەمێرد»یش کرد، بۆ ئەوەی خۆی لە داوی پیتی عەرەبیی ڕزگارکا. ئەم هەوڵەدانەش بۆ خۆ ڕزگارکردن، لە دەس پیتی بیانیی، بە کارێکی باش دەژمێرا. بەڵام، هەر وەک « بەدرخانیی »ەکان، لە هەوڵدانەکەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، هەرەوها، « پیرەمێرد »یش نەیتوانی، تا سەر لەگەڵی بەردەوامبێ.
هەر چەندە، هەر دوو پیتەکە لە بنەڕەتدا « عەرەبیی و لاتین »، هیچیان کوردیی نین. بەڵام، ئەز لەو باوەڕەدام، ئەلفوبێی لاتین بۆ زمانی کوردیی، گەلێ لە ئەلفوبێی عەرەبیی باشترە، چونکە :
1. هەموو دەنگەکانی زمانی کوردیی، بە پیتی عەرەبیی دەرنابڕێ، بەڵام بە پیتی لاتین، بە ئاسانیی دەردەکەوێ. چونکە،(زۆر ووشەی دەنگدار هەیە، بە پیتی لاتینی زۆر باشتر ئەنووسرێ وە بە ئاسانیی هەموو دەنگەکان دەرئەبڕێ)«36،44» بۆ نموونە: هێندێ دەنگی کورتی وەک « i » هەیە، بە پیتی عەرەبیی وێنەی نییە.(وەک دەنگی نێوان « ک » و « ز »

لە ووشەی کز/k - z/دا، دەنگی نێوان « م » و « ن » لە ووشەی من/ min/دا و دەنگی « پ » و « ر » لە ووشەی پڕ/ pir/دا...) «7،90»
2. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ و تێبینیکراوە، لە پیتە عەرەبییەکاندا، گرفتی جیاوازیی نێوان پیت و دەنگ هەیە. چونکە، هێندێ پیتی عەرەبیی بە یەک دەنگ دەر نابڕێ. بەڵام، هەموو پیتە لاتینییەکان، تەنیا یەک دەنگیان هەیە، بە یەک دەنگ دەردەبڕێن. واتە: ژمارەی پیت و دەنگ یەکدەگرن. (ئەلفوبێی کوردیی بە پیتی لاتین، ئەلفوبێیەکی دەنگدارە، هەر پیتێ لە پیتەکانی تاکە یەک دەنگی هەیە، ناتوانرێ، بۆ پیتێ یا دەنگێکی بگۆڕرێ. ... هەموو ووشەکانیش چۆن دەنووسرێن، هەر بەو شێوەیەش دەگوترێن، بێ ئەوەی گومانیان لێ بکەین، لە خوێندنەوەدا پێویستە، هەموو پیتە نووسراوەکان بخوێنرێتەوە.) «19،18» بەڵام، (تەنیا پیتی « i » لەم یاسایە بەدەرە.) «28،18»
3. پیتی لاتین، بە هەموو زمانەکانی جیهان دەخوێنرێتەوە. بە پێچەوانەوە، پیتی عەرەبیی تەنیا لای عەرەبزمانەکان و هێندێ لە گەلانی موسوڵمان دەناسرێ. لێرەدا، مەبەسمان ئەوە نییە، کاتێ، هێندێ خەڵکی « ئەورووپا، ئەمێریکا » و وولاتانی دیکە دێنە کوردستان، ئەو پیتە لاتینییانە دەخوێننەوە، لە زمانەکەش تێبگەن. نەخێر، بەڵکوو، هێندێ شتی گشتیی هەیە، وەک ناوی « شەقام، تابلۆی سەر دوکان و بازاڕەکان، سینەما، نەخۆشخانە، خوێندنگە و شوێنە گشتییەکان »ی دیکە، گەر بە پیتی لاتین بنووسرێ، گەلێ چاکترە، وەک لەوەی بە پیتی عەرەبیی بنووسرێ. بۆ نموونە: کاتێ کوردێ ڕێی لە هەر وولاتێکی ئەورووپا دەکەوێ، دەتوانێ، ئەو ناوانە بە ئاسانیی بخوێنێتەوە، چونکە، لەگەڵ پیتەکانی زمانی ئینگلیزیدا، جۆرە ئاشنایەتییەکی هەیە. بەڵام، خۆ مەرج نییە، لەو زمانانە تێبگا!
4. فێربوونی نووسین بە ئەلفوبێی لاتین، گەلێ لە ئەلفوبێکانی دیکە ئاسانترە.
5. گەر حسێبی دیمۆکراسییش لەبەرچاوگرین، باسی زۆرینە و کەمینەش بکەین، هەوڵ بۆ چەسپاندنی ئەلفوبێیەکی یەککرتوو بدەین، ئەوا کوردەکانی باکوور و خۆراوای کوردستان، بەشی زۆری نەتەوەی کورد پێکدێنن و پیتی

لاتین بەکاردێنن. لێرەدا، مەبەس لەبەکارهێنانی پیتی لاتین، ئەوە نییە، بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو، وەک زمانی یەکگرتووی ویژەیی بەکاربێنرێ، بەڵکوو، تەنیا مەبەسمان لە ڕێنووسێکی یەکگرتووی کوردییە. ئەگینا، ئەو کوردانەی لە ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خواروو دەپەیڤن، دەنووسن و دەخوێننەوە، دەتوانن، هەر بەو بەشەدیالێکتە بنووسن و بخوێننەوە. بەڵام، لە بری پیتی عەرەبیی، پیتی لاتین بەکاربێنن.
لە هەمان کاتدا، ئەم ڕاستییانە ئەوە ناگەیەنن، بەکارهێنانی پیتی لاتین، کارێکی هێندە ئاسانبێ، یەکسەر واز لە یەکێ، لەو دوو پیتە بێنین و پێڕەوی ئەلفوبێیەکی یەکگرتوو بکەین. چونکە، بە هۆی « داگیرکردن، دابەشکردنی کوردستان و لێکدابڕانی نەتەوەی کورد »ەوە، پتر لە ماوەی سێ چارەکە سەدە دەبێ، کوردەکانی باشوور و خۆرهەڵات، پیتی عەرەبیی، کوردەکانی باکوور و خۆراواش پیتی لاتین بەکاردێنن. لەبەرئەوە، هەروا بە بڕیارێکی کتوپڕیی و لە ماوەیەکی کەمدا ناتوانرێ، بێ دەسەلاتی دەوڵەت و دەزگەیەکی ئابووریی بە هێز، ئەو کارە بەئەنجامگەیەنرێ. جگە لەوەی، گەر هەموو « پێویستییەکانی گۆڕان، باری خودیی و بابەتیی »ش لەباربوون، بێ گرفت هەموو بە یەک پیتی یەکگرتوو نووسیمان، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، ئیدی هیچ جۆرە گرفتێکی زمانەوانیمان بۆ دروس نابێ. بە پێچەوانەوە، چەڵەمەیەکی زۆرمان بۆ قووتدەبێتەوە. لەبەرئەوەی، گەر ئەوڕۆ هەر پیتێکیان بە تەنیا بەکاربێنین، هەر دوو نەوەی کۆن و نوێ، بە تەواویی لە یەکدی دادەبڕێن، هەموو ئەو نووسینانەی پێشووی، بە یەکێ لەو دوو پیتە نووسراون، لە لایەن نەوەی تازەوە زۆر بە گران دەخوێنرێنەوە.
بۆیە پێشنیازدەکەم :
1/ هەر چەندە، ئەلفوبێی «عەرەبیی ـ فارسییش » دەسکاریکراو(تا سەر بەکاری زمانی کوردیی نایەت، بەڵام، چارمان ناچارە، جارێ دەبێ، بەپێی دەسەلات، دەستورێکی ڕێکوپێکی بۆ دانێین و هەموو شتێک هەر بەو پێیە بنووسینەوە.)«93،26» بۆیە دەبێ، جارێ هەر دوو ئەلفوبێکە بەکاربێنرێ، تا لە پارچەیەکی کوردستان، دەسەلاتێکی ڕامیاریی و قەوارەیەکی

نەتەوەیی سەربەخۆ دادەمەزرێ، ئەو کاتە دەتوانرێ، بڕیارێکی تەواو لە سەر بەکارهێنانی یەکێکیان بدرێ.

2/ پێویستە هەوڵدەین، هەر لە ئێستەوە، خۆمان فێری خوێندنەوە و نووسینی ئەلفوبێی لاتین کەین. لە پێش هەموو کەسێکدا دەبێ، نووسەران و ڕووناکبیرانی نەتەوەکەمان، خۆیان فێرکەن و پاشان خەڵکی دیکەش فێرکەن.

3/ هەمووومان دەزانین، نزیکەی « 80 ـ 90 » ساڵێ دەبێ، لە باشووری کوردستان، زمانی کوردیی بەکاردێنرێ، « ڕۆژنامە، گۆڤار، نامیلکە و پەرتووک »ێکی زۆر، بە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارو و ئەلفوبێی عەرەبیی نووسراوە. نووسەرانی کورد پێویستە، ئەو نووسینانەی گرنگن و پێوەندییان بە « جوگرافیا، مێژوو، زمان و وێژەی کوردیی »ەوە هەیە، بە یەکێ لە دیالێکت و ئەلفوبێکان نووسراون، کەسانی شارەزا و دڵسۆز، قۆڵی ڕاژەکردنی مەردانەی لێ هەڵکەن، بە دیالێکت و ئەلفوبێیەکەی دیکە بیاننووسنەوە، تا هەموو کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان، کەڵک لە یەکدی وەرگرن.

4/ هەر نووسەرێ، لە مەودوا هەر بەرهەمێکی بڵاوکردەوە، بەگوێرەی توانا، پوختەیەکی نووسینەکەی خۆی، بە پیتەکەی دیکە بنووسێتەوە و بڵاویکاتەوە.

5/ خولی تایبەتیی، بۆ فێربوونی هەر دوو بەشەدیالێکتە سەرەکییەکەی زمانی کوردیی و هەر دوو ئەلفوبێکان بکرێتەوە، بە تایبەتییش بایەخ بە ئەلفوبێی لاتین بدرێ.

6/ هۆکانی ڕاگەیاندن، بایەخ بە دیالێکتەکانی زمانی کوردیی بدەن. گۆشەیەک لە قوژبنی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیاندا، بۆ فێربوونی لاتین تەرخانکەن.

7/ ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، بە تایبەتیی ئەو کوردانەی باکووری کوردستان، هەروەها، ئەو منالانەی لە دەرەوەی کوردستان گەورەدەبن، یا لەدایکدەبن و دەخوێنن، بە هەموو شێوەیە هاندرێن، خۆیان فێری زمانی دایک کەن و بە کوردیی بنووسن و بخوێننەوە.

8/ فەرهەنگێکی تایبەتیی «کوردیی ـ کوردیی»، بە هەر دوو بەشەدیالێکتە سەرەکییەکە و بە پیتی عەرەبیی و لاتین دانرێ.
9/ شارەزایانی گرامەری کوردیی لە دەرەوەی وولات، پەرە بە ڕێزمانەکەمان بدەن، لێکۆڵینەوە و باسی ئەکادیمیی، لە سەر بنووسن و بڵاوکەنەوە. ئەو کادێر و پسپۆڕە ئەکادیمیانەی، لە دەرەوەی وولات، بە یەکێ لە زمانە بیانییەکان، لە سەر کێشە و باسی زمانەوانیی خوێندوویانە، ماجستێر یا دوکتۆرایان تەواوکردووە، با کارنامەی دکتۆراکانیان، بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕن، تا ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیش، کەڵک لە دید و بۆچوونە زانستانەکانیان وەرگرن و بێبەش نەبن.
10/ سوود لە هەموو دیالێکت و خواردیالێکتە جیاجیاکانی زمانی کوردیی وەرگیرێ، ووشەی پاکی کوردییان لێوە بخوازرێ، لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاربێنرێن.
11/ شارەزایانی زمان دەتوانن، کەڵک لە پەرتووکە کوردییە ئایینییە کۆنەکانی وەک:« ئاڤێستا، سەرەنجام، جیلوە و مسحەفا ڕەش » وەرگرن.
12/ هەمووومان دەزانین، لە ساڵەکانی سیی و بەرەو ژوور، لە باشووری کوردستان بە تایبەتیی، گەر ووشەیەک بەرانبەرەکەی لە زمانی کوردییدا نەبووایە، شارەزایەک، زانایەکی کورد، چاکی چالاکی لێ دەکرد بەلادا و بە تەنیا باڵ، شانی دەدایەبەر و هێندێ زاراوەی دادەڕشت. بەڵام، ئەوڕۆ نەتەوەکەمان، لە هەموو پارچەکانی کوردستان بەگشتیی و لە باشووری کوردستان بە تایبەتیی، بارێکی جیاوازی هەیە وتا ڕادەیەک پێشکەوتووە. بۆیە دەبێ، دەزگەیەکی ئەکادیمیی تایبەتیی هەبێ، چونکە، هەوڵ و تێکۆشانی، تاکەتاکەی نووسەر و زانایانی کورد، هەر چەندە گرنگ و بە کەڵکیشبێ، هێشتا هەر بەقەدەر کاری بە کۆمەڵ و هاوکاریکردن، لە چوارچێوەی دەزگەیەکی ئەکادیمیی تایبەتییدا، پڕ بایەخ نییە، بە تەواویی جێگەی خۆی ناگرێ، ناتوانێ، بڕیاربدا، هەموو ئەو شتانەی دەشیلێ، وەک پێشنیازێ تەماشادەکرێ. بۆیە، گەر چەن دەزگەیەکی تایبەتیی وەک: ئەکادیمیای زمانەوان و یەکێتی نووسەران هەبێ، گەلێ باشترە، تا وەک پێویست، هەموو کارەکانی زمانەوانیی جێبەجێکا، بە تایبەتیی زاراوە

نوێکان دارێژێ. گەر ووشەیەکی تایبەتیمان لە زمانی کوردییدا نەبوو، ئەوا پێویستە، بە شێوەیەکی باش ووشەیەکی لە بەرانبەردا بۆ دارێژرێ. بەڵام، پێویستە، لە کاتی دارشتنی هەر زاراوەیەکدا، واتاکەی خۆی بە تەواویی بگەیەنێ و پڕبەپڕی خۆیبێ. یا کۆمیتەیەک، لە بوارە جیاوازەکانی زمانەوانییدا پێکبێنرێ، زاراوەی زانستانە بۆ ئەو ووشانەی لە زمانی کوردیدا نین، دابتاشن.

13/ ئێمە نەتەوەیەکی بندەسین، تەنانەت، نەتەوەکانی « فارس، عەرب و تورک »ەکانیش، بەو هەموو توانا، ئازادیی و دەوڵەتە ناسیۆنالانەی هەیانە، توانای ئەوەیان نییە، شتێکی نوێ داهێنین. بەڵکوو، هەموو شتەکان، تەنانەت ووشە و زاراوە نوێکانیش، هەر لە دەرەوە وەردەگرن. چونکە، ئەو نەتەوانە، لە ئاستی « ڕاپەڕینە ژیاریی و شارستانیی، پێشکەوتنە ئەکادیمیی و تەکنۆلۆژییەکان »دا نین، لە کاروانی زانست و تەکنۆلۆژیا دواکەوتوون. بۆیە، ئێمەی کوردیش دەبێ، کەڵک لەو پێشکەوتنە زمانەوانییانەی، گەلانی جیهان وەرگرین. ئەو ووشانەی تا ئێستە، لە زمانی کوردییدا نین و بەو زووانە توانای داتاشینییان نییە، لە لاتینییەوە وەرگیرێن. دەتوانین، بە دوو شێوە کەڵک لە زمانی لاتین وەرگرین :

1. دوای ئەوەی دەسکاریی ووشە لاتینییەکان دەکرێ، بە مەرجێ لەگەڵ خەسڵەت و دەنگەکانی زمانی کوردییدا بگونجێن، ووشەکان بەکاردێنرێن.

2. یا دەتوانین، زاراوە لاتینییەکان هەر وەک خۆی چۆن هەن، بەو شێوەیەش بەکاریبێنین. بەڵام، بە مەرجێ خۆیان چۆن نووسراون، هەر بە هەمان شێوەش بنووسرێنەوە، فۆنێتیکەکەی خۆیان تێک نەدرێ و دەسکاریی نەکرێ، وایان لێ بکرێ نەناسرێنەوە.

هەروەها دەبێ، ئەو زاراوانەش، لە زمانە سەرەکییەکانیانەوە وەرگیرێن، نەک لە زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی و تورکیی »ەوە بیانخوازین. چونکە، ئەوان بەگوێرەی پیت و دەنگی زمانەکانی خۆیان، ئەو زاراوانە بەکاردێنن، کە لەگەڵ پیت و فۆنێتیکی زمانی کوردیدا جیاوازییان هەیە. لێرەدا، نموونەیەک دێنینەوە: ئامێرەکانی « Television و Telefon » بە

هێندێ لە زمانە جیاوازەکانی جیهان، بەو شێوەیە دەنووسرێ. بەڵام، عەرەبەکان لەو زمانە جیهانیانەوە، ئەو دوو ووشەیەیان خواستووە و بەم جۆرە دەینووسن: « تلفیزیون، تلفون ». گەر، ئەم ووشە بیانییانە لە زمانی عەرەبییەوە بخوازین، دەبێ یەکەم، بە ڕێنووسی کوردیی و بە «تەلەفیزیۆن، تەلەفوون » بیانووسین. ئەم ڕێنووسەش هەڵەیە. بەڵکوو، ڕاستروایە، خۆیان لە زمانە ڕەسەنەکانیاندا، چۆن نووسراون، هەر بەو شێوەیەش بیانووسین. کەواتە، بە کوردیی بەم شێوەیە دەنووسرێن:« تیلێڤیزیۆن، تیلێفۆن ».

لە ڕاستیدا، باشتروایە، گەر ووشەیەکی لاتینیمان خواست، سەرەتا لە تەنیشت کوردییەکەیەوە، ناوەکەی بەپیتی لاتینیش بنووسین، تا خوێنەواران بزانن، لە کوێوە هاتووە، ووشە ڕەسەنەکە چۆن نووسراوە و دەنگەکەی چۆنە.

14/ دەبێ، بایەخێکی زۆر، بە هەر دوو بەشەدیالێکتە سەرەکییەکەی زمانی کوردیی « کرمانجیی سەروو، خواروو » بدرێ. لەبەرئەوەی، کوردەکانی باکووری کوردستان، بە دوو دیالێکتی جیاوازی وەک بەشی کرمانجیی ژووروو و زازایی دەدوێن. لە هەمان کاتیشدا، هەموویان بە پیتی لاتین دەنووسن، باشتروایە، هەوڵدەن، تەنیا یەکێ لەو دوو بەشەدیالێکتە، وەک زمانی نووسین بەکاربێنن، نەک بە « کرمانجیی ژووروو و زازاکیی »ش بنووسن. چونکە، ئەو کارە، هێندەی دیکە ڕیزەکانی گەلی کورد، لە باکووری کوردستان بە تایبەتیی و نەتەوەی کورد بە گشتیی، لەتوپەتدەکا. دیارە، بەپێی « ژمارەی دانیشتووان، دەوڵەمەندیی زمان و فەرهەنگ، دوور و نزیکیی لە دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردیی »ەوە بێ، بەشەدیالێکتی کرمانجیی ژووروو، لە دیالێکتی زازایی باشتر و لەبارترە. هەروەها، لە بەشەدیالێکتی کرمانجیی خوارووشەوە نزیکترە و بە هەر دووکیان یەک دیالێکت پێکدێنن.

لە کرمانجیی خوارووا پێویستە، بایەخێکی تەواو بە لقەدیالێکتی موکریی بدرێ. هەوڵدرێ، لە نووسیندا بەکاربێنرێ. چونکە، لقەدیالێکتی سولەیمانیی، کەمێ وشکوبرینگ و ڕەقوتەقە. زۆربەی زانایان لەو باوەڕەدان

و بەڵگە « ئەتنۆگرافیا ، جوگرافیا و فیلۆلۆژیاکانیش » ئەوەیان سەلماندووە، ئەو لقەدیالێکتە، لە هەموو لقەکانی دیکەی ناوچەکانی کوردستان، پاکتر، شیرینتر، ڕەوانتر، پێشکەوتووتر، دەوڵەمەندترە و لە زمانی ئاڤێستای زەردەشتیشەوە نزیکترە.
لە هەمان کاتیشدا، پێویست ناکا، لە بەکارهێنانی دیالێکتە جۆربەجۆرەکانی زمانی کوردیی بترسین. ئەو دیالێکتانە هەن و ڕیالیزمی باری ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواریی سەپاندوونی. لەبەرئەوە دەبێ، هەر ناوچەیەکی کوردستان، بەو دیالێکتەی خۆی بدوێ، گۆرانیی پێ بڵێ و پێشیخا. دیالێکتەکان پێویستە، بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردیی، کەڵک لە یەکدی وەرگرن. بەڵام، لە هەمان کاتدا، بە شێوەیەک بەکار نەهێنرێن، لە یەکدی دوورکەونەوە. بەڵکوو هەوڵدرێ، زمانێکی ئاخافتنی نزیکی هاوبەش، لە نێوان هەموو دیالێکتەکاندا، یا بەلانی کەمەوە، لە نێوان هەر دوو بەشەدیالێکتە سەرەکییەکەدا، کرمانجیی سەروو و خواروو، دروسکرێ وەک چۆن دەڵێن:« سورمانجیی » ، تا بەرەبەرە، ڕۆڵەکانی کورد، لە هەموو ناوچەکانی کوردستان، لە یەکدی دەگەن. ئەمەش پتر، لە ڕێگەی تێکەڵاوبوونەوە پێکدێ. بۆ نموونە: ئەو کوردانەی لە دەرەوەی کوردستان، بە تایبەتیی لە ئەورووپا دەژین، گەر لەگەڵ کوردەکانی باکوور و باشوور، بەراوردیانکەین، کە هێشتا لە کوردستان دەژین، چونکە، لە هەموو بەشەکانی کوردستانەوە هاتوون، لە ئەنجامی « یەکدی ناسین، تێکەڵابوون و کارکردن »دا، گەلێ ووشە لە یەکدییەوە فێربوون، تا ڕادەیەکی باشیش، لە یەکدی دەگەن. هەروەها، «ڕادیۆ، تێلێڤیزیۆن، فیلمی ڤیدیۆ و سینەما» ، کارێکی باش لە بەرەوپێشچوونی زمانەکەمان دەکەن و تێکەڵاوییەک لە نێوان دیالێکتە کوردییەکاندا پەیدادەکەن. بۆ نموونە: ئەو زمانە کوردییەی ڕادیۆی کوردیی لە ئەمێریکا » پێی دەدوێ، زۆربەی زۆری کورد تێیدەگا. ئەو کرمانجییەی «MED TV » بەکاریدێنا ، گەلێ باشبوو. گەر دا ئەخرایە، دەتوانرا، وردەوردە بەرەو باشتریش بروا، بە تایبەتیی دەزگەی سەتەلایتی کوردیی، بە هەموو کوردستان و جیهاندا، بەرنامەکانی خۆی پەخشدەکا و کارێکی زۆر لە کوردەکانی نێوەوە و دەرەوە دەکا.

لەگەڵ ئەوەشدا، پێویستە، زمانێکی هاوبەشی یەکگرتووی ستانداردی یەکگرتوومان هەبێ، جا چ بە پیتی لاتین، چ بە پیتی عەرەبیی بنووسرێ، ئەوەیان زۆر گرنگ نییە. چونکە، ئێستە ئێمە لێرەدا بڕیار نادەین. بەڵکوو دەبێ، دەزگـەیەکی ئەکـادیمیی کـوردیی، ئەو بڕیارە بدا و لە ڕێگەی دەسەڵاتێکی ڕامیارییەوە پیادەکرێ.

دەبێ، ئەوەش بزانین، هەر کورد ئەو گرفتە سەختەی زمانەوانیی نییە، بەڵکوو، هێندێ لە نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەمینەش، بە دەس هەمان گرفتی دیالێکتەوە، گیریانخواردووە. بۆ نموونە: نەتەوەی عەرەب، پتر لە بیست دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆیان هەیە، پەرتووکێکی پیرۆزی ئایینیی وەک قورئانیان هەیە، هەموویانی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە. کەچی، تا ئەوڕۆش لە ڕووی زمانی ئاخافتنەوە، گەورەترین گرفتیان هەیە، نەک هەر عەرەبێکی خۆراوا لە عەرەبێکی خۆرهەڵاتی وولاتێکی دیکەی عەرەب بە گران تێدەگا، بەڵکوو، لە نێو یەک دەوڵەتیشدا، چەن دیالێکت و بەشەدیالێکتیان هەیە و زۆر بە ئاسانیی لە یەکدی ناگەن.

15/ پێویستە، بایەخێکی زۆر بە وەرگێڕان بدرێ، زمان و وێژەی کوردیی، بە بەرهەمی « چاک، بەپێز، پێشکەوتووخواز و بە نرخ »دەوڵەمەندکرێ. جا چ لە کوردییەوە بۆ زمانەکانی دیکەی جیهان بێ، یا بە پێچەوانەوە بێ، بە کارێکی گەلێ پێویست و گرنگ دادەنرێ.

16/ بۆ ئەوەی، ئەم پێشنیازانە و گەلێ پێشنیازی دیکەی ڕووناکبیرانی کورد جێبەجێکرێن، بۆ ئەوەی ڕاژەی زمان و کەلتووری نەتەوەکەمان کەین، پێویستە، هەموو « نووسەران، شارەزایان و ئەکادیمییەکان »، لە چوارچێوەی دەزگەیەکی وێژەیی یا ئەکادیمیی نەتەوەییدا، خۆیان ڕێکخەن و کۆبنەوە. ئەگینا، بەو پەرشوبڵاویی و بێ توانایی ئابووریی یەوە، مەحاڵە هیچ کوردێ، بە تەنیا باڵ بتوانێ، ماڵێکی کوردیی دامەزرێنێ و هەنگاوێ بۆ پێشەوە بنرێ!

ئێمەی کورد، هەر چەندە زمانەکەمان، بەو شێوەیە دواکەوتوو و یەک نەگرتووە، بەڵام، زمانێکی دەوڵەمەندی وەک زمانی عەرەبیی، بەو هەموو توانا و ڕەوانبێژییەی خۆیەوە، هێشتا گەلێ گرفتی زمانەوانییان هەیە.

له(ماوەی پتر له1200 ساڵ پێش ئێستاوه تا ئیمڕۆ له سەر فەرهەنگ و «فقه » و ڕێزمان و هەموو بارێکیەوه دەریا دەریای کتێب دانراوه هێشتان ئەوەنده لێڵایی و گرفتی تێدا ماوەتەوه که نووسەرانی ئیمڕۆی عەرەبی، وەک « بەسریی و کوفیی »یەکانی کۆن، له میانی خۆیاندا نەتوانن ڕێک کەون له سەر گرتنه بەری تاکه ڕێگەیێک و باوەڕێکی یەک گرتوو له ڕێزمان به تایبەتی و له سەر جوملەی باسەکانی زمان به تێکڕایی.)«107،ی»
ئەوەتەی عەرەبەکان هەن. ئەوەتەی ڕاست و چەپی خۆیان ناسیوه، خاوەنی زمانی نەتەوەیی خۆیان بوون و ئەلفوبێیەکی تایبەتییان بەکارهێناوه. «1420» ساڵیشه ئیسلام پەیدابووه، به هۆی قورئانی پیرۆزیشەوه، زمانێکی یەکگرتووی خوێندنەوه و نووسینیان بۆ دروسبووه. ئەوڕۆش پتر له بیست دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان هەیه، کەچی تازه هۆنەری گەورەی به ناوبانگی میسریی « فاروق ئەلشوشه » هاواری لێ هەڵدەستێ، زەنگی خەتەر لێدەدا و دەڵێ:(بۆ ئەوەی، زمانەکەمان له داتەپین ڕزگارکەین، پێویسته، بەزووترین کات، کۆنگرەیەکی نەتەوەیی بگرین.)«124» ئەدی دەبێ، ئێمەی کوردی خاک داگیر و دابەشکراو و بێ دەوڵەتی ناسیۆنال، هانا بۆ کێ بەرین و چی بڵێین؟!!
گەر تا ئێسته، هیچ نووسەرێ نەیویستووه یا نەیتوانیوه، ئەو ڕاستییه جەرگبڕه بدرکێنێ، که خەریکه دوو زمانی یەکگرتووی نووسین، له کوردستان خۆی دەسەپێنێ، ئەوا من لێرەدا، زۆر بەڕاشکاویی دەڵێم: گەر، دەسەڵاتێکی کوردیی له کوردستان دا نەمەزرێ، چارەسەرێ بۆ ئەو هەموو گرفتانه نەدۆزرێتەوه، دیالێکتەکان به هەموو بەش و لقەکانیانەوه، له یەکدی نزیک نەکاتەوه، ئەو هەموو جۆره ڕێنووسه جیاوازانه ڕێک نەخا، باری داگیرکردن و چەوساندنەوەی نەتەوەیی کۆتایی پێ نەهێنرێ، کێشەی ئاموزریی به شێوەیەکی بنەبڕیی چارەسەر نەکا، ئەوا له پاشەڕۆژدا، دوو زمانی یەکگرتووی ستانداردی کوردیی، به دوو ڕێنووسی جیاواز سەرهەڵدەدا!. لەو ڕێیەشەوه دوور نییه، نەتەوەی کورد دوولەتبێ!
کۆتایی ئەم باسەم، به بیروڕای چەن نووسەرێکی عەرەب دێنم. ڕۆژی چوارشەممەی ڕێککەوتی« 24 /9/ 1997 »، له تێلیڤیزیۆنی «MBC »دا،

بەرنامەیەکی زیندووی « ئێوارەتان باش ئەی عەرەب » پێشکەشکرا. جگە لە « ئەشوە ئەلڕوەینی » بەرنامەکەی پێشکەشدەکرد، بینەرانیش بە تێلیفۆن بەشداریاندەکرد، دوو دوکتۆری شارەزای زمانی عەرەبیش، کۆڕەکەیان دەگێڕا. لە کۆڕەکەدا، بە درێژیی باسی زمانی عەرەبیی و گرفتەکانیان کرد. یەکێکیان لە سەر کێشەی بەکارهێنانی زمانی« عەرەبیی و فرەنسیی »، لە هەر سێ وولاتەکەی خۆراوای نیشتمانی عەرەب «جەزایر، مەغریب و تونس » گوتی: (گەلانی جیهان، ڕێزی ئەو گەلانە ناگرن، کە بە زمانی گەلێکی دیکە دەپەیڤن). هەر چەندە، لەوانەیە ئەمە ڕاستبێ، بەلام، بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، نەتەوەی عەرەب، چەن ڕێزی کورد دەگرن، کاتێ بە زمانی عەرەبیی قسەدەکەین و زمانەکەی خۆمان پشگوێدەخەین. جا ئەو کەسە کەسە، ئەلفێکی بەسە!

ستۆکهۆلم
1998/10/10
بەڕێزان دەستەی بەڕێوەبەرانی مانگنامەی « پەیام »
سلاوێکی گەرم
لە نامەی ڕۆژی « 1998/08/22 »دا، چەن تێبینییەکم بۆ نووسیبوون. یەکێ لەو تێبینییانە ئەوە بوو، نووسیبووم : نازانم، ئێوە کێن؟ ئێستەش هەر هەمان شت دووبارەدەکەمەوە. لەبەرئەوە ناتوانم، شارەزاییتان لە زمانی کوردییدا هەلسەنگێنم. بۆیە، ویژدانیشم ڕێگەم نادا، هەر لە خۆمەوە تفەنگ بە تاریکەشەوەوە بنێم. بەلام دەکرێ، لەبەر ڕۆشنایی نامەکەی پێشوومدا، کەمێ لە بۆچوونەکانتان بدوێم.
لەوە دەچێ، ئەمە نێرە بیدۆشەبێ، هەر چی من بیلێم و هەر چیتان بۆ بنووسم، بێ کەلکبێ. چونکە، لەو نامەیەی لە ژمارە دەی بەشی « پەیامی خوێنەران »دا بلاوتانکردبۆوە، چیم بۆ نووسیبوون، هەموویتان پشکوێخستووە. ئەگینا گەر وانەبێ، چۆن لەو نامە کورتەدا، کە سەدویازدە دێڕی « 4.5 »سانتیمەتری « پەیام » بوو، شەستوپێنج جار دەسکاریی ڕێنووسەکەیتان دەکرد؟!!
ئەز سەیرم لێدێ، ئێوە خۆتان بە دەستەی بەڕێوەبەری بلاوکراوەیەکی کوردیی دەزانن، لە وولاتێکی وەک ئینگلستاندا دەژین، کەچی گوێ بۆ پێشنیازەکانی خوێنەران ڕانادێرن! هەلبەتە، ئێوەش هەر هێندەی سەرانی ڕێکخراوە کوردستانییەکان، باوەڕتان بە دێمۆکراسیی هەیە، ڕێز لە دید و بۆچوونی خەلکی دەگرن، لە پێشنیاز و داواکاریەکانیان دەکۆلنەوە، بۆیە بەو شێوەیە هەلسوکەوت دەکەن!
نازانم، چۆن ڕێگە بە خۆتان دەدەن، دەسکاریی نووسینی خەلکی بکەن؟! ئێوە ئەوەتان لە سەرە، گەر هەلەیەکی ڕێزمان هەبێ، ڕاستیکەنەوە، یا شتێ بەپیبێ، بینووسنەوە، ئەوەیان کارێکی زۆر باشە، کەس ڕەخنە ناگرێ، چونکە بە یەکێ لە ئەرکەکانی سەر شانتان دادەنرێ. بەلام، من بۆیە گوتارەکانتان بە چاپکراوی بۆ دەنێرم، تا دەسکاریی ڕێنووسەکەی نەکەن، ئەگینا بە دەس بۆم دەنووسین و بۆم دەناردن.
من هەر لە خۆتان دەپرسم، گەر خوێنەرێ، گوتارێکی دیاریکراویی هەر نووسەرێکی مانگنامەکەتان بخوێنێتەوە، گەر هەلەیەک لە نووسینەکەیدا

هەبوو، ئایا چۆن دەزانێ، ئەو هەڵەیە هەڵەی کێیە؟ بە هەڵەی ئێوە یا بە هەڵەی نووسەرەکەی دابنێ؟ چونکە گەر ئێوە نووکی پێنووسەکەتان تیژکەنەوە و لە هەموو دێڕەکانی وەردەن، ئیدی کێ دەزانێ، هەڵەی کێیە؟! جگە لەوە، ئایا چۆن ڕێگە بە خۆتان دەدەن، کاری وا بکەن؟ ئایا بە کارێکی خراپ و نارەوای دانانێن؟! وەنەبێ، هەر چی ئێوە دەینووسن، ڕاستبێ، نەخێر. لە گوتارەکاندا گەلێ هەڵەی ڕێزمان و ڕێنووس دەبینم، بەلام لەبەرئەوەی نازانم، نووسەرەکانیان بە هەڵە نووسیویانن، یا ئێوە ڕاستەکانتان بە هەڵە بۆ گۆڕیون، ناچار بە سەریاندا بازدەدەم، هەر چەندە هەر چی چۆنێبێ، لە سەر « پەیام » دەکەوێ.
دەمەوێ، بۆتان ڕوونکەمەوە، ئەو شەستوپێنج جارەی ئێوە دەسکاریی نووسینەکەتان کردووە، تەنیا یەک جاری هەڵەیەکتان بۆ ڕاسکردوومەتەوە، ئەویش ووشەی « زۆری »یە و من بە شێوەی تاک نووسیوومە، دەبووایە، بە شێوەی کۆ بنووسرایە، دەستان خۆشبێ و زۆر چاکتان کردووە. بەلام، ئەو شەستوچوار جارەی دیکە، من بە دەسێوەردانی دادەنێم. ئەو کارانەش لە مرۆڤی خوێنەوار و دەسپاک ناوەشێتەوە!
سەیر دەبێ، منیش وەک ئێوە نەزانم، لە کوێدا پیتی « ک » و پیتی« ت » لە کۆتایی ووشەکاندا بەکاردێنرێ! چ ووشەیەک لە زمانی کوردییدا، بە دوو « و » دەنووسرێ؟ لە کوێدا ووشەیەک بە دوو « ی » کۆتایی دێ؟
بەلام بۆ نموونە : کاتێ من دەنووسم، « دەبێ، نابێ، دەمەوێ یا نووسەرێ، گوتارێ، ڕۆژنامەیە، کاتێ، ڕۆژێ، مانگێ، سالێ ... تاد »، نەک «دەبێت، نابێت، دەمەوێت یا نووسەرێک، گوتارێک، ڕۆژنامەیەک، کاتێک، ڕۆژێک، مانگێک، سالێک ... تاد »، لە ڕووی ڕێزمان و واتاوە، هیچ لە ناوەڕۆکی نووسینەکە ناگۆڕێ. من پێموایە، هەر دوو نووسینەکە ڕاستن، بەلام ئەز هەولدەدەم، بە کوردییەکی ئاسان بنووسم. بەو کوردییە بنووسم، کە کۆمەلانی خەلک ڕۆژانە ئاخافتنی پێ دەکەن. چونکە زمان خۆی ئەوەیە، دەبێ گوێ لە خەلکی بگرین، بزانین، چۆن دەدوێن و هەر بەو شێویەش بنووسین. دیارە کوردیی ئاسان، لەگەل نووسینی کوردیی بە هەلە، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. بۆ نموونە : گەر بنووسین، « نیە یا چیە »، ئەمە بۆ ئاسانکردنی زمانەکەمان نییە، بەلکوو بە هەلە لە قەلەمدەدرێن، چونکە ڕاستەکەی دەبێ، بەم شێوەیە بنووسرێ : « نییە،

چییه ». خۆ گەر بنووسین :« نی یە یا چی یە »، دیسانەوە هەر هەڵە نییە، بەڵکوو لە شێوەی ڕێنووسەکاندا جیاوازییان هەیە. خۆ گەر ئێوە بە « دەبێ، نابێ ... تاد » قایل نابن، هەر لە سەر بۆچوونی خۆتان سوورن، « دەبێت، نابێت ... تاد) بە ڕاست دەزانن، ئەدی بۆ بە یەکجاریی نانووسن : «دەبێتن، نابێتن ... تاد » وەک هێندێ کوردی ناوچەکانی کۆیە، هەولێر و بادینان بەکاریدێنن!

بۆ ئاگاداریتان، ماوەی پتر لە ساڵێکە پەرتووکێکم لە سەر « زمانی کوردیی و گرفتەکانی » بە دەسەوەیە، بەشێکی تایبەتیم بۆ شێوەی نووسین و ڕێنووسی کوردیی نوێ تەرخانکردووە. بە درێژی باسی کوردیی ئاسان و کوردیی بە هەڵەنووسینم کردووە.

ئێوە بێ ئەوەی پێویستکا، بە خۆڕایی سەری خۆتان، بە کارێکەوە دێشێنن، لە زیان زیاتر قازانجی بۆ کەس نییە، لە بری ئەوە دەتوانن، کارێکی دیکەی سوودبەخش بە ئەنجامگەیەنن. سەیرە، هێندەی بەو کارانەوە خۆتان ماندوودەکەن، ئەو هەموو پیتانەی « ک » و « ت »، بۆ کۆتایی ووشەکانم زیاددەکەن، یا هێندێ ووشەی وەک « دەربکەن، کۆدەبنەوە، جیابکاتەوە، جیابکەنەوە، بەگەڕبخەن، دووربکەونەوە، چارەسەربکەن، بڵاوبکەنەوە، ئاگاداربکەن »م پێکەوە نووسیوە، ئێوە لە یەکدیتان جیاکردوونەتەوە و بەم شێوەیە نووسیوتانەتەوە :« دەر بکەن، کۆ دەبنەوە، جیا بکاتەوە، جیا بکەنەوە، بەگەڕ بخەن، دوور بکەونەوە، چارەسەر بکەن، بڵاو بکەنەوە، ئاگادار بکەن »، گوتارێ بخوێننەوە، گەلێ باشترە. یا « لە ڕاستیدا »م بە جیا نووسیوە، کەچی ئێوە پێکتانەوە نووساندوون و کردووتانە بە « لەڕاستیدا »، کە ئەوە ناشێ و ڕاست نییە، چونکە « لە ڕاستیدا » لە دوو ووشەی جیاواز پێکهاتووە. « لە » ئامرازی پێوەندییە، لەگەڵ «ڕاستیدا » پێکەوە نانووسرێن.

ئەز سەرنج لە هێندێ گوتاری « پەیام » دەدەم، بە ڕێنووسێکی تێکەڵاو دەنووسرێ. بۆ نموونە: ئەوڕۆ کە بەشێ لە نووسەرە لاوەکانمان، پێڕەوی ڕێنووسی بە سەریەکەوە نووسین دەکەن، دەبێ بزانن، چی و لە کوێدا ووشەیەک پێکەوە دەنووسرێ. خۆ ناکرێ، هەر لەبەرئەوەی پێکەوە بنووسین، ئیدی هەر چی « ناو، کردار، ئاوەڵناو، ئامرازی پێوەندیی، ئامرازی لێکدەر و ئامرازی بانگکردن » هەیە، هەمووی وەک چێشتی مجێور بە سەر یەکدا

بترشێنین، ئەمە چییە، بە ڕێنووسێکی نوێ و بە سەریەکەوە دەنووسین.
گەر بلێین، ئەمانەش هەر گرنگ نین، ئەدی بە چ مافێ، جارێ ووشەی «جگە» بە «بێجگە» و دوو جاریش ووشەی «ئینجا» بە «ئەوجا» دەگۆڕن؟ وەک بۆم ڕوونکردنەوە، من نالێم، ئەوەی ئێوە هەڵەیە، هەردوو شێوە نووسینەکە بە ڕاست دەزانم، بەڵام ئەز بە جوانی نازانم، شارەزایی خۆتان لە زمانی کوردییدا، بە نووسەرانی کورد تاقیکەنەوە!
لە خالی شەشی نامەکەی پێشوومدا، ووشەی « Doctor »م بە ئینگلیزی نووسیبوو، بەڵام کاتێ نامەکەتان بڵاوکردۆتەوە، جگە لە چەن پیتێکی عەرەبی وەک « طق ذهق م » هیچی دیکە دیار نییە. دیارە ئێوە لە سەر دیسکەکە تەماشای گوتارەکان دەکەن، ئیدی پاشان لە سەر ڕووکاری مانگنامەکەتان چۆن دەرچێ، گرنگ نییە و پێیداناچنەوە، تا بزانن، چۆن دەرچووە و هەڵەکانی چاک بکەن.
ئەز دەمەوێ، لە نووسیندا تەنیا یەک جۆر ڕێنووس پێڕەوکەم، جا خەڵکی دیکە چۆن دەنووسن و کام شێوە پێڕەودەکەن، یا لەبری « دە » و « ئیدی » لقەدیالێکتی موکریی، « ئە » و « ئیستر »ی لقەدیالێکتی سولەیمانی بەکاردێنن، هەر کەسە بۆ خۆی ئازادە و من بە هەڵەی دانانێم. هەر چەندە پڕ بە دڵ حەزدەکەم، هەموو نووسەرێکی کورد، بەو شێوەیە بنووسێ، کە خۆم باوەڕم پێی هەیە، بەڵام حەزکردن و سەپاندن، دوو شتی جیاوازن و پێکەوە لە یەک قازانی نووسیندا دانوویان ناکوڵێ. بۆ نموونە: لە مێژە هەوڵدەدەم، لە بری « بێجگە، ئەگەر، ئینجا، ئەوجا، هەتا، وەکوو ... تاد». « جگە، گەر، جا، تا، وەک ... تاد » لە نووسینەکانی خۆمدا بەکاربێنم، بەڵام هەرگیز، شتێ لەو بابەتانەشم بۆ هیچ برایەکی نووسەر چاک نەکردووە، کە هێندێ جار، داوای یارمەتیی و پێداچوونەوە دەکەن، چونکە وەک گوتم: هەر دوو شێوەکە ڕاستن، تەنیا هێندە هەیە، من ئەوەیان بە کوردییەکی ئاسانتر، ڕەوانتر و شیرینتر دەزانم، بۆیە دەسبەرداریی نابم.
لە کۆتاییدا، تکایەکی برایانەتان لێ دەکەم، واز لە نەخۆشی بەرزەفڕیی بێنن. چونکە، هەر کەسێ تەنیا، هەر خۆی بە ڕاست بزانێ، ئەوە بە نەخۆشیی و گرێوگۆڵێکی دەروونیی دادەنرێ. با پێ لە ڕاستی بنێین، ئێمە تا ئێستە هیچمان، بە تەواویی کوردییەکی ڕێکوپێک نازانین، لە سەرەتای ڕێدایین و دەمانەوێ، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە، خۆمان فێری نووسینی

زمانەکەمان بکەین، تا شێوە زمانێکی پوخت و پاراو، بۆ نەوەکانی داهاتوومان بچەسپێنین. ئەمەش، هیچ جۆرە نەنگییەکی تێدانییە، چونکە لە لایەکەوە، بە هۆی باری بندەسیی و دواکەوتوویی نەتەوەکەمانەوە، زمانەکەمان ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخساوە، وەک نەتەوە ئازاد و سەربەخۆکانی دیکەی سەر ڕووی ئەم زەوییە، ئەو هەلەیان بۆ هەڵکەوتووە، ڕاژەی زمانەکەمان بکەین. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم پێشکەوتن و دەسپێداهێنانە، بە زۆر ناکرێ، بەڵکوو بە دەمەتەقێ و لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی پێکدێ، بە هاوکاریی، سنگفراوانیی و لەخۆبووردن جێبەجێدەکرێ. جا با ڕیسەکەمان هەڵنەوەشێتەوە، قسە هەر بۆ قسە نەبێ، ئاسنی سارد لەگەڵ یەکدی نەکوتین، باشتر وایە، لە ژێر ڕەشماڵی ڕەوشی دێموکراسیی ئەم وولاتانەدا، گوێ بۆ یەکدی شلکەین، ڕێز لە بیروباوەڕی یەکدی بگرین، دڵی نووسەرەکانمان نەڕەنجێنین، لە هەوڵدان و خۆماندوکردن ساردیان نەکەینەوە.

باشتروایە، پێشەکیی تەماشایەکی مێژووی گەشەسەندن، پێشکەوتنی زمان و ڕێنووسی کوردیی بکەین، بزانین، لە دوای ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانەوە، زمانی کوردیی بە چ قۆناغێکدا تێپەڕبووە، بە چ شێوەیە گەشەیکردووە و پێشکەوتووە، تا بەم شێوەیە گەیشتووە، کە ئەوڕۆ ئێمە پێی دەنووسین. لەو باوەڕەشدام، زمان وەک بوونەوەرێکی زیندوو وایە، پێبەپێی گۆڕانکارییە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، هونەریی، وێژەیی، زانستیی و تەکنۆلۆژیی »ەکان دەگۆڕێ، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گەشەسەندن و بەرەوپێشەوەچووندایە. بۆیە لە زۆر ڕووەوە، نە ئەو شێوە زمانەی پێش پەنجا ساڵێ لەمەوبەر بەکاردێنرا، لەم شێوە زمانەی ئەوڕۆ دەچێ، نە ئەم شێوە زمانەی ئەوڕۆش، تا سەر بەم شێوەیە دەمێنێتەوە، بەڵکوو بە دڵنیاییەوە دەڵێم: لە پاشەڕۆژدا، شێوە زمانێکی دیکەی « باشتر، ڕەوانتر، شیرینتر و جوانتر » خۆی دەچەسپێنێ.

ئەز پێشنیازدەکەم، پێش ئەوەی، نەشتەرکاریی لە دڵ و جەرگی کۆریەی ساوای بەرهەمی نووسەراندا بکەن، باشتروایە، چاوێ بەو زمانە ئاسان و خۆماڵییەدا بخشێنن، کە لە مێژە، چەن نووسەر و بلیمەتێکی وەکە( پیرەمێرد، گۆران، هێمن، دیلان، هەژار ... تاد)پەخشانیان پێ نووسیوە، هۆنراوەیان پێ هۆنیوەتەوە، بەرهەمەکانی خۆیان، بە خشڵی

ووشەی کوردیی ناسک و نازدار ڕازاندۆتەوە، ئەو کاتە بۆتان دەردەکەوێ، ئەو نووسەر و هۆنەرە نەمرانە، بە چ زمانێ باخچەی وێژەی کوردییان ڕازاندۆتەوە، ئەو هونەرمەندە بلیمەتانە، بە دە س و پەنجەی زێڕینیان، چۆن ئەو چەن تابلۆ ڕەنگینانەی زمانیان بۆ کێشاوین!
جارێکی دیکەش، تکایەکی برایانەتان لێ دەکەم، با کاتی یەکدی بەو شتانەوە نەگرین، چونکە، من یەکەم کەس نیم، ڕەخنەتان لێ بگرم، بەڵکوو خەڵکی دیکەش هەن، لێرە و لەوێ سرتە و بۆڵەیان لێوە دێ. گەر کاریش وا بڕوا، ڕۆژبەڕۆژ ژمارەیان پتریش دەبێ. جا گەر هەر بڕیارتان داوە، لە کەلی ئەهریمەن دانەبەزن، خۆتان لە پشت دێوجامەی دەستێوەردانەوە حەشاردەن و ڕاوە ووشە بکەن، گەر دەسکاریی نووسینەکانم دەکەن، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم : پێش ماڵاوایی،(دەترسم، ئەمەشم بۆ بگۆڕن و بیکەن بە «ماڵئاوایی»!)، لە کانگای دڵەوە، داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم، بەڵام ئیدی لەمەودوا، چیدیکە نووسینی من بڵاومەکەنەوە، چونکە ئەز تەنیا ناوەڕۆکم مەبەس نییە، بەڵکوو ناوەڕۆک و شێوەم پێکەوە لا گرنگە. پێموایە ناتوانرێ، بابەتێکی «گرنگ، بە پێز و بە هێز»، لە شێوەیەکی لاواز و شێواودا دەربڕێ، وەک چۆن ئاوێنەیەکی چڵکن، تەڵخ و خراپ، ڕوخساری تەماشاکاران دەشێوێنێ، ڕووە گەش و ڕاستەقینەکەیان پیشان نادا، با تەماشاکاریش مرۆڤێکی گەلێ « ڕێکوپێک، قنجوقیت، قۆز و ئێسکسووک » بێ!

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزی

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیزدا

## 16. ســــــــــەرچاوەکان :

1. ئەحمەدی خانی، مەم و زین، هەژار کردوویە بە موکریانی، چاپخانەی نەجاح،« چاپی جەواهێری تاران » بەغدا، 1960 .
2. ئەکـرەم خـامـۆش، کـێشـەی نیـشـانەکـانی خـاڵبـەندی و دەسـتـوور و بناوانی چارەسەرکردنی، بەشی یەکەم، گۆڤاری خوێندکاری کورد، ژمارە 24 - 25، دەزگای چاپەمەنی شەهید فەرهاد، ڕێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد لە ئەورووپا ـ سۆکسە، 1997
3. ئەکرەم خامۆش، کێشەی ....، بەشی دووەم، ژمارە 1998،26 .
4. ئەنداز حەویزی، ئاڤێستا ، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، سوید، 1992.
5. ئەنوەر محەمەد ئەحمەد، زمانی دووفاقیی ڕۆژنامەگەریی کوردی، مانگنامەی پەیام، ژمارە8، یولی1998.
6. د. ئەوڕرحمانی حاجی مارف، وشەی زمانی کوردیی، بەغدا، 1975 .
7. د. ئەوڕەحـمانی حـاجی مـارف، زمـانی کـوردیی لەبەر ڕۆشنایی فـۆنەتییکدا، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،1976. ل ـ ٢٥
8. ئەولیا چەلەبی، سیاحەتنامە، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی ناکام، چاپی دووەم، چاپخانەی ئەشبیلییەی تازە، بەغداد، 1977 .
9. د. ئیبـراهیم عـەزیز ئیـبـراهیم، ئامـراز لە زمـانی کـوردیدا، ناوەندی بڵاوکـردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی، ، چاپی یەکەم، ارومیە، ١٣٦٧.
10 . اسماعیل بیشیکچی، کردستان مستعمرە دولیە، ترجمە زهیر عبدالملک، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، سوید، 1998.
11. بانگی کوردستان ـ کۆکردنەوە و لەسەرنووسینی جەمال خەزنەدار ـ ل 111، ساڵی 1، ژمارە 13 ، 1922.
12. بەرهەمی کۆکراوەی عبدولواحید نووری، ئامادەکردن و کۆکردنەوەی مەحمود تۆفیق خەزنەدار، پێشەکی و سەرپەرشتیی ئامادەکردن دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، طبع مطابع دار الثقافە العامە، بەغدا، 1991 .
13. بەشێک لە دیوانی ئەوڕەحمان بەگی بابان، ئامادەکردنی، محمود احمد محمد، چاپی یەکەم، چاپخانەی زەمان، بەغدا، 1989.
14. بۆبی ئەسەر، ئەمڕۆ پێویستـمان بەچی هەیە؟ گۆڤـاری بەربانگ، ژمـارە 87، ساڵی12 ، ستۆکهۆلم،1993 .
15. پەیام، مانگنامەی پەیام، ژمارە5 ، فێبروەری1998.

16. تەوفیق وەهبی، بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کورد، وەرگێڕ تاها فەیزی زادە، چاپی یەکەم، چاپەمەنی سەییدیان، مەهاباد، 1361.
17. تۆفـیق وەهبی، زانیـاری گـشـتی ی پێـشـەکی، گـۆڤـاری هیـوا، ژمـارە 1، لە بڵاوکراوەکانی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، تشرینی یەکەم 1983.
18. الامیر جلادت بدرخان و المستشرق الفرنسی روجیە لسکو، قواعد اللغە الکردیە « اللهجە الکرمانجیە »، ترجمە و نشر دلاور زنکی، الطبعە الاولی، مطبعە دار العلم، عمان، نیسان 1968.
19. جلال الطالبانی، کردستان والحرکە القومیە الکردیە، دار الطلیعە للطباعە و النشر، بیروت، 1969.
20. جەلال مەحمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، بەغدا، 1982.
21. جەمال عەبدول، شەوکار، فەرهەنگی کیمیا ئینگلیزیی ـ عەرەبیی ـ کوردیی، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر، سلێمانی، 1998.
22. جمال نبز، حول المشکلە الکردیە، طبع علی مطابع الاتحاد القومی للطلبە الاکراد فی اوروپا، 1969.
23. جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا بڵاوی کردۆتەوە، ئەڵمانیا ـ بامبێرگ، 1976.
24. د. جەمال نەبەز، سەرنجێک لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە 22، چاپخانەی « دار الجاحظ »، بەغدا، 1978، ل 79 ـ 115.
25. جەمال نەبەز، نووسینی کوردی بە لاتینی، چاپی دووەم، بنکەی چاپەمەنی نەبەز، ستۆکهۆڵم، 1987.
26. جەمـال نەبەز، خوێندەواری بە زمـانی کـوردی، چاپی دووەم، بنکەی چاپەمـەنی نەبەز، ستۆکهۆڵم، 1987.
27. جمال نبز، المستضعفون الکرد و اخوانهم المسلمون، منشورات کوردنامە، لندن، 1997.
28. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەی ی کوردی نە بیری " قەومیەت " ی ڕۆژهەڵاتی و نە بیـری " ناسـیـۆنالزیم " ی ڕۆژئاوایی یە، چاپی یەکـەم، بنکەی چاپەمـەنی ئازاد، ستۆکهۆڵم، سوید، 1984.
29. حەمـە حەمـە ئەمین قـادر، « کاکەی فەلاح »، کاروانی شیـعری نوێی کـوردیی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1978.

30. حەمە حەمە ئەمین قادر، « کاکەی فەلاح »، شیعر، چاپی یەکەم، چاپخانەی « الحوادث »، بەغدا، 1980.
31. د. حوسێنی خەلیقی، بناخە گشتی یەکانی کۆمەڵناسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، سوید، 1991.
32. حوسێن محەمەد عەزیز، بەرەو ئازادیی، ڕابوون، ژمارە 2، سوید، 1991،ل 46.
33. حوسێن محەمەد عەزیز، ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چاپی دووەم، چاپخانەی کتێبی هەرزان، سوید، 1995
34. حوسێن محەمەد عەزیز، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کتێبی هەرزان، سوید، 1996.
35. د. حوسێن محەمەد عەزیز، هەنگاوی یەکەم و سەرەتای کارێکی مەزن، گۆڤاری بەربانگ، ژمارە 102، سالی 12، ستۆکهۆلم،1996.
36. حوسێن محەمەد عەزیز، فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید، 1996.
37. د. حوسێن محەمەد عەزیز، سێ سەرنجی زمانەوانیی، مانگنامەی پەیام، ژمارە ژمارە8، یولی1998.
38. د. حوسێن محەمەد عەزیز، گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی کتێبی هەرزان، سوید، 1998.
39. د. حوسێن محەمەد عەزیز، نامەیە بۆ دەستەی بەڕێوەبەرانی مانگنامەی « پەیام » مانگنامەی پەیام، ژمارە10، سێپتێمبەر1998.
40. د. حوسێن محەمەد عەزیز، بۆرە نەبێ، بازە بێ، کلکی بە ئەندازە بێ، گۆڤاری بەربانگ، ژمارە « 109 »، سالی1998، ل27-30 .
41. دارا مەحموود، پشوویەک لە هەوارگەی کاروانە دوورودرێژەکەی مامۆستا « فاتیح ڕەسوڵ »دا، مانگنامەی پەیام، ژمارە11، ئۆکتۆبەری1998 .
42. دیاکۆنۆف ئی.م.، میدیا، بورهان قانع لە فارسییەوە کردوێتی بە کوردی، چاپی یەکەم، دار الحریە للطباعە و النشر، بەغدا، 1978.
43. دیوانی بێخود، بێ ئەوەی هیچی لە سەر بێ!
44. دیوانی پیرەمێردی نەمر، سقز، 1369.
45. دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل 1986 .
46. دیوانی دڵدار.
47. دیوانی مەحوی، 1984.

48. دیوانی مەستوورەی کوردستانی، 1374.
49. دیوانی مەلای جزیری، تهران، 1361.
50. دیوانی موفتی پێنجوینی ـ مەلا عەبدوڵڵای توتنچی، بەغدا، 1990.
51. دیوانی نالی، تهران، 1364.
52. دیوانی هەژار، بۆ کوردستان، چاپی سێیەم، تاران، بەفرانباری 1385.
53. دیوانی ئەسیری ـ بەغدا، 1980.
54. دیوانی مەولەوی، بەغدا، 1961.
55. دیوانی موخلیس حاجی مەلا ڕەسووڵی دێلێژە، سلێمانی، 1988.
56. دوو چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ بەڕێزان د. عیسمەت شەریف وانلی و د. ئیسماعیل بێشکچی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی مەهاباد کوردی، بنکەی چاپەمەنی سارا، چاپی یەکەم، سوید، 1992.
57. ڕەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی کورد، بەرگی یەکەم و دووەم چاپی دووەم، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر، 1988.
58. زبێر بلال اسماعیل، مێژووی زمانی کوردی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە یوسف ڕەووف عەلی ، دار الحریە للطباعە، بغداد، 1984.
59. ساطع الحصری، ما هی القومیە؟ مرکز دراسات الوحدە العربیە، طبعە خاصە، بیروت، نیسان 1985 .
60. سوارەی ئێلخانی زادە، خەوەبەردینە، چاپی یەکەم، ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی « ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی » اورمیە، 1372 هەتاوی.
61. د. شاکر خەسباک، الکرد و المسالە الکردیە، الموسسە العربیە للدراسات و النشر، الطبعە الثانیە، بیروت، 1989 .
62. شەرەفخانی بدلیسی، شرفنامە، هەژار کردویە بە کوردی، لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە لە چاپ دراوە، 1981 .
63. طاهر صادق، ڕێنوس ـ چۆنیەتی نوسینی کوردی، چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سیدیان لە مەهاباد. ساڵی چاپ؟
64. (د. علی عبدالواحد وافی، علم اللغە، الطبعە السادسە، دار نهضە مصر للطبع و النشر، 1967، ل 182ـ 183)
65. عەبدوڵڵا قەرەداغی « مەلا عەلی » زەرتەشت، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، ستۆکۆلم، 1997 .

66. عەبدولقادر ڕۆستەم بابان، ڕەوشی کوردان، مێژووی کوردستان لە فارسییەوە کەریمی حیسامی کردوویە بە کوردی، چاپی یەکەم، ناوەندی چاپ و ڕازاندنەوەی مەنسوور، سوید، 1991.
67. علاء الدین سجادی، مێژوی ئەدەبی کوردی، کتابفرۆشی معارف، سردشت، پەرتوخانەی زانیاری، خرداد 1361.
68. علاء الدین سجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1978.
69. دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی ی یەکگرتووی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)،بەغدا، 1971.
70. عەبدوڕەحمانی زەبیحی، قاموسی زبانی کوردی، چاپی دووەم، ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی، ورمێ، 1367.
71. عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم،
72. عەزیزی ئیبراهیمی، ڕێنووس و ڕێزمانی کوردی دستور زبان کردی با ترجمە فارسی، مرکز پخش: مهاباد، ساڵی چاپ؟
73. عەلی سەیدۆ گۆرانیی، لوڕ و لوڕستان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی 2، بەشی2، بەغدا، 1974، ل ١١٣ « عەرەبیی »
74. فریان جرنفیل، التقویمان الهجری و المیلادی، ترجمە د. حسام محی الدین الالوسی، وزارە الثقافە و الاعلام، مطبعە الجمهوریە، الطبعە الثانیە، بغداد، 1986.
75. فوواد حەمە خورشید، التوزیع الجغرافی للهجات اللغە الکردیە، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی 3، بەشی2، ل 612 ـ 634.
76. ڤیلچێڤسکی ئۆ. ل.، نەژادی کورد، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە ڕەشاد میران، چاپی یەکەم، چاپخانەی سارا، ستۆکهۆڵم، 1993.
77. قانع، ژیان و شیعرەکانی، برهان قانع کۆیکردۆتەوە و سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە، چاپخانە و ساڵی چاپ؟
78. پرۆفیسۆر ق. کوردۆ، هەندێک بیروباوەڕی هەڵە لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە، وەرگێڕان و پێشەکیی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، پیاچوونەوەی د. کەمال مەزهەر، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1973-1974.
79. قورئانی پیرۆز.
80. پرۆفیسۆر ق. کوردۆ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی(سۆرانی) چاپی یەکەم، دەزگای چاپەمەنی زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، 1983.

81. پرۆفیسۆر ق. کوردۆ، کورتە دیرۆکا هەلشکافتنا ل بارا رێزمان و زارێن کوردی، خالدێ محەمەدی کردیە کوردی، چاپخانەی خەبات، کوردستان، 1988.
82. کاژیکنامە، فەلسەفەی حیزبی کاژیک لە چەند دێرێکدا، چاپی دووەم، چاپخانەی دامودەزگای کاژیک لە ئەورووپا، 1968.
83. کاکە سوور، چاوپێکەوتن لەگەڵ هونەرمەندی گەورەی کورد قادر دیلان، مانگنامەی پەیام، ژمارە 11، ئۆکتۆبەری1998.
84. دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر، لە کۆری لێکۆڵینەوەی وێژەیی و رەخنەسازیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1980.
85. دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر، رەخنەسازی مێژوو و پەیرەوکردن، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغداد، 1983.
86. کەریمی حسامی، یادی هێمن، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی نوێ، سوید، 1987.
87. کەریم شارەزا، پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٦.
88. د. کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمانی کوردیی و زمانی ئەدەبیی و نووسینیان، گۆڤاری زانیاری، ژمارە 4، بەغدا، 1971، ل ـ 22، 24
89. د. کەمال فوئاد، چەند سەرەتایەکی زمانەوانی، گۆڤاری هیوا، ژمارە 1، لە بڵاوکراوەکانی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، تشرینی یەکەم 1983.
90. د. کەمال فوئاد، فۆنیمەکانی زمانی کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کتێبی ئەرزان، 1995.
91. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، رێنیسانس، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ـ الحوادث ـ بەغدا، 1984.
92. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد « بەشی یەکەم » چاپی دووەم، چاپخانەی هەڵەبجە، سوید، ساڵی چاپ؟
93. د. کەمال مەزهەر، پێرێسترۆیکا و کورد، بەشی یەکەم، رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە « 1138 »، 1989/12/25. بەشی دووەم، ژمارە « 1140 » 1990/1/1 . بەشی سێیەم، ژمارە « 1141 » 1990/1/4 (لە سوید لە شێوەی نامیلکەیەکدا کۆکراوەتەوە.)
94. لە بارەی مەحوی لوتکەوە، چاپی یەکەم، مطبعە سومر، بغداد، 1986.
95. مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، کوردۆ لە ئاڵمانییەوە کردوویە بە کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژ، سوید، 1996.

96. پرۆفیسۆر دوکتۆر مارف خەزنەدار، پەخشانی هونەری کوردی 1945-1961، گۆڤاری باسکار، ژمارە1 ، لەندەن، هاوینی1998.
97. محمد امين زكي، خلاصه تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخيه حتى الان، ترجمه محمد علي عوني، الجزء الاول، الطبعه الثانيه، بغداد، 1961.
98. محمد امين زكي، خلاصه تاريخ الكرد و كردستان، تاريخ الدول و الامارات الكرديه في العهد الاسلامي، ترجمه محمد علي عوني، الجزء الثاني، الطبعه الثانيه، لندن، 1986.
99. محەمەد ئەمین هەورامانی، تەماشاکردنێکی سەرپێیی زاری سۆرانی و زاری هەورامی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی دووەم، بەغدا، 1974.
100. محەمەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوورد دا، چاپی یەکەم، بەغدا، 1981.
101. محەمەد حەمە باقی، مێژووی مۆسیقای کوردی، چاپی یەکەم، چاپ ئێران ـ شهر کرد، ورمێ، 1996.
102. محمدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، جزمی یەکەم، کتابفرۆشی محمدی سقز، چاپ اول، خرداد1367.
103. د. محەمەد رەزای باتینی، ئاوڕێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان، وەرگێڕ حەسەنی قازی، چاپی یەکەم، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، سوید، 1993.
104. محەمەد رەسووڵ هاوار، مافی کورد لە دووتوێی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان و نەتەوە یەکگرتووەکاندا، مانگنامەی پەیام، ژمارە ژمارە11، ئۆکتۆبەری1998.
105. محەمەد صالح ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل)، ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی یا گەنجینەی فەرهەنگ و زانست، چاپی یەکەم، تهران، 1364 هـ.
106. محەممەد مەردۆخی کوردستانی، مێژووی کورد و کوردستان، وەرگێڕانی عەبدول کەریم محەممەد سەعید، چاپی یەکەم، مطبعه اسعد ـ بغداد، 1991.
107. مەسعوود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1974.
108. مسعود محمد، لسان الكرد، مطبعه الحوادث، بغداد، 1987.
109. مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی یەکەم، ستۆکهۆڵم، 1992.
110. مصطفى محمد طحان، القوميه بين النظريه و التطبيق، دار الوثائق، الطبعه الاولى، الكويت، 1989.

111. مینۆرسکیی، کورد نەوەی میدێکانن، وەرگێڕانی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم، بەندی یەکەم، بەغدا، 1973.
112. مینۆرسکی، کورد تێبینیی و وردبوونەوە، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە حەمە سەعید حەمەکەریم، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 1984.
113. د. محەممەدی موکریی، گۆرانیی یا ترانەهای کوردیی، کتێبخانەی دانش، 1957، ل58 (لە زوبێحی یەوە وەرگیراوە).
114. د. معین، فەرهەنگی فارسیی « تاران » ج ٥، ل ٨١٠)
115. د. نەسرین فەخری، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ـ زانستگای بەغدا، ژمارە (19)، 1976.
116. نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، چاپی یەکەم، ئەڵمانیا ـ بەرلین، 1997.
117. نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، چاپی یەکەم، ئەڵمانیا ـ بەرلین، 1997.
118. نوری عەلی ئەمین، ....، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، چاپی 26، چاپخانەی ژمارە2ی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،1986 .
119. هەردەوێل کاکەیی، مصطفی نەریمان، شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەووەر، چاپی یەکەم، دار الحریە للطباعە، بغداد، 1984.
120. هەژار، هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کوردی ـ فارسی، چاپی یەکەم، سروش، تهران، 1369.
121. هێمن، تاریک و ڕوون، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، عێراق، 1974.
122. هێمن، پاشەڕۆک، چاپی دووەم، چاپخانەی پیرۆز، لە بڵاوکراوەکانی سەییدیان، مهاباد، خاکەلێوەی1362 هەتاوی.
123. یادی125ساڵەی کۆچی دوای نالی، مانگنامەی پەیام، ژمارە ژمارە11، ئۆکتۆبەری1998.
124. دەقی ئەم قسەیەی « فاروق شوشە » لە دەنگوباسی تێکستی MBC ڕۆژی (1997/7/7)ەوە وەرگیراوە.
125. Uno Dalen, Bonniers Lilla uppslagsbok, 1989
126. Kerstin Ballardini, Svenska som andra språk, 1982
127. Världen i fakta, kartor, flaggor och ..., 1996

# له بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

گوتـــار :

1/ بەرەو ئازادی، ڕابوون، ژمارە 2، سوید، 1991، ل 46

2/ لە پێناوی ڕاسـتـیـدا، بەربانگ، ژمـارە 87، سـاڵی 12، سـوید، 1993 ،ل48

3/ یەکـێـتی سـۆڤـیـەتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییـەکـانی نەتەوەی کـوردەوە، ڕابوون، ژمارە7 ـ 8، سوید، 1993، ل67

4/ دەربارەی کەسایەتیی کورد، ڕابوون، ژمارە 10ـ11، سوید،1994 ل71

5/ بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژمارە 13 ، لەندەن،1995ل7

6/ سـایکۆلۆژییـەتی مـرۆڤی ئاوارەی کـورد و بازاڕی چاپەمـەنی کـوردی، گـزینگ، ژمارە8، سوید،1995، ل30

7/ لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواری، گزینگ، ژمارە 9،1995، ل48

8/ کـۆرپە تاقـانە ساواکـەی دەنک و ڕەنگی نەتەوەکـەم( MedTV) ، گـزینگ، ژمـارە 13، سوید، 1996.

9/ هەنگاوی یەکـەم و سـەرەتای کـارێکی مـەزن،بەربانـگ، ژمـارە 102، سـاڵی 14، سوید، 1996 ،ل51

10/ چەند سـەرنجێ دەربارەی سـەرەخۆشی و پرسـەدانان، بەربانـگ، ژمـارە 104، سـاڵی 15، سوید، 1997 ،ل22

11/ دیکتـاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە، قۆڕی نەخشـە و پلانەکانیـان دادەهێنن،بەربانـگ، ژمـارە 105، سـاڵی 15، سـوید، 1993 ،ل39. گـۆڤـاری دیمـۆکـراسی، ژمـارە30، ساڵی7، کوردستان ـ سلێمانی، تشرینی یەکەمی1997، ل16.

12 / کـەی هۆشێ بە بەر خـۆمـاندا دەهێنینەوە؟ بەربانـگ، ژمـارە 106-107، سـاڵی 15، سـوید، 1998 ،ل23. گـۆڤـاری دیمـۆکـراسی، ژمـارە31، سـاڵی7 ، کـوردسـتـان ـ سلێمانی، نیسانی1998، ل21.

13 / با خۆمان چاک بناسین، بەربانـگ، ژمارە 108، ساڵی 16، سوید، 1998 ،ل27

14/ سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژمارە8، پووشپەڕ1998، ل18

15/ مـافی دیاریکردنی چارەنووس، گـۆڤـاری ئاڵا، ئۆرگـانی پارتی سـەربەخـۆیی کوردستان، ژمارە30، ڕێبەندانی1998، ل7.

16/ بۆرە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ،بەربانگ، ژمارە 109 ، 1988، ل27

17/ چەند سـەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی خەلیل منەوەر، گۆڤـاری هەردەم، کوردستان ـ سولەیمانیی،1999.

يلكه و پەرتووك :


دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی
بەندی رۆشنبیری کوردی، سوید، 1994، ل32
دوا پرۆژە، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی، سوید، 1994،
1
پێنج ووتاری غەمگین، چاپخانەی باران، سوید، 1994، ل77
دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چاپخانەی باران، سوید، 1994، ل84
ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چاپی یەکەم، سولەیمانی، 1993، ل208.
ی دووەم، لە بلاوکراوەکانی کتێبی هەرزان، سوید، 1995، ل125
پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید،
19، ل91. چاپی دووەم، کوردستان، 1996.
، نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چاپخانەی باران، سوید، 1995، ل47
کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی کیتاب هەرزان،
ید ـ یۆنشۆپینگ، 1996، ل222.
فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی باران، سوید،
19، ل98. چاپی دووەم، لە بلاوکراوەکانی دیموکراسی، کوردستان ـ سولەیمانی،
19، ل90
/ بەڵێ لێکۆڵینەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستیی، چاپی یەکەم، لە
وکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید، 1996، ل53
/ خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک لەگەڵ
جیس فەتحوڵلای پارێزەردا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاپێک، ستۆکهۆلم، 1997،
. 12
/ رۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چاپی
کەم، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1997، ل100
/ گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، لە بلاوکراوەکانی کیتاب هەرزان، سوید ـ
شۆپینگ، 1998، ل80.
/ تۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چاپی یەکە، چاپخانەی میدیا،
ید ـ ستۆکهۆلم، 1999، ل104.
/ سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، 1999.

